# سُنَنُ الدَّارِمِيّ

به كوردى

لِلامام عبد الله بن عبد الرحمن الدارمي

به رگى دووه م

وه رگيراني

زانا عيا عبابكر

حوكمى فه رموده كان وه رگيراوه له

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق



ڕێکخراوی پیت
بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

پرۆژەی پیت
بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرمووده

# سُنَنُ الدَّارِميّ

## بەکوردی

نووسینی: الإمام عبدالله بن عبدالرحمن الدّارمي
وەرگێڕانـــی : زانـــا عیســا عـبابکر
دیزاینی ناوەوه : زەردەشت کاوانی
خـەتی بـەرگ : نــەوزاد کۆیـــی
چاپــی یەکـەم : ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك
٦٦١ لاپـــەڕە
١٧ * ٢٤ ســـم
بابـەت : ئایینی

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانه گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٣٢٦ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە







# سُنَنُ الدَّارِمِيِّ

# بەکوردی

للإمام عبدالله بن عبدالرحمن الدَّارمي

- بەرگی دووەم -

وەرگـێڕانـی

**زانـــا عیســـا عبابکر**

حوکمی فەرمودەکان وەرگیراوە لە: الشیخ محمد صبحي بن حسن حلَّاق

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی گوماندا (واتە: ئەو ڕۆژەی گومانی تیایە کە ئایا یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە یان نەبۆتە ڕەمەزان)

١٧٢٩ - «عَنْ صِلَةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَأُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ فَقَالَ: كُلُوا، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ. فَقَالَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ: مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ»[١].

واتە: لە صیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای عەمماری کوڕی یاسر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) بووین، مەڕێکی سورەوەکراویان هێنا، عەمماریش وتی: بیخۆن، جا یەکێک لە خەڵکەکە خۆی لێ کێشایەوە و وتی: من بە ڕۆژووم، عەمماری کوڕی یاسریش وتی: هەر کەسێک لەم ڕۆژەدا کە گومانی تیایە (ڕەمەزانە یان نا) بە ڕۆژوو بێت، ئەوە سەرپێچی ئەبو قاسمی کردوە (واتە: سەرپێچی پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە).

١٧٣٠ - «عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: أَصْبَحْتُ فِي يَوْمٍ قَدْ أُشْكِلَ عَلَيَّ مِنْ شَعْبَانَ أَوْ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ، فَأَصْبَحْتُ صَائِمًا، فَأَتَيْتُ عِكْرِمَةَ فَإِذَا هُوَ يَأْكُلُ خُبْزًا وَبَقْلاً، فَقَالَ: هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ. فَقَالَ: أُقْسِمُ بِاللهِ لَتُفْطِرَنَّ. فَلَمَّا رَأَيْتُهُ حَلَفَ وَلاَ يَسْتَثْنِي، تَقَدَّمْتُ فَعَذَرْتُ وَإِنَّمَا تَسَحَّرْتُ قُبَيْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قُلْتُ: هَاتِ الآنَ مَا عِنْدَكَ، فَقَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سَحَابٌ، فَكَمِّلُوا الْعِدَّةَ ثَلاَثِينَ، وَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الشَّهْرَ اسْتِقْبَالاً»[٢].

واتە: لە سیماکی کوڕی حەربەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەیانیم کردەوە لە ڕۆژێکدا گومانی بۆ دروست کردم کە ئایا هەر لە مانگی شەعبان حیسابە، یان لە مانگی ڕەمەزان، بۆیە بەیانیم کردەوە بە بەڕۆژو بوونەوە (بە ڕۆژوو بووم)و، چووم بۆ لای عیکریمە، لە کاتێکدا نان و پاقڵەی دەخوارد، وتی: وەرە خواردنی بەیانی بخۆ، منیش وتم: من بە ڕۆژووم، ئەویش وتی: سوێند بە خوا دەبێ بیشکێنی، جا کاتێ بینیم سوێندی خوارد بە موتڵەقی و پێداگری، هاتمە پێشەوە و (هەندێکم خوارد و کشامەوە) و داوای لێبوردنم کرد (کە کەمم خوارد چونکە) تۆزێک پێشی ئەو کات پارشێوم خواردبوو، دواتر وتم: ئادەی ئەو بەڵگەیەی لەلاتە بیهێنەوە، وتی: ئیبنو عەبباس بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕۆژووبن بە بینینی مانگ (واتە: گشتتان بە ڕۆژووبن بە هۆی بینینی مانگی یەک شەوەی ڕەمەزان لە لایەن هەندێک لە مسوڵمانی عادیل)، وە ڕۆژوو بشکێنن و (بیکەن بە جەژن) بە هۆی بینینی مانگی یەک شەوەی مانگی شەووال، جا ئەگەر هەور کەوتە نیوانی ئێوە و مانگ (بۆیە نەتانزانی مانگ دەرکەوتووە یان نا)، ئەوە سی ڕۆژ تەواو بکەن و دەستپێشخەری مانگی ڕەمەزان مەکەن (بە ڕۆژوو گرتن).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

تێبینی: ئەمە بنچینە و یاسای شەرعە: پێشی ڕەمەزان هەتا سی ڕۆژ تەواو دەبێ، یان تا مانگ دەبینرێ ڕۆژووی ڕەمەزان بوونی نیە و ئەسڵ خواردنە، چونکە لە پێشتر لە مانگانی خواردندا بوویت، وە لە کۆتایی ڕەمەزانیش ئەسڵ بە ڕۆژوو بوونە تا سی ڕۆژ تەواو دەبێت، یان تا مانگی شەووال دەبینرێ نابێت بکرێتە جەژن، چونکە لە مانگی ڕۆژوودا بوویت.

## بابەت: بەڕۆژوو بوون بەهۆی بینینی مانگ

١٧٣١ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ رَمَضَانَ فَقَالَ: لاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْا الْهِلاَلَ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕەمەزانی کرد و وتی: بە ڕۆژوو مەبن تاوەکو مانگی یەک شەوەی ڕەمەزان دەبینن، وە ڕۆژوو مەشکێنن تاوەکو مانگ دەبینن، جا ئەگەر (ئاسمانتان) هەوراوی بوو (نەتانتوانی مانگ ببینن لەبەر هەور) ئەوە ئەندازەی مانگێکی تەواو بژمێرن (واتە: سی ڕۆژ تەواو بکەن).

١٧٣٢ - «حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَوْ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمُ الشَّهْرُ فَعُدُّوا ثَلاَثِينَ»[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ یان ئەبو قاسم ﷺ فەرموویەتی: بە ڕۆژوو مەبن تاوەکو مانگی یەک شەوەی ڕەمەزان دەبینن، وە ڕۆژوو مەشکێنن (مەیکەن بە جەژن) تاوەکو مانگ دەبینن، جا ئەگەر (سەرەتا و کۆتایی) مانگتان لێ دیار نەبوو ئەوە سی ڕۆژ بژمێرن.

١٧٣٣ - « عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ عَجِبَ مِمَّنْ يَتَقَدَّمُ الشَّهْرَ وَيَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ، فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلاَثِينَ يَوْمًا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، کە سەری سوڕماوە لە و کەسەی پێشی مانگی ڕەمەزان دەکەوێتەوە، وە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مانگتان بینی بەڕۆژووبن (بیکەن بەسەرەتای ڕەمەزان)، وە کاتێ مانگتان بینی (لە کۆتایی ڕەمەزاندا) ئەوە ڕۆژوو بشکێنن (بیکەن بە جەژن)، جا ئەگەر ئاسمان هەور بوو (نەتان دەتوانی مانگ ببینن) ئەوە ژمارەی مانگێکی کامل تەواو بکەن کە سی ڕۆژە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەوەی سوننەتە بوترێت کاتێ مانگی یەک شەوە دەبینرێت

١٧٣٤ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ، وَالتَّوْفِيقِ لِمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى، رَبُّنَا وَرَبُّكَ اللهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ مانگی یەک شەوەی دەبینی دەیفەرموو: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ، وَالتَّوْفِيقِ لِمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى، رَبُّنَا وَرَبُّكَ اللهُ) واتە: خوا لە هەموو شتێک گەورەترە، خوایە مانگ هەڵبێنی بەسەرماندا بە ئاسایش و ئارامی و ئیمان و سەلامەتی و ئیسلامەتی و یارمەتیدان بۆ ئەو ڕەفتار و کردارانەی پەروەردگارمان پێی خۆشە و پێی ڕازیە، (ئەی مانگ) خوای ئێمە و خوای تۆ (الله)یە.

١٧٣٥ - «عَنْ طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ قَالَ: اللهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ، رَبِّي وَرَبُّكَ اللهُ»[٢].

واتە: لە تەڵحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەر ﷺ کاتێ مانگی یەک شەوەی دەبینی دەیفەرموو: (اللهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ، رَبِّي وَرَبُّكَ اللهُ) واتە: پەروەردگارا مانگ هەڵبێنی بەسەرماندا بە ئاسایش و ئارامی و ئیمان و سەلامەتی و ئیسلامەتی، (ئەی مانگ) خوای من و خوای تۆ (الله)یە.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی پێشی ڕەمەزان ڕۆژووی سوننەت بگیرێ پێشی بینینی مانگ

١٧٣٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَقَدَّمُوا قَبْلَ رَمَضَانَ يَوْمًا، وَلاَ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلاً كَانَ يَصُومُ صَوْمًا، فَلْيَصُمْهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێشی ڕەمەزان مەکەون (بە ڕۆژووی سوننەت) ڕۆژێک و دووان، تەنها کەسێک نەبێت کە بەردەوام ڕۆژوو دەگرێت (ئەو ڕۆژەش دەکەوێتە ناو ڕۆژی عادەتی خۆی، وەک دووشەم و پێنج شەم) ئەوە با بەڕۆژوو بێت (بۆ ئەو دروستە و، با عادەتی سوننەتی خۆی تێک نەدات).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: مانگ بیست و نۆ ڕۆژە

١٧٣٧ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، فَلاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ، فَاقْدُرُوا لَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگ بیست و نۆ ڕۆژە (بەلایەنی کەمەوە)، کەواتە بە ڕۆژوو مەبن تاوەکو مانگ دەبینن (بۆ ڕۆژێک پەلە مەکەن)، وە ڕۆژووش مەشکێنن تاوەکو مانگ دەبینن (بۆ ڕۆژێک پەلە مەکەن)، جا ئەگەر ئاسمان هەور بوو لەسەرتان ئەوە ئەندازەی مانگێکی تەواو بژمێرن (واتە: تا سی ڕۆژ تەواو دەکەن).

## بابەت: شاهێدیدان لەسەر بینینی مانگی یەک شەوەی ڕەمەزان

١٧٣٨ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَرَاءَى النَّاسُ الْهِلاَلَ، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ، فَصَامَ وَأَمَرَ النَّاسَ بِالصِّيَامِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: خەڵک سەیریان دەکرد تا مانگی یەک شەوە ببینن، منیش هەواڵمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە من بینیومە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە ڕۆژوو بوو (لەبەر شاهێدیەکەی من) و فەرمانی بە خەڵکیش کرد بە ڕۆژووبن.

١٧٣٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْهِلاَلَ، فَقَالَ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: نَعم. قَالَ: يَا بِلاَلُ، نَادِ فِي النَّاسِ، فَلْيَصُومُوا غَدًا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: من مانگی یەک شەوەی ڕەمەزانم بینیوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا شاهێدی دەدەی کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە الله، وە منیش پێغەمبەر و نێردراوی خوام؟ وتی: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەی بیلال لەناو خەڵکیدا بانگ ڕادێرە و بڵێ با بەیانی بەڕۆژووبن.

## بابەت: ئەو کەسەی پارشێو دەخوات کەی واز لە خواردن و خواردنەوە دەهێنێت؟

١٧٤٠ - «عَنْ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمًا فَحَضَرَ الْإِفْطَارُ، فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلاَ يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِمًا، فَلَمَّا حَضَرَ الْإِفْطَارُ أَتَى

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ ضعيف.

امْرَأَتَهُ، فَقَالَ: عِنْدَكِ طَعَامٌ؟ فَقَالَتْ: لاَ، وَلَكِنْ أَنْطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ، وَكَانَ يَوْمَهُ يَعْمَلُ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ وَجَاءَتِ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ، قَالَتْ: خَيْبَةٌ لَكَ. فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ البقرة، فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحًا شَدِيدًا، فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا حَتَّى تَبَيَّنَ لَهُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ»[1].

واتە: لە بەڕرائەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێشتر هاوەڵانی موحەممەد ﷺ كاتێ یەكێكیان بە ڕۆژوو دەبوو و كاتی فتار (ڕۆژوو شكان) دەهات و كەسەكەش خەوتبوو پێش ئەوەی ڕۆژوەكەی بشكێنێ، ئەوە هیچی نەدەخوارد ئەو شەوە و ڕۆژەكەشی تا ئێوارە دادەهات (چونكە تەنها بۆیان هەبوو لە ئێوارە تا عیشا بخۆن و بخۆنەوە، واتە: ڕۆژوو لە عیشاوە تا مەغریب بوو).

جا قەیسی كوڕی صیرمەتی ئەنصاری بە ڕۆژوو بوو، كە كاتی فتار هات چوو بۆ لای خێزانەكەی و وتی: خۆراكێكت لەلایە؟ خێزانەكەشی وتی: نەخێر، بەڵام دەچم بۆت پەیدا دەكەم، وە قەیس بە ڕۆژ كاری دەكرد بۆیە (شەكەت بوو) و خەو بەسەریدا زاڵ بوو و خێزانەكەی گەڕایەوە، جا كاتێ قەیسی بینی وتی: بێ بەشی بۆ تۆ (تازە كاتی خواردن تەواو بوو)، جا كاتێ بوو بە نیوەڕۆ بورایەوە، جا ئەوە باس كرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ البقرة، واتە: [لە شەوانی مانگی ڕۆژوودا چوونە لای ژنەكانتان بۆ حەڵاڵ كراوە، ئەوان بەرگ و پۆشاكن بۆ ئێوە عەیبتان دائەپۆشن، ئێوەش بەرگ و پۆشاكن بۆ ئەوان و عەیبیان دائەپۆشن، خودا دەیزانی و ئاگاداربوو ئێوە زوڵمتان لە خۆتان كرد و خۆتان تاوانبار كرد كە لە شەوانی مانگی ڕەمەزاندا پێش ئەوەی بۆتان حەڵاڵ بكرێ چوونە لای خێزانەكانتان، جا كە تەوبەیان كرد خودا تەوبەی لێ قبوڵ كردن و عەفوی كردن، دەی ئێستا لە شەواندا بڕۆنە لایان و بۆتان حەڵاڵە و داوای ئەوە بكەن كە خوا بۆی نوسیون تیایاندا (لە منداڵ)، هەروەها لە شەواندا بخۆن و بخۆنەوە تا خەتی سپی ڕووناكی بەیان لە خەتی ڕەشی تاریكی شەو جیا دەبێتەوە، وە دواتر ڕۆژوەكانتان ببەنەسەر تا شەو دادێت، بەڵام لە شەوەكاندا ئەگەر لە مزگەوتدا گۆشەنشین بوون بۆ عیبادەت و خواپەرستی ئەوە مەڕۆنە لای خێزانەكانتان (جیماعیان لەوێ لەگەڵ نەكەن)، ئەمانە كە بۆم ڕوون كردنەوە سنوری فەرمانی خودان لێیان نزیک مەبنەوە نەبادا سنور ببڕن و تەجاوز بكەن، خودا بەو شێوەیە فەرمانتان بۆ ڕوون دەكاتەوە بەڵكو خۆتان لە تاوان و سەرپێچی بپارێزن].

---

(١) ـ صحیح.

جا هاوەڵان بەو ئایەتە زۆر دڵ خۆش بوون و، دەیانخوارد و دەیانخواردەوە تاوەکو خەتی سپی بەیانیان لە خەتی ڕەشی شەو بۆ ڕوون دەبوویەوە.

۱۷٤۱ - «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، لَقَدْ جَعَلْتُ تَحْتَ وِسَادَتِي خَيْطًا أَبْيَضَ وَخَيْطًا أَسْوَدَ، فَمَا تَبَيَّنَ لِي شَيْءٌ، قَالَ: إِنَّكَ لَعَرِيضُ الْوِسَادِ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ اللَّيْلُ مِنَ النَّهَارِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ البقرة»[1].

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا لە ژێر سەرینەکەمدا داوێک و (بەنێکی) سپی و داوێکی ڕەشم داناوە، کەچی هیچم بۆ دەرنەکەوت، (پێغەمبەری خوا ﷺ) (زەردەخەنەی کرد) و فەرمووی: تۆ سەرینەکەت زۆر پانە (بۆیە دیارە شەو و ڕۆژی لە ژێر جێگا بۆتەوە)، ئەوە باسی (خەتی) شەو و ڕۆژە لەو وتەی خوا: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ البقرة، واتە: [هەروەها لە شەواندا بخۆن و بخۆنەوە تا خەتی سپی ڕووناکی بەیانی لە خەتی تاریکی ڕەشی شەو جیادەبێتەوە، وە دواتر ڕۆژوەکانتان ببەنەسەر تا شەو دادێت...].

## بابەت: ئەوە ئەندازەی سوننەتە لە تاخیر کردنی پارشێو

۱۷٤۲ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَ الأَذَانِ وَبَيْنَ السُّحُورِ؟ قَالَ: قَدْرُ قِرَاءَةِ خَمْسِينَ آيَةً»[2].

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پارشێومان خوارد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، دواتر هەڵسا بۆ نوێژ، (ئەنەس دەڵێ) وتم: چەندی پێ چوو لە نێوان بانگدان و پارشێو خواردن؟ (زەید) وتی: بە ئەندازەی خوێندنی پەنجا ئایەت.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی پارشێو خواردن

۱۷٤۳ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً»[3].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پارشێو بخۆن، چونکە لە پارشێو خواردن بەرەکەت هەیە.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٧٤٤ - «عَنْ أَبِي قَيْسٍ، مَوْلَى عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: كَانَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ ﷺ يَأْمُرُنَا أَنْ نَصْنَعَ لَهُ الطَّعَامَ يَتَسَحَّرُ بِهِ، فَلاَ يُصِيبُ مِنْهُ كَثِيراً، فَقُلْنَا لَهُ: تَأْمُرُنَا بِهِ وَلاَ تُصِيبُ مِنْهُ كَثِيراً؟ قَالَ: إِنِّي لاَ آمُرُكُمْ بِهِ أَنِّي أَشْتَهِيهِ، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ»[١].

واتە: لە ئەبو قەیسی خزمەتکاری عەمرِی کوڕی عاص گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار عەمرِی کوڕی عاص ﷺ فەرمانی پێ دەکردین کە خواردنی بۆ دابنێین تا پارشێوی پێ بخوات، وە زۆریشی نەدەخوارد، بۆیە پێمان وت: ئەوە بۆ فەرمانمان پێ دەکەی خواردنت بۆ ئامادە بکەین و زۆریش ناخۆی؟! (عەمرِ) وتی: من فەرمانتان پێ ناکەم لەبەر ئەوەی حەزم لێی بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەیە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: جیاوازی نێوان ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی ئەهلی کیتاب خواردنی پارشێوە (بۆیە بە کەمێکیش بێت هەر پارشێو دەخۆم).

## بابەت: هەر کەسێک نیەتی ڕۆژوگرتنی تۆکمە نەکات لە شەوەوە

١٧٤٥ - «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَلاَ صِيَامَ لَهُ، قَالَ عَبْد اللهِ: فِي فَرْضِ الْوَاجِبِ: أَقُولُ بِهِ»[٢].

واتە: لە حەفصەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک بە شەو نیەتی ڕۆژوو نەهێنێت پێشی بەیانی، ئەوە ڕۆژووی بۆ نیە (ڕۆژووی دانامەزرێ).

عەبدوڵڵا وتویەتی: دەربارەی ڕۆژووی واجب فەتوا دەدەم.

## بابەت: دەربارەی زوو فتار کردنەوە

١٧٤٦ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ»[٣].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەردەوام لە چاکە و خێر دان تا زوو فتار بکەنەوە و ڕۆژوەکانیان بشکێنن (چونکە دیارە لەسەر ڕێڕەوی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ماون).

١٧٤٧ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ وَأَدْبَرَ النَّهَارُ، وَغَابَتِ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَفْطَرْتَ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ موقوف صحيح، ولا يصح رفعه.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ شەو هات و ڕۆژ نەما و خۆر ئاوابوو ئەوە ڕۆژووت شكاوە (چونكە بە كاتی نوێژی مەغریب ڕۆژوو نامێنێت).

## بابەت: ئەوەی سوننەتە فتاری پێ بكرێتەوە

١٧٤٨ - «عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ، فَإِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ»[١].

واتە: لە سەلمانی كوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: كاتێ یەكێک لە ئێوە فتار دەكەنەوە با فتار بە خورما بكاتەوە، جا ئەگەر دەستی نەكەوت و نەیبوو با فتار بە ئاو بكاتەوە، چونكە ئاو پاک و پاككەرەوەیە.

## بابەت: چاكەو گەورەیی ئەو كەسەی فتار بە ڕۆژووەوانێک دەكاتەوە (خواردن یان خواردنەوەیەكی پێ دەبەخشێ تا ڕۆژووەكەی پێ بشكێنێ)

١٧٤٩ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كُتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، إلاَّ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ»[٢].

واتە: لە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەینیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: هەر كەسێک فتار بە ڕۆژووەوانێک بكاتەوە، هەمان پاداشتی ئەوی بۆ دەنوسرێت، كەچی لە پاداشتی ڕۆژووەوانەكە كەم ناكات.

## بابەت: نەهی كردن لە نەپچڕاندن و فتار نەكردنەوەی چەند ڕۆژێک

١٧٥٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ مَرَّتَيْنِ، قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ، قَالَ: إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بە دوور بگرن لە ویصال و فتار نەكردنەوە و نەپچڕاندنی ڕۆژوو بە درێژایی چەند ڕۆژێک، دوو جار فەرمووی، وتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) خۆ تۆ ویصال دەكەیت؟! فەرمووی: من وەكو ئێوە نیم، من شەودەكەمەوە پەروەردگار هێزێک و خۆشەویستییێكم بۆ عیبادەت كردن پێ دەبەخشێت كە شوێنی خواردن و خواردنەوەی ئێوە دەگرێتەوە.

---

(١) ـ ضعيف، لكنه صحيح من فعله عليه السلام.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٧٥١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تُوَاصِلُوا، قِيلَ: إِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ، قَالَ: إِنِّي لَسْتُ كَأَحَدِكُمْ، إِنِّي أُطْعَمُ وَأُسْقَى»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ویصاڵ مەکەن (واتە: چەند ڕۆژێک بە ڕۆژوو مەبن بەبێ فتار کردنەوە)، وترا: تۆ ویصاڵ ئەنجام دەدەیت (واتە: ئەی بۆ تۆ ویصاڵ دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ)، فەرمووی: من وەکو هیچ یەکێک لە ئێوە نیم، من (هێزێک و خۆشەویستییێکم بۆ عیبادەت کردن) پێ دەبەخشرێت کە شوێنی خواردن و خواردنەوەی ئێوە دەگرێتەوە.

١٧٥٢ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ تُوَاصِلُوا، فَأَيُّكُمْ يُرِيدُ أَنْ يُوَاصِلَ، فَلْيُوَاصِلْ إِلَى السَّحَرِ، قَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: إِنِّي أَبِيتُ لِي مُطْعِمٌ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي»[2].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: ویصاڵ مەکەن (واتە: چەند ڕۆژێک بە ڕۆژوو مەبن بەبێ فتار کردنەوە)، جا هەر یەکێک لە ئێوە ویستی ویصاڵ بکات ئەوە با ویصاڵەکە تا کاتی سەحەر و پارشێو بکات، وتیان: تۆ ویصاڵ دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەویش فەرمووی: من شەو دەکەمەوە کەسێکم هەیە (هێزێک و خۆشەویستییێکم بۆ عیبادەت کردن) پێ دەبەخشێت کە شوێنی خواردن و خواردنەوەی ئێوە دەگرێتەوە (کەسەکەش خوای پەروەردگارە).

١٧٥٣ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْوِصَالِ، فَقَالَ لَهُ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي. فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ، وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا، ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوْا الْهِلاَلَ، فَقَالَ: لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە ویصاڵ (واتە: لەوەی مرۆڤ چەند ڕۆژێک بە ڕۆژوو بێت بەبێ فتار کردنەوە)، جا پیاوێک لە مسوڵمانان وتی: دەنا تۆ ویصاڵ دەکەیت! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من وەکو ئێوە نیم، من شەو دەکەمەوە خواکەم (هێزێک و خۆشەویستییێکم بۆ عیبادەت کردن) پێ دەبەخشێت کە شوێنی خواردن و خواردنەوەی ئێوە دەگرێتەوە، جا کاتێک پشتیان هەڵکرد و ڕازی نەبوون واز بهێنن لە ویصاڵ، بۆیە ڕۆژێک ویصاڵی پێ کردن، دواتر ڕۆژێکی تریشی زیاد کرد (ویصاڵی پێ کردن)، دواتر مانگی یەک شەوەیان بینی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر مانگ تاخیرتر بووایە ئەوە (ویصاڵەکەم) بۆ زیاد دەکردن، وەکو کەسێکی سزادەر

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(ویستی سزایان بدات بە ویصاڵ) کاتێ پشتیان هەڵکرد و ڕازی نەبوون وازی لێ بهێنن و (بێ فەرمانی پێغەمبەری خوایان کردﷺ).

تێبینی: لەو فەرمودانەی ویصاڵ کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: خوای پەروەردگار خواردن و خواردنەوەم پێ دەبەخشێت، (وەک ئیمامی خەتتابی دەفەرموێت و ئیمامی نەوەویش هەڵی دەبژێرێت): مەبەستی ئەوە نیە بە هەقیقەت خواردن دەخوات و خواردنەوە دەخواتەوە، چونکە ئەگەر وا بێت ئەوە پێی ناوترێت ویصاڵ، وە هیچ جیاوازی نابێت لەگەڵ خەڵک، تەنها ئەوە نەبێت خواردن و خوارنەوەکە لەلایەن خواوە بۆی دەنێردرێت.

بەڵکو مەبەستی ئەوەیە خوای میهرەبان هێزیک و خۆشەویستییێکی بێ سنوری بۆ عیبادەت کردن پێ دەبەخشێت، کە هەست بە برسیەتی ناکات و کاری تێ ناکات، چونکە لە ڕیوایەتیتردا هاتووە دەفەرموێت: (إني أظل يطعمني ربي ويسقيني): واتە من بەردەوام و بە ڕۆژ خوا خواردن و خواردنەوەم پێ دەبەخشێت!!!

جا لێرەدا وشەی (أظل) بۆ کاتی ڕۆژ بەکار دێت، خۆ ناشکرێ بە ڕۆژوو بێت و بە هەقیقیش خواردن و خواردنەوە بخوات لە ڕۆژدا؟!! کەواتە ماناکەی ڕوونە مەبەستی خواردن و خواردنەوەی هەقیقی نیە.

## بابەت: بەڕۆژوو بوون لە سەفەردا

١٧٥٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أُرِيدُ السَّفَرَ، فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[١].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: حەمزەی کوڕی عەمڕی ئەسلەمی (لەناو ڕەمەزاندا) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەمەوێ بچم بۆ سەفەر جا فەرمانی چیم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت (بەڕۆژوو بیت) ئەوە بەڕۆژووبە، ئەگەریش ویستت (بە ڕۆژوو نەبیت) ئەوە بەڕۆژوو مەبە.

١٧٥٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَصَامَ وَصَامَ النَّاسُ حَتَّى بَلَغَ الْكَدِيدَ، ثُمَّ أَفْطَرَ فَأَفْطَرَ النَّاسُ، فَكَانُوا يَأْخُذُونَ بِالأَحْدَثِ، فَالأَحْدَثِ مِنْ فِعْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی فەتحی مەککە (لە ڕەمەزاندا) دەرچوو و، بە ڕۆژوو بوو و خەڵکیش بەڕۆژوو بوون تا گەیشتن بە کەدید (کە شوێنێکە لە نزیک مەککە) پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژوەکەی شکاند و خەڵکیش ڕۆژوەکەیان شکاند، (زوهری دەڵێ): چونکە خەڵکی نوێترین و نوێترین شتیان جێبەجێ دەکرد لە کردەوەی پێغەمبەری

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

خوادا ﷺ (چونكە سەرەتا كەسی موسافیر بۆی نەبوو ڕۆژوو بشكێنێت، دواتر مۆڵەت درا، ئەوەش كۆتا و نوێترین كردار بوو لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەرچوو، لەم بابەتەدا).

١٧٥٦ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ ذَكَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا وَرَجُلٌ قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا صَائِمٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ»[١].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، كە باسی كردوە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێكدا بوو، قەرەباڵغییێكی بینی و پیاوێكیش سێبەری لێكرا بوو (بورابوویەوە)، پێغەمبەری خواش فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتیان: ئەوە بە ڕۆژووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە چاكەكاری نیە بە ڕۆژوو بوون لە سەفەردا.

١٧٥٧ - «عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[٢].

واتە: لە كەعبی كوڕی عاصمی ئەشعەریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە چاكەكاری نیە بە ڕۆژوو بوون لە سەفەردا.

١٧٥٨ - «عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[٣].

واتە: (لەم ڕێگایەشەوە) لە كەعبی كوڕی عاصمی ئەشعەریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە چاكەكاری نیە بە ڕۆژوو بوون لە سەفەردا.

## بابەت: مۆڵەتدان بە شكاندنی ڕۆژوو و، بە ڕۆژوو نەبوون بۆ كەسی موسافیر

١٧٥٩ - «عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا ذَهَبْتُ لِأَخْرُجَ، قَالَ: انْتَظِرِ الْغَدَاءَ يَا أَبَا أُمَيَّةَ، قَالَ: فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ يَا نَبِيَّ اللهِ، فَقَالَ: تَعَالَ أُخْبِرْكَ عَنِ الْمُسَافِرِ، إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْهُ الصِّيَامَ، وَنِصْفَ الصَّلَاةِ،قَالَ أَبُو مُحَمَّد: إِنْ شَاءَ صَامَ، وَإِنْ شَاءَ أَفْطَرَ»[٤].

واتە: لە ئەبو ئومەییەی زەمریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەسەفەر گەڕامەوە و چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەلامم لێ كرد، جا كاتێ ویستم لەلای بڕۆم و بچمە دەرەوە، فەرمووی: ئەی ئەبو ئومەییە چاوەڕێی نان حازر بوون بكە (تا لەگەڵمان بخۆی)، منیش وتم: من بە ڕۆژووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وەرە با پێت ڕابگەیەنم دەربارەی كەسی موسافیر، (بزانە) خوا ڕۆژوو و نیوەی (ڕەكعەتەكانی) نوێژی لەسەر لاداوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (كەسی موسافیر) ئەگەر ویستی (بە ڕۆژوو بێت) بەڕۆژوو دەبێت، ئەگەریش ویستی (بە ڕۆژوو نەبێت) ئەوە بەڕۆژوو نابێت.

تێبینی: ئەگەر كەسێک بیەوێ بە ڕۆژوو بێت لە سەفەردا ئاساییە، بەڵام چاكتر وایە ڕوخسەتەكە وەرگرێت و بە ڕۆژوو نەبێت، جا لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەبو ئومەییەی باس كرد كە دەتوانێ بە ڕۆژوو نەبێت، چونكە ئەو وا تێگەیشتبوو كە هەر واجبە دەبێ بە ڕۆژوو بێت.

## بابەت: مرۆڤ كەی ڕۆژوو دەشكێنێ كاتێ دەیەوێ لە ماڵەوە دەربچێت بۆ سەفەر

١٧٦٠ - «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﷺ قَالَ: رَكِبْتُ مَعَ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ سَفِينَةً مِنَ الْفُسْطَاطِ فِي رَمَضَانَ، فَدَفَعَ فَقَرَّبَ غَدَاءَهُ، ثُمَّ قَالَ: اقْتَرِبْ، فَقُلْتُ: أَلَسْتَ تَرَى الْبُيُوتَ؟ فَقَالَ أَبُو بَصْرَةَ: أَرَغِبْتَ عَنْ سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ ؟»[1].

واتە: لە عوبەیدی كوڕی جوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ ئەبو بەصرە سواری كەشتییەک بووین لە شاری بەصرە لە مانگی ڕەمەزاندا، دەستی بە ڕۆیشتن كرد و ئەبو بەصرەش خواردنەكەی نزیک خستەوە، دواتر وتی: نزیكبەرەوە (وەرە پێش، بیخۆ)، منیش وتم: ئایا خانووەكان نابینی (هێشتا نەچووینەتە قوڵایی سەفەر)؟ ئەبو بەصرە وتی: ئایا پشتت لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ كردووە؟

## بابەت: هەر كەسێک ڕۆژوێک لە ڕەمەزان نەگرێت یان بیشكێنێت بە ئەنقەست (بەبێ پاساو)

١٧٦١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ وَلاَ مَرَضٍ، فَلَنْ يَقْضِيَهُ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ، وَلَوْ صَامَ الدَّهْرَ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک ڕۆژوێک لە ڕەمەزاندا بخوات بەبێ ڕوخسەت و نەخۆشی (بە عەمدی)، ئەوە بە ڕۆژووبوونی گشت ساڵەكە (ڕۆژووە فەوتاوەكە) ناگیرێتەوە، ئەگەرچی هەموو ساڵەكەش بەڕۆژوو بێت.

١٧٦٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ رَخَّصَهَا اللهُ لَهُ، لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صِيَامُ الدَّهْرِ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ ضعيف.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك ڕۆژوێك لە ڕەمەزاندا بخوات بەبێ هیچ ڕوخسەتێك كە خوا ڕوخسەتی دابێت، ئەوە بە ڕۆژووبوونی گشت ساڵەكە (ڕۆژووە فەوتاوەكە) ناگێڕێتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی تووشی سەرجێیی دەبێت لەگەڵ خێزانەكەی لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژ

١٧٦٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلَكْتُ؟ فَقَالَ: وَمَا أَهْلَكَكَ؟. قَالَ: وَاقَعْتُ امْرَأَتِي فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ: فَأَعْتِقْ رَقَبَةً. قَالَ: لَيْسَ عِنْدِي، قَالَ: فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ. قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ، قَالَ: فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا. قَالَ: لاَ أَجِدُ، قَالَ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ؟ تَصَدَّقْ بِهَذَا، فَقَالَ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنْ أَهْلِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَوَاللهِ، مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرَ مِنَّا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَأَنْتُمْ إِذًا وَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: بە هیلاك چووم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چ شتێك بە هیلاكی داوی؟ وتی: تووشی سەرجێیی بووم (بە ڕۆژ) لەگەڵ خێزانەكەم لە ڕەمەزاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەندەیەك ئازاد بكە، (پیاوەكە) وتی: نیمە (پارەی كڕینی بەندەیەك تا ئازادی بكەم)، پێغەمبەری خوا فەرمووی: كەواتە دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژووبە، (پیاوەكە) وتی: ناتوانم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كەواتە شەست هەژار نان بدە، (پیاوەكە) وتی: نیمە، (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: سەبەتەیەكیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ كە خورمای تیا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كوا پرسیاركەرەكە؟ (بڕۆ) ئەوە بكەرە خێر و ببەخشە، (پیاوەكەش) وتی: ئایا ببەخشم بە ماڵێكی هەژارتر لە خانەوادەی خۆم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ سوێند بە خوا لەوسەر بۆ ئەوسەری بەردە ڕەشەكانی شاری مەدینە ماڵێك نیە لە ئێمە هەژارتر بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: كەواتە با بۆ ئێوە بێت، وە پێكەنی تاوەكو ددانە خڕێنەكانی دەركەوتن.

١٧٦٤ - «حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَجُلاً أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە باسی ئەم فەرموودەیە كراوە.

١٧٦٥ - «عن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا تَقُولُ: إِنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدِ احْتَرَقَ، فَسَأَلَهُ: مَا لَهُ؟ فَقَالَ: أَصَابَ أَهْلَهُ فِي رَمَضَانَ، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِمِكْتَلٍ يُدْعَى الْعَرَقَ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: أَيْنَ الْمُحْتَرِقُ؟ فَقَامَ الرَّجُلُ، فَقَالَ: تَصَدَّقْ بِهَذَا»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە کە دەیوت: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و باسی حاڵی خۆی کرد، وتی: (خۆی) سوتاندووە (بە دۆزەخ)، پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری لێ کرد: چی بووە؟ وتی کە: تووشی خێزانەکەی بووە لە ڕەمەزاندا، جا زەنبیلێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات کە پێی دەوترێت (الْعَرَق) و خورمای تیا بوو، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: کوانێ خۆسوتێنەرەکە؟ پیاوەکەش هەڵسایەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەمە بکە بە صەدەقە و ببەخشە.

## بابەت: نەهی کراوە لە ڕۆژوو گرتنی سوننەت بۆ ئافرەت، مەگەر پیاوەکەی مۆڵەتی بدات

**١٧٦٦- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لِامْرَأَةٍ: لاَ تَصُومِي إلاَّ بِإِذْنِهِ»[١].**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە بە ئافرەتێکی فەرمووە: بە ڕۆژوو مەبە (ڕۆژووی سوننەت مەگرە) تەنها بە ئیزنی ئەو نەبێت (واتە: بە ئیزنی پیاوەکەت).

**١٧٦٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَصُومُ الْمَرْأَةُ يَوْمًا تَطَوُّعًا فِي غَيْرِ رَمَضَانَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إلاَّ بِإِذْنِهِ»[٢].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئافرەت یەک ڕۆژ بە ڕۆژوو نابێت بە سوننەت، جگە لە ڕەمەزان، لە کاتێکدا کە هاوسەرەکەی لەلای بێت، تەنها بە ئیزن و مۆڵەتی ئەو نەبێت.

**١٧٦٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَصُومُ الْمَرْأَةُ يَوْمًا وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ، إلاَّ بِإِذْنِهِ، قَالَ: فِي النُّذور تَفِي بِهَا»[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺی گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئافرەت یەک ڕۆژی (سوننەت) بە ڕۆژوو نابێ لە کاتێکدا کە هاوسەرەکەی ئامادە بێت (لە ماڵ بێت)، مەگەر بە مۆڵەتی ئەو بێت.

ئەبو هورەیرە وتویەتی: لە ڕۆژووی نەزردا ئافرەتەکە جێبەجێی دەکات و بەڕۆژوو دەبێت (واتە: ئەگەر ئافرەت نەزری کردبوو بە ڕۆژوو بێت، ئەوە دەبێ نەزرەکەی جێبەجێ بکات و پێویستی بە مۆڵەتی هاوسەرەکەی نیە، چونکە جێبەجێ کردنی نەزر واجبە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ڕوخسەت و مۆڵەتدانی ماچ کردن بۆ کەسی ڕۆژووەوان

١٧٦٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَ عُرْوَةُ: أَمَا إِنَّهَا لاَ تَدْعُو إِلَى خَيْرٍ»[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکرد لە کاتێکدا کە بە ڕۆژوو بوو.

عورِوە وتویەتی: بەڵام ماچ کردن باشەی لەدوا نایێ (بۆ کەسی لاواز، لە ڕووی شەهوەتەوە، واتە: تا بکرێ ئەم کارە ئەنجام نەدرێ).

١٧٧٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ»[٢].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی ماچ دەکرد لە کاتێکدا کە بە ڕۆژوو بوو.

١٧٧١ - «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: هَشِشْتُ فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَجِئْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: إِنِّي صَنَعْتُ الْيَوْمَ أَمْرًا عَظِيمًا: قَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ. قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ مَضْمَضْتَ مِنَ الْمَاءِ؟ قُلْتُ: إِذًا لاَ يَضُرُّ، قَالَ: فَفِيمَ؟»[٣].

واتە: لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەزم جوڵا و دڵم خۆش بوو و (ماڵەوەم) ماچ کرد، لە کاتێکدا کە بە ڕۆژوو بووم، جا چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتم: من ئەمڕۆ کارێک و (تاوانێکی) گەورەم ئەنجام داوە، ماچم کردوە لە کاتێکدا بە ڕۆژوو بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێت وایە (ڕۆژووت بشکێت) ئەگەر ئاو لە دەمت وەر بکەیت؟ (ئیمامی عومەر دەڵێت) وتم: کەواتە زەرەر ناگەیەنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زەرەر لە چی دەدات؟ (نەخێر زەرەر لە ڕۆژوو نادات).

تێبینی: ماچ کردن ئاساییە و ڕۆژوو ناشکێنێت مادەم نەگاتە حاڵەتی ئاو هاتنەوە و جیماع، وەک چۆن ئاو لە دەم وەرکردن ئاساییە و ڕۆژوو ناشکێنێت مادەم نەگاتە حاڵەتی ئاو قوتدان و خواردنەوە، بەڵام دەبێ مرۆڤ زۆر ئاگاداری خۆی بێ ماچ کردنەکە تێنەپەڕێنێ، وەک چۆن دەبێ ئاگاداری خۆی بێت ئاو لە دەم وەرکردنەکە نەگاتە حاڵەتی ئاو خواردنەوە، کەواتە لە هەردووکیان شارەزایی و ئاگاداری

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دەوێت و بۆ کەسی لاواز و ناشارەزا هەردووکی باش نیە، بەڵام بۆ کەسی شارەزا و بەهێز هەردووکی زۆر ئاساییە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی بەیانی دەکاتەوە بە جەنابەتەوەو، دەیەوێ بە ڕۆژوو بێ

١٧٧٢ - «أَنَّ أَبا بَكْر ﷺ أخبره عن أبيه، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، وَعَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَن، أَخْبَرَتَاهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ أَهْلِهِ، ثُمَّ يَصُومُ»[١].

واتە: باوکی ئەبوبەکر ﷺ وتویەتی: ئوممو سولەمە و عائیشە (رَضِي اللهُ عَنهَن) هەواڵیان پێ داوە وتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی دەکردەوە بە جەنابەت لە خێزانەکانی، دواتر بەڕۆژووش دەبوو.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی خواردن دەخوات بە لەبیرچوونەوە

١٧٧٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک لەیادی چویەوە لە کاتێکدا کە بە ڕۆژووە خواردی یان خواردیەوە، ئەوە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوە (خوا نان و ئاوی داوەتێ و ئەوە دیاری و بەخششە).

١٧٧٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا وَهُوَ صَائِمٌ، ثُمَّ ذَكَرَ، فَلْيُتِمَّ صِيَامَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ»[٣].

قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَهْلُ الْحِجَازِ يَقُولُونَ: يَقْضِي، وَأَنَا أَقُولُ: لاَ يَقْضِي.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە دەخوات یان دەخواتەوە بە لەیادچوونەوە، لە کاتێکدا کە بەڕۆژووە، دواتر بیری دەکەوێتەوە، ئەوە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، چونکە خوا خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەهلی حیجاز دەڵێن: (ڕۆژووەکە) قەزا دەکاتەوە، وە من دەڵێم: قەزای ناکاتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: (حوكمى) ڕشانەوە بۆ كەسى ڕۆژووەوان

١٧٧٥ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَاءَ فَأَفْطَرَ. قَالَ: فَلَقِيتُ ثَوْبَانَ بِمَسْجِدِ دِمَشْقَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: صَدَقَ، أَنَا صَبَبْتُ لَهُ الْوَضُوءَ قَالَ عَبْد اللهِ: إِذَا اسْتَقَاءَ»[1].

واتە: لە ئەبو دەڕدائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ (بە ڕۆژووى سوننەت بوو، بەڵام لەبەر پێویستییێک) خۆى ڕشاندۆتەوە و ڕۆژوەكەى شكاندووە، (مەعدانى كوڕى ئەبو تەڵحە) وتویەتى: گەیشتم بە ثەوبان لە مزگەوتى دیمەشق و ئەوەم بۆ باس كرد (واتە: قسەكەى ئەبو دەڕدائم بۆ باس كرد، دەربارەى پێغەمبەرى خوا ﷺ)، ئەویش وتى: ڕاست دەكات، من ئاوى دەستنوێژم بۆ پێدا دەكرد (بۆ دەستنوێژ شۆردن، كاتێ خۆى ڕشاندەوە).

عەبدوڵلا وتویەتى: (ڕۆژوو شكان) كاتێكە كە خۆى بڕشێنێتەوە.

## بابەت: ڕوخسەتدان لە نەشكانى ڕۆژوو بە هۆى ڕشانەوەى بێ ئەنقەست

١٧٧٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا ذَرَعَ الصَّائِمَ الْقَيْءُ وَهُوَ لاَ يُرِيدُهُ، فَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَإِذَا اسْتَقَاءَ، فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ»[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتى: كاتێ ڕشانەوە بەسەر ڕۆژوەوان زاڵ دەبێت و دەڕشێتەوە، لە كاتێكدا مەبەستى نیە (بە ئەنقەست واى نەكردوە)، ئەوە قەزاكردنەوەى لەسەر نیە، وە كاتێ خۆى ڕشاندەوە، ئەوە قەزاكردنەوەى لەسەرە.

## بابەت: حیجامە (كەڵەشاخ) كردن ڕۆژووى ڕۆژووەوان دەشكێنێ (تێبینى: ئەم بابەتە مەنسوخە و حوكمەكەى هەڵوەشاوەتەوە)

١٧٧٧ - «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي ثَمَانِ عَشْرَةَ خَلَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَبْصَرَ رَجُلاً يَحْتَجِمُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»[3].

واتە: لە شەددادى كوڕى ئەوسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتى: لەگەڵ پێغەمبەرى خوادا ﷺ ڕێم دەكرد (بە ڕێگادا دەڕۆیشتم) لە هەژدەى ڕەمەزان تێپەڕ ببوو، (لەو كاتەدا پێغەمبەرى خوا ﷺ) پیاوێكى بینى حیجامە (كەڵەشاخ)ى دەكرد، پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: كەڵەشاخكار و كەڵەشاخ بۆكراو ڕۆژوویان شكاوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح، لكنه منسوخ.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە هەڵوەشاوەتەوە و کەڵەشاخ کردن ڕۆژوو ناشکێنێت، چونکە ئەمە حوکمی سەرەتا بوو، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەڵەشاخ ڕۆژوو ناشکێنێ .

١٧٧٨ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يَمْشِي بِالْبَقِيعِ فَإِذَا رَجُلٌ يَحْتَجِمُ فَقَالَ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَنَا أَتَّقِي الْحِجَامَةَ فِي الصَّوْمِ فِي رَمَضَانَ»[١].

واتە: ثەوبان ﷺ وتویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە (گۆڕستانی) بەقیعدا دەڕۆیشت (لە ڕەمەزاندا)، جا لەو کاتەدا پیاوێک کەڵەشاخی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەڵەشاخکار و کەڵەشاخ بۆکراو ڕۆژوویان شکاوە.

## بابەت: ڕۆژووەوان (کاتێ) غەیبەت دەکات (قەڵغانی) ڕۆژوەکەی دەدڕێنێ

١٧٧٩ - «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ، مَا لَمْ يَخْرِقْهَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَعْنِي بِالْغِيبَةِ»[٢].

واتە: لە عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە (لە سزای خوا دەیپارێزێت)، مادەم (ڕۆژوەوان) نەیدڕێنێ.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: واتە: بە غەیبەت.

## بابەت: کل بۆ ڕۆژوەوان

١٧٨٠ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ النُّعْمَانِ أَبُو النُّعْمَانِ الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي، وَكَانَ جَدِّي قَدْ أُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَمَسَحَ عَلَى رَأْسِهِ وَقَالَ: لاَ تَكْتَحِلْ بِالنَّهَارِ وَأَنْتَ صَائِمٌ، اكْتَحِلْ لَيْلاً بِالإِثْمِدِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: لاَ أَرَى بِالْكُحْلِ بَأْسًا»[٣].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی نوعمانی ئەنصاری لە باوک و باپیریەوە گێراویەتیەوە و وتویەتی: باپیرم بردراوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەستی بەسەری داهێناوە و فەرموویەتی: بە ڕۆژ کل مەکە (چاوت کل ڕێژ مەکە) لە کاتێکدا کە بە ڕۆژووی، بە شەو کل بکە بە ئیثمید، چونکە کلی ئیثمید چاو ڕۆشن و بەهێز دەکات و موش دەڕووێنێتەوە و درێژی دەکات (واتە: مووی برژانگ).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: پێم وانیە کل کردن و کل ڕێژ کردن هیچ کێشەیەکی تیا بێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ ضعيف.

تێبینی: ئەو فەرموودانەی باسی ئەوە دەکەن نابێ کل بە ڕۆژ بکرێت، هەموویان فەرموودەی لاوازن، بەڵام خۆ پاراستن باشترە، بۆیە زۆرێک لە زانایان دەفەرموون تەنها مەکڕوهە.

## بابەت: دەربارەی تەفسیری ئایەتی: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ ١٨٥﴾البقرة

١٧٨١ - «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖ ١٨٤﴾البقرة، قَالَ: كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، فَعَلَ، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا، فَنَسَخَتْهَا»[١].

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖ ١٨٤﴾البقرة، (سەلەمە) وتی: هەر کەسێک ویستبای بە ڕۆژوو نەبێت و فیدیە بدات، وای دەکرد، تاوەکو ئایەتی دواتر دابەزی و نەسخی کردەوە و حوکمەکەی هەڵوەشایەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی بەیانی دەکاتەوە بە بەڕۆژووبوونی سوننەت، دواتر دەیشکێنێت

١٧٨٢ - «عَنْ أُمِّ هَانِئٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَهِيَ صَائِمَةٌ، فَأُتِيَ بِإِنَاءٍ فَشَرِبَ ثُمَّ نَاوَلَهَا فَشَرِبَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنْ كَانَ قَضَاءَ رَمَضَانَ، فَصُومِي يَوْمًا آخَرَ، وَإِنْ كَانَ تَطَوُّعًا، فَإِنْ شِئْتِ فَاقْضِيهِ، وَإِنْ شِئْتِ فَلاَ تَقْضِيهِ»[٢].

واتە: لە ئوممو هانیئەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە لای لە کاتێکدا بەڕۆژوو بووە، جا قاپێک (شیری) بۆ هات و خواردیەوە دواتر دای بە (ئوممو هانیء) و ئەویش خواردیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قەزاکردنەوەی ڕەمەزانە (ڕۆژێت لەسەر ماوە) ئەوە ڕۆژێکی تر بەڕۆژووبە، وە ئەگەر ڕۆژووی سوننەتیشە، ئەوە ئەگەر حەزت کرد قەزای بکەرەوە، ئەگەریش حەزت کرد قەزای مەکەرەوە (چونکە قەزا کردنەوە واجب نیە بۆ ڕۆژووی سوننەت).

١٧٨٣ - «عَنْ أُمِّ هَانِئٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ جَاءَتْ فَاطِمَةُ فَجَلَسَتْ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَأُمُّ هَانِئٍ عَنْ يَمِينِهِ. قَالَتْ: فَجَاءَتِ الْوَلِيدَةُ بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَنَاوَلَتْهُ، فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ أُمَّ هَانِئٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ ثُمَّ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَقَدْ أَفْطَرْتُ، وَكُنْتُ صَائِمَةً. فَقَالَ لَهَا: أَكُنْتِ تَقْضِينَ شَيْئًا؟ قَالَتْ: لَا، قَالَ: فَلاَ يَضُرُّكِ: إِنْ كَانَ تَطَوُّعًا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَقُولُ بِهِ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن.

واتە: لە ئوممو هانیئەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ ڕۆژی ئازادکردن و فەتحی مەککە بوو، فاتیمە هات و لەلای چەپەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت، ئوممو هانیئیش لەلای ڕاستەی بوو، (ئوممو هانیء) دەڵێ: ئافرەتێکی کۆیلە بە قاپێک خواردنەوەوە هات و دای بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەری خواش ﷺ لێی خواردەوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ قاپە خواردنەوەکەی دا بە ئوممو هانیء و ئەویش لێی خواردەوە، دواتر (ئوممو هانیء) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژوەکەم شکاند بە ڕۆژوو بووم، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا ڕۆژوی واجبت قەزا دەکردەوە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زەرەرت لێ نادات ئەگەر (ڕۆژووی) سوننەت بێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: فەتوا بەوە دەدەم.

## بابەت: هەر کەسێک بانگکرا بۆ خواردن لە کاتێکدا بەڕۆژوو بوو، با بڵێت: من بەڕۆژووم

١٧٨٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە بانگکرا بۆ خواردنێک لەو کاتەدا بەڕۆژوو بوو، با بڵێت: من بەڕۆژووم.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژوەوان کاتێ خواردنی لەلا دەخورێت

١٧٨٥ - «عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ بِنْتِ كَعْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا، فَدَعَتْ لَهُ بِطَعَامٍ، فَقَالَ لَهَا: كُلِي فَقَالَتْ: إِنِّي صَائِمَةٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الصَّائِمَ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يَفْرُغُوا وَرُبَّمَا قَالَ: حَتَّى يَقْضُوا أَكْلَهُمْ»[٢].

واتە: لە ئوممو عەممارەی کچی کەعبەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە لای و ئەویش داوای خواردنی بۆ کردوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووە: بخۆ، (ئوممو عەممارەش) وتویەتی: من بەڕۆژووم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: کەسی ڕۆژوەوان کاتێ خواردنی لەلا خورا، فریشتە دووعای بۆ دەکەن تا کەسەکان لە خواردن دەبنەوە.

## بابەت: بەستانەوە و لکاندنی مانگی شەعبان بە مانگی ڕەمەزانەوە (بە ڕۆژوو گرتن)

١٧٨٦ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَامَ شَهْرًا تَامًّا إلاَّ شَعْبَانَ، فَإِنَّهُ كَانَ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ لِيَكُونَا شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، وَكَانَ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى نَقُولَ: لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ: لاَ يَصُومُ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، والحديث ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مانگێک بە تەواوی و تاسەر بە ڕۆژوو بێت جگە لە شەعبان، ئەو شەعبانی دەلکاند بە ڕەمەزانەوە تاوەکو ببن بە دوو مانگی (ڕۆژووی) لەدوای یەکتری بەردەوام، وە هەموو جار لە مانگێکدا ئەوەندە بە ڕۆژوو دەبوو تاوەکو دەمانوت: (ئەو مانگە) بێ ڕۆژوو نابێت، وە ئەوەندەش بێ ڕۆژوو دەبوو تاوەکو دەمانوت: بە ڕۆژوو نابێت.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕۆژوو گرتن دوای بە نیوەبوونی مانگی شەعبان

١٧٨٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا كَانَ النِّصْفُ مِنْ شَعْبَانَ، فَأَمْسِكُوا عَنِ الصَّوْمِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بوو بە نیوەی شەعبان، ئەوە واز بێنن لە ڕۆژوو.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە کەسێک ناگرێتەوە کە عادەتی خۆی هەبێ هەموو دوشەم و پێنجشەمەیەک بەڕۆژوو بێت، یان ڕۆژێک نا ڕۆژێک بەڕۆژوو بێت، یان کۆتاییەکانی مانگ بە ڕۆژوو بێت، بۆ ئەو مەکروە نیە و ئاساییە، بۆ خەڵکی تریش کە عادەتی بەردەوامی ڕۆژوو گرتنی خۆی نیە، لەو حاڵەتە بۆی حەرامە ئەگەر ڕۆژوی شەعبان بلکێنێت بە ڕەمەزانەوە، بەڵام ئەگەر ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ پێشی ڕەمەزان بەڕۆژوو نەبێت ئەوە فەرموودەکانی جێبەجێ کردوە و تووشی هیچ مەکروهی و حەرامێک نەبووە، وەک لە فەرموودەیتردا هاتووە.

١٧٨٨ - «أَخْبَرَنَا الْحَكَمُ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ الْعَلَاءِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ نَحْوَ هَذَا»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

## بابەت: ڕۆژوو گرتن لە کۆتایی مانگدا

١٧٨٩ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: هَلْ صُمْتَ مِنْ سَرَرِ هَذَا الشَّهْرِ؟ فَقَالَ: لَا. قَالَ: فَإِذَا أَفْطَرْتَ مِنْ رَمَضَانَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ»[٣].

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی وت: ئایا لە کۆتایی ئەم مانگە (واتە: مانگی شەعبان) بەڕۆژوو بوویت؟ ئەویش وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ﷺ فەرمووی: ئەگەر لە ڕەمەزاندا ڕۆژووت خواردوە ئەوە دوو ڕۆژ بە ڕۆژووبە (لە کۆتایی شەعبان، چونکە ڕۆژوو گرتنی کۆتایی شەعبان بۆ قەزاکردنەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان و گرتنی ڕۆژووی نەزر ئاساییە).

## بابەت: دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ

١٧٩٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَا صَامَ النَّبِيُّ ﷺ شَهْرًا كَامِلاً غَيْرَ رَمَضَانَ، وَإِنْ كَانَ لَيَصُومُ إِذَا صَامَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: لاَ وَاللهِ لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ إِذَا أَفْطَرَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: لاَ وَاللهِ لاَ يَصُومُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مانگێک بە تەواوی و تاسەر بەڕۆژوو نەبووە، هەرچەندە بەڕۆژوو دەبوو، (بەشێوەیەک) کاتێ بەڕۆژوو دەبوو (ئەوەندە بە ڕۆژوو دەبوو) تاوەکو کەسێک دەیوت: نەخێر سوێند بە خوا (ئەم مانگە) هیچی لێ ناخوا، وە کاتێ بەڕۆژووش نەدەبوو، (ئەوەندە بێ ڕۆژوو دەبوو) تاوەکو کەسێک دەیوت: نەخێر سوێند بە خوا (ئەم مانگە) هیچی لێ بەڕۆژوو نابێت (بەڵام لە هەردوو حاڵەت لە کۆتاییەکەی پێچەوانەی دەکردەوە).

## بابەت: نەهی کردن لە بەڕۆژووبوونی ساڵ (بە تەواوی)

١٧٩١ - «عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ رَجُلٌ يَصُومُ الدَّهْرَ، فَقَالَ: لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ»[٢].

واتە: لە موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێک کرا کە هەموو ڕۆژەکانی ساڵ بەڕۆژوو دەبێت، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: نە بەڕۆژوو بووە و نە بێ ڕۆژووش بووە (واتە: هیچ پاداشتی بۆ نیە، کەواتە وەک ئەوە وایە بە ڕۆژوو نەبووبێت).

## بابەت: دەربارەی ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە گشت مانگێکدا

١٧٩٢ - «حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلاَثٍ لَسْتُ بِتَارِكِهِنَّ: أَنْ لاَ أَنَامَ إلاَّ عَلَى وِتْرٍ، وَأَنْ أَصُومَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَأَنْ لاَ أَدَعَ رَكْعَتَيِ الضُّحَى»[٣].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی ئەبو سولەیمانەوە گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە ئەبو هوڕەیرە بووە ﷺ کە دەیوت: خۆشەویستەکەم (پێغەمبەری خوا ﷺ) وەسیەتی بۆ کردووم بە سێ شت، وازیان لێ ناهێنم

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(شتەکانیش ئەمانەن): نەخەوم تەنها دوای ویتر کردن نەبێت، وە سێ ڕۆژانیش بەڕۆژووبم لە گشت مانگێکدا، وە واز لە دوو ڕەکعەتی سوننەتی چێشتەنگاویش نەهێنم.

١٧٩٣ - «أَخْبَرَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبَّاسٍ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ نَحْوَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٧٩٤ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صِيَامُ الْبِيضِ صِيَامُ الدَّهْرِ وَإِفْطَارُهُ»[٢].

واتە: لە موعاویەی کوڕی قوڕڕەتەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕۆژوو بوونی بِيض (واتە: بە ڕۆژووبوونی ئەو ڕۆژانەی شەوەکانیان ڕووناکە، واتە: سێزدە و چواردە و پازدەی هەموو مانگێک) وەک بەڕۆژووبوونی هەموو ساڵەک وایە و ڕۆژوو نەگرتنیشە (واتە: ساڵەکەی هیچی بە ڕۆژوو نابی جگە لە (٣٦) ڕۆژی سوننەت کە کۆکراوەی سێ ڕۆژە لە دووانزە مانگدا، کەچی خێری ڕۆژووی ساڵێکت دەگات، کەواتە هەم ڕۆژوو گرتنی سەرتانسەریە (لە ڕووی پاداشتەوە)، هەم ڕۆژوو نەگرتنیشە، چونکە زۆربەی ساڵ بەڕۆژوو نیت).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی هەینی

١٧٩٥ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرٍ ﷺ أَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: نَعم وَرَبِّ هَذَا الْبَيْتِ»[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە جابرم وت ﷺ (لە کاتی تەواف کردندا): ئایا پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە بەڕۆژووبوونی ڕۆژی هەینی؟ وتی: بەڵێ، سوێند بە پەروەردگاری ئەو ماڵە (کەعبە).

تێبینی: تەنها بۆ کەسێک نەهی لێ کراوە کە ڕۆژی هەینی تایبەت بکات بە ڕۆژوو گرتن، بەڵام ئەگەر تایبەتی نەکات و کەوتە ڕۆژانی سوننەتی عادەتی خۆی ئەوە کێشە نیە، بەڵام ئەصل وایە ڕۆژی هەینی جەژنی حەفتانەی مسوڵمانان بێت و خواردنی تیا بخورێ تا باشتر و بەهێزەوە عیبادەتەکانی ئەو ڕۆژە ئەنجام بدرێت.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی شەممە

١٧٩٦ - «عن عَبْدُ اللهِ بْنُ بُسْرٍ، عَنْ أُخْتِهِ يُقَالُ لَهَا الصَّمَّاءُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ، إلاَّ فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إلاَّ كَذَا، أَوْ لِحَاءَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضَغْهُ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی بوسڕەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە خوشكی گێڕاویەتیەوە كە پێی دەوترا: صەمماء (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی شەممە بەڕۆژوو مەبن، تەنها لەو ڕۆژانەی لەسەرتان واجب كراوە (وەک شەممەكانی ڕەمەزان و نەزر)، وە ئەگەر یەكێک لە ئێوە هیچی دەست نەكەوت تەنها ئەمە نەبێت (ئاماژەی بۆ توێكڵی دار كرد) ئەوە با بیجوێت (واتە: گرنگ ئەوەیە شتێک بخوات و ڕۆژووەكە بشكێنێ).

تێبینی: مەبەست لە مەكڕوهی ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی شەممە بریتیە لە تایبەت كردنی ئەو ڕۆژە بە تەنها.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی دوو شەم و پێنجشەم

١٧٩٧ - «أَنَّ مَوْلَى أُسَامَةَ، حَدَّثَهُ قَالَ: كَانَ أُسَامَةُ يَرْكَبُ إِلَى مالَ لَهُ بِوَادِي الْقُرَى، فَيَصُومُ الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ فِي الطَّرِيقِ، فَقُلْتُ لَهُ لِمَ تَصُومُ الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ فِي السَّفَرِ، وَقَدْ كَبِرْتَ وَضَعُفْتَ أَوْ رَقِقْتَ؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ، وَقَالَ: إِنَّ أَعْمالَ النَّاسِ تُعْرَضُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[١].

واتە: لە خزمەتكاری ئوسامەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئوسامە سواری وڵاغەكەی دەبوو (دەڕۆیشت) بۆ لای ئاژەڵەكانی لە وادی قوڕا (كە دۆڵێكە لە نزیک مەدینە)، جا دووشەم و پێنجشەم بە ڕۆژوو دەبوو لەم ڕێگایە، منیش پێم وت: بۆچی دووشەم و پێنجشەم بە ڕۆژوو دەبیت لە سەفەردا لە كاتێكدا بەساڵاچووی و بێ هێز، یان لاواز، بوویت؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دووشەم و پێنجشەم بەڕۆژوو دەبوو و فەرموویەتی: كردەوەكانی خەڵک نیشان دەدرێن و (مەلەفەكانیان واڵا دەكرێنەوە) لە ڕۆژی دووشەم و پێنجشەمدا.

١٧٩٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَصُومُ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: إِنَّ الأَعْمالَ تُعْرَضُ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو جار دووشەم و پێنجشەم بە ڕۆژوو دەبوو، منیش پرسیارم لێ كرد (كە هۆكار چیە)؟ ئەویش فەرمووی: كردەوەكان نیشان دەدرێن و (مەلەفەكان واڵا دەكرێنەوە) لە ڕۆژی دووشەم و پێنجشەمدا.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژووگرتنی پێغەمبەر داوود

١٧٩٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ يَرْفَعُهُ قَالَ: أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ صِيَامُ دَاوُدَ، كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَأَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ صَلاَةُ دَاوُدَ، كَانَ يُصَلِّي نِصْفًا، وَيَنَامُ ثُلُثًا، وَيُسَبِّحُ سُدُسًا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هَذَا اللَّفْظُ الأَخِيرُ غَلَطٌ، أَوْ خَطأٌ إِنَّمَا هُوَ أَنَّهُ كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيُصَلِّي ثُلُثَهُ، وَيُسَبِّحُ سُدُسَهُ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، والموفوع منه صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، والحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرموویەتی: خۆشەویست ترین ڕۆژوو لای خوای زاڵی پایەدار ڕۆژووی پێغەمبەر داوودە ﷺ، هەموو جار ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو و ڕۆژێکیشی دەیخوارد و بە ڕۆژوو نەدەبوو (واتە: ڕۆژێک نا ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو)، وە خۆشەویست ترین نوێژ لای خوای زاڵی پایەدار نوێژی پێغەمبەر داوودە ﷺ، ((هەموو جار تا نیوەی شەو نوێژی دەکرد و، سێ یەکیش دەخەوت و، شەش یەکیش تەسبیحاتی دەکرد)).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەو وتەیەی کۆتایی (کە لەناو جووت کەوانەیە) هەڵەیە، بەڵکو ئەو تا نیوەی شەو دەخەوت و، سێ یەکیش نوێژی دەکرد و، شەش یەکیش تەسبیحاتی دەکرد.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕۆژوو گرتن ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان

١٨٠٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ صَوْمَ يَوْمَيْنِ: يَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ النَّحْرِ»[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو گرتن لە دوو ڕۆژاندا (دروست) نیە: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژووگرتنی شەش ڕۆژەکانی مانگی شەووال

١٨٠١ - «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتَّةً مِنْ شَوَّالٍ، فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ»[٢].

واتە: لە ئەبو ئەییوبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک (مانگی) ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت، دواتر شەش ڕۆژانی لەدوا بگرێت لە شەووال (شەشەران)، ئەوە ڕۆژووی ئەو ساڵەیە بە تەواوی (واتە: پاداشتەکەی وەک ئەوە وایە هەموو ڕۆژێکی ساڵەکە بە ڕۆژوو بوویێت).

١٨٠٢ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: صِيَامُ شَهْرٍ بِعَشَرَةِ أَشْهُرٍ، وَسِتَّةِ أَيَّامٍ بَعْدَهُنَّ بِشَهْرَيْنِ، فَذَلِكَ تَمَامُ سَنَةٍ» يَعْنِي: شَهْرَ رَمَضَانَ، وَسِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَهُ»[٣].

واتە: لە ثەوبانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووی مانگێک بە (ڕۆژووی) دە مانگە (پاداشتەکەی)، وە شەش ڕۆژی دوای ئەوانیش بە (ڕۆژووی) دوو مانگە (پاداشتەکەی)، ئەوە ساڵێکی تەواو، واتە: مانگی ڕەمەزان و شەش ڕۆژی دوای ئەو لە شەشەڵان (دەکاتە پاداشتی ڕۆژوی ساڵێک).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، والحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژووی (مانگی) موحەڕڕەم

١٨٠٣ - «عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَلِيٍّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ شَهْرٍ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ يَصُومُهُ، فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ: مَا سَأَلَنِي أَحَدٌ عَنْ هَذَا بَعْدَ إِذْ سَمِعْتُ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، أَيُّ شَهْرٍ يَصُومُهُ مِنَ السَّنَةِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ؟ فَأَمَرَهُ بِصِيَامِ الْمُحَرَّمِ، وَقَالَ: إِنَّ فِيهِ يَوْمًا تَابَ اللهُ عَلَى قَوْمٍ، وَيَتُوبُ فِيهِ عَلَى قَوْمٍ»[١].

واتە: لە نوعمانی کوڕی سەعدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای (ئیمامی) عەلی ﷺ، پرسیاری لێ کرد دەربارەی مانگێک جگە لە ڕەمەزان (تیایدا بە ڕۆژوو بێت)، عەلیش پێی وت: هیچ کەسێک پرسیاری لێ نەکردووم دەربارەی ئەمە دوای ئەو کاتەی گوێم لە پیاوێک بوو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد وتی: کام مانگ بە ڕۆژووبم لە ساڵدا جگە لە ڕەمەزان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد بە ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەم و فەرمووی: مانگی موحەڕڕەم ڕۆژێکی تیایە خوا لە گەلێك و خەڵکانێک خۆش بووە (تیایدا)، وە لە خەڵکانێکیش خۆش دەبێت تیایدا (بە بەردەوام).

١٨٠٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الَّذِي تَدْعُونَهُ الْمُحَرَّمَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترین و گەورەترین ڕۆژوو دوای مانگی ڕەمەزان مانگی خوایە کە پێی دەڵێن: موحەڕڕەم.

١٨٠٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ الْمُحَرَّمُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و گەورەترین ڕۆژوو دوای مانگی ڕەمەزان (ڕۆژووی مانگی) موحەڕڕەمە.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا

١٨٠٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَالْيَهُودُ يَصُومُونَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَسَأَلَهُمْ، فَقَالُوا: هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي ظَهَرَ فِيهِ مُوسَى عَلَى فِرْعَوْنَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْتُمْ أَوْلَى بِمُوسَى فَصُومُوهُ»[٤].

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، لە کاتێکدا جوولەکەکان ڕۆژی عاشوڕا بە ڕۆژوو دەبوون، پێغەمبەری خواش ﷺ پرسیاری لێ کردن (کە ئایا بۆچی بەڕۆژوو دەبن)، ئەوانیش وتیان: ئەم ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەر موسا ﷺ بەسەر فیرعەوندا زاڵ بوو (ئەو کاتەی خۆی و شوێنکەوتووانی ڕزگاریان بوو و فیرعەون و شوێنکەوتووانیشی نوقمی ئاو و سزای خوا بوون)، پێغەمبەری خواش ﷺ (بە مسوڵمانانی) فەرمووی: ئێوە ئەولاتر و نزیکترن لە موسا ﷺ کەواتە ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبن.

١٨٠٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَيَأْمُرُ بِصِيَامِهِ»(١).

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووی عاشوڕای دەگرت و فەرمانیشی بەڕۆژوو گرتنی دەکرد.

١٨٠٨ - «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ: إِنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ كَانَ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيَصُمْهُ»(٢).

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی عاشوڕادا پیاوێکی عەشیرەتی ئەسلەمی نارد (تاوەکو بە خەڵکی بڵێت): ئەمڕۆ ڕۆژی عاشوڕایە، جا هەر کەسێک (ئەمڕۆ) خواردوویەتی یان خواردویەتیەوە، با ئەوەندەی ماوە ڕۆژووەکەی تەواو بکات (چیتر شت نەخوات و نەخواتەوە)، وە هەر کەسێکیش نەیخواردووە و نەیخواردۆتەوە ئەوە با بەڕۆژوو بێت.

١٨٠٩ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَذَا يَوْمُ عَاشُورَاءَ كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصُومُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَصُومَهُ فَلْيَصُمْهُ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَتْرُكَهُ فَلْيَتْرُكْهُ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يَصُومُهُ إِلاَّ أَنْ يُوَافِقَ صِيَامَهُ»(٣).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوە ڕۆژی عاشوڕایە، قوڕەیشیەکان تیایدا بە ڕۆژوو دەبوون، جا هەر کەسێک حەز دەکات بیگرێت و تیایدا بەڕۆژوو بێت با بە ڕۆژوو بێت، وە هەر کەسێکیش حەزی کرد نەیگرێت و تیایدا بەڕۆژوو نەبێت ئەوە با نەیگرێت و وازی لێ بهێنێت، وە ئیبنو عومەر تیایدا بە ڕۆژوو نەدەبوو، تەنها ئەگەر ڕێککەوتبا لەگەڵ عادەتی ڕۆژووەکانی (ئنجا تیایدا بەڕۆژوو دەبوو).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ رجاله ثقات، والحديث صحيح.

١٨١٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، حَتَّى إِذَا فُرِضَ رَمَضَانُ كَانَ رَمَضَانُ هُوَ الْفَرِيضَةُ وَتُرِكَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ»(١).

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ڕۆژی عاشورا ڕۆژێک بوو قورەیشیەکان تیایدا بەڕۆژوو دەبوون، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە (تیایدا) بەڕۆژوو بوو و فەرمانیشی کرد بە گرتن و بە ڕۆژوو بوونی، تا ئەو کاتەی ڕەمەزان واجب کرا، ڕەمەزان بوو بە واجب و ڕۆژی عاشوڕاش واز لێ هێنرا، هەر کەسێک حەزی کردبووایە دەیگرت و بە ڕۆژوو دەبوو، ئەوەی حەزیشی کردبووایە (نەیگرێت) نەیدەگرت و بەڕۆژوو نەدەبوو.

## بابەت: دەربارەی ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی عەرەفە

١٨١١ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَوْمُ عَرَفَةَ، وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»(٢).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی عەرەفە و ئەییامول تەشریق (واتە یازدە و دوازدە و سێزدەی مانگی ذي الحجة، واتە سێ ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان) جەژنی ئێمەن ئەی خەڵکی ئیسلام، وە ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

تێبینی: جەژنی قوربان چوار ڕۆژ نیە وەک لەلای خەڵکی باوە، بەڵکو یەک ڕۆژە و سێ ڕۆژەکەی دوای ئەو (أَيَّامُ التَّشْرِيقِ)ە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لەویش ناوە جەژن.

١٨١٢ - «حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ، فَقَالَ: حَجَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَحَجَجْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَحَجَجْتُ مَعَ عُمَرَ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَحَجَجْتُ مَعَ عُثْمَانَ فَلَمْ يَصُمْهُ، وَأَنَا لاَ أَصُومُهُ وَلاَ آمُرُ بِهِ وَلاَ أَنْهَى عَنْهُ»(٣).

واتە: لە ئیبنو ئەبی نەجیحەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پرسیار لە ئیبنو عومەر کرا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەربارەی ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی عەرەفە، ئەویش وتی: حەجم کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و بە ڕۆژوو نەبوو، وە حەجم کرد لەگەڵ ئەبوبەکر و بەڕۆژوو نەبوو، وە حەجم کرد لەگەڵ عومەر و بەڕۆژوو نەبوو، وە حەجم کرد لەگەڵ عوسمان و بەڕۆژوو نەبوو، وە من نایگرم و تیایدا بەڕۆژوو نابم و فەرمانیشی پێ ناکەم و نەهیشی لێ ناکەم.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕۆژوو گرتنی ئەییامول تەشریق
## (سێ ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان)

١٨١٣ - «عَنْ بِشْرِ بْنِ سُحَيْمٍ، أن رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَهُ أَوْ أَمَرَ رَجُلاً يُنَادِي أَيَّامَ التَّشْرِيقِ أَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إلاَّ مُؤْمِنٌ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[١].

واتە: لە بیشری کوڕی سوحەیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەو کردوە یان فەرمانی بە پیاوێک کرد بانگ بکات لە ڕۆژانی تەشریقدا (واتە: لە یازدە و دوازدە و سێزدەی مانگی ذي الحجة، واتە سێ ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان) و (تا بە خەڵکی بڵێت): بە دڵنیایی کەس ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە بڕوادار، ئەو سێ ڕۆژانەش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن (ڕۆژانی ڕۆژوو گرتن نین).

١٨١٤ - «عَنْ أَبِي مُرَّةَ، مَوْلَى عَقِيلٍ أَنَّهُ دَخَلَ هُوَ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو عَلَى عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ وَذَلِكَ الْغَدَ، أَوْ بَعْدَ الْغَدِ، مِنْ يَوْمِ الأَضْحَى، فَقَرَّبَ إِلَيْهِمْ عَمْرٌو طَعَامًا، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عَمْرٌو: أَفْطِرْ، فَإِنَّ هَذِهِ الأَيَّامَ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُنَا بِفِطْرِهَا وَيَنْهَانَا عَنْ صِيَامِهَا، فَأَفْطَرَ عَبْدُ اللهِ فَأَكَلَ وَأَكَلْتُ مَعَهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو موڕڕەی خزمەتکاری عەقیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆی و عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ چوونەتە لای عەمرِی کوڕی عاص ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ پاشی ڕۆژی جەژنی قوربان، (عەمرِی کوڕی عاصیش) خواردنێکی لێ نزیک خستنەوە (تاوەکو بیخۆن)، عەبدوڵلاش وتی: من بە ڕۆژووم، عەمرِیش وتی: (ڕۆژووەکەت) بشکێنە، چونکە ئەم ڕۆژانە (ئەم سێ ڕۆژانەی ئەییامول تەشریق) ڕۆژانێکن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین بە بەڕۆژوو نەبوون، وە نەهی لێ دەکردین لە ڕۆژوو گرتنی ئەم ڕۆژانە، جا عەبدوڵلا ڕۆژووەکەی شکاند و (خواردنەکەی) خوارد، منیش لەگەڵم خوارد.

## بابەت: ئەو کەسەی وەفات دەکات و ڕۆژووی لەسەرە

١٨١٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ امْرَأَةً نَذَرَتْ أَنْ تَصُومَ، فَمَاتَتْ فَجَاءَ أَخُوهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ كَانَ عَلَيْهَا دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟ قَالَ: نَعم. قَالَ: فَاقْضُوا اللهَ، اللهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ. قَالَ: فَصَامَ عَنْهَا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، کە ئافرەتێک نەزری کردبوو کە بەڕۆژوو بێت، جا وەفاتی کرد و (نەیتوانی ڕۆژووەکەی بگرێت)، جا براکەی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەوە (کە ئایا چی بکات)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر قەرزی (پارە و شتی ماددی خەڵکی لەسەر بووایە) ئایا تۆ دەتدایەوە (بۆت هەبوو بیدەیتەوە)؟ (براکەی) وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە قەرزی خوا بدەنەوە، خوا شایستەترە قەرزەکانی بدرێنەوە، (ئیبنو عەبباس) دەڵێت: جا براکەی لە جیاتی ئەو بەرۆژوو بوو.

## بابەت: دەربارەی پاداشت و گەورەیی ڕۆژوەوان

١٨١٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ، وَفَرْحَةٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی گۆڕانی بۆنی دەمی کەسی ڕۆژوەوان باشترە (پاداشتەکەی) لای خوا لە بۆنی میسک (کاتێ سوننەتە لەخۆ بدرێت لە جومعە و جەژن و کاتە سوننەتەکان)، وە بۆ کەسی ڕۆژوەوان دوو خۆشی هەیە: خۆشییەک لە کاتی فتارکردنەوەی، وە خۆشییەکیش لە ڕۆژی دواییدا (کە پاداشتی سەرسامکەری ڕۆژووەکانی وەردەگرێت).

١٨١٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ: فَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، إلاَّ الصِّيَامَ هُوَ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، إِنَّهُ يَتْرُكُ الطَّعَامَ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي، وَيَتْرُكُ الشَّرَابَ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي، فَهُوَ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز فەرموویەتی: هەموو کردەوەکانی نەوەی ئادەم (مرۆڤ) بۆ خۆیەتی، یەک کردەوەی چاک بە دە ئەوەندەیەتی تاوەکو حەوت سەد ئەوەندە، تەنها ڕۆژوو نەبێت ئەو بۆ منە، وە هەر خۆشم پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوەوان وازی لە خواردن و ئارەزووەکانی هێناوە لە پێناوی من، وە وازی لە خواردنەوە و ئارەزووەکانی هێناوە لە پێناوی من، کەواتە ڕۆژوەکە بۆ منە وە هەر خۆشم پاداشتی دەدەمەوە.

١٨١٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە (واتە: لە دونیادا قەڵغانە لە خراپە و شەهوەت دەتپارێزێت، لە دوارۆژیشدا قەڵغانە لە سزای دۆزەخ دەتپارێزێت).

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دووعای ڕۆژووەوان بۆ ئەو كەسانەی ئەو فتاریان لەلا دەكاتەوە

١٨١٩ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَفْطَرَ عِنْدَ النَّاسِ، قَالَ: أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ، وَتَنَزَّلَتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ»[1].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ فتاری لەلای خەڵكی دەكردەوە دەیفەرموو: ڕۆژووەوانان فتاریان لای ئێوە كردەوە، وە چاكەكاران خواردنەكەی ئێوەیان خوارد، وە فریشتەتان بەسەر دابەزین (واتە: بەو مواسەفاتانەوە دیارە بە دڵنیایی پاداشتەكەتان زۆر و زەوەند و گەورەیە).

## بابەت: دەربارەی ئەجر و گەورەیی دە ڕۆژەكانی ذي الحجة

١٨٢٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا الْعَمَلُ، فِي أَيَّامٍ أَفْضَلَ مِنَ الْعَمَلِ فِي عَشْرِ ذِي الْحِجَّةِ. قِيلَ: وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ، إلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمالَهِ ثُمَّ لَمْ يَرْجِعْ بِشَيْءٍ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: هیچ كردەوەیەک نیە لە چەند ڕۆژێكدا چاكتر و گەورەتربن لە كردەوەكانی دە ڕۆژەكانی (مانگی) ذي الحجة، وترا: هەتا جیهاد و تێكۆشانیش لە پێناوی خوادا لەوە گەورەتر نیە؟ فەرمووی: هەتا جیهاد و تێكۆشانیش لە پێناوی خوادا، تەنها (جیهادی) پیاوێک نەبێت كە دەردەچێت بە خودی خۆی و ماڵەكەی، دواتر هیچی ناگەڕێتەوە (واتە: نە بەخۆی و نە ماڵەكەشی ناگەڕێتەوە).

١٨٢١ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ عَمَلٍ أَزْكَى عِنْدَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلاَ أَعْظَمَ أَجْرًا مِنْ خَيْرٍ يَعْمَلُهُ فِي عَشْرِ الأَضْحَى قِيلَ: وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ قَالَ: وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ إلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمالَهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ»[3].

قَالَ: وَكَانَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ إِذَا دَخَلَ أَيَّامُ الْعَشْرِ اجْتَهَدَ اجْتِهَادًا شَدِيدًا حَتَّى مَا يَكَادُ يَقْدِرُ عَلَيْهِ .

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: هیچ كردەوەیەک نیە چاكتر و پاكتر بێت لای خوا، وە پاداشتی گەورەتر بێت، لە چاكەیەک كە مرۆڤ بیكات لە دە ڕۆژی مانگی قورباندا، وترا: هەتا جیهاد و تێكۆشانیش لە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

پێناوی خوادا؟ فەرمووی: هەتا جیهاد و تێکۆشانیش لە پێناوی خوادا، تەنها (جیهادی) پیاوێک نەبێت کە دەردەچێت بە خودی خۆی و ماڵەکەی، دواتر هیچی ناگەڕێتەوە.

دەڵێ: هەموو جار سەعیدی کوڕی جوبەیر کاتێ دەکەوتە ناو ئەم دەڕۆژانە، خۆی ماندوو دەکرد (بۆ عیبادەت) خۆماندوو کردنێکی زۆر، تاوەکو نزیک بوو توانای بەسەردا نەشکێ.

## بابەت: دەربارەی پاداشت و گەورەیی مانگی ڕەمەزان

١٨٢٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ، فُتِحَتْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ڕەمەزان دێت، دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە، وە دەرگاکانی ئاگری دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەکانیش زنجیر دەکرێن.

## بابەت: دەربارەی پاداشت و گەورەیی شەونوێژ و تەڕاویحی ڕەمەزان

١٨٢٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شەوانی ڕەمەزان شەونوێژ و تەڕاویح بکات بە بڕوا و چاوبڕینە پاداشتەوە، ئەوە لە هەموو تاوانەکانی پێشووی دەبوردرێت، وە هەر کەسێکیش لە شەوی قەدردا شەونوێژ بکات و (شەوەکە زیندوو بکاتەوە بە عیبادەت)، ئەوە لە هەموو تاوانەکانی پێشووی دەبوردرێت.

١٨٢٤ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَهْرَ رَمَضَانَ، قَالَ: فَلَمْ يَقُمْ بِنَا مِنَ الشَّهْرِ شَيْئًا حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ. قَالَ: فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَتِ السَّادِسَةُ، لَمْ يَقُمْ بِنَا، فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ، قَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ الْآخِرُ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ نَفَّلْتَنَا بَقِيَّةَ هَذِهِ اللَّيْلَةِ فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا قَامَ مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ مِنْ صَلَاتِهِ، حُسِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ الرَّابِعَةُ، لَمْ يَقُمْ بِنَا، فَلَمَّا كَانَتِ الثَّالِثَةُ، جَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ وَالنَّاسَ فَقَامَ بِنَا حَتَّى خَشِينَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ قُلْنَا: وَمَا الْفَلَاحُ قَالَ: السُّحُورُ، قَالَ: ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا بَقِيَّةَ الشَّهْرِ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژووی ڕەمەزانمان گرت، جا لە هیچ یەکێک لە شەوەکانی ڕەمەزاندا شەونوێژی پێ نەکردین (بە کۆمەڵ)، تاوەکو حەوت شەو (لە مانگەکەدا) ما بوون، دەڵێ: (لە شەوی حەوتەمی کۆتایی مانگدا) شەونوێژی پێ کردین تاوەکو سێیەکی شەو تێپەڕی، دەڵێ: جا کاتێ بوو بە شەشەم شەو شەونوێژی پێ نەکردین، وە کە بوو بە پێنجەم (شەو) شەونوێژی پێ کردین تاوەکو نیوەی شەو تێپەڕی، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (چەند چاک بوو) ئەگەر سوننەتت پێ کردبایە ئەو ماوەی لەم شەوەدا ماوە، ئەویش فەرمووی: مرۆڤ ئەگەر شەونوێژی کرد لەگەڵ ئیمامدا تاوەکو ئیمام لە نوێژەکانی دەبێتەوە، ئەوە بە شەونوێژی گشت شەوەکە بۆی ئەژمار دەکرێت (کەواتە: پاداشتی شەونوێژی گشت شەوەکەتان بۆ نوسراوە)، جا کە بوو بە چوارەم شەو، شەونوێژی پێ نەکردین، جا کە بوو بە سێیەم شەو خانەوادە و خێزانەکانی و خەڵکی کۆکردەوە و شەونوێژی پێ کردین تاوەکو ترساین فەلاحمان لە کیس بچێت و بفەوتێت، وتمان (بە ئەبو زەڕ): فەلاح چیە؟ وتی: پارشێوە، دەڵێ: دواتر شەونوێژی پێ نەکردین لەو شەوانەی مابوون لە مانگەکەدا.

**١٨٢٥** - «حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ دَاوُدَ، عَنِ الْوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْجُرَشِيِّ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ الْحَضْرَمِيِّ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ نَحْوَهُ ﷺ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ئیعتیکافی پێغەمبەری خوا ﷺ

**١٨٢٦** - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە شەوەکانی کۆتایی (ڕەمەزاندا) ئیعتیکافی دەکرد (واتە: بە نیەتی پەرستش کردن لە مزگەوت دەمایەوە)، جا لەو ساڵەی تیایدا وەفاتی کرد بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد.

**١٨٢٧** - «أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ، أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيَّ رَضِيَ اللهُ عَنْهَم، أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا، جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، ثُمَّ قَامَتْ»[٣].

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: صەفییەی کچی حویەی (رَضِيَ اللهُ عَنْها)، بۆی گێڕاوەتەوە کە چۆتە لای پێغەمبەر ﷺ، سەردانی کردوە لە ئیعتیکافەکەی لە مزگەوتدا لە دە ڕۆژەکانی کۆتایی ڕەمەزاندا و ماوەیەک گفتوگۆی لەلا کردوە، دواتر هەڵساوە (ڕۆیشتووە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی شەوی قەدر

١٨٢٨ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُخْبِرَنَا بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَتَلَاحَى رَجُلَانِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي خَرَجْتُ إِلَيْكُمْ، وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُخْبِرَكُمْ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَكَانَ بَيْنَ فُلَانٍ وَفُلَانٍ لِحَاءٌ فَرُفِعَتْ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرًا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ: فِي الْخَامِسَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالتَّاسِعَةِ»[١].

واتە: لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ لامان لە كاتێكدا دەیەویست شەوی قەدرمان پێ ڕابگەیەنێت، دوو كەسیش لە مسوڵمانان كێشە و دەمەقاڵیان لەگەڵ یەكتری كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: من دەرچووم بۆ لاتان، لە كاتێكدا دەمەویست شەوی قەدرتان پێ ڕابگەیەنم، وە لە نێوان فلان و فلانیش كێشە و دەمەقاڵی هەبوو، بۆیە (زانیاریەكە دەربارەی شەوی قەدر) هەڵگیرایەوە و (بیرم بردرایەوە)، دەی بەڵكو خێری تیا بێت، كەواتە بەدوایدا بگەڕێن لە دە شەوەكانی كۆتایی: لە پێنجەم و حەوتەم و نۆیەم (واتە: لە بیست و پێنج و، بیست و حەوت و، بیست و نۆی دە شەوەكانی كۆتایی بەدوایدا بگەڕێن).

١٨٢٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أَيْقَظَنِي بَعْضُ أَهْلِي فَنَسِيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْغَوَابِرِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەوی قەدرم لە خەو بینی، دواتر یەكێك لە خێزانەكانم خەبەری كردمەوە و بیرم چوویەوە، كەواتە بەدوایدا بگەڕێن لە دە شەوەكانی كە ماون (واتە: لە دە شەوەكانی كۆتایی).

١٨٣٠ - «أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْتَمِسُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن لە حەوت شەوەكانی كۆتایی.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: هەر كەسێک دەیەوێت حەج بكات با پەلە بكات

١٨٣١ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ فَلْيَتَعَجَّلْ»(١).

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک دەیەوێت حەج بكات با پەلە بكات.

## بابەت: ئەو كەسەی مردووە و حەجی نەكردوە

١٨٣٢ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ لَمْ يَمْنَعْهُ عَنِ الْحَجِّ حَاجَةٌ ظَاهِرَةٌ، أَوْ سُلْطَانٌ جَائِرٌ، أَوْ مَرَضٌ حَابِسٌ فَمَاتَ وَلَمْ يَحُجَّ، فَلْيَمُتْ إِنْ شَاءَ يَهُودِيًّا، وَإِنْ شَاءَ نَصْرَانِيًّا»(٢).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک پێویستییەكی دیار و ڕوون، یان كاربەدەستێكی زاڵم یان نەخۆشییەكی قەتیسكەر ڕێگری لێ نەكردبێت لە حەج كردن و، كەسەكەش مردبێت و حەجی نەكردبێت، ئەگەر حەز بكات با بە یەهودی بمرێت، ئەگەر حەزیش دەكات با بە گاوری بمرێت (واتە: یان بە یەهودی یان بە گاوری دەمرێت، جا با یەكیان هەڵبژێرێت).

## بابەت: دەربارەی تاكە حەجەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ

١٨٣٣ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﷺ يَقُولُ: حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ هِجْرَتِهِ حَجَّةً، قَالَ: وَقَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: حَجَّ قَبْلَ هِجْرَتِهِ حَجَّةً»(٣).

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە زەیدی كوڕی ئەرقەم ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەجی كرد دوای كۆچ كردنی (بۆ مەدینە) یەک حەج، (زوهری) دەڵێت: ئەبو ئیسحاق وتویەتی: پێشی كۆچ كردنیشی حەجێكی كردوە.

تێبینی: قسەی كۆتایی ئەبو ئیسحاق دەقیق نیە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی كۆچ كردنی دوو حەجی كردوە، نەوەک یەک حەج، وەک زانایان فەرموویانە و لە كتێبەكانی فەرموودەدا هاتووە.

١٨٣٤ - «حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسٍ ﷺ: كَمْ حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: حَجَّةً وَاحِدَةً، وَاعْتَمَرَ أَرْبَعًا: عُمْرَتُهُ الْأُولَى الَّتِي صَدَّهُ الْمُشْرِكُونَ عَنِ الْبَيْتِ، وَعُمْرَتُهُ الثَّانِيَةُ حِينَ صَالَحُوهُ فَرَجَعَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ، وَعُمْرَتُهُ مِنَ الْجِعْرَانَةِ حِينَ قَسَّمَ غَنِيمَةَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَتُهُ مَعَ حَجَّتِهِ»(٤).

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئەنەسم ﷺ وت: پێغەمبەر ﷺ چەند حەجی کردوە؟ وتی: یەک حەج و، چوار عومرەشی کردوە: عومرەی یەکەمی ئەوەبوو کە موشریکەکان ڕێگریان لێ کرد لە کەعبە، وە عومرەی دووەمی ئەو کاتە بوو کە صولح و ئاشتەواییان لەگەڵ کرد و گەڕایەوە لە ساڵی داهاتوودا، وە عومرەی (سێیەمیشی) لە جیعرانەوە بوو کاتێ دەستکەوتی حونەینی دابەش کرد لە مانگی زیلقەعیدەدا، وە عومرەی (چوارەمیشی) لەگەڵ حەجەکەیدا کرد (واتە: لەگەڵ حەجی ماڵئاواییدا).

## بابەت: واجب بوونی حەج چۆنە؟

١٨٣٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْحَجُّ. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ فِي كُلِّ عَامٍ؟ قَالَ: لاَ، وَلَوْ قُلْتُهَا لَوَجَبَتْ، الْحَجُّ مَرَّةٌ فَمَا زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەجتان لەسەر واجب کراوە، جا وترا: ئەی پێغەمبەری خوا لە هەموو ساڵێکدا؟ فەرمووی: نەخێر، جا ئەگەر بموتایە لە هەموو ساڵێکدا واجبە، ئەوە واجب دەبوو، حەج یەک جارە، چەندی زیاتریش بێت ئەوە سوننەتە.

١٨٣٦ - «أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا نَحْوَهُ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: شوێنەکانی (ئیحرام بەستن) بۆ حەج

١٨٣٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا. قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ أَمَّا هَذِهِ الثَّلاَثُ فَإِنِّي سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَبَلَغَنِي أَنَّهُ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی مەدینە (زول حولەیفە)ی دیاری کردوە و کردویەتیە شوێنی (ئیحرام بەستن، کە ئێستا پێی دەڵێن: ئەبیار عەلی)، وە بۆ خەڵکی شام «جوحفە»ی دیاری کرد (کە ئێستا پێی دەڵێن: ڕابغ)، وە بۆ خەڵکی نەجد «قەرن»ی دیاری کرد، دەڵێ: ئیبنو عومەر وتویەتی: هەرچی ئەم سیانەن لە پێغەمبەری خواوەم ﷺ گوێ لێ بووە، وە پێشم گەیشتووە کە بۆ خەڵکی یەمەنیش «یەلەملەم»ی دیاری کردوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

١٨٣٨ - «أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا مالَكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارَ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا مِثْلَهُ»[1].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٨٣٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ هُنَّ لِأَهْلِهِنَّ وَلِكُلِّ آتٍ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکی مەدینە «ذول حولەیفە»ی دیاری کردوە و کردویەتی بە شوێنی (ئیحرام بەستن، کە ئێستا پێی دەڵێن: ئابار عەلی)، وە بۆ خەڵکی شام «جوحفە»ی دیاری کردوە (کە ئێستا پێی دەڵێن ڕابغ)، وە بۆ خەڵکی نەجد «قەرنول مەنازیل»ی دیاری کردوە، وە بۆ خەڵکی یەمەنیش «یەلەملەم»ی دیاری کردوە، ئەم شوێنانە بۆ خەڵکی خۆیانن (واتە: تایبەتن بەو خەڵکانەی کە باسکران)، وە بۆ هەموو کەسێکی تریشە جگە لەمان کە گوزەر بکات و بڕوات بەو شوێنانەدا، لەو کەسانەی دەیانەوێ حەج و عومرە بکەن، وە ئەو کەسەش کە نزیکترە (لەو شوێنانەی باسکرا) ئەوە (شوێنی ئیحرام بەستنی بریتیە) لە شوێنی خۆی، وە خەڵکی مەککەش (شوێنی ئیحرام بەستنیان) لە مەککەیە.

## بابەت: خۆشۆردن لە کاتی ئیحرامدا

١٨٤٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: امْتَرَى الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ وَابْنُ عَبَّاسٍ فِي غَسْلِ الْمُحْرِمِ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلُونِي إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم، كَيْفَ رَأَيْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَأَتَيْتُ أَبَا أَيُّوبَ وَهُوَ بَيْنَ قَرْنَيِ الْبِئْرِ وَقَدْ سُتِرَ عَلَيْهِ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَضَمَّ الثَّوْبَ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ ابْنُ أَخِيكَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَيْفَ رَأَيْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَغْسِلُ رَأْسَهُ؟ فَأَمَرَّ يَدَيْهِ عَلَى رَأْسِهِ مُقْبِلاً وَمُدْبِرًا»[3].

واتە: لە ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حونەینەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێراویەتیەوە، وتویەتی: میسوەری کوڕی مەخرەمە و ئیبنو عەبباس مشتومڕیان هەبوو دەربارەی (چۆنیەتی) سەر شۆردنی کەسی موحریم، بۆیە منیان نارد بۆ لای ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (رَضِيَ اللهُ عَنْه)، (تا پێی بڵێم): چۆن پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە سەری خۆی شۆردووە لە کاتێکدا کە موحریم بووە؟ (دەڵێت): هاتم بۆ لای ئەبو ئەییوب لە کاتێکدا لە نێوانی هەردوو عامودەکانی بیر بوو و بە جلێک پەردەپۆش کرابوو،

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

منیش سەلامم لێ کرد، ئەویش جلەکەی بۆ خۆی ڕاکێشا (واتە: پەردەکەی لادا تا بمبینێت)، منیش وتم: ئیبنو عەبباسی کوڕی برات ڕەوانەی کردووم (تا لێت بپرسم) چۆن پێغەمبەری خواتﷺ بینیوە سەری خۆی شۆردووە؟ ئەویش دەستی هێنا بەسەریدا بۆ پێشەوە و بۆ دواوە.

١٨٤١ - «عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَجَرَّدَ لِلْإِهْلَالِ وَاغْتَسَلَ»[١].

واتە: لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیتەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ جلەکانی داکەند بۆ ئیحرام و خۆی شۆرد.

## بابەت: دەربارەی پاداشت و گەورەیی حەج و عومرە

١٨٤٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: حَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ لَيْسَ لَهَا ثَوَابٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ، وَعُمْرَتَانِ تُكَفِّرَانِ مَا بَيْنَهُمَا مِنَ الذُّنُوبِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەجێکی قەبوڵکراو هیچ پاداشتێکی بۆ نیە جگە لە بەهەشت، وە عومرەیێک بۆ عومرەیەکی تر هەموو تاوانەکانی نێوانیان دەسڕنەوە.

١٨٤٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ حَجَّ الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێراویەتیەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک حەجی ماڵی خوا بکات و گوفتار و ڕەفتاری خراپ نەکات و هەروەها سەرپێچی نەکات، ئەوە دەگەڕێتەوە وەک ئەو کاتەی لە دایک بووە (واتە بێ تاوان و پاک پاک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە وەک سەردەمی ساوایی).

## بابەت: کام حەج چاکترینە

١٨٤٤ - «عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّ الْحَجِّ أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْعَجُّ وَالثَّجُّ.

الْعَجُّ يَعْنِي: التَّلْبِيَةَ، وَالثَّجُّ يَعْنِي: إِهْرَاقَ الدَّمِ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ رجاله ثقات، والحديث صحيح.

واتە: لە ئەبوبەكرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێكرا: كام حەج چاكترینە (واتە: باشترین پاداشتی لەسەرە)؟ فەرمووی: (حەجێک) بە دەنگ بەرزكردنەوە بوترێت: (لبیک اللهم لبیک...) و، خوێنی ئاژەڵی تیا بڕژێت (بۆ قوربانی).

(الْعَجُّ): واتە: وتنی (لبیک اللهم لبیک...) بە دەنگی بەرز. (الثَّجُّ): واتە: ڕشتنی خوێن.

## بابەت: ئەوەی موحریم دەیپۆشێت لە جل و بەرگ

١٨٤٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: مَا نَلْبَسُ مِنَ الثِّيَابِ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: لاَ تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ أَحَدٌ لَيْسَتْ لَهُ نَعْلاَنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ وَلْيَجْعَلْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ وَرْسٌ وَلاَ زَعْفَرَانٌ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد: چ بپۆشین لە جل و بەرگ كاتێک ئیحرامامان بەست (ئێمەی پیاوان)؟ فەرمووی: قەمیس و، بێجامە و شەڕوال و (پانتۆڵ) و، مەندیل و، ڕۆب و كڵاو و، خوفی (درێژ) لەبەر مەكەن، تەنها كەسێک نەبێت كە جووتە نەعلەیەكی نەبێت و (دەستی نەكەوێت) با جووتە خوفێک لەپێ بكات و دایانماڵێت (یان كورتیان بكاتەوە) بۆ خوار گۆزینگەكانی، وە (چ ژن چ پیاوی موحریم) هیچ جلێک لەبەر مەكەن كە وەڕس و زەعفەڕانی بەر كەوتبێت (واتە: نابێت بۆن و گوڵاوی بەر كەوتبێت).

١٨٤٦ - «أَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ. قَالَ: قُلْتُ: أَوْ قِيلَ، أَيَقْطَعُهُمَا؟ قَالَ: لاَ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، كە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە كە فەرموویەتی: هەر كەسێک پەشتەماڵێكی بۆ خوارەوەی جەستەی دەست نەكەوێت ئەوە با بێجامەیەک (یان شەڕواڵێک) بپۆشێت، وە هەر كەسێک جووتە نەعلەیەكی دەست نەكەوێت (نەیبێت) ئەوە با جووتە خوفێک بكاتە بەری، (دەڵێ) وتم: ـ یان وترا ـ ئایا دەیانبڕێتەوە؟ فەرمووی: نەخێر.

تێبینی: ڕاجیایی لە نێوان زانایان هەیە دەربارەی بڕینەوەی خوف لە ئیحرامدا، هەندێكیان ئەم فەرموودەیەیان وەرگرتووە و دەڵێن: بڕینەوەی پێویست نیە، زۆربەی زانایانیش دەفەرموون: دەبێ ببڕێتەوە، چونكە لە فەرموودەیتردا هاتووە كە ئیبنو عومەر گێڕاویەتیەوە، چونكە ئەم فەرموودەیە موتڵەقە و دەبێ حەمل بكرێتە سەر موقەییەد.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

١٨٤٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَمَّا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ، قَالَ: لاَ يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ، إلاَّ أَنْ لاَ يَجِدَ نَعْلَيْنِ، فَيَلْبَسَ خُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعَهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی ئەو پۆشاکەی (پیاوی) موحریم دەیپۆشێت و (لەبەری دەکات)، فەرمووی: (پیاوی موحریم) قەمیس و، مەندیل و، بێجامە و (ڕۆبی بە کڵاو و کڵاو) و، خوف لەبەر ناکات، تەنها (ئەگەر کەسێک) جووت نەعلەیەکی دەست نەکەوێت، ئەوە با جووتە خوفێک لەبەر بکات و، با (خوفەکە) تا خوار گۆزینگی ببڕێتەوە.

بابەت: (بەکارهێنانی) بۆن و گوڵاو لە کاتی ئیحرامدا

١٨٤٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ بِأَطْيَبِ الطِّيبِ، قَالَ: وَكَانَ عُرْوَةُ يَقُولُ لَنَا: تَطَيَّبُوا قَبْلَ أَنْ تُحْرِمُوا وَقَبْلَ أَنْ تُفِيضُوا يَوْمَ النَّحْرِ»[2].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، کە وتویەتی: من هەموو جار پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد پێشی ئیحرام بە خۆشترین بۆن، (عوسمانی کوڕی عوروە) وتویەتی: عوروە پێی دەوتین: خۆتان بۆن خۆش بکەن پێش ئەوەی ئیحرام ببەستن، هەروەها پێش ئەوەی تەوافی ئیفازە بکەن لە ڕۆژی قورباندا، (بەڵام لە کاتی ئیحرامدا دروست نیە).

١٨٤٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا قَالَتْ: لَقَدْ كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عِنْدَ إِحْرَامِهِ بِأَطْيَبِ مَا أَجِدُ»[3].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من هەموو جار پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد کاتێ دەیەویست ئیحرام ببەستێت (واتە تۆزێک پێش ئیحرام) بە خۆشترین بۆن کە دەستمکەوتایە.

١٨٥٠ - «حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْقَاسِمِ، أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا تَقُولُ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ لِحُرْمِهِ، وَطَيَّبْتُهُ بِمِنًى قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ»[4].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسم لە باوکیەوە بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە دایکە عائیشە (رَضِي اللهُ عَنهَا) بوو دەیوت: پێغەمبەری خوام ﷺ

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، والحديث متفق عليه.

(٤)ـ صحيح.

بۆن خۆش کرد بۆ ئیحرام بەستنی (پێشی ئیحرام)، وە بۆن خۆشم کرد لە مینا پێش ئەوەی تەوافی ئیفازە بکات.

## بابەت: دەربارەی ئافرەتی منداڵبوو و حەیزدار کاتێ دەیانەوێت حـــەج بکەن و دەگەن بە شوێن و میقاتی ئیحرام بەستن

١٨٥١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: نُفِسَتْ أَسْمَاءُ بِمُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ بِالشَّجَرَةِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ أَنْ تَغْتَسِلَ وَتُهِلَّ»[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەسماء منداڵی بوو، خوێنی منداڵبوونی بینی، بەهۆی لە دایک بوونی) موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر، لە شەجەڕە (کە شوێنێکە لە میقاتی زول حولەیفە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ئەبوبەکر کرد کە (فەرمان بە ئەسماء بکات) خۆی بشۆرێت و ئیحرام بکات.

١٨٥٢- « «عَنْ جَابِرٍ ﷺ فِي حَدِيثِ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ حِينَ نُفِسَتْ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ أَنْ يَأْمُرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ وَتُهِلَّ»[٢].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی فەرموودەی ئەسمائی کچی عومەیسە وتویەتی: کاتێ کە منداڵی بوو و تووشی خوێنی منداڵبوون بوو لە (زول حولەیفە)دا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ئەبوبەکر کرد کە فەرمان بە ئەسمائی (خێزانی بکات) کە خۆی بشۆرێت و ئیحرام ببەستێت.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی لە چ کاتێک سوننەتە ئیحرام ببەسترێت؟

١٨٥٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَحْرَمَ دُبُرَ الصَّلاَةِ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بەست دوای نوێژ.

١٨٥٤ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَحْرَمَ وَأَهَلَّ فِي دُبُرِ الصَّلاَةِ»[٤].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بەست دوای نوێژ.

---

(١) صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی وتنی (لَبَيكَ اللَّهُمَ لَبَيْك...)

١٨٥٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا لَبَّى قَالَ: لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ، قَالَ يَحْيَى: وَذَكَرَ نَافِعٌ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَزِيدُ هَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ: لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ، لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، (وتویەتی): پێغەمبەر ﷺ كاتێ تەلبيەی دەكرد دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ)، يەحيا دەڵێ: نافيعيش باسی كردوە كە ئيبنو عومەر ئەم ڕستانەشی زیاد دەكردن: (لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ، لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ).

## بابەت: دەربارەی دەنگ بەرزكردنەوە بە تەلبيە (بە وتنی: لَبَيكَ اللَّهُمَ لَبَيْك...)

١٨٥٦ - «عَنْ خَلاَدِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَانِي جِبْرِيلُ فَقَالَ: مُرْ أَصْحَابَكَ، أَوْ مَنْ مَعَكَ، أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ أَوْ بِالْإِهْلاَلِ»[٢].

واتە: لە خەلادی كوڕی سائیبەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیبریل‌ﷺ هات بۆ لام و فەرمووی: فەرمان بە هاوەڵانت بكە، يان فەرمووی: فەرمان بەوانە بكە كە لەگەڵتن، كە دەنگيان بەرز بكەنەوە بە تەلبيە، يان بە نيەتی ئيحرام بەستان.

١٨٥٧ - «حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێردراوەتەوە.

## بابەت: مەرج دانان لە حەجدا

١٨٥٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ ضُبَاعَةَ بِنْتَ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَحُجَّ، فَكَيْفَ أَقُولُ؟ قَالَ: قُولِي لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وَمَحِلِّي حَيْثُ تَحْبِسُنِي، فَإِنَّ لَكِ عَلَى رَبِّكِ مَا اسْتَثْنَيْتِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتەڵیب هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەمەوێ حەج بکەم، جا چی بڵێم؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بڵێ: (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ)، واتە: ئەی خوایە لە خزمەتدام لە خزمەتدام، هەروەها بڵێ: با شوێنی ئیحرام شکانم ئەو شوێنە بێت کە ڕێگریم لێ دەکەیت (بە هۆی تووشبوونی نەخۆشیەوە)، (جا ئەگەر وات وت) ئەوە بە دڵنیایی ئەو مەرجەت بۆ هەیە لای پەروەردگارت کە بە مەرجت گرتووە.

تێبینی: وەک لەو فەرموودەیەدا هاتووە زانایان فەرموویانە: دروستە مرۆڤ بە هۆی نەخۆشیەوە ئیحرام بشکێنێت بەر لە تەواو بوونی، بەمەرجێک لە سەرەتای ئیحرامەکەی مەرج دابنێت، وەک لەم فەرموودەیەدا هاتووە.

## بابەت: دەربارەی ئیحرام بەستان تەنها بە نیەتی حەج

**١٨٥٩** - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَفْرَدَ الْحَجَّ»[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەنها نیەتی حەجی هێنا لە ئیحرام بەستنەکەیدا (واتە: نیەتی عومرەشی نەهێنا، بەڵکو بە نیەتی ئیفراد ئیحرامی بەست).

## بابەت: دەربارەی حەجی قیران

**١٨٦٠** - «عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: قَالَ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ ﷺ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَنْفَعَكَ بِهِ بَعْدُ: إِنَّهُ كَانَ يُسَلَّمُ عَلَيَّ، وَإِنَّ ابْنَ زِيَادٍ أَمَرَنِي فَاكْتَوَيْتُ، فَاحْتُبِسَ عَنِّي حَتَّى ذَهَبَ أَثَرُ الْمَكَاوِي، وَاعْلَمْ أَنَّ الْمُتْعَةَ حَلَالٌ فِي كِتَابِ اللهِ، لَمْ يَنْهَ عَنْهَا نَبِيٌّ وَلَمْ يَنْزِلْ فِيهَا كِتَابٌ « قَالَ رَجُلٌ: بِرَأْيِهِ مَا بَدَا لَهُ»[٢].

واتە: لە موتەڕڕیفەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ وتویەتی: من قسەیەکت بۆ دەکەم بەڵکو دواتر خوا سوودت پێ بگەیەنێت بەهۆیەوە، پێشتر من سەلامم لێ دەکرا (واتە: فریشتە سەلامیان لێ دەکردم، جا تووشی مایەسیری ببوم)، ئیبنو زیادیش فەرمانی پێ کردم کە (شوێنی مایەسیریەکەم) داغ بکەم، جا داغم کرد (بۆ چارەسەر کردن)، جا سەلامەکەم لەسەر ڕاگیرا (واتە: فریشتە چیتر سەلامیان لێ نەکردم) تاوەکو شوێنەواری داغ کردنەکە نەما و ڕۆیی (جا کە شوێنەوارەکەی نەما دووبارە سەلامیان لێ دەکردمەوە)، وە بزانە موتعە حەڵاڵە لە پەرتوکی خوادا (واتە: ئیحرام بەستن بە نیەتی حەج و عومرە لە قوڕئاندا حەڵاڵە) و، پێغەمبەری خواش نەهی لێ نەکردوە و، وە ئایەتیشی دەربارە دانەبەزیوە (کە حەرامی بکات)، کابراش (واتە: ئیمامی عومەریش کە نەهی لێ کردوە) سەرەنجامی ئەوە بووە کە بۆی دەرکەوتووە (واتە: بە پێی ئیجتیهادی خۆی ئەم فەتوایەی داوە).

---

(١) ـ إسناده حسن، والحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی تەمـــەتتوع (واتە: ئیحـــرام بەستن بە عومرە بە تەنیا دواتر بە حـــەج بە تەنیا، یان گۆڕینی نیەتی حەج بۆ عومرە)

١٨٦١ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ نَوْفَلٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَامَ حَجَّ مُعَاوِيَةُ ﷺ يَسْأَلُ سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ: كَيْفَ تَقُولُ بِالتَّمَتُّعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ؟ قَالَ: حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ، فَقَالَ: قَدْ كَانَ عُمَرُ يَنْهَى عَنْهَا، فَأَنْتَ خَيْرٌ مِنْ عُمَرَ؟ قَالَ: عُمَرُ خَيْرٌ مِنِّي، وَقَدْ فَعَلَ ذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ خَيْرٌ مِنْ عُمَرَ»[١].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی نەوفەلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لێ بوو ئەو ساڵەی موعاویە ﷺ حەجی كرد سەعدی كوڕی مالیك پرسیاری كرد وتی: چی دەڵێی دەربارەی تەمەتتوع (بەوەی ئیحرام ببەسترێت سەرەتا تەنها بۆ عومرە دواتر) بۆ حەج؟ وتی: باش و جوان و ڕێكە، ئەویش وتی: عومەر نەهی لێ دەكرد، جا ئایا تۆ لە عومەر باشتری؟ وتی: عومەر لە من باشترە، وە بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەتتوعی كردوە، ئەویش لە عومەر باشترە.

١٨٦٢ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ حَجَّ وَهُوَ مُنِيخٌ بِالْبَطْحَاءِ فَقَالَ لِي: أَحَجَجْتَ؟ قُلْتُ: نَعم. قَالَ: كَيْفَ أَهْلَلْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ: لَبَّيْكَ بِإِهْلاَلٍ كَإِهْلاَلِ النَّبِيِّ ﷺ. قَالَ: أَحْسَنْتَ، اذْهَبْ فَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حِلَّ، قَالَ: فَطُفْتُ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ نِسَاءِ بَنِي قَيْسٍ فَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسِي، فَجَعَلْتُ أُفْتِي النَّاسَ بِذَلِكَ، فَقَالَ لِي رَجُلٌ: يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ رُوَيْدًا بَعْضَ فُتْيَاكَ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي النُّسُكِ بَعْدَكَ، فَقُلْتُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَنْ كُنَّا أَفْتَيْنَاهُ فُتْيَا، فَلْيَتَّئِدْ: فَإِنَّ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ قَادِمٌ عَلَيْكُمْ فَبِهِ فَأْتَمُّوا، فَلَمَّا قَدِمَ أَتَيْتُهُ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللهِ، فَإِنَّ كِتَابَ اللهِ يَأْمُرُ بِالتَّمَامِ، وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى بَلَغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو موساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ حەجی كرد لەكاتێكدا وشترەكەی یەخ كرد لە گۆڕەپانی مەككە و پێی فەرمووم: ئایا حەجت كرد؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: چۆن ئیحرامت بەست؟ دەڵێ: وتم: لەبیەیكە پەروەردگارا لە خزمەتتدام بە ئیحرامێك وەك ئیحرامی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاكت كرد، بڕۆ تەوافی بەیت بكە لەگەڵ ڕاكردنی صەفا و مەڕوە، دواتر ئیحرامت بشكێنە، دەڵێ: منیش تەوافی بەیت و صەفا و مەڕوەم كرد، دواتر چووم بۆ لای ئافرەتێك لە ئافرەتەكانی بەنی قەیس و سەری پاك كردمەوە و شانەیكرد، منیش فەتوای ئەوەم بۆ خەڵكی دەدا (واتە: ئەو جۆرە ئیحرام و شێوازەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیدام و فێری كردم، تا زەمانی خیلافەتی ئیمامی عومەر)، جا پیاوێك پێی وتم: ئەی عەبدوڵڵای كوڕی قەیس

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

هێواشبە و هەڵوێستە بکە و هەندێ لە فەتواکانت دوابخە، چونکە تۆ نازانی گەورەی بڕواداران چی دەکات لە مەناسیکەکان دوای تۆ، منیش وتم: ئەی خەڵکینە هەر کەسێک ئێمە فەتوایەکمان بۆ داوە با پەلە نەکات، چونکە گەورەی بڕواداران دێت بۆ لاتان و شوێنی ئەو بکەون (کار بە فەتوای ئەو بکەن)، جا کاتێ (ئیمامی عومەر) هات چووم بۆ لای و ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش وتی: ئەگەر پەرتوکی خوا وەرگرین و کاری پێ بکەین، ئەوە پەرتوکی خوا فەرمان بە تەواوکردنی ئیحرام دەکات، وە ئەگەر سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرین، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی نەشکاندووە تاوەکو هەدی گەیشتۆتە کات و شوێنی خۆی (کەواتە: لە فەتواکە پێچەوانەی تۆم).

## بابەت: ئەوەی کەسی موحریم دەیکوژێت[1] لە ئیحرامەکەیدا

١٨٦٣ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ لاَ جُنَاحَ فِي قَتْلِ مَنْ قَتَلَ مِنهُنَّ: الْغُرَابُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[2].

واتە: لە ئیبن و عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شت هەن هیچ تاوانێک لەسەر ئەو کەسە نیە کە لێیان دەکوژێت: قەلەڕەش و، مشک و جورج و، باشوکە و، دووپشک و، سەگی هار.

١٨٦٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِقَتْلِ خَمْسٍ فَوَاسِقَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْحِدَأَةِ، وَالْغُرَابِ، وَالْفَأْرَةِ، وَالْعَقْرَبِ، وَالْكَلْبِ الْعَقُورِ « قَالَ عَبْد اللهِ: الْكَلْبُ الْعَقُورُ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: الأَسْوَدُ»[3].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی پێنج سنوربەزێنەکان لە زەرەر و زیان، لە ئیحرام و غەیری ئیحرامدا (کە ئەمانەن): باشوکە و، قەلەڕەش و، مشک و جورج و، دووپشک و، سەگی هار.

عەبدوڵلا وتویەتی: سەگی هار، هەندێکیش وتویانە: (سەگی) ڕەش.

١٨٦٥ - «أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا: إِنَّ مَعْمَرًا، كَانَ يَذْكُرُهُ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَعَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ»[4].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) واتە: ئەوەی بۆی هەیە بیکوژێت..

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: كەڵەشاخ كردن بۆ كەسی موحریم

**١٨٦٦** - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵەشاخی كرد، لەكاتێكدا كە موحریم بوو (لە ژێر ئیحرامدا بوو).

**١٨٦٧** - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِلَحْيِ جَمَلٍ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی بوحەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵەشاخی كرد لە لەحیی جەمەل (كە شوێنێكە لە نێوان مەككە و مەدینە) لەكاتێكدا كە موحریم بوو (لەژێر ئیحرامدا بوو).

**١٨٦٨** - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، قَالَ إِسْحَاقُ: قَالَ سُفْيَانُ مَرَّةً عَنْ عَطَاءٍ، وَمَرَّةً عَنْ طَاوُسٍ، وَجَمَعَهُمَا مَرَّةً»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵەشاخی كرد، لەكاتێكدا كە موحریم بوو (لە ژێر ئیحرامدا بوو).

ئسحاق وتویەتی: سوفیان جارێک لە عەطائەوە گێڕاویەتیەوە، وە جارێكیشی لە طاووسەوە گێڕاویەتیەوە، وە جارێكیش هەردووكی هێناون بەیەكەوە و لە هەردووكیانی گێڕاوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی زەواج كردنی كەسی موحریم

**١٨٦٩** - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَزَوَّجَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هاوسەرگیری كرد، لەكاتێكدا كە لە حەرەمدا بوو (واتە: لە حەرەمی مەككە بوو).

تێبینی: مەبەست لە وشەی (موحریم) لێرەدا ئەوە نیە كە لە ئیحرامدا بووبێت، چونكە لە كاتی ئیحرامدا دروست نیە هاوسەرگیری و ژن و ژنخوازی بكرێت، پێغەمبەری خواش ﷺ مەیمونەی خێزانی لە كاتی ئیحرامدا نەخواستووە، بەڵكو مەیمونە خۆی دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرگیری لەگەڵ كردم لە

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

(٣) ـ صحیح.

(٤) ـ صحیح.

كاتێكدا لە ژێر ئیحرام نەبوو، بۆچوونی تریش هەیە دەفەرموێ: ئەگەر لە ژێر ئیحرامیش خواستبێتی ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها لای ئیبنو عەبباس ئەگەر كەسێك هەدیەكەی (واتە: ئاژەڵەكەی) سەربڕێت لە كاتی حەج و عومرە ئەو پێی دەڵێت موحریم، هەر چەندە موحریمیش نیە، كەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنی نەكردوە لە ژێر ئیحرامدا، چونكە فەرموودەیتر پێچەوانەیەتی و حەرامی كردوە. والله أعلم.

١٨٧٠ - «عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ قُرَيْشٍ خَطَبَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَوْسِمِ، فَقَالَ أَبَانُ: لاَ أُرَاهُ إِلاَّ عِرَاقِيًّا جَافِيًا، إِنَّ الْمُحْرِمَ لاَ يَنْكِحُ وَلاَ يُنْكِحُ. أَخْبَرَنَا بِذَلِكَ عُثْمَانُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، سُئِلَ أَبُو مُحَمَّد: تَقُولُ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعم»[1].

واتە: لە نوبەیهی كوڕی وەهبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە قوڕەیشیەكان داخوازی لە ئەبانی كوڕی عوسمان كرد، لە كاتێكدا كە (ئەبان) ئەمیری ئەو مەوسیمەی حەج بوو، ئەبان وتی: پێم وانیە (ئەم پیاوە) لە عێراقییێكی وشک چیتر بێت (واتە: سیفاتی وەک كەسێكی وشكی عێراقیە، كە گوێ بە هیچ نادات و هاتووە خوازبێنی دەكات لە كاتی ئیحرام و حەجدا!)، بە دڵنیایی كەسی موحریم نە خوازبێنی بۆ خۆی دەكات و، نەبۆ خەڵكیش، عوسمان ئەمەی پێ ڕاگەیاندووین لە پێغەمبەری خواوە ﷺ .

پرسیار لە ئەبو موحەممەد كرا: فەتوا و كار بەوە دەكەی؟ وتی: بەڵێ

١٨٧١ - «أَنَّ مَيْمُونَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ حَلاَلاَنِ بَعْدَمَا رَجَعَ مِنْ مَكَّةَ بِسَرِفَ»[2].

واتە: لە مەیمونەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنی كردم، لە كاتێكدا هەردووكمان حەڵاڵ بووین (واتە: لە ژێر ئیحرامدا نەبووین)، پاش ئەوەی لە مەككە گەڕایەوە لە سەریف (شوێنێكە لە نزیك مەككە).

١٨٧٢ - «عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَيْمُونَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا حَلاَلاً، وَبَنَى بِهَا حَلاَلاً وَكُنْتُ الرَّسُولَ بَيْنَهُمَا»[3].

واتە: لە ئەبو ڕافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خوازبێنی كرد و مارەی كرد بە حەڵاڵی (واتە: لە ژێر ئیحرامدا نەبوو و موحریم نەبوو)، وە گواستیشیەوە بە حەڵاڵی، منیش نێردراو بووم لە نێوانیاندا.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف إلا أن الشطر الأول صحيح.

## بابەت: دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیر بۆ كەسی موحریم ئەگەر خۆی ڕاوەكەی نەكردبێت

١٨٧٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ أَبِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ وَلَمْ يُحْرِمْ أَبُو قَتَادَةَ، فَأَصَابَ حِمَارَ وَحْشٍ، فَطَعَنَهُ وَأَكَلَ مِنْ لَحْمِهِ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ حِمَارَ وَحْشٍ، فَطَعَنْتُهُ، فَقَالَ لِلْقَوْمِ: كُلُوا وَهُمْ مُحْرِمُونَ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باوكم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشت لە ساڵی حودەیبیە، جا هاوەڵەكانی ئیحرامیان بەست و ئەبو قەتادە ئیحرامی نەبەست، جا (ئەبو قەتادە) بە كەرە كێویەک گەیشت و پێكای و (ڕاوی كرد) و لە گۆشتەكەی خوارد، (ئەبو قەتادە دەڵێ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من گەیشتم بە كەرەكێویەک و پێكام و ڕاوم كرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) بە خەڵكەكەی فەرموو: بخۆن، لە كاتێكدا لە ژێر ئیحرامدا بوون.

١٨٧٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نَسِيرُ وَهُمْ مُحْرِمُونَ وَأَبُو قَتَادَةَ حَلَالٌ، إِذْ رَأَيْتُ حِمَارًا، فَرَكِبْتُ فَرَسًا، فَأَصَبْتُهُ، فَأَكَلُوا مِنْ لَحْمِهِ وَهُمْ مُحْرِمُونَ، وَلَمْ آكُلْ، فَأَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلُوهُ، فَقَالَ: أَشَرْتُمْ، قَتَلْتُمْ؟ أَوْ قَالَ: ضَرَبْتُمْ؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: فَكُلُوا»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: لە كاتێكدا ئێمە دەڕۆیشتین، ئەوانیش (واتە ئەوانەی لەگەڵم بوون) موحریم بوون، ئەبو قەتادەش (واتە خۆی) موحریم نەبوو، (دەڵێ) لەناكاو كەرە كێویەكم بینی، منیش سواری ئەسپەكەم بووم و پێی گەیشتم و پێكام، ئەوانیش (ئەو خەڵكەی لەگەڵم بوون) لە گۆشتەكەیان خوارد و من نەمخوارد، جا چوون بۆ لای پێغەمبەرﷺ پرسیاریان لێ كرد (كە ئایا دروستە لەكاتێكدا لە ژێر ئیحرامدا بوون و گۆشتی ڕاویان خواردووە؟)، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئایا ئاماژەتان كرد (تا بچێت ڕاوی بكات)، ئایا خۆتان ڕاوتان كرد؟ یان وتی: ئێوە لێتاندا؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: كەواتە بخۆن.

١٨٧٥ - «عَنْ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِلَحْمِ حِمَارِ وَحْشٍ فَرَدَّهُ وَقَالَ: إِنَّا حُرُمٌ لَا نَأْكُلُ الصَّيْدَ»[٣].

واتە: لە صەعبی كوڕی جەسامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ گۆشتی كەرە كێوی بۆ هێنرا و ڕەتی كردەوە و فەرمووی: ئێمە لە ژێر ئیحرامداین نێچیر ناخۆین(واتە: دروستە بەڵام چاكترە نەیخۆین).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٨٧٦ - «عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأُهْدِيَ لَهُ طَيْرٌ وَهُمْ مُحْرِمُونَ، وَهُوَ رَاقِدٌ، فَمِنَّا مَنْ أَكَلَ، وَمِنَّا مَنْ تَوَرَّعَ، فَاسْتَيْقَظَ طَلْحَةُ فَأَخْبَرُوهُ، فَوَافَقَ مَنْ أَكَلَهُ وَقَالَ: أَكَلْنَاهُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ»[1].

واتە: لە موعاذی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عوسمانی تەیمیەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، جا (تەڵحە) باڵندەیەکی بۆ کرا بە دیاری و (بۆیان هێنا)، لە کاتێکدا موحریم بوون (هەموویان لە ژێر ئیحرامدا بوون)، تەڵحەش خەوتبوو، هەندێکمان خواردمان، هەندێکیش وەک ئیحتیاتی دینەکەی خۆی پاراست (نەیخوارد)، جا تەڵحە لەخەو هەڵسا و هەواڵیان پێدا (کە نێچیرێک بۆ ئەو هاتووە و خواردویانە)، ئەویش بۆچوونی یەک بوو لەگەڵ ئەو کەسەی خواردویەتی و (پێی دروست بوو) و وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ خواردوومانە (واتە: ئێمەش گۆشتی نێچیرمان خواردووە بە ڕێپێدانی پێغەمبەری خوا).

١٨٧٧ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: حَدَّثَنِي الصَّعْبُ بْنُ جَثَّامَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنَا بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ وَأَهْدَيْتُ لَهُ لَحْمَ حِمَارِ وَحْشٍ فَرَدَّهُ عَلَيَّ، فَلَمَّا رَأَى فِي وَجْهِي الْكَرَاهِيَةَ قَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ بِنَا رَدٌّ عَلَيْكَ، وَلَكِنَّا حُرُمٌ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: صەعبی کوڕی جەسامە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامدا تێپەڕی لە کاتێکدا من لە ئەبواء یان وەددان بووم (کە دوو شوێنن لە نێوان مەککە و مەدینە)، منیش گۆشتی کەرەکێویم بۆ کرد بە دیاری و، ئەویش بۆی گەڕاندمەوە (وەری نەگرت)، جا کاتێ پێناخۆشی لە ڕوخسارمدا بەدی کرد (زانی پێم ناخۆش بووە دیاریەکەمی ڕەت کردۆتەوە)، وتی: ئەوە ڕەت کردنەوەی ئێمە نیە بۆ سەر تۆ (لەبەر ئەوە نیە شتی تۆ وەرنەگرین، نەخێر)، بەڵام ئێمە موحریمین (لە ژێر ئیحرام داین، بۆیە وەری ناگرین).

## بابەت: دەربارەی حەج کردن لە جیاتی زیندووێک

١٨٧٨ - «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ فَقَالَتْ: إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لاَ يَسْتَمْسِكُ عَلَى رَاحِلَتِهِ وَلَمْ يَحُجَّ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعم»[3].

سُئِلَ أَبُو مُحَمَّد: تَقُولُ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعم.

---

[1] - صحيح.

[2] - صحيح.

[3] - صحيح.

واتە: لە فەزلی كوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كە لە پشتی پێغەمبەر ﷺ سوار بووە لە حەجی ماڵئاواییدا، ئافرەتێک لە خێڵی خەثعەم هات و وتی: فەرزی خوا كە حەج كردنە لەسەر بەندەكانی كەوتۆتە سەر باوكم كە پیرێكی زۆر بەساڵاچووە، ناتوانێت لەسەر وڵاغ خۆی ڕابگرێت و حەجیشی نەكردوە، ئایا (دروستە) من حەجی لە جیاتی بكەم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، پرسیار لە ئەبو موحەممەد كرا: فەتوا و كار بەوە دەكەیت؟ وتی: بەڵێ.

١٨٧٩ - «عَنْ الْفَضْلِ هُوَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ لاَ يَسْتَوِي عَلَى الْبَعِيرِ، أَدْرَكَتْهُ فَرِيضَةُ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: حُجِّي عَنْهُ»[١].

واتە: لە فەزلی كوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد و ووتی: باوكم پیرە، خۆی ڕاناگرێت لەسەر وشتر، واجبی خواشی كەوتۆتە سەر (كە حەج كردنە، جا چیبكەم؟)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لە جیاتی ئەو حەج بكە.

١٨٨٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمَ اسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَالْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَوِيَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، فَهَلْ يَقْضِي أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعم»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێكی خێڵی خەسعەم پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد لە حەجی ماڵئاواییدا، لەكاتێكدا فەزلی كوڕی عەبباس لە دواوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوار ببوو، (ئافرەتەكە) وتی: فەرزی خوا (كە حەجە) لەسەر بەندەكانی كەوتۆتە سەر باوكم كە پیرێكی زۆر بەساڵاچووە ناتوانێ لەسەر سواری خۆی ڕابگرێت، جا ئایا بۆی بەر دەكەوێت من حەجی لە جیاتی بكەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

١٨٨١ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوًا مِنْ حَدِيثِ الأَوْزَاعِيِّ»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٨٨٢ - «عن سليمان بن يسار، حَدَّثَنِي الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ، أَوْ عُبَيْدُ اللهِ بْنُ الْعَبَّاسِ ﷺ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبِي أَوْ أُمِّي عَجُوزٌ كَبِيرٌ، إِنْ أَنَا حَمَلْتُهَا لَمْ تَسْتَمْسِكْ، وَإِنْ رَبَطْتُهَا خَشِيتُ أَنْ أَقْتُلَهَا، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى أَبِيكَ أَوْ أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ تَقْضِيهِ؟ قَالَ: نَعم، قَالَ: فَحُجَّ عَنْ أَبِيكَ أَوْ أُمِّكَ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

واتە: لە سولەیمانی كوڕی یەسارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەزلی كوڕی عەبباس یان عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ بۆی گێڕامەوە، وتی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوكم ـ یان گوتی: دایكم ـ پیرێكی زۆر بەتەمەنە، ئەگەر سواری وڵاغی بكەم ناتوانێت خۆی ڕابگرێت، ئەگەر بشی بەستمەوە دەترسم ببمە هۆی مردنی (بەهۆی بەستنەوەكە)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئایا پێت وانیە ئەگەر هاتوو قەرزێک لەسەر باوكت یان دایكت بێت تۆ بۆت هەبێت بیدەیتەوە؟ وتی: بەڵێ (بۆم هەیە بیدەمەوە)، فەرمووی: كەواتە حەج لە بری باوكت یان دایكت بكە.

## بابەت: حەج كردن لە جیاتی مردوو

١٨٨٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ خَثْعَمَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي أَدْرَكَهُ الْإِسْلاَمُ وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ رُكُوبَ الرَّحْلِ، وَالْحَجُّ مَكْتُوبٌ عَلَيْهِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: أَنْتَ أَكْبَرُ وَلَدِهِ؟ قَالَ: نَعم. قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَى أَبِيكَ دَيْنٌ فَقَضَيْتَهُ عَنْهُ، أَكَانَ ذَلِكَ يُجْزِئُ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعم. قَالَ: فَاحْجُجْ عَنْهُ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاویكی خێڵی خەسعەم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: باوكم ئیسلامی پێ گەیشتووە (مسوڵمانە)، لەكاتێكدا پیرێكی زۆر بەساڵاچووە، ناتوانێت سواری پشتی وڵاغ بێت، حەجیشی لەسەر واجب كراوە، ئایا حەج بكەم لە بری ئەو؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: تۆ گەورەترین منداڵی ئەوی؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پێت وانیە ئەگەر قەرزێک لەسەر باوكت بێت و تۆش لە بری ئەو بیدەیتەوە، ئایا ئەوە بەری دەكەوێت (دروستە)؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كەواتە حەج بكە لە بری ئەو (دروستە).

١٨٨٤ - «عَنْ سَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَحُجَّ، قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَى أَبِيكَ دَيْنٌ فَقَضَيْتَهُ عَنْهُ، قُبِلَ مِنْهُ؟، قَالَ: نَعم. قَالَ: اللهُ أَرْحَمُ، حُجَّ عَنْ أَبِيكَ»[٢].

واتە: لە سەودەی كچی زەمعەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: باوكم پیرێكی زۆر بەساڵاچووە، ناتوانێت حەج بكات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پێت وانیە ئەگەر قەرزێک لەسەر باوكت بێت و تۆش لە بری ئەو بیدەیتەوە، لێی قبوڵ بكرێت؟ وتی: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: خوا بە ڕەحمترە (قەبوڵی دەكات)، حەج لە بری باوكت بكە.

---

١) ـ إسناده ضعيف.

٢) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: دەربارەی دەست لێدانی بەردە ڕەشەكە

١٨٨٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَا تَرَكْتُ اسْتِلاَمَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ فِي شِدَّةٍ وَلاَ رَخَاءٍ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَسْتَلِمُهُمَا، قُلْتُ لِنَافِعٍ: أَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَمْشِي بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ؟ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ يَمْشِي لِيَكُونَ أَيْسَرَ لِاسْتِلاَمِهِ»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەرگیز دەست لێدانی ئەم دوو ڕوكنەی بەمانیەم واز لێ نەهێناوە نە لە كاتی زەحمەت و قەڵەباڵغی و نە لە كاتی ئاسایی و ئاسانیدا، لەو كاتەوەی پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەستی لێداون، (عوبەیدوڵڵا دەڵێ) بە نافیعم وت: ئایا ئیبنو عومەر لە نێوان دوو ڕوكنەكان بە ڕۆیشتنی ئاسایی دەڕۆیشت (یان ڕایدەكرد)؟ وتی: بە ڕۆیشتنی ئاسایی دەڕۆیشت تاوەكو دەست لێدانی ئاسانتر بێت.

## بابەت: گەورەیی دەست لێدانی بەردە ڕەشەكە

١٨٨٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيَبْعَثَنَّ اللهُ الْحَجَرَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ، قَالَ سُلَيْمَانُ: لِمَنِ اسْتَلَمَهُ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ژیان بەبەر بەردە ڕەشەكەدا دەكات لە ڕۆژی دواییدا، دوو چاوی هەیە پێیان دەبینێ، وە زمانێكی هەیە قسەی پێ دەكات، شاهێدی بۆ ئەو كەسانە دەدات كە دەستی لێ دەدەن بە هەق و (ئیمانەوە).

سولەیمان وتویەتی: (عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ) واتە: لِمَنِ اسْتَلَمَهُ (واتە: لێرەدا وشەی «علی» بە واتای «لام» دێت).

## بابەت: هەر كەسێک سێ جار بە ئیحما ڕابكات و، چوار جاریش بە ئاسایی بڕوات (لە تەواف كردندا)

١٨٨٧ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَمَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ ثَلاَثَةَ أَشْوَاطٍ»[3].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیحما (بە ڕاكردنێكی هێواشی هەنگاو كورت) ڕایكرد لە بەردە ڕەشەكەوە (دەسوڕایەوە جارێكی تر) بۆ بەردە ڕەشەكە سێ جار.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٨٨٨ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ الطَّوَافَ الأَوَّلَ، خَبَّ ثَلاَثَةً، وَمَشَى أَرْبَعَةً، وَكَانَ يَسْعَى بِبَطْنِ الْمَسِيلِ إِذَا سَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَقُلْتُ لِنَافِعٍ: أَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَمْشِي إِذَا بَلَغَ الرُّكْنَ الْيَمَانِيَ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ يُزَاحَمَ عَلَى الرُّكْنِ، فَإِنَّهُ كَانَ لاَ يَدَعُهُ حَتَّى يَسْتَلِمَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی بەیتی دەکرد، تەوافی یەکەم (لە یەکەم جاردا) سێ جار بە ئیحما ڕایکرد، وە چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی ڕۆیشت، وە لە «بەطنول مەسیلدا» (کە شوێنێکە لە ناوەڕاستی صەفا و مەڕوا) ڕایدەکرد کاتێ ڕۆیشتنی لە نێوان صەفا و مەڕوادا دەکرد، (عوبەیدوڵلا وتی) بە نافیعم وت: ئایا ئیبنو عومەر بە هێواشی دەڕۆیشت کاتێ دەگەیشت بە ڕوکنی یەمانی؟ وتی: نەخێر، تەنها کاتێ قەڵەباڵغی دەبوو لەسەر ڕوکن، چونکە ئەو وازی لێ نەدەهێنا تا دەستی لێدەدا.

١٨٨٩ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَمَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ ثَلاَثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیحما (واتە: بە ڕاکردنێکی هێواشی هەنگاو کورت کە شانەکانی لەگەڵ بهەژێتەوە) ڕایکرد لە بەردە ڕەشەکەوە بۆ بەردە ڕەشەکە سێ جار، وە بە ڕۆیشتنی ئاساییش ڕۆیشت چوار جار.

## بابەت: جوببە خستنە بن باڵ لە کاتی ڕاکردن (لە تەوافدا)

١٨٩٠ - «عَنْ ابْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ طَافَ مُضْطَبِعًا»[٣].

واتە: لە ئیبنو یەعلاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺی گێڕاوەتەوە کە تەوافی کردوە بە هەڵدانەوەی جوببەکەی.

## بابەت: تەوافی حەج و عومرە بەیەکەوە

١٨٩١ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ كَفَاهُ لَهُمَا طَوَافٌ وَاحِدٌ، وَلاَ يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا»[٤].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ئیحرام بە نیەتی حەج و عومرە ببەستێت یەک تەوافی بەسە بۆ هەردووکیان، وە حەڵاڵ نابێت (لە ژێر ئیحرام دەرناچێت) تاوەکو لە فەرزی هەردووکیان دەرنەچێت و تەواویان نەکات.

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ إسناده ضعيف والحديث حسن.
(٤) ـ صحيح.

## بابەت: تەواف کردن لەسەر پشتی سواری (وەک ئەسپ و وشتر و عارەبانە و سەیارەو...)

١٨٩٢ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ طَافَ بِالْبَيْتِ عَلَى بَعِيرٍ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ، أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ وَكَبَّرَ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی بە دەوری بەیتدا کرد لەسەر وشترێک، هەر جارێک دەگەیشت بە ڕوکن ئاماژەی بۆ دەکرد بە شتێک کە لە دەستیدا بوو، وە (الله أکبر)ی دەکرد.

## بابەت: ئەوەی ئافرەتی حاجی دەیکات کاتێ لە سوڕی مانگانەیە

١٨٩٣ - «عَنِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ وَلَمْ أَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: افْعَلِي مَا يَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ»[٢].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ مەککە لە کاتێکدا لە سوڕی مانگانە بووم، جا ڕۆیشتنی نێوان صەفا و مەڕوەم نەکرد، بۆیە شکاتی ئەو حاڵەی خۆم کرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: هەموو ئەو شتانە بکە کە کەسی حاجی دەیانکات، تەنها تەواف بەدەوری بەیتدا مەکە.

## بابەت: قسە کردن لە تەوافدا

١٨٩٤ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلاَةٌ إلاَّ أَنَّ اللهَ أَبَاحَ فِيهِ الْمَنْطِقَ، فَمَنْ نَطَقَ فِيهِ فَلاَ يَنْطِقْ إلاَّ بِخَيْرٍ»[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەواف کردن بە بەیت نوێژە، تەنها (ئەوە نەبێ) خوا قسە کردنی تیا حەڵاڵ کردوە، جا هەر کەسێک قسەی کرد با قسە نەکات تەنها بە چاکە نەبێت.

١٨٩٥ - «أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مَعْبَدٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَعْيَنَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ»[٤].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: نوێژ كردن لەدواوەی مەقام (شوێنی وەستانی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ)

١٨٩٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رِضْوَانُ اللهِ عَلَيْهِ: وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلاَثٍ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوِ اتَّخَذْتَ مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾ البقرة»[١].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: لەگەڵ پەروەردگارم لە سێ شت تێكم كردەوە: (یەكێك لەم سێ شتانە ئەوەبوو) كە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شوێنی وەستانی پێغەمبەر ئیبراهیمت ﷺ كردبووایە شوێنی نوێژ كردن (زۆر باش دەبوو)، جا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾ البقرة، واتە: [مەقام و شوێنی وەستانی ئیبراهیم ﷺ بكەن بە نوێژگا و شوێنی نوێژ كردن].

## بابەت: دەربارەی سوننەتی حەج

١٨٩٧ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ أَبُو جَعْفَرٍ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ فَسَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ الْحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ. فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى زِرِّيَ الأَعْلَى وَزِرِّيَ الأَسْفَلِ، ثُمَّ وَضَعَ فَمَهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ شَابٌّ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ يَا ابْنَ أَخِي، سَلْ عَمَّا شِئْتَ. فَسَأَلْتُهُ، وَهُوَ أَعْمَى، وَجَاءَ وَقْتُ الصَّلاَةِ، فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفًا بِهَا، كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبَيْهِ، رَجَعَ طَرَفُهَا إِلَيْهِ مِنْ صِغَرِهَا، وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَنْبِهِ عَلَى الْمِشْجَبِ، فَصَلَّى، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ. فَقَالَ بِيَدِهِ فَعَقَدَ تِسْعًا، فَقَالَ: مَكَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أُذِّنَ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ فِي الْعَاشِرَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حَاجٌّ، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ، وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ، فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ: كَيْفَ أَصْنَعُ؟ فَقَالَ: اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ وَأَحْرِمِي. فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ، فَنَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ مِنْ رَاكِبٍ وَمَاشٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَخَلْفَهُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا وَعَلَيْهِ يُنْزَلُ الْقُرْآنُ وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ، فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ: لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ، فَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِي يُهِلُّونَ بِهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَيْهِمْ شَيْئًا، وَلَبَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ تَلْبِيَتَهُ حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ. قَالَ جَابِرٌ: لَسْنَا نَنْوِي إِلاَّ الْحَجَّ، لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ، حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ، اسْتَلَمَ الرُّكْنَ فَرَمَلَ ثَلاَثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ تَقَدَّمَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ فَصَلَّى فَقَرَأَ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾ البقرة، فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، وَكَانَ أَبِي يَقُولُ: - وَلاَ أَعْلَمُهُ ذَكَرَهُ إِلاَّ عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾

---

(١) - صحيح.

﴾الإخلاص، وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾﴾الكافرون، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا، فَلَمَّا أَتَى الصَّفَا قَرَأَ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة، أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ. فَبَدَأَ بِالصَّفَا، فَرَقِيَ عَلَيْهِ حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ فَوَحَّدَ اللهَ وَكَبَّرَهُ، وَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ. ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ فَقَالَ مِثْلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْوَادِي، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الدَّارِمِيُّ: يَعْنِي: فَرَمَلَ حَتَّى إِذَا صَعِدْنَا، مَشَى حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْمَرْوَةَ فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا، حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرَ طَوَافٍ عَلَى الْمَرْوَةِ، قَالَ: إِنِّي لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ، لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً. فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيُحِلَّ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً. فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لِأَبَدٍ فَشَبَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَصَابِعَهُ فِي الأُخْرَى فَقَالَ: دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ هَكَذَا مَرَّتَيْنِ، « لاَ، بَلْ لِأَبَدِ أَبَدٍ، لاَ بَلْ لأَبَدِ أَبَدٍ؟ فَشَبَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَصَابِعَهُ فِي الأُخْرَى فَقَالَ: دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ هَكَذَا مَرَّتَيْنِ، لاَ، بَلْ لِأَبَدِ أَبَدٍ، لاَ بَلْ لأَبَدِ أَبَدٍ، وَقَدِمَ عَلِيٌّ بِبُدْنٍ مِنَ الْيَمَنِ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَوَجَدَ فَاطِمَةَ مِمَّنْ حَلَّ، وَلَبِسَتْ ثِيَابَ صَبِيغٍ، وَاكْتَحَلَتْ، فَأَنْكَرَ عَلِيٌّ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: أَبِي أَمَرَنِي، فَكَانَ عَلِيٌّ يَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أُحَرِّشُهُ عَلَى فَاطِمَةَ فِي الَّذِي صَنَعَتْ مُسْتَفْتِيًا لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فِيمَا ذَكَرَتْ، فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: صَدَقَتْ، مَا فَعَلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللهُمَّ إِنِّي أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ. قَالَ: فَإِنَّ مَعِيَ الْهَدْيَ فَلاَ تَحِلَّ. قَالَ: فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْيِ الَّذِي قَدِمَ بِهِ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ، وَالَّذِي أَتَى بِهِ النَّبِيُّ ﷺ مِائَةَ بَدَنَةٍ فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ، وَقَصَّرُوا إِلاَّ النَّبِيَّ ﷺ وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، وَجَّهَ إِلَى مِنًى فَأَهْلَلْنَا بِالْحَجِّ، وَرَكِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَصَلَّى بِنَا الظُّهْرَ، وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ، وَالْعِشَاءَ، وَالصُّبْحَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ، أَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعَرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةَ، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَسَارَ لاَ تَشُكُّ قُرَيْشٌ إِلاَّ أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ، كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي الْمُزْدَلِفَةِ، فَسَارَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَهَا حَتَّى إِذَا زَاغَتْ - يَعْنِي الشَّمْسَ - أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ لَهُ فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي، فَخَطَبَ النَّاسَ وَقَالَ: إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَأَوَّلُ دَمٍ وُضِعَ دِمَاؤُنَا دَمُ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ كَانَ مُسْتَرْضَعًا فِي بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ، وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُهُ رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ، فَاتَّقُوا اللهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّمَا أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ، وَإِنَّ لَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَأَنْتُمْ مَسْئُولُونَ عَنِّي، فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟ قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ. فَقَالَ بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ فَرَفَعَهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ: اللهُمَّ اشْهَدْ، اللهُمَّ اشْهَدْ، اللهُمَّ اشْهَدْ. ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ بِنِدَاءٍ وَاحِدٍ، وَإِقَامَةٍ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ لَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى وَقَفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إِلَى الصُّخَيْرَاتِ - وَقَالَ إِسْمَعِيلُ إِلَى الشُّجَيْرَاتِ - وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ

فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ، فَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ، ثُمَّ دَفَعَ وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حَتَّى إِنَّهُ لَيُصِيبُ رَأْسُهَا مَوْرِكَ رَحْلِهِ، وَيَقُولُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى: السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ كُلَّمَا أَتَى حَبْلاً مِنَ الْحِبَالِ، أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً حَتَّى تَصْعَدَ، حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، صَلَّى الْفَجْرَ، بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى وَقَفَ عَلَى الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَدَعَا اللهَ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا، ثُمَّ دَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ الْعَبَّاسِ، وَكَانَ رَجُلاً حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ، وَسِيمًا، فَلَمَّا دَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ مَرَّ بِالظُّعُنِ يَجْرِينَ، فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَهُ فَوَضَعَهَا عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ، فَحَوَّلَ الْفَضْلُ رَأْسَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ، فَوَضَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ حَتَّى إِذَا أَتَى مُحَسِّرَ، حَرَّكَ قَلِيلاً، ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تُخْرِجُكَ إِلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى، حَتَّى إِذَا أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَهَا الشَّجَرَةُ، فَرَمَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ حَصَاةٍ مِنْ حَصَى الْخَذْفِ، ثُمَّ رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ فَنَحَرَ ثَلاَثًا وَسِتِّينَ بَدَنَةً بِيَدِهِ، ثُمَّ أَعْطَى عَلِيًّا فَنَحَرَ مَا غَبَرَ، وَأَشْرَكَهُ فِي بُدْنِهِ، ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبِضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ، فَطُبِخَتْ فَأَكَلاَ مِنْ لُحُومِهَا، وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا، ثُمَّ رَكِبَ فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ، فَأَتَى الْبَيْتَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمَكَّةَ، وَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَهُمْ يَسْتَقُونَ عَلَى زَمْزَمَ فَقَالَ: انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَلَوْلاَ يَغْلِبُكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ، لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا فَشَرِبَ»[1].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەبو جەعفەر وتویەتی: چووین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵڵا و پرسیاری لە خەڵکەکە کرد و (خۆیان ناساند) تا گەیشت بە من، منیش وتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلیم، جا دەستی نەوی کرد بۆ گرتنی دوگمە و قۆچپەی سەرەوە و خوارەوەم و، دەمی دانا لە نێوان دوو مەمکەکانم، لەکاتێکدا من گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بووم، جا وتی: بەخێر بێی ئەی کوڕی برام، پرسیار لە هەر شتێک بکە کە دەتەوێت، جا پرسیارم لێ کرد، لەکاتێکدا کوێر بوو، جا کاتی نوێژ هات و هەڵسا بە پەشتەماڵەیەکەوە کە لەخۆی لول دابوو، هەر جارەک کە لەسەر شانەکانی دایدەنا لایەکی بۆی دەهاتەوە لەبەر بچوکی پەشتەماڵەکە، ڕیدائەکەشی بە عەلاقەوە بوو لە تەنیشتیەوە، جا نوێژی کرد، منیش وتم: هەواڵم پێ بدە بە حەجی پێغەمبەری خوا.

جا بەدەستی ئاماژەی کرد بەوەی پێغەمبەری خوا نۆ ساڵ دانیشت (حەجی نەکرد)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ساڵ مایەوە حەجی نەکرد، دواتر لە ساڵی دەیەمدا بانگی ڕاهێشت لەناو خەڵکی بۆ حەج کردن (دەوترا): پێغەمبەری خوا ﷺ حەج دەکات، جا خەڵکێکی زۆر چوون بۆ مەدینە و هەموویان دەیانەویست لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بن و کردەوەی وەک ئەو بکەن و لاسایی بکەنەوە، جا لەگەڵی دەرچووین تاوەکو چووینە ذول حەلەیفە، جا ئەسمائی کچی عومەیسی (خێزانی ئەبوبەکری صدیق) موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری بوو و ناردی بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئایا چی بکات

---

(١) ـ صحيح.

(چۆن حەج بکات لەکاتێکدا بێ نوێژ بووە و منداڵی بووە)؟ پێغەمبەری خواش پێی فەرموو: خۆت بشۆرە و پارچە پەڕۆیەک لە شوێنی خوێنەکە دابنێ و ئیحرام ببەستە.

جا پێغەمبەری خوا لە مزگەوت نوێژی کرد و، دواتر سواری وشتری قەصوا بوو تاوەکو وشترەکەی بردی بۆ گۆڕەپانیەک و چۆڵەوانیەک، منیش هەتا چاو بڕی کرد سەیرم کرد بەردەمی پڕ لە خەڵک بوو بە سواری و بە پیادە، لەلای ڕاستیشی بەهەمان شێوە، لەلای چەپیشی بە هەمان شێوە، لە دواوەشیەوە بە هەمان شێوە، جا لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا لەنێوانمان بوو قورئانی بۆ دادەبەزی، ئەویش ماناکەی دەزانی، جا تەهلیلی کرد بە یەکتاپەرستی و (فەرمووی): لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ، جا خەڵکیش وەک ئەو تەهلیلیان کرد و پێغەمبەری خواش ڕەتی کەسی نەدایەوە و نەهی لێ نەکردن، جا پێغەمبەری خوا هەر لەببەیکەی دەفەرموو تاوەکو لەگەڵی گەیشتین بە مەککە و بەیت.

جابر وتویەتی: ئێمە تەنها نیەتی حەجمان هێنا، ئێمە عومرەمان نەدەزانی، جا کاتێ لەگەڵی گەیشتین بە بەیت دەستی دا لە ڕوکن و سێ جار بە خێرایی ڕایکرد و سوڕایەوە و چوار جاریش بە هێواشی و ئاسایی ڕۆیشت و سوڕایەوە، دواتر چوو بۆ لای مەقامی ئیبراهیم و نوێژی کرد و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقرة، جا مەقامی ئیبراهیمی خستە نێوان خۆی و نێوان بەیت، جا باوکم دەیگێڕایەوە، پێم وانیە لە کەسی وەرگرتبێت جگە لە جابر کە لە پێغەمبەری خواوەی گێڕاوەتەوە، دەیوت: لە دوو ڕەکعەتەکانی سوڕەتی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾، و ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١﴾ ﴾، خوێند، دواتر گەڕایەوە بۆ ڕوکن و دەستی لێدا، دواتر لە دەرگا دەرچوو بۆ صەفا، جا کاتێ هات بۆ صەفا ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، فەرمووی: بەوە دەست پێ دەکەم کە خوا لە ئایەتەکە دەستی پێ کردوە، بۆیە سەرەتا دەستی بە صەفا کرد و سەر بەرزاییەکەی کەوت تاوەکو بەیتی لێ وەدیار کەوت، ئنجا خوا بە تاک و تەنیا و بە گەورە گرت و فەرمووی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ)، دواتر لە نێوان ئەم زیکرە دووعاو نزای کرد و سێ جار هەمان شتی وتەوە، دواتر هاتە خوارەوە بۆ مەڕوە تاوەکو قاچی کەوتە ناو بەتنول وادی، ئیمامی دارەمی وتویەتی: بە خێرایی ڕایکرد، تاوەکو دوو قاچەکانی سەرکەوتن، وە ڕۆیشت تاوەکو هاتین بۆ مەڕوە، جا هەمان شتی کە لە صەفا کردی لە مەڕوەش ئەنجامیدا، جا کە کۆتا تەواف هات لە مەڕوە فەرمووی: ئەگەر ئەوەی لە کۆتایی زانیم لە سەرەتا بمزانیایە (واتە: ئەگەر بمزانیایە کە ئێوە هەدی ناهێنن و چاوەڕوان دەبن من ئیحرام بشکێنم بە سەرتاشین) ئەوە منیش ئاژەڵ و هەدی خۆمم نەدەهێنا و حەجەکەم فەسخ دەکردەوە و دەمکرد بە عومرە، جا هەر کەسێک لە ئێوە ئاژەڵ و هەدی پێ نیە ئەوە با ئیحرام بشکێنێت و حەجەکەی بکات بە عومرە.

جا سوڕاقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەنجامدانی عومرە لە مەوسیمی حەج تەنها دروستە) لەم ساڵەمان و کارەکە تایبەتە بەم ساڵ یان بۆ هەتاهەتایە؟ پێغەمبەری

خواش پەنجەكانی دەستی خستە ناو یەكەوە و فەرمووی: عومرە چووە ناو مەوسیمی حەجەوە، دوو جار فەرمووی، نەخێر بۆ هەتا هەتاییە، نەخێر بۆ هەتا هەتاییە، جا عەلیش وشترێكی مێی گەورەی لە یەمەنەوە هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، جا بینی فاتیمە لەو كەسانە بوو كە ئیحرامیان شكاندووە و جلێكی بە ڕەنگی پۆشیوە و چاوی كلڕێژ كردوە، جا عەلی سەرەكۆنەی كردوو ئەو شتانەی پێ ناخۆش بوو، فاتیمەش وتی: باوكم (پێغەمبەری خوا) فەرمانی پێ كردووم، جا عەلی دەڵێ: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەكو سەرەكۆنەكەی خۆمی بۆ بگێڕمەوە كە سەركۆنەی فاتیمەم كرد و پرسیاری لێ بكەم دەربارەی ئەوەی فاتیمە باسی كرد و منیشی سەرەكۆنە كرد لەسەری، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فاتیمە ڕاست دەكات، (ئەی تۆ عەلی) چۆن نیەتت هێنا كاتێ ئیحرامی حەجت بەستا؟ دەڵێ وتم: پەروەردگارا ئیحرام دەبەستم بەو نیەتەی كە پێغەمبەری خوا هێناویەتی و ئیحرامی لەسەر بەستاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من ئاژەڵی هەدیم پێیە (نابێ ئیحرام بشكێنم تاوەكو لە كردەوەی حەج و عومرە تەواو دەبم) كەواتە تۆش ئیحرام مەشكێنە (چونكە نیەتت وەكو منە)، دەڵێ: جا ئەو ئاژەڵی هەدیانەی عەلی لە یەمەنەوە هێنابووی لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆی هێنابووی سەد وشتر بوون، جا هەموویان ئیحرامیان شكاند و قژیان كورت كردەوە تەنها پێغەمبەری خوا و ئەوانە نەبێت كە هەدیان پێ بوو.

جا كاتێ ڕۆژی تەڕوویە هات (كە دەكاتە ڕۆژی هەشتەمی ذیل حیججە) ڕووی كردە مینا و ئیحرامی حەجمان بەستا و پێغەمبەری خواش ﷺ سواری سواریەكەی بوو و نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و بەیانی لە مینا كرد، دواتر تۆزێك مایەوە تاوەكو خۆر هەڵات و فەرمانی كرد بە هەڵكەندنی خێمەكە لە مینا و چەقاندنی لە نەمیرە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ سواری سواریەكەی بوو و ڕۆیشت قوڕەیش گومانیان نەبوو تەنها لە موزدەلیفە دەوەستێت وەك چۆن قوڕەیش لە سەردەمی نەزانیدا لە موزدەلیفە دەوەستان، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە موزدەلیفە تێپەڕی و لە مەشعەرول حەرام وەستا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تاوەكو خۆر لایدا فەرمانی كرد وشترەكەی ئامادە بكرێت، جا وشترەكەی بۆ كورتان كرا و هات بۆ بەتنول وادی و وتاری بۆ خەڵكیدا و فەرمووی: خوێن وماڵتان لەسەر یەكتری حەرامە وەك حەڕامی تاوان و جینایەت لەم ڕۆژەتان لەم مانگەتان لەم شارەتان، ئاگاداربن و بزانن هەموو كردەوەیەكی سەردەمی نەزانی فڕێدراوەتە ژێر پێم (نابێ كاری پێ بكرێت)، وە خوێنی سەردەمی نەزانی باتڵە و فڕێدراوە، وە یەكەم خوێن كە فڕێی دەدەم و حیسابی بۆ ناكەم خوێنی خۆمانە: كە خوێنی (ئیبنو ڕەبیعەی كوڕی حاریث)ە، كە داوای لە ئافرەتانی بەنی سەعد دەكرد بۆ دایەنی كردن و شیردان، جا هوزەیل كوشتی ـ وە ڕیبای سەردەمی نەزانی فڕێدراوە، جا یەكەم ڕیبا كە فڕێی دەدەم و كاری پێ ناكەم ڕیبای عەبباسی كوڕی عەبدول موتەللیبە، گشتی فڕێدراوە، وە لە خوا بترسن دەربارەی ئافرەتان (واتە: ستەمیان لێ مەكەن و مەهێڵن ستەم لە خۆشیان بكەن بە بێ فەرمانی خوا)، چونكە ئێوە بە ئەمانەتی خوا وەرتان گرتوون و كردووتانن بە خێزانی خۆتان و بە وشە و عەقدی شەریعەتی خوا دامێنیانتان حەڵاڵ كردوە، وە مافی ئێوەش بەسەر ئەوانەوە ئەوەیە كە ئەوان كەس نەكەنە ژوورەوە و داینەنیشێنن لە سەر جێگە و ماڵی ئێوە كە پێتان خۆش نەبێت و ڕقتان لێی بێت،

جا ئەگەر وایانکرد و سەرپێچی فەرمانەکانی ئێوەیان کرد، ئەوە لێیان بدەن بە لێدانێکی بە ئێش نا (تەنها بیانترسێنن با بزانن لێیان قبوڵ ناکرێت و پەیوەندیان لاواز دەبێت و مەوقیفەکەیان بیر ناچێتەوە)، وە مافی ئەوان بەسەر ئێوە ئەوەیە ڕۆزی و جلوبەرگیان بۆ بکەن بە جوانی و ڕێکی، جا ئەی هاوەڵان ئێوە دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکرێت (پرسیار دەکرێت کە ئایا ئاینی پەروەردگاری پێ ڕاگەیاندن) جا ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: شاهێدی دەدەین کە تۆ ڕاتگەیاند و ئەرکی خۆت بەجێگەیاند و ئامۆژگاریت کرد.

جا ئاماژەی بە پەنجەی شاتومانی کرد و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و بەرەو خەڵکی پەنجەی دەکوتی و دەیفەرموو: خوایە شاهێدبە، خوایە شاهێدبە، خوایە شاهێدبە، دواتر بیلال یەک بانگ و قامەتی کرد و (پێغەمبەری خوا) نوێژی نیوەڕۆی بۆ هاوەڵان کرد و دواتر بیلال قامەتی کرد و (پێغەمبەری خواش ﷺ) نوێژی عەسریشی بۆ هاوەڵان کرد و هیچ نوێژێکیشی لە نێوانیاندا نەکرد، دواتر سواری وشترەکەی بوو ڕۆیشت تاوەکو لە عەرەفات وەستا و سکی وشترەکەی کردە بەردەکان، ئیسماعیلیش وتویەتی ڕووی کردە درەختەکان، وە ڕێگەی پیادەی خستە بەردەمی خۆی، دواتر ڕووی کردە قیبلە، جا بەردەوام وەستا تاوەکو خۆر ئاوا بوو و زەردایەتی خۆرئاوابوون نەما و بازنەکەی دیارنەما، جا ئوسامەی لە دواوەی خۆی سوار کرد و دەرچوو (بۆ موزدەلیفە) لەکاتێکدا هەوساری وشترەکەی توند و گورج کرد تاوەکو سەری وشترەکە گەیشتبووە گوشینی پێشەوە (تاوەکو خێرایی کەم بکاتەوە)، بە دەستی ڕاستەشی ئاماژەی دەکرد و دەیفەرموو: ئارامی ئارامی، جا کە دەگەیشت بە هەر تەپۆڵکە و بەرزاییەک هەوسارەکەی کەمێک بۆ شل دەکرد تاوەکو وشترەکە سەر بەرزاییەکە دەکەوت، (هەر بەم شێوەیەی کرد) تاوەکو هات بۆ موزدەلیفە و نوێژی مەغریب و عیشای لەوێ کرد بە بانگێک و دوو قامەت، دواتر پاڵکەوت تاوەکو بەیان هەڵات و نوێژی بەیانی کرد بە بانگێک و قامەتێک، دواتر سواری وشترەکەی بوو و ڕۆیشت تاوەکو لە مەعشەڕول حەڕام وەستا و ڕووی کردە قیبلە و دووعای کرد و دەیفەرموو: (الله أكبر، لا إلا إلا الله، وحده لا شريک له)، تاوەکو زۆر ڕووناک داهات، دواتر دەرچوو پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، جا فەزلی کوڕی عەبباسی لەدوای خۆی سوار کرد، کە پیاوێکی قژ جوانی سپی و ڕێک و قۆز بوو، جا کە بەڕێ کەوت بەلای ئافرەتانی سواربوودا تێپەڕی کە بە وشترەکانیان تێدەپەڕین بە خێرایی، جا فەزل هەر سەیری دەکردن و پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دادەنا لەسەر چاوی فەزل هەتا ئافرەتەکان نەبینێ، فەضلیش ڕووی وەردەگێڕایە لایەکەیتر و پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەسەر چاوی دادەنا لەلایەکەیتر تاوەکو گەیشتە دۆڵی موحەسسیر لەوێ وشترەکەی تۆزێک خێرا کرد، دواتر ڕێگەی ناوەڕاستی گرت، ئەو ڕێگەیەی دەتگەیەنێتە ڕەجمکردنی گەورە (جەمەڕەی عەقەبە)، تاوەکو گەیشت بەو جەمەڕەیەی کە درەختەکەی لەلایە، لەوێ حەوت بەردی هاویشت و «الله أكبر»ی کرد لەگەڵ هەر بەرد هاویشتنێک بە بەردی پەلاپیتکە (کە ئەندازەکەی وەک دەنکە نۆکە)، دواتر لە بەتنول وادیەوە ڕەجمی کرد، دواتر ڕووی وەرگێڕا و چوو بۆ کوشتارگە و شەست و سێ وشتری بە دەستی خۆی سەر بڕی، دواتر چەقۆکەی دا بە عەلی و ئەویش وشترەکانی تری سەر بڕی و، عەلیشی کرد بە شەریکی خۆی لە وشترەکەی، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لە هەر وشترێک پارچەیەکی لێ بکرێتەوە و خرایە ناو مەنجەڵەوە و کوڵێنرا و هەردووکیان لە گۆشتەکەیان خوارد و لە چەلاوەکەشیان خواردەوە، دواتر سواری وشترەکەی

بوو و چوو بۆ بەیت بۆ تەوافی ئیفازە، جا چوو بۆ بەیت و نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد و چوو بۆ لای بەنی عەبدول موتەللیب لەکاتێکدا ئاویان لە بیری زەمزەم دەردەهێنا فەرمووی: ئاو دەربێنن ئەی بەنی عەبدول موتەلیب، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبا خەڵک ئاودانتان لێ بسەنن و کێبڕکێیان لەگەڵ بکەن ئەوە لەگەڵ ئێوە ئاوم دەردەهێنا، جا دۆڵکە ئاوێکیان بۆ دەرهێنا و خواردیەوە.

١٨٩٨ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَعِيدٍ الأَصْبَهَانِيُّ، أَخْبَرَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ بِهَذَا»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی کەسی موحریم کاتێ وەفات دەکات چی لێ دەکرێت

١٨٩٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَيْنَا رَجُلٌ وَاقِفٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَرَفَةَ فَوَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ أَوْ قَالَ فَأَقْعَصَتْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُحَنِّطُوهُ وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا پیاوێک وەستابوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە، لە ناکاو لەسەر سواریەکەی کەوتە خوارەوە، یان وتی: سواریەکەی پێی لێنا و ڕاستەوخۆ وەفاتی کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بە ئاو و سیدر بیشۆرن و لە دوو پارچە جل کفنی بکەن و بۆنداری مەکەن و سەریشی دامەپۆشن، چونکە خوای بەرز زیندووی دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا بە دەم زیکری: (لبیک اللهم لبیک...).

## بابەت: زیکر و یادی خوا کردن لە تەواف و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەدا

١٩٠٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّمَا جُعِلَ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ، وَرَمْيُ الْجِمَارِ، وَالسَّعْيُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لإِقَامَةِ ذِكْرِ اللهِ قَالَ أَبُو عَاصِمٍ كَانَ يَرْفَعُهُ»[٣].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: تەواف لە دەوری بەیت و، ڕەجمی شەیتان و، هاتن و چوون لە نێوان صەفا و مەڕوە تەنها بۆ بەرپاکردنی زیکر و یادی خوا دانراون.

ئەبو عاصم وتویەتی: (عوبەیدوڵڵا) بە فەرموودەیەکی مەرفوع دەیگێڕایەوە (واتە: دەیوت: قسەی پێغەمبەری خوایە ﷺ).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

١٩٠١ - «أَخْبَرَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەوە هەمان شت لە ڕێگای دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی حەج و (گۆڕینی بۆ عومرە)

١٩٠٢ - «عَنْ الْحَارِثِ بْنِ بِلَالِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَسْخُ الْحَجِّ أَلَنَا خَاصَّةً أَمْ لِمَنْ بَعْدَنَا؟ قَالَ: بَلْ لَنَا خَاصَّةً»[٢].

واتە: لە حارسي كوڕی بیلالی كوڕی حارس گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵوەشاندنەوەی حەج و (گۆڕینی بۆ عومرە) ئایا بۆ ئێمەیە بە تایبەت، یان بۆ ئەو كەسانەی دوای ئێمەشە؟ فەرمووی: بەڵكو تەنها بۆ ئێمەیە بە تایبەت.

تێبینی: پێشتر لە سەردەمی نەزانیدا پێیان حەڕام بوو لە مانگەكانی حەج، عومرە بكرێت، بۆیە پێغەمبەری خوا تا ئەو عادەتە نەزانیە بشكێنێت بە شێوەیەكی زۆر بەهێز، بۆیە لە نیەتی حەج پاشگەزی كردنەوە و نیەتەكەیان بۆ عەمرە گۆڕی تا بزانن عومرە لە مانگەكانی حەجدا دروستە، بەڵام هەڵوەشاندنەوەی حەج دروست نیە چیتر، تەنها ئەو جارە دروست بوو و حەج فەسخ ناكرێتەوە و هەڵناوەشێنرێتەوە چیتر، بەڵام عومرەش لە كاتی حەجدا دروستە.

## بابەت: ئەو كەسەی عومرە دەكات لە مانگەكانی حەجدا

١٩٠٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَا بِهَا، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ، فَقَدْ دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: ئەمە عومرەیەكە داوامان كرد هەندێك لە ئێمە بە تەنها نیەتی بۆ بهێنن و واجباتەكانی تەواو بكەن، جا هەر كەسێك هەدی و ئاژەڵ سەربڕینی نیە بۆ مەككە ئەوە با هەموو شتە حەڵاڵەكان بۆ خۆی حەڵاڵ بكاتەوە (بە جێبەجێ كردنی هەموو كارەكانی عومرە)، بە دڵنیایی عومرە چۆتە ناو (مانگەكانی) حەج تا ڕۆژی دوایی.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ منكر.

(٣) ـ صحيح.

١٩٠٤ - «عَنْ رَبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُمْ سَارُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى بَلَغُوا عُسْفَانَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي مُدْلِجٍ يُقَالُ لَهُ مالَكُ بْنُ سُرَاقَةَ أَوْ سُرَاقَةُ بْنُ مالَكٍ: اقْضِ لَنَا قَضَاءَ قَوْمٍ وُلِدُوا الْيَوْمَ. قَالَ: إِنَّ اللهَ قَدْ أَدْخَلَ عَلَيْكُمْ فِي حَجِّكُمْ هَذَا عُمْرَةً، فَإِذَا أَنْتُمْ قَدِمْتُمْ فَمَنْ تَطَوَّفَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَقَدْ حَلَّ إلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ»[1].

واتە: لە ڕەبیعی کوڕی سەبرەوە گێردراوەتەوە، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتوون تاوەکو گەیشتوون بە عوسفان، جا پیاوێک لە خێڵی بەنی مودلیج کە پێی دەوترا مالیکی کوڕی سوڕاقە ـ یان سوڕاقەی کوڕی مالیک پێی وت: بڕیار و شتێکمان بۆ بڵێ (تاوەکو لەسەری بڕۆین لەمڕۆ بەدواوە) وەک خەڵکانێک ئەمڕۆ لە دایک ببن (چۆن لەمڕۆ بەدواوە ژیانیان دەست پێ دەکەن، ئێمەش لەو بڕیارە وادەبین)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بێگومان خوا عومرەی بۆ خستونەتە ناو حەجەوە (واتە یەک کردار بۆ هەردووکیان ئەنجام دەدرێت)، جا کاتێ هاتن (بۆ حەج کردن) هەر کەسێک تەواف لە دەوری بەیت بکات و ڕابکات لە نێوان صەفا و مەڕوە ئەوە لە ئیحرام دەردەچێت، تەنها کەسێک نەبێت کە هەدی و ئاژەڵ سەربڕینی هەیە.

## بابەت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند عومرەی کردوە؟

١٩٠٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ: عُمْرَةَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَعُمْرَةَ الْقَضَاءِ، أَوْ قَالَ: عُمْرَةَ الْقِصَاصِ شَكَّ شِهَابُ بْنُ عَبَّادٍ مِنْ قَابِلٍ، وَالثَّالِثَةَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ، وَالرَّابِعَةَ الَّتِي مَعَ حَجَّتِهِ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ چوار عومرەی کردوە، عومرەی حودەیبیە و، عومرەی قەزاکردنەوە ـ یان وتی: عومرەی قیصاص (تۆڵە) ـ شیهابی کوڕی عەبباد گومانی هەبووە (لە نێوان ئەم دوو ناوە) ـ لەساڵی دواتر (ئەنجامیدا، کاتێ (ساڵی پێشتر) ڕێگایان لێگیرا لەلایەن موشریکەکانەوە)، سێیەمیان عومرەی جیعڕانە، چوارەمیش ئەو عومرەی لەگەڵ حەجەکەیدا ئەنجامیدا.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی عومرە لە ڕەمەزاندا

١٩٠٦ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِامْرَأَةٍ: اعْتَمِرِي فِي رَمَضَانَ، فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً»[3].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئافرەتێکی فەرموو: عومرە بکە لە ڕەمەزاندا، چونکە عومرەیەک لە ڕەمەزاندا (پاداشتەکەی) وەک حەجێک وایە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٩٠٧ - «حَدَّثَنِي يُوسُفُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ مَعْقِلٍ رَضِي اللهُ عَنْها، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً»(١).

واتە: لە یوسفی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی سەلامەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئوممو مەعقەلی (رَضِي اللهُ عَنها)، داپیریەوە گێڕاویەتیەوە كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک لە ڕەمەزاندا (پاداشتەکەی) وەک حەجێک وایە.

## بابەت: شوێنەكانی عومرە بەستن

١٩٠٨ - «عَنْ مُحَرِّشٍ الْكَعْبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ حِينَ أَنْشَأَ مُعْتَمِرًا، فَدَخَلَ مَكَّةَ لَيْلاً، فَقَضَى عُمْرَتَهُ ثُمَّ خَرَجَ مِنْ تَحْتِ لَيْلَتِهِ، فَأَصْبَحَ بِالْجِعْرَانَةِ كَبَائِتٍ»(٢).

واتە: لە موحەڕڕیشی كەعبیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە «جیعڕانە»وە دەرچوو كاتێ بوو بە عومرەكار، جا چوو بۆ مەككە بە شەو و، عومرەكەی تەواو كرد، دواتر هەر لە شەوەكەدا دەرچوو (لە مەككە و گەڕایەوە بۆ جیعڕانە) و، بەیانی لە جیعڕانە كردەوە وەک ئەوەی هەموو شەوەكە لە جیعڕانە بووبێت و دەرنەچووبێت.

تێبینی: جمهوری زانایان فەرموویانە: بۆ ئەو كەسەی لە مەككەیە بۆی دروستە لە نزیكترین شوێن عومرە ببەستێت، بەڵام لە جیعرانە سوننەتە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ بەستویەتی.

١٩٠٩ - «أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللهُ عَنهما، يَقُولُ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ أُرْدِفَ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْها، فَأُعْمِرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ»(٣).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكرەوە (رَضِي اللهُ عَنهما)، گێڕدراوەتەوە، كە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردم عائیشە (رَضِي اللهُ عَنها)، لە دواوەی خۆم سوار بكەم و عومرەشی پێ ببەستم لە «تەنعیم»ـەوە.

١٩١٠ - «عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ عَنْ أَبِيهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ: أَرْدِفْ أُخْتَكَ، يَعْنِي عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، وَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ، فَإِذَا هَبَطْتَ مِنَ الأَكَمَةِ فَمُرْهَا فَلْتُحْرِمْ، فَإِنَّهَا عُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ»(٤).

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە حەفصەی کچی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صددیقەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری فەرموو: خوشکت، واتە عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَا)، لە دوای خۆت سوار بکە و عومرەی پێ ببەستە لە «تەنعیم»ـەوە، جا کاتێ لە تەپۆڵکەکە هاتیتە خوارەوە فەرمانی پێ بکە با نیەتی ئیحرام بهێنێت، چونکە ئەوە عومرەیەکی قەبوڵکراو و وەرگیراوە.

## بابەت: دەربارەی ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە

١٩١١ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهما، أَنَّ عُمَرَ قَالَ: إِنِّي لأُقَبِّلُكَ وَإِنِّي لأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وَلَكِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْها)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر (بە بەردە ڕەشەکە)ی وت: من ماچت دەکەم، دەشزانم تۆ بەردی، بەڵام پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ماچی کردووی (بۆیە منیش ماچت دەکەم).

١٩١٢ - «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُثْمَانَ قَالَ: رَأَيْتُ مُحَمَّدَ بْنَ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ، ثُمَّ يُقَبِّلُهُ وَيَسْجُدُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذَا؟ فَقَالَ: رَأَيْتُ خَالَكَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ رِضْوَانُ اللهِ عَلَيْهِ، يَفْعَلُهُ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ فَعَلَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ وَلَكِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَفْعَلُ هَذَا»[2].

واتە: لە جەعفەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موحەممەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەر دەستیدا لە بەردە ڕەشەکە، دواتر ماچی کرد و کڕنووشی لەسەر برد، منیش پێم وت: ئەوە چیە؟! ئەویش وتی: خاڵی تۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم ﷺ بینیوە ئاوای کرد، دواتر عەبدوڵڵا وتی: عومەرم بینیوە ئاوای کرد، دواتر (عومەر) وتی: من دەزانم تۆ بەردی، بەڵام پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ئاوای کردوە.

## بابەت: نوێژ کردن لەناو کەعبەدا

١٩١٣ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَكَّةَ وَرَدِيفُهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَأَنَاخَ فِي أَصْلِ الْكَعْبَةِ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَسَعَى النَّاسُ فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ وَبِلاَلٌ وَأُسَامَةُ، فَقُلْتُ لِبِلاَلٍ مِنْ وَرَاءِ الْبَابِ: أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ: بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ ناو مەككە و ئوسامەی كوڕی زەیدیش لە دواوەی سوار ببوو، جا وشترەكەی لە ژێر بینای كەعبە یەخ كرد، ئیبنو عومەر وتویەتی: خەڵكیش تەوافیان دەكرد، جا پێغەمبەر ﷺ و بیلال و ئوسامە چوونە ژوورەوە (بۆ ناو كەعبە)، منیش لە پشت دەرگاوە بە بیلالم وت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كوێ نوێژی كرد (لەناو كەعبە)؟ (بیلالیش) وتی: لە نێوان دوو دینگەكان.

١٩١٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْبَيْتَ هُوَ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلاَلٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئوسامەی كوڕی زەید و بیلال و عوسمانی كوڕی تەڵحەی حەجەبی چوونە ناو بەیت (ناو كەعبە) و هەمان شتی فەرموودەكەی پێشەوەی باس كرد.

## بابەت: حیجر بەشێكە لە بەیت (لە كەعبە)

١٩١٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْلاَ حَدَاثَةُ عَهْدِ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ، لَنَقَضْتُ الْكَعْبَةَ، ثُمَّ لَبَنَيْتُهَا عَلَى أُسِّ إِبْرَاهِيمَ، فَإِنَّ قُرَيْشًا حِينَ بَنَتْ اسْتَقْصَرَتْ، ثُمَّ جَعَلَتْ لَهَا خَلْفًا»[2].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت قەومەكەت لە سەردەمی كوفر نزیكن (تازە ئیسلامیان ناسیوە)، ئەوە كەعبەم هەڵدەوەشاندەوە، دواتر دروستم دەكردەوە لەسەر بناغەی (پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ)، چونكە قوڕەیش كاتێ دروستیان كرد بە كەمی و بچوكی دروستیان كرد، دواتر یەك دەرگایان بۆ دانا.

١٩١٦ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الحَجَرِ أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: نَعم. قُلْتُ: فَمَا لَهُمْ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي الْبَيْتِ؟ فَقَالَ: إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا؟ قَالَ: فَعَلَ ذَلِكَ قَوْمُكِ لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاءُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاءُوا، وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ، لَعَمَدْتُ إِلَى الحِجْرِ فَجَعَلْتُهُ فِي الْبَيْتِ وَأَلْزَقْتُ بَابَهُ بِالأَرْضِ»[3].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی بەردە ڕەشەكە كە ئایا بەشێكە لە بیت (لە كەعبە)؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی بۆچی نەیانخستۆتە ناو بەیتەوە (ناو كەعبەوە)؟ ئەویش فەرمووی: قەومەكەت تێچوو كورتی پێ هەڵهێنان (واتە: لەبەر پارە و مەسرەف كەعبەیان بە كەموكوڕی و بچوكی دروست كرد)، منیش وتم: ئەی بۆچی دەرگای بڵندە؟

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

فەرمووی: ئەوە قەومەکەت وایان کردوە، تاوەکو ئەو کەسە بکەنە ژوورەوە کە مەبەستیانە، وە ڕێگری لەو کەسەش بکەن کە مەبەستیانە، وە ئەگەر قەومەکەت لە سەردەمی نەزانی نزیک نەبوونایە، چونکە دەترسم دڵیان پێی ناخۆش بێت و (کار لە ئیمانیان بکات)، ئەوە تا دەگاتە حیجر دەمڕوخاند و دەمخستە ناو بەیت (ناو کەعبە) و دەرگاکەشم (ڕاستەوخۆ) بە زەویەکەوە دەلکاند (ژێرەکەیم دەخستە سەر زەوی و نەویم دەکرد).

## بابەت: دەربارەی تەحصیب

١٩١٧ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: التَّحْصِيبُ لَيْسَ بِشَيْءٍ، إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد «التَّحْصِيبُ مَوْضِعٌ بِمَكَّةَ وَهُوَ مَوْضِعٌ بِبَطْحَاءَ»[١].

واتە: لە عەتائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) بوو دەیوت: (مانەوە) لە تەحصیب (کە شوێنێکە لە نێوان مەککە و مینا، کە نزیکترە لە مینا) هیچ نیە (واتە: واجب نیە و لە کاروباری حەجدا نیە)، ئەوە تەنها شوێنێکە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دابەزیوە و ماوەتەوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: تەحصیب شوێنێکە لە مەککە، وە شوێنێکە لە بەطحاء.

تێبینی: موحەصصیب ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ڕەجم کردن و مانەوە لە مینا چۆتە ئەوێ و سوننەتە کەسی حاجی وەک پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە ئەوێ، بەڵام واجب نیە و پەیوەندی بە فەڕز و واجباتی حەج نیە.

## بابەت: (کەسی حاجی) چەند نوێژ دەکات لە مینا تاوەکو دەچێت بۆ عەرەفات؟

١٩١٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمِنًى خَمْسَ صَلَوَاتٍ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا پێنج نوێژی کرد.

١٩١٩ - «عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ: حَدِّثْنِي بِشَيْءٍ عَقَلْتَهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَيْنَ صَلَّى الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ قَالَ: بِمِنًى. قَالَ: قُلْتُ: فَأَيْنَ صَلَّى الْعَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بِالأَبْطَحِ، ثُمَّ قَالَ: اصْنَعْ مَا يَصْنَعُ أُمَرَاؤُكَ»[٣].

واتە: لە عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ وت: شتێکم بۆ بگێڕەوە کە لەبەرت کردبێت و تێگەیشتبێتی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، (پێغەمبەری خوا

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ﷺ) له كوێ نوێژی نیوەڕۆی كرد له ڕۆژی تەڕوویه (له هەشتەم ڕۆژی ذي الحجة)؟ وتی: له مینا، دەڵێ: وتم: ئەی له كوێ نوێژی عەسری كرد له ڕۆژی نەفر (ڕۆژی دەرچوون له مینا)؟ وتی: له ئەبتەح، دواتر وتی: ئەوە ئەنجام بدە كه كاربەدەستەكانت ئەنجامی دەدەن (چونكه ئەوكات كاربەدەستەكان لەسەر سوننەت دەڕۆیشتن).

١٩٢٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّهُ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَرَقَدَ رَقْدَةً بِمِنًى، ثُمَّ رَكِبَ إِلَى الْبَيْتِ فَطَافَ بِهِ»[١].

واتە: له ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشای كرد و سەرخەوێكی شكاند (خەوت) له مینا، دواتر سواری سواریەكەی بوو (ڕۆیشت) بۆ لای بەیت و تەوافی بە دەوری كرد.

## بابەت: كورت كردنەوەی نوێژ له مینا

١٩٢١ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ وَصَلَّى مَعَ عُثْمَانَ بِمِنًى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ: لَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي هَذَا الْمَكَانِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُمَرَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ تَفَرَّقَتْ بِكُمُ الطُّرُقُ، فَلَيْتَ حَظِّي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَانِ مُتَقَبَّلَتَانِ»[٢].

واتە: له عەبدوڕڕەحمانی كوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا وتی: نوێژی لەگەڵ عوسمان كردوە له مینا بە چوار ڕەكعەت، وە وتویەتی: بە دڵنیایی نوێژم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ كرد لەم شوێنە بە دوو ڕەكعەت دوو ڕەكعەت، وە لەگەڵ ئەبوبەكردا بە دوو ڕەكعەت دوو ڕەكعەت، وە لەگەڵ عومەردا بە دوو ڕەكعەت دوو ڕەكعەت، دواتر ڕێچكەكان جیاوازیان خستە نێوانتان، خۆزگە و بریا پشكی من له چوار ڕەكعەت دوو ڕەكعەتی قەبوڵكراو بووایە.

تێبینی: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود پێی دروست بووە كه نوێژ بە تەواوی بكرێت و كورت نەكرێتەوە له مینا، بەڵام پێی باشتر بوو لەسەر ڕێچكە و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕۆیشتنایە و وەک ئەو كورتیان بكردایەتەوە، بەڵام كه ئیمامی عوسمان كورتی نەكردەوە ئەویش كورتی نەكردەوە و وتی: نامەوێ خیلاف و جیاوازی دروست بكەم له نێوان مسوڵمانان، چونكه جیاوازی دروست كردنم پێ خراپتر و ناخۆشترە.

١٩٢٢ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ وَأَبَا بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ وَعُمَرَ رَكْعَتَيْنِ، وَعُثْمَانَ رَكْعَتَيْنِ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا بَعْدُ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە سالمەوە گێردراوەتە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە مینا کرد بە دوو ڕەکعەت، وە ئەبوبەکریش بە دوو ڕەکعەت کردی، وە عومەریش بە دوو ڕەکعەت کردی، وە عوسمانیش بە دوو ڕەکعەت کردی لە سەرەتای کاربەدەست بوونی، دواتر بە تەواوی کردی بە چوار ڕەکعەت.

## بابەت: چی دەکرێت لە هاتنەوە لە مینا بۆ عەرەفە؟

١٩٢٣ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ مِنًى فَمِنَّا مَنْ يُكَبِّرُ وَمِنَّا مَنْ يُلَبِّي»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە مینا (بۆ عەرەفە)، جا هەندێک لە ئێمە (الله أكبر)یان دەکرد، وە هەندێکی تریش لە ئێمە تەلبیەیان دەکرد (واتە دەیانوت: لبیک اللهم لبیک...).

١٩٢٤ - «حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مالَكٍ ﷺ وَنَحْنُ غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ عَنِ التَّلْبِيَةِ، كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: كَانَ يُلَبِّي الْمُلَبِّي فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری ئەقەفیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کرد لەکاتێکدا ئێمە دەڕۆشتین لە میناوە بۆ عەرەفات (پرسیارم لێ کرد) دەربارەی تەلبیە، وتم: ئێوە چۆنتان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: ئەوەی (لبیک اللهم لبیک)ی دەوت (پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕێگری لێ نەدەکرد، ئەوەیشی تەکبیر و (الله أكبر)ی دەکرد ڕێگری لێ نەدەکرد.

## بابەت: وەستان لە عەرەفە

١٩٢٥ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ جُبَيْرٌ: أَضْلَلْتُ بَعِيرًا لِي فَذَهَبْتُ أَطْلُبُهُ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَاقِفًا مَعَ النَّاسِ بِعَرَفَةَ، فَقُلْتُ: وَاللهِ إِنَّ هَذَا لَمِنَ الْحُمْسِ فَمَا شَأْنُهُ هَا هُنَا»[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: جوبەیر وتویەتی: وشترێکی خۆم ون کرد و چووم بەدوایدا بگەڕێم، جا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەگەڵ خەڵکی وەستابوو لە عەرەفە، منیش (لە دڵی خۆم) وتم: سوێند بە خوا ئەمە کارێکی گرنگە بۆچی لێرەدا وەستاوە؟

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: عەرەفە هەمووی شوێنی وەستانە

١٩٢٦ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَمَى، ثُمَّ قَعَدَ لِلنَّاسِ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ، قَالَ: لاَ حَرَجَ. ثُمَّ جَاءَهُ آخَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، طُفْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، قَالَ: لاَ حَرَجَ. قَالَ: فَمَا سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ قَالَ: لاَ حَرَجَ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ مُزْدَلِفَةَ مَوْقِفٌ، وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ طَرِيقٌ وَمَنْحَرٌ»[١].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی (شەیتانی) کرد، دواتر بۆ خەڵکی دانیشت (تا کاروبار و پرسیاریان جێبەجێ بکات)، جا پیاوێک هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من سەرم تاشیوە پێش ئەوەی (قوربانیەکەم) سەر ببڕم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تاوانی تیا نیە (کێشە نیە، دروستە)، دواتر پیاوێکیتر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافم کردوە پێشی ڕەجم کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تاوانی تیا نیە (کێشە نیە، دروستە)، (جابر) دەڵێ: جا پرسیاری دەربارەی هەر شتێک لێکرا حەتمەن فەرمووی: تاوانی تیا نیە (کێشە نیە، دروستە)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو (خاکی) عەرەفە شوێنی وەستانە، وە هەموو (خاکی) موزدەلیفە شوێنی وەستانە، وە هەموو (خاکی) مینا کوشتارگەیە (بۆ هەدی و قوربانیەکان)، وە هەموو کوچە و ڕێگایەکی مەککە ڕێگا و کوشتارگەیە (دەتوانن ئاژەڵەکانتان تیا سەربڕن).

## بابەت: ڕۆیشتن چۆنە لە کاتی گەڕانەوە لە عەرەفە؟

١٩٢٧ - «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ، وَكَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا أَتَى عَلَى فَجْوَةٍ، نَصَّ»[٢].

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە لە دواوەی پێغەمبەر ﷺ سوار بووە، پێغەمبەریش ﷺ لە عەرەفە گەڕاوەتەوە و، بە شێوەیەکی مامناوەند دەڕۆیشت، جا کاتێ دەگەیشت بە بۆشاییێک و چۆڵییێک بە خێرایی دەڕۆیشت.

## بابەت: کۆکردنەوەی دوو نوێژ

١٩٢٨ - «أَخْبَرَنِي كُرَيْبٌ، أَنَّهُ سَأَلَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَخْبِرْنِي عَشِيَّةَ رَدِفْتَ النَّبِيَّ ﷺ، كَيْفَ فَعَلْتُمْ - أَوْ صَنَعْتُمْ؟ قَالَ: جِئْنَا الشِّعْبَ الَّذِي يُنِيخُ النَّاسُ فِيهِ لِلْمُعَرَّسِ، فَأَنَاخَ رَسُولُ اللهِ ﷺ نَاقَتَهُ، ثُمَّ بَالَ - وَمَا قَالَ: أَهْرَاقَ الْمَاءَ - ثُمَّ دَعَا بِالْوَضُوءِ فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا لَيْسَ بِالسَّابِغِ جِدًّا، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ الصَّلاَةَ، قَالَ:

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

الصَّلاَةُ أَمَامَكَ. قَالَ: فَرَكِبَ حَتَّى قَدِمْنَا الْمُزْدَلِفَةَ، فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ وَالنَّاسُ فِي مَنَازِلِهِمْ، فَلَمْ يَحِلُّوا حَتَّى أَقَامَ الْعِشَاءَ الآخِرَةَ، فَصَلَّى، ثُمَّ حَلَّ النَّاسُ، قَالَ: قُلْتُ: أَخْبِرْنِي كَيْفَ فَعَلْتُمْ حِينَ أَصْبَحْتُمْ؟ قَالَ: رَدِفَهُ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ فَانْطَلَقْتُ أَنَا فِي سُبَّاقِ قُرَيْشٍ عَلَى رِجْلَيَّ»[١].

واتە: لە كورەيبەوە گێردراوەتەوە، كە پرسیاری لە ئوسامەی كوڕی زەید ﷺ كردوە، وتویەتی: بۆم بگێڕەوە ئەو ئێوارەیەی لە دواوەی پێغەمبەر ﷺ سوارببووی، چیتان كرد؟ وتی: هاتین بۆ ئەو دۆڵەی خەڵك سواریەكانی تیا یەخ دەكات بۆ دابەزین و حەسانەوە لە كۆتایی شەودا، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) وشترەكەی یەخ كرد، دواتر (بە صەڕاحەت و بێ پێچ و پەنا وتی:) میزی كرد ـ نەیوت: ئاوی ڕشت ـ دواتر داوای ئاوی دەستنوێژی كرد و دەستنوێژی شۆرد دەستنوێژێك زۆر بە تێروتەسەلی نەبوو (وەك جاران)، دواتر وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ نەكەین؟ فەرمووی: نوێژ لە پێشتەوەیە (واتە: جەمع و تەئخیر دەكەین)، دەڵێ: جا سوار بوو (ڕۆیشتین) تا چووینە موزدەلیفە و مەغریب لەوێ گیرسایەوە، دواتر وشترەكەی یەخ كرد و خەڵكیش لە شوێنی خۆیان بوون و بارگەكانیان نەكردەوە تاوەكو عیشاش لەوێ مایەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی كرد (نوێژی مەغریب و عیشا)، دواتر خەڵك بارگەكانیان كردەوە و دایانكوتا، (كورەیب) دەڵێ: وتم: (ئەی ئوسامە) پێم بڵێ چیتان كرد كاتێ بەیانیتان كردەوە (كاتێ ڕۆژداهات)؟

وتی: (ئەو كات من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووم) فەزلی كوڕی عەبباس لە دواوەی سوار بوو، منیش بە پێ ڕۆیشتم لەگەڵ ئەو قوڕەیشیانەی بە پەلە ڕۆیشتن.

١٩٢٩ - «أَخْبَرَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ كُرَيْبِ بْنِ أَبِي مُسْلِمٍ، عَنْ أُسَامَةَ ﷺ نَحْوَهُ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێردراوەتەوە.

١٩٣٠ - «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، يَعْنِي بِجَمْعٍ»[٣].

واتە: لە ئەیوبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای كۆكردەوە.

١٩٣١ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، لَمْ يُنَادِ فِي وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا إلاَّ بِالإِقَامَةِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا، وَلاَ عَلَى إِثْرِ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە سالمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مەغریب و عیشای لە موزدەلیفە کرد، بۆ هیچێکیان بانگی نەدا (فەرمانی نەکرد بانگ بدرێت)، تەنها قامەت کرا، وە هیچ نوێژێکی سوننەتی نەکرد نە لە نێوانیان و، نە لە دواوەی هیچێکیان.

## بابەت: مۆڵەتدان بە ڕۆیشتن لە موزدەلیفە بە شەو

١٩٣٢ - «أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَهَا أَنْ تَنْفِرَ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ»[1].

واتە: لە ئوممو حەبیبەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردوە کە لە جەمع (واتە: لە موزدەلیفە) بڕوات بە شەو.

١٩٣٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا قَالَتْ: اسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يَأْذَنَ لَهَا فَتَدْفَعَ قَبْلَ أَنْ يَدْفَعَ، فَأَذِنَ لَهَا، - قَالَ الْقَاسِمُ وَكَانَتِ امْرَأَةً ثَبِطَةً وَقَالَ الْقَاسِمُ: الثَّبِطَةُ: الثَّقِيلَةُ - فَدَفَعَتْ وَحُبِسْنَا مَعَهُ حَتَّى دَفَعْنَا بِدَفْعِهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلأَنْ أَكُونَ اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَمَا اسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ فَأَدْفَعَ قَبْلَ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مَفْرُوحٍ بِهِ»[2].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەودەی کچی زەمعە مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەری خوا ﷺ تا مۆڵەتی بدات تا بڕوات پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕوات، (پێغەمبەری خواش ﷺ) ڕێگەی پێدا ـ قاسم وتویەتی: (سەودە) ئافرەتێکی قورس و بە سەنگ بوو (بۆ ڕۆیشتن) ـ جا سەودە ڕۆیشت و ئێمە نەڕۆیشتین، لەگەڵ (پێغەمبەری خوادا ﷺ) ماینەوە تا ڕۆیشتین لەگەڵ ڕۆیشتن و بەڕێکەوتنی پێغەمبەری خوادا ﷺ، عائیشە وتویەتی: ئەگەر منیش مۆڵەتم لێ بخواستایە وەک سەودە مۆڵەتی خواست و پێشی خەڵکی بڕۆیشتمایە پێم خۆشتر بوو لە (بەدەستهێنانی) شتێکی دڵخۆشکەر.

## بابەت: حەج بەچی تەواو دەبێت؟

١٩٣٤ - «حَدَّثَنَا بُكَيْرُ بْنُ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَعْمُرَ الدِّيلِيَّ يَقُولُ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْحَجِّ، فَقَالَ: الْحَجُّ عَرَفَاتٌ - أَوْ قَالَ عَرَفَةَ - وَمَنْ أَدْرَكَ لَيْلَةَ جَمْعٍ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ فَقَدْ أَدْرَكَ. وَقَالَ: أَيَّامُ مِنًى ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ: ﴿ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴿٢٠٣﴾ ﴾ البقرة»[3].

واتە: لە بوکەیری کوڕی عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەعموری دیلی بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی حەج و فەرمووی: حەج عەرەفاتە ـ یانیش فەرمووی: عەرەفەیە ـ وە هەر کەسێک بە شەوی جەمع (واتە: بە شەوی موزدەلیفە) ڕابگات پێشی نوێژی بەیانی ئەوە بە مانەوەی موزدەلیفە ڕاگەیشتووە، وە فەرمووی: ڕۆژانی مینا سێ ڕۆژن:

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

﴿ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴿٢٠٣﴾ ﴾ البقرة، واته: [ئەوەی پەلە بكات و لە دوو ڕۆژان شەیتان ڕەجم بكات ئەوە هیچ گوناهی لەسەر نیە، ئەوەیشی كە دوای بخات و (بە سێ ڕۆژ ئەنجامی دەدات) هەر گوناهی لەسەر نیە].

١٩٣٥ - «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِالْمَوْقِفِ عَلَى رُءُوسِ النَّاسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، جِئْتُ مِنْ جَبَلِ طَيِّءٍ أَكْلَلْتُ مَطِيَّتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللهِ إِنْ بَقِيَ جَبَلٌ إِلاَّ وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي حَجٌ؟ قَالَ: مَنْ شَهِدَ مَعَنَا هَذِهِ الصَّلاَةَ، وَقَدْ أَتَى عَرَفَاتٍ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ قَضَى تَفَثَهُ، وَتَمَّ حَجُّهُ»[١].

واتە: لە عوروەی كوڕی موزەرریسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە لەناو ئاپۆڕای خەڵک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە چیای (طَيِّءٍ)، هاتووم دوای ئەوەی وشترەكەم و خۆمم ماندو كردوە، سوێند بە خوا ئەگەر تاكە چیایێكیش بمێنێ حەتمەن لەسەری دەوەستم، جا ئایا حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر كەسێک لەگەڵمان لەو نوێژە ئامادە بێت و هاتبێت بۆ عەرەفات بەر لەوە، جا بە شەو بێت یان بە ڕۆژ، ئەوە مەناسیكەكانی تەواو كردوە و حەجەكەی تەواو بووە.

١٩٣٦ - «أَخْبَرَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسِ بْنِ حَارِثَةَ بْنِ لاَمٍ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: كاتی بەڕێكەوتن و ڕۆیشتن لە موزدەلیفە

١٩٣٧ - «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يُفِيضُونَ مِنْ جَمْعٍ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَكَانُوا يَقُولُونَ: أَشْرِقْ ثَبِيرُ لَعَلَّنَا نُغِيرُ، وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَالَفَهُمْ فَدَفَعَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، بعد صَلاَةِ الْمُسْفِرِينَ، أَوْ قَالَ: الْمُشْرِقِينَ، بِصَلاَةِ الْغَدَاةِ»[٣].

واتە: لە عومەری كوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار خەڵكی سەردەمی نەزانی دەگەڕانەوە لە جەمع (واتە: لە موزدەلیفە) پاش ڕۆژهەڵاتن و دەیانوت: ئەی (ثَبِيرُ): (كە ناوی چیایێكە لەوێ) زوكە ڕۆژت بەسەدا هەڵبێ تاوەكو بە خێرایی بڕۆین، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پێچەوانەی ئەمانی كرد، پێشی ڕۆژهەڵات بەڕێكەوت بە نوێژی بەیانی بە ئەندازە و كاتی نوێژی ئەو كەسانەی ڕووناكی تەواو دادەهێنن بۆ نوێژی بەیانی (واتە: پێغەمبەری خوا كەمێک پێشی ڕۆژهەڵات بەڕێ كەوتووە، كاتێ تەواو ڕووناک داهاتووە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: خێرا ڕۆیشتن لە دۆڵی موحەسسیر

۱۹۳۸ - «عَنْ الْفَضْلِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي عَشِيَّةِ عَرَفَةَ وَغَدَاةِ جَمْعٍ حِينَ دَفَعُوا: عَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ، وَهُوَ كَافٌّ نَاقَتَهُ حَتَّى إِذَا دَخَلَ وَادِيَ مُحَسِّرٍ، أَوْضَعَ»[۱].

واتە: لە فەزلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە ئێوارەی عەرەفە و بەیانی موزدەلیفە کاتێ بەڕێکەوتن فەرمووی: دەست بە ئارامیەوە بگرن (زۆر پەلە مەکەن)، لەکاتێکدا (پێغەمبەری خوا ﷺ) وشترەکەی دەگرتەوە و نەیدەهێشت خێرا بڕوات تاوەکو چوو بۆ دۆڵی موحەسسیر (لەوێ) خێرا ڕۆیشت.

۱۹۳۹ - «أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ ﷺ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ»[۲].

واتە: هەمان فەرمووده بە هەمان سەنەد لە زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی ڕێگەی حەج کردنی لێ دەگیرێت بەهۆی دوژمنەوە

۱۹٤۰ - «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَسَالِمًا كَلَّمَا ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا لَيَالِيَ نَزَلَ الْحَجَّاجُ بِابْنِ الزُّبَيْرِ قَبْلَ أَنْ يُقْتَلَ فَقَالاَ: لاَ يَضُرُّكَ أَنْ لاَ تَحُجَّ الْعَامَ نَخَافُ أَنْ يُحَالَ بَيْنَكَ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَقَالَ: قَدْ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مُعْتَمِرِينَ، فَحَالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ دُونَ الْبَيْتِ، فَنَحَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ هَدْيَهُ، وَحَلَقَ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَجَعَ، فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ عُمْرَةً، فَإِنْ خُلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ الْبَيْتِ، طُفْتُ، وَإِنْ حِيلَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَعَلْتُ كَمَا كَانَ فَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ، فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ سَارَ فَقَالَ: إِنَّمَا شَأْنُهُمَا وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجًّا مَعَ عُمْرَتِي. قَالَ نَافِعٌ فَطَافَ لَهُمَا طَوَافًا وَاحِدًا، وَسَعَى لَهُمَا سَعْيًا وَاحِدًا، ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى جَاءَ يَوْمَ النَّحْرِ فَأَهْدَى، وَكَانَ يَقُولُ: مَنْ جَمَعَ الْعُمْرَةَ وَالْحَجَّ فَأَهَلَّ بِهِمَا جَمِيعًا، فَلاَ يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا يَوْمَ النَّحْرِ»[۳].

واتە: لە نافیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا و سالم قسەیان لەگەڵ ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) کرد لەو شەوانەی حەججاج هات بۆ ئیبنو زوبەیر، پێش ئەوەی بکوژرێ، جا وتیان: هیچ نیە ئەگەر ئەم ساڵ حەج نەکەیت، دەترسین بەربەست بخرێتە بەینی تۆ و کەعبە (نەهێڵن حەج بکەیت و ڕێگریت لێ بکەن)، ئیبنو زوبەیریش وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بە عومرەداری، جا کافرەکانی قورەیش ڕێگریان کرد لە چوون بۆ بەیت ئەوکات (بۆ ناو مزگەوتی حەرام، کەعبە)، پێغەمبەری خواش ﷺ هەدی و ئاژەڵەکەی خۆی سەر بڕی و سەری خۆی تاشی،

---

(۱) ـ صحيح.

(۲) ـ صحيح.

(۳) ـ صحيح.

دواتر گەڕایەوە، جا من تێوە دەکەمە شاهێد کە ئەوە عومرەیەکم لەسەر خۆم واجب کردو (نەزرم کرد عومرەیەک بکەم)، جا ئەگەر ڕێگەم بۆ چۆڵکرا لەنێوان خۆم و بەیت (واتە: ئەگەر ڕێگەم لێ نەگیرا)، ئەوە تەواف دەکەم و (عەمرەی خۆم دەکەم)، ئەگەر ڕێشم لێگیرا لە بەیت، ئەوە ئەنجام دەدەم کە پێغەمبەری خوا ئەنجامیدا لەکاتێکدا لەگەڵی بووم، جا ئیحرامی بەست بە عومرە لە (ذي الحليفة) دواتر ڕۆیشت (بۆ ئەنجامدانی عومرەکەی)، هەروەها وتی: کار و مەناسیکەکانی حەج و عومرە وەکو یەکن، کەواتە: (مادەم هەردووکیان مەناسیکەکانیان وەکو یەکن) ئەوە دەتانکەم بە شاهێد کە من حەجێکم واجب کرد (کردم بە نەزر) لەگەڵ عومرەکەم.

نافیع دەڵێ: جا یەک تەوافی بۆ حەج و عومرە کرد و، یەک ڕۆیشتنی نێوان صەفا و مەڕوەی بۆ هەردووکیان کرد و، دواتر لەژێر ئیحرام نەهاتە دەرەوە تاوەکو ڕۆژی قوربان هات و ئاژەڵەکەی سەربڕی، وە دەیوت: هەر کەسێک عومرە و حەجی بەیەکەوە کۆکردەوە ئەوە ئیحرام بۆ هەردووکیان دەبەستێت بەیەکەوە و، لەژێر ئیحرامیش نایێتە دەرەوە تاوەکو کۆتایی بەهەردووکیان نەهێنێت بە یەکەوە لە ڕۆژی قورباندا.

١٩٤١ - «عَنْ الْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كُسِرَ أَوْ عُرِجَ فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى»[١].

واتە: لە حەججاجی کوڕی عەمری ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک (لە حەجدا شوێنێکی) شکێنرا یان شەلەکرا (نەیتوانی حەجەکەی تەواو بکات) ئەوە کۆتایی هێنان و ئیحرام شکاندنی بۆ حەڵاڵە و حەجێکی تری لەسەر واجبە (دەبێ حەجێکی تر بە تەواوی ئەنجام بدات و ئەو حەجە قەزا بکاتەوە).

## بابەت: دەربارەی جەمەڕەی عەقەبە لە چ کاتێک ڕەجم دەکرێت

١٩٤٢ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللهِ ﷺ الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ: الضُّحَى، وَبَعْدَ ذَلِكَ عِنْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ»[٢].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ جەمەڕەی عەقەبەی ڕەجم کرد لە ڕۆژی قورباندا بە چێشتەنگا و، وە دواتر (واتە: ڕۆژانی دوای ڕۆژی قوربان) ڕەجمی کرد لە دوای لادانی ڕۆژ (واتە: دوای نیوەڕۆ).

١٩٤٣ - «عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرْخَصَ لِرِعَاءِ الإِبِلِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْمُوا الْغَدَ أَوْ مِنْ بَعْدِ الْغَدِ لِيَوْمَيْنِ، ثُمَّ يَرْمُوا يَوْمَ النَّفْرِ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو بەدداحی کوڕی عاصمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتیدا بە شوانەکانی وشتر لەوەی ڕەجم نەکەن لە ڕۆژی قوربان‌دا (کە واجبە لەسەر کەسانی تر لەم ڕۆژەدا)، دواتر ڕەجم بکەن لە ڕۆژی دواتر (واتە: یەکەم ڕۆژی تەشریق)، یان لە ڕۆژی دوای ئەو (واتە: ڕۆژی دووەمی تەشریق)، یان لە ڕۆژی دووەم (واتە: ئەو ڕۆژانەی کە ڕەجمی تێدا دەکەن بریتیە لە ڕۆژی دووەم لە چوار ڕۆژەکان، کە دەکاتە ڕۆژی یەکەمی تەشریق)، دواتر ڕەجم بکەن لە ڕۆژی جێهێشتنی مەککە (کە دەکاتە ڕۆژی سێیەم لە چوار ڕۆژەکان، کە دەکاتە ڕۆژی دوەمی تەشریق).

## بابەت: دەربارەی ڕەجم کردن بە بەردی هاوشێوەی بەردی پەلاپیتکە

١٩٤٤ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ أَنْ نَرْمِيَ الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ»(١).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عوسمانی تەیمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین لە حەجی ماڵئاواییدا کە ڕەجم بکەین بە هاوشێوە و ئەندازەی بەردی پەلاپیتکە (واتە: ئەو بەردانەی بە ئەندازەی دەنکە نۆکن لە سەردەمی نەزانی خەڵکی بە گاڵتە بە نێوانی پەنجەکانیان لە یەکتریان دەگرت، لایخۆشمان بەو کارە دەوترێت پەلاپیتکە، جا ئەو حەجم و ئەندازەی ئەو جۆرە بەردە بۆ ڕەجم بەکار دێت).

١٩٤٥ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَرَمَوْا بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ، وَأَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ وَقَالَ: عَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ»(٢).

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوون و، ڕەجمیان کردوە بە هاوشێوەی بەردی پەلاپیتکە، وە (پێغەمبەری خوا ﷺ)، خێرا ڕۆیشت لە دۆڵی موحەسسیر و فەرمووی: دەست بە لەسەرەخۆیی و ئارامیەوە بگرن (واتە: ئارامبن و زۆر پەلە مەکەن).

١٩٤٦ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاذٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُنَا أَنْ نَرْمِيَ الْجِمَارَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ، قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُعَاذٍ لَهُ صُحْبَةٌ؟ قَالَ: نَعم»(٣).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موعازەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین کە ڕەجم بکەین بە هاوشێوەی ئەندازەی بەردی پەلاپیتکە (کە بە ئەندازەی دەنکە نۆکە).

بە ئەبو موحەممەد وترا: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موعاز هاوەڵایەتی (لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ) هەبووە (صەحابە بووە)؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی شەیتان ڕەجم كردن بە سواری

١٩٤٧ - «عَنْ قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمَّارٍ الْكِلاَبِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَرْمِي الْجِمَارَ عَلَى نَاقَةٍ صَهْبَاءَ لَيْسَ ثَمَّ ضَرْبٌ، وَلاَ طَرْدٌ، وَلاَ إِلَيْكَ إِلَيْكَ»[١].

واتە: لە قودامەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەمماری كیلابیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی جەمەڕەی عەقەبەی ڕەجم دەكرد لەسەر وشترێكی مێی سوربا و، لەوێ لێدان و ڕێگری و زەخت و پاڵپێوەنان و گۆتەی لاچۆ لاچۆ نەبوو (واتە: زۆر بە ئارامی كارەكە بەڕێوەدەچوو).

١٩٤٨ - «عَنْ الْفَضْلِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ»[٢].

واتە: لە فەزلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لە دواوەی پێغەمبەری خواوە ﷺ سواربووم، بەبەردەوامی (لبيک اللهم لبيک)ی دەكرد تاوەكو جەمەڕەی عەقەبەی ڕەجم كرد.

## بابەت: ڕەجم كردن لە بەطنول وادی و الله أكبر كردن لەگەڵ هەموو بەردێكدا

١٩٤٩ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ الَّتِي تَلِي الْمَسْجِدَ - مَسْجِدَ مِنًى - يَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ تَقَدَّمَ أَمَامَهَا فَوَقَفَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ، وَكَانَ يُطِيلُ الْوُقُوفَ، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْحَدِرُ ذَاتَ الْيَسَارِ مِمَّا يَلِي الْوَادِي رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الْعَقَبَةِ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا، قَالَ الزُّهْرِيُّ: سَمِعْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يُحَدِّثُ بِهَذَا الْحَدِيثِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ»[٣].

واتە: لە زوهریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ ئەو جەمەڕەی ڕەجم دەكرد كە لەدوای مزگەوت دێت ـ مزگەوتی مینا ـ بە حەوت بەرد ڕەجمی دەكرد لەگەڵ هەر بەردێک (اللّٰه أكبر)ی دەكرد، دواتر چووە پێش بۆ بەردەم جەمەڕەكە و ڕووەو قیبلە وەستا بە دەست بەرزكردنەوە، وە وەستانەكەی درێژ كردەوە، دواتر هات بۆ جەمەڕەی دووەم و ڕەجمی كرد بە حەوت بەرد و (اللّٰه أكبر)ی دەكرد هەر جارێک بەردێكی دەوەشاند، دواتر لایدا بۆ لای چەپە لەلای دۆڵەكە بە دەست بەرزكردنەوە دووعا و نزای دەكرد، دواتر هات بۆ ئەو جەمەڕەی كە لای عەقەبەیە و ڕەجمی كرد بە حەوت بەرد و (اللّٰه أكبر)ی دەكرد هەر جارێک بەردێكی دەوەشاند، دواتر ڕۆیشت و لەلای نەوەستا.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

زوهری وتویەتی: گوێم لە سالمی کوڕی عەبدوڵلا بوو ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە لە باوکیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەﷺ ، (زوهری) وتی: ئیبنو عومەریش ئاوای دەکرد.

## بابەت: مانگا بەر وشتر دەکەوێت (واتە: دروستە مانگا لەجیاتی وشتر بکرێتە هەدی)

١٩٥٠- - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ لاَ نَذْكُرُ إلاَّ الْحَجَّ، فَلَمَّا جِئْنَا سَرِفَ، طَمِثْتُ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، طَهُرْتُ، فَأَرْسَلَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَفَضْتُ، فَأُتِيَ بِلَحْمِ بَقَرٍ فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: أَهْدَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ الْبَقَرَةَ»[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین باسی هیچمان نەدەکرد جگە لە حەج، جا کاتێک چووین بۆ سەریف (کە شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینە و لە مەککەوە نزیکترە، لەوێ) تووشی حەیز بووم، جا لە ڕۆژی قوربانیدا پاکبوومەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانی کردم و گەڕامەوە (دوای جێبەجێ کردنی مەناسیکەکان)، جا گۆشتی مانگام بۆ هات، منیش وتم: ئەوە چیە؟ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگای بۆ ئافرەتەکانی کردوە بە هەدی.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی دەڵێت: سەرتاشین لەسەر ئافرەتان نیە

١٩٥١ - «أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەرتاشین لەسەر ئافرەتان نیە، تەنها کورتکردنەوە لەسەر ئافرەتانە.

## بابەت: ئەجر و گەورەیی سەرتاشین بەسەر کورتکردنەوەدا

١٩٥٢ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: رَحِمَ اللهُ الْمُحَلِّقِينَ. قِيلَ: وَالْمُقَصِّرِينَ؟ قَالَ: رَحِمَ اللهُ الْمُحَلِّقِينَ» قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: وَالْمُقَصِّرِينَ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لە و کەسانە بێت کە سەری خۆیان دەتاشن، وترا: ئەو کەسانەش کە

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

(٣) ـ صحیح.

کورتی دەکەنەوە؟ فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسانە بێت کە سەری خۆیان دەتاشن (سێ جار ئاوای فەرمووە)، لە جاری چوارەمدا فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا) لەو کەسانەش بێت کە کورتی دەکەنەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی شتێک پێشی شتێکیتر دەخات لە پەرستشەکانی حەجدا

١٩٥٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عِنْدَ الْجَمْرَةِ وَهُوَ يُسْأَلُ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، نَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ. قَالَ آخَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ؟ قَالَ: انْحَرْ وَلاَ حَرَجَ. قَالَ: فَمَا سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لای ڕەجم لەکاتێکدا پرسیاری لێدەکرا، جا پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قوربانیم سەربڕیوە پێش ئەوەی ڕەجم بکەم؟ فەرمووی: ڕەجم بکە هیچی تیا نیە، پیاوێکی تر وتی: سەرم تاشیوە پێش ئەوەی قوربانی سەرببڕم؟ فەرمووی: سەرببڕە هیچی تیا نیە، دەڵێ: جا پرسیاری دەربارەی هەر شتێک لێکرا کە پێشخرابوو، یان دواخرابوو حەتمەن فەرمووی: بیکە و هیچی تیا نیە.

١٩٥٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَقَفَ لِلنَّاسِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ قَالَ: لاَ حَرَجَ قَالَ: لَمْ أَشْعُرْ، ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: لاَ حَرَجَ. فَلَمْ يُسْأَلْ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ أَوْ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: لاَ حَرَجَ، قَالَ عَبْد اللهِ: أَنَا أَقُولُ بِهَذَا، وَأَهْلُ الْكُوفَةِ يُشَدِّدُونَ»[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕ عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی وەستا لە حەجی ماڵئاواییدا، جا پیاوێک پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا سەرم تاشیوە پێش ئەوەی (قوربانیەکەم) سەرببڕم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێشە نیە، (پیاوەکە) وتی: نەمزانی سەربڕینم کرد پێش ئەوەی ڕەجم بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێشە نیە، جا لەو ڕۆژەدا پرسیاری دەربارەی هەر شتێک لێکرا کە پێشخرابوو، یان دواخرابوو حەتمەن فەرمووی: کێشە نیە.

عەبدوڵڵا وتویەتی: من فەتواو کار بەوە دەکەم، وە خەڵکی کوفە (واتە زانایانی کوفە کارەکەیان) توند کردوە (بەوەی دەڵێن ئەوەی شتێک لەمانە پێشی شتێکیتر بخات خوێنی دەکەوێتە سەر).

## بابەت: ڕێگەچارەی وشتر کاتێ ماندو و هـیلاک دەبێت و ناگاتە شوێنی سـەربڕین و لە مردن نزیک دەکەوێتەوە

١٩٥٥ - «عَن نَاجِيَةَ الأَسْلَمِيِّ " صَاحِبِ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ " قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ: كَيْفَ أَصْنَعُ بِمَا عَطِبَ مِنَ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ بَدَنَةٍ عَطِبَتْ فَانْحَرْهَا، ثُمَّ أَلْقِ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ خَلِّ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ فَلْيَأْكُلُوهَا»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ناجیەی ئەسلەمی قەسساب و سەربڕی هەدی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد چی بکەم لەو ئاژەڵەی هەدی کە ماندو و شوڕ دەبێت (ناگاتە جێگای سەربڕینی)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەر وشترێک هیلاک و ماندوو بوو سەری ببڕە، دواتر ئەو پەت و گوریسەی پێوەیەتی (لێی بکەرەوە) و بیخەرە ناو خوێنەکەی (تا خەڵک بزانن ئەمە موڵکی کەس نیە، بەڵکو ئاژەڵی هەدیە بۆ خێرە)، دواتر وازی لێ بێنە بۆ خەڵکی تاوەکو (بیبەنەوە) و بیخۆن.

١٩٥٦ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ نَاجِيَةَ نَحْوَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ئەوەی دەڵێت: مەڕ و بزن بەر دەکەون (دروستن) لە هەدیدا

١٩٥٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَهْدَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مَرَّةً غَنَمًا»[٢].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان مەڕێکی کردە هەدی.

## بابەت: دەربارەی نیشانەدار کردنی ئاژەڵی هەدی، کە ئایا چۆن نیشانەدار دەکرێت؟

١٩٥٨ - «عَنْ قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حَسَّانَ، يُحَدِّثُ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ دَعَا بِبَدَنَةٍ فَأَشْعَرَهَا مِنْ صَفْحَةِ سَنَامِهَا الأَيْمَنِ، ثُمَّ سَلَتَ الدَّمَ عَنْهَا وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ، ثُمَّ أُتِيَ بِرَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا قَعَدَ عَلَيْهَا وَاسْتَوَتْ عَلَى الْبَيْدَاءِ أَهَلَّ بِالْحَجِّ»[٣].

واتە: لە قەتادەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو حەسسان بوو لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی لە زیل حولەیفە کرد دواتر داوای هێنانی وشترێکی کرد و (دوای کوشتنەوە) وشترەکەی نیشانەدار کرد لە تەنیشتی ڕاستەی کۆپارەی پشتی (بە هۆی لێدان و بڕینی تەنیشتی بە چەقۆ، تاوەکو دیار بێت ئەمە ئاژەڵی هەدیە و خەڵک بۆ خۆی گۆشتەکەی بباتەوە) دواتر خوێنەکەی لە چەقۆیەکە سڕیەوە و جوتە نەعلەیەکی کردە ملی وشترەکە (وەک نیشانەیەکی تر تا بزانرێت ئەمە وشتری هەدیە)، دواتر سواریەکەی بۆ هێنرا، جا کە سواری پشتی بوو .و گەیشتە چۆڵەوانی ئیحرامی بە حەج بەستا.

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی سواربوونی وشتری هەدی

١٩٥٩ - «عَن قَتَادَةُ أَخْبَرَنِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يُحَدِّثُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى رَجُلٍ يَسُوقُ بَدَنَةً قَالَ: ارْكَبْهَا فَقَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: ارْكَبْهَا قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: ارْكَبْهَا، وَيْحَكَ»[١].

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە گەیشتوە بە پیاوێک کە وشترێکی هەدی ڕادەکێشا، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: سواریبە، (پیاوەکە) وتی: ئاخر ئەوە وشتری هەدیە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: سواریبە، (پیاوەکە) وتی: ئاخر ئەوە وشتری هەدیە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: (دەڵێم) سواریبە (هاوار بۆ تۆ).

## بابەت: دەربارەی کوشتنەوە و سەربڕینی وشتری هەدی بەپێوە

١٩٦٠ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً قَدْ أَنَاخَ بَدَنَةً، فَقَالَ: ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً سُنَّةَ مُحَمَّدٍ ﷺ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێکی بینیوە وشترێکی هەدی یەخ کرد، ئیبنو عومەریش وتی: بەپێوە بیوەستێنە بە بەستراوەیی (واتە: بیوەستێنە و قاچی چەپی پێشەوەی بنوشتێنەوە و بیبەستەوە و با لەسەر سێ قاچەکەیتری بوەستێ، بەو شێوەیە سەری ببڕە) سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ .

## بابەت: دەربارەی وتاری مەوسیمی حەج

١٩٦١ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ رَجَعَ مِنْ عُمْرَةِ الْجِعْرَانَةِ، بَعَثَ أَبَا بَكْرٍ عَلَى الْحَجِّ، فَأَقْبَلْنَا مَعَهُ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْعَرْجِ، ثُوِّبَ بِالصُّبْحِ، فَلَمَّا اسْتَوَى لِيُكَبِّرَ سَمِعَ الرَّغْوَةَ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَوَقَفَ عَنِ التَّكْبِيرِ، فَقَالَ: هَذِهِ رَغْوَةُ نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْجَدْعَاءِ، لَقَدْ بَدَا لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الْحَجِّ، فَلَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَنُصَلِّيَ مَعَهُ، فَإِذَا عَلِيٌّ عَلَيْهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمِيرٌ أَمْ رَسُولٌ؟ قَالَ: لاَ، بَلْ رَسُولٌ أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ بِبَرَاءَةٌ أَقْرَؤُهَا عَلَى النَّاسِ فِي مَوَاقِفِ الْحَجِّ، فَقَدِمْنَا مَكَّةَ، فَلَمَّا كَانَ قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِيَوْمٍ، قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ عَنْ مَنَاسِكِهِمْ حَتَّى إِذَا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ عَلَى النَّاسِ بَرَاءَةٌ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ خَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ عَنْ مَنَاسِكِهِمْ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ عَلَى النَّاسِ بَرَاءَةٌ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، فَأَفَضْنَا، فَلَمَّا رَجَعَ أَبُو بَكْرٍ خَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ عَنْ إِفَاضَتِهِمْ، وَعَنْ نَحْرِهِمْ، وَعَنْ مَنَاسِكِهِمْ، فَلَمَّا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ عَلَى النَّاسِ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

بَرَاءَةٌ حَتَّى خَتَمَهَا، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّفْرِ الأَوَّلُ، قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ كَيْفَ يَنْفِرُونَ، وَكَيْفَ يَرْمُونَ فَعَلَّمَهُمْ مَنَاسِكَهُمْ، فَلَمَّا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ بَرَاءَةٌ عَلَى النَّاسِ حَتَّى خَتَمَهَا»[1].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ كاتێ گەڕایەوە لە عومرەی جیعڕانە، ئەبوبەكری نارد بە ئەمیر بۆ حەج، ئێمەش لەگەڵ ئەودا ڕۆیشتین تاوەكو گەیشتین بە عەرج (كە گوندێكی گەورەیە لە دووری چەند ڕۆژێك ڕۆیشتن بەپێ لە مەدینەوە)، (لەوێ) قامەت كرا بۆ نوێژی بەیانی، جا كاتێ ڕێک وەستا تا (الله أكبر) بكات و دەست بە نوێژ بكات، گوێی لە دەنگی وشترێک بوو لەدواوەی، جا وەستا لە (الله أكبر) كردن و وتی: ئەوە دەنگی وشترە «جەدعاء»ـەكەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، دیارە بۆ پێغەمبەری خوا ڕوون بۆتەوە كە چاكترە ئەم ساڵ حەج بكات، بەڵكو پێغەمبەری خوا ﷺ بێت تا نوێژی لەگەڵ بكەین، (كە هاتە پێشەوە) دەركەوت عەلی سواری ببوو، ئەبوبەكریش وتی: (ڕەوانەكراوی بۆ لامان) بە ئەمیر و پێشەنگ یان نێردراو؟ عەلی وتی: نەخێر، بەڵكو نێردراوم، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی كردووم بە سوڕەتی تەوبە تا بیخوێنمەوە بەسەر خەڵكی لە شوێنەكانی وەستان (لەو شوێنانەی مەجال هەیە) لە حەج، (جابر دەڵێ): چووین بۆ مەككە، جا كاتێ ڕۆژێک پێش ڕۆژی تەڕوویە داهات (واتە: بوو بە ڕۆژی حەوتەمی مانگی ذي الحجة) ئەبوبەكر وەستا و وتاریدا بۆ خەڵكی و باسی مەناسیک و جێبەجێكردنی قۆناغەكانی حەج و عومرەی كرد كە تەواو بوو عەلی هەڵسا و سوڕەتی تەوبەی بەسەر خەڵكیدا خوێندەوە تاوەكو تەواوی كرد، دواتر دەرچووین لەگەڵی تاوەكو بوو بە ڕۆژی عەڕەفە، ئەبوبەكر هەڵسا و وتاری بۆ خەڵكیدا و باسی مەناسیكی حەجی بۆ كردن تاوەكو لێبوویەوە، جا عەلی هەڵسا و سوڕەتی تەوبەی بەسەر خەڵكیدا خوێندەوە، تاوەكو تەواوی كرد، دواتر كە ڕۆژی قوربان داهات و تەوافی ئیفازەمان كرد، جا كاتێ ئەبوبەكر گەڕایەوە وتاری بۆ خەڵكیدا و قسەی بۆ كردن دەربارەی تەوافی ئیفازە و قوربانی و مەناسیكەكانیان، جا كاتێ تەواو بوو، عەلی هەڵسا و سوڕەتی تەوبەی بەسەر خەڵكیدا خوێندەوە تاوەكو تەواوی كرد، جا كە بوو بە ڕۆژی چوون بۆ موزدەلیفە ئەبوبەكر گەڕایەوە وتاری بۆ خەڵكیدا و قسەی بۆ كردن دەربارەی چۆنیەتی چوون بۆ موزدەلیفە و چۆنیەتی ڕەجم كردن و مەناسیكەكانی فێر كردن، جا كاتێ تەواو بوو، عەلی هەڵسا و سوڕەتی تەوبەی بەسەر خەڵكیدا خوێندەوە تاوەكو تەواوی كرد.

## بابەت: دەربارەی وتاری ڕۆژی قوربان

١٩٦٢ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ ذَلِكَ الْيَوْمُ، قَعَدَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَعِيرٍ لاَ أَدْرِي جَمَلٌ أَوْ نَاقَةٌ وَأَخَذَ إِنْسَانٌ بِخِطَامِهِ - أَوْ قَالَ: بِزِمَامِهِ - فَقَالَ: أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟، قَالَ: فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ سِوَى اسْمِهِ، فَقَالَ: أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ؟، قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: فَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟ قَالَ: فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ سِوَى اسْمِهِ، فَقَالَ: أَلَيْسَ ذَا الْحِجَّةِ؟ قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟ قَالَ: فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ سِوَى اسْمِهِ، فَقَالَ: أَلَيْسَ الْبَلْدَةَ؟ قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

بَيْنَكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّ الشَّاهِدَ عَسَى أَنْ يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى مِنْهُ»[1].

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: کاتێ ڕۆژی قوربان هات، پێغەمبەر ﷺ لەسەر وشترێک دانیشت، نازانم وشترەکە نێر بوو یان مێ، کەسێکیش هەوسارەکەی گرتبوو، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەمە چ ڕۆژێکە؟ دەڵێ: ئێمەش بێ دەنگ بووین (هیچمان نەوت و وەڵاممان نەدایەوە) وامانزانی ناوێکی تری لێدەنێت جگە لە ناوەکەی خۆی، فەرمووی: مەگەر ئەمە ڕۆژی جەژن نیە؟ وتمان: با، فەرمووی: ئەمە چ مانگێکە؟ دەڵێ: ئێمەش بێ دەنگ بووین وامانزانی ناوێکی تری لێدەنێت جگە لە ناوەکەی خۆی، فەرمووی: مەگەر (ذو الحجة) نیە؟ وتمان: با، فەرمووی: ئەمە چ شارێکە؟ دەڵێ: ئێمەش بێ دەنگ بووین وامانزانی ناوێکی تری لێدەنێت جگە لە ناوەکەی خۆی، فەرمووی: مەگەر بەلدە نیە؟ وتمان: با، فەرمووی: دە بزانن بە دڵنیایی خوێنتان و ماڵتان و ئابڕوتان لە نێوانتاندا حەرامە وەک حەرامی ئەو ڕۆژەتان، لەو مانگەتان، لەو شارەتان، ئاگاداربن با ئەوەی ئامادەیە (ئەم قسانە) ڕابگەیەنێت بەوانەی ئامادەنین، چونکە ئەوەی ئامادەیە ڕەنگە قسەکان بگەیەنێت بە کەسێک کە زۆر لە خۆی تێگەیشتوتر و شارەزاتر و لەبەرکارترە (ئەو فیقهی زیاتر بێت و مسوڵمانان زیاتر سود لە تێگەیشتن و تەفسیری ئەو بکەن).

## بابەت: ئەو ئافرەتەی تووشی سوڕی مانگانە و عادە دەبێت دوای زیارەت (واتە: دوای تەوافی ئیفازە)

١٩٦٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: حَاضَتْ صَفِيَّةُ رَضِي اللهُ عَنْهَا، فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ النَّفْرِ، قَالَتْ: أَيْ حَلْقَى، أَيْ عَقْرَى. بِلُغَةٍ لَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلَسْتِ قَدْ طُفْتِ يَوْمَ النَّحْرِ؟ قَالَتْ: بَلَى. قَالَ: فَارْكَبِي»[2].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: صەفییە (رَضِي اللهُ عَنْهَا)، تووشی عادە بوو، جا کە شەوی ڕۆیشتن و جێهێشتنی مەککە هات صەفییە وتی: ئای برین کەوتە گەرو و جەستەم (ئەمە ڕستەیەک بوو بۆ حاڵەتی ناخۆشی و کارەسات بەکاریان دەهێنا) بە زاراوەی خۆیان، جا (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: بۆ مەگەر تەوافت نەکردوە ڕۆژی قوربان؟ صەفییە وتی: با (کردومە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دە سواربە (کەواتە: پێویست بە تەوافی وەداع ناکات و دەڕۆین).

١٩٦٤ - «حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ بِنَحْوِهِ»[3].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: هیچ کەسێک بە ڕوتی تەواف ناکات

١٩٦٥ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ يُثَيْعٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْنَا عَلِيًا بِأَيِّ شَيْءٍ بُعِثْتَ؟ قَالَ: بُعِثْتُ بِأَرْبَعٍ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إلاَّ نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَلاَ يَجْتَمِعُ مُسْلِمٌ وَكَافِرٌ فِي الْحَجِّ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا، وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَهْدٌ، فَعَهْدُهُ إِلَى مُدَّتِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ عَهْدٌ، فَهِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ، يَقُولُ: بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ أَجَلُهُمْ عِشْرِينَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَاقْتُلُوهُمْ بَعْدَ الأَرْبَعَةِ»[١].

واتە: لە زەیدی کوڕی یوسەیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارمان لە عەلی کرد بە چ شتێک ڕەوانەکرای (لە ڕۆژانی حەجدا)؟ وتی: بە چوار شت ڕەوانەکرام (تاوەکو بڵێم): ناچێتە بەهەشت جگە لە کەسی بڕوادار، وە هیچ کەسێکی ڕوت تەواف بە دەوری بەیتدا ناکات، وە هیچ مسوڵمانێک و کافرێک کۆنابنەوە لە حەجدا دوای ئەم ساڵەیان (واتە: کافر بۆی نیە بێتە حەج)، وە هەر کەسێک لە نێوان خۆی و پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمان و بەڵێننامەیەکی هەیە ئەوە پەیمانەکەی تاوەکو ئەو کاتەی بۆ بەڵێننامەکە دانراوە کاری پێ دەکرێت، وە هەر کەسێکیش پەیمانێکی نەبێت ئەوە تا چوار مانگ مۆڵەتی هەیە، جا لەدوای ڕۆژی قورباندا فەرمووی: مەودایان لە بیستی مانگی زیل حیججەوەیە، بیانکوژن (کافرە شەڕکەر و حەربیەکان) دوای چوار مانگ.

## بابەت: کاتێ (کەسی حاجی) ماڵئاوایی لە بەیت دەکات دەستی بەرز ناکاتەوە

١٩٦٦ - «أَخْبَرَنِي أَبُو قَزَعَةَ، قَالَ سَمِعْتُ مُهَاجِرًا يَقُولُ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنْ رَفْعِ الأَيْدِي عِنْدَ الْبَيْتِ، فَقَالَ: إِنَّمَا كَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ الْيَهُودُ حَجَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَفَصَنَعْنَا ذَلِكَ؟»[٢].

واتە: لە ئەبو قەزەعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە موهاجیر بوو دەیوت: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) پرسیاری لێکرا دەربارەی بەرزکردنەوەی دەستەکان لەلای بەیت (لەلای کەعبە)، ئەویش وتی: تەنها جوولەکەکان ئەمەیان دەکرد، (ئێمەش) حەجمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا دەکرێت وامان کردبێت؟

تێبینی: ئەم فەرموودەیە بە چەندین لەفز هاتووە، جارێک دەڵێت: دەستمان بەرز نەکردۆتەوە، جارێک دەڵێت: دەستمان بەرز کردۆتەوە، کەواتە فەرموودەکە زەعیفە و لە ئەلفازەکانی تێکەڵی هەیە، بۆیە ناکرێت دەست بەرز کردنەوە حەڕام بکرێت، بەڵکو ئاساییە. والله أعلم.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

## بابەت: دەربارەی پارێزراوی کەسی مسوڵمان

١٩٦٧ - «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اسْتَنْصِتِ النَّاسَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، ثُمَّ قَالَ: لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[١].

واتە: لە جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا پێی فەرمووم: خەڵکی بێ دەنگ بکە، دواتر فەرمووی: لەدوای من هەڵنەگەڕێنەوە و نەگەڕێنەوە سەر کوفر و کافر نەبنەوە، جا هەندێکتان ملی هەندێکتان بپەڕێنێ.

## بابەت: دەربارەی ڕاکردن لە نێوان صەفا و مەڕوەدا

١٩٦٨ - «حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: سَعَى رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَنَحْنُ نَسْتُرُهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يُصِيبَهُ أَحَدٌ بِحَجَرٍ أَوْ بِرَمْيَةٍ»[٢].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبنو ئەبی ئەوفا ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایکرد لە نێوان صەفا و مەڕوەدا، لە کاتێکدا ئێمە پارێزگاریمان لێ دەکرد لە خەڵکی مەککە لەوەی نەوەک یەکێک بەردێک یان تیرێکی لێبدات.

## بابەت: دەربارەی قیڕان (واتە: ئیحڕام بەستان بە نیەتی حەج و عومڕە)

١٩٦٩ - «عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، أَنَّهُ شَهِدَ عَلِيًّا وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، وَعُثْمَانُ يَنْهَى عَنِ الْمُتْعَةِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عَلِيٌّ أَهَلَّ بِهِمَا جَمِيعًا، فَقَالَ: لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًا، فَقَالَ: تَرَانِي أَنْهَى عَنْهُ وَتَفْعَلُهُ، فَقَالَ: لَمْ أَكُنْ لِأَدَعَ سُنَّةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِقَوْلِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ»[٣].

واتە: لە مەڕوانی کوڕی حەکەمەوە گێڕدراوەتەوە کە ئامادەبووە لەگەڵ عەلی و عوسمان (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، لە نێوان مەککە و مەدینەدا، عوسمان نەهی لە موتعە (قیڕان) کرد (واتە: نەهی لەوە کرد ئیحڕامی حەج و عومڕە بەیەکەوە ببەسترێت)، جا کاتێ عەلی ئەوەی بینی ئیحڕامی بە حەج و عومڕە بەست و وتی: (لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًا) خوایە لە خزمەتتدام بە ئیحڕامی حەج و عومڕە بەیەکەوە، عوسمانیش وتی: دەمبینی نەهی لە موتعە (قیڕان) دەکەم تۆش ئەنجامی دەدەیت؟ عەلیش وتی: هەرگیز سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وازلێناهێنم بۆ قسەی هیچ کەسێک لە خەڵکی (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحڕامی بە حەج و عومڕە بەستووە، بەڵام تۆ ئاگات لێ نەبووە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٩٧٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحَجٍّ»(١).

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحَجٍّ) واتە: خوایە لەخزمەتتدام بە ئیحرامی حەج و عومرە.

١٩٧١ - «عنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَهَلَّ بِهِمَا جَمِيعًا، فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ أَنَسٍ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَهَلَّ بِالْحَجِّ، فَرَجَعْتُ إِلَى أَنَسٍ فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ ابْنِ عُمَرَ، فَقَالَ: مَا يَعُدُّونَنَا إِلاَّ صِبْيَانًا»(٢).

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بە حەج و عومرە بەیەكەوە بەست، جا (بەكری كوڕی عەبدوڵلا دەڵێت) گەیشتم بە ئیبنو عومەر و قسەی ئەنەسم پێ ڕاگەیاند، ئەویش وتی: تەنها بە نیەتی حەج ئیحرامی بەست، (بەكری كوڕی عەبدوڵلا دەڵێت) منیش گەڕامەوە بۆ لای ئەنەس و قسەی ئیبنو عومەرم پێ ڕاگەیاند، ئەنەسیش وتی: ئێمە بە هیچ ئەژمار ناكەن جگە لە منداڵ (واتە: ئێمەیان پێ منداڵە و دەترسن هەڵەمان كردبێت، بەڵام خۆ بە گەورەیی و بچوكی نیە).

## بابەت: تەواف كردن (لە هەموو كاتێک) جگە لە كاتی نوێژ

١٩٧٢ - «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، إِنْ وَلِيتُمْ هَذَا الأَمْرَ، فَلاَ تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ أَوْ صَلَّى أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ»(٣).

واتە: لە جوبەیری كوڕی موتعیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی بەنی عەبدی مەناف ئەگەر كاروباری كەعبەتان كەوتە دەست، ئەوە ڕێگری لە كەس مەكەن تەواف یان نوێژ بكات لە هەر كاتێكدا (هەر كەسێک) كە ویستی لە شەو بێت یان لە ڕۆژ.

## بابەت: دەربارەی چوونە ناو بەیت بە ڕۆژ

١٩٧٣ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَاتَ بِذِي طُوًى حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ دَخَلَ مَكَّةَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ»(٤).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەو لە (ذي طوی) مایەوە تاوەكو بەیانی داهات، دواتر چوو بۆ ناو مەككە (واتە: بە ڕۆژ چوو بۆ مەككە و بەیت)، وە ئیبنو عومەریش ئاوای دەكرد.

## بابەت: (كەسی حاجی) لە كام ڕێگا دەچێتە ناو مەككە؟

١٩٧٤ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَدْخُلُ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ ناو مەككە لە بەرزایی سەرەوە، وە دەردەچوو لە بەرزایی خوارەوە.

## بابەت: پیاو كەی ئیحرام دەبەستێت؟

١٩٧٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَدْخَلَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ وَاسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ أَهَلَّ مِنْ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ قاچی دەخستە ناو ئاوزەنگ و وشترەكەی ڕاست دەبوویەوە ئیحرامی دەبەستا لە مزگەوتی زیل حەلیفە.

تێبینی: (ئاوزەنگ) ئەو شتەیە كە پێی دەخرێتە ناو بۆ سواربوونی وڵاغ.

## بابەت: كەسی موحریم چی دەكات كاتێ چاوەكانی ژان دەكەن

١٩٧٦ - «عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ فِي الْمُحْرِمِ إِذَا اشْتَكَى عَيْنَيْهِ: يَضْمِدُهَا بِالصَّبِرِ»[٣].

واتە: لە ئەبانی كوڕی عوسمانەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی كەسی موحریم كە كاتێ چاوەكانی ژان دەكەن فەرموویەتی: چارەسەر و تەداوی بكات بە گیای ئالوٚفێرا.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: حاجی لە كوێ نوێژ دەكات دوای تەواف

١٩٧٧ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَصَلَّى عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا»[١].

واتە: لە عەمری كوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، بوو دەیوت: پێغەمبەر ﷺ هات و تەوافی بەیتی كرد و دوو ڕەكعەت نوێژی لەلای مەقامی ئیبراهیم عليه السلام كرد، دواتر دەرچوو بۆ صەفا.

١٩٧٨ - «قَالَ شُعْبَةُ: فَحَدَّثَنِي أَيُّوبُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: هِيَ السُّنَّةُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی: ئەوە سوننەتە.

## بابەت: دەربارەی تەوافی ماڵئاوایی

١٩٧٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِي كُلِّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵك لە هەموو لایێك دەردەچوون (دوای تەواوبوونی مەناسیكەكان)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ كەسێك نەڕوات تاوەكو كۆتا پێكگەیشتنی لەگەڵ بەیت دەبێت (واتە: تاوەكو تەوافی ماڵئاوایی دەكات).

١٩٨٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: رُخِّصَ لِلْحَائِضِ أَنْ تَنْفِرَ إِذَا أَفَاضَتْ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مۆڵەت دراوە بۆ ئافرەتی حەیزدار (كە تەوافی وەداع نەكات) و مەككە جێبهێڵێت ئەگەر تەوافی ئیفازەی كردبوو.

١٩٨١ - «عَن طاوس قَالَ: وَسَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا عَامَ الأَوَّلِ: أَنَّهَا لاَ تَنْفِرُ، ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: تَنْفِرُ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لَهُنَّ»[٥].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده موصول بالإسناد السابق.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ إسناده موصول بإسناد سابقه، وهو صحيح.

واتە: طاووس وتویەتی: گوێم لە ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) بوو لە ساڵی یەکەم، وتی: ئافرەتی حەیزدار ناڕوات (پێش تەوافیماڵئاوایی)، دواتر گوێم لێی بوو دەیوت: دەڕوات، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێداون.

١٩٨٢ - «أَخْبَرَنِي طَاوُسٌ الْيَمَانِيُّ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا وَهُوَ يُسْأَلُ عَنْ حَبْسِ النِّسَاءِ عَنِ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ إِذَا حِضْنَ قَبْلَ النَّفْرِ وَقَدْ أَفَضْنَ يَوْمَ النَّحْرِ، فَقَالَ: إِنَّ عَائِشَةَ كَانَتْ تَذْكُرُ رُخْصَةً لِلنِّسَاءِ وَذَلِكَ قَبْلَ مَوْتِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بِعَامٍ»(١).

واتە: لە طاووسی یەمانیەوە گێردراوەتەوە کە گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) بووە لەکاتێکدا پرسیاری لێکراوە دەربارەی قەدەغەکردنی ئافرەتان لە تەواف کردنی بەیت کاتێ تووشی حەیز دەبن پێش ئەوەی بڕۆن، لەکاتێکدا تەوافی ئیفازەیان کردوە لە ڕۆژی قوربانیدا، ئەویش وتی: عائیشە باسی مۆڵەتی کردوە بۆ ئافرەتان (بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی ئافرەتی حەیزداری داوە)، ئەوەش ساڵێک پێش مردنی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی هەدیەکەی دەنێرێت (بۆ مەککە بۆ سەربڕین)، خۆیشی لە شارەکەی خۆی دەمێنێتەوە

١٩٨٣ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، أَنَّهُ قَالَ لِعَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ رِجَالاً يَبْعَثُ أَحَدُهُمْ بِالْهَدْيِ مَعَ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: إِذَا بَلَغْتَ مَكَانَ كَذَا وَكَذَا، فَقَلِّدْهُ، فَإِذَا بَلَغَ ذَلِكَ الْمَكَانَ، لَمْ يَزَلْ مُحْرِمًا حَتَّى يَحِلَّ النَّاسُ. قَالَ: فَسَمِعْتُ صَفْقَتَهَا بِيَدِهَا مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ، وَقَالَتْ: لَقَدْ كُنْتُ أَفْتِلُ الْقَلاَئِدَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَيَبْعَثُ بِالْهَدْيِ إِلَى الْكَعْبَةِ، مَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ شَيْءٌ مِمَّا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنْ أَهْلِهِ حَتَّى يَرْجِعَ النَّاسُ»(٢).

واتە: لە مەسروقەوە گێردراوەتەوە، کە بە عائیشەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) وتووە: ئەی دایکی بڕواداران، پیاوانێک هەن یەکێک لەوان هەدیێک (ئاژەڵێک بۆ سەربڕین) بە پیاوێک دەنێرێت (بۆ مەککە) و دەڵێت: ئەگەر گەیشتی بە فڵان شوێن و فڵان شوێن ئەوە ئاژەڵەکە ملپێچ بکە (واتە: پەتێک شتێک بخەرە ملی تا بزانرێت ئەوە بۆ هەدیە)، جا کە کابرا دەگات بە شوێنەکە (کابرای کە ئاژەڵەکەی ڕەوانە کردوە) هەر بە موحریمی خۆی دەهێڵێتەوە (هەموو شتێکی ئیحرام لەسەر خۆی حەرام دەکات) تاوەکو خەڵکی حاجی ئیحرامیان دەشکێنن.

مەسروق دەڵێ (کە ئەوەم بۆ عائیشە گێڕایەوە): گوێم لە شەققەی دەستی بوو لە پشت پەردە (واتە: دەستەکانی لێکدا بۆ دەربڕینی سەرسوڕمان لە کاری ئەو کەسە، کە چۆن ئاوا لە سوننەت دوورکەوتۆتەوە و شت لە خۆی حەرام دەکات!!!)، وە وتی: من پەتم گرێدەدا و دەمکرد بە کەزی بۆ هەدی پێغەمبەری

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

خوا ﷺ، (پێغەمبەری خواش ﷺ) هەدی بۆ كەعبە ڕەوانە دەكرد، هیچ شتێكی لەسەر حەڕام نەبوو ئەوەی كە بۆ پیاو حەڵاڵە لە خێزانەكەیدا تاوەكو خەڵك دەگەڕایەوە.

١٩٨٤ - «أَنَّ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَيَبْعَثُ بِهَدْيِهِ مُقَلَّدَةً وَيُقِيمُ بِالْمَدِينَةِ، وَلاَ يَجْتَنِبُ شَيْئًا حَتَّى يُنْحَرَ هَدْيُهُ»[١].

واتە: عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) وتویەتی: من پەتی ملی ئاژەڵی هەدی پێغەمبەری خوام ﷺ دەكرد بە كەزی و لولم دەدا، (پێغەمبەری خواش ﷺ) هەدیەكەی خۆی دەنارد بە ملپێچەوە (واتە: پەتەكەی دەخستە ملی ئاژەڵەكەو ڕەوانەی مەككەی دەكرد)، خۆیشی لە مەدینە دەمایەوە و، لە هیچ شتێكیش دوورنەدەكەوتەوە (هیچی لەسەر خۆی حەڕام نەدەكرد) تاوەكو هەدیەكەی سەردەبڕدرا.

## بابەت: مەكڕوهی دروست كردنی بینا لە مینا

١٩٨٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ نَبْنِي لَكَ بِمِنًى بِنَاءً يُظِلُّكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ مِنًى مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ»[٢].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بینایەكت لە مینا بۆ دروست نەكەین تاوەكو ببێتە سێبەر بۆت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نەخێر، مینا شوێنی یەخ كردنی سواری و وڵاغی ئەو كەسەیە كە زووتر دەگات.

## بابەت: دەربارەی چوونە مەككە بەبێ ئیحرامی حەج و عومرە

١٩٨٦ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْتُلُوهُ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ خَالِدٍ: وَقُرِئَ عَلَى مَالِكٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ مُحْرِمًا»[٣].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ مەككە لە ساڵی ئازادكردنی مەككەدا، لە كاتێكدا درعی لەسەر سەر بوو، جا كاتێ درعەكەی لادا پیاوێك هات و وتی: ئەوە ئیبنو خەتەڵە خۆی بە پەردەی كەعبەوە هەڵواسیوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیكوژن (چونكە لە ئیسلام هەڵگەڕابوویەوە و خزمەتكارە مسوڵمانەكەی خۆی كوشتبوو و جوێنی زۆر قێزەونی دابوو بە پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان و كافرێكی بكوژ و موجریمێكی گەورە بوو).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

عەبدوڵڵای کوڕی خالید وتویەتی: لەلای مالیک (ئەم فەرموودەیە) خوێندرایەوە، مالیک وتی: ئیبنو شیهاب وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە موحریم نەبوو.

١٩٨٧ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ حِينَ افْتَتَحَهَا وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ»[١].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ناو مەککە کاتێ ئازادی کرد بێ ئیحرام بوو، مەندیلێکی ڕەشیشی لەسەر سەر بوو.

## بابەت: قەسساب و سەربڕ هیچی پێنادرێ لە قوربانی (بەناوی کرێی سەربڕینەکە)

١٩٨٨ - «أَنَّ عَلِيًّا ﷺ، أَخْبَرَهُ، أن رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ يَقْسِمَ بُدْنَهُ كُلَّهَا: لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلاَلَهَا، وَلاَ يُعْطِيَ فِي جِزَارَتِهَا مِنْهَا شَيْئًا»[٢].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردوە کە لەسەر قوربانیەکەی بوەستێ، وە هەموو قوربانیەکە دابەش بکات: بە گۆشتەکەی و خوریەکەی و پێستەکەی، وە (فەرمانی پێ کردوە) هیچ شتێکی لێ نەبەخشێت بە قەسساب و سەربڕەکە (بەناوی کرێی سەربڕین و کەلوپەل کردنی).

تێبینی: بەڵام دروستە ئەگەر وەک خەڵکی بەشێکی قوربانیەکەی بۆ دابنرێت کە پەیوەندی بە کرێی کارەکەیەوە نەبێت.

## بابەت: دەربارەی تۆڵەی کەمتیار (ئەگەر حاجی ڕاوی کرد)

١٩٨٩ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الضَّبُعِ، فَقَالَ: هُوَ صَيْدٌ، وَفِيهِ كَبْشٌ إِذَا أَصَابَهُ الْمُحْرِمُ»[٣].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی کەمتیار، ئەویش فەرمووی: کەمتیار نێچیرە (واتە: دەخورێ)، وە نێرینێک تۆڵەیەتی کاتێ کەسی موحریم ڕاوی بکات (واتە: دەبێ نێرینێک لە جیاتی کەمتیارەکە بکاتە هەدی، ئەوە تۆڵەکەیەتی).

١٩٩٠ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ، قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنِ الضَّبُعِ آكُلُهُ؟ قَالَ: نَعم. قُلْتُ: هُوَ صَيْدٌ؟ قَالَ: نَعم. قُلْتُ: سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ ؟ قَالَ: نَعم، قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: مَا تَقُولُ فِي الضَّبُعِ تَأْكُلُهُ؟ قَالَ: أَنَا أَكْرَهُ أَكْلَهُ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو عەممارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) کرد دەربارەی کەمتیار کە ئایا بیخۆم؟ وتی: بەڵێ، وتم: نێچیرە؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێت لێ بووە؟ وتی: بەڵێ.

بە ئەبو موحەممەد وترا: چی دەڵێی دەربارەی کەمتیار ئایا دەیخۆی؟ وتی: من حەز لە خواردنی ناکەم.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی لە شەوەکانی مینا لە مەککە دەمێنێتەوە لەبەر هۆکارێک

١٩٩١ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ الْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ لِيَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەکو لە مەککە بمێنێتەوە لە شەوەکانی مینا (واتە لەو شەوانەی کە دەبێ بچن بۆ مینا و لەوێ بمێننەوە)، لەبەر ئاو ئامادە کردن بۆ خەڵکی، پێغەمبەری خواش ﷺ رێگای پێدا.

١٩٩٢ - «حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، عَنْ عِيسَى بْنِ يُونُسَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا نَحْوَهُ»[٢].

واتە: لەم رێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: سوننەت لە قوربانیدا

١٩٩٣ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، وَيُسَمِّي وَيُكَبِّرُ، لَقَدْ رَأَيْتُهُ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ وَاضِعًا عَلَى صِفَاحِهِمَا قَدَمَهُ، قُلْتُ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ؟ قَالَ: نَعم»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی کرد بە دوو نێری قۆچدار و، (بسم الله)ی کردو، (الله أكبر)ی کرد، بە دڵنیایی من خۆم بینیم بە دەستی خۆی سەری بڕین، قاچیشی دانابوو لەسەر لاتەنیشتیان.

(شوعبە دەڵێ بە قەتادەم) وت: تۆ گوێت لە ئەنەس بوو (کاتێك ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە)؟ وتی: بەڵێ.

١٩٩٤ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِكَبْشَيْنِ فِي يَوْمِ الْعِيدِ، فَقَالَ حِينَ وَجَّهَهُمَا: إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ، اللهُمَّ إِنَّ هَذَا مِنْكَ وَلَكَ، عَنْ مُحَمَّدٍ وَأُمَّتِهِ، ثُمَّ سَمَّى اللهَ وَكَبَّرَ وَذَبَحَ»[2].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلا (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو نێری کردە قوربانی لە ڕۆژی جەژندا، جا کاتێ خستنیە سەر ڕوو فەرمووی: من ڕووم کردە ڕووی ئەو زاتەی ئاسمان و زەوی دروست کردوە لەکاتێکدا لامداوە لە کوفر و شیرک و من لە هاوبەش دانەران نیم، بە دڵنیایی نوێژ و پەرستش و ژیان و مردنم بۆ (الله)یە کە پەروەردگاری هەموو کەون و دروستکراوانە، هیچ هاوبەشێکی نیە (نە لە سیفات و نە لە کردار)، وە هەر بەو بیروباوەڕەش فەرمانم پێکراوە، وە من یەکەمی مسوڵمانانم (لە ئوممەتەکەم)، ئەی خوایە ئەم ئاژەڵە لە تۆوەیە (تۆ دروستت کردوە و پێت بەخشیوم) وە بۆتۆشە (بۆ تۆ دەیکەم بە قوربانی) لەبری موحەممەد و ئوممەتەکەی، (جابر دەڵێ): دواتر (بسم الله)ی کرد و (الله أكبر)ی کرد و سەری بڕی.

## بابەت: ئەوەی دەکرێتە بەڵگە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوەی قوربانی کردن واجب نیە (بەڵکو سوننەتە)

١٩٩٥ - «أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا أَخْبَرَتْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ فَلاَ يُقَلِّمْ أَظْفَارَهُ، وَلاَ يَحْلِقْ شَيْئًا مِنْ شَعْرِهِ فِي الْعَشْرِ الأُوَلِ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ»[3].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک دەیەوێت قوربانی بکات با نینۆکی نەکات، وە هیچ مووەکانیشی نەتاشێت لە دە ڕۆژەکانی یەکەمی مانگی زیل حیججە.

١٩٩٦ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلاَ يَمَسَّ مِنْ شَعْرِهِ، وَلاَ أَظْفَارِهِ شَيْئًا»[1].

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: کاتێ دە ڕۆژەکانی (یەکەمی مانگی زیل حیججە) داهات و یەکێک لە ئێوە ویستی قوربانی بکات، ئەوە با دەست لە مووەکانی و نینۆکی نەدات.

## بابەت: ئەو ئاژەڵانەی ناشێن و بەر ناکەون لە قوربانیدا

١٩٩٧ - «عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا يُتَّقَى مِنَ الضَّحَايَا؟ قَالَ الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَجْفَاءُ الَّتِي لاَ تُنْقِي»[2].

واتە: لە بەڕرائی کوڕی عازیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا: خۆ لە چ ئاژەڵێک دەپارێزرێت (چ ئاژەڵێک بۆ قوربانی ناشێ)؟ فەرمووی: ئاژەڵی کوێر کە کوێریەکەی زۆر ڕوون بێت، وە ئاژەڵی شەلە کە شەلیەکەی زۆر ڕوون بێت، وە ئاژەڵی نەخۆش کە نەخۆشیەکەی ڕوون بێت، وە ئەو ئاژەڵە لاوازەی شعوری نەمابێ.

١٩٩٨ - «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ فَيْرُوزَ قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ: عَمَّا نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنَ الأَضَاحِيِّ، فَقَالَ: أَرْبَعٌ لاَ يُجْزِئْنَ: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْكَسِيرُ الَّتِي لاَ تُنْقِي، قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ فِي السِّنِّ نَقْصٌ، وَفِي الأُذُنِ نَقْصٌ، وَفِي الْقَرْنِ نَقْصٌ، قَالَ: فَمَا كَرِهْتَ فَدَعْهُ، وَلاَ تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ»[3].

واتە: لە عوبەیدی کوڕی فەیرۆزەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە بەڕراء کرد دەربارەی ئەو ئاژەڵانەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردوون لە قوربانیدا، ئەویش وتی: چوار جۆر بەر قوربانی ناکەون و ناشێن: ئاژەڵی کوێر کە کوێریەکەی زۆر ڕوون بێت، وە ئاژەڵی شەلە کە شەلیەکەی زۆر ڕوون بێت، وە ئاژەڵی نەخۆش کە نەخۆشیەکەی ڕوون بێت، وە ئاژەڵی لاواز کە لەبەر لاوازیەکەی مێشکی نەمابێ.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دەڵێ: بە (بەڕراء)م وت: من پێم باش نیە نەقس و کەموکوڕی لە ددان هەبێت، وە نەقس لە گوێ هەبێت، وە نەقس لە قۆچ هەبێت.

بەڕراء وتی: ئەوەی پێت باش نیە وازی لێبهێنە (خۆت مەیکە بە قوربانی)، وە حەڕامیشی مەکە لەسەر کەس.

١٩٩٩ - «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ قَالَ: سَمِعْتُ حُجَيَّةَ بْنَ عَدِيٍّ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ وَسَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، الْبَقَرَةُ؟ قَالَ: عَنْ سَبْعَةٍ، قُلْتُ: الْقَرْنُ؟ قَالَ: لاَ يَضُرُّكَ. قَالَ: قُلْتُ: الْعَرَجُ؟ قَالَ: إِذَا بَلَغَتِ الْمَنْسَكَ. ثُمَّ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ»[١].

واتە: لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حوجەییەی کوڕی عەدی بوو وتی: گوێم لە عەلی ﷺ بوو لەکاتێکدا پیاوێک پرسیاری لێکرد و وتی: ئەی گەورەی بڕواداران مانگا (بۆ چەند کەسە)؟ وتی: بۆ حەوت، دەڵێ وتم: ئەگەر قۆچی شکا بێت؟ وتی: زیانی بۆت نیە، دەڵێ وتم: ئەگەر شەلەبێت؟ وتی: ئەگەر بگات بە شوێنی سەربڕین (دەشێ و سەری ببڕە)، دواتر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین کە سەیری چاوو گوێ بکەین (تا دڵنیابین عەیبی نیە و دەشێت).

٢٠٠٠ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ، وَأَنْ لاَ نُضَحِّيَ بِمُقَابَلَةٍ وَلاَ مُدَابَرَةٍ وَلاَ خَرْقَاءَ وَلاَ شَرْقَاءَ فَالْمُقَابَلَةُ: مَا قُطِعَ طَرَفُ أُذُنِهَا، وَالْمُدَابَرَةُ: مَا قُطِعَ مِنْ جَانِبِ الْأُذُنِ، وَالْخَرْقَاءُ: الْمَثْقُوبَةُ، وَالشَّرْقَاءُ: الْمَشْقُوقَةُ»[٢].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین کە سەیری چاو و گوێی (ئاژەڵی قوربانی) بکەین، وە ئاژەڵی موقابەلە و مودابەڕە و خەرقا و شەڕقا نەکەین بە قوربانی، جا موقابەلە واتە: ئەو ئاژەڵەی سەری گوێی بڕابێت، مودابەڕەش واتە: ئەو ئاژەڵەی تەنیشتەکانی گوێی بڕابێت، خەڕقائیش واتە: ئەو ئاژەڵەی گوێی کون کراوە، شەڕقائیش واتە: ئەو ئاژەڵەی گوێی شەق کراوە.

## بابەت: ئەوەی دەشێت لە قوربانیدا

٢٠٠١ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ضَحَايَا بَيْنَ أَصْحَابِهِ فَأَصَابَنِي جَذَعٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا صَارَتْ لِي جَذَعَةٌ فَقَالَ: ضَحِّ بِهَا»[٣].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەینیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵی قوربانی دابەش کرد بەسەر هاوەڵەکانی، منیش بەرخێکی یەکساڵیم بەرکەوت و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی من بەرخێکی یەک ساڵیە؟ ئەویش فەرمووی: بیکەرە قوربانی (دەشێت).

٢٠٠٢ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: أَعْطَانِي رَسُولُ اللهِ ﷺ غَنَمًا أَقْسِمُهَا عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقَسَمْتُهَا وَبَقِيَ مِنْهَا عَتُودٌ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: ضَحِّ بِهِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الْعَتُودُ: الْجَذَعُ مِنَ الْمَعْزِ»[1].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە ئاژەڵێکی پێدام تاوەکو دابەشی بکەم بەسەر هاوەڵەکانی، منیش دابەشم کردن و کاریلەیەکی لێ مایەوە، منیش ئەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: بیکەرە قوربانی.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (الْعَتُود): بێچووی بزنە (کە تەمەنی گەیشتبێتە ساڵێک، واتە کاریلە).

## بابەت: وشتر بۆ حەوت کەسە و مانگاش بۆ حەوتە

٢٠٠٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَحَرْنَا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ سَبْعِينَ بَدَنَةً، الْبَدَنَةُ عَنْ سَبْعَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اشْتَرِكُوا فِي الْهَدْيِ»[2].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە ڕۆژی (صوڵحی) حودەیبیە حەفتا وشترمان سەربڕی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەشداری بکەن لە هەدی (واتە: بە حەوت کەس وشترێک بکەن بە قوربانی).

٢٠٠٤ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تَقُولُ بِهِ؟ « قَالَ: نَعم»[3].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ مانگامان بۆ حەوت کەس سەربڕی.

بە ئەبو عەبدوڵڵا وترا: فەتوا بەوە دەدەی؟ وتی: بەڵێ.

## بابەت: دەربارەی گۆشتی قوربانی

٢٠٠٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِيِّ أَوْ قَالَ: لاَ تَأْكُلُوا لُحُومَ الأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلاَثٍ»[4].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە گۆشتی قوربانی، یان وتی: گۆشتی قوربانی مەخۆن دوای سێ ڕۆژ (واتە: پشکی سێ ڕۆژ زیاتر هەڵمەگرن، با خەڵکی زیاتر لێی بەهرەمەند بێت، لە ئێستادا گۆشت کەمە).

٢٠٠٦ - «عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّا كُنَّا نَهَيْنَاكُمْ عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِيِّ أَنْ تَأْكُلُوهَا فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ كَيْ تَسَعَكُمْ، فَقَدْ جَاءَ اللهُ بِالسَّعَةِ، فَكُلُوا، وَادَّخِرُوا، وَاتَّجِرُوا، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: اتَّجِرُوا: اطْلُبُوا فِيهِ الأَجْرَ»[1].

واتە: لە نوبەیشەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ئێمە پێشتر نەهیمان لێکردن لە گۆشتی قوربانی کە لە سێ ڕۆژ زیاتر بیخۆن تاوەکو بەشتان بکات، (بەڵام ئێستا) خوا (ڕزقی) فراوانی بۆ هێناون (گۆشت زۆرە و بەشتان دەکات)، بۆیە بیخۆن و هەڵیشی بگرن و خەزنی بکەن و (ببیەخشن) و چاوتان لە پاداشتیش بێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (اتَّجِرُوا) واتە: داوای پاداشتی تیا بکەن.

٢٠٠٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَدْ نَهَى عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلاَثٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْقَابِلُ وَضَحَّى النَّاسُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ كَانَتْ هَذِهِ الأَضَاحِيُّ لَتَرْفُقُ بِالنَّاسِ كَانُوا يَدَّخِرُونَ مِنْ لُحُومِهَا وَوَدَكِهَا؟ قَالَ: فَمَا يَمْنَعُهُمْ مِنْ ذَلِكَ الْيَوْمَ؟ قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، أَوَ لَمْ تَنْهَهُمْ عَامَ أَوَّلَ عَنْ أَنْ يَأْكُلُوا لُحُومَهَا فَوْقَ ثَلاَثٍ؟ فَقَالَ: إِنَّمَا نَهَيْتُ عَنْ ذَلِكَ لِلْحَاضِرَةِ الَّتِي حَضَرَتْهُمْ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ لِيَبُثُّوا لُحُومَهَا فِيهِمْ، فَأَمَّا الآنَ، فَلْيَأْكُلُوا وَلْيَدَّخِرُوا»[2].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردین (لە خواردن و هەڵگرتنی) گۆشتی قوربانی پاش سێ ڕۆژ (واتە: لە سێ ڕۆژ بەسەرەوە)، جا کاتێ ساڵی دواتر هات و خەڵک قوربانی کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر نەهیت لێ نەکردن و لێت قەدەغە نەکردن لە ساڵی یەکەم لەوەی گۆشتەکەی بخۆن لە سێ ڕۆژ بەسەرەوە (لە سێ ڕۆژ زیاتر)؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: نەهیم لەو کارە کرد تەنها لە پێناوی ئامادەبووانی گوند تاوەکو گۆشتەکە لە نێوانیاندا دابەش بکرێت، جا هەرچی ئێستایە بیخۆن و دایبکەن (چونکە گۆشت زۆرە و ئامادەبوانیش ئەوەندە زۆر نین).

٢٠٠٨ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، حَدَّثَنِي أَبِي أَنَّهُ، سَمِعَ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ بِمِنًى: أَصْلِحْ لَنَا مِنْ هَذَا اللَّحْمِ، فَأَصْلَحْتُ لَهُ مِنْهُ، فَلَمْ يَزَلْ يَأْكُلُ مِنْهُ حَتَّى بَلَغْنَا الْمَدِينَةَ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە گوێی لە ثەوبانی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیوت: لە کاتێکدا لە مینا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: هەندێک لەم گۆشتەمان بۆ (چاک بکە و) ئامادەی بکە، (دەڵێ): منیش هەندێکم لە گۆشتەکە بۆ ئامادەکرد، جا بەردەوام لێی دەخوارد تاوەکو گەیشتین بە مەدینە.

٢٠٠٩ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا ﷺ يَقُولُ: إِنْ كُنَّا لَنَتَزَوَّدُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَعْنِي: لُحُومَ الأَضَاحِيِّ»[(١)].

واتە: لە عەمری کوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەتاء بوو وتی: گوێم لە جابر ﷺ بوو دەیوت: ئێمە (گۆشتی قوربانیمان) لە مەککەوە بۆ مەدینە دەکردە توێشوو (هەڵمان دەگرت، بۆ ڕێگا و بۆ ماڵەوە) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: واتە (مەبەستی) گۆشتی قوربانیە.

## بابەت: دەربارەی سەربڕینی قوربانی پێشی ئیمام

٢٠١٠ - «عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بُرْدَةَ بْنَ نِيَارٍ ﷺ ضَحَّى قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَلَمَّا صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ دَعَاهُ، فَذَكَرَ لَهُ مَا فَعَلَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، عِنْدِي عَنَاقٌ جَذَعَةٌ مِنَ الْمَعْزِ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ، قَالَ: فَضَحِّ بِهَا، وَلاَ تُجْزِئُ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: قُرِئَ عَلَى مُحَمَّدٍ عَنْ سُفْيَانَ وَمَنْ ذَبَحَ بَعْدَ الصَّلاَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ أَجْزَأَهُ»[(٢)].

واتە: لە بەڕرائی کوڕی عازیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو بوردەی کوڕی دینار ﷺ قوربانی سەربڕی پێش ئەوەی نوێژ بکات (نوێژی جەژن)، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد بانگی کرد، ئەویش ئەوەی بۆ باس کرد کە ئەنجامی داوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: مەڕەکەی تۆ تەنها مەڕی گۆشتە (واتە: بۆخۆتان بیخۆن چونکە نەبۆتە قوربانی، لەبەر ئەوەی پێشی کاتی خۆی سەرت بڕیوە)، (ئەبو بوردەش) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێچووە بزنێکی یەک ساڵیم هەیە لەلام چاکترە لە دوو بزن (واتە: زۆر قەڵەو و جوانە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە بیکەرە قوربانی، بەڵام بۆ کەسیتر دروست نیە (بزنی یەک ساڵی بکاتە قوربانی) پاش تۆ.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: بۆ موحەممەد خوێندرایەوە لە ڕێگەی سوفیانەوە (ئەم زیادەیەش لە فەرموودەکەدا هەبوو): وە هەر کەسێک دوای نوێژ (قوربانیەکەی) سەر ببڕێت لەکاتێکدا ئیمام وتار دەدات قوربانیەکەی بەردەکەوێت (دروست دەبێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

٢٠١١ - «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ»[١].

واتە: لە ئەبو بوڕدەی کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک قوربانی سەربڕی پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو بێت (لە نوێژی جەژن)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد کە قوربانیەکەی دووبارە بکاتەوە (ئاژەڵێکی تر بکاتە قوربانی).

## بابەت: دەربارەی فەڕەع و عەتیرە

٢٠١٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە فەڕەع (واجبە) و نە عەتیرەش.

تێبینی: (فەڕەع): یەکەم بێچوو بوو سەریان دەبڕی لە سەردەمی نەزانی بەناوی بەرەکەت. (عەتیرە)ش: ئەو ئاژەڵە بوو کە لە مانگی ڕەجەبدا سەریان دەبڕی.

٢٠١٣ - «عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ لَقِيطِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا نَذْبَحُ فِي رَجَبٍ، فَمَا تَرَى؟ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، قَالَ وَكِيعٌ: لاَ أَدَعُهُ أَبَدًا»[٣].

واتە: لە ئەبو ڕەزینی عوقەیلی لەقیتی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە پێشتر ئاژەڵمان سەردەبڕی لە ڕەجەبدا، جا پێت چۆنە؟ فەرمووی: ئەوە هیچ کێشەی تیا نیە.

وەکیع وتویەتی: (کەواتە) هەرگیز وازی لێ ناهێنم.

## بابەت: سوننەت لە عەقیقەدا (سوننەت چۆنە لە هۆزەبانە)

٢٠١٤ - «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ فِي الْعَقِيقَةِ: عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ»[٤].

واتە: لە ئومم و کوڕزەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە دەربارەی هۆزەبانە (عەقیقە) فەرموویەتی: بۆ کوڕ دوو مەڕ یان بزنی هاوتەمەن (سەردەبڕێت)، بۆ کچیش مەڕێک یان بزنێک.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح لغيره.

(٤) ـ صحيح.

٢٠١٥ - «عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى»[١].

واتە: لە سەلمانی كوڕی عامیری زەبیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هۆزەبانە لەگەڵ منداڵدایە، جا خوێنێک لە پێناوی بڕێژن (واتە ئاژەڵ سەرببڕن) و، پیسیشی لێبكەنەوە (واتە: قژی بتاشن).

تێبینی: لە ڕووی تەندروستیەوە دەركەوتووە قژی منداڵ میكرۆبی زۆری هەڵگرتووە لە سەرەتای لەدایكبووندا، بۆیە چاک وایە بتاشرێ، وەک سەروەرمان ﷺ فەرموویەتی.

٢٠١٦- «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مِثْلاَنِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ».[٢]

واتە: لە ئوممو كوڕزەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ كوڕ دوو مەڕ یان بزن (سەر دەبڕێت بۆ هۆزەبانەكەی)، بۆ كچیش مەڕێک یان بزنێک.

٢٠١٧ - «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُلُّ غُلاَمٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ يُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ وَيُدَمَّى، وَكَانَ قَتَادَةُ يَصِفُ الدَّمَ فَيَقُولُ: إِذَا ذُبِحَتِ الْعَقِيقَةُ، تُؤْخَذُ صُوفَةٌ فَيُسْتَقْبَلُ بِهَا أَوْدَاجُ الذَّبِيحَةِ، ثُمَّ تُوضَعُ عَلَى يَافُوخِ الصَّبِيِّ حَتَّى إِذَا سَالَ شَبَهُ الْخَيْطِ، غُسِلَ رَأْسُهُ، ثُمَّ حُلِقَ بَعْدُ قَالَ عَفَّانُ: حَدَّثَنَا أَبَانُ بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: وَيُسَمَّى قَالَ عَبْد اللهِ: وَلاَ أُرَاهُ وَاجِبًا».[٣]

واتە: لە سەمورەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: هەموو منداڵێک بارمتەی هۆزەبانەكەیەتی (واتە: ئەگەر بە منداڵی بمرێت و هۆزەبانەی بۆ نەكرابێت قەدەغە دەكرێت لە شەفاعەت كردن بۆ دایک و باوكی، كەواتە: ئەگەر شەفاعەتیان گەرەكە ئەوە دەبێ ئاژەڵی) لە پێناو سەرببڕدرێت لە ڕۆژی حەوتەمدا، وە سەریشی بتاشرێت و خوێناوی بكرێت، جا قەتادە باسی خوێناوی كردنەكەی دەكرد و دەیوت: كاتێ ئاژەڵەكەی هۆزەبانە سەر دەبڕێت، پارچە سوفێک دەهێنرێت و، دەخرێتە بەردەمی شادەماری ملی ئاژەڵەكە، دواتر (پارچە سوفەكە) دەخرێتە سەر ناوەڕاستی سەری منداڵەكە تاوەكو وەک دەزولە خوێنەكە دەچۆڕێتەوە، جا سەری دەشۆردرێت (خوێنەكەی لێدەكرێتەوە)، دواتر سەری دەتاشرێت.

عەففان وتویەتی: ئەبان ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕاومەتەوە و وتویەتی: ناودەنرێت (واتە: لە گێڕانەوەكەی ئەودا لە جیاتی بڵێت: دەبێ خوێناوی بكرێت، وتی: دەبێ ناوبنرێت، ئەم ڕیوایەتەش صەحیحتر و چاكترە، وەک زانایان فەرموویانە).

عەبدوڵڵا وتویەتی: پێم وانیە واجب بێت (واتە: هەموو ئەو شتانەی باسكران سوننەتن).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح بلفظ (ويسمى) بدل قوله (يدمي).

## بابەت: دەربارەی جوان سەربڕین

٢٠١٨ - «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ اثْنَتَيْنِ، قَالَ: إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ الْإِحْسَانَ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، ثُمَّ لِيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ».[1]

واتە: لە شەددادی کوڕی ئەوسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو شتم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەر کردوە، کە فەرموویەتی: بێگومان خوا چاکی (لە هەموو بوارێکدا) لەسەر ئێوە پێویست کردوە، جا کاتێ کوشتنتان ئەنجامدا (وەک کوشتنی ئاژەڵ و خشۆک و زیندەوەری زیانبەخش، یان دوژمنی دین و ژینتان) ئەوە بە شێوازێکی جوان بکوژن (واتە: بە کەمترین ئازار)، وە کاتێ ئاژەڵتان سەربڕی ئەوە سەربڕینەکە بە چاکی و جوانی ئەنجام بدەن، (بەوەی) هەر یەکەتان با چەقۆکەی تیژ بکات، دواتر با ئاژەڵەکەی بە ئەرخەیانی و بێ ئازار بخاتە سەر زەوی.

## بابەت: ئەو شتەی سەربڕینی پێ دروستە

٢٠١٩ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تَرْعَى لِآلِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ غَنَمًا بِسَلْعٍ، فَخَافَتْ عَلَى شَاةٍ مِنْهَا أَنْ تَمُوتَ، فَأَخَذَتْ حَجَرًا فَذَبَحَتْهَا بِهِ وَإِنَّ ذَلِكَ ذُكِرَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَمَرَهُمْ بِأَكْلِهَا».[2]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک شوانەتی بۆ ئالی کەعب ﷺ دەکرد لە چیای سەلع (کە شاخێکی نزیکی مەدینەیە)، جا ترسا یەکێک لە مەڕەکان بمرێت (چونکە بینی حاڵی شڕە)، بۆیە بەردێکی هەڵگرت و پێی سەربڕی، جا ئەوە باسکرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەویش فەرمانی پێ کردن بە خواردنی.

## بابەت: دەربارەی ئەو ئاژەڵەی دەکەوێتە ناو بیر

٢٠٢٠ - «عَنْ أَبِي الْعُشَرَاءِ ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَمَا تَكُونُ الذَّكَاةُ إِلاَّ فِي الْحَلْقِ وَاللَّبَّةِ؟ فَقَالَ: لَوْ طَعَنْتَ فِي فَخِذِهَا، لأَجْزَأَ عَنْكَ، قَالَ حَمَّادٌ: حَمَلْنَاهُ عَلَى الْمُتَرَدِّي».[3]

واتە: لە ئەبو عوشڕائەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، وتویەتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر کوشتنەوە و سەربڕین تەنها لە دەماری حەلق و لەبە نیە؟ پێغەمبەری

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) منكر.

خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕانیشی بپێکیت و برینداری بکەیت ئەوە بۆت دروست دەبێت (خواردنی)، حەمماد وتویەتی: ئەو فەرموودەمان لێکداوەتەوە بۆ ئەو ئاژەڵەی دەکەوێتە خوارەوە و (دەستی مرۆڤ پێی ناگات و زایە دەبێت، بۆیە بە شتێک دەپێکرێت و دواتر دەهێنرێتە دەرەوە، ئەم فەرموودە باسی ئەوە دەکات).

تێبینی: حەلق: کوشتنەوەیە لە سەرەوەی گەروو، لەببەش: کوشتنەوەیە لە خوارەوەی گەروو، ذبحیش لە نێوان هەردووکیانە.

## بابەت: نەهی کردن لە هەتککردنی ئاژەڵ

٢٠٢١ - «حَدَّثَنِي الْمِنْهَالُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ ﷺ يَقُولُ: خَرَجْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ، فَإِذَا بِغِلْمَةٍ يَرْمُونَ دَجَاجَةً، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ فَتَفَرَّقُوا، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَعَنَ مَنْ مَثَّلَ بِالْحَيَوَانِ».[١]

واتە: لە مینهالی کوڕی عەمرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ بوو دەیوت: لەگەڵ ئیبنو عومەر دەرچووم لە ڕێگایەک لە ڕێگاکانی مەدینە، جا لەوێ کۆمەڵە منداڵێک شتیان دەگرت لە مریشکێک (واتە ڕەجمیان دەکرد)، ئیبنو عومەریش وتی: ئەوە کێ ئاوای کردوە؟ ئەوانیش (لە ترسان) پەرت بوون (هەڵاتن)، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لەو کەسە کردوە کە ئاژەڵ هەتک و پەل پەل بکات (بە زیندوویی).

٢٠٢٢ - «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ صَبْرِ الدَّابَّةِ، قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: لَوْ كَانَتْ دَجَاجَةٌ مَا صَبَرْتُهَا».[٢]

واتە: لە ئەبو ئەییوبی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە ئاژەڵ کردنە نیشانە (واتە حەڕامی کردوە)، ئەبو ئەییوب دەڵێ: ئەگەر مریشکێکیش بێت نایکەم بە نیشانە.

٢٠٢٣ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ نَهَى عَنِ الْمُجَثَّمَةِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الْمُجَثَّمَةُ الْمَصْبُورَةُ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە موجەثثەمە، ئەبو موحەممەد وتویەتی: (موجەثثەمە) ئەو ئاژەڵەیە کە دەکرێتە نیشانە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) صحيح.

## بابەت: گۆشت دەستدەكەوێت و نازانرێت ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا

٢٠٢٤ - «عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ قَوْمًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ لاَ نَدْرِي أَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ؟ فَقَالَ: سَمُّوا أَنْتُمْ وَكُلُوا، وَكَانُوا حَدِيثَ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ».[1]

واتە: لە عائیشەی دایكی بڕوادارانەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵكانێك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵكانێك گۆشتمان بۆ دەهێنن ناشزانین كە ئایا ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لەسەر بێنن و بخۆن، لەوكاتیش لە سەردەمی نەزانیەوە زۆر نزیك بوون (واتە تازە ئیسلام هاتبوو).

## بابەت: دەربارەی ئاژەڵ كاتێ ڕادەكات (ناگیرێتەوە)

٢٠٢٥ - «عَنْ عَبَايَة بن رَفَاعَةَ عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، أَنَّ بَعِيرًا نَدَّ وَلَيْسَ فِي الْقَوْمِ إِلاَّ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ، فَحَبَسَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا، فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا».[2]

واتە: لە عەبایەی كوڕی ڕیفاعەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باپیریەوە لە ڕافیعی كوڕی خەدیجەوە گێڕاویەتیەوە كە وتویەتی: وشترێك هەڵات و ڕایكرد خەڵكەكەش ئەسپی زۆریان لانەبوو (بۆیە بەو كەمە ئەسپە دوای كەوتین، بەڵام نەمانتوانی بەو كەمە ئەسپە دەورەی تۆق بكەین و بیگرینەوە)، بۆیە پیاوێك تیرێكی تێگرت و پێكای و وەستاندی، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەم گیاندارانە ڕاكردن و كێویەتیان هەیە وەك ڕاكردن و كێویەتی ئاژەڵی كێوی، جا هەر ئاژەڵێك لەمانە لە دەسەڵاتتان دەرچوون ئاوای لێ بكەن.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی هەر زیندەوەرێك بێ هۆكار دەكوژێت

٢٠٢٦ - «عَنْ صُهَيْبٍ، مَوْلَى ابْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ عُصْفُورًا بِغَيْرِ حَقِّهِ، سَأَلَهُ اللهُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قِيلَ: وَمَا حَقُّهُ؟ قَالَ: أَنْ تَذْبَحَهُ فَتَأْكُلَهُ».[3]

واتە: لە سوهەیبی خزمەتكاری ئیبنو عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵلای كوڕی عەمر ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك چۆلەكەیەك بەبێ هەقی خۆی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

بکوژێت، ئەوە خوا لێپێچینەوەی دەربارە لەگەڵ دەکات لە ڕۆژی دواییدا، وترا: هەقی خۆی چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە سەری ببڕیت و بیخۆیت (نەوەک بیکوژیت و فڕێی بدەیت).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی: کوشتنەوەی بێچووی ناو سک بریتیە لە کوشتنەوەی دایکی

٢٠٢٧ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ذَكَاةُ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ، قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: يُؤْكَلُ؟ قَالَ: نَعم».[١]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کوشتنەوەی بێچوی ناو سک بریتیە لە کوشتنەوەی دایکی (واتە: ئەگەر دایکی سەربڕا پێویست ناکات بێچووەکەش سەرببڕێت).

بە ئەبو موحەممەد وترا: دەخورێ؟ وتی: بەڵێ.

## بابەت: ئەو دڕندانەی ناخورێن

٢٠٢٨ - «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ».[٢]

واتە: لە ئەبو ثەعلەبەی خوشەنیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی هەموو خاوەن کەڵبەیەکی بەهێز لە دڕندانداا (واتە: ئەو دڕندانەی کەڵبەی بەهێزیان هەیە حەرامن و ناخورێن).

٢٠٢٩ - «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْخَطْفَةِ، وَالْمُجَثَّمَةِ، وَالنُّهْبَةِ، وَعَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ».[٣]

واتە: لە ئەبو ثەعلەبەی خوشەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی ئەو بەشەی لە گیاندار دەکرێتەوە و دەبڕدرێت بە زیندویی و، لەو گیاندارەش کە دەکرێتە نیشانە و، لەوەیشی کە تاڵان دەکرێت یان دەدزرێت، هەروەها نەهی کردوە لە خواردنی هەموو خاوەن کەڵبەیەکی بەهێز لە دڕندانداا.

٢٠٣٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ».[٤]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ اسناده حسن.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لە خواردنی هەموو خاوەن كەڵبەیەک لە دڕندان و، خواردنی هەموو خاوەن چڕنوكێک لە باڵندەكاندا.

## بابەت: نەهی كردن لە پۆشینی پێستی دڕندە

٢٠٣١ - «عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ أَنْ تُفْتَرَشَ».[١]

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لە پێستی دڕندە كە ڕابخرێت (كەواتە نەهیەكە لە پێشترە بۆ پۆشین).

٢٠٣٢ - «عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: سودوەرگرتن لە پێستەی ئاژەڵی مردارەوەبوو

٢٠٣٣ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ وَعْلَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ الأَسْقِيَةِ، فَقَالَ: مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لَكَ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ».[٣]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی وەعلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) كرد دەربارەی ئەو جۆركەی لە پێستە دروست دەكرێت، ئەویش وتی: نازانم چیت پێ بڵێم تەنها ئەوە نەبێ من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر پێستەیەک دەباغ و خۆش بكرێت ئەوە پاک دەبێتەوە.

٢٠٣٤ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ وَعْلَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: عَنْ جُلُودِ الْمَيْتَةِ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دِبَاغُهَا طَهُورُهَا قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللهِ: تَقُولُ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعم، إِذَا كَانَ يُؤْكَلُ لَحْمُهُ».[٤]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی وەعلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) كرد دەربارەی پێستەی ئاژەڵی مردارەوەبوو، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەباغكردن و خۆش كردنی پێستە پاكبوونەوەیەتی.

پرسیار لە ئەبو موحەممەد كرا: كە ئایا فەتوا بەوە دەدەی؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر ئاژەڵەكە گۆشتی بخورێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ رجاله ثقات.

٢٠٣٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُسْتَمْتَعَ بِجُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ».(١)

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە کە سود وەربگیرێت لە پێستەی ئاژەڵی مردارەوەبوو کاتێ دەباغ کرا و خۆش کرا.

٢٠٣٦ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مَاتَتْ شَاةٌ لِمَيْمُونَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَو اسْتَمْتَعْتُمْ بِإِهَابِهَا؟. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا مَيْتَةٌ، قَالَ: إِنَّمَا حُرِّمَ أَكْلُهَا».(٢)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مەڕێک یان بزنێکی مەیمونە مرداربوویەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆچی سودتان لە پێستەکەی وەرنەگرتووە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە مرداربۆتەوە، فەرمووی: تەنها خواردنی حەڕام کراوە (خۆ پێستی حەڕام نەکراوە ئەگەر دەباغی بکەن).

٢٠٣٧ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَ هَذَا الْحَدِيثِ قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: مَا تَقُولُ فِي الثَّعَالِبِ إِذَا دُبِغَتْ، قَالَ: أَكْرَهُهَا».(٣)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە، جا بە ئەبو موحەممەد وترا: چی دەڵێی دەربارەی ڕێوی ئەگەر پێستەکەی دەباغ بکرێت؟ وتی: پێم باش نیە.

## بابەت: دەربارەی گۆشتی کەری ماڵی

٢٠٣٨ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ عَلِيًّا قَالَ لِابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ».(٤)

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە بە ئیبنو عەبباسی (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، وتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە موتعە و (سیغە)ی ئافرەتان لە ڕۆژی خەیبەردا، وە نەهیشی کرد لە گۆشتی کەری ماڵی (واتە: لە ڕۆژی خەیبەر ئەم دووانەی حەڕام کردوە، نەهی لێرەدا بە واتای حەڕام دێت).

٢٠٣٩ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ يَوْمَ خَيْبَرَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُكِلَتِ الْحُمُرُ - أَوْ أُفْنِيَتِ الْحُمُرُ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُفْنِيَتِ الْحُمُرُ - أَوْ أُكِلَتِ الْحُمُرُ - فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَجُلاً فَنَادَى إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ فَإِنَّهَا رِجْسٌ».(٥)

---

(١) ـ صحيح لغيره.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ اسناده ضعيف ، ولكن الحديث صحيح.
(٤) ـ صحيح.
(٥) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە ڕۆژی خەیبەردا پیاوێک هەڵسایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەر دەخورێت ـ یان لەناودەبرێت (بە هۆی خواردن)؟ دواتر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەر لەناوبرا بە هۆی خواردن یان (وتی:) کەر دەخورێ؟ جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە پیاوێک کە بانگ بکات و بڵێت: خوا و پێغەمبەرەکەی نەهیتان لێ دەکەن لە گۆشتی گوێدرێژ، چونکە پیسە.

## بابەت: دەربارەی خواردنی گۆشتی ئەسپ

٢٠٤٠- «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَكَلْنَا لَحْمَ فَرَسٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ».[١]

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە وتویەتی: گۆشتی ئەسپمان خواردووە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مەدینە.

٢٠٤١ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، وَأَذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ».[٢]

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە گۆشتی کەری ماڵی، وە مۆڵەتیدا بە (خواردنی) گۆشتی ئەسپ.

## بابەت: نەهی کردن لە شت دزی و تاڵان

٢٠٤٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ، يَرْفَعُ الْمُؤْمِنُونَ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ، وَهُوَ حِينَ يَنْتَهِبُهَا مُؤْمِنٌ».[٣]

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە تاڵانێک بکات کە بە قیمەت بێت و بڕواداران چاویان لەدوای بێت، لەو کاتەی تاڵانیەکە دەکات و دەیدزێت ئیماندار و بڕوادار بێت (واتە: لەو کاتەدا سیفەتی بڕواداری ون دەکات و ئیمان بۆ ماوەیەکی کاتی لێی دوور دەکەوێتەوە).

٢٠٤٣ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ النُّهْبَةِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هَذَا فِي الْغَزْوِ إِذَا غَنِمُوا قَبْلَ أَنْ يُقْسَمَ».[٤]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە (ئاژەڵ و شتی) تاڵانی.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەوە دەربارەی جیهادە، کاتێ دەسکەوت بەدەست دەهێنن پێش ئەوەی دابەش بکرێت.

## بابەت: دەربارەی خواردنی مردارەوەبوو بۆ کەسی ناچار

٢٠٤٤ - «عَنْ أَبِي وَاقِدٍ ﷺ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا بِأَرْضٍ تَكُونُ بِهَا الْمَخْمَصَةُ فَمَا يَحِلُّ لَنَا مِنَ الْمَيْتَةِ؟ قَالَ: إِذَا لَمْ تَصْطَبِحُوا، وَلَمْ تَغْتَبِقُوا، وَلَمْ تَحْتَفِئُوا بَقْلاً، فَشَأْنُكُمْ بِهَا، قَالَ: النَّاسُ يَقُولُونَ: بِالْحَاءِ، وَهَذَا قَالَ: بِالْخَاءِ».[١]

واتە: لە ئەبو واقیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە شوێنێکین برسیەتی لێیە، جا چیمان بۆ حەڵاڵە لە ئاژەڵی مردارەوەبوو؟ فەرمووی: ئەگەر هیچ خواردن و خواردنەوەیەکتان نەخواردەوە بە بەیانی و، هیچتان نەخوارد بە ئێوارەو، هیچ ڕووەکێکتان لە زەوی دەست نەکەوت، ئەوە مردارەوەبووتان بۆ حەڵاڵە.

## بابەت: دەربارەی دۆشەر کە بە زەحمەت دۆشین ئەنجام دەدات

٢٠٤٥ - «عَنْ ضِرَارِ بْنِ الأَزْوَرِ ﷺ قَالَ: أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ لِقْحَةً، فَأَمَرَنِي أَنْ أَحْلُبَهَا فَحَلَبْتُهَا، فَجَهَدْتُ فِي حَلْبِهَا، فَقَالَ: دَعْ دَاعِيَ اللَّبَنِ».[٢]

واتە: لە زیراری کوڕی ئەزوەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وشترێک کرا بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە تازە بێچووی ببوو، (دەڵێ): پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کردم کە بیدۆشم، منیش دۆشیم، ماندوبووم بەدەست دۆشینەکەیەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەندێک لە شیر جێبهێڵە لە ناو گوانەکانی تا شیری دواوە بە ئاسانی ڕابکێشێت.

## بابەت: نەهی کردن لە کوشتنی بۆق و هەنگ

٢٠٤٦ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ قَتْلِ الضِّفْدَعِ».[٣]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عوسمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە کوشتنی بۆق.

---

(١) ـ اسناده منقطع.

(٢) ـ اسناده حسن.

(٣) ـ صحيح.

٢٠٤٧ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعَةٍ مِنَ الدَّوَابِّ: النَّمْلَةِ، وَالنَّحْلَةِ، وَالْهُدْهُدِ، وَالصُّرَدِ».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە کوشتنی چوار شت: مێروولە (مێرۆستان) و، هەنگ و، پەپو (پەپو سولەیمان) و، صورەد (کە جۆرە بلبلێکە).

## بابەت: دەربارەی کوشتنی خەمەگوڕی (مارمێلکە، مارمیلۆک)

٢٠٤٨ - «عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الأَوْزَاغِ».[٢]

واتە: لە ئوممو شەریکەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی خەمەگوڕی (مارمێلکە، مارمیلۆک).

## بابەت: دەربارەی ئەو گیاندارەی شتی پیس دەخوات و ئەو نەهیەی دەربارەی هاتووە

٢٠٤٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُجَثَّمَةِ، وَعَنْ لَبَنِ الْجَلاَلَةِ، وَأَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە (خواردنی) ئەو ئاژەڵەی دەکرێتە نیشانە، هەروەها (نەهیشی کردوە) لە شیری ئاژەڵێک کە شتی پیس بخوات، وە (نەهیشی کردوە) لەوەی خواردنەوە بخورێتەوە لە دەمی دۆلکە و دەفر (کاتێ دیارنەبێت ناوەوەی چی تیایە و چی تێکەوتووە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف ، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ناوی خوا هێنان لە کاتی ڕاوکردن بە سەگ

٢٠٥٠- - «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْكَلْبِ، فَقَالَ: مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ كَلْبُكَ فَكُلْ، فَإِنَّ أَخْذَهُ ذَكَاتُهُ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَهُ كَلْبًا فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ قَدْ أَخَذَهُ مَعَهُ وَقَدْ قَتَلَهُ فَلاَ تَأْكُلْهُ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تَذْكُرْهُ عَلَى غَيْرِهِ».[١]

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ڕاو کردن بە سەگ، ئەویش فەرمووی: ئەو شتەی سەگی خۆت گرتی و ڕاوی کرد (بە فەرمانی تۆ) ئەوە بیخۆ، چونکە خودی گرتنەکەی ئەو کوشتنەوەیەتی، بەڵام ئەگەر سەگێکیترت لەگەڵ بینی و ترسای ئەو گرتبێتی و کوشتبووشی ئەوە نەیخۆی، چونکە تۆ ناوی خوات تەنها لەسەر (ناردنی) سەگەکەت هێناوە و لەسەر جگە لەوت نەهێناوە.

٢٠٥١ - «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ: عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ فَذَكَرَ مِثْلَهُ»[٢]

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ڕاو کردن بە میعراض (کە تیرێکی ئەستور و قورسە)، جا هەمان شتی باس کرد.

## بابەت: دەربارەی ڕاگرتنی سەگ بۆ ڕاوکردن و پاسەوانی مەڕوماڵات

٢٠٥٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ اقْتَنَى كَلْبًا إِلاَّ كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ مَاشِيَةٍ، نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سەگێک ڕابگرێت جگە لە سەگی ڕاوکردن، یان سەگی پاسەوانی مەڕوماڵات، ئەوە هەموو ڕۆژێک دوو قیراط لە کردەوە چاکەکانی کەم دەکات.

٢٠٥٣ - «عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سُفْيَانَ بْنَ أَبِي زُهَيْرٍ ﷺ، يُحَدِّثُ نَاسًا مَعَهُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لاَ يُغْنِي عَنْهُ زَرْعًا، وَلاَ ضَرْعًا، نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ، قَالُوا: أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ ؟ قَالَ: إِي وَرَبِّ هَذَا الْمَسْجِدِ».[٤]

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە گوێی لە سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر بووە ﷺ کە قسەی بۆ خەڵکانێک دەکرد کە لەگەڵی بوون لەلای دەرگای مزگەوت، دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک سەگێک ڕابگرێت و، خزمەتی بكات كە سودی پێ نەگەیەنێت لە ڕووی كشتوكاڵ و پاسەوانی ئاژەڵ، ئەوە هەموو ڕۆژێک یەک قیراط چاكە لە كردەوەكانی كەم دەكات، وتیان: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێ لێبوو؟ وتی: بەڵێ سوێند بە خوای ئەم مزگەوتە.

٢٠٥٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ، ثُمَّ قَالَ: مالِي وَلِلْكِلاَبِ؟ ثُمَّ رَخَّصَ فِي كَلْبِ الزَّرْعِ، وَكَلْبِ الصَّيْدِ».[١]

واتە: لەعەبدوڵلای كوڕی موغەففەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە كوشتنی سەگ (ئەو كاتەی سەگ مزگەوت و هەموو كوچ و كۆڵانێكی تەنی بوو)، دواتر (كە كەمبوونەوە) فەرمووی: چ كارم بە سەگە؟ (چیتر مەیانكوژن)، دواتر مۆڵەتیدا بە ڕاگرتنی سەگی پاسەوانی كشتوكاڵ و سەگی ڕاوكردن.

## بابەت: دەربارەی كوشتنی سەگ

٢٠٥٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ».[٢]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە كوشتنی سەگ (ئەو كاتەی سەگ مزگەوت و هەموو كوچ و كۆڵانێكی تەنی بوو).

٢٠٥٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْلاَ أَنَّ الْكِلاَبَ أُمَّةٌ مِنَ الْأُمَمِ لأَمَرْتُ بِقَتْلِهَا كُلِّهَا، وَلَكِنِ اقْتُلُوا مِنْهَا كُلَّ أَسْوَدَ بَهِيمٍ، قَالَ سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ: الْبَهِيمُ الأَسْوَدُ كُلُّهُ».[٣]

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی موغەففەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت سەگ دروستكراوێكن لە دروستكراوان و (زیكر و یادی خوا دەكەن)، ئەوە فەرمانم دەكرد بە كوشتنی گشتیان، بەڵام تەنها هەموو ئەوانەیان بكوژن كە تەواو ڕەشن.
سەعیدی كوڕی عامیر وتویەتی: (الْبَهِيمُ): ئەوەیە هەمووی ڕەش بێت.

## بابەت: دەربارەی ڕاوكردن بە تیر و ڕمی پان (یان هەر شتێک كە تیژی و پانی هەبێت)

٢٠٥٧ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَدِيَّ بْنَ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: عَنِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَقَتَلَ، فَإِنَّهُ وَقِيذٌ فَلاَ تَأْكُلْ».[٤]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەدی كوڕی حاتەم بوو ﷺ كە وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی (ڕاوكردن) بە میعراض، ئەویش فەرمووی: ئەگەر بە لای تیژەكە بەری

---

(١) ـ صحیح.
(٢) ـ صحیح.
(٣) ـ صحیح.
(٤) ـ صحیح.

كەوت ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر بەلای پانەكە بەریكەوت و كوشتی، ئەوە لە لە حوكمی وەقیذ دایە (واتە: وەک ئەو ئاژەڵەیە كە بە زەبری بەركەوتنی شتێک مردار دەبێتەوە) و مەیخۆ.

## بابەت: دەربارەی خوردنی كلۆ (كولله)

٢٠٥٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ نَأْكُلُ الْجَرَادَ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: غەزامان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، لە حەوت غەزایاندا كلۆمان دەخوارد.

## بابەت: دەربارەی نێچیری دەریا

٢٠٥٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد و وتی: ئێمە سواری كەشتی و بەلەم دەبین لە دەریادا، وە ئاوێكی كەم لەگەڵ خۆمان دەبەین و هەڵی دەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێ بشۆرین تووشی تونێیەتی دەبین، جا ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بشۆرین؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەریا ئاوەكەی پاكە و مردارەبوەكەشی حەڵاڵە و (دەخورێ).

٢٠٦٠ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ثَلاَثِ مِائَةٍ، فَأَصَابَنَا جُوعٌ حَتَّى أَتَيْنَا الْبَحْرَ، وَقَدْ قَذَفَ دَابَّةً فَأَكَلْنَا مِنْهَا، حَتَّى ثَابَتْ أَجْسَامُنَا، فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلْعًا مِنْ أَضْلاَعِهَا فَوَضَعَهُ، ثُمَّ حَمَلَ أَطْوَلَ رَجُلٍ فِي الْجَيْشِ عَلَى أَعْظَمِ بَعِيرٍ فِي الْجَيْشِ فَمَرَّ تَحْتَهُ، هَذَا مَعْنَاهُ».[٣]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە سێ سەد كەس ڕەوانەی كردین (بۆ جیهاد)، جا برسیێتیەكی زۆرمان تووش بوو تاوەكو چووینە لای دەریا، لەو كاتەدا ئاژەڵێک (نەهەنگێكی) فڕێدابووە دەرەوە و ئێمەش لێمان خوارد، تاوەكو هێز بۆ جەستەمان گەڕایەوە، جا ئەبو عوبەیدە پەراسوێک لە پەراسوەكانی هێنا و داینا (لە زەویەكەی چەقاند)، دواتر درێژترین پیاوی جەیشەكە هەڵی گرت لەسەر گەورەترین وشتری ناو جەیشەكە (لەگەڵ ئەوەش) بە ژێریدا تێپەڕی (واتە: ئەوەندە بەرز و درێژو زەبەلاح بوو)، ئەوە ماناكەیەتی.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی خواردنی كەروێشك

٢٠٦١ - «قَالَ: هِشَامُ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَنَسٍ أَخْبَرَنِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مالَكٍ ﷺ يَقُولُ: أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا وَنَحْنُ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغِبُوا، فَأَخَذْتُهَا وَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا، وَبَعَثَ بِوَرِكَيْهَا - أَوْ فَخِذَيْهَا، شَكَّ شُعْبَةُ - إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَبِلَهَا».[١]

واتە: لە هیشامی كوڕی زەیدی كوڕی ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بوو دەیوت: كەروێشكێكمان ڕاونا لە كاتێكدا كە لە (مَرِّ الظَّهْرَانِ) بووین (كە شوێنێكە شازدە میل لە مەككەوە دوورە)، جا خەڵكەكە ڕایانكرد بەدوایدا و هیلاك و ماندوو بوون (نەیانتوانی بیگرن)، منیش گرتم و چووم بۆ لای ئەبو تەڵحە و سەرم بڕی، ئەبو تەڵحەش دوو ڕانەكانی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش وەریگرت و قەبوڵی كرد.

٢٠٦٢- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ، أَنَّهُ مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِأَرْنَبَيْنِ مُعَلِّقُهُمَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي دَخَلْتُ غَنَمَ أَهْلِي فَاصْطَدْتُ هَذَيْنِ الأَرْنَبَيْنِ، فَلَمْ أَجِدْ حَدِيدَةً أُذَكِّيهِمَا بِهَا فَذَكَّيْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ أَفَآكُلُ؟ قَالَ: نَعم».[٢]

واتە: لە موحەممەدی كوڕی صەفوانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە تێپەڕ بووە بە لای پێغەمبەر ﷺ دا بە دوو كەروێشك كە هەڵیواسیبوون و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من چووم بۆ لای مەڕ و ماڵاتی خانەوادەكەمان و ئەو دوو كەروێشكەم ڕاوكرد، هیچ ئاسنێك و چۆقۆیێكم دەست نەكەوت تا سەریان پێ ببڕم بۆیە بە بەردێكی تیژ سەرم بڕین، جا ئایا بیانخۆم؟ فەرمووی: بەڵێ.

## بابەت: دەربارەی خواردنی بزنمژە

٢٠٦٣- «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الضَّبِّ فَقَالَ: لَسْتُ بِآكِلِهِ، وَلاَ مُحَرِّمِهِ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا دەربارەی بزنمژە (كە ئایا دەخورێت یان نا)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: من نایخۆم و حەرامیشی ناكەم.

٢٠٦٤ - «عَنْ ثَابِتِ بْنِ وَدِيعَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِضَبٍّ فَقَالَ: أُمَّةٌ مُسِخَتْ، وَاللهُ أَعْلَمُ».[٤]

واتە: لە سابیتی كوڕی وەدیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بزنمژەیەک هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: گەلێک مەسخ بوون و شێوەیان گۆڕا (شێوەیان بوو بە گیاندارێک جا نازانم بوون بەم بزنمژەیە یان بوون بە ئاژەڵێكی تر).

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

٢٠٦٥- «عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ الأَنْصَارِيُّ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا أَخْبَرَهُ، أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ ﷺ الَّذِي يُقَالُ لَهُ سَيْفُ اللهِ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَلَى مَيْمُونَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ وَهِيَ خَالَتُهُ وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَوَجَدَ عِنْدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ نَجْدٍ، فَقَدَّمَتِ الضَّبَّ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ قَلَّمَا يُقَدِّمُ يَدَهُ لِطَعَامٍ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ وَيُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْ نِسْوَةِ الْحُضُورِ: أَخْبِرْنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، قُلْنَ هَذَا الضَّبُّ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: أَتُحَرِّمُ الضَّبَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ، قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يَنْظُرُ، فَلَمْ يَنْهَنِي».[١]

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاڕی بۆی گێڕامەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو خالیدی کوڕی وەلیدەی ﷺ پێی دەوترا شمشێری خوا بۆی گێڕاوەتەوە کە چۆتە لای مەیمونەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەر ﷺ، کە پلکی ئەو و ئیبنو عەبباس بوو، جا لەلای مەیمونە بزنمژەیەکی سورەوەکراوی بینی کە خوشکەکەی مەیمونە (حەفیدەی کچی حاریس) هێنابووی لە نەجدەوە، جا بزنمژەکەی پێشکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ عادەتی وابوو کەم جار هەبوو دەست بۆ خواردن ببات تاوەکو بۆی باس نەکرێت ئەو خواردنە چیە و ناوی بۆ نەهێنن، جا (ئەم جارەیان) پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی نەوی کرد بۆ بزنمژەکە، ئافرەتێکیش لە ئافرەتانی ئامادەبوو وتی: بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕابگەیەنن ئەوەی پێشکەشتان کردوە چیە، ئەوانیش وتیان: ئەوە بزنمژەیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کێشایەوە، خالیدی کوڕی وەلیدیش وتی: ئایا بزنمژە حەڕام دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام لە زەوی قەومەکەی من نیە (خواردنی لەلام نەبۆتە عادەت)، دەزانم پێم خۆش نیە و قێزم لێ دەبێتەوە، خالید وتی: منیش ڕامکێشا و خواردم، پێغەمبەری خواش ﷺ سەیری دەکرد و نەهی لێ نەکردم.

## بابەت: دەربارەی ئەو نێچیرەی ئەندامێکی لێدەکرێتەوە

٢٠٦٦ - «عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ ﷺ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وَالنَّاسُ يَجُبون أَسْنِمَةَ الإِبِلِ، وَأَلْيَاتِ الْغَنَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا قُطِعَ مِنْ بَهِيمَةٍ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ».[٢]

واتە: لە ئەبو واقیدی لەیثیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە لە کاتێکدا خەڵک کۆپاڵ و (بەرزایی سەر پشتی) وشتر و دونگی مەڕیان دەبڕیەوە (بە زیندویی و دەیانخوارد)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوەی لە ئاژەڵ بکرێتەوە و ببردرێت لە کاتێکدا کە زیندووە، ئەوە مردووە (واتە: ئەو بەشە بە گۆشتی مردوو حیسابە و حەڕامە بخورێت).

---

(١) ـ اسناده ضعيف ، ولكن الحديث صحيح

(٢) ـ صحيح

## بابەت: دەربارەی بسم الله کردن لەسەر خواردن

٢٠٦٧ - «عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: سَمِّ اللهَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ».(١)

واتە: لە عومەری کوڕی سەلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: بسم الله بکە و لەبەردەمی خۆت بخۆ.

٢٠٦٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْكُلُ طَعَامًا فِي سِتَّةِ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَمَا إِنَّهُ لَوْ ذَكَرَ اسْمَ اللهِ لَكَفَاكُمْ، فَإِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللهِ، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللهِ فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ».(٢)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ خواردنی دەخوارد لەگەڵ شەش لە هاوەڵەکانی و پیاوێکی دەشتەکیش هات و بە دوو پاروو (خواردنەکەی) خوارد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بزانن ئەگەر ناوی خوای هێنابا و (بسم الله)ی کردبا ئەوە (خواردنەکە) بەشی دەکردن، جا کاتێ یەکێک لە ئێوە خواردی با (بسم لله) بکات، جا ئەگەر (لەسەرەتا) بیری چویەوە بسم الله بکات با بڵێت: بسم الله لە سەرەتا و کۆتایی.

٢٠٦٩ - «أَخْبَرَنَا بُنْدَارٌ، حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ بُدَيْلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا بِهَذَا الْحَدِيثِ».(٣)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دوعا کردن بۆ خاوەنی خۆراک کاتێ نانیدا

٢٠٧٠ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ بُسْرٍ ﷺ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ يَسِيرَةٌ - قَالَ: قَالَ أَبِي: لِأُمِّي لَوْ صَنَعْتِ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ طَعَامًا فَصَنَعَتْ ثَرِيدَةً - وَقَالَ: بِيَدِهِ يُقَلِّلُ - فَانْطَلَقَ أَبِي فَدَعَاهُ فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ عَلَى ذِرْوَتِهَا، ثُمَّ قَالَ: خُذُوا بِاسْمِ اللهِ، فَأَخَذُوا مِنْ نَوَاحِيهَا فَلَمَّا طَعِمُوا دَعَا لَهُمْ فَقَالَ: اللهُمَّ اغْفِرْ لَهُمْ، وَارْحَمْهُمْ، وَبَارِكْ لَهُمْ فِي رِزْقِهِمْ».(٤)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بوسرەوە گێڕدراوەتەوە ﷺ، کە ماوەیەکی کەم هاوەڵایەتی هەبووە ـ وتویەتی: باوکم بە دایکمی وت: بۆ خواردنێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست ناکەی؟ ئەویش

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

تەشریبی دروست کرد، جا عەبدوڵلا بە دەستی ئاماژەی کرد کە خواردنەکە کەم بوو ـ (دەڵێ): جا باوکم ڕۆیشت و بانگێشتی کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی دانا لە سەرەوەی خواردنەکە، دواتر فەرمووی: هەڵیگرن و بیخۆن بەناوی خوا و لە چواردەورەکەی هەڵیگرن و بیخۆن، جا کاتێ خواردیان پێغەمبەری خوا ﷺ دووعا و نزای بۆ کردن و فەرمووی: خوایە لێیان خۆش بیت و ڕەحمیان پێ بکەیت و بەرەکەت بخەیتە ڕۆزیانەوە.

## بابەت: دووعا کردن دوای تەواوبوون لە خواردن

٢٠٧١ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَكَلَ، أَوْ شَرِبَ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، غَيْرَ مَكْفُورٍ، وَلاَ مُوَدَّعٍ، وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا».[١]

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەیخوارد و دەیخواردەوە دەیفەرموو: گشت سوپاس و ستاییشێک بۆ خوا، ستاییشێکی زۆر و پاک و چاک و بەرەکەتدار، بەبێ سپڵەیی و شوکر نەکردن و، بەبێ واز لێهێنان و پێ ڕازی نەبوون و، بە بێ نیاز نەبوون لە نیعمەتەکانی پەروەردگارمان.

## بابەت: دەربارەی شوکر کردن لەسەر خواردن

٢٠٧٢ - «عَنْ سِنَانِ بْنِ سَنَّةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ كَالصَّائِمِ الصَّابِرِ».[٢]

واتە: لە سینانی کوڕی سەننەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی خواردن دەخوات و شوکرانەبژێرە وەکو کەسێکی ڕۆژوگری ئارامگر وایە (پاداشتی وەکو ئەوە).

## بابەت: دەربارەی لێسانەوەی پەنجەکان

٢٠٧٣ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَلْعَقْ أَصَابِعَهُ الثَّلاَثَ».[٣]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە خواردی، با سێ پەنجەکانی بلێسێتەوە.

تێبینی: هەندێ کەس بە نەزانی دەیانەوێ پاکوخاوێنی بە ئیسلام بفرۆشنەوە و ڕەخنە لەم فەرموودەیە دەگرن و پێیان وایە لێسانەوەی پەنجە کارێکی قێزەونە، کەچی ئەگەر لێی بپرسی ئایا خواردن و پەنجەکەت و لێوەکانت خاوێنن؟ دەڵێت: بە دڵنیایی! ئەی ئەو پیسی و قێزەونیە چیە باسی دەکەیت؟!

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده حسن ، والحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا بێ ئاگا و غافڵن لەوەی خۆشیان ناتوانن لە کاتی نان خواردن پەنجەکانیان نەلێسنەوە، ئەمە حاڵەتێکی سروشتیە لای مرۆڤەکان مەحاڵە ئەنجامی نەدەن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وەک سوننەتێک فەرمان دەکات بە تەواوی بلێسرێنەوە، جا تەنها لەبەر ئەوەی بە ڕاشکاوی ئاماژەی پێکردوە وادەزانن قیامەت هەڵساوە!! جا کامیانت پێ باشترە: مرۆڤ کاتێ پەنجەکانی بە چڵک و چەورایی گۆشت و تەشریبە لە بەر چاوی ئامادەبوان بەم جۆرە پەنجەکانی درێژ بکات بۆ هەڵگرتنی سەوزە و قاپ و کەوچک و پەرداغ و هەمویان خەڵتانی چەوری و ڕەنگی چێشتەکە بکات، یانیش پەنجەکانی بلێسێتەوە و بە پاکی مامەڵە لەگەڵ شتەکانی چواردەوری بکات و ڕەنگ و چەورایەتی خواردنەکە نەلکێنێت بە شتەکانی چواردەوری، وەک منداڵ؟!!

## بابەت: دەربارەی (بەکارهێنانی) خاولی و (کلێنس) لە کاتی خواردندا

٢٠٧٤ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ، فَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَ أَصَابِعَهُ - أَوْ يُلْعِقَهَا».(١)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە (خواردنێکی) خوارد، ئەوە با دەستی نەسڕێتەوە تاوەکو پەنجەکانی دەلێسێتەوە یان بۆی دەلێسنەوە.

## بابەت: دەربارەی لێسانەوەی دەفر (قاپ)

٢٠٧٥ - «أَنْبَأَنَا أَبُو الْيَمَانِ الْبَرَّاءُ وَهُوَ مُعَلَّى بْنُ رَاشِدٍ قَالَ: حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي أُمُّ عَاصِمٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا نُبَيْشَةُ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ نَأْكُلُ طَعَامًا، فَدَعَوْنَاهُ، فَأَكَلَ مَعَنَا، ثُمَّ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنَّهُ مَنْ أَكَلَ فِي قَصْعَةٍ ثُمَّ لَحِسَهَا، اسْتَغْفَرَتْ لَهُ الْقَصْعَةُ».(٢)

واتە: لە ئەبو یەمانی بەڕڕائەوە گێڕدراوەتەوە ـ کە موعەللای کوڕی ڕاشیدە ـ وتویەتی: ئوممو عاصیمی داپیرم (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) بۆی گێڕامەوە وتی: نوبەیشە ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لامان لەکاتێکدا ئێمە خواردنمان دەخوارد، ئێمەش بانگمان کرد و خواردی لەگەڵ ئێمەدا، دواتر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: هەر کەسێک لە قاپ و دەفرێکدا خواردی، دواتر لێسایەوە، ئەوە قاپ و دەفرەکە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکات (واتە: کاتێک بەم جۆرە بەبێ فیزی و بەبێ مەغروری دەخوات و قەدری خواردن دەگرێت و بەفیڕۆی نادات، ئەم کارەی بە دڵنیایی دەبێتە هۆی ئەجر و لێخۆشبوون لە بەشێک لە تاوانەکانی، واتە مامەڵەکەی لەگەڵ قاپەکە ئەو سیفاتانەی دەردەخات، بۆیە وەک بڵێی قاپ و دەفرەکە هۆکاری ئیستیغفارەکەن، بابەتەکە مەجازە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

تێبینی: ئەو کەسەی پێی قێزەونە قاپ بلێسرێتەوە، با کەوچک نەلێسێتەوە و دەم نەدات لە لێواری پەرداغەکەی، ئەگەر وتی ئاخر دواتر دەشۆردرێت، ئێمەش دەڵێین: قاپ و دەفریش دواتر دەشۆردرێن.

## بابەت: دەربارەی پارویێک کاتێک دەکەوێتە سەر زەوی

٢٠٧٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ، فَلْيَمْسَحْ عَنْهَا التُّرَابَ، وَلْيُسَمِّ اللهَ وَلْيَأْكُلْهَا».[١]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ پارویێکی یەکێک لە ئێوە دەکەوێت و بەردەبێتەوە، ئەوە خۆڵەکە (یان ئەو شتەی پێوەی لکا کە دەکرا لێی بکرێتەوە) ئەوە دەستی بەسەردا بهێنێت و پاکی بکاتەوە و بسم الله بکات و بیخوات.

٢٠٧٧ - «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: كَانَ مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ ﷺ يَتَغَدَّى، فَسَقَطَتْ لُقْمَتُهُ، فَأَخَذَهَا فَأَمَاطَ مَا بِهَا مِنْ أَذًى، ثُمَّ أَكَلَهَا. قال فَجَعَلَ أُولَئِكَ الدَّهَاقِينُ يَتَغَامَزُونَ بِهِ، فَقَالُوا لَهُ: مَا تَرَى مَا يَقُولُ هَؤُلَاءِ الأَعَاجِمُ، يَقُولُونَ انْظُرُوا إِلَى مَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الطَّعَامِ وَإِلَى مَا يَصْنَعُ بِهَذِهِ اللُّقْمَةِ؟ فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ لِأَدَعَ مَا سَمِعْتُ مِنْ رسولِ اللهِ ﷺ بِقَوْلِ هَؤُلَاءِ الأَعَاجِمِ، إِنَّا كُنَّا نُؤْمَرُ إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِنَا أَنْ يُمِيطَ مَا بِهَا مِنَ الأَذَى، وَأَنْ يَأْكُلَهَا».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مەعقەلی کوڕی یەسار ﷺ خواردنی دەخوارد، لەناکاو پاروەکەی (لەدەست) کەوتە خوارەوە، جا هەڵیگرتەوە و ئەوەی پێوەی لکابوو لێی کردەوە، دواتر خواردی، (دەڵێ) جا تاجیر و گەورەکان بە تیکە چاوێک بە خراپی سەیریان دەکرد، جا (هەندێک لە خەڵکی تر کە لەوێ ئامادە بوون) پێیان وت: نابینی ئەو تاجیرە فارسیانە چی دەڵێن؟ دەڵێن: سەیری ئەو خواردنەی بەردەمی بکەن (چەندە زۆرە)، سەیریشکەن چی لەو پاروە دەکات (چەندە چاوچنۆکە)؟ ئەویش وتی: من واز لە شتێک ناهێنم کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێ بووە بە قسەی ئەم ئەعجەمیانە، ئێمە فەرمانمان پێکراوە کاتێ پاروی یەکێک لە ئێمە دەکەوێتە خوارەوە ئەوەی پێوەی لکا لایبدات و بیخوات.

تێبینی: ئیسلام دەیەوێ مرۆڤ فێری قەدرگرتنی نیعمەت و بێ فیزی بکات، تاوەکو وەک ئەو کەسە مەغرور و خۆ بەگەورەزانانە نەبێت کە لە فەرموودەکە باس کران، تاوەکو مسوڵمان ببێتە مرۆڤی ڕاستەقینە و شەق لە نیعمەتی خوا هەڵنەدات، چونکە ئێستا کە پێی عەیب بێت پارویێک هەڵگرێتەوە بەیانی پارە و پوڵی لێ بکەوێت هەڵی ناگرێتەوە، دواتریش پێی عەیب و شورەیی دەبێت مل کەچ بکات و، خۆی بۆ هیچ هەقێک نەوی بکات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف.

## بابەت: خواردن بە (دەستی) ڕاستە

٢٠٧٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمالَهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمالَهِ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە خواردی با بە دەستی ڕاستی بخوات و بە دەستی ڕاستیش بخواتەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و دەخواتەوە.

٢٠٧٩ - «أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، عَنْ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٠٨٠ - «حَدَّثَنِي إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَبْصَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بُسْرَ بْنَ رَاعِي الْعِيرِ يَأْكُلُ بِشِمالَهِ، فَقَالَ: كُلْ بِيَمِينِكَ، قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ، قَالَ: لاَ اسْتَطَعْتَ، قَالَ: فَمَا وَصَلَتْ يَمِينُهُ إِلَى فِيهِ».[٣]

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باوکم (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بوسری کوڕی ڕاعی عیری بینی بە دەستی چەپی دەیخوات، بۆیە فەرمووی: بە دەستی ڕاستت بخۆ، وتی: ناتوانم (لەبەر خۆبەزلزانی وای وت، چونکە دەیتوانی)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەک نەتوانی، دەڵێ: (لەو کاتەوە بەدواوە شەلەل بوو) و دەستی ڕاستی نەگەیشتەوە دەمی (بۆ هەتا هەتایی دەستی ڕاستی لەکار کەوت).

## بابەت: خواردن بە سێ پەنجە

٢٠٨١ - «عَنْ ابْنِ كَعْبِ بْنِ مالَكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ، وَلاَ يَمْسَحُ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا».[٤]

واتە: لە ئیبنو کەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەر ﷺ بە سێ پەنجە دەیخوارد، دەستیشی نەدەسڕیەوە تاوەکو دەیلێسایەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

٢٠٨٢ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدٍ الْمَدَنِيِّ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبٍ أَوْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ كَعْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا - شَكَّ هِشَامٌ - أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْكُلُ بِأَصَابِعِهِ الثَّلَاثِ، فَإِذَا فَرَغَ لَعِقَهَا، وَأَشَارَ هِشَامٌ بِأَصَابِعِهِ الثَّلَاثِ».[1]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی سەعدی مەدەنیەوە گێڕدراوەتەوە، كە عەبدوڵلای كوڕی كەعب یانیش عەبدوڕڕەحمانی كوڕی كەعب (رَضِي اللهُ عَنهُمَا)، هیشام نازانێت كامەیان بووە، بۆی گێڕاوەتەوە لە باوكیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار بە سێ پەنجە دەیخوارد، وە كاتێ تەواو دەبوو دەیلێسایەوە، جا هیشام ئاماژەی بەسێ پەنجەكانی كرد.

تێبینی: خواردن بە سێ پەنجە بۆ خواردنە توندەكانە، ئەم جۆرەش جوانترین جۆری دەست بردنە بۆ خواردن، چونكە مرۆڤ كاتێ خورمایێک یان شتێكی لەم جۆرە هەڵدەگرێت یان پاروێک لە خواردن دەدات چەندە جوانە بەو پەڕی سەقافەتەوە بە سێ پەنجە هەڵیبگرێت، نەوەک چەپۆكی لێ گیر بكات و بە لەپی دەستەكانی بیخوات و شلە بە ئانیشكیدا بێتە خوارەوە، وەک هەندێک لە عەرەبەكان عادەتیانە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم عادەتەی ڕاست كردۆتەوە.

## بابەت: دەربارەی میوانداری

٢٠٨٣ - «عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا، أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، جَائِزَتَهُ يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ وَمَا بَعْدَ ذَلِكَ صَدَقَةٌ».[2]

واتە: لە ئەبو شوڕەیحی خوزاعیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە دراوسێی بگرێت، وە هەر كەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاک بكات یان بێ دەنگ بێت، وە هەر كەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێت، جا خۆپێوە ماندوكردن و زیادە ڕێزی میوانداری بریتیە لە شەو و ڕۆژێک، میوانداری كردنی (ئاسایی)ش بریتیە لە سێ ڕۆژ، دوای ئەو ماوەیەش خێر و صەدەقەیە (ئەگەر زیاتر ڕایبگرێت چاكە).

تێبینی: واتە لە ڕۆژی یەكەم هەرچی لە تواناتدا هەیە بۆ میوانی بكە و لە عادەتی ڕۆژانەی خۆت زیاتر شتی بۆ بكرە و ڕێزی لێ بنێ و مەچۆ بۆ كارەكەت ئەگەر گونجا، لە دوو ڕۆژی دواتر وەک ڕۆژەكەی دواتر تەكلیف لەخۆت مەكە (ئەگەر هەبوون بوویت و وەک ڕۆژی یەكەم خزمەتت كرد باشتر، بەڵام ئەگەر نەبوون بوویت ئەوە لەسەرت نیە)، بەڵكو وەكو ڕۆژانی ئاسایی چیت خوارد بە ڕێز و حورمەتەوە پێشكەشی ئەویشی بكە، جا دوای ئەم سێ ڕۆژە لەسەرت نیە خۆت لە ئیش و كار بكەیت ئەگەر

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

پێویستت بێت و بۆت نەگونجێت، بۆیە ئەگەر زیاتریش ڕایبگریت ئەوە خێرێکە و ئەنجامی دەدەیت، بۆ میوانیش وا باشە لە سێ ڕۆژ زیاتر نەمێنێتەوە ئەگەر زەڕور نەبێت.

٢٠٨٤ - «عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا، أَوْ لِيَسْكُتْ».(١)

واتە: لە ئەبو شورەیحی خوزاعیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێت، وە هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با چاکە بکات لەگەڵ دراوسێکەی، وە هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاک بکات یان بێ دەنگ بێت.

٢٠٨٥ - «عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ أَبِي كَرِيمَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّمَا مُسْلِمٍ ضَافَ قَوْمًا، فَأَصْبَحَ الضَّيْفُ مَحْرُومًا، فَإِنَّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ نَصْرَهُ حَتَّى يَأْخُذَ لَهُ بِقِرَى لَيْلَتِهِ مِنْ زَرْعِهِ، وَمَالِهِ».(٢)

واتە: لە ئەبو کەریمە، میقدادی کوڕی مەعدی کەریبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێک میوانداری خەڵکانێک بکات و، میوانەکە بێبەش بێت لە میوانداری و (برسیەتی تینی بۆ هێنابێت)، ئەوە لەسەر هەموو مسوڵمانان پێویستە خواردن و ڕێزی میوانداری شەوەکەی بۆ فەراهەم بکات لە بەروبوم وماڵەکەی.

بابەت: کە مێش دەکەوێتە ناو خواردن (یان خواردنەوە)

٢٠٨٦ - «عَنْ عُتْبَةَ بْنِ مُسْلِمٍ، أَنَّ عُبَيْدَ بْنَ حُنَيْنٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا سَقَطَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءً».(٣)

واتە: لە عوتبەی کوڕی موسلیمەوە گێردراوەتەوە، کە عوبەیدی کوڕی حونەین بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: گوێی لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ مێش دەکەوێتە ناو خواردنەوەی یەکێک لە ئێوە، ئەوە با بەتەواوی نوقمی بکات، دواتر دەریبێنێت و فڕێی بداتە دەرەوە، چونکە لە یەکێک لە باڵەکانی نەخۆشی هەیە و لەوەیتریش چارەسەر.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

٢٠٨٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءً».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: كاتێ مێش دەكەوێتە ناو خواردنەوەی یەكێک لە ئێوە، ئەوە با بەتەواوی نوقمی بكات، دواتر دەریبێنێت و فڕێی بداتە دەرەوە، چونكە لە یەكێک لە باڵەكانی نەخۆشی هەیە و لەوەیتریش چارەسەر.

## بابەت: بڕوادار بە ئەندازەی یەک گەدە نان دەخوات

٢٠٨٨ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ».[٢]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتی: مرۆڤی بڕواداری (ڕاستەقینە و بە قەناعەت) بە ئەندازەی یەک گەدە دەخوات (واتە: تەنها ئەوەندە دەخوات تاوەكو برسیەتی بشكێ)، كافریش بە ئەندازەی چەندین گەدە دەخوات (واتە: تەنگەی پڕ پڕ دەكات).

تێبینی: لێرەدا وشەی (حەوت) كە لە فەرموودەكەدا هاتووە مەبەست پێی ژمارە حەوت نیە، بەڵكو واتای زۆر دەگەیەنێت، چونكە لە زمانی عەرەبی حەوت و حەفتا كینایەتن لە بری شتی زۆر.

٢٠٨٩ - «أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ الْقَوَارِيرِيُّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ».[٣]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٠٩٠ - «وحَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنْ أَبِي الْوَدَّاكِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ».[٤]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٠٩١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ».[٥]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتی: مرۆڤی بڕواداری (ڕاستەقینە و بە قەناعەت) بە ئەندازەی یەک گەدە دەخوات (واتە: تەنها ئەوەندە

---

(١) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٥) ـ صحيح.

دەخوات تاوەكو برسیەتی بشكێ)، كافریش بە ئەندازەی چەندین گەدە دەخوات (واتە: تەنگەی پڕ پڕ دەكات).

## بابەت: خواردنی یەک کەس بەشی دووان دەکات

٢٠٩٢ - «عَنْ جَابِرٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الِاثْنَيْنِ، وَطَعَامُ الِاثْنَيْنِ يَكْفِي الأَرْبَعَةَ، وَطَعَامُ الأَرْبَعَةِ يَكْفِي ثَمَانِيَةً».[١]

واتە: لە جابرەوە  گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە (کە فەرموویەتی): خواردنی یەک کەس بەشی دوو کەس دەکات، وە خواردنی دوو کەس بەشی چواران دەکات، وە خواردنی چوار کەس بەشی هەشتان دەکات.

٢٠٩٣ـ غیر موجود[٢].

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی (خواردن) لەبەردەمی خۆی دەخوات

٢٠٩٤ - «عن عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: سَمِّ اللهَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ».[٣]

واتە: لە عومەری کوڕی سەلەمەوە  گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ناوی خوا بێنە (بسم الله بکە لەکاتی خواردن) و لەبەردەمی خۆت بخۆ.

## بابەت: نەهی کردن لە خواردنی ناوەڕاستی تەشریب (تێگوشە) تاوەکو چواردەورەکەی دەخوات

٢٠٩٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِجَفْنَةٍ - أَوْ قَالَ قَصْعَةٍ - مِنْ ثَرِيدٍ، فَقَالَ: كُلُوا مِنْ حَافَاتِهَا - أَوْ قَالَ: جَوَانِبِهَا، وَلاَ تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهَا، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ فِي وَسَطِهَا».[٤]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سنیێک (خوانچەیەک) لە تەشریب و تێگوشەی بۆ هات، ئەویش فەرمووی: لە دەوروبەر و چواردەوری بخۆن و لە ناوەڕاستی مەخۆن، چونکە بەرەکەت دادەبەزێت بۆ ناوەڕاستەکەی.

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ سقط الترقیم.

(٣) ـ صحیح.

(٤) ـ صحیح.

## بابەت: نەهی كردن لە خواردنی چێشتی گەرم

٢٠٩٦ - «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا أُتِيَتْ بِثَرِيدٍ، أَمَرَتْ بِهِ فَغُطِّيَ حَتَّى يَذْهَبَ فَوْرَةُ وَدُخَانُهُ، وَتَقُولُ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: هُوَ أَعْظَمُ لِلْبَرَكَةِ».[١]

واتە: لە ئەسمائی كچی ئەبوبەكرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، كە هەر كاتێ تەشریبی بۆ بهاتایە فەرمانی دەكرد و دادەپۆشرا تاوەكو گەرماتی و هەڵمەكەی دەڕۆیشت و نەدەما، وە دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەم جۆرە بەرەكەتی زیاترە.

## بابەت: كام پێخۆر خۆشترین بووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٠٩٧ - «عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِي ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَقَالَ: هَلْ مِنْ غَدَاءٍ، أَوْ مِنْ عَشَاءٍ؟ شَكَّ طَلْحَةُ قَالَ: فَأَخْرَجَ إِلَيْهِ فِلَقًا مِنْ خُبْزٍ، فَقَالَ: أَمَا مِنْ أُدْمٍ؟ قَالُوا: لاَ، إِلاَّ شَيْءٌ مِنْ خَلّ، فَقَالَ: هَاتُوهُ فَنِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ، قَالَ جَابِرٌ: فَمَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَمَا زِلْتُ أُحِبُّهُ مُنْذُ سَمِعْتُهُ مِنْ جَابِرٍ».[٢]

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵلا (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێكیان دەستی گرتم (بردمی) بۆ ماڵەكەی و فەرمووی: هیچ خواردنێك بۆ بەیانی ـ یان فەرمووی هیچ خواردنێك بۆ ئێوارە ـ هەیە؟ (تەڵحە لەو دوو ڕستەیە بە گومانە نازانێ كامەی وت لە گێڕانەوەكەدا)، (جابر) دەڵێ: چەند پارچەیەك لە نانیان بۆ دەرهێنا، ئەویش فەرمووی: پێخۆرێك نیە (تا لەگەڵی بخۆین)؟ وتیان: نەخێر تەنها تۆزێك لە دۆشاو نەبێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیهێنن دۆشا و چاكترین پێخۆرە.

جابر وتویەتی: بەردەوام حەز لە دۆشاو دەكەم و لام خۆشە لەو كاتەوەی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست، ئەبو سوفیانیش وتویەتی: بەردەوام حەز لە دۆشاو دەكەم و لام خۆشە لەو كاتەوەی لە جابرم بیست.

٢٠٩٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: نِعْمَ الْإِدَامُ - أَوْ نِعْمَ الْأُدْمُ - الْخَلُّ».[٣]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: چاكترین پێخۆر دۆشاوە.

---

(١) ـ اسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی كولەكە (كودی)

٢٠٩٩ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِمَرَقَةٍ فِيهَا دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، فَرَأَيْتُهُ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ يَأْكُلُهُ».(١)

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی مەرەگەیەكی بۆ هێنرا (ترشێكی بۆ هێنرا) كولەكە و گۆشتی وشككراوی تیابوو، بینیم لەدوای كولەكەكە دەگەڕا دەیخوارد.

٢١٠٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الْقَرْعُ، قَالَ: فَقُدِّمَ إِلَيْهِ فَجَعَلْتُ أَتَنَاوَلُهُ، وَأَجْعَلُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ».(٢)

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ كولەكەی پێ خۆش بوو، دەڵێ: جا پێشكەشی كرا منیش هەڵمدەگرت و دەمخستە بەردەمی.

## بابەت: دەربارەی چاكی زەیت (زەیتی زەیتون)

٢١٠١ - «عَنْ أَبِي أَسِيدٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُوا الزَّيْتَ فَإِنَّهُ مُبَارَكٌ وَائْتَدِمُوا بِهِ، وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ».(٣)

واتە: لە ئەبو ئوسەیدی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەیت بخۆن، چونكە بەرەكەتدار كراوە، وە بیكەنە پێخۆر و، خۆتانی پێ چەور بكەن (واتە: جەستە و قژتان پێ چەور بكەن)، چونكە لە دارێكی بە فەڕ و بەرەكەت پێبەخشرا و دەردەچێت (كە داری زەیتونە).

## بابەت: دەربارەی خواردنی سیر

٢١٠٢ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ: مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ - يَعْنِي الثُّومَ - فَلاَ يَأْتِيَنَّ الْمَسَاجِدَ».(٤)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە غەزای خەیبەر فەرمووی: هەر كەسێك لەم دارە بخوات ـ واتە: سیر بخوات ـ ئەوە با نێت بۆ مزگەوت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ اسناده حسن.

(٤) ـ صحيح.

٢١٠٣ - «حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي يَزِيدَ ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ أُمَّ أَيُّوبَ، أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ: نَزَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَتَكَلَّفْنَا لَهُ طَعَامًا فِيهِ شَيْءٌ مِنْ بَعْضِ هَذِهِ الْبُقُولِ، فَلَمَّا أَتَيْنَا بِهِ كَرِهَهُ وَقَالَ لِأَصْحَابِهِ: كُلُوا، فَإِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ أُوذِيَ صَاحِبِي، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: إِذَا لَمْ يُؤْذِ أَحَدًا، فَلاَ بَأْسَ بِأَكْلِهِ».[١]

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو زەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە کە ئوممو ئەییوب بۆی گێڕاوەتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای ئێمە دابەزی و مایەوە، ئێمەش چێشتێکمان بۆ دروست کرد کە هەندێک لە سیری تیابوو، جا کاتێ بۆمان برد پێی باش نەبوو و بە هاوەڵەکانی فەرموو: بیخۆن، من وەک هیچ یەکێک لە ئێوە نیم، من دەترسم ئازاری هاوڕێکەم (جبریل عليه السلام) بدەم.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەگەر مرۆڤ ئازاری کەس نەدات (بە بۆنەکەی و کەسی لێ نزیک نەبێت، یان ئەوانەی لێی نزیکن لایان ئاساییە و پێیان ناخۆش نەبێت)، ئەوە خواردنی (سیر) هیچ کێشەی تیا نیە.

## بابەت: دەربارەی خواردنی مریشک

٢١٠٤ - «عَنْ زَهْدَمٍ الْجَرْمِيِّ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه فَقُدِّمَ طَعَامُهُ، فَقُدِّمَ فِي طَعَامِهِ لَحْمُ دَجَاجٍ، وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللهِ أَحْمَرُ، فَلَمْ يَدْنُ، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: ادْنُ، فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَأْكُلُ مِنْهُ».[٢]

واتە: لە زەهدەمی جەڕمیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەلای ئەبو موسا رضي الله عنه بووین و چێشتەکەی پێشکەش کرا، جا گۆشتی مریشک لە خواردنەکەدا هەبوو، لەناو خەڵکەکەش پیاوێکی سوری (بەنی تیمی الله) هەبوو و نزیک نەکەوتەوە، ئەبو موساش پێی وت: نزیکبەرەوە، بە دڵنیایی من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە لێی خواردووە.

٢١٠٥ - «عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه، أَنَّهُ ذَكَرَ الدَّجَاجَ فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَأْكُلُهُ».[٣]

واتە: لە ئەبو موساوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە کە باسی مریشکی کردوە و وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەیخوارد.

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو کەسەی پێی باش نیە خواردن بدات و (میوانداری کەس بکات بەناوی دەعوەتەوە) مەگەر پارێزکار و بەتەقوا نەبێت

٢١٠٦ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ نَبِيَّ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ تَصْحَبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا، وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ».(١)

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هاوڕێیەتی کەس مەکە جگە لە بڕوادار، وە با کەسیش خواردنت نەخوات (بە ناوی دەعوەت) جگە لە کەسی پارێزکار و بەتەقوا.

## بابەت: ئەوەی پێی وایە هیچ کێشە نیە دوو شت (دوو خۆراک) بەیەکەوە کۆبکرێنەوە

٢١٠٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی تەرۆزی و ڕوتابی دەخوارد.

## بابەت: نەهی کردن لە هەڵگرتن و خواردنی دوو دانە لە خۆراک (لەکاتی خواردنی بە کۆمەڵ)

٢١٠٨ - «حَدَّثَنَا جَبَلَةُ بْنُ سُحَيْمٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ فَأَصَابَتْنَا سَنَةٌ، فَكَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ يَرْزُقُ التَّمْرَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَمُرُّ بِنَا وَيَقُولُ: لاَ تُقَارِنُوا فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْقِرَانِ، إِلاَّ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ أَخَاهُ».(٣)

واتە: لە جەبلەی کوڕی سوحەیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە مەدینە بووین، جا وشکە ساڵی و قاتوقوڕیمان توش بوو، ئیبنو زوبەیریش خورمای دابەش دەکرد، ئیبنو عومەریش بەلاماندا تێپەڕی و وتی: دوان مەخۆن (واتە: دوو دەنکە خورما بە یەک جار هەڵمەگرن)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە دوو شت هەڵبگیرێت و بخورێت، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە کابرا مۆڵەتی براکەی بدات.

(ئەو کات بۆی هەیە دوو دانە بخوات، کەواتە سوننەت وایە کە شتێک دابەشکرا لە کۆڕو مەجلیس یەک دانەی لێ هەڵبگیرێ، فەرموودەکە گشتیە، والله أعلم).

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی خورما

٢١٠٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَا عَائِشَةُ بَيْتٌ لاَ تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ - أَوْ جَاعَ أَهْلُهُ - مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا».(١)

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی عائیشە ماڵێک خورمای تیا نەبێت خەڵكەكەی برسیە، یان خەڵكەكەی برسی بووە، دوو جار یان سێ جار (ئاوای فەرموو).

٢١١٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ يَجُوعُ أَهْلُ بَيْتٍ عِنْدَهُمُ التَّمْرُ».(٢)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ ماڵێک برسی نابن كە خورمایان لەلا بێت.

٢١١١- «حَدَّثَنَا مُصْعَبُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ تَمْرٌ، فَأَخَذَ يُهَدِّيهِ، وَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَأْكُلُ تَمْرًا مُقْعِيًا مِنَ الْجُوعِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يُهَدِّيهِ يَعْنِي يُرْسِلُهُ هَاهُنَا وَهَاهُنَا»(٣)

واتە: لە موصعەبی كوڕی سولەیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ بوو دەیوت: خورما كرا بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بەخشیەوە (بە كەسانی دەوروبەری)، هەروەها وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە شێوەی ئیقعاء دانیشتبوو و خورمای دەخوارد لەبەر برسیەتی.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: وشەی (يُهَدِّيهِ) واتە: بەملا و ئەملادا ڕەوانەی دەكرد و (خورماكەی دابەش دەكرد).

تێبینی: ئیقعاء شێوازێكە نزیكە لە شێوازی دانیشتن لەسەر چیچكان، بەڵام نێركەكانیش لە زەوی دادەنرێت.

## بابەت: دەربارەی دەستنوێژ شۆردن دوای خواردن

٢١١٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ نَامَ وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ فَعَرَضَ لَهُ عَارِضٌ، فَلاَ يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ».(٤)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ حسن.

واتە: لە ئەبو هورەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خەوت و دەستی بۆنی چەورایەتی گۆشتی لێهات و توشی بەڵایێک بوو (واتە: ئاژەڵێک یان زیندەوەرێک بۆنی کرد و پەلاماریدا یان پێوەیدا و گەستی و ژەهراوی بوو)، ئەوە با تەنها لۆمە و سەرزەنشتی خۆی بکات و گلەیی لە خۆی بکات.

## بابەت: دەربارەی چێشتی هاوسەرگیری

٢١١٣ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، وَرَأَى عَلَيْهِ وَضَرًا مِنْ صُفْرَةٍ: مَهْيَمْ؟ قَالَ: تَزَوَّجْتُ. قَالَ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ».[١]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفی ﷺ فەرموو: ئەوە چیە چی بووە؟ لەکاتێکدا شوێنەواری گوڵاوی پێوە بینی، عەبدوڕڕەحمانیش وتی: هاوسەرگیریم کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چێشتی هاوسەرگیری دروست بکە، ئەگەر بە بزنێکیش بێت (واتە: ئەگەر دەعوەتەکە گەورەش نەبێت هەر بیکە، چونکە سوننەتێکی گەورەیە).

٢١١٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُثْمَانَ الثَّقَفِيِّ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ ثَقِيفٍ أَعْوَرَ قَالَ: كَانَ يُقَالُ لَهُ مَعْرُوفٌ أَيْ يُثْنَى عَلَيْهِ خَيْرٌ إِنْ لَمْ يَكُنِ اسْمُهُ زُهَيْرَ بْنَ عُثْمَانَ فَلاَ أَدْرِي مَا اسْمُهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْوَلِيمَةُ أَوَّلَ يَوْمٍ حَقٌّ، وَالثَّانِيَ مَعْرُوفٌ، وَالثَّالِثَ سُمْعَةٌ وَرِيَاءٌ، قَالَ قَتَادَةُ: وَحَدَّثَنِي رَجُلٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ دُعِيَ أَوَّلَ يَوْمٍ فَأَجَابَ، وَدُعِيَ الْيَوْمَ الثَّانِيَ فَأَجَابَ، وَدُعِيَ الْيَوْمَ الثَّالِثَ فَحَصَبَ الرَّسُولَ وَلَمْ يُجِبْهُ، وَقَالَ: أَهْلُ سُمْعَةٍ وَرِيَاءٍ».[٢]

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عوسمانی سەقەفیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی کوێری ثەقیفی گێڕاوەتەوە، دەڵێ: بە چاکە باسی دەکرا و پیاوێکی چاک بوو، ئەگەر ناوی زوهەیری کوڕی عوسمان نەبێت نازانم ناوی چی بوو (بەڵام پیاوێکی جێگای باوەڕ بوو) وتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەعوەت و چێشت دروستکردن بۆ هاوسەرگیری لە ڕۆژی یەکەمدا هەق و سوننەتە، لە ڕۆژیی دووەمدا چاکە و (ئاساییە)، لە ڕۆژی سێیەمدا ناوبانگ و ڕیایی و ڕووپامایبە.

قەتادە وتویەتی: پیاوێک لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە بۆی گێڕامەوە، کە سەعید یەکەم ڕۆژ بانگێشت کراوە، ئەویش وەڵامی داوەتەوە و چووە، وە ڕۆژی دووەم بانگێشت کراوە و وەڵامی داوەتەوە و چووە، وە ڕۆژی سێیەم بانگێشت کراوە بەردی لە نێردراوەکە گرتووە و وەڵامی نەداوەتەوە و، نەچووە و، وتویەتی: ئەهلی ناوبانگ و ڕیایی و ڕووپامایین.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

٢١١٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُدْعَى إِلَيْهِ الأَغْنِيَاءُ، وَيُتْرَكُ الْمَسَاكِينُ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللهَ، وَرَسُولَهُ».(١)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: خراپترین خواردن خواردنی هاوسەرگیرییێکە کە دەوڵەمەندەکان بانگێشت و دەعوەت بکرێن و هەژارەکانیش واز لێبهێنرێن و بانگێشت نەکرێن، وە هەر کەسێکیش وەڵامی دەعوەت و بانگێشت نەداتەوە و نەچێت ئەوە سەرپێچی خوا و پێغەمبەری ﷺ کردوە.

٢١١٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ قَدْ صَنَعَ طَعَامًا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَكَذَا وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ بِيَدِهِ، قَالَ: يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَكَذَا، وَأَشَارَ إِلَى عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَ: لاَ فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ الثَّانِيَةَ، وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَهَذِهِ؟ قَالَ: نَعم، فَانْطَلَقَ مَعَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَعَائِشَةُ فَأَكَلاَ مِنْ طَعَامِهِ».(٢)

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات کە خواردنێکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کردبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا ئاماژەی بە دەستی کرد (بە ئاماژە وتی: وەرە دەعوەتم کردووی)، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ ئاوای پێ فەرموو ئاماژەی بۆ عائیشە کرد (رَضِي اللهُ عَنْهَا) (واتە: بە ئاماژە فەرمووی عائیشەش بێ؟)، پیاوەکە وتی: نەخێر، پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی دەعوەتەکەی نەدایەوە و لەگەڵی نەچوو، (جا پیاوەکە) بۆ جاری دووەم ئاماژەی بۆ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بۆ عائیشە کردەوە، (کابرا ڕازی نەبوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی دەعوەتەکەی نەدایەوە و لەگەڵی نەچوو، (جا پیاوەکە) بۆ جاری سێیەم ئاماژەی بۆ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ (ئەم جارەیان بە قسە) پێی فەرموو: ئەوەش بێ؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ و عائیشە لەگەڵی ڕۆیشتن و لە خواردنەکەیان خوارد.

٢١١٧ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ، وَكَانَ لَهُ غُلاَمٌ لَحَّامٌ فَقَالَ: اصْنَعْ لِي طَعَامًا أَدْعُو رَسُولَ اللهِ ﷺ خَامِسَ خَمْسَةٍ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولَ اللهِ ﷺ خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَتَبِعَهُمْ رَجُلٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّكَ دَعَوْتَنَا خَامِسَ خَمْسَةٍ، وَهَذَا رَجُلٌ قَدْ تَبِعَنِي، فَإِنْ شِئْتَ أَذِنْتَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ تَرَكْتَهُ، قَالَ: فَأَذِنَ لَهُ».(٣)

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هەبوو پێی دەوترا: ئەبو شوعەیب، جا خزمەتکارێکی هەبوو لە چێشت لێنان و گۆشت لێناندا شارەزاییەکی باشی هەبوو، (ئەبو شوعەیب) وتی: چێشتێکم بۆ دروست بکە (بۆ پێنج کەس) پێغەمبەری خواش ﷺ پێنجەم کەس بانگێشت دەکەم، دەڵێ: پێغەمبەری خوای ﷺ پێنجەم کەس بانگێشت کرد، پیاوێکیش بەدوایان کەوت،

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: تۆ منت پێنجەم کەس بانگێشت کردوە (واتە: ژمارەی میوانەکان تەواو بووە بە حیسابی خۆت)، ئەوەش پیاوێکە و شوێنمان کەوتووە، جا ئەگەر حەزدەکەی ئیزنی بدە (با ئەویش بێت)، ئەگەر حەزیش دەکەیت وازی لێ بهێنە (بانگێشتی مەکە)، دەڵێ: ئەبو شوعەیب ئیزنی پێدا و بانگێشتی ئەویشی کرد.

## بابەت: قەدری تەشریب (تیکوشە)

٢١١٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَضْلُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَلَى النِّسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ».[١]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەیی و قەدری عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بەسەر ئافرەتانەوە، وەک گەورەیی و قەدری تەشریبە بەسەر چێشتەکانی ترەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی پێی سوننەت و چاکە گۆشت بپچکڕێتەوە بە ددانەکانی و پارچەی نەکات (بە چەقۆ)

٢١١٩ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ: زَوَّجَنِي أَبِي فِي إِمَارَةِ عُثْمَانَ ﷺ، فَدَعَا رَهْطًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَكَانَ فِيمَنْ دَعَا صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: انْهَسُوا اللَّحْمَ نَهْسًا، فَإِنَّهُ أَشْهَى وَأَمْرَأُ».[٢]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریثی کوڕی نەوفەل وتویەتی: باوکم هاوسەرگیری بۆ کردم لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا ﷺ، جا کۆمەڵێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ داوەت و بانگێشت کردبوو، وە لەوانەی بانگێشتی کردبوون صەفوانی کوڕی ئومەییەی تیابوو کە پیرێکی بەتەمەن بوو و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گۆشت بە ددان بپچڕن، چونکە ئاوا شەهیەی زیاتری هەیە و ئاسانترە بۆ هەزمکردنی گەدە.

## بابەت: دەربارەی خواردن بە پاڵکەوتن لەسەر لاتەنیشت

٢١٢٠ - «حَدَّثَنِي أَبُو جُحَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ آكُلُ مُتَّكِئًا».[٣]

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواردن ناخۆم بە پاڵکەوتن.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی سەرەتا و دەستپێک و وەجبەی یەکەمی بەروبووم

٢١٢١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أُتِيَ بِالْبَاكُورَةِ بِأَوَّلِ الثَّمَرَةِ، قَالَ: اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَفِي ثَمَرَتِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَفِي صَاعِنَا بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ، ثُمَّ يُعْطِيهِ أَصْغَرَ مَنْ يَحْضُرُهُ مِنَ الْوِلْدَانِ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەرەتا و وەجبەی یەکەمی بەروبووم و میوەجاتی بۆ دەهات دەیفەرموو: (اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَفِي ثَمَرَتِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَفِي صَاعِنَا بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ) واتە: ((خوایە فەڕ و بەرەکەت بخەیتە ناو شارەکەمان و بەروبوومەکەمان و مودد و صاع و (واتە: بەرەکەت بخەیتە کێشان و پێوانەشمان) بەرەکەت لەگەڵ بەرەکەت))، دواتر (میوەکەی) دەدا بە بچوکترین منداڵی ئامادەبوو.

## بابەت: دەربارەی ڕێزلێنان لە خزمەتکار لە کاتی نان خواردندا

٢١٢٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا جَاءَ خَادِمُ أَحَدِكُمْ بِالطَّعَامِ، فَلْيُجْلِسْهُ، فَإِنْ أَبَى، فَلْيُنَاوِلْهُ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خزمەتکاری یەکێک لە ئێوە خواردنی هێنا، ئەوە با دایبنیشێ (با لەگەڵی بخوات)، جا ئەگەر (خزمەتکارەکە) ڕازی نەبوو، ئەوە با لە خواردنەکەی پێ بدات.

٢١٢٣ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامٍ، فَلْيُجْلِسْهُ مَعَهُ، أَوْ لِيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ، أَوْ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ، فَإِنَّهُ وَلِيَ حَرَّهُ وَدُخَانَهُ».[٣]

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو لە پێغەمبەری ﷺ دەیگێڕایەوە و دەیوت: کاتێ خزمەتکاری یەکێک لە ئێوە خواردنی بۆ هێنان با لەگەڵ خۆی دایبنیشێنێ، یان با پارووێک دوو پارووی پێ بدات، چونکە ئەو خزمەتکارە گەرم کردن و کوڵان و دوکەڵ و هەڵمەکەی گرتۆتە ئەستۆ و ئەنجامی داوە (واتە: ئەو بۆی ئامادە کردوون و پێوەی ماندوو بووە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی حەلوا و هەنگوین

٢١٢٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ».(١)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە حەلوا و هەنگوین بوو.

## بابەت: دەربارەی خواردن و خواردنەوە بەبێ دەستنوێژ

٢١٢٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الْبَرَازِ فَقُدِّمَ إِلَيْهِ الطَّعَامُ فَقِيلَ لَهُ: أَلاَ تَوَضَّأُ؟ قَالَ: فَقَالَ: أُصَلِّي فَأَتَوَضَّأُ؟».(٢)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سەرئاو دەرچوو و خواردنی پێشکەشکرا و بۆی هێنرا، جا پێی وترا: دەستنوێژ ناشۆری؟ ئەویش فەرمووی: مەگەر نوێژ دەکەم تاوەکو دەستنوێژ بشۆرم؟

٢١٢٦ - «حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا».(٣)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە.

٢١٢٧ - «قَالَ: وَسَمِعْتُ أَبَا عَاصِمٍ يُحَدِّثُ، عَنْ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، بِإِسْنَادِهِ».(٤)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی کەسی جەنابەتدار کە خواردن دەخوات

٢١٢٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَجْنَبَ فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ، تَوَضَّأَ».(٥)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ جەنابەتدار دەبوو و دەیەویست خواردن بخوات، یان بخەوێت، ئەوە دەستنوێژی دەشۆرد.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ رجاله ثقات.

(٥) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئاو زیادكردن لەناو مەنجەڵ

٢١٢٩ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ فَقَالَ: إِذَا طَبَخْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَهَا، ثُمَّ انْظُرْ أَهْلَ بَيْتٍ مِنْ جِيرَانِكَ، فَاغْرِفْ لَهُمْ مِنْهَا».(١)

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆشەویستەكەم (پێغەمبەری خوا ﷺ) ئامۆژگاری كردووم و وەسیەتی بۆ كردووم و فەرموویەتی: ئەگەر شلە و مەرەگەت دروست كرد، ئەوە ئاوەكەی زیاد بكە، دواتر سەیركە بزانە كام لە جیرانەكانت (پێویست ترە)، هەندێكیان بۆ تێبكە و بەشیان بدە.

## بابەت: دەربارەی نەعلە و پێڵاو داكەندن لەكاتی خواردن

٢١٣٠ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا وُضِعَ الطَّعَامُ، فَاخْلَعُوا نِعَالَكُمْ، فَإِنَّهُ أَرْوَحُ لِأَقْدَامِكُمْ».(٢)

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ خواردن دانرا نەعلە و پێڵاوەكانتان داكەنن، ئاوا بۆ قاچەكانتان خۆشترە.

## بابەت: دەربارەی خواردن بەخشین و ناندان

٢١٣١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اعْبُدُوا الرَّحْمَنَ، وَأَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، تَدْخُلُوا الْجِنَانَ».(٣)

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بە بەزەیی بپەرستن و، سەلام و ئاشتی بڵاوبكەنەوە و، خواردن ببەخشن، دەچنە بەهەشت.

## بابەت: دەربارەی دەعوەت و بانگێشت

٢١٣٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَجِيبُوا الدَّاعِيَ إِذَا دُعِيتُمْ، قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَأْتِي الدَّعْوَةَ فِي الْعُرْسِ، وَفِي غَيْرِ الْعُرْسِ، وَيَأْتِيهَا وَهُوَ صَائِمٌ».(٤)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف.

(٣) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەڵامی بانگێشتکار بدەنەوە کاتێ بانگێشتی کردن بۆ دەعوەت.

دەڵێ: هەموو جار عەبدوڵلا دەچوو بۆ داوەت و بانگێشتی بوک گواستنەوە و، غەیری بوک گواستنەوەش، وەڵامی دەعوەتی دەدایەوە و دەچوو بۆ دەعوەتەکەو، لەکاتێکدا بەڕۆژووش بوو.

## بابەت: مشک کاتێ دەکەوێتە ناو ڕوون و تیایدا دەمرێت (حوکمەکەی چیە)؟

٢١٣٣ - «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا، وَكُلُوا».[١]

واتە: لە مەیمونەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی مشک کاتێ کەوتۆتە ناو ڕوون (ئایا حوکمی چۆنە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مشکەکە و ڕوونی چواردەوری فڕێبدەن و (ئەوەیتری) بخۆن (ئەمە تایبەتە بە ڕوونی بەستو توند، کە ئێستا پێی دەڵێن ڕۆنی تەنەکە، کەواتە: ڕۆنی زەیت ناگرێتەوە، چونکە ئەو شلە و گشتی پیس دەبێت).

٢١٣٤ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ عَنْ ابْنِ عُيَيْنَةَ ﷺ بِإِسْنَادِهِ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە گێڕدراوەتەوە.

٢١٣٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ فَأْرَةٍ وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ فَمَاتَتْ، فَقَالَ: خُذُوهَا وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی مشک کە کەوتۆتە ناو ڕوون و مردووە (ئایا حوکمی چۆنە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مشکەکە و چواردەورەکەی هەڵگرن و فڕێی بدەن.

٢١٣٦ - «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: إِذَا كَانَ ذَائِبًا أُهَرِيقَ».[٤]

واتە: لە مەیمونەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە بە هەمان شێوە، ئەبو موحەممەدیش وتویەتی: ئەگەر ڕوونەکە تواوەبوو (یان زەیت بوو) ئەوە دەڕژێنرێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی دەرهێنانی خواردن لە نێوان ددانەكان

٢١٣٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَكَلَ، فَلْيَتَخَلَّلْ، فَمَا تَخَلَّلَ، فَلْيَلْفِظْهُ، وَمَا لاَكَ بِلِسَانِهِ، فَلْيَبْتَلِعْ».[1]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک خواردنی خوارد، با خواردن لە ژێر ددانەكانی دەربهێنێت، جا ئەوەی هەڵیكەنی (بە داری ددان و یان هەر شتێكی تر) با فڕێی بدات، وە ئەوەیشی كە بە زمانی ئەملا و لای پێكرد (بە توندی نەچوبویە ژێر ددانەكانی و قێزەون نەبوبوو) با قوتی بدات.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی ئارەق و مەشرۆب هاتووە

٢١٣٨ - «أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا ثُمَّ أَخَذَ اللَّبَنَ. فَقَالَ جِبْرَائِيلُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ».[١]

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: لەو شەوەی شەوڕۆیی کرا بە پێغەمبەر ﷺ بۆ بەیتول مەقدیس دوو بەرداغ درا بە پێغەمبەری خوا ﷺ (یەکێکیان) ئارەق و ئەوەیتریان شیر بوو، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) سەیری هەردووکیانی کرد، دواتر شیرەکەی وەرگرت (ئارەقەکەشی ڕەت کردەوە)، جا جیبریل ﷺ فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ڕێنموویی کردی بۆ سروشتی خواڕسکی مرۆڤایەتی، ئەگەر ئارەقەکەت هەڵبژاردبووایە ئەوە ئوممەتەکەت گومڕا دەبوون و لایاندەدا لە هەق (چونکە دەیانوت پێغەمبەر ﷺ خواردوویەتیەوە ئێمەش وازی لێ ناهێنین، دەیانکرد بە بەهانە، هەر چەندە ئارەقی بەهەشت جیاوازە و بێهۆشکەر نیە).

## دەربارەی حەڕامکردنی ئارەق، کە چۆن بوو

٢١٣٩ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ. قَالَ: فَنَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ. قَالَ: فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ اخْرُجْ فَانْظُرْ مَا هَذَا، قَالَ: فَخَرَجْتُ فَقُلْتُ: هَذَا مُنَادٍ يُنَادِي: أَلَا إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ، فَقَالَ لِيَ: اذْهَبْ فَأَهْرِقْهَا قَالَ: فَجَرَتْ فِي سِكَكِ الْمَدِينَةِ. قَالَ: وَكَانَتْ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخَ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: قُتِلَ قَوْمٌ وَهِيَ فِي بُطُونِهِمْ. فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوا وَآمَنُوا ﴿٩٣﴾ ﴾ المائدة».[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: من ساقی و ئارەقپێدەری خەڵکەکە بووم لە ماڵی ئەبو تەڵحە، دەڵێ: کە (ئایەتی) حەڕامکردنی ئارەق دابەزی، (جا پێغەمبەری خوا) فەرمانی بە بانگبێژێک کرد بانگ ڕابهێڵێت، ئەویش بانگی ڕاهێشت، ئەبو تەڵحەش وتی: بڕۆ دەرەوە بزانە ئەوە چیە؟ دەڵێ: منیش چوومە دەرەوە (دواتر هاتمە ژوورەوە) و وتم: ئەوە بانگبێژێکە بانگ دەکات و دەڵێت: ئاگاداربن ئارەق حەڕامکرا، ئەبوتەڵحەش پێی وتم: بڕۆ و بیڕێژە، دەڵێ: جا ئارەق جۆگەلەی دەکرد لە کۆڵانەکانی مەدینە (چونکە مسوڵمانان دەیانڕشت)، دەڵێ: ئارەقی ئەو ڕۆژگارە فەضیخ بوو (واتە: لە جۆرە خورمایێک دروست دەکرا پێشی ئەوەی ببێتە ڕوتاب)، جا هەندێک لە خەڵکی وتیان: هەندێک لە خەڵکی مسوڵمان کوژراون (شەهید بوون لە شەڕی کافراندا) لەکاتێکدا ئەو ئارەقەیان لە سک و هەناودا بووە؟ خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ﴿٩٣﴾ المائدة، واتە: [هیچ تاوانێک نیە لەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کرداری چاکەکانیان ئەنجامداوە لەوەی کە خواردویانە و خواردویەتیانەوە پێش حەڕامکردنیان].

## بابەت: دەربارەی حوکم و هەڕەشەی توند لەسەر مەشڕوبخۆر (ئارەقخۆر)

٢١٤٠ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الْآخِرَةِ فَلَمْ يُسْقَهَا».(١)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مەشڕوب و (ئارەق و بیرە) بخواتەوە لە دونیادا، دواتر تەوبە نەکات و لێی پەشیمان نەبێتەوە و تەرکی نەکات، ئەوە لێی حەڕام و قەدەغە دەکرێت لە دواڕۆژدا و پێی نادرێت (لەکاتێکدا ئارەقی بەهەشت هەرچی تام و بۆی خۆشە لەخۆی گرتووە و هەرچی خراپی و بێ هۆشیە تیای نیە).

٢١٤١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الدَّيْلَمِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، فِي حَائِطٍ لَهُ بِالطَّائِفِ يُقَالُ لَهُ الْوَهْطُ، فَإِذَا هُوَ مُخَاصِرٌ فَتًى مِنْ قُرَيْشٍ يُزَنُّ ذَلِكَ الْفَتَى بِشُرْبِ الْخَمْرِ، فَقُلْتُ: خِصَالٌ بَلَغَتْنِي عَنْكَ أَنَّكَ تُحَدِّثُ بِهَا عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ: قَالَ، مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ شَرْبَةً لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَلَمَّا أَنْ سَمِعَ الْفَتَى يَذْكُرُ الْخَمْرَ اخْتَلَجَ يَدَهُ مِنْ يَدِ عَبْدِ اللهِ، ثُمَّ وَلَّى، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: اللهُمَّ إِنِّي لَا أُحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَقُولَ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ شَرْبَةً لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللهُ عَلَيْهِ، فَلَا أَدْرِي فِي الثَّالِثَةِ أَمْ فِي الرَّابِعَةِ: كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ رَدْغَةِ الْخَبَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دەیلەمیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) لەناو شوڕەکەی خۆی لە تائیف کە (شوڕەکە) پێی دەوترا وەهط، جا لەو کاتەدا (بینیم) دەستی گەنجێکی قوڕەیشی گرتبوو بەیەکەوە پیاسەیان دەکرد، ئەو گەنجەش بە مەشڕوبخۆر تۆمەتبار بوو، منیش وتم: سیفەتێک هەیە پێم گەیشتووە کە تۆ دەربارەی ئەو سیفەتە دەیگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: هەر کەسێک مەشڕوب و (ئارەق و شتی بێهۆشکەر) بخواتەوە ئەوە هیچ نوێژێکی وەرناگیرێت و قبوڵ نابێت چل ڕۆژان، جا کاتێ گەنجەکە گوێی لێ بوو باسی ئارەق کرا دەستی دەرهێنا لە دەستی عەبدوڵڵا، دواتر پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، عەبدوڵڵاش وتی: ئەی خوایە من ڕێگا نادەم بە کەس کە قسەیەک بکات بەناوی منەوە لەکاتێکدا نەموتبێت (فەرموودەکە ئاوا نیە، بەڵکو زیاترە)، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک مەشڕوب بخواتەوە ئەوە هیچ نوێژێکی وەرناگیرێت و قبوڵ نابێت چل ڕۆژان، جا ئەگەر

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

تەوبەی کرد ئەوە خوا تەوبەکەی وەردەگرێت، جا نازانم لە سێیەم جار یان چوارەم جار (فەرمووی): خوا هەقیەتی لە قوڕ و لیتەی بۆگەن دەرخواردی بدات لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: نەهی کردن لە دانیشتن لەسەر خوان و سفرەیێک کە مەشڕوبی لەسەر بگێڕدرێت

٢١٤٢ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلاَ يَقْعُدْ عَلَى مَائِدَةٍ يُشْرَبُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ».[1]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، با دانەنیشێت لەسەر خوانێک کە مەشڕوبی لەسەر بخورێتەوە.

## بابەت: دەربارەی مەشڕوبخۆری بەردەوام (کەسی مودمین)

٢١٤٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ وَلَدُ زِنْيَةٍ، وَلاَ مَنَّانٌ، وَلاَ عَاقٌّ، وَلاَ مُدْمِنُ خَمْرٍ».[2]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: (چوار جۆرە کەس) ناچێتە بەهەشت: (یەکەمیان): ڕۆڵەی زینا (واتە: ئەو کەسەی بەردەوام بە زینا فێرە و زینا دەکات و تەرکی ناکات، وەک ئەوەی زینا دایکی بێت خۆی لێ جیاواز ناکاتەوە و بۆتە عەبدو ڕۆڵەی زینا)، (دووەمیان): کەسی منەتکار (لەسەر چاکەکانی)، (سێیەمیان): ئازاردەری دایک و باوک، (چوارەمیان): کەسی مودمین و مەشڕوبخۆری بەردەوام (ئەم چوارە ناچنە بەهەشت لەسەرەتاوە، بەڵکو دوای سزای زۆر و سەخت دەچنە بەهەشتەوە).

٢١٤٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَاقٌّ، وَلاَ مَنَّانٌ، وَلاَ مُدْمِنُ خَمْرٍ».[3]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: (سێ جۆرە کەس) ناچێتە بەهەشت: (یەکەمیان): کەسی ئازاردەری دایک و باوک، (دووەمیان): کەسی منەتکار (لەسەر چاکەکانی)، (سێیەمیان): کەسی مودمین و مەشڕوبخۆری بەردەوام (ئەم سێیانە ناچنە بەهەشت لەسەرەتاوە، بەڵکو دوای سزای زۆر و سەخت دەچنە بەهەشتەوە).

---

(١) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: شیفا و چارەسەر لە مەشڕوبدا نیە

٢١٤٥ - «حدثنا سماك قال: سمِعْتُ عَلْقَمَةَ بْنَ وَائِلٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ وَائِلٍ أَنَّ سُوَيْدَ بْنَ طَارِقٍ ﷺ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الْخَمْرِ فَنَهَاهُ عَنْهَا أَنْ يَصْنَعَهَا، فَقَالَ: إِنَّهَا دَوَاءٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّهَا لَيْسَتْ دَوَاءً، وَلَكِنَّهَا دَاءٌ».(١)

واتە: لە سەمماكەوە گێڕدروەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەلقەمەی کوڕی وائیل بوو لە باوکیەوە دەیگێڕایەوە کە سوەیدی کوڕی تاریق ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی مەشڕوب، (پێغەمبەری خواش ﷺ) نەهی لێکرد و لێی قەدەغە کرد دروستی بکات، ئەویش وتی: مەشڕوب دەرمانە (چارەسەرە)، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئەوە دەرمان نیە، بەڵکو دەردە.

## بابەت: خەمر لەچی دروست دەکرا

٢١٤٦ - «عَنْ الأَوْزَاعِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا كَثِيرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ النَّخْلَةِ، وَالْعِنَبِ».(٢)

واتە: لە ئەوزاعیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو کەثیر بوو دەیوت: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەمر لەو دوو دارەیە: خورما و ترێ (واتە: لە بەروبومی ئەم دوو دارە دروست دەکرێت).

## بابەت: ئەوەی وتراوە دەربارەی شتی بێهۆشکەر

٢١٤٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْبِتْعِ، قَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ حَرَامٌ».(٣)

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی بیتع (کە مەشڕوبێک بوو لە هەنگوین و ئاو دروست دەکرا تا دەترشا، ئایا حوکمەکەی چیە؟)، فەرمووی: هەموو خواردنەوەیەک کە بێهۆشکەر بێت حەڕامە.

٢١٤٨ - «عن أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنَا وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: اشْرَبُوا، وَلاَ تَشْرَبُوا مُسْكِرًا، فَإِنَّ كُلَّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ».(٤)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو بوردەی كوڕی ئەبو مووساوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ من و موعاذی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن و فەرمووی: بخۆنەوە (واتە: هەموو خواردنەوەیەک بخۆنەوە)، بەڵام هیچ بێهۆشكەرێک نەخۆنەوە، چونكە هەموو بێهۆشكەرێک حەڕامە.

٢١٤٩ - «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: أَنْهَاكُمْ عَنْ قَلِيلِ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ».[١]

واتە: لە سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: نەهیتان لێ دەكەم دەربارەی كەمێک لەو شتەی زۆریەكەی مرۆڤ بێهۆش دەكات.

(واتە: ئەو مەشڕوب و مەوادانەی ئەگەر كەمێكی بەكاربهێنرێت بێهۆشكەر نەبێت، بەڵام ئەندازەیەكی زۆر بەكاربهێنریت ئنجا مرۆڤ بێهۆش بكات، ئەوە كەمیەكەشی حەڕامە مادەم لە قۆناغێک لە قۆناغەكان یا ئەندازەیێک لە ئەندازەكان بێهۆشكەر بێت).

تێبینی: وشەی نەهی لەم فەرمودانە حەڕام دەگەیەنێت.

٢١٥٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُكْفَأُ - قَالَ زَيْدٌ: يَعْنِي فِي الْإِسْلَامَ - كَمَا يُكْفَأُ الْإِنَاءُ يَعْنِي الْخَمْرَ، فَقِيلَ: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللهِ وَقَدْ بَيَّنَ اللهُ فِيهَا مَا بَيَّنَ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا فَيَسْتَحِلُّونَهَا».[٢]

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: یەكەم شت كە حوكمەكەی هەڵدەگێڕنەوە لە ئیسلامدا وەک چۆن قاپ و مەنجەڵ وەردەگێردرێت (واتە: لە حەڕامیەوە حەڵاڵی دەكەن) بریتیە لە مەشڕوب، جا وترا: چۆن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێكدا خوا زۆر جوان ڕوونكردنەوەی تیاداوە (كە حەڕامە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ناویدەنێن بە جگە لە ناوی خۆی (ناوی دەنێن بیرە وێسكی خواردنەوەی ڕۆحی) و حەڵاڵی دەكەن.

٢١٥١ - «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَوَّلُ دِينِكُمْ نُبُوَّةٌ وَرَحْمَةٌ، ثُمَّ مُلْكٌ وَرَحْمَةٌ، ثُمَّ مُلْكٌ أَعْفَرُ، ثُمَّ مُلْكٌ وَجَبَرُوتٌ يُسْتَحَلُّ فِيهَا الْخَمْرُ وَالْحَرِيرُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: سُئِلَ عَنْ أَعْفَرَ فقال: يُشَبَّهُهُ بالتُّرَابِ ولَيْسَ فِيهِ خَيْرٌ».[٣]

واتە: لە ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕڕاحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەرەتای دین و ئاینەكەتان پێغەمبەرایەتی و ڕەحمەتە، دواتر (دەبێتە) موڵک و دەسەڵات و ڕەحمەت،

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده حسن.

(٣) ـ اسناده منقطع.




دواتر (دەبێتە) موڵک و دەسەڵاتێکی تۆزاوی (واتە: بێ خێر و فەڕ)، دواتر (دەبێتە) موڵک و دەسەڵات و خۆزاڵکردن و ستەم، (لەم قۆناغەدا) مەشڕوب و (لەبەرکردنی) حەریر حەڵاڵ دەکرێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: پرسیاری لێکراوە دەربارەی وشەی (أعفر)ی ناو فەرموودەکە، ئەویش وتویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەسەڵاتەکەی چواندووە بە تۆز (تەشبیهی کردوە بە تۆز) کە هیچ چاکەیەک و سوودێکی تیا نیە.

## بابەت: نەهی کردن لە کڕین و فرۆشتنی مەشڕوب

٢١٥٢ - «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ بَاعَ الْخَمْرَ فَلْيُشَقِّصِ الْخَنَازِيرَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: إِنَّمَا هُوَ عُمَرُ بْنُ بَيَانٍ».[1]

واتە: لە عوروەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک مەشڕوب بفرۆشێت و (فرۆشتنی پێ حەڵاڵ بێت) ئەوە با بەرازیش بفرۆشێت (چونکە حەڕامی فرۆشتنیان وەکو یەکە، یان ئەگەر لەبەر ئەوە ئارەق دەفرۆشێت چونکە پێی حەڵاڵە ئەوە با وەک کافران بەرازیش بفرۆشێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خراپی بابەتەکە بەو جۆرەی فەرمووە).

٢١٥٣ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ وَعْلَةَ، قَالَ سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ بَيْعِ الْخَمْرِ، فَقَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ صَدِيقٌ مِنْ ثَقِيفٍ، أَوْ مِنْ دَوْسٍ فَلَقِيَهُ بِمَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ بِرَاوِيَةٍ مِنْ خَمْرٍ يُهْدِيهَا لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا فُلَانُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ اللهَ تَعَالَى قَدْ حَرَّمَهَا؟ قَالَ: فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ عَلَى غُلَامِهِ فَقَالَ: اذْهَبْ، فَبِعْهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِمَاذَا أَمَرْتَهُ يَا فُلَانُ؟ قَالَ أَمَرْتُهُ بِبَيْعِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا حَرَّمَ بَيْعَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَأُكْفِئَتْ فِي الْبَطْحَاءِ».[2]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی وەعلەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) کرد دەربارەی فرۆشتنی مەشڕوب، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوڕێیەکی لە ثەقیف، یان لە دەوس، هەبوو، جا لە مەککە پێیگەیشت لە ساڵی ئازادکردنی مەککە بەخۆ بە کوپە مەشڕوبێک (هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ) تا بیکاتە دیاری بۆی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی فڵان ئایا نەتزانیوە خوا حەڕامی کردوە؟ (عەبدوڕڕەحمان) دەڵێ: کابراش ڕووی کردە خزمەتکارەکەی و وتی: بڕۆ بیفرۆشە (ئێمە نایخۆینەوە مادەم حەڕام بێت)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەچی فەرمانت پێکرد ئەی فڵان؟ کابرا وتی: فەرمانم پێکرد بیفرۆشێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوەی خواردنەوەی حەڕام کردوە فرۆشتنیشی حەڕام کردوە، جا کابرا فەرمانی کرد و ڕژێنرا بەسەر زەویدا.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

٢١٥٤ـ غير موجود[١].

٢١٥٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ بَلَغَ عُمَرَ ﷺ أَنَّ سَمُرَةَ، بَاعَ خَمْرًا. فَقَالَ: قَاتَلَ اللهُ سَمُرَةَ أَمَا عَلِمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَجَمَلُوهَا فَبَاعُوهَا. قَالَ سُفْيَانُ: جَمَلُوهَا أَذَابُوهَا».[٢]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەبەر بە ئیمامی عومەر ﷺ گەیشت کە سەمورە مەشروبی فرۆشتووە، جا وتی: دەک خوا سەمورە بکوژێت مەگەر نەیزانیوە (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرموویەتی: نەفرەتی خوا لە جولەکەکان بدات بەزیان لەسەر حەڕاسکرا، چوون تاواندیانەوە و فرۆشتیان (واتە: هەر شتێک لە خودی خۆیدا حەڕام بێت کڕین و فرۆشتنیشی حەڕامە، ئەو دوو بابەتەش وەکو یەکن).

سوفیان وتویەتی: (جَمَلُوهَا) واتە: تاواندیانەوە.

## بابەت: سزا دەربارەی مەشڕوبخۆر

٢١٥٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِذَا سَكِرَ فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ يَعْنِي فِي الرَّابِعَةِ».[٣]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر (کەسێک) خۆی بێهۆش کرد ئەوە (چل) شوارکی لێبدەن، دواتر ئەگەر خۆی بێهۆش کردەوە ئەوە (چل) شوارکی لێبدەن، دواتر ئەگەر خۆی بێهۆش کردەوە ئەوە (چل) شوارکی لێبدەن، دواتر ئەگەر خۆی بێهۆش کردەوە و (زانیتان پێی حەڵاڵە بۆیە وازی لێ ناهێنێت، ئەوە کافر بووە) لە گەردەنی بدەن و بیکوژن، واتە: لە جاری چوارەم.

## بابەت: دەربارەی بە گەورە زانینی جەریمەی مەشڕوبخۆر

٢١٥٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ».[٤]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ زیناکارێک نیە کاتێ زینا دەکات بڕوادار بێت، وە هیچ دزێک نیە کاتێ دزی دەکات بڕوادار بێت، وە هیچ (مەشڕوبخۆرێک)

---

(١) ـ سقط في الترقيم.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

مەشڕوب ناخواتەوە لە كاتی مەشڕوب خواردنەوەكەیدا بڕوادار بێت (واتە: لەكاتی ئەنجامدانی ئەم تاوانە گەورانە بڕوا و ئیمان لێی جیادەبێتەوە تا كەسەكە لە تاوانەكە جیادەبێتەوە، بەڵام هەر بڕوادارە، چونكە بە ئەنجامدانی ئەم تاوانانە مرۆڤ كافر نابێت ئەگەر پێی حەڵاڵ نەبێت).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی كراوەتە خۆشاو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

٢١٥٨ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ يُنْبَذُ لِلنَّبِيِّ ﷺ فِي السِّقَاءِ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ سِقَاءٌ نُبِذَ لَهُ فِي تَوْرٍ مِنْ بِرَامٍ».[١]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆشاوی خورما بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست دەكرا لە ناو دێمكە، جا ئەگەر دێمكە نەبووایە ئەوە بۆی دەخرایە ناو لەگەنێكی بەردین.

## بابەت: دەربارەی خۆشاوی ترێ

٢١٥٩- «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الدَّيْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ أَبَاهُ، أَوْ أَنَّ رَجُلاً، مِنْهُمْ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا قَدْ خَرَجْنَا مِنْ حَيْثُ عَلِمْتَ، وَنَزَلْنَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْ مَنْ قَدْ عَلِمْتَ فَمَنْ وَلِيُّنَا؟ قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا كُنَّا أَصْحَابَ كَرْمٍ وَخَمْرٍ، وَإِنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَ الْخَمْرَ. فَمَا نَصْنَعُ بِالْكَرْمِ؟ قَالَ: اصْنَعُوهُ زَبِيبًا. قَالُوا: فَمَا نَصْنَعُ بِالزَّبِيبِ؟ قَالَ: انْقَعُوا فِي الشِّنَانِ انْقَعُوهُ عَلَى غَدَائِكُمْ، وَاشْرَبُوهُ عَلَى عَشَائِكُمْ، وَانْقَعُوهُ عَلَى عَشَائِكُمْ، وَاشْرَبُوهُ عَلَى غَدَائِكُمْ، فَإِنَّهُ إِذَا أَتَى عَلَيْهِ الْعَصْرَانِ كَانَ خَلاً قَبْلَ أَنْ يَكُونَ خَمْرًا».[٢]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دەیلەمیەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە كە باوكی ـ یان پیاوێک لەوان ـ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە شوێنێكین خۆت دەزانی چۆنە، وە لە نێوان خەڵكانێكین خۆت دەزانی چۆنن، جا كێ كاربەدەستی ئێمەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا و پێغەمبەرەكەی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خاوەنی ترێ و مەشڕوبین، وە خوا مەشڕوبی حەرام كردوە، جا چ لە ترێ بكەین؟ فەرمووی: بیكەن بە مێوژ، وتیان: ئەی چی لە مێوژ بكەین؟ فەرمووی: بیكەنە خۆشاو لەناو پێستە لە بەیانیدا و بیخۆنەوە لە ئێوارەدا، وە بیكەنە خۆشاو لە ئێوارەدا و بیخۆنەوە لە بەیانیدا (واتە: ڕۆژانە دروستی بكەن و بیخۆنەوە)، چونكە ئەگەر دوو عەسری بەسەردا تێپەڕ بێت دەبێتە دۆشاو پێش ئەوەی ببێتە خەمر (مەشڕوب).

## بابەت: نەهی كردن لە خۆشاوی ناو گۆزە و ئەوەی دەخرێتە ناویەوە

٢١٦٠ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ حَرَّمَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ. فَلَقِيتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ: صَدَقَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ».[٣]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عومەر کرد دەربارەی خۆشاوی ناو گۆزە، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەڕامی کردوە، جا گەیشتم بە ئیبنو عەبباس و قسەی ئیبنو عومەرم پێ ڕاگەیاند، ئەویش وتی: ئەبو عەبدوڕڕەحمان (واتە: ئیبنو عومەر) ڕاست دەکات.

٢١٦١ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ تَنْتَبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ».[١]

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشاو دروست مەکەن لەناو کولەکەی زەرد و گۆزەی قیرکراو.

٢١٦٢ - «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْحَكَمِ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَوْ سَمِعْتُهُ سُئِلَ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ نَبِيذِ الْجَرِّ وَالدُّبَّاءِ. وَسَأَلْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ فَقَالَ مِثْلَ قَوْلِ ابْنِ عَبَّاسٍ. قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُحَرِّمَ مَا حَرَّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ، أَوْ مَنْ كَانَ مُحَرِّمًا مَا حَرَّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ فَلْيُحَرِّمِ النَّبِيذَ».[٢]

«قَالَ: وَحَدَّثَنِي أَخِي عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْجَرِّ وَالدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ، وَعَنِ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ»

واتە: لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو حەکەم بوو وتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) بوو، یان وتی گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو پرسیاری لێکرا دەربارەی خۆشاوی ناو گۆزە، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خۆشاوی ناو گۆزە و ناو کولەکەی زەرد، (دەڵێ): هەروەها پرسیارم لە زوبەیر کرد: ئەمیش هەمان قسەی ئیبنو عەبباسی کرد، وتی: هەروەها ئیبنو عەبباس وتویەتی: هەر کەسێک دەیەوێ و پێی خۆشە حوکمی خوا جێبەجێ بکات و ئەوە حەڕام بکات کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺحەڕامیان کردوە، یان هەر کەسێک حەڕامکەری ئەو شتەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ حەڕامیان کردوە، ئەوە با خۆشاو حەڕام بکات (واتە: خۆشاو لەناو ئەم جۆرە شتانە حەڕامە و شەرع حەڕامی کردوە).

هەروەها وتویەتی: برام لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە (خۆشاوی ناو) گۆزە و کودی زەرد و (گۆزەی) قیرکراو و، (بەیەکەوە تێکەڵکردنی) کاڕکە خورما لەگەڵ خورمای پێگەیشتوو.

٢١٦٣ - «عَنْ فُضَيْلِ بْنِ زَيْدٍ الرَّقَاشِيِّ، أَنَّهُ أَتَى عَبْدَ اللهِ بْنَ مُغَفَّلٍ ﷺ، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِمَا يَحْرُمُ عَلَيْنَا مِنَ الشَّرَابِ. فَقَالَ: الْخَمْرُ. قُلْتُ: هُوَ فِي الْقُرْآنِ. قَالَ: مَا أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ مُحَمَّدًا ﷺ بَدَأَ بِالِاسْمِ، أَوْ بِالرِّسَالَةِ قَالَ: فَقَالَ: نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ وَالنَّقِيرِ».[٣]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە فوزەیلی کوڕی زەیدی ڕەققاشیەوە گێڕدراوەتەوە کە چۆتە لای عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ و وتویەتی: پێم ڕابگەیەنە ئەوەی لەسەرمان حەرامکراوە لە خواردنەوە، ئەویش وتی: خەمر (مەشرووب)، وتم: ئەوە لە قورئاندا هەیە (دەیزانم)، وتی: هیچت بۆ باس ناکەم تەنها ئەوە نەبێت کە لە موحەممەدم ﷺ گوێ لێ بووە ـ یان ناوی پێغەمبەری ﷺ هێنا یان پێغەمبەرایەتیەکەی ﷺ (واتە: یان وتی: موحەممەد ﷺ، یان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ)، دەڵێ: (عەبدوڵڵا) وتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ) نەهی کردوە لە (خۆشاو دروست کردن لەناو) کولەکەی زەرد و حەنتەم و، نەقیر (حەنتەم: بریتیە لە جۆرە گۆزەیەک، نەقیریش: بریتیە لە قەدی دار کە هەڵیاندەکۆڵی و شتیان دەخستە ناوی).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە دوو تێکەڵە

٢١٦٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ، لاَ تَنْتَبِذُوا الزَّهْوَ وَالرُّطَبَ جَمِيعًا، وَلاَ تَنْتَبِذُوا الزَّبِيبَ، وَالتَّمْرَ جَمِيعًا. وَانْتَبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَتِهِ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: فەریکە خورما و ڕوتاب بەیەکەوە مەکەنە خۆشاو، وە مێوژ و خورماش بەیەکەوە مەکەنە خۆشاو، (بەڵکو) هەر یەکەیان بە تەنها بکەن بە خۆشاو (چونکە ئەگەر دوو شت لەمانە تێکەڵ بکرێن، ئەوە ئەگەری گۆڕان و بوونی بە مەشڕوب خێراترە و ڕەنگە بیخۆنەوە وابزانن نەبۆتە مەشڕوب، کەچی گۆڕاوە و بۆتە مەشڕوب).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لەوەی ناو لە ترێ بنرێت کەڕم

٢١٦٥ - «عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَقُولُوا: الْكَرْمَ. وَقُولُوا: الْعِنَبَ، أَوِ الْحَبَلَةَ».[٢]

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (بە ترێ) مەڵێن کەڕم (چونکە کەڕم لە کەڕەم و سەخاوەت و ڕێزەوە هاتووە، بۆیە ئەو ناوە لە مسوڵمان دەوەشێتەوە نەک لە ترێ کە مەشڕوبی لێ دروست دەکرێت، یان لەبەر ئەوە باش نیە بە ترێ بوترێت کەڕم نەوەکو مەشڕوب بەهۆی ئەو ناوەی ترێ لەلایان خۆشەویست بێت)، بەڵکو بڵێن: عینەب یان حەبەلە.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە تەنها عەرەبەکان دەگرێتەوە بە نسبەت ناوهێنانی ترێ، بەڵام ماناکەی قاعیدە و ڕێسایێکە بۆ گشت مسوڵمانان، قاعیدەکەش ئەوەیە باش وایە ناوە جوانەکان لە شتێک نەنرێت لایەنێکی خراپی بەرچاوی تیا بێت، بەڵکو با ناوە جوانەکان هەموویان بۆ مسوڵمانان بن.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لەوەی مەشرِوب (ئارەق) بکرێتە دۆشاو

٢١٦٦ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ كَانَ فِي حِجْرِ أَبِي طَلْحَةَ يَتَامَى. فَاشْتَرَى لَهُمْ خَمْرًا، فَلَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: أَجْعَلُهُ خَلاً، قَالَ: لاَ فَأَهْرَاقَهُ».[1]

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چەند هەتیوێک (بێ باوکێک) لە ژێر سەرپەرشتی ئەبو تەڵحە بوون و، مەشرِوبی بۆ کڕی بوون، جا کە ئایەتی حەرامکردنی مەشرِوب و ئارەق دابەزی ئەبو تەڵحە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆی باس کرد و وتی: ئایا بیکەم بە دۆشاو؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، بیرِێژە.

## بابەت: دەربارەی چۆنیەتی سوننەتی خواردنەوە؟

٢١٦٧ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا. وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ، فَأَعْطَى الأَعْرَابِيَّ فَضْلَهُ. ثُمَّ قَالَ: الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ».[2]

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە شیری خواردۆتەوە، لەلای چەپەی ئەبوبەکر دانیشتبوو، وە لەلای ڕاستەشی پیاوێکی دەشتەکی دانیشتبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شیرەی مابوویەوە دوای خواردنەوەی خۆی دای بە دەشتەکیەکە، دواتر فەرمووی: لە ڕاستە وە بۆ ڕاستە (شیرەکە بخۆنەوە و لێک وەرگرنەوە).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە خواردنەوە بە دەم و لولەی دۆلکەو سوراحی و... هتد

٢١٦٨ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ».[3]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی خواردنەوە بخورێتەوە لە دەمی دۆلکە و سوراحی و مەتارە و (هەر شتێک کە لولە و دەمی باریکی هەبێت و خواردنەوەی تێبکرێت و ناوەوەیت لێ دیار نەبێت، چونکە ڕەنگە شتێکی زیانبەخشی تێکەوتبێت و ببێتە هۆی نەخۆشی).

٢١٦٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ».[4]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لەوەی خواردنەوە بخورێتەوە لە دەمی دۆلكە و سوڕاحی و مەتارە و (هەر شتێک كە لولە و دەمی باریكی هەبێت و خواردنەوەی تێبكرێت و ناوەوەی دیار نەبێت، چونكە ڕەنگە شتێكی زیانبەخشی تێكەوتبێت و ببێتە هۆی نەخۆشی).

٢١٧٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ».[١]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی كردوە لە خواردنەوە بە دەم و لولەی دێمكە (یان ماناكەی ئەوەیە: نەهی كردوە لە نوشتاندنەوەی دەم و لولەی دێمكە و مەشكەو خواردنەوەیان پێوەی، چونكە پیس دەبن و دەكەونەوە ژوورەوە، هەردوو مانا هاتوون).

## بابەت: دەربارەی خواردنەوە بە سێ نەفەس و (بە سێ جار)

٢١٧١ - «عَنْ ثُمَامَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَ كَانَ أَنَسٌ ﷺ يَتَنَفَّسُ فِي الإِنَاءِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، وَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَتَنَفَّسُ فِي الإِنَاءِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا».[٢]

واتە: لە ثومامەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەنەس دوو جار یان سێ جار هەناسەی دەدا لە كاتی خواردنەوەدا، وە دەیوت هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار یان سێ جار هەناسەی داوە لە كاتی خواردنەوەدا.

## بابەت: ئەو كەسەی بە یەک نەفەس (بە یەک جار) خواردنەوە دەخواتەوە

٢١٧٢ - «عَنْ أَبِي الْمُثَنَّى، قَالَ كُنْتُ عِنْدَ مَرْوَانَ فَجَاءَ أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي لاَ أَرْوَى مِنْ نَفَسٍ وَاحِدٍ. قَالَ: فَأَبِنِ الإِنَاءَ عَنْ فِيكَ ثُمَّ تَنَفَّسْ قَالَ: إِنِّي أَرَى الْقَذَاةَ. قَالَ: أَهْرِقْهُ».[٣]

واتە: لە ئەبو موثەنناوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای مەڕوان بووم، ئەبو سەعیدیش هات و وتی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بە یەک نەفەس و (بە یەک جار ئاو بخۆمەوە) تینوەتیم ناشكێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: دەفر و جامەكە لە دەمت دووربخەرەوە دواتر هەناسە بدە، وتی: من پیسی دەبینم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیڕێژە (ئەوەی دەمێنێتەوە مادەم قێزت لێ دەبێتەوە).

٢١٧٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي أَنَّهُ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ، فَلاَ يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَسْتَنْجِي بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ».[٤]

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ حسن.
(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە دەیفەرموو: کاتێ یەکێک لە ئێوە میزی کرد با بەدەستی ڕاستی دەست نەدات لە عەورەتی، هەروەها با بە دەستی ڕاستیش خۆی پاک نەکاتەوە و (تارەت نەکات)، هەروەها با نەفەس و هەناسە نەدات لەناو دەفر و جام و پەرداغ.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی بە دەستەکانی ڕاستەوخۆ ئاو لە ڕووبار دەخواتەوە

٢١٧٤ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يَعُودُهُ وَجَدْوَلٌ يَجْرِي. فَقَالَ: إِنْ كَانَ عِنْدَكُمْ مَاءٌ بَاتَ فِي الشَّنِّ وَإِلاَّ كَرَعْنَا».[١]

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای پیاوێک لە ئەنصاریەکان و لەبەر نەخۆشی سەردانی کرد، ڕووبارێکی بچکۆلەش ئاوی پێدا دەڕۆیشت (لەلای ماڵەکەیان)، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئاوتان لەلایە لەناو تەشتێک (ئەوە با بیخۆینەوە)، ئەگەرنا ڕاستەوخۆ لە ڕووبارەکە دەیخۆینەوە.

## بابەت: دەربارەی خواردنەوە بە پێوە

٢١٧٥ - «عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ مِنْ فَمِ قِرْبَةٍ قَائِمًا».[٢]

واتە: لە ئوممو سولەیمەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە دەم و دەرچەی دێمکەی خواردەوە بە پێوە.

٢١٧٦ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنَّا نَشْرَبُ وَنَحْنُ قِيَامٌ وَنَأْكُلُ، وَنَحْنُ نَسْعَى عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە (خواردنەوەمان) دەخواردەوە لەکاتێکدا بە پێوە بووین، وە (خواردنمان) دەخوارد لەکاتێکدا ڕامان دەکرد، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

٢١٧٧ - «أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، نَحْوَهُ».[٤]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣)ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: ئەوانەی خواردنەوەیان بە پێوە لا پەسەند نەبووە

٢١٧٨ - «عَنْ أَنَسٍ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الشُّرْبِ قَائِمًا قَالَ: وَسَأَلْتُهُ عَنِ الأَكْلِ. قَالَ: ذَاكَ أَخْبَثُ».(١)

واتە: لە ئەنەسەوە  گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە خواردنەوە بە پێوە، دەڵێ: هەروەها پرسیارم لێکرد دەربارەی خواردن بە پێوە، فەرمووی: ئەوە هەر خراپ و پیسترە.

٢١٧٩ - «عَنْ أَبِي زِيَادٍ الطَّحَّانِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لِرَجُلٍ رَآهُ يَشْرَبُ قَائِمًا قِئْ قَالَ: لِمَ. قَالَ: أَتُحِبُّ أَنْ تَشْرَبَ مَعَ الْهِرِّ قَالَ: لاَ. قَالَ: فَقَدْ شَرِبَ مَعَكَ شَرٌّ مِنْهُ الشَّيْطَانُ».(٢)

واتە: لە ئەبو زیادی تەححانەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو  لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕایەوە کە بە پیاوێکی فەرموو: خۆت بڕشێنەوە، کاتێ بینی بە پێوە دەخواتەوە، پیاوەکە وتی: بۆچی؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: پێت خۆشە لەگەڵ پشیلە ئاو بخۆیتەوە؟ پیاوەکە وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دە بزانە لە پشیلە خراپتر لەگەڵی خواردیتەوە، کە شەیتانە.

تێبینی: ئاو خواردنەوە بە پێوە مەکرِوهە بە کەڕاهەتی تەنزیهی، واتە وازی لێ بهێنرێت چاکترە، کەواتە خواردنەوە بە پێوە حەڕام نیە و گوناهی تیا نیە.

## بابەت: خواردنەوە لە کەلوپەلی زیو

٢١٨٠ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ مِنْ فِضَّةٍ فَإِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ».(٣)

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە دەفری زیو دەخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخی کردۆتە سکی خۆی.

٢١٨١ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ حُذَيْفَةَ إِلَى الْمَدَائِنِ فَاسْتَسْقَى فَأَتَاهُ دِهْقَانٌ بِإِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ فَرَمَى بِهِ وَجْهَهُ، فَقُلْنَا اسْكُتُوا فَإِنَّا إِنْ سَأَلْنَاهُ لَمْ يُحَدِّثْنَا، فَلَمَّا كَانَ بَعْدُ. قَالَ: أَتدْرُونَ لِمَ رَمَيْتُهُ؟ قُلْنَا: لاَ. قَالَ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُهُ. وَذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ: أَنَّهُ نَهَى عَنِ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ وَقَالَ: هُمَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ».(٤)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ حوذەیفە دەرچووین بۆ مەدائین، جا (حوذەیفە) داوای ئاوی کرد و سەرۆکی گوندێک (یان تاجیرێک) ئاوی لە دەفرێکی زیو بۆ هێنا، حوذەیفەش دەفرەکەی ڕاوەشاند بۆ ڕوخساری، ئێمەش وتمان: بێ دەنگ بن (هەرا پەیا نەکەن)، چونکە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەین قسەمان بۆ ناکەن (ئێمەش پێویستمان پێیانە)، جا دواتر (پاش ماوەیەک) حوذەیفە وتی: دەزانن بۆ دەفرەکەم بۆ ڕاوەشاند؟ وتمان: نەخێر (نازانین)، وتی: من بە خراپی دەزانم، وە باسی پێغەمبەری ﷺ کرد، وتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ) نەهی کردوە لە خواردنەوە لە دەفری زێڕ و زیو و، لە پۆشینی حەریر (بە گشتی) و دیباج (بە تایبەتی، کە ئەویش جۆرێکی باشی حەریرە)، وە فەرمووی: ئەم دووانە: (واتە: خواردنەوە لە زێڕ و زیو و، پۆشینی حەریر) بۆ کافرانە لە دونیا و، بۆ ئێوەیە لە دواڕۆژ.

## بابەت: دەربارەی داپۆشینی دەفر و مەنجەڵ

٢١٨٢ - «حَدَّثَنِي أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِلَبَنٍ. فَقَالَ: أَلاَ خَمَّرْتَهُ وَلَوْ تَعْرِضُ عَلَيْهِ عُودًا».[١]

واتە: لە ئەبو حومەیدی ساعیدیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەندێک شیرم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ برد، ئەویش فەرمووی: بۆ داتنەپۆشیوە ئەگەرچی پەلە دارێکیش بێت لەسەرت دانابا.

٢١٨٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِتَغْطِيَةِ الْوَضُوءِ وَإِيكَاءِ السِّقَاءِ وَإِكْفَاءِ الْإِنَاءِ».[٢]

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە داپۆشینی ئاوی دەستنوێژ و قایم کردنی پەتی دێمکە و مەشکە و نخون کردنەوەی قاپ و قاچاغ (تاوەکو هیچ شتێکی زیان بەخش نەکەوێتە ناویانەوە).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فوو کردن لە خواردنەوە

٢١٨٤ - «عَنْ أَبِي الْمُثَنَّى الْجُهَنِيِّ، قَالَ: قَالَ مَرْوَانُ لِأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَنْهَى عَنِ النَّفْخِ فِي الشَّرَابِ؟ قَالَ: نَعم».[٣]

واتە: لە موثەننای جوهەنیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مەڕوان بە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ وت: ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە نەهی کردبێت لە فوو کردنە ناو خواردنەوە؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسن.

**٢١٨٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ النَّفْخِ فِي الشَّرَابِ».[١]**

**واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە فوو کردنە ناو خواردنەوە.**

## بابەت: ئاوگێڕی خەڵک و مەجلیس کۆتا کەسیانە لە خواردنەوە

**٢١٨٦ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: سَاقِي الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا».[٢]**

**واتە: لە ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاوگێڕی خەڵکەکە کۆتا کەسیانە لە خواردنەوە.**

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی فەرمایشتی خوا: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴿٦٤﴾ ﴾ یونس.

٢١٨٧ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ، قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ قَوْلُ اللهِ لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا. قَالَ: سَأَلْتَنِي عَنْ شَيْءٍ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ قَبْلَكَ، أَوْ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي. قَالَ: هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ».[١]

واتە: لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی خوا (كە دەفەرموێت): ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴿٦٤﴾ ﴾، واتە: [بڕواداران موژدەی خۆشیان بۆ هەیە لە دونیادا...] (واتای چیە)؟ فەرمووی پرسیارت دەربارەی شتێک لێكردم كە كەس پێشتر پرسیاری دەربارە نەكردوە ـ یان كەس لە ئوممەتەكەم پێشتر پرسیاری دەربارە نەكردوە ـ فەرمووی: مەبەست پێی خەونی چاک و ڕاستە، كە مسوڵمان دەیبینێت یان پێوەی دەبینرێت.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی خەونی مسوڵمان بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی

٢١٨٨ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ».[٢]

واتە: لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە  گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە، كە فەرموویەتی: خەونی مسوڵمان بەشێكە لە چل و شەش بەشی (وەحیی) پێغەمبەرایەتی.

## بابەت: پێغەمبەرایەتی ڕۆیشت و نەما، موژدە خۆشەكان ماون[٣]

٢١٨٩ - «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: ذَهَبَتِ النُّبُوَّةُ وَبَقِيَتِ الْمُبَشِّرَاتُ».[٤]

واتە: لە ئوممی كوڕزی كەعبیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پێغەمبەرایەتی ڕۆیشت و نەما، موژدە خۆشەكان ماون (واتە خەونە ڕاستەكان ماون كە جۆرێكە لە وەحی ئیلاهی بۆ بەندەكان).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ واتە: خەونە ڕاستەكان ماون.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی بینینی پێغەمبەری خوا لەخەودا

٢١٩٠ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي. فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ مِثْلِي».(١)

واتە: لە عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە خەودا من ببینێت ئەوە منی بینیوە (بە هەقیقەتی خۆم)، چونکە شەیتان خۆی ناهێنێتە سەر شێوازی من (ناتوانێت وابکات) (٢).

٢١٩١ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ».(٣)

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە خەودا من ببینێت، ئەوە خەونێکی ڕاستی بینیوە (وە ئەوەی ڕوویداوە لە خەونەکە دێتەجێ).

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی خەونێک دەبینێت پێی ناخۆش دەبێت

٢١٩٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ. وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ. فَإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ حُلْمًا يَخَافُهُ، فَلْيَبْصُقْ عَنْ شِمَالِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ».(٤)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەونی چاک و باش لە خواوەیە، وە خەونی ناخۆش و خراپ لە شەیتانەوەیە، جا کاتێ کەسێک لە ئێوە خەونێکی ناخۆش و خراپی بینی، ئەوە با سێ جار خوزی (تف) بکات بە لای چەپی و پەنا بەخوا بگرێت لە شەیتان، جا خەونەکە زیانی پێ ناگەیەنێ.

٢١٩٣- «عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، يَقُولُ: إِنْ كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِأَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: وَأَنَا إِنْ كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلْيَحْمَدِ اللهَ، وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ، وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُه فَلْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثًا وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا، وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ».(٥)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ تێبینی: واتە: هەر کەسێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا ببینێت ئەوە ئەوی بینیوەو ئەو بە ڕاستەقینە هاتۆتە خەونی و، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگای لەخەونەکەی ئەو هەیە، چونکە بەیەك گەیشتنەکەی نێوانیان حەقیقیە.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدی ڕەبیهی کوڕی سەعدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان بوو ﷺ دەیوت: جاری وا هەبوو خەونم دەبینی نەخۆشی دەخستم (لە ترسان دەکەوتمە ناو جێگا)، جا ئەوەم باس کرد بۆ ئەبو قەتادە ﷺ، (ئەویش) وتی: منیش جاری وا هەبوو خەونم دەبینی نەخۆشی دەخستم، تا ئەو کاتەی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەونی چاک لە خواوەیە، جا کاتێ یەکێک لە ئێوە خەونێکی بینی کە پێی خۆش بوو، ئەوە با سوپاسی خوا بکات و، بۆ کەسی نەگێڕێتەوە جگە لەو کەسەی خۆشی دەوێت، وە کاتێ خەونێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو، ئەوە با سێ جار خوزی (تف) بکاتە لای چەپی و پەنا بەخوا بگرێت لە خەونەکە و بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، جا زیانی پێ ناگەیەنێت.

تێبینی: تف کردن و خوزی هاویشتنەکە بە شێوەی پڕوشکی زۆر ورد دەبێت، نەوەک بچێت تفێکی بەقەد کولێرەیەک فڕێ بدات، خەڵک و شتی دەوروبەری خەڵتانی لافاو بکات.

## بابەت: خەون سێ جۆرە

٢١٩٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الرُّؤْيَا ثَلاَثٌ، فَالرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ بُشْرَى مِنَ اللهِ، وَالرُّؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَالرُّؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ بِهِ الْإِنْسَانُ نَفْسَهُ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُهُ، فَلاَ يُحَدِّثْ بِهِ وَلْيَقُمْ وَلْيُصَلِّ».(١)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەون سێ جۆرە: جا ئەوەیان کە خەونی چاکە، ئەوە موژدەیە لەلایەن خواوە، وە خەونیش هەیە خەمبارکەرە لەلایەن شەیتانەوەیە، وە خەونیش هەیە لە خەیاڵ و نەفس و قسەکردنی ڕۆژ لەگەڵ خۆی سەرچاوەی گرتووە، جا کاتێ یەکێک لە ئێوە خەونێکی بینی پێی ناخۆش بوو، ئەوە با نەیگێڕێتەوە و، هەڵسێت و نوێژ بکات.

## بابەت: ڕاسترینی خەڵکی لە ڕووی خەو بینینەوە، ڕاستگۆترینیانە

٢١٩٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ، لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُهُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُهُمْ حَدِيثًا».(٢)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ زەمان نزیک بوویەوە (واتە: کاتێ کاتی قیامەت نزیک بوویەوە، یان کاتێ شەو و ڕۆژ ماوەکەیان وەکو یەکی لێهات، کە لە کاتی بەهاراندا ڕوودەدات)، ئەوە نزیکە هیچ خەونێکی مرۆڤی بڕوادار ناڕاست دەرنەچێ (واتە: زۆربەی هەرە زۆری ڕاست دەردەچێت)، وە ڕاسترینیان لە ڕووی خەونەوە ڕاستگۆترینیانە لە قسە و گوفتاردا.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی مرۆڤ خەون دروست بکات و بە درۆ بیگێڕێتەوە لەکاتێکدا نەیبینیبێ

٢١٩٦- «عَنْ عَلِيّ ﷺ، يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مَنْ كَذَبَ فِي حُلْمِهِ، كُلِّفَ عَقْدَ شَعِيرَتَيْنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[١]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ لە خەون گێڕانەوەیدا بکات، ئەوە لە ڕۆژی دوایی داوای لێ دەکرێت دوو دەنکە جۆ لە یەکتری گرێ بدات (ئنجا سزای لەسەر لادەبەن).

تێبینی: مەحاڵە ڕزگاری ببێت، چونکە کارەکەی پێ ئەنجام نادرێت و دەبێ سزاکەی بچێژێت.

## بابەت: ڕاسترین خەون لە کاتی سەحەرە

٢١٩٧ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَصْدَقُ الرُّؤْيَا بِالأَسْحَارِ».[٢]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕاسترین خەون لە کاتی سەحەرە (واتە: کەمێک پێش نوێژی بەیانی).

## بابەت: مەکروهی ئەوەی مرۆڤ خەون بگێڕێتەوە بۆ هەر کەسێکی جگە لە زانا و چاکەخواز

٢١٩٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَقُصُّوا الرُّؤْيَا إِلاَّ عَلَى عَالِمٍ أَوْ نَاصِحٍ».[٣]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە هەموو جار دەیفەرموو: خەون مەگێڕنەوە تەنها بۆ کەسی زانا و چاکەویست و چاکەخواز نەبێت.

## بابەت: (ڕووداوەکانی) خەون نایێنەجێ ئەگەر خەونەکە لێک نەدرابێتەوە

٢١٩٩ - «عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الرُّؤْيَا هِيَ عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ، مَا لَمْ يُحَدَّثْ بِهَا، فَإِذَا حُدِّثَ بِهَا وَقَعَتْ».[٤]

---

(١) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو ڕەزینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: خەون بە قاچی تەیرەوەیە (واتە: چۆن قاچی تەیر ئۆقرەی نیە و لە جووڵە ناکەوێ و هەموو کات لە جوڵەدایە، ئاوا بەو شێوەیەش خەون جێگیر نابێت و ڕوونادات) مادەم نەگێڕدرێتەوە، جا کاتێ گێڕدرایەوە ڕودەدات.

## بابەت: دەربارەی بینینی خوای بەرز لە خەودا

٢٢٠٠ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ اللَّجْلاَجِ، وَسَأَلَهُ، مَكْحُولٌ أَنْ يُحَدِّثَهُ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَائِشٍ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلاَ الأَعْلَى؟ فَقُلْتُ: أَنْتَ أَعْلَمُ يَا رَبِّ، قَالَ: فَوَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَتَلاَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥﴾ الأنعام».[1]

واتە: لە خالیدی کوڕی لەجلاجەوە گێڕدراوەتەوە، لە کاتێکدا مەکحول داوای لێکرد کە فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە، ئەویش وتی: گوێم لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عائیش بوو ﷺ دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پەروەردگارم بینی بە جوانترین شێوە و (پرسیاری لێ کردم) و فەرمووی: فریشتەکانی ئاسمان دەربارەی چی مناقەشەیانە؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەفەرموێ: وتم: تۆ زاناتری پەروەردگارا، دەفەرموێ: پەروەردگار دەستی (کەرەم و نیعمەت و منەتی) لە نێوان دوو شانەکانم دانا و هەستم بە ساردیەکەی کرد لە نێوان مەمکەکانم (لە سینگم)، جا ئەوەی لە ئاسمان و زەوی هەیە زانیم و فێری بووم، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥﴾ الأنعام، واتە: بەو شێوەیە دەسەڵات و مەلەکوتی ئاسمان و زەویمان نیشانی ئیبراهیمدا ﷺ بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێنێت و لە ڕیزی دڵنیاکاندا بێت.

٢٢٠١ - «عَنْ ابْنِ سِيرِينَ، قَالَ: مَنْ رَأَى رَبَّهُ فِي الْمَنَامِ دَخَلَ الْجَنَّةَ».[2]

واتە: لە ئیبنو سیرینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک خوای پەروەردگار لە خەودا ببینێ دەچێتە بەهەشت.

## بابەت: دەربارەی (تەعبیری): کراس و، بیر و، شیر و، هەنگوین و، ڕۆن و، مانگ و، جگە لەمانەش، لە خەودا

٢٢٠٢ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ، فَقَالَ: مَنْ حَوْلَهُ، فَمَاذَا تَأَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الدِّينَ».[3]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف.

(٣) ـ اسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لەکاتێکدا من خەوتبووم، (لە خەودا) خەڵکیم بینی پێم نیشان دەدران و کراسیان لەبەردابوو، قەمیسی هەندێکیان دەگەیشتە مەمکەکانیان، قەمیسی هەندێکیتریش دەگەیشتە لەوە کەمتر، وە عومەری کوڕی خەتتابم پێ نیشاندرا و کراسێکی لەبەر بوو لەدوو خۆی ڕادەکێشا (ئەوەندە درێژ بوو)، جا ئەوانەی لە دەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون وتیان: ئەوەت بەچی لێکداوەتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئاین (واتە: ئیمامی عومەر دینداری لە هەموو خەڵکەکە زیاتر بووە).

٢٢٠٣ - «أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ وَمَا لِي مَبِيتٌ إِلاَّ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَصْبَحَ يَأْتُونَهُ فَيَقُصُّونَ عَلَيْهِ الرُّؤْيَا، قَالَ: فَقُلْتُ: مَا لِي لاَ أَرَى شَيْئًا، فَرَأَيْتُ كَأَنَّ النَّاسَ يُحْشَرُونَ، فَيُرْمَى بِهِمْ عَلَى أَرْجُلِهِمْ فِي رَكِيٍّ، فَأُخِذْتُ، فَلَمَّا دَنَا إِلَى الْبِئْرِ، قَالَ رَجُلٌ: خُذُوا بِهِ ذَاتَ الْيَمِينِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظْتُ هَمَّتْنِي رُؤْيَايَ، وَأَشْفَقْتُ مِنْهَا، فَسَأَلْتُ حَفْصَةَ عَنْهَا؟ فَقَالَتْ: نِعْمَ مَا رَأَيْتَ، فَقُلْتُ لَهَا: سَلِي النَّبِيَّ ﷺ ، فَسَأَلَتْهُ؟ فَقَالَ: نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ».(١)

واتە: ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی: من لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بووم، هیچ جێگای مانەوەی شەوانیشم نەبوو تەنها مانەوە نەبێت لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ کە بەیانی دەکردەوە (خەڵک) دەهاتن بۆ لای و خەونیان بۆ دەگێڕایەوە، دەڵێ: منیش وتم: ئەوە بۆچی من هیچ خەونێک نابینم؟ جا (دوای ئەوە خەونم بینی)، بینیم وەک ئەوەی بڵێی خەڵک حەشرو حیساب دەکران، جا فڕێ دەدرانە ناو بیرەوە بەسەر پێکانیانەوە، منیش بردرام، جا کە نزیک بوویەوە لە بیرەکە پیاوێک وتی: بیبەن بۆ لای ڕاستە (واتە: ئەو مەخەنە ناو بیرەکە)، جا کاتێ بەخەبەر هاتم خەونەکەم سەرقاڵی کردم و لێی ترسام، بۆیە پرسیارم لە حەفصە کرد دەربارەی خەونەکە، ئەویش وتی: ئەوەی بینیوتە چاک و باشە (خراپ نیە)، منیش پێم وت: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، ئەویش پرسیاری لێکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: عەبدوڵلا چاکترین پیاوە ئەگەر شەونوێژ بکات.

٢٢٠٤ - «قَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: وَكُنْتُ إِذَا نِمْتُ لَمْ أَقُمْ حَتَّى أُصْبِحَ، قَالَ نَافِعٌ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي اللَّيْلَ».(٢)

واتە: ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی (پێشتر پێشی ئەم خەونە ببینم) کاتێ دەنوستم شەونوێژم نەدەکرد و هەڵنەدەستام تاوەکو بەیانی، نافیعی (خزمەتکاری ئیبنو عومەر) وتویەتی: ئیبنو عومەر شەونوێژی دەکرد (واتە: دوای ئەو خەونە دەستی پێ کردوە و وازی لێ نەهێناوە).

---

(١) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.




٢٢٠٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أُتِيتُ بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ فِي ظُفْرِي، أَوْ قَالَ: فِي أَظْفَارِي، ثُمَّ نَاوَلْتُ فَضْلَهُ عُمَرَ ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَوَّلْتَهُ، قَالَ: الْعِلْمَ».[١]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: لەكاتێكدا من خەوتبووم (خەونم بینی) لە خەوەكەمدا پەرداغێك شیرم بۆ هێنرا و منیش لێم خواردەوە تاوەكو شوێنەواری تێر شیریەكەم بینی لە نینۆكم ـ یان فەرمووی لە نینۆكەكانم ـ دواتر زێدەی پاشماوەكەم دا بە عومەر ﷺ، (هاوەڵانیش) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەچی لێكت داوەتەوە؟ فەرمووی: زانست.

٢٢٠٦ - «حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ قَيْسٍ حَدَّثَنِي بَعْضُ، أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اللَّبَنُ الْفِطْرَةُ، وَالسَّفِينَةُ نَجَاةٌ، وَالْجَمَلُ حُزْنٌ، وَالْخُضْرَةُ الْجَنَّةُ، وَالْمَرْأَةُ خَيْرٌ».[٢]

واتە: لە موحەممەدی كوڕی قەیسەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەندێك (یان یەكێك) لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆی گێرامەوە كە فەرموویەتی: شیر فیترەت و خواڕسكی چاكە، كەشتیش ڕزگاریە، وشتریش غەم و پەژارەیە، سەوزاییش بەهەشتە، ئافرەتیش سود و شتی باشە.

٢٢٠٧ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ مِمَّا يَقُولُ لِأَصْحَابِهِ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ رُؤْيَا فَلْيَقُصَّهَا عَلَيَّ، فَأَعْبُرَهَا لَهُ» قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ رَأَيْتُ ظُلَّةً بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ تَنْطِفُ عَسَلاً، وَسَمْنًا، وَرَأَيْتُ سَبَبًا وَاصِلاً مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ، وَرَأَيْتُ أُنَاسًا يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا، فَمُسْتَكْثِرٌ، وَمُسْتَقِلٌّ، فَأَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ، فَأَعْلاَكَ اللهُ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ الَّذِي بَعْدَكَ فَعَلاَ، فَأَعْلاَهُ اللهُ ثُمَّ أَخَذَهُ الَّذِي بَعْدَهُ فَعَلاَ، فَأَعْلاَهُ اللهُ ثُمَّ أَخَذَهُ الَّذِي بَعْدَهُ فَقُطِعَ بِهِ، ثُمَّ وُصِلَ فَاتَّصَلَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي فَأَعْبُرَهَا، فَقَالَ: اعْبُرْهَا وَكَانَ أَعْبَرَ النَّاسِ لِلرُّؤْيَا بَعْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَالإِسْلاَمُ، وَأَمَّا الْعَسَلُ وَالسَّمْنُ فَالْقُرْآنُ، حَلاَوَةُ الْعَسَلِ، وَلِينُ السَّمْنِ، وَأَمَّا الَّذِينَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهُ فَمُسْتَكْثِرٌ، وَمُسْتَقِلٌّ فَهُمْ حَمَلَةُ الْقُرْآنِ، وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِي أَنْتَ عَلَيْهِ، تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللهُ بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُوَ بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ، ثُمَّ يَوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ، فَأَخْبِرْنِي يَا رَسُولَ اللهِ - بِأَبِي أَنْتَ أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتَ، فَقَالَ: أَصَبْتَ وَأَخْطَأْتَ، فَقَالَ: فَمَا الَّذِي أَصَبْتُ؟ وَمَا الَّذِي أَخْطَأْتُ؟ فَأَبَى أَنْ يُخْبِرَهُ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەكێك لەو قسانەی بە هاوەڵانی دەفەرموو (ئەوەبوو دەیفەرموو): هەر كەسێك لە ئێوە خەونێكی بینی با بۆم بگێڕێتەوە تا

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ اسناده ضعیف.

(٣) ـ صحیح.

بۆی لێکبدەمەوە و بۆی مانا بکەم، (ئیبنو عەبباس) دەڵێ: جا پیاوێک هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەورێکم بینی لە نێوان ئاسمان و زەویدا هەنگوین و ڕۆنی دەباراند، وە پەتێکم بینی لە ئاسمانەوە بۆ زەوی هاتبوو، وە خەڵکانێکم بینی بە دەستەکانیان پەتەکەیان دەگرت، جا هەبوو زۆری دەگرت هەشبوو کەمی دەگرت، تۆش (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) پەتەکەت گرت و بەرز بویتەوە، خوا بەرزی کردیتەوە، دواتر ئەو کەسەی دوای تۆ گرتی و بەرزبویەوە، خوا بەرزی کردەوە، دواتر ئەوەی دەستی پێگرتبوو، پەیوەست کرا و بەرزبویەوە، خوا بەرزی کردەوە، دواتر ئەو کەسەی دوای ئەو گرتی و بەهۆیەوە پچڕێنرا، دواتر لکێنرایەوە و یەکتری گرتەوە، جا ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتم بدە تا لێکی بدەمەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لێکی بدەرەوە، جا (ئەبوبەکر) خەونزانترین کەس بوو دوا پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: هەرچی هەورەکەیە ئەوە ئیسلامە، وە هەرچی هەنگوین و ڕۆنەکەشە ئەوە قورئانە: شیرناتی هەنگوین و نەرمایەتی ڕۆنی هەیە، وە ئەوانەی دەستیان پێوە دەگرت، جا هەندێک زۆر و هەندێک کەم ئەمانە هەڵگرانی قورئانن، وە هەرچی پەتە گەیەنەرەکەیە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، ئەوە ئەو هەقەیە کە تۆ لەسەری، دەستی پێوە دەگریت و خوا بەهۆیەوە بەرزت دەکاتەوە، دواتر پیاوێک دوای (وەفاتی) تۆ دەستی پێوە دەگرێت و بەهۆیەوە بەرز دەبێتەوە، دواتر کەسێکی تر دەستی پێوە دەگرێت و بەهۆیەوە دەپچڕێت، دواتر بۆی پەیوەند دەکرێتەوە و بەهۆیەوە بەرز دەکرێتەوە، جا (ئەبوبەکر) وتی: بە دایک و باوکەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ ڕاستم کرد و پێکام یان هەڵەم کرد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاستت کرد و پێکات هەم هەڵەشت کرد، ئەبوبەکریش وتی: چیم ڕاست کرد و پێکام، وە لە چیش هەڵەم کرد؟ جا پێغەمبەری خوا ڕەتی کردەوە پێی ڕابگەیەنێت.

٢٢٠٨ - «عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، فَقَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ شَمْسًا أَوْ قَمَرًا، شَكَّ أَبُو جَعْفَرٍ فِي الأَرْضِ، تُرْفَعُ إِلَى السَّمَاءِ بِأَشْطَانٍ شِدَادٍ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: ذَاكَ وَفَاةُ ابْنِ أَخِيكَ، يَعْنِي رَسُولَ اللهِ ﷺ نَفْسَهُ».(١)

واتە: لە عەبباسی کوڕی عەبدول موتەڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە خەودا بینیم وەک بڵێی خۆر (ڕۆژ) یان مانگ ـ ئەبو جەعفەر گومانی لە یەکێک لەو دوو وشانە هەیە ـ لە زەویەوە بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە بە پەتی قایم، جا ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە وەفات و مردنی کوڕی براتە، واتە: خودی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢٢٠٩ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هَذِهِ أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا، فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ أُخْرَى فَعَادَ كَأَحْسَنِ مَا كَانَ، فَإِذَا هُوَ مَا جَاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ، وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا أَيْضًا بَقَرًا، وَاللهِ خَيْرٌ، فَإِذَا هُوَ النَّفَرُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ مَا جَاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ، وَثَوَابِ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا بَعْدَ يَوْمِ بَدْرٍ».(٢)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو مووساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: من لەم خەونەمدا بینیم شمشێری (ذیل فیقارم) لەراندەوە و جوڵاندم و (ویستم لە کالانەکەی دەربێنم) سەرەکەی پارچە بوو، جا (مانای پارچە بوونەکە لە خەونەکەدا) بریتی بوو لەو شتەی کە توشی بڕواداران بوو لە شەڕی ئوحود، دواتر جارێکی تر شمشێرەکەم لەراندەوە و (دەرهەم هێنا لە کاڵانەکەی) جا چاک بویەوە و وەک جارانی لێهاتەوە بەڵکو چاکتریش بوو، جا (ماناکەی) بریتی بوو لەو فەتح و سەرکەوتنەی کە خوا هێنای (بۆ بڕواداران، لە ئازادکردنی مەککە) و کۆبوونەوە و یەکگرتنی بڕواداران، وە لە خەونەکەمدا مانگاشم بینی (سەر بڕا)، جا پاداشتی خوا چاکترە (بۆ شەهیدەکان) و، مانای مانگا سەر بڕینەکەش بریتی بوو لەو کەسە بڕوادارانەی کە شەهید بوون لە جەنگی ئوحود، جا ئەو چاکە و خێرەی (بینیم لە خەونەکەم) ئەوە بوو کە خوا هێنای لە چاکە و پاداشتی ڕاستگۆیی بڕواداران کە پێی بەخشین دوای جەنگی بەدر.

٢٢١٠ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ كَأَنِّي فِي دِرْعٍ حَصِينَةٍ، وَرَأَيْتُ بَقَرًا يُنْحَرُ، فَأَوَّلْتُ أَنَّ الدِّرْعَ الْمَدِينَةُ، وَأَنَّ الْبَقَرَ نَفَرٌ، وَاللهِ خَيْرٌ، وَلَوْ أَقَمْنَا بِالْمَدِينَةِ، فَإِذَا دَخَلُوا عَلَيْنَا قَاتَلْنَاهُمْ فَقَالُوا: وَاللهِ مَا دُخِلَتْ عَلَيْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، أَفَتُدْخَلُ عَلَيْنَا فِي الْإِسْلَامِ، قَالَ: فَشَأْنَكُمْ إِذًا وَقَالَتْ: الْأَنْصَارُ بَعْضُهَا لِبَعْضٍ رَدَدْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ رَأْيَهُ فَجَاءُوا، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ شَأْنَكَ، فَقَالَ: الْآنَ إِنَّهُ لَيْسَ لِنَبِيٍّ إِذَا لَبِسَ لَأْمَتَهُ أَنْ يَضَعَهَا حَتَّى يُقَاتِلَ».[1]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەخەونمدا بینیم وەک بڵێی درعێک و زرێپۆشێکی بەهێزم لەبەر بوو، وە مانگایێکیشم بینی سەردەبڕا، جا (خەونەکەم وا لێکدایەوە) درعەکە مەدینە بێت و، مانگاکەش ئەو کەسانە بن شەهید بوون، سوێند بە خوا ئەوە چاکە بوو، (جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی): ئەگەر لە مەدینە بمێنینەوە (چاکترە)، جا ئەگەر هاتنە سەرمان شەڕیان لەگەڵ دەکەین، جا (خەڵکی مەدینە) وتیان: سوێند بەخوا لە سەردەمی نەزانیدا نەهاتونەتە سەرمان و نەیانتوانیوە، جا ئایا لە سەردەمی ئیسلامەتی بێنە سەرمان؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: کەواتە بە کەیفی خۆتان بن (مادەم پێتان باشە بۆیان دەچینە دەرەوە)، جا هەندێک لە ئەنصارییەکان بە هەندێکیتریان وت: دوو دڵیمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کرد لە بۆچونەکەیدا (کارێکی باشمان نەکرد)، جا هاتن و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەیفی خۆت بە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: تازە؟ بۆ هیچ پێغەمبەرێک نیە کاتێ خۆی چەکدار کرد چەکەکەی دابنێت تاوەکو دەجەنگێت.

٢٢١١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: أَكْرَهُ الْغُلَّ، وَأُحِبُّ الْقَيْدَ، الْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ».[2]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە دەیفەرموو: تەوقی مل (واتە: گەردەنبەندم) پێ چاک نیە (لە تەعبیری خەوندا)، کۆت و کەلەمچەم پێ چاکە، کۆت و کەلەمچە ئەبات و ڕاگیراویە لە ئایندا (تەعبیرەکەی ئاوایە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.
(٢) ـ صحيح.

٢٢١٢ - «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الشَّعْرِ، تَفِلَةً، أُخْرِجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ فَأُسْكِنَتْ مَهْيَعَةَ فَأَوَّلْتُهَا، وَبَاءَ الْمَدِينَةِ يَنْقُلُهَا اللهُ إِلَى مَهْيَعَةَ».(١)

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵا  گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە خەودا ئافرەتێکی ڕەشی قژ ئاڵۆزی بۆن ناخۆشم بینی لە مەدینە وەدەرنرا و جێگیرکرا لە مەهیەعە (واتە: جوحفە، کە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی شامە)، جا لێکم دایەوە بە نەخۆشی مەدینە کە خوا دەیگوازێتەوە بۆ مەهیەعە (بۆ جوحفە).

٢٢١٣ - «عَنْ جَابِرٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَوْمًا مِنَ الأَيَّامِ إِنِّي رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنَّ رَجُلاً أَتَانِي بِكُتْلَةٍ مِنْ تَمْرٍ فَأَكَلْتُهَا، فَوَجَدْتُ فِيهَا نَوَاةً فَآذَتْنِي حِينَ مَضَغْتُهَا، ثُمَّ أَعْطَانِي كُتْلَةً أُخْرَى فَقُلْتُ: إِنَّ الَّذِي أَعْطَيْتَنِي، وَجَدْتُ فِيهَا نَوَاةً آذَتْنِي فَأَكَلْتُهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: نَامَتْ عَيْنُكَ يَا رَسُولَ اللهِ هَذِهِ السَّرِيَّةُ الَّتِي بَعَثْتَ بِهَا، غَنِمُوا مَرَّتَيْنِ كِلْتَاهُمَا وَجَدُوا رَجُلاً يَنْشُدُ ذِمَّتَكَ، فَقُلْتُ لِمُجَالِدٍ: مَا يَنْشُدُ ذِمَّتَكَ قَالَ: يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ».(٢)

واتە: لە جابرەوە  گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان فەرمووی: من لە خەونمدا پیاوێکم بینی ئەندازەیەک لە خورمای بۆ هێنام و منیش خواردم و دەنکە خورمایێک کەوتە بەر ددانەکان و ئازاری پێگەیاندم کاتێ کە جویم، دواتر ئەندازەیەکی تری پێدام، منیش وتم: ئەوەی (پێشتر) پێتدام دەنکێکی تیا بوو ئازاریدام و خواردم، ئەبوبەکریش وتی: چاوت با بە ئەرخەیانی و ئارامی بخەوێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (مانای خەونەکە ئەوەیە) ئەو سوپایەی ناردوتە دوو جار دەستکەوتیان بەدەست هێناوە هەردوو جار گەیشتوون بە پیاوێک کە داوای پەیمانی تۆ دەکات، جا (عوبەیدەی کوڕی ئەسوەد) دەڵێ: بە موجالیدم وت: داوای پەیمانی تۆ دەکات (واتا چی)؟ وتی: دەڵێت: (لا إله إلا الله).

٢٢١٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَتِ امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَهَا زَوْجٌ تَاجِرٌ يَخْتَلِفُ، فَكَانَتْ تَرَى رُؤْيَا كُلَّمَا غَابَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَقَلَّمَا يَغِيبُ إِلاَّ تَرَكَهَا حَامِلاً، فَتَأْتِي رَسُولَ اللهِ ﷺ فَتَقُولُ: إِنَّ زَوْجِي خَرَجَ تَاجِرًا، فَتَرَكَنِي حَامِلاً، فَرَأَيْتُ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ أَنَّ سَارِيَةَ بَيْتِي انْكَسَرَتْ، وَأَنِّي وَلَدْتُ غُلاَمًا أَعْوَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَيْرٌ، يَرْجِعُ زَوْجُكِ عَلَيْكِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى صَالِحًا، وَتَلِدِينَ غُلاَمًا بَرًّا فَكَانَتْ تَرَاهَا مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلاَثًا كُلُّ ذَلِكَ، تَأْتِي رَسُولَ اللهِ ﷺ ، فَيَقُولُ: ذَلِكَ لَهَا، فَيَرْجِعُ زَوْجُهَا، وَتَلِدُ غُلاَمًا، فَجَاءَتْ يَوْمًا كَمَا كَانَتْ تَأْتِيهِ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ غَائِبٌ، وَقَدْ رَأَتْ تِلْكَ الرُّؤْيَا، فَقُلْتُ لَهَا: عَمَّ تَسْأَلِينَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَا أَمَةَ اللهِ؟ فَقَالَتْ: رُؤْيَا كُنْتُ أُرَاهَا، فَآتِي رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَسْأَلُهُ عَنْهَا؟ فَيَقُولُ: خَيْرًا، فَيَكُونُ كَمَا

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف.

قَالَ: فَقُلْتُ: فَأَخْبِرِينِي مَا هِيَ؟ قَالَتْ: حَتَّى يَأْتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَعْرِضَهَا عَلَيْهِ، كَمَا كُنْتُ أَعْرِضُ، فَوَاللهِ مَا تَرَكْتُهَا حَتَّى أَخْبَرَتْنِي، فَقُلْتُ: وَاللهِ لَئِنْ صَدَقَتْ رُؤْيَاكِ لَيَمُوتَنَّ زَوْجُكِ، وَتَلِدِينَ غُلاَمًا فَاجِرًا، فَقَعَدَتْ تَبْكِي، وَقَالَتْ: مَا لِي حِينَ عَرَضْتُ عَلَيْكِ رُؤْيَايَ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهِيَ تَبْكِي، فَقَالَ لَهَا: مَا لَهَا يَا عَائِشَةُ؟ فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ، وَمَا تَأَوَّلْتُ لَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَهْ يَا عَائِشَةُ إِذَا عَبَرْتُمْ لِلْمُسْلِمِ الرُّؤْيَا فَاعْبُرُوهَا عَلَى الْخَيْرِ، فَإِنَّ الرُّؤْيَا تَكُونُ عَلَى مَا يَعْبُرُهَا صَاحِبُهَا، فَمَاتَ، وَاللهِ زَوْجُهَا، وَلاَ أُرَاهَا إِلاَّ وَلَدَتْ غُلاَمًا فَاجِرًا».[1]

واتە: لە عائیشەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێکی خەڵکی مەدینە هاوسەرێکی بازرگانی هەبوو دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە (بۆ بازرگانی دەچوو)، جا هەموو جارێک کە پیاوەکەی دەڕۆیشت ئافرەتەکە خەونی دەبینی، وە کەم جار هەبوو بڕوات و خێزانەکەی دووگیان نەبێت، جا دەهات بۆ لای پێغەمبەر دەیوت: مێردەکەم بۆ بازرگانی دەرچووە و منی بە دووگیانی جێهێشتووە، منیش خەونم بینی وەک هەر کەسێکی خەوتوو: (لە خەونەکەمدا بینیم) دینگەی ماڵەکەم شکا و منداڵێکی کوێرم بوو (واتە: یەک چاوی کوێر بوو منداڵەکە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (خەونەکەت) چاکە، إن شاء الله هاوسەرەکەت بە پیاوچاکی دەگەڕێتەوە لات و، تۆش کوڕێکی چاکەکارت دەبێت، جا دوو جار یان سێ جار ئافرەتەکە ئەم خەونەی بینی و هەموو جارێک دەهات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاوای پێ دەوت، جا هاوسەرەکەی گەڕایەوە و ئافرەتەکەش کوڕێکی بوو، جا ڕۆژێکیان ئافرەتەکە هات، وەک چۆن جاران دەهات، لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەوە نەبوو، وە هەمان خەونی بینی بوو، عائیشە دەڵێ وتم: پرسیار دەربارەی چی دەکەیت لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بەندەی خوا؟ ئەویش وتی: دەربارەی خەونێک کە بینیومە، من پێشتر دەهاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیارم لێی دەکرد و ئەویش دەیفەرموو: (خەونەکەت) چاکە، جا ئەوە دەردەچوو کە دەیفەرموو، عائیشە دەڵێ وتم: خەونەکە چیە؟ ئافرەتەکە وتی: با پێغەمبەری خوا ﷺ بێتەوە خۆم بۆی باس دەکەم وەک جاران، (عائیشە دەڵێت): سوێند بەخوا وازم لێ نەهێنا تاوەکو بۆی باسکردم، منیش وتم: سوێند بەخوا ئەگەر خەونەکەت ڕاست بێت ئەوە هاوسەرەکەت دەمرێت و تۆش منداڵێکی خراپت دەبێت، جا ئافرەتەکە دانیشتوو دەستی کرد بە گریان و وتی: باشە بۆچی خەونی خۆم بۆ گێڕایەوە؟ جا پێغەمبەری خوا ﷺ (گەڕایەوە) و هاتە ژوورەوە لە کاتێکدا ئافرەتەکە دەگریا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەوە چیەتی ئەی عائیشە؟ عائیشەش هەواڵەکەی پێدا و ئەوەشی بۆ باس کرد کە چۆن خەونەکەی بۆ لێکداوەتەوە، جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەسە ئەی عائیشە (واز بێنە)، ئەگەر خەونێکتان لێکدایەوە بۆ کەسێکی مسوڵمان ئەوە بە لای چاکە بۆی لێکبدەنەوە، چونکە خەون بەو شێوەیە ڕوودەدات کە کەسەکە لێکی دەداتەوە، جا سوێند بەخوا هاوسەری ئافرەتەکە مرد و کوڕێکی خراپی بوو.

---

(١)ـ إسناده رجاله ثقات.

## بابەت: هاندان لەسەر هاوسەرگیری

٢٢١٥ - «عَنْ أَبِي نَجِيحٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَدَرَ عَلَى أَنْ يَنْكِحَ، فَلَمْ يَنْكِحْ فَلَيْسَ مِنَّا».[١]

واتە: لە ئەبو نەجیحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک توانای هەبێت هاوسەرگیری بكات و هاوسەرگیری نەكات (ئەوە لەو سیفەتەدا) لە ئێمە نیە.

## بابەت: هەر كەسێک توانای هەیە ئەوە با هاوسەرگیری بكات

٢٢١٦ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَبَابًا لَيْسَ لَنَا شَيْءٌ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ، فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ».[٢]

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: ئێمە گەنج بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین هیچمان نەبوو، فەرمووی: ئەی كۆمەڵی گەنجان هەر كەسێک لە ئێوە توانای (ماددیی و مەعنەویی) هەیە با هاوسەرگیری بكات، چونكە ئاوا چاو داخەرترە (لە ئاست نەزەر و حەڕام)، وە پارێزەرتریشە بۆ دامێن، وە هەر كەسێكیش توانای نەبوو ئەوە با دەست بە ڕۆژووەوە بگرێت (بە ڕۆژوو بێت)، چونكە ڕۆژوو بۆ ئەو دامركانەوەی شەهوەتە.

٢٢١٧ - «عن علقمة عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لَقِيَهُ عُثْمَانُ وَأَنَا مَعَهُ، فَقَالَ لَهُ: أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ هَلْ لَكَ فِي جَارِيَةٍ بِكْرٍ تُذَكِّرُكَ؟ فَقَالَ: لَئِنْ قُلْتَ: ذَاكَ، فَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ، فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَلْيَصُمْ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ».[٣]

واتە: لە عەلقەمەوە گێڕدراوەتەوە ﷺ، ئەویش لە عەبدوڵڵا گێڕاویەتیەوە (عەلقەمە) وتویەتی: عوسمان بە عەبدوڵڵا گەیشت و منیش لەگەڵی بووم، پێی وت: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان ئایا پێویستیت بە كچێک هەیە كە باست دەكات (چاوی لە تۆیە)؟ ئەویش وتی: مادەم ئاوات وت (با فەرمودەیەكت بۆ بگێڕمەوە)، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەی كۆمەڵی گەنجان هەر كەسێک لە ئێوە توانای (ماددیی و مەعنەویی) هەیە با هاوسەرگیری بكات، چونكە ئاوا چاو داخەرترە (لە ئاست نەزەر و حەڕام)، وە پارێزەرتریشە بۆ دامێن، وە هەر كەسێكیش توانای نەبوو ئەوە با دەست بە ڕۆژووەوە بگرێت (بە ڕۆژوو بێت)، چونكە ڕۆژوو بۆ ئەو دامركانەوەی شەهوەتە.

---

(١) ـ مرسل رجاله ثقات.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە خۆبێنیاز کردن لە ژن

٢٢١٨ - «أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، يَقُولُ: لَقَدْ رَدَّ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى عُثْمَانَ، وَلَوْ أَجَازَ لَهُ التَّبَتُّلَ لَاخْتَصَيْنَا».[١]

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس بووە ﷺ کە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ (بێ نیازی لە ژن و خۆ تەرخان کردن بۆ عیبادەتی) ڕەت کردەوە بۆ عوسمانی کوڕی مەظعون، جا ئەگەر هاتوو ڕێگەی بەو دابووایە ئەوە ئێمە خۆمان دەخەساند.

تێبینی: خۆ خەساندن دروست نیە، قسەکەی سەعدیش واتای ئەوە نیە پێی دروست بوبێت، چونکە کە خۆ بێنیاز کردن لە ئافرەت دروست نەبێت، واتە: شەهوەت لەناوبردن بە جارێک دروست نیە بۆ کەسێک کە شەهوەتی هەر چەندە زۆر بەرز بێت، کەواتە خەساندن بە تەریقەی ئەولا دروست نیە. والله أعلم.

٢٢١٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ التَّبَتُّلِ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خۆ بێنیاز کردن لە ژن و، ڕووکردنە عیبادەت بە شێوەیەکی سەخت.

٢٢٢٠ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا كَانَ مِنْ أَمْرِ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ الَّذِي كَانَ مِنْ تَرْكِ النِّسَاءِ، بَعَثَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا عُثْمَانُ، إِنِّي لَمْ أُومَرْ بِالرَّهْبَانِيَّةِ، أَرَغِبْتَ عَنْ سُنَّتِي؟ قَالَ: لَا، يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: إِنَّ مِنْ سُنَّتِي أَنْ أُصَلِّيَ، وَأَنَامَ، وَأَصُومَ، وَأَطْعَمَ، وَأَنْكِحَ، وَأُطَلِّقَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي، فَلَيْسَ مِنِّي. يَا عُثْمَانُ، إِنَّ لِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا قَالَ سَعْدٌ: فَوَاللهِ لَقَدْ كَانَ أَجْمَعَ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، إِنْ هُوَ أَقَرَّ عُثْمَانَ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْهِ أَنْ نَخْتَصِيَ فَنَتَبَتَّلَ».[٣]

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ بابەتی عوسمانی کوڕی مەظعون ڕوویدا کە وازهێنان لە ئافرەت بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوایدا نارد و فەرمووی: ئەی عوسمان، من فەرمانم پێ نەکراوە بە ڕەهبانیەت و ڕاهیبیەت، ئایا پشتت کردۆتە سوننەتی من؟ وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەری خوا ﷺ)، فەرمووی: سوننەت و ڕێبازی من ئەوەیە نوێژ بکەم و، بخەوم و، بەڕۆژووبم و، بخۆم و، هاوسەرگیری بکەم و، تەڵاق بدەم، جا هەر کەسێک پشت بکاتە سونەتی من ئەوە لە ئێمە نیە (لە و سیفەتانەی پێچەوانەی سوننەتی ئێمەیە)، ئەی عوسمان: خێزان و ماڵ و منداڵەکەت هەقیان لەسەرت هەیە، وە جەستەی خۆشت هەقی لەسەرت هەیە (دەبێ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح لغيره.

(٣) ـ صحيح.

هەقی جەستەی خۆشت بدەی)، سەعد وتی: سوێند بە خوا کۆمەڵە پیاوێکی مسوڵمان کۆکبوون لەسەر ئەوەی ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگا بە عوسمان بدا لەوەی ئەو لەسەریەتی و پەیڕەوی دەکات، ئەوە خۆمان دەخەسێنین و بێ نیاز دەبین لە خێزان و خۆمان بۆ عیبادەت تەرخان دەکەین.

## بابەت: ئافرەت بۆ چوار شت هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرێت

٢٢٢١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: تُنْكَحُ النِّسَاءُ لِأَرْبَعٍ: لِلدِّينِ، وَالْجَمَالِ، وَالْمَالِ، وَالْحَسَبِ، فَعَلَيْكَ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئافرەتان بۆ چوار شت خوازبێنی دەکرێن: بۆ دین و، جوانی و، سەروەت و، ڕەچەڵەک و بنەماڵە، جا تۆ دەست بگرە بە دینەکەوە (جا ئەگەر ئەوە هەڵنەبژێری) ئەوە هەژار کەوتووی لە هەرچی خێرو بێرە.

٢٢٢٢ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا الْحَدِيثِ».

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.[٢]

## بابەت: مۆڵەتدان بۆ سەیرکردنی ئافرەت لە کاتی خوازبێنیدا

٢٢٢٣ - «عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّهُ خَطَبَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا».[٣]

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە ئافرەتێکی لە ئەنصاریەکان داخوازی کردبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بڕۆ سەیری بکە، چونکە ئاوا نزیکترە (گرێنتی زیاتری تیایە) کە خۆشەویستی و ڕەحم و بەزەییتان لە نێواندا دروست بێت.

## بابەت: کاتێ کەسێک هاوسەرگیری دەکات چی پێدەوترێ؟

٢٢٢٤ - «عن یونس قال سمعت عَنْ الْحَسَنِ، يَقُولُ: قَدِمَ عَقِيلُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ الْبَصْرَةَ فَتَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي جُشَمٍ، فَقَالُوا لَهُ: بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِينَ، فَقَالَ: لاَ تَقُولُوا ذَلِكَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَانَا عَنْ ذَلِكَ، وَأَمَرَنَا أَنْ نَقُولَ: بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ».[٤]

---

(١) ـ صحیح.
(٢) ـ صحیح.
(٣) ـ صحیح.
(٤) ـ صحیح لغیره.

واتە: لە یونسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەسەن بوو دەیوت: عەقیلی كوڕی ئەبوتاڵیب هات بۆ بەصرە و هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێكی بەنی جوشەم كرد، جا پێیان وت: یاخوا كۆكبن و كوڕتان ببێت (لە زەواجەكەتاندا)، ئەویش وتی: ئەوە مەڵێن، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ كردووین لەوەدا، وە فەرمانی پێ كردووین كە بڵێین: (بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ) واتە: خوا بەرەكەتت تێ بخات و بەرەكەتت بەسەردا بڕژێنێت.

٢٢٢٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا رَفَّأَ لِإِنْسَانٍ، قَالَ: بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كاتێ كەسێک هاوسەرگیری دەكرد دەیفەرموو: (بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ) واتە: خوا بەرەكەتت تێ بخات و، بەرەكەتت بەسەردا بڕژێنێت و، لەناو خێر و چاكەدا كۆتان بكاتەوە.

## بابەت: نەهی كردن لە داخوازی مسوڵمانێک لەسەر داخوازی مسوڵمانێكی تر

٢٢٢٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنْ أَنْ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، كە نەهی كردوە و (بە حەڕامی داناوە) كەسی (مسوڵمان) خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای (مسوڵمانی) بكات.

٢٢٢٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، وَلاَ يَبِيعُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ حَتَّى يَأْذَنَ لَهُ».[٣]

واتە: با هیچ كەسێک لە ئێوە خوازبێنی نەكات لەسەر خوازبێنی برا مسوڵمانەكەی، وە كڕین و فرۆشتنیش نەكات لەسەر كڕین و فرۆشتنی براكەی، تاوەكو ئەو مۆڵەتی دەدات.

٢٢٢٨ - «عن أبي سلمة، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا حَدَّثَتْهُ - وَكَتَبَهُ مِنْهَا كِتَابًا - أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ فَطَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى أَهْلِهِ تَبْتَغِي مِنْهُمُ النَّفَقَةَ، فَقَالُوا: لَيْسَ لَكِ نَفَقَةٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: لَيْسَ لَكِ نَفَقَةٌ، وَعَلَيْكِ الْعِدَّةُ، وَانْتَقِلِي إِلَى بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، وَلاَ تُفَوِّتِينَا بِنَفْسِكِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أُمَّ شَرِيكٍ امْرَأَةٌ يَدْخُلُ عَلَيْهَا إِخْوَانُهَا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، وَلَكِنِ انْتَقِلِي إِلَى بَيْتِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى إِنْ وَضَعْتِ ثِيَابَكِ لَمْ يَرَ شَيْئًا، وَلاَ تُفَوِّتِينَا بِنَفْسِكِ، فَانْطَلَقَتْ إِلَى بَيْتِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ فَلَمَّا حَلَّتْ، ذَكَرَتْ أَنَّ مُعَاوِيَةَ، وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ لاَ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

مَالَ لَهُ، وَأَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ، فَأَيْنَ أَنْتَ مِنْ أُسَامَةَ؟ فَكَأَنَّ أَهْلَهَا كَرِهُوا ذَلِكَ، فَقَالَتْ: وَاللهِ لاَ أَنْكِحُ إِلاَّ الَّذِي قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَنَكَحَتْ أُسَامَةَ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو: قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: يَا فَاطِمَةُ اتَّقِي اللهَ فَقَدْ عَلِمْتِ فِي أَيِّ شَيْءٍ كَانَ هَذَا».

قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ ﴿١﴾ ﴾ الطلاق، وَالْفَاحِشَةُ أَنْ تَبْذُوَ عَلَى أَهْلِهَا، فَإِذَا فَعَلَتْ ذَلِكَ، فَقَدْ حَلَّ لَهُمْ أَنْ يُخْرِجُوهَا».[1]

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە فاتیمەی کچی قەیسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕاویەتیەوە، فاتیمە بۆی گێڕاوەتەوە ـ ئەبو سەلەمەش لێیەوە نوسیویەتیەوە ـ (گێڕانەوەکەش ئەوە بووە) فاتیمە لە ژێر نیکاحی پیاوێکی قورەیشی بوو (خێزانی پیاوێکی قورەیشی بوو) لە بەنی مەخزووم، جا بە تەواوی تەڵاقیدا، جا (فاتیمە کەسێکی) نارد بۆ لای خزم و کەسەکانی پیاوەکەی و داوای مەسرەفکێشانی لێ کردن، ئەوانیش وتیان: تۆ نەفەقەت بۆ نیە (تازە تەڵاق دراوی)، جا ئەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت و فەرمووی: تۆ نەفەقەت بۆ نیە و عیددەشت لەسەرە و بچۆ بۆ ماڵی ئوممو شەریک و، بێ فەرمانیمان نەکەیت بە هۆی مامەڵە کردن بە ئارەزووی خۆت، دواتر فەرمووی: ئوممو شەریک ئافرەتێکە برا کۆچکەرەکانی دەچن بۆ لای (ئەوێ باش نیە)، بەڵکو بچۆرە ماڵی ئیبنو ئوممی مەکتوم، چونکە ئەو پیاوێکی کوێرە، هەتا ئەگەر جلەکانیشت دابنێیت هیچ شتێک نابینێت، جا بێ فەرمانیمان نەکەیت بە هۆی مامەڵە کردن بە ئارەزووی خۆت، جا فاتیمە چوو بۆ ماڵی ئیبنو ئوممی مەکتوم، جا کە عیددەکەی تەواو بوو باسی کرد کە موعاویە و ئەبو جەهم داخوازیان کردوە (بۆیە ڕاوێژی بە پێغەمبەری خوا کرد)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەرچی موعاویەیە پیاوێکی بێ ماڵ و سەروەتە، وە هەرچی ئەبو جەهمیشە گۆچانەکەی لەسەر شان و ملی ناخاتە خوارەوە (واتە: کابرایەکی توندوتیژە)، جا تۆ دڵت لە چ ئاستێکە بۆ ئوسامە (واتە: بە ئوسامە ڕازی دەبیت)؟ جا وەک بڵێی ماڵەوەیان ئەوەیان پێ خۆش نەبوو کە شوو بە ئوسامە بکات، فاتیمەش وتی: سوێند بەخوا شوو بە کەس ناکەم جگە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، جا ئەوە بوو شووی بە ئوسامە کرد.

موحەممەدی کوڕی عەمرِ وتویەتی: موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم وتویەتی: (عائیشە وتی): ئەی فاتیمە لەخوا بترسە، خۆ تۆ دەزانیت ئەوە دەربارەی چ شتێکە (واتە: لەبەر زمان تیژی گواسترایەوە ماڵی ئیبنو ئوممی مەکتووم نەک لەبەر کوێری ئەو)؟

دەڵێ: وە ئیبنو عەبباس وتویەتی: خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ ﴿١﴾ ﴾، جا (فاحشة) لە ئایەتەکەدا بریتیە لەوەی خۆی دەربخات بەسەر خزم و کەسەکانی و (خۆی بسەپێنێت)، جا کە وای کرد، ئەوە بۆیان دروستە وەدەری بنێن (حاڵەتەکەی فاتیمەش ئاوا بوو).

---

(١) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو حاڵەتەی بۆ پیاو دروستە تیایدا هاوسەرگیری بکات

٢٢٢٩- «حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَالْعَمَّةُ عَلَى ابْنَةِ أَخِيهَا، أَوِ الْمَرْأَةُ عَلَى خَالَتِهَا، أَوِ الْخَالَةُ عَلَى بِنْتِ أُخْتِهَا، وَلاَ تُنْكَحُ الصُّغْرَى عَلَى الْكُبْرَى، وَلاَ الْكُبْرَى عَلَى الصُّغْرَى».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی ئافرەتێک بەسەر پوری بهێنرێت، یان پور بەسەر کچی برای بهێنرێت، یان ئافرەتێک بەسەر خارەتی بهێنرێت، یان خارەت بەسەر کچی خوشکی بهێنرێت، نە بچوکەکە بەسەر گەورەکە دەهێنرێت، وە نە گەورەکەش بەسەر بچوکەکە دەهێنرێت (مەبەستی ئافرەتەکە و پور و خارەتیەتی، واتە: نابێ هیچ ئافرەتێک لەگەڵ پوری یان خارەتی بەیەکەوە خێزانی پیاوێک بن).

٢٢٣٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَالْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردوە کە ئافرەتێک و پورەکەی، یان ئافرەتێک و خارەتی بەیەکەوە کۆبکرێنەوە (واتە حەرامە پیاوێکی مسوڵمان ئافرەتێک و خوشکی باوکی ئافرەتەکە یان خوشکی دایکی ئافرەتەکە خێزانی بن لە یەک کاتدا).

## بابەت: دەربارەی ژن بە ژنی (بێ مارەیی)

٢٢٣١ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الشِّغَارِ قَالَ مَالِكٌ: وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ الآخَرَ ابْنَتَهُ، عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ، قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تَرَى بَيْنَهُمَا نِكَاحًا، قَالَ: لاَ يُعْجِبُنِي».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە ژن بە ژنە، مالیک وتویەتی: ژن بە ژنە ئەوەیە: پیاوێک کچی خۆی لە پیاوێکی تر مارەبکات لەسەر ئەوەی ئەو پیاوەیتر کچی خۆی لەو مارە بکات بەبێ مارەیی (واتە: بێ ئەوەی هیچیان مارەییان بۆ بکرێت).

بە ئەبو موحەممەد وترا: ئایا پێت وایە زەواجیان لە نێوان دروست بووبێت؟ وتی: پێم باش نیە.

## بابەت: دەربارەی زەواج کردنی پیاوان و ئافرەتانی چاک

٢٢٣٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَنْكِحُوا الصَّالِحِينَ وَالصَّالِحَاتِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَقَطَ عَلَيَّ مِنَ الْحَدِيثِ فَمَا تَبِعَهُمْ بَعْدُ فَحَسَنٌ».[٤]

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ اسناده حسن.

واتە: لە عائیشـەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغـەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: زەواج و هاوسەرگیری بۆ پیاوان و ئـافرەتانی باش و چاک بکەن (ژنیان بۆ بهێنن و بە شویان بدەن).

## بابەت: نەهی کردن لە هاوسەرگیری بەبێ وەلی (بەبێ سەرپەرشتیار)

٢٢٣٣ - «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ نِكَاحَ إلاَّ بِوَلِيٍّ».(١)

واتە: لە ئەبو بوردەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ هاوسەرگیرییێک دانامەزرێ بەبێ وەلی و سەرپەرشتیار (واتە: بەبێ باوک و شوێنگرەوەکانی).

٢٢٣٤ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ نِكَاحَ إلاَّ بِوَلِيٍّ».(٢)

واتە: لە ئەبو مووساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: هیچ هاوسەرگیرێک دانامەزرێ بەبێ وەلی و سەرپەرشتیار (واتە: بەبێ باوک، یان هەر کەسێکی تر کە سەرپەرشتی دەکات).

٢٢٣٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ نُكِحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهَا، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنِ اشْتَجَرُوا - قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: وَقَالَ مَرَّةً: فَإِنْ تَشَاجَرُوا - فَالسُّلْطَانُ، وَلِيُّ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهُ، فَإِنْ أَصَابَهَا فَلَهَا الْمَهْرُ بِمَا اسْتَحَلَّ مِنْ فَرْجِهَا، قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: أَمْلاَهُ عَلَيَّ سَنَةَ سِتٍّ وَأَرْبَعِينَ وَمِائَةٍ».(٣)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک مارە بکرێت بەبێ مۆڵەتی وەلی و سەرپەرشتیارەکەی، ئەوە مارەکردنەکەی بەتاڵ و پوچەڵە، ئەوە مارەکردنەکەی بەتاڵ و پوچەڵە (دانەمەزراوە)، جا ئەگەر سەرپەرشتیارەکان کێشەیان تێکەوت و (ڕێک نەدەکەوتن هەندێک دەیانەویست عەقدەکە بکرێت و هەندێکیتر ڕێگریان دەکرد) ئەوە (لەو حاڵەتەدا) کاربەدەست وەلی و سەرپەرشتیاری ئەو کەسەیە کە وەلی و سەرپەرشتیاری نیە (یان هەیەتی بەڵام ڕێک ناکەون)، جا ئەگەر (بەبێ وەلی هاوسەرگیری کرد) و جیماعی لەگەڵ کرد ئەوە ئافرەتەکە مارەیی بۆ هەیە بە هۆی جیماع کردنەکەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئافرەتی هەتیو (یەتیم) كە بەشوو دەدرێت

٢٢٣٦ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تُسْتَأْمَرُ الْيَتِيمَةُ فِي نَفْسِهَا، فَإِنْ سَكَتَتْ فَقَدْ أَذِنَتْ، وَإِنْ أَبَتْ لَمْ تُكْرَهْ».[١]

واتە: لە ئەبو موساوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی هەتیو پرسی پێ دەكرێت، جا ئەگەر بێ دەنگ بوو (كاتێ لێیان پرسی: ڕازی شوو بە فلانە كەس بكەیت كە دەیەوێ بێت بۆ داخوازیت؟)، ئەوە (بەبێ دەنگیەكەی) مۆڵەتی داوە، وە ئەگەر ڕازی نەبوو (بە ڕاشكاوی وتی: پێم خۆش نیە و ڕازی نیم) ئەوە زۆری لێ ناكرێت.

## بابەت: دەربارەی پرس كردن بە كچ و بێوەژن

٢٢٣٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، وَإِذْنُهَا الصُّمُوتُ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی بێوەژن بە شوو نادرێت تاوەكو داوای فەرمانی لێ نەكرێت (واتە: تا خۆی فەرمان دەكات)، وە كچیش بە شوو نادرێت تاوەكو داوای مۆڵەتی لێ نەكرێت، وە مۆڵەت لێ وەرگرتنی بێ دەنگ بوونیەتی.

٢٢٣٨ - «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ حَدَّثَهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِهَذَا الْحَدِيثِ».[٣]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمودە گێردراوەتەوە.

٢٢٣٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا».[٤]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی بێوەژن هەق و شایستەترە و لە پێشترە لە وەلی و سەرپەرشتیار لە بەشوودانی خۆی، وە كچیش پرسی پێ دەكرێت و ئیزنی لێ وەردەگیرێت بۆ بەشوودان، وە ئیزن و مۆڵەتدانەكەشی بریتیە لە بێ دەنگیەكەی.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

٢٢٤٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تُسْتَأْذَنُ الْبِكْرُ، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کچ پرسی پێ دەکرێت و مۆڵەتی لێ وەردەگیرێت بۆ بەشوودان، وە مۆڵەتدانەکەشی بریتیە لە بێ دەنگیەکەی.

٢٢٤١ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الأَيِّمُ أَمْلَكُ بِأَمْرِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْمَرُ فِي نَفْسِهَا، وَصَمْتُهَا إِقْرَارُهَا».[٢]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی بێوەژن لە وەلی و سەرپەرشتیار زیاتر خاوەنی کاروبار و بەشوودانی خۆیەتی، وە کچیش پرسی پێ دەکرێت و مۆڵەتی لێ وەردەگیرێت بۆ بەشوودان، وە مۆڵەتدان و ڕازی بوونەکەشی بریتیە لە بێ دەنگیەکەی.

## بابەت: ئەو بێوەژنەی باوکی بەشووی دەدات لەکاتێکدا ئافرەتەکە پێی خۆش نیە

٢٢٤٢ - «أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ، وَمُجَمِّعَ بْنَ يَزِيدَ الأَنْصَارِيَّيْنِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، حَدَّثَاهُ أَنَّ رَجُلاً مِنْهُمْ مِنَ الأَنْصَارِ يُدْعَى خِذَامًا أَنْكَحَ بِنْتًا لَهُ فَكَرِهَتْ نِكَاحَ أَبِيهَا فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَرَدَّ عَنْهَا نِكَاحَ أَبِيهَا، فَنَكَحَتْ أَبَا لُبَابَةَ بْنَ عَبْدِ الْمُنْذِرِ فَذَكَرَ يَحْيَى أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّهَا كَانَتْ ثَيِّبًا».[٣]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید و موجەممیعی کوڕی یەزیدی ئەنصاریەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، کە وتویانە: پیاوێک لە خۆیان، (واتە:) لە ئەنصاریەکان، کە پێی دەوترا: خیذام کچێکی خۆی مارەکرد، ئافرەتەکەش مارەکردن و بە شوو دانەکەی باوکی پێ ناخۆش بوو و (بە پیاوەکە ڕازی نەبوو)، جا ئافرەتەکە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ مارەکردنەکەی باوکی ڕەت کردەوە و ئافرەتەکە شووی بە ئەبو لوبابەی کوڕی عەبدول مونذیر کرد.

جا یەحیا باسی کردوە کە پیی گەیشتووە: ئافرەتەکە بێوەژن بووە.

٢٢٤٣ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَمُجَمِّعٍ ابْنَيْ يَزِيدَ ابْنِ جَارِيَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ خَنْسَاءَ بِنْتَ خِذَامٍ زَوَّجَهَا أَبُوهَا، وَهِيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَرَدَّ نِكَاحَهَا».[٤]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمان و موجەممیعەوە کە دوو کوڕی یەزیدی کوڕی جاریەنە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویانە: خەنسائی کچی خیذام باوکی بەشوویدا، لە کاتێکدا بێوەژن بوو و پێی ناخۆش بوو و ڕازی نەبوو، جا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەری خواش) بە شوودانەکەی ڕەت کردەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.




## بابەت: ئەو ئافرەتەی دوو وەلی و سەرپەرشتیار بەشووی دەدەن

٢٢٤٤ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، أَوْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ زَوَّجَهَا وَلِيَّانِ لَهَا، فَهِيَ لِلأَوَّلِ مِنْهُمَا، وَأَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ بَيْعًا مِنْ رَجُلَيْنِ، فَهُوَ لِلأَوَّلِ مِنْهُمَا».[١]

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیر یان سەمورەی کوڕی جوندوبەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک دوو وەلی و سەرپەرشتیار بەشووی بدەن، ئەوە بەشوودانەکە بۆ یەکەمیانە، وە هەر کەسێک شتێک بفرۆشێتە دوو کەس، ئەوە شتەکە بۆ یەکەمیانە (واتە: لە هەردوو بابەتدا هی یەکەمیان دادەمەزرێت و ئەوەیتریان باتڵە).

٢٢٤٥ - «حَدَّثَنَا عَفَّانُ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، أَنْبَأَنَا قَتَادَةُ، عَنْ الْحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِنَحْوِهِ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: نەهی کردن لە موتعە

٢٢٤٦ - «عَنْ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ، حَدَّثَهُ: أَنَّهُمْ سَارُوا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي حِجَّةِ الْوَدَاعِ فَقَالَ: اسْتَمْتِعُوا مِنْ هَذِهِ النِّسَاءِ وَالاِسْتِمْتَاعُ عِنْدَنَا: التَّزْوِيجُ فَعَرَضْنَا ذَلِكَ عَلَى النِّسَاءِ، فَأَبَيْنَ أَنْ لاَ يَضْرِبنَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُنَّ أَجَلاً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: افْعَلُوا فَخَرَجْتُ أَنَا وَابْنُ عَمٍّ لِي مَعَهُ بُرْدٌ، وَمَعِي بُرْدٌ، وَبُرْدُهُ أَجْوَدُ مِنْ بُرْدِي، وَأَنَا أَشَبُّ مِنْهُ، فَأَتَيْنَا عَلَى امْرَأَةٍ فَأَعْجَبَهَا شَبَابِي، وَأَعْجَبَهَا بُرْدُهُ، فَقَالَتْ: بُرْدٌ كَبُرْدٍ، وَكَانَ الأَجَلُ بَيْنِي وَبَيْنَهَا عَشْرًا، فَبِتُّ عِنْدَهَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ، ثُمَّ غَدَوْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ قَائِمٌ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبَابِ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الاِسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ، أَلاَ وَإِنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ، فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهَا، وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا».[٣]

واتە: لە ڕەبیعی کوڕی سەبرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەمیش باوکی بۆی گێڕاوەتەوە: کە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێگادا ڕۆیشتوون لە حەجیماڵئاواییدا، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: موتعە لەگەڵ ئەم ئافرەتانەدا بکەن، وە موتعە لای ئێمە بریتی بوو لە هاوسەرگیری، جا ئێمە داوای ئەوەمان (واتە: داوای زەواجمان) لە ئافرەتان کرد، ئەوانیش ڕازی نەبوون تەنها بەوە نەبێت کە ماوەیەکی دیاریکراو لە نێوان ئێمە و خۆیان دابنێن.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (قەیناکە) بیکەن، جا من و کوڕە مامێکم دەرچووین (بۆ ئەوەی هەر یەکەمان زەواج لەگەڵ ئافرەتێک بکەین)، جا کوڕە مامەکەم کراسێکی هەبوو، منیش کراسێک، وە کراسەکەی ئەو چاکتر و نوێتر بوو لە هی من، (بەڵام) من لەو گەنجتر بووم، جا هاتین بۆ لای ئافرەتێک و ئافرەتەکە دڵی گەنجایەتیەکەی منی گرت، وە دڵی کراسەکەی کوڕە مامیشمی گرت، (جا دوو دڵ بوو لە هەڵبژاردنی یەکێکمان، دواتر بڕیاری خۆی دا) و وتی: کراسەکەی وەک کراسەکەتە (واتە: وتی: کراس هەر کراسە زۆر گرینگ نیە، گەنجایەتیەکە گرینگترە، بۆیە منی هەڵبژارد) و ماوەی نێوانی من و ئەو دە ڕۆژ بوو (واتە: قەول وابوو زەواجەکەمان دە ڕۆژ بێت و ئەو ماوەیە لای بمێنمەوە)، جا ئەو شەوە لای مامەوە، دواتر بەیانیم کردەوە و پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە نێوان ڕوکن و دەرگای (کەعبە بوو) و فەرمووی: ئەی خەڵکینە من پێشتر ڕێگەمدان بۆ موتعە و زەواجی کاتی، جا بزانن ئەوە خوا حەڕامی کرد تا ڕۆژی دوایی، جا هەر کەسێک ئافرەتێکی لەلایە (بە موتعە مارەی کردوە)، ئەوە با دەست بەرداری بێت و هیچ شتێکیشیان لێ نەسەننەوە کە پێتان بەخشیون (لە مارەیی و دیاری).

٢٢٤٧- «عَنْ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ عَامَ الْفَتْحِ».[١]

واتە: لە ڕەبیعی کوڕی سەبرەی جوهەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە موتعە (واتە زەواجی کاتی حەڕام کردوە)، لە ساڵی ئازادکردنی مەککە.

٢٢٤٨- «عَنِ الْحَسَنِ، وَعَبْدِ اللهِ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ أَبِيهِمَا، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ، يَقُولُ: لِابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُتْعَةِ، مُتْعَةِ النِّسَاءِ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، عَامَ خَيْبَرَ».[٢]

واتە: لە حەسەن و عەبدوڵلا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەمانیش لە باوکیانەوە گێڕاویانەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەلی بوو ﷺ بە ئیبنو عەبباسی (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) دەوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە موتعە و، لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی، لە ساڵی خەیبەردا.

## بابەت: هاوسەرگیری کردنی کەسی موحریم

٢٢٤٩ - «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُحْرِمُ لاَ يَنْكِحُ، وَلاَ يُنْكِحُ».[٣]

واتە: لە عوسمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کەسی موحریم نە خۆی هاوسەرگیری دەکات (لە حاڵەتی ئیحرامدا)، نە هاوسەرگیری بۆ کەسیش دەکات (واتە: ژن بۆ خۆی و بۆ خەڵکیش مارە ناکات).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: مارەیی خێزانەکان و کچەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بووە؟

٢٢٥٠ - «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، كَمْ كَانَ صَدَاقُ أَزْوَاجِ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قَالَتْ: كَانَ صَدَاقُهُ لِأَزْوَاجِهِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشًّا وَقَالَتْ: أَتَدْرِي مَا النَّشُّ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ. قَالَتْ: « نِصْفُ أُوقِيَّةٍ، فَهَذَا صَدَاقُ رَسُولِ اللهِ ﷺ لِأَزْوَاجِهِ».(١)

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) کرد (وتم): مارەیی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بووە؟ وتی: مارەیی (پێغەمبەری خوا ﷺ) بۆ خێزانەکانی بریتی بووە لە دوازدە ئۆقیە و نەششێک، جا وتی: ئایا دەزانی نەش چیە؟ دەڵێ وتم: نەخێر، وتی: نیو ئۆقیەیە، ئا ئەوە مارەیی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە بۆ ئافرەتەکانی.

تێبینی: دوازدە ئۆقیە و نیوەکە دەکاتە پێنج سەد درهەمی زیو، چونکە هەر ئۆقیەیەک چل درهەمە.

٢٢٥١ - «عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ السُّلَمِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَخْطُبُ ﷺ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ لاَ تُغَالُوا فِي صُدُقِ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللهِ، كَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، مَا أَصْدَقَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ، وَلاَ أُصْدِقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ فَوْقَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً. أَلاَ وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيُغَالِي بِصَدَاقِ امْرَأَتِهِ، حَتَّى يَبْقَى لَهَا فِي نَفْسِهِ عَدَاوَةٌ، حَتَّى يَقُولَ: كَلِفْتُ لَكِ عَلَقَ الْقِرْبَةِ، أَوْ عَرَقَ الْقِرْبَةِ».(٢)

واتە: لە ئەبو عەجفائی سولەمیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو ﷺ وتاری دەدا، جا ستایشی خوای کرد و بە جوانی وەسفی کرد، دواتر وتی: ئاگاداربن زێدەڕۆیی مەکەن لە مارەیی ئافرەتاندا (داوای مارەیی زۆر مەکەن)، چونکە ئەگەر (مەسەلەی مارەیی) ڕێز و حورمەت بێت لە دونیا، یان تەقوا و پارێزکاری بێت لای خوا (ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا) پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشتر بوو، (کەچی) مارەیی بۆ خێزانەکانی نەکردوە، وە هیچ لە کچەکانیشی مارەییان بۆ نەکراوە زیاتر بێت لە دوازدە ئۆقیە، وە ئاگادار بن یەکێک لە ئێوە زێدەڕۆیی دەکات لە مارەیی دانانی ئافرەتەکەی تاوەکو لە ناخ و دڵیدا دژایەتیێک و دوژمنایەتیەکی بەرانبەری دروست دەبێت تا وای لێ دێت دەڵێت: بۆ تۆ سوراحی ئاو هەڵێنجانیشم سەرف کرد ـ یان بۆ تۆ ئارەقەی ئاو هەڵێنجانم کرد (واتە: ژیانم هەمووی بۆتە ماندووبوون و سوغرە بۆ پەیاکردنی مارەیی تۆ).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: ئەوەی دروستە بكرێت بە مارەیی

٢٢٥٢ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁، قَالَ: أَتَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّهَا وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا لِي فِي النِّسَاءِ مِنْ حَاجَةٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: زَوِّجْنِيهَا، فَقَالَ: أَعْطِهَا ثَوْبًا فَقَالَ: لاَ أَجِدُ، قَالَ: أَعْطِهَا وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، قَالَ فَاعْتَلَّ لَهُ فَقَالَ: مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ قَالَ: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا عَلَى مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ».[١]

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: خۆم كردۆتە دیاری بۆ خوا و پێغەمبەرەكەی، جا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من پێویستم بە ئافرەت نیە، پیاوێكیش وتی: لەمنی مارە بكە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جلێكی پێ بدە (بە مارەیی)، پیاوەكە وتی: نیمە، (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: مارەیی بدەرێ هەرچەندە گوستیلەیەكی ئاسنیش بێت، دەڵێ (جا كابرا) بەڵگەی بۆ پێغەمبەری خوا هێنایەوە (كە نیەتی)، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئایا هیچ لە قوڕئانت لەبەرە؟ كابرا وتی: ئەوە و ئەوەم لەبەرە، فەرمووی: ئەوە لێم مارە كردی لەسەر ئەوەندەی كە لەبەرتە لە قوڕئان (بۆ ئەوەی فێری بكەیت).

## بابەت: وتاری مارەبڕین

٢٢٥٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﵁، قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ خُطْبَةَ الْحَاجَةِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ - أَوْ إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ - نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا. مَنْ يَهْدِهِ اللهُ، فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ يَقْرَأُ ثَلاَثَ آيَاتٍ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب، ثُمَّ يَتَكَلَّمُ بِحَاجَتِهِ».[٢]

واتە: لە عەبدوڵڵا ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری پێویستی فێر كردین (واتە: ئەو وتارەی وەک پێشەكی بەكار دێت بۆ داخوازی هەر كارێک، كە بریتیە لە وتنی ئەم ڕستە و ئایەتانە): (الْحَمْدُ لِلَّهِ، أَوْ إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ اسناده منقطع، لكن الحديث صحيح.

يَهْدِهِ اللهُ، فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، دواتر ئەم ئایەتانەی دەخوێند:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب،دواتر قسە لەسەر پێویستی و داخوازیەكەی دەكات.

## بابەت: مەرج لە زەواجدا

٢٢٥٤ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ».[١]

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: شایستەترین مەرج كە جێبەجێی بكەن مەرجی زەواجە كە بەهۆیەوە دامێنتان حەڵاڵ كردوە.

## بابەت: دەربارەی چێشتی بوك گواستنەوە

٢٢٥٥ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ صُفْرَةً فَقَالَ: مَا هَذِهِ الصُّفْرَةُ؟ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: بَارَكَ اللهُ لَكَ، أَوْلِمْ، وَلَوْ بِشَاةٍ».[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ شوێنەواری گوڵاوی بینی بەسەر عەبدوڕڕەحمانەوە و ﷺ، فەرمووی: ئەو بۆنە چیە؟ ئەویش وتی: هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێك كردوە لەسەر ئەندازەی دەنگە قەسپێك لە زێڕ (بۆ مارەیی)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: خوا بەرەكەتت تێبخات، (كەواتە:) چێشتی هاوسەرگیری بكە ئەگەرچی بە بزنێكیش بێت.

## بابەت: دەربارەی وەڵامدانەوەی دەعوەتی بوك گواستنەوە

٢٢٥٦ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى وَلِيمَةٍ فَلْيُجِبْ قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَنْبَغِي أَنْ يُجِيبَ، وَلَيْسَ الأَكْلُ عَلَيْهِ بِوَاجِبٍ».[٣]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە بانگێشت و دەعوەت کرا بۆ چێشتی بوک گواستنەوە، با وەڵام بداتەوە (بۆ داوەتەکە بچێت).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: واجبە وەڵام بداتەوە و بچێت، بەڵام خواردنی لەسەر واجب نیە (گرنگ ئەوەیە ئامادە بێت).

## بابەت: دەربارەی دادگەریی کردن لە نێوان ئافرەتاندا

٢٢٥٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَشِقُّهُ مَائِلٌ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێراوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو خێزانی هەبن و، بەلای یەکێکیاندا بشکێتەوە (بەوەی زیاتر مەسرەفی بکات و گرنگی زیاتری پێ بدات)، ئەوە ڕۆژی دوایی کابرا دێت لە کاتێکدا لایێکی خوارە (بە تەنیشتێکدا شکاوەتەوە، چونکە دادگەر نەبووە).

تێبینی: بەڵام ئەگەر یەکێک لە خێزانەکانی نەخۆش بوو یان ئیفلیج و شەلەل بوو، یان هەر جۆرێک لەم شتانەی تووش ببوو بە دڵنیایی دەبێ گرنگی زیاتری پێ بدرێت و فەرموودەکە نایگرێتەوە.

## بابەت: دەربارەی نۆبەت لە نێوان ئافرەتاندا[٢]

٢٢٥٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْسِمُ فَيَعْدِلُ، وَيَقُولُ: اللهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ، وَلاَ أَمْلِكُ».[٣]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆبەتی بۆ ئافرەتەکانی دەکرد و دادگەر بوو، وە دەیفەرموو: خوایە ئەوە نۆبەتی منە لەوەی لە توانامدا هەیە، کەواتە (ئەی خوایە) سەرزەنشتم مەکە لەو شتانەی تۆ دەتوانیت و من ناتوانم (واتە: خوایە تەنها تۆ دەتوانی لە هەموو زەڕڕەیەک دادگەر بیت، من مرۆڤم و ناتوانم).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ بۆ ئەوانەی لە ئافرەتێك زیاتریان هەیە.

(٣) ـ ضعيف.

## بابەت: ئەو پیاوەی چەند ئافرەتێکی هەیە و لە لایەتی

۲۲٥۹ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا سَافَرَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ فَأَيَّتُهُنَّ، خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ».[۱]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەفەرێکی دەکرد، تیروپشکی لە نێوان ئافرەتەکانیدا دەکرد، جا ناو و پشکی کامەیان دەرچووایە ئەوی لەگەڵ خۆی دەبرد.

## بابەت: مانەوە لەلای بێوەژن و کچ کاتێ پیاو (بۆ یەکەمجار) دەچێتە لایان

۲۲٦۰ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِلْبِكْرِ سَبْعٌ، وَلِلثَّيِّبِ ثَلَاثٌ».[۲]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەوت ڕۆژ بۆ کچە و، سێ ڕۆژیش بۆ بێوەژنە.

تێبینی: واتە ئەگەر پیاوێک خێزانێکی هەبوو، دواتر خێزانێکی تری هێنا کە کچ بوو، ئەوە حەوت ڕۆژ لای خێزانە کچەکە دەبێت (چونکە یەکەم جارە ماڵی باوکی جێ دەهێڵێت، تا دڵی ئۆقرەی بۆ دروست دەبێت، وە ئەگەر پیاو خێزانێکی هەبوو دواتر خێزانێکی تری هێنا کە بێوەژن بوو، ئەوە سێ ڕۆژ لەلای دەمێنێتەوە، چونکە ئەمەیان تەجرەبەی هەیە و ڕاهاتووە، جا دوای ئەو ماوەیە نۆبەتی یەکسان دادەنێت).

۲۲٦۱ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ، أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا، وَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ، وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ، سَبَّعْتُ لِسَائِرِ نِسَائِي».[۳]

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ زەواجی لەگەڵ ئوممو سەلەمە کرد، سێ ڕۆژ لەلای مایەوە و فەرمووی: ئەوە لەبەر کەمی و بێ ڕێزی تۆ نیە (کە سێ ڕۆژ لەلات مامەوە نەوەک حەوت ڕۆژ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە هەقی بێوەژن تەنها سێ ڕۆژە)، جا ئەگەر دەتەوێ (نۆبەتت) بۆ دەکەم بە حەوت، جا ئەگەر بۆت بکەم بە حەوت، ئەوە بۆ خێزانەکانی تریشم دەکەم بە حەوت.

---

(۱) ـ صحيح.

(۲) ـ صحيح.

(۳) ـ صحيح.

## بابەت: بەزاوابوونی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی لە مانگی شەووالدا (لە مانگی شەشەڵان)

٢٢٦٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي شَوَّالٍ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي؟ قَالَتْ: وَكَانَتْ تَسْتَحِبُ أَنْ تُدْخِلَ عَلَى النِّسَاءِ فِي شَوَّالٍ».[١]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەووال مارەی کردم و، لە شەووالیش گواسترامەوە (لێم بەزاوا بوو)، کەواتە: کام لە خێزانەکانی پایەی لە من گەورەترە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (عائیشە) دەڵێ: پێم باشە لە مانگی شەووال ئافرەتان بگوازنەوە و لێیان بەزاوا ببن.

## بابەت: دوعای کاتی جیماع و جووت بوون

٢٢٦٣- «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ أَنْ يَقُولَ حِينَ يُجَامِعُ أَهْلَهُ: بِسْمِ اللهِ اللهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَإِنْ قَضَى اللهُ وَلَدًا، لَمْ يَضُرَّهُ الشَّيْطَانُ».[٢]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چ شتێک ڕێگری لە هەر یەکێک لە ئێوە دەکات کە کاتێک لەگەڵ خێزانی جووت دەبێت بڵێت: (بِسْمِ اللهِ، اللهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا) واتە: بەناوی خوا، خوایە لە شەیتانمان دور بخەیتەوە و، شەیتانیش دور بخەیتەوە لەوەی پێمان دەبەخشی، جا ئەگەر خوا بڕیاریدا ببێتە منداڵ ئەوە شەیتان زەرەری پێ ناگەیەنێ و (ناتوانێ).

## بابەت: نەهی کردن لە جووت بوون لەگەڵ ئافرەتان لە دواوە (لە کۆم)

٢٢٦٤ - «عَنْ هَرَمِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ خُزَيْمَةَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، لاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ».[٣]

واتە: لە هەڕەمی کوڕی عەبدوڵڵا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە خوزەیمەی کوڕی ثابیت بوو ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان خوا شەرم لە هەق ناکات (ڕوونی دەکاتەوە)، مەچوونە لای ئافرەتان (لەگەڵیان جووت مەبن) لە دواوە، لە کۆم.

٢٢٦٥ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ الْيَهُودَ، قَالُوا لِلْمُسْلِمِينَ: مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ وَهِيَ مُدْبِرَةٌ جَاءَ وَلَدُهُ أَحْوَلَ فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة».[٤]

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): جولەکەکان بە موسڵمانانیان وت: هەر کەسێک بچێتە لای خێزانەکەی لەکاتێکدا ئافرەتەکە پشتی لەوە، ئەوە منداڵەکەی خێل دەردەچێ، جا خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة، واتە: [ئافرەتانتان کێلگەن بۆتان، کەواتە بڕۆن بۆ لایان و لە گەڵیان جووت بن لە هەر لایێکی حەز دەکەن] (گرینگ ئەوەیە لە شوێنە حەڵاڵەکە بچنە لایان).

## بابەت: ئەو پیاوەی چاوی بە ئافرەت دەکەوێت و لە نەفسی خۆی دەترسێت

٢٢٦٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللهِ ﷺ امْرَأَةً فَأَعْجَبَتْهُ، فَأَتَى سَوْدَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، وَهِيَ تَصْنَعُ طِيبًا، وَعِنْدَهَا نِسَاءٌ فَأَخْلَيْنَهُ فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ رَأَى امْرَأَةً تُعْجِبُهُ فَلْيَقُمْ إِلَى أَهْلِهِ، فَإِنَّ مَعَهَا مِثْلَ الَّذِي مَعَهَا».[1]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتێکی بینی و پێی سەرسام بوو (چونکە بەرچاو بوو)، بۆیە چوو بۆ لای سەودەی خێزانی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) لەکاتێکدا گوڵاوی دروست دەکرد و چەند ئافرەتێکیشی لەلا بوو، جا ئافرەتەکان پێغەمبەری خوایان ﷺ بە تەنها بۆ سەودە جێهێشت و پێغەمبەری خواش ﷺ پێویستیەکەی خۆی جێبەجێ کرد، دواتر فەرمووی: هەر پیاوێک ئافرەتێکی بینی و پێی سەرسام بوو با بچێتە لای خێزانەکەی و (شەهوەتی خۆی بشکێنێت)، چونکە ئەوەی لای ئافرەتەکە هەیە لای خێزانەکەشی هەیە.

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئافرەتەکەی بینیوە لەگەڵ هاوەڵانیدا بووە، جا ڕەنگە بینیبێتی کە هەندێک لە هاوەڵەکان چاویان بڕیوەتە ئافرەتەکە و، لایان جوان بووە و، کاری تێ کردوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خاتری ئەوان لەبەر چاویان نمایشەکەی لەسەر خۆی جێبەجێ کردوە، وا خۆی نیشان داوە کە ئەو ئافرەتە کاری تێ کردوە وەک هەر یەکێک لەمان، جا تاوەکو هاوەڵەکانی فێر بکات چارەی ئەو حاڵەتە بکەن، بۆیە چووە بۆ لای خێزانەکەی و بە ئاشکرا لەبەر چاوی هەمووان دەری خستووە پێویستی بە شەهوەت خاڵی کردنەوە هەیە، تاوەکو هاوەڵان و موسڵمانان فێر بکات لەو حاڵەتانەی توشی شەهوەت وروژان دەبن بچن شەهوەتەکەیان خاڵی بکەنەوە و، هیچیش شەرم نەکەن و بەهانەی کۆڕو مەجلیسان فریویان نەدات لە هەر بارودۆخێک بێت، چونکە سنوری شەرم بەزاندن چاکترە لە تووش بوونی تاوانی نەزەر و زینا و چاولەدەری.

## بابەت: دەربارەی خواستنی کچ

٢٢٦٧ - «حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَلَمَّا قَفَلْنَا: تَعَجَّلْتُ، فَلَحِقَنِي رَاكِبٌ، قَالَ: فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ لِي: مَا أَعْجَلَكَ يَا جَابِرُ؟. قَالَ: إِنِّي

---

(١) ـ إسناده حسن.

حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ، قَالَ: أَفَبِكْرًا تَزَوَّجْتَهَا أَمْ ثَيِّبًا قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا. قَالَ: فَهَلاَ بِكْرًا تُلاَعِبُهَا، وَتُلاَعِبُكَ قَالَ: ثُمَّ قَالَ لِي: إِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا، ذَهَبْنَا نَدْخُلُ. قَالَ: أَمْهِلُوا حَتَّى نَدْخُلَ لَيْلاً، أَيْ عِشَاءً لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ، وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ». (١)

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، جا کاتێ گەڕاینەوە پەلەم کرد (پێشیان کەوتمەوە)، جا سوارێک پێم گەیشتەوە، دەڵێ: منیش ئاوڕم دایەوە و بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا پێی وتم: چی وایکرد پەلە بکەیت ئەی جابر؟ جابر ﷺ وتی: من تازە هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێک کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا کچە ئەوەی هاوسەرگیریت لەگەڵ کردوە یان بێوەژنە؟ جابر وتی: (کچ نیە) بەڵکو بێوەژنە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆچی کچت نەدەهێنا تا یاری لەگەڵ بکەیت و یاریت لەگەڵ بکات (چونکە کچ سەلیقەی چاکترە)، دەڵێ: دواتر پێی وتم: کاتێ چوویتەوە دەست بگرە بە زیرەکیەوە زیرەکی، جابر دەڵێ: کاتێ گەڕاینەوە، ڕۆیشتین ویستمان بچینە ژوورەوە (بۆماڵەوە)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: تۆزێ بوەستن تاوەکو دەکەوینە ناو شەو، واتە تا دەبێتە عیشا، تاوەکو قژ ئاڵۆز قژی شانە بکات و ئافرەتەکەش تراش بکات و خۆی ئامادە بکات (کاتێ هەواڵی گەیشتنەوەی ئێوە دەبیستن).

## بابەت: دەربارەی جیماع کردن لەگەڵ خێزان کاتێ کە شیر دەدات بە منداڵ

٢٢٦٨ - «عنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ الأَسَدِيَّةِ رَضِي اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ، حَتَّى ذَكَرْتُ أَنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ يَصْنَعُونَ ذَلِكَ، فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الْغِيلَةُ أَنْ يُجَامِعَهَا، وَهِيَ تُرْضِعُ». (٢)

واتە: جودامەی کچی وەهبی ئەسەدیەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ویستم نەهی لە غیلە بکەم تاوەکو بیرم کەوتەوە کە فارس و ڕۆمەکان ئەوە دەکەن و زیان بە منداڵەکانیشیان ناگەیەنن.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (غیلە): ئەوەیە کە پیاو جیماع و سەرجێیی لەگەڵ خێزانەکەی بکات لەکاتێکدا کە شیر بە منداڵ دەدات.

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا زانایان و موجتەهیدانی ئوممەتەکەی فێری ئەوە دەکات کە بابەتی پزیشکی کار لە فەتوا دەکات و، دەبێت لە حەڕام و حەڵاڵدا ڕەچاوی مەفسەدە و مەصڵەحەت بکرێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە لێدانی ئافرەتان

٢٢٦٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ خَادِمًا قَطُّ، وَلاَ ضَرَبَ بِيَدِهِ شَيْئًا إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ».(١)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لە خزمەتکارێکی نەداوە، وە بە دەستەکانی لە هیچ شتێکی نەداوە و ئازاری هیچ بوونەوەرێکی نەداوە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە جیهادی کردوە لە پێناوی خوا عزَّ وجلَّ (ئەو کات شمشێری وەشاندووە بەرانبەر دوژمن).

٢٢٧٠ - «عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللهِ فَجَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: قَدْ ذَئِرْنَ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ، فَرَخَّصَ لَهُمْ فِي ضَرْبِهِنَّ، فَأَطَافَ بِآلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ نِسَاءٌ كَثِيرٌ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ نِسَاءٌ كَثِيرٌ، يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ».(٢)

واتە: لە ئیاسی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ذوبابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئافرەتان مەدەن، جا (پاش ماوەیەک) عومەری کوڕی خەتتاب هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئافرەتان لاملی و بێ فەرمانی پیاوەکانیان دەکەن (لەوەتەی فەرمووتە لێیان مەدەن)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دان بە لێدانیان، جا ئافرەتانی زۆر دەهاتن بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و شکاتیان لە هاوسەرەکانیان دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئافرەتی زۆر هاتوون بۆ لای خێزانەکانی موحەممەد و، شکات لە هاوسەرەکانیان دەکەن، ئا ئەو پیاوانە باشەکانتان نین (باش ئەوەیە لەگەڵیان هەڵبکات و ئارامگر بێت، نەوەک لێیان بدات).

٢٢٧١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَمَعَةَ ﷺ، قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ النَّاسَ يَوْمًا وَوَعَظَهُمْ فِي النِّسَاءِ، فَقَالَ: مَا بَالُ الرَّجُلِ يَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، وَلَعَلَّهُ يُضَاجِعُهَا فِي آخِرِ يَوْمِهِ؟»(٣)

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی زەمعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان وتاری بۆ خەڵکیدا و ئامۆژگاری کردن دەربارەی ئافرەتان و فەرمووی: ئەوە چیە پیاو هەیە بە شواڕک و جەڵدەو (قایش) لە خێزانەکەی خۆی دەدات وەک جەڵد لێدانی بەندە، ڕەنگە لە کۆتایی ئەو ڕۆژەشدا لەگەڵیشی جووت بێت؟! (ئەمە چ ڕەفتارێکی قێزەونە؟!!!).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: هەڵکردنی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی (تەعامول لەگەڵ کردنی)

٢٢٧٢ - «عَنْ أَبِي ذَرّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ فَإِنْ تُقِمْهَا، كَسَرْتَهَا، فَدَارِهَا، فَإِنَّ فِيهَا أَوَدًا وَبُلْغَةً».(١)

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لە پەراسو دروست کراوە (پەراسوش خوارە)، جا ئەگەر ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، کەواتە لەگەڵی هەڵکە (مامەڵەی لەگەڵ بکە)، چونکە خواریشی تیایە و سودیشی تیایە (خۆ تەنها عەیب و خواریان تیا نیە، چاکی و سود و خۆشیشیان تیایە).

تێبینی: واتای ئەم فەرموودە ئەوەیە: ئافرەتان کچی دایکە حەووان، حەووای دایکیشیان بێ عەیب نەبووە، (حەوواش) لە پەراسو دروست کراوە، جا تۆ بەتەمای خوارایەتی پەراسو ڕاست بکەیتەوە؟! نەخێر وامەکەن، بەڵکو ئافرەتان وەک نەقس و خواروخێچیان تیایە، ئەوە سودو خزمەتیشیان زۆرە، هەردووکیانت لەبەر چاو بێت. والله أعلم.

٢٢٧٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ تُقِمْهَا، تَكْسِرْهَا، وَإِنْ تَسْتَمْتِعْ بها، تَسْتَمْتِعْ وَفِيهَا عِوَجٌ».(٢)

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت وەکو پەراسو وایە (نەقس و خواری تیایە)، ئەگەر ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، ئەگەر چێژ و سودیشی لێ وەرگری، ئەوە چێژ و سوودی لێ وەردەگری لەکاتێکدا نەقسیشی تیایە.

## بابەت: دەربارەی مەنع کردنی منداڵ بوون

٢٢٧٤ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الْعَزْلِ؟ فَقَالَ: أَوَ تَفْعَلُونَ ذَلِكَ ؟ فَلاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا، فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ نَسَمَةٍ قَضَى اللهُ تَعَالَى أَنْ تَكُونَ إِلاَّ كَانَتْ».(٣)

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی مەنع کردنی منداڵ بوون؟ (پێغەمبەری خواش) فەرمووی: ئایا وادەکەن (واتە: موحاوەلەی مەنعیش دەکەن)؟ لەسەرتان واجب نیە کە مەنع نەکەن، چونکە هیچ نەفسێک نیە خوا بڕیاری دابێت ببێت حەتمەن دەبێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

٢٢٧٥ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ بِشْرٍ ﷺ، يَرُدُّ الْحَدِيثَ إِلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ الرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الْجَارِيَةُ فَيُصِيبُ مِنْهَا، وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ، أَفَيَعْزِلُ عَنْهَا؟ وَتَكُونُ عِنْدَهُ الْمَرْأَةُ تُرْضِعُ، فَيُصِيبُ مِنْهَا، وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ. أَفَيَعْزِلُ عَنْهَا؟ قَالَ: لاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا فَإِنَّمَا هُوَ الْقَدَرُ قَالَ ابْنُ عَوْنٍ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلْحَسَنِ فَقَالَ: وَاللهِ لَكَأَنَّ هَذَا زَجْرًا، وَاللهِ لَكَأَنَّ هَذَا زَجْرًا».(١)

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی بیشرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، فەرموودەکەی بۆ ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ پاڵداوە کە وتویەتی: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو هەیە جاریەیەکی لەلایە و لەگەڵی جووت دەبێت و پێی خۆش نیە دوو گیان ببێت، ئایا مەنعی منداڵی لێ بکات؟ فەرمووی: لەسەرتان واجب نیە مەنع نەکەن، چونکە ئەوە تەنها قەدەرە (واتە: ئەگەر خوا بیەوێ کەسێک لەدایک بێت، ئەوە هەر لەدایک دەبێت، ئەگەر نەشیەوێ کەسێک لەو ماوەیە بێتە دونیا ئەوە خۆتان ڕێگەی عەزل دەگرنەبەر، بە ئیزنی خوا و قەدەرەکە دێتەجێ).

ئیبنو عەون وتویەتی: جا من ئەوەم بۆ حەسەن باس کرد، ئەویش وتی: سوێند بەخوا ئەوە وەک سەرکۆنە کردن وایە، سوێند بەخوا ئەوە وەک سەرکۆنە کردن وایە (واتە: هەر چەندە مەنع کردنی حەرام نەکردوە، بەڵام پێی ناخۆش بووە کە نیەتتان وایە و پێتان وایە ڕووبەڕووی قەدەر دەبنەوە).

## بابەت: دەربارەی غیرەت

٢٢٧٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَيْسَ أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللهِ، لِذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ، وَلَيْسَ أَحَدٌ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللهِ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە لە خوا بە غیرەتتر بێت (واتە هیچ کەس نیە لە خوا سورتر بێت لەسەر سزا دانان بۆ خراپە و قبوڵ نەکردنی)، بۆیە خراپە و بەدڕەوشتی حەڕام کردوە، وە هیچ کەسێک نیە مەدح کردنی پێ خۆشتر بێت لە خوا.

٢٢٧٧ - «حَدَّثَنِي ابْنُ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ ﷺ، حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللهُ، وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللهُ: فَالْغَيْرَةُ الَّتِي يُحِبُّ اللهُ: الْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَالْغَيْرَةُ الَّتِي يُبْغِضُ اللهُ: الْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ».(٣)

واتە: لە ئیبنو جابری کوڕی عەتیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: غیرەت و توڕەبوون هەیە خوا پێی خۆشە، وە غیرەت و توڕەبوونیش هەیە خوا

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسن لغيره.

ڕقی لێیەتی: جا ئەو غیرەتەی کە خوا خۆشی دەوێت بریتیە لەو غیرەت و توڕەبوونەی کە لەسەر بینینی خراپەیە، وە ئەو غیرەت و توڕەبوونەش کە خوا پێی ناخۆشە بریتیە لەو غیرەت و توڕەبوونەی لەسەر بنەمای بینینی خراپە نەبێت (بەڵکو هەر تەنها لەسەر بنەمای گومان بردن و میزاج بێت).

٢٢٧٨ - «عَنْ الْمُغِيرَةِ ﷺ، قَالَ: بَلَغَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ يَقُولُ: لَوْ وَجَدْتُ مَعَهَا رَجُلاً لَضَرَبْتُهَا بِالسَّيْفِ، غَيْرَ مُصْفَحٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَعْجَبون مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ، أَنَا أَغْيَرُ مِنْ سَعْدٍ، وَاللهُ أَغْيَرُ مِنِّي، وَلِذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا، وَمَا بَطَنَ. وَلاَ شَخْصَ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ، وَلاَ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنَ الْمَعَاذِيرِ، وَلِذَلِكَ بَعَثَ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ. وَلاَ شَخْصَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللهِ، وَلِذَلِكَ وَعَدَ الْجَنَّةَ» [1].

واتە: لە موغیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گەیشت کە سەعدی کوڕی عوبادە وتویەتی: ئەگەر پیاوێک لەگەڵ خێزانم ببینم ئەوە بە شمشێر دەیپێکم (بە ڕووە تیژەکەی) نەک بە ڕووە پانەکەی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا سەرسامن بە غیرەتی سەعد؟ من لە سەعد بە غیرەت ترم، خواش لە من بەغیرت ترە، هەر بۆیەش هەموو بێ ڕەوشتییەکی ئاشکرا و پەنهانی حەڕام کردوە، هیچ کەسێک لە خوا بەغیرت تر نیە، وە هیچ شتێکی لا خۆشەویست تر نیە لە داوای لێبوردن و تەوبە، هەر بۆیەش پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوە بە موژدەدەرو ترسێنەر، وە هیچ کەسێک مەدح و ستاییشی لا خۆشەویست تر نیە لە خوا، هەر بۆیەش بەڵێنی بەهەشتی داوە.

تێبینی: کە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت خوا و پێغەمبەرەکەی لە سەعد بە غیرەت ترن واتای ئەوە نیە بە هەمان حوکم ڕازی بن، چونکە ئەگەر پیاوەکە کوڕ بێت و خێزاندار نەبێت کوشتنی لەسەر نیە، بەڵکو جەڵدی لەسەرە، بۆیە مەبەستی پێغەمبەری خوا بەوەی خواو پێغەمبەر لە سەعد بە غیرەت ترن ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەر ڕێگە نادەن بە خراپە و بەد ڕەوشتی و ڕقیان لە بەد ڕەوشتیە بە هەموو جۆرەکانی، وەک چۆن سەعدیش ڕقی لێیەتی.

## بابەت: دەربارەی هەق و مافی پیاو لەسەر خێزان

٢٢٧٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ هَاجِرَةً لِفِرَاشِ زَوْجِهَا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تَرْجِعَ» [2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کاتێ ئافرەت شەو تا بەیانی خۆی لە پێخەفی مێردی دوور دەگرێت (ناهێڵێت لەگەڵی جووت بێت)، ئەوە فریشتەکان نەفرەتی لێ دەکەن تاوەکو دەگەڕێتەوە (سەر پێخەفی مێردەکەی و خۆی تەسلیم دەکات).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی لیعان (كاتێ ژن خۆی لە مێرد دوور دەگرێ)

٢٢٨٠ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ عُوَيْمِرًا الْعَجْلاَنِيَّ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَيَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ أَنْزَلَ اللهُ فِيكَ، وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا قَالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ تَلاَعُنِهِمَا قَالَ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَتْ تِلْكَ بَعْدُ سُنَّةَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ».[١]

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە عوەیمیری عەجلانی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێی دەربارەی پیاوێک كە لەگەڵ ئافرەتەكەی خۆی پیاوێک دەبینێت (واتە: لە كاتی جووت بووندا)، ئایا پیاوەكە بكوژێت و دواییش (خزمی پیاوە كوژراوەكەش) كابرا بكوژنەوە، یان چی بكات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا دەربارەی تۆ و خێزانەكەت ئایەتی دابەزاندووە، برۆ خێزانەكەت بێنە، سەهل دەڵێت: مولاعەنەیان كرد، منیش لەگەڵ خەڵكی بووم لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا كە تەواو بوون لە مولاعەنەكەیان، پیاوەكە وتی: دەكا من درۆم بەسەرەوە كردوە و بوختانم پێ كردوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیهێڵمەوە و تەڵاقی نەدەم، بۆیە تەڵاقیدا پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ بكات، ئیبنو شیهاب وتویەتی: ئەوە دواتر بوو بە شێوازی مولاعەنەكارەكان.

٢٢٨١ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ عُوَيْمِرًا أَتَى عَاصِمَ بْنَ عَدِيٍّ وَكَانَ سَيِّدَ بَنِي عَجْلاَنَ فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ طَلَّقَهَا ثَلاَثًا».[٢]

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە عوەیمیر هات بۆ لای عاصمی كوڕی عەدی كە گەورەی بەنی عەجلان بوو، هەمان فەرموودەكەی پێشتری باس كرد، (بەڵام) باسی ئەوەی نەكرد كە بە سێ تەڵاق تەڵاقی داوە.

٢٢٨٢ - «أَنبأَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، يَقُولُ: سُئِلْتُ عَنِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ فِي إِمَارَةِ مُصْعَبِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ فَمَا دَرَيْتُ مَا أَقُولُ. قَالَ: فَقُمْتُ حَتَّى أَتَيْتُ مَنْزِلَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، فَقُلْتُ لِلْغُلاَمِ: اسْتَأْذِنْ لِي عَلَيْهِ. فَقَالَ: إِنَّهُ قَائِلٌ لاَ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَدْخُلَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَسَمِعَ ابْنُ عُمَرَ صَوْتِي، فَقَالَ ابْنُ جُبَيْرٍ: فَقُلْتُ: نَعم. فَقَالَ: ادْخُلْ، فَمَا جَاءَ بِكَ هَذِهِ السَّاعَةَ إِلاَّ حَاجَةٌ. قَالَ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْتُهُ، وَهُوَ مُفْتَرِشٌ بَرْذَعَةَ رَحْلِهِ، مُتَوَسِّدٌ مِرْفَقَةً - أَوْ قَالَ: نُمْرُقَةً شَكَّ عَبْدُ اللهِ، حَشْوُهَا لِيفٌ ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُتَلاَعِنَانِ، أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ، نَعم، إِنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ فُلاَنٌ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْكَ ، أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ أَحَدَنَا رَأَى امْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ، كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إِنْ سَكَتَ،

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

سَكَتَ عَلَى أَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ تَكَلَّمَ فَمِثْلُ ذَلِكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَلَمْ يُجِبْهُ، فَقَامَ لِحَاجَتِهِ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ، أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ الَّذِي سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدِ ابْتُلِيتُ بِهِ. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ الَّتِي فِي سُورَةِ النُّورِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور، حَتى ختم هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ، قَالَ: فَدَعَا الرَّجُلَ فَتَلَاهُنَّ عَلَيْهِ، وَذَكَّرَهُ بِاللهِ، وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، فَقَالَ: مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا، ثُمَّ دَعَا الْمَرْأَةَ فَوَعَظَهَا وَذَكَّرَهَا، وَأَخْبَرَهَا أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، فَقَالَتْ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ. فَدَعَا الرَّجُلَ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ أُتِيَ بِالْمَرْأَةِ فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا».(١)

واتە: لە عەبدولمەلیکی کوڕی سولەیمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر بوو دەیوت: لە سەردەمی کاربەدەستبوونی موصعەبی کوڕی زوبەیر ﷺ پرسیارم لێکرا دەربارەی ئەو دوو هاوسەرەی لیعان دەکەن: کە ئایا لێک جیا دەکرێنەوە؟ جا نەمزانی چی بڵێم، دەڵێ: هەڵسام ڕۆیشتم تاوەکو هاتم بۆ ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و بە خزمەتکارەکەم وت: مۆڵەتم بۆ وەرگرە بچمە لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، خزمەتکارەکەش وتی: ئەو خەوتووە ناتوانی بچیتە لای، دەڵێ: جا ئیبنو عومەر گوێی لە دەنگم بوو وتی: ئیبنو جوبەیرە؟ منیش وتم: بەڵێ، وتی: وەرە ژوورەوە، هیچ شتێک لەو کاتەدا تۆی نەهێناوە کارێک و پێویستییێک نەبێت، دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای و بینیم پاڵکەوتووە و بەرگی کورتانی وڵاغەکەی ڕاخستووە و سەری کردوە بە سەرینێکی بچکۆڵە کە توێکڵی دار خورمای تیا بوو، منیش وتم: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان: ئایا ئەو دوو هاوسەرەی لیعان دەکەن لێک جیادەکرێنەوە؟ وتی: پاک و بێگەردی بۆ خوا، بەڵێ (لێک جیادەکرێنەوە)، یەکەم کەس کە پرسیاری دەربارەی ئەوە کرد فڵانە کەس بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕات چیە ئەگەر یەکێک لە ئێمە خێزانەکەی خۆی بینی لەسەر کاری بەدڕەوشتی، چی بکات؟ ئەگەر بێ دەنگ بێت ئەوە بێ دەنگ بووە لەسەر کارێکی گەورە و ناڕەوا، وە ئەگەر قسەش دەکات بە هەمان شێوە (هەر گەورەیە و حەیای دەچێت و ڕەنگە کوشت و کوشتار ڕووبدات)؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو و وەڵامی نەدایەوە و هەڵسا بۆ کاری خۆی، جا دواتر (جارێکی تر) هاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی پرسیارم دەربارە لێ کردی پێیەوە گیرۆدە بووم، دەڵێ: جا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی دابەزاند لە سووڕەتی (النور): ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: ((ئەوانەی کە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیان، هیچ شایەتێکیشیان نیە

---

(١) ـ صحیح

جگە لە خۆیان، شایەتی ئەو جۆرە کەسانە بەوە دەبێت کە چوار جار سوێند بە خوا بخوات کە بێ گومان لە ڕاستگۆیانە و (بە چاوی خۆی تاوانەکەی بینیوە)، پێنجەم جاریش بڵێت: بەڕاستی نەفرینی خوام لەسەرە ئەگەر بوختانچی بم و لە درۆزنان بم، (لە لایەکی تریشەوە) سزا لەسەر ژنەکە لادەبرێت کاتێ کە چوار جار سوێند بە خوا دەخوات کە مێردەکەی درۆ دەکات و (بوختانی بۆ هەڵدەبەستێت)، پێنجەم جار ژنەکە دەڵێت خەشم و قینی خوام لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەم ڕاست بکات)). تاوەکو ئەم ئایەتانەی تەواو کرد (بۆی خوێندەوە).

دەڵێ: جا پیاوەکەی بانگ کرد و ئایەتەکانی بەسەردا خوێندەوە و خوای هێنایەوە یاد (تاوەکو پەشیمان بێتەوە ئەگەر بوختانی کردبێت)، وە هەواڵی پێدا کە سزای دونیا (کە هەشتا جەڵدە لێدانە ئەگەر بوختانی کردبێت) سوکترە لە سزای دواڕۆژ، پیاوەکەش وتی: درۆ و بوختانم بەسەر هەڵنەبەستاوە، دواتر بانگی ئافرەتەکەی کرد و ئامۆژگاری کرد و خوای هێنایەوە یاد و هەواڵی پێدا کە سزای دونیا (کە ڕەجمە ئەگەر زینای کردبێت) سوکترە لە سزای دواڕۆژ، ئافرەتەکەش وتی: سوێند بەوەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە ئەو درۆ دەکات، جا بانگی پیاوەکەی کرد و چوار جار سوێندی بەخوا خوارد کە لە ڕاستگۆیانە، پێنجەم جاریش وتی: نەفرینی خوام لەسەر بێت ئەگەر لە درۆزنان بم، دواتر ئافرەتەکە هێنرا و چوار جار سوێندی بەخوا خوارد کە پیاوەکەی لە درۆزنانە، پێنجەم جاریش وتی: خەشم و قینی خوام لەسەرە ئەگەر پیاوەکەم لە ڕاستگۆیان بێت، دواتر لێکی جیاکردنەوە.

٢٢٨٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: فَرَّقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِأُمِّهِ».(١)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوو هاوسەرانەی لێک جیا دەکردەوە کە لیعانیان دەکرد و، نەفرینیان لە یەکتری دەخوارد، منداڵەکەشی دەدا بە دایکی.

## بابەت: دەربارەی ئەو بەندەیەی کە هاوسەرگیری دەکات بێ پرسی گەورەکەی

٢٢٨٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ أَوْ أَهْلِهِ، فَهُوَ عَاهِرٌ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابر بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک هاوسەرگیری بکات بەبێ پرس و ئاگاداری گەورەکەی، یان خانەوادەکەی، ئەوە زیناکەرە (واتە: هاوسەرگیریەکەی دانامەزرێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

٢٢٨٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَهُوَ زَانٍ».[١]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: هەر بەندەیەک هاوسەرگیری بکات بەبێ پرس و ئاگاداری گەورەکەی، ئەوە زیناکەرە (واتە: هاوسەرگیریەکەی دانامەزرێت).

## بابەت: منداڵ هی خاوەنی سەرجێ و پێخەفی (شەرعیە)

٢٢٨٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَرْفَعُهُ[٢] قَالَ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ».[٣]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵ هی خاوەنی سەرجێ و پێخەفی شەرعیە (واتە: هی ئەو پیاوەیە کە خێزانی شەرعی هەبێت و سەرجێیی شەرعی کردبێت)، وە پیاوی داوێن پیسیش بەردی بۆ هەیە (واتە: هیچی بۆ نیە، منداڵی زینا نابێتە هی ئەو، چونکە ژنەکە حەڵاڵی خۆی نیە بۆیە نەسەب وەرناگرێ).

٢٢٨٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ».[٤]

واتە: لە دایکمان عائیشەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەری ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: منداڵ هی خاوەنی سەرجێ و پێخەفی شەرعیە (واتە: هی ئەو پیاوەیە کە خێزانی شەرعی هەبێت و سەرجێیی شەرعی کردبێت، نەوەک بەهۆی زینا پەیدای کردبێت).

٢٢٨٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ عُتْبَةُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، أَنْ يَقْبِضَ إِلَيْهِ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ، فَقَالَ عُتْبَةُ: إِنَّهُ ابْنِي فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ زَمَنَ الْفَتْحِ أَخَذَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ، فَإِذَا هو أَشْبَهُ النَّاسِ بِعُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ: هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِيهِ، وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: احْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ مِمَّا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَسَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ».[٥]

واتە: لە عائیشەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەری ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاس بەڵێنی لە برای کە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسە وەرگرت کە منداڵی ناو سکی زەمعە بهێنێت بۆ لای خۆی (واتە: بیکات بە برازای خۆی، چونکە زەمعە کۆیلە بوو و کوڕێکی هەبوو بەناوی (عەبد)، وە

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ يرفعه: واتە: بەرزی کردۆتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

عوتبەی برای سەعد لەگەڵی جووت ببوو، جا پێی وابوو منداڵەکە کوڕی خۆی حیسابە و دوای مردنی خۆی دەبێ بەناوی ئەو بانگ بکرێت)، عوتبە بە سەعدی وت: ئەوە کوڕی منە، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە کاتی ئازادکردنی مەککە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس منداڵە تازە لەدایکبووەکەی زەمعەی برد، جا لە هەموو خەڵکی زیاتر لە عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاس دەچوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بۆ تۆیە ئەی عەبدی کوڕی زەمعە (واتە: برای تۆیە نەک کوڕی عوتبە)، بە هۆکاری ئەوەی لەسەر پێخەفی باوکی لەدایک بووە (نەک هی عوتبە)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی سەودە خۆت بەرانبەری داپۆشە لەبەر ئەوەی بینی شێوەی لە عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاس دەچێت، سەودەش کچی زەمعە بوو.

## بابەت: هەر کەسێک نکوولی بکات لە کوڕەکەی بشزانێ کوڕی خۆیەتی

٢٢٨٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: حِينَ أُنْزِلَتْ آيَةُ الْمُلَاعَنَةِ أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ نَسَبًا لَيْسَ مِنْهُمْ، فَلَيْسَتْ مِنَ اللهِ فِي شَيْءٍ، وَلَن يُدْخِلَهَا اللهُ جَنَّتَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ، وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ احْتَجَبَ اللهُ مِنْهُ، وَفَضَحَهُ عَلَى رُءُوسِ الأَوَّلِينَ، وَالآخِرِينَ قَالَ عَبْدُ اللهِ: قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ كَعْبٍ الْقُرَظِيُّ وَسَعِيدٌ: يُحَدِّثَهُ بِهِ بِهَذا، وَقَدْ بَلَغَنِي هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێ ئایەتی مولاعەنە دابەزێنرا دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک نەسەبێک (منداڵێک) بخاتە سەر خەڵکانێک کە لەوان نەبێت، ئەوە هیچی لەلای خوا بۆ نیە و خواش نایخاتە بەهەشتەکەیەوە، وە هەر کەسێکیش ئینکاری منداڵەکەی خۆی بکات لەکاتێکدا سەیری دەکات (واتە: زۆر بەرچاوە و باش باش ڕوونە و دەزانێ منداڵی خۆیەتی)، ئەوە خوا خۆی پێ نیشان نادات و، ڕیسوای دەکات لەبەر چاوی هەموو خەڵکانی پێشوو و دوایی (واتە: لەبەر چاوی گشت مرۆڤەکان).

عەبدوڵڵا وتویەتی: موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظي و سەعید ئەوەیان بۆ گێڕاوەتەوە، وە ئەم فەرمودەیەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێ گەیشتووە.

## بابەت: ئەو پیاوەی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنی باوکی دەکات

٢٢٩٠ - «عَنْ يَزِيدَ بْنِ الْبَرَاءِ ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: لَقِيتُ عَمِّي وَمَعَهُ رَايَةٌ، فَقُلْتُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةَ أَبِيهِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ، وَآخُذَ مَالَهُ».[٢]

واتە: لە یەزیدی کوڕی بەرڕائەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: بە مامم گەیشتم ئاڵایێکی پێ بوو، منیش وتم: دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

ناردومی بۆ لای پیاوێک کە هاوسەرگیری لەگەڵ خێزانی باوکی کردوە (واتە: زڕ دایکی خۆی هێناوە)، جا فەرمانی پێ کردووم کە لە گەردەنی بدەم (بیکوژم) و، ماڵەکەشی بێنم (دەستی بەسەردا بگرین).

## بابەت: دەربارەی فەرمایشتی خوا عزَّ وجلَّ: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ ۝٥٢﴾ الأحزاب

٢٢٩١ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ رَجُلٍ، مِنَ الأَنْصَارِ ﷺ يُسَمَّى زِيَادًا قَالَ: قُلْتُ: لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ مُتْنَ كَانَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَتَزَوَّجَ؟ قَالَ: نَعم، إِنَّمَا أَحَلَّ اللهُ لَهُ ضَرْبًا مِنَ النِّسَاءِ، وَوَصَفَ لَهُ صِفَةً، فَقَالَ: لاَ يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ بَعْدُ، مِنْ بَعْدِ هَذِهِ الصِّفَةِ».[١]

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو مووسا گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی ئەنصاریەکانی ﷺ گێڕاوەتەوە، کە پێی دەوترا زیاد، وتی: بە ئوبەی کوڕی کەعبم وت: چی دەڵێی ئەگەر خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفات بکەن و بمرن، ئایا بۆی حەڵاڵ و دروستە ژن بهێنێت؟ وتی: بەڵێ: بەڵام خوا تەنها جۆرێک لە ئافرەتانی بۆ حەڵاڵ کردوە و سیفەتەکەی بۆ باس کردوە (کە دەبێ چۆن بێت) و فەرموویەتی: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ ۝٥٢﴾الأحزاب، واتە: [دوای ئەوە و جگە لەو ئافرەتانەت بۆ حەڵاڵ نیە] واتە: جگە لەو سیفەتە (واتە: سیفەتی ئافرەتەکانی بۆ باس کراوە و ئنجا پێی وتراوە جگە لەمانەت بۆ حەڵاڵ نیە).

٢٢٩٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى أَحَلَّ اللهُ لَهُ أَنْ يَتَزَوَّجَ مِنَ النِّسَاءِ مَا شَاءَ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی نەکرد تاوەکو خوا بۆی حەڵاڵ کرد کە هاوسەرگیری لەگەڵ هەر ئافرەتێک بکات کە بیەوێت.

## بابەت: دەربارەی ئافرەتی کۆیلە کە ئازادکردنەکەی ببێتە مارەییەکەی

٢٢٩٣ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا».[٣]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) ئازاد کرد و (هاوسەرگیری لەگەڵ کرد) و ئازادکردنەکەشی کرد بە مارەییەکەی.

٢٢٩٤ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، وَتَزَوَّجَهَا، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا».[٤]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) ئازاد کرد و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد و ئازادکردنەکەشی کرد بە مارەییەکەی.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

## بابەت: پاداشت و گەورەیی ئەو کەسەی ئافرەتێکی کۆیلە ئازاد دەکات و دواتر دەیکاتە هاوسەری خۆی

٢٢٩٥ - «عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحِ بْنِ حَيِّ الْهَمْدَانِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ الشَّعْبِيِّ فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو إِنَّ مَنْ قِبَلَنَا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ يَقُولُونَ: فِي الرَّجُلِ إِذَا أَعْتَقَ أَمَتَهُ، ثُمَّ تَزَوَّجَهَا، فَهُوَ كَالرَّاكِبِ بَدَنَتَهُ؟ فَقَالَ الشَّعْبِيُّ: حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ، ثُمَّ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ، وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَّاهَا، فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا، وَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، فَأَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ ثُمَّ قَالَ لِلرَّجُلِ: خُذْ هَذَا الْحَدِيثَ بِغَيْرِ شَيْءٍ، فَقَدْ كَانَ يُرْحَلُ فِيمَا دُونَ هَذَا إِلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ هُشَيْمٌ: أَقَادُونِي بِالْبَصْرَةِ فَأَتَيْتُهُ، فَسَأَلْتُهُ عَنْهُ؟».[١]

واتە: لە ساڵحی کوڕی ساڵحی کوڕی حەیی هەمدانیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای شەعبی بووم، جا پیاوێکی خەڵکی خۆڕاسان هات و وتی: ئەی باوکی عەمر، ئەوەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە لە خەڵکی خۆڕاسان دەربارەی ئەو پیاوەی کە ئافرەتە کۆیلەکەی خۆی ئازاد دەکات و دواتر دەیکاتە هاوسەری خۆی دەڵێن: ئەو کەسە وەک ئەوە وایە سواری وشترەکەی خۆی بوبێت، شەعبیش وتی: ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسا لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن دوو جار پاداشتیان دەدرێتەوە: (یەکەمیان): پیاوێک لە ئەهلی کیتاب بێت و بڕوای بە پێغەمبەرەکەی هێنابێ، دواتر بە پێغەمبەری خوا ﷺ موحەممەد گەیشتبێت و بڕوای پێ هێنابێت و شوێنی کەوتبێت، (دووەمیان): بەندەیەکە هەقی خوا و هەقی گەورەکانی بدات، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، (سێیەمیان): پیاوێکە بەندەیەکی ئافرەتی هەیە و نانی دەدات بە شێوەیەکی چاک و جوان، وە پەروەردەی دەکات بە پەروەردەیەکی جوان و ئازادی دەکات و دەیکات بە هاوسەری خۆی، ئەوە دوو پاداشتی هەیە.

دواتر بە پیاوەکەی وت: ئەو فەرموودەیە وەرگرە بێ هیچ (زەحمەت و ماندوبوونیک و پارەیەک)، (جا نرخی ئەم فەرمودەیە بزانە) بە دڵنیایی بارگە دەپێچرێتەوە و سەفەر دەکرێت لە پێناوی ئەم فەرموودەیە بۆ مەدینە.

هوشەیم وتویەتی: وتم: بەصرەم پێ نیشان بدەن، جا چووم بۆ بەصرە و پرسیارم دەربارەی ئەم فەرموودەیە کرد.

٢٢٩٦ - «أَخْبَرَنَا سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ صَالِحِ بْنِ حَيٍّ، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَ هَذَا الْحَدِيثِ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو پیاوەی ئافرەتێک مارەدەکات و دەمرێت پێش ئەوەی مارەیی بۆ دیاری بکات

٢٢٩٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، فِي رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَكُنْ فَرَضَ لَهَا شَيْئًا، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، وَمَاتَ عَنْهَا، قَالَ فِيهَا: لَهَا صَدَاقُ نِسَائِهَا، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، قَالَ مَعْقِلٌ الأَشْجَعِيُّ: قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي رُؤَاسٍ بِمِثْلِ مَا قَضَيْتَ قَالَ: فَفَرِحَ بِذَلِكَ، قَالَ مُحَمَّدٌ: وَسُفْيَانُ نَأْخُذُ بِهَذَا».[١]

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێردراوەتەوە دەربارەی پیاوێک کە ئافرەتێکی مارە کردبێت و هیچ مارەیێکیشی بۆ دیاری نەکردبێت و لەگەڵیشی جووت نەبوبێت و مردبێت، دەربارەی ئافرەتەکە وتویەتی: مارەیی ئافرەتانی هاوشێوەی خۆی بۆ هەیە (یان هاوشێوەی مارەیی ئافرەتانی خزم و کەسی بۆ هەیە)، وە عیددەشی لەسەرە، وە میراتیشی بۆ هەیە (میرات لە پیاوەکە دەگرێت)، مەعقیلی ئەشجەعی وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بیروەعی کچی واشیق کە ئافرەتێک بوو لە بەنی ڕواس هەمان بڕیار و حوکمی تۆی دا، دەڵێ: عەبدوڵلا دڵی زۆر بەوە خۆش بوو (کە ئیجتیهاد و فەتواکەی لەگەڵ حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکی گرتوتەوە.

موحەممەد و سوفیانیش وتویانە: ئەوە وەردەگرین (بۆ کار پێ کردن و فەتوادان).

## بابەت: ئەوەی بەهۆی شیرخواردنەوە حەڕام دەبێت

٢٢٩٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، أَنَّهَا كَانَتْ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، فَسَمِعَتْ صَوْتَ إِنْسَانٍ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ سَمِعْتُ صَوْتَ إِنْسَانٍ فِي بَيْتِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أُرَاهُ فُلاَنًا لِعَمِّ حَفْصَةَ، مِنَ الرَّضَاعَةِ قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَلَوْ كَانَ فُلاَنٌ حَيًّا لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، دَخَلَ عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعم. يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: خۆی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووە و گوێی لە دەنگی کەسێک بوو لە ژوورەکەی حەفصە (رَضِي اللهُ عَنْهَا)، دەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لە دەنگی کەسێکە لە ماڵەکەت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پێم وایە فلانە، مامی شیری حەفصەیە، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر فلان کەس زیندووبووایە، واتە: مامی شیری عائیشە، ئەوە دروست بوو بێتە لام؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، مرۆڤ حەڕام دەبێت بەهۆی شیرخواردنەوە، وەک چۆن حەڕام دەبێت بە هۆی لە دایک بوون.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

٢٢٩٩ - «أنبأَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ عَمَّهَا أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ، جَاءَ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهَا بَعْدَمَا ضُرِبَ الْحِجَابُ، فَأَبَتْ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ حَتَّى يَأْتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَسْتَأْذِنَهُ، فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ ذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَتْ: جَاءَ عَمِّي أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ فَرَدَدْتُهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَكَ. قَالَ: أَوَ لَيْسَ بِعَمِّكِ؟ قَالَتْ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ، وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ. فَقَالَ: إِنَّهُ عَمُّكِ فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ فَقَالَتْ: وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ.».[١]

واتە: لە هیشامی کوڕی عورۆەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) بۆی گێڕامەوە کە برای ئەبو قوعەیسی مامی هاتووە بۆ لای و داوای لێ کردوە مۆڵەتی بدات بچێتە ژوورەوە بۆ لای، پاش ئەوەی حیجاب و پەردە و بەردەست واجب کرا (لە نێوان خەڵکی بێگانە و خێزانەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ)، جا عائیشە ڕازی نەبوو و ڕێگەی نەدا، وتی: تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دێت و مۆڵەتی لێ وەردەگرم (کە ئایا دروستە یان نا)، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هات ئەوەی بۆ باس کرد و وتی: مامم برای ئەبو قوعەیس هاتبوو، منیش گەڕاندمەوە تاوەکو مۆڵەت لە تۆ وەردەگرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەگەر مامت نیە؟ عائیشە وتی: ژنەکە شیری داومەتێ خۆ پیاو شیری نەداومەتێ (واتە: چۆن تەنها لە ڕێگەی شیر خواردنی ژن دەبێتە مامم)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە مامتە با بێتە ژوورەوە بۆ لات، دەڵێ: جا عائیشە دەیوت: مرۆڤ حەڕام دەبێت بە هۆی شیر خواردنەوە وەک چۆن حەڕام دەبێت بە هۆی لە دایک بوون.

٢٣٠٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: مرۆڤ حەڕام دەبێت بەهۆی شیر خواردنەوە وەک چۆن حەڕام دەبێت بەهۆی لەدایک بوون.

٢٣٠١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ».[٣]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: چەند جار شیر خواردن دەبێتە هۆی لێک حەڕامبوون

٢٣٠٢ - «عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ».[٤]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: مژێک و دوو مژ مرۆڤ لێک حەڕام ناکات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ اسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

۲۳۰۳ - «عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي قَدْ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، وَعِنْدِي أُخْرَى، فَزَعَمَتِ الْأُولَى أَنَّهَا أَرْضَعَتِ الْحُدْثَى، فَقَالَ: لاَ تُحَرِّمُ الْإِمْلاَجَةُ، وَلاَ الْإِمْلاَجَتَانِ».[1]

واتە: لە ئوممول فەزلەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئافرەتێکم خواستووە، خێزانێکی تریشم هەیە، جا ئافرەتی یەکەمم دەڵێت (بە بچوکی) شیرم داوە بە ئافرەتە نوێیەکە (جا حوکممان چیە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مژێک و دوو مژ حەڕامی دروست ناکات (ئەگەر ئەوەندە بێت لێت حەڕام نابێت).

۲۳۰٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: نَزَلَ الْقُرْآنُ بِعَشْرِ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ، وَهُنَّ مِمَّا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ».[2]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئایەتی قورئان دابەزی بەوەی دە مژ شیرخواردن مرۆڤ لێک حەڕام دەکات، دواتر ئەم ئایەتە حوکم و خوێندنەوەکەی سڕایەوە (کرا) بە پێنج مژی ڕوون و ئاشکرا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد (هێشتا هەندێک نەیانزانی بوو ئەم ئایەتە خوێندنەوەکەی نەماوە) هەر لە قورئاندا دەخوێندرایەوە.

## بابەت: ئەو شتەی هەق و مافی شیردانی پێ دەدرێت

۲۳۰٥ - «عَنْ حَجَّاجِ بْنِ حَجَّاجٍ الأَسْلَمِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا يُذْهِبُ عَنِّي مَذَمَّةَ الرَّضَاعِ، قَالَ: الْغُرَّةُ الْعَبْدُ، أَوِ الأَمَةُ».[3]

واتە: لە حەججاجی کوڕی حەججاجی ئەسلەمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ شتێک هەق و مافی شیردان دەدات (واتە: بەچی پاداشتی شیردەر بدەمەوە)؟ فەرمووی: شایستەکە و (پاداشتەکە) بریتیە لە بەندەیەک جا پیاو بێت یان ئافرەت (واتە: بەندەیەک یان خزمەتکارێکی پیاو یان ئافرەتی بۆ بکڕە، واتە: چۆن ئەو تۆی خزمەت کردوە تۆش ئاوا ئەو خزمەت بکەوە).

## بابەت: شاهێدیدانی یەک ئافرەت لەسەر شیرخواردن

۲۳۰٦ - «عن أبي مليكة، قال: حَدَّثَنِي عُقْبَةُ بْنُ الْحَارِثِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: لَمْ يُحَدِّثْنِيهِ وَلَكِنْ سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، قَالَ: تَزَوَّجْتُ بِنْتَ أَبِي إِهَابٍ فَجَاءَتْ أَمَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَرْضَعْتُكُمَا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَأَعْرَضَ عَنِّي، قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: قَالَ: فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ، قَالَ: كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟: وَنَهَاهُ عَنْهَا، قَالَ

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

أَبُو عَاصِمٍ: وقَالَ عَمْرُو بْنُ سَعِيدِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ: عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ فَكَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟: وَلَمْ يَقُلْ نَهَاهُ عَنْهَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: كَذَا عِنْدَنَا».(١)

واتە: لە ئەبو مولەیکەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ بۆی گێڕامەوە، دواتر (لەبەر ئەمانەتی زانستی) وتی: بۆ منی باس نەکرد، بەڵکو گوێم لێی بوو بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە وتی: کچی ئەبو ئیهابم خواست، جا ئافرەتێکی ڕەش پێست هات و وتی: من شیرم بە هەردووکتان داوە، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش گوێی پێ نەدام، ئەبو عاصیم دەڵێ: لە جاری سێیەم یان چوارەم فەرمووی: چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەیت لەکاتێکدا ئاوا وتراوە؟ وە حەرامی کرد بیکاتە هاوسەری.

ئەبو عاصیم وتویەتی: عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی حوسەین، لە ئەبو مولەیکەوە گێڕدراوەتەوە (کە ئەوەی لە فەرموودەکەدا هەیە کە دەڵێ): چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەیت لەکاتێکدا ئاوا وتراوە؟ بەڵام ئەوەی نەوت (کە دەڵێت): حەرامی کرد بیکاتە هاوسەری (واتە ڕیوایەتێکیان ئەم ڕستەیەی کەمترە).

## بابەت: دەرباری شیردان بە کەسی گەورە

٢٣٠٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا، وَعِنْدَهَا رَجُلٌ فَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ، وَكَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ، فَقُلْتُ: إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ فَقَالَ: انْظُرْنَ مَا إِخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ».(٢)

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای (واتە: هاتە ژوورەکەی)، لەکاتێکدا پیاوێکی لەلا بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی تێک چوو، وەک بڵێی پێی باش نەبوو ئەو پیاوە لەوێیە، (عائیشە دەڵێت): منیش وتم: ئەوە برای شیریمە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دیقەتدەن بزانن کێ براتانن، شیر خواردن لە برسیەتیەوەیە (واتە: ئەو شیر خواردنە مرۆڤ دەکات بە خوشک و برا و کەسەکان لێک حەرام دەکات کە بدرێت بە منداڵێک کە تەنها بە شیر تێر ببێت و نەتوانێ چێشت و شتیتر بخوات، واتە: تەمەنی لە دوو ساڵ زیاتر نەبێت).

٢٣٠٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو وَكَانَتْ تَحْتَ أَبِي حُذَيْفَةَ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ سَالِمًا مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَأَنَا فُضُلٌ، وَإِنَّمَا نَرَاهُ وَلَدًا، وَكَانَ أَبُو حُذَيْفَةَ تَبَنَّاهُ كَمَا تَبَنَّى النَّبِيُّ ﷺ زَيْدًا، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ أَنْ تُرْضِعَ سَالِمًا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هَذَا لِسَالِمٍ خَاصَّةً».(٣)

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

أَبُو عَاصِمٍ: وقَالَ عَمْرُو بْنُ سَعِيدِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ: عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ فَكَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟: وَلَمْ يَقُلْ نَهَاهُ عَنْهَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: كَذَا عِنْدَنَا».[١]

واتە: لە ئەبو مولەیکەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ بۆی گێڕامەوە، دواتر (لەبەر ئەمانەتی زانستی) وتی: بۆ منی باس نەکرد، بەڵکو گوێم لێی بوو بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە وتی: کچی ئەبو ئیهابم خواست، جا ئافرەتێکی ڕەش پێست هات و وتی: من شیرم بە هەردووکتان داوە، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش گوێی پێ نەدام، ئەبو عاصیم دەڵێ: لە جاری سێیەم یان چوارەم فەرمووی: چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەیت لەکاتێکدا ئاوا وتراوە؟ وە حەڕامی کرد بیکاتە هاوسەری.

ئەبو عاصیم وتویەتی: عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی حوسەین، لە ئەبو مولەیکەوە گێردراوەتەوە (کە ئەوەی لە فەرموودەکەدا هەیە کە دەڵێ): چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەیت لەکاتێکدا ئاوا وتراوە؟ بەڵام ئەوەی نەوت (کە دەڵێت): حەڕامی کرد بیکاتە هاوسەری (واتە ڕیوایەتێکیان ئەم ڕستەیەی کەمترە).

## بابەت: دەرباری شیردان بە کەسی گەورە

٢٣٠٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا، وَعِنْدَهَا رَجُلٌ فَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ، وَكَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ، فَقُلْتُ: إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ فَقَالَ: انْظُرْنَ مَا إِخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ».[٢]

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای (واتە: هاتە ژوورەکەی)، لەکاتێکدا پیاوێکی لەلا بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی تێک چوو، وەک بڵێی پێی باش نەبوو ئەو پیاوە لەوێیە، (عائیشە دەڵێت): منیش وتم: ئەوە برای شیریمە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دیقەتدەن بزانن کێ براتانن، شیر خواردن لە برسیەتیەوەیە (واتە: ئەو شیر خواردنە مرۆڤ دەکات بە خوشک و برا و کەسەکان لێک حەڕام دەکات کە بدرێت بە منداڵێک کە تەنها بە شیر تێر ببێت و نەتوانێ چێشت و شتیتر بخوات، واتە: تەمەنی لە دوو ساڵ زیاتر نەبێت).

٢٣٠٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو وَكَانَتْ تَحْتَ أَبِي حُذَيْفَةَ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ سَالِمًا مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَأَنَا فُضُلٌ، وَإِنَّمَا نَرَاهُ وَلَدًا، وَكَانَ أَبُو حُذَيْفَةَ تَبَنَّاهُ كَمَا تَبَنَّى النَّبِيُّ ﷺ زَيْدًا، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ أَنْ تُرْضِعَ سَالِمًا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هَذَا لِسَالِمٍ خَاصَّةً».[٣]

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەهلەی کچی سوهەیلی کوڕی عەمرٍ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە ژێر نیکاحی ئەبو حوذەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بوو (خێزانی ئەو بوو)، (هات) و وتی: سالمی خزمەتکاری ئەبو حوذەیفە دێتە ژوورەوە بۆ لامان و، منیش زۆر جل دەگۆڕم، ئێمەش تەنها بە چاوی منداڵی خۆمان سەیری دەکەین، (چونکە) ئەبو حوذەیفە کردوویەتی بە کوڕی خۆی، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ زەیدی کردوە بە کوڕی خۆی، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۝٥ ﴾الأحزاب، واتە: [ئەو کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناویان بەرن و بانگیان بکەن، ئەوە پەسندە لای خوا]، جا پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا فەرمانی کرد کە شیر بدات بە سالم (تاوەکو ببێتە مەحرەم).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەوە تایبەت بوو بە سالم.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە مارەبەجاش

٢٣٠٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمُحِلَّ، وَالْمُحَلَّلَ لَهُ».[١]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردوە لەو کەسەی ئافرەتی تەڵاقدراو حەڵاڵ دەکاتەوە بۆ مێردی، وە نەفرەتی لەو کەسەش کرد کە بۆی حەڵاڵ دەکرێتەوە (واتە: ئەگەر پێشتر ڕێک بکەون لەسەر ئەم کارە).

تێبینی: مارەبەجاش ئەوەیە: پیاوێک خێزانەکەی خۆی تەڵاق بدات و دواتر پەشیمان ببێتەوە و، کەسێک پەیدا بکات تا ئافرەتەکە مارەبکات و لەگەڵی جووت ببێت و دواتر بۆی تەڵاق بدات، تاوەکو بە زەواجێکی نوێ مێردە کۆنەکە مارەی بکاتەوە و پێی بگاتەوە.

## بابەت: دەربارەی پێویست بوونی خەرجی ماڵ و منداڵ لەسەر پیاو

٢٣١٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ هِنْدًا أُمَّ مُعَاوِيَةَ امْرَأَةَ أَبِي سُفْيَانَ رَضِي اللهُ عَنهم، أَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَإِنَّهُ لاَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي، وَبَنِيَّ إِلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ، وَهُوَ لاَ يَعْلَمُ، فَهَلْ عَلَيَّ فِي ذَلِكَ جُنَاحٌ؟ فَقَالَ: خُذِي مَا يَكْفِيكِ، وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیندی دایکی موعاویە، خێزانی ئەبو سوفیان (رَضِي اللهُ عَنْهم)، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە و، ئەوەندەم (پارە و شت) پێ نادات کە بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات تەنها ئەو کاتە نەبێت کە لێی دەبەم (واتە: هەندێ جار بە ناچاری پارەی لێ دەبەم تا مەسرەفەکەم پێ بکرێت، ئەگەرنا بە تەمای ئەو بەشمان ناکات) لە کاتێکدا ئەو نازانێ (کە لێی دەبەم)، جا ئایا لەو کارە

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.

تاوانم لەسەرە؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ببە ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەکانت دەکات بە شێوەیەکی چاک (واتە: زیاتر لە پێویست نەبەیت، بەڵکو بە ئەندازەی پێویست ببە).

## بابەت: دەربارەی چاک مامەڵەکردن لەگەڵ خێزاندا

٢٣١١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَإِذَا مَاتَ صَاحِبُكُمْ فَدَعُوهُ».[١]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینتان چاکترینتانە بۆ خێزانەکەی، وە کاتێ هاوڕێکەت وەفاتی کرد ئەوە وازی لێ بێنە (بە خراپی باسی نەکەیت، تەنها بە چاکە نەبێت).

## بابەت: دەربارەی بەشودانی کچانی بچووک، کاتێ باوکیان بەشویان دەدەن

٢٣١٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَوُعِكْتُ، فَتَمَرَّقَ رَأْسِي، فَأَوْفَى جُمَيْمَةً فَأَتَتْنِي أُمُّ رُومَانَ، وَإِنِّي لَفِي أُرْجُوحَةٍ، وَمَعِي صَوَاحِبَاتٌ لِي، فَصَرَخَتْ بِي فَأَتَيْتُهَا، وَمَا أَدْرِي مَا تُرِيدُ فَأَخَذَتْ بِيَدِي حَتَّى أَوْقَفَتْنِي عَلَى بَابِ الدَّارِ، وَإِنِّي لَأَنْهَجُ حَتَّى سَكَنَ بَعْضُ نَفَسِي، ثُمَّ أَخَذَتْ شَيْئًا مِنْ مَاءٍ فَمَسَحَتْ بِهِ وَجْهِي وَرَأْسِي، ثُمَّ أَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْبَيْتِ، فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِنَّ، فَأَصْلَحْنَ مِنْ شَأْنِي، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ ، ضُحًى فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ ابْنَةُ تِسْعِ سِنِينَ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی کردم لەکاتێکدا تەمەنم شەش ساڵ بوو، جا چووین بۆ مەدینە و لەلای بەنی حاریثی کوڕی خەزرەج گیرساینەوە و، شەکەت بووم و، قژی سەرم هەڵوەری، (جا دوای ماوەیەک کە حەسامەوە قژم درێژ بوویەوە) گەیشت بە شانەکان، جا ئوممو ڕوومان هات بۆ لام، لەکاتێکدا من لەسەر جۆلانە بووم و هاوڕێکانیشم لەگەڵ بوو و، هاواری کرد و بانگی کردم، منیش نەمزانی چی دەوێت، دەستی گرتم (بردمی) تاوەکو لەلای دەرگایماڵێک وەستاندمی، منیش ماندو بووم (هێنکەم لێ بڕابوو و پشیم هەرمابوو)، (هەندێک وەستاین) تاوەکو تۆزێک ئارام بومەوە، دواتر تۆزێک ئاوی هێنا و ڕوخسار و سەری پێ تەڕ کردم، دواتر بردمیە ژوورەوە بۆ ناو ماڵەکە، جا کۆمەڵە ئافرەتێک لە ئەنصاریەکان لە ماڵەکە بوون و وتیان: (پیرۆزت بێت) لەسەر خێر و بەرەکەت و بەخت باشی، جا تەسلیمی ئەوانی کردم و ئەوانیش ڕێکیان خستم، جا هیچ شتێک بۆم نەبوو بە موفاجەئە تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ، کە بە کاتی چێشتەنگا و تەسلیمیان کردم لەکاتێکدا ئەو ڕۆژە تەمەنم نۆ ساڵ بوو.

---

(١) ـ صحيح.

(٢)- صحيح.

تێبینی: هەندێ خەڵک هەن بوونەتە پارێزەری دایکمان عائیشە و دەڵێن: چۆن دەبێت (موحەممەد ﷺ) عائیشەی لەو تەمەنە بچوکە هێناوە، منداڵێکی لەو تەمەنە چۆن دەبێت تاوانی وای لەگەڵ بکرێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین: هاوڕێ دەزانی پارێزەریەکەت نامەعقوڵە؟! دەزانی ئەو کەسەی تۆ پارێزەری بۆ دەکەیت گوایە ستەمی لێکراوە بە قسەکەت ڕازی نیە؟ دەزانی ئەو کچە شەیدای هاوسەرەکەی بووە؟ دەزانی هیچ گلەیی و گازاندەیەکی بەرانبەر ئەو لێ تۆمار نەکراوە؟ دەزانی ئەو کچە غیرەی بەسەر هەوێکانیدا کردوە بۆ هاوسەرەکەی؟ دەزانی نەیارانی هیچ تۆمەتێکیان نەداوەتە پاڵ لەم ڕووەوە؟ دەی کەواتە تۆ چیت لەم نێوانەدا؟

باشە، وتت: پیاوێکی پەنجا و چوار ساڵی چۆن دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی ئاوا بچوک بکات. لە وەڵامدا دەڵێین: هاوڕێ دەزانی لەو تەمەنەش هیچ گەنجێک نەگەیشتۆتە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جوانی، لە ساغی، لە کەشخەیی، لە جوامێری، لە نەرمونیانی، لە چاکی، لە ڕۆح سوکی، لە پاکی، لە ڕەوشت بەرزی...هتد، کەواتە: تۆ بێنە بەرچاوت ئەگەر کچێک بهێنرێت بۆ شوو کردن، جا جەنابت ڕابگیرێیت لەگەڵ پیاوێک وەک پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا جوانیەکەی بەراورد نەکرێت لەگەڵ جوانی تۆ، وە ڕەوشتەکەی بەراورد نەکرێت، گەنجیەکەی بەراورد نەکرێت، چاکیەکەی بەراورد نەکرێت، پاکیەکەی بەراورد نەکرێت، ناوبانگیەکەی بەراورد نەکرێت، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمی هەموو دونیا بکات و هیوای هەموو کچێک بێت شووی پێ بکات، ئایا جەنابت هەڵدەبژێرێ یان ئەم پیاوە؟

ئەوەت بیر نەچێت: ئەو ئافرەتەی تۆ پارێزەری بۆ دەکەیت ئەگەر زیندوو بکرێتەوە سکاڵات لەسەر تۆمار دەکات و کارەکەت بە نامەعقوڵ دەزانێت، ئەگەر پارێزەریەکەت مەعقول بووایە ئەوە نەیارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەردەمی ئەودا پێشت دەکەوتن.

## بابەت: سوننەت لە تەڵاقدان

٢٣١٣ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: مُرْهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا، وَيُمْسِكَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ، قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ فَتِلْكَ الْعِدَّةُ، الَّتِي أَمَرَ اللهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ».[١]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خێزانەكەی خۆم تەڵاقدا لەكاتێكدا لە سوڕی مانگانەدا بوو، عومەر (واتە: باوكی) ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس كرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: فەرمان بە ئیبنو عومەر بكە كە خێزانەكەی بگەڕێنێتەوە ژێر نیكاحی خۆی و لای خۆی بیهێڵێتەوە تاوەكو لە حەیز (لە عادە) پاك دەبێتەوە و، دواتر حەیزی تووش دەبێتەوە و، دواتر پاك دەبێتەوە، دواتر ئەگەر ویستی با بیهێڵێتەوە و تەڵاقی نەدات، وە ئەگەر ویستیشی تەڵاقی بدات با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی جیماعی لەگەڵ بكات، ئا ئەوە ئەو عیددەیەیە كە خوا فەرمانی پێ كردوە ئافرەتانی تیا تەڵاق بدرێن (ئەوە شێوازی تەڵاقدانی سوننەتیە).

٢٣١٤ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ عُمَرَ، قَالَ: لِلنَّبِيِّ ﷺ حِينَ طَلَّقَ ابْنُ عُمَرَ امْرَأَتَهُ فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا، وَهِيَ طَاهِرَةٌ» قَالَ أَبُو مُحَمَّد: رَوَاهُ ابْنُ الْمُبَارَكِ وَوَكِيعٌ أَوْ حَامِلٌ».[٢]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێ ئیبنو عومەر خێزانەكەی خۆی تەڵاقدا، ئیمامی عومەر بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: فەرمان بە ئیبنو عومەر بكە با خێزانەكەی بگێڕێتەوە، دواتر با تەڵاقی بدات لەكاتێكدا كە پاكە و (حەیزدار نیە).

## بابەت: دەربارەی تەڵاق چاككردنەوە

٢٣١٥ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا».[٣]

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی تەڵاقدا (بە تەڵاقێك)، دواتر گێڕایەوە.

٢٣١٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ طَلَّقَ حَفْصَةَ».[٤]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی تەڵاقدا، دواتر گێڕایەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: تەڵاق بەر لە هاوسەرگیری بوونی نیە

٢٣١٧ - «قَالَ الْحَكَمُ: قَالَ لِي يَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ ﷺ أَفْصِلُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ أَنْ لاَ يَمَسَّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ، وَلاَ طَلاَقَ قَبْلَ إِمْلاَكٍ، وَلاَ عَتَاقَ حَتَّى يَبْتَاعَ».[1]

واتە: حەكەم وتویەتی: یەحیای كوڕی حەمزە ﷺ پێی وتووم: باس دەكەم پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵكی یەمەنی نوسی (واتە فەرمانی كرد بنوسرێت): با كەس دەست لە قورئان نەدات مەگەر پاك نەبێت (واتە: دەبێ بە دەستنوێژ بێت، یان جەنابەتی لەسەر نەبێت)، وە تەڵاق بەر لە هاوسەرگیری بوونی نیە، وە ئازادكردنی بەندە بوونی نیە تاوەكو دەیكڕێت.

## بابەت: چ شتێک ژن بۆ ئەو پیاوە حەڵاڵ دەكاتەوە، كە تەڵاقی داوە و تەڵاقەكەی نەماوە؟

٢٣١٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَعِنْدَهُ أَبُو بَكْرٍ، وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ عَلَى الْبَابِ يَنْتَظِرُ، أَنْ يُؤْذَنَ لَهُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلاَقِي، قَالَ: أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ، وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ فَنَادَى خَالِدُ بْنُ سَعِيدٍ أَبَا بَكْرٍ أَلاَ تَرَى مَا تَجْهَرُ بِهِ؟ هَذِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟».[2]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خێزانی ڕیفاعەی قوڕەظی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەكریشی لەلا بوو، خالیدی كوڕی سەعیدی كوڕی عاصیش لە لای دەرگا چاوەڕێی دەكرد كە مۆڵەت بدرێت تا بێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا خێزانی ڕیفاعە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەلای ڕیفاعە بووم (خێزانی ئەو بووم)، جا تەڵاقیدام تەڵاقم نەما، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئایا دەتەوێت بگەڕێیتەوە لای ڕیفاعە؟ نەخێر (ناتوانی بگەڕێیتەوە لای) تاوەكو (پیاوێكیتر مارەت دەكات) و شیرناتی جیماع لەگەڵ كردنت دەچێژێت و تۆش شیرنایەتی جیماع لەگەڵ كردنی دەچێژی، جا خالیدی كوڕی سەعید بانگی ئەبوبەكری كرد و هاواری كرد (وتی): نابینی ئەوە بە ئاشكرا باسی چی دەكات لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ؟!

٢٣١٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: طَلَّقَ رِفَاعَةُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي قُرَيْظَةَ امْرَأَتَهُ فَتَزَوَّجَهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الزُّبَيْرِ، فَدَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ وَاللهِ إِنْ مَعَهُ إِلاَّ مِثْلُ هُدْبَتِي هَذِهِ، فَقَالَ لَهَا: رَسُولُ اللهِ ﷺ لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ لاَ حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ، أَوْ قَالَ: تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ».[3]

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: ڕیفاعە كە پیاوێكی بەنی قوڕەیظە بوو خێزانەكەی خۆی تەڵاقدا و عەبدوڕڕەحمانی كوڕی زوبەیریش مارەی كردەوە، جا ئافرەتەكە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا ئەوەی لەگەڵ ئەودایە (واتە: ئەندامی پیاوەتی) وەك لیچك و دامێنی ئەو كراسەمە (واتە: ئەندامی پیاوەتی خاوە و كەڵكی چێژ لێوەرگرتنی نیە)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ڕەنگە بتەوێت بگەڕێیتەوە لای ڕیفاعە، نەخێر نابێت، تاوەكو (مێردە نوێیەكەت) شیرنایەتی و جیماع لەگەڵ كردنت نەچێژێت، یانیش فەرمووی: (تاوەكو) تۆ شیرنایەتی جیماع لەگەڵ كردنی نەچێژی.

## بابەت: دەربارەی سەرپشك كردن

٢٣٢٠ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ الْخِيَرَةِ، فَقَالَتْ: قَدْ خَيَّرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَفَكَانَ طَلَاقًا».[١]

واتە: لە مەسروقەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) كرد دەربارەی سەرپشك كردن (واتە: سەرپشك كردنی خێزان لەلایەن مێردەكەی بەوەی ئەگەر حەز بكات تەڵاقی بكەوێت یانیش لەلای بمێنێتەوە)، دایكمان عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشكی كردین، جا ئایا مەگەر ئەوە تەڵاقە؟! (واتە: خۆ ئەوە تەڵاق نیە).

## بابەت: نەهی كردن لەوەی ئافرەت داوای تەڵاق لە هاوسەرەكەی بكات

٢٣٢١ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا الطَّلَاقَ مِنْ غَيْرِ بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ».[٢]

واتە: لە ثەوبانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێك داوای تەڵاق لە هاوسەرەكەی بكات بەبێ هیچ خەتایەك ئەوە بۆنی بەهەشتی لەسەر حەڕامە (واتە بۆنی بەهەشتیش ناكات چ جای ئەوەی بچێتە ناویەوە).

## بابەت: دەربارەی خولع (واتە: خۆداڕنینی ژن لە مێرد)

٢٣٢٢ - «أَخْبَرَنَا يَحْيَى هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ أَنَّ عَمْرَةَ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ سَهْلٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، تَزَوَّجَهَا ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ ﷺ، فَذَكَرَتْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ هَمَّ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، وَكَانَتْ جَارَةً لَهُ، وَأَنَّ ثَابِتًا ضَرَبَهَا فَأَصْبَحَتْ عَلَى بَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الْغَلَسِ، وَأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ فَرَأَى إِنْسَانًا، فَقَالَ: مَنْ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

هَذَا؟ قَالَتْ: أَنَا حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ، فَقَالَ: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: لاَ أَنَا، وَلاَ ثَابِتٌ، فَأَتَى ثَابِتٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ: خُذْ مِنْهَا، وَخَلِّ سَبِيلَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ عِنْدِي كُلُّ شَيْءٍ أَعْطَانِيهِ، فَأَخَذَ مِنْهَا، وَقَعَدَتْ عِنْدَ أَهْلِهَا».(١)

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەمرە بۆی گێڕاوەتەوە كە ثابیتی كوڕی قەیسی كوڕی شەمماس ﷺ حەبیبەی كچی سەهلی هێنا و (رَضِي اللهُ عَنْهَا) هاوسەرگیری لەگەڵ كرد، جا باسی كرد كە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستویەتی بیخوازێت كە جیران و هاوسێیان بووە، وە ثابیتیش لێیداوە، جا بەتاریک و ڕوونی بەیانی لەبەر دەرگای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ دەرچوو و كەسێكی بینی و فەرمووی: ئەوە كێیە؟ حەبیبە وتی: من حەبیبەی كچی سەهلم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چیتە؟ وتی: نە من و نە ثابیت (واتە هیچمان یەكترمان ناوێت)، جا ثابیت هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: (مارەییەكەی) لێ وەرگرە و دەستی لێ بكەوە، حەبیبەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەو شتەم لەلایەو (هێشتا ماومە) كە داویەتی بە من (هەمووی دەدەمەوە)، جا ثابیت شتەكانی لێ وەرگرت، حەبیبەش لەلای ماڵی باوكی مایەوە.

## بابەت: دەربارەی تەڵاقی موتڵەق (بێ وتنی ژمارە)

۲۳۲۳ - «عن سعيد عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ بْنِ رُكَانَةَ، وَهُوَ فِي قَرْيَةٍ لَهُ فَأَتَيْتُهُ فَسَأَلْتُهُ؟ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ جَدِّي، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: مَا أَرَدْتَ؟ فَقَالَ: وَاحِدَةً، قَالَ: اللهِ؟ قَالَ: اللهِ، قَالَ: هُوَ مَا نَوَيْتَ».(٢)

واتە: لە سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرموودەیەكم پێگەیشت لە عەبدوڵلای كوڕی عەلی كوڕی یەزیدی كوڕی ڕوكانەوە لەكاتێكدا ئەو لە گوندەكەی خۆی بوو، جا منیش چووم بۆ لای و پرسیارم لێ كرد؟ ئەویش وتی: باوكم لە باپیرمەوە بۆی گێڕاومەتەوە كە خێزانی خۆی تەڵاقداوە بە موتڵەقی (هیچ ژمارەی نەوتبوو)، جا چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆ باس كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: مەبەستت چی بوو؟ ئەویش وتی: مەبەستم یەک دانە بوو، فەرمووی: بڵێ بە خوا؟ وتی: بە خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەیە كە نیەتت هێناوە و مەبەستت بووە (واتە یەک تەڵاقت كەوتووە).

## بابەت: دەربارەی زیهار (واتە: وێكچواندنی خێزان بە یەكێک لە ئافرەتانی مەحرەم)

۲۳۲٤ - «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الْبَيَاضِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ امْرَأً أُصِيبُ مِنَ النِّسَاءِ مَا لاَ يُصِيبُ غَيْرِي، فَلَمَّا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ خِفْتُ أَنْ أُصِيبَ فِي لَيْلِي شَيْئًا، فَيَتَتَابَعَ بِي ذَلِكَ إِلَى أَنْ أُصْبِحَ. قَالَ: فَتَظَاهَرْتُ إِلَى أَنْ يَنْسَلِخَ فَبَيْنَا هِيَ لَيْلَةً تَخْدُمُنِي، إِذْ تَكَشَّفَ لِي مِنْهَا شَيْءٌ، فَمَا لَبِثْتُ أَنْ نَزَوْتُ عَلَيْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

خَرَجْتُ إِلَى قَوْمِي فَأَخْبَرْتُهُمْ، وَقُلْتُ: امْشُوا مَعِي إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ ، فَقَالُوا: لاَ وَاللهِ، لاَ نَمْشِي مَعَكَ، مَا نَأْمَنُ أَنْ يَنْزِلَ فِيكَ الْقُرْآنُ، أَوْ أَنْ يَكُونَ فِيكَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَقَالَةٌ، يَلْزَمُنَا عَارُهَا، وَلَنُسْلِمَنَّكَ بِجَرِيرَتِكَ، فَانْطَلَقْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَصَصْتُ عَلَيْهِ قصتي، فَقَالَ: يَا سَلَمَةُ أَنْتَ بِذَاكَ، قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ، قَالَ: يَا سَلَمَةُ أَنْتَ بِذَاكَ، قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ، قَالَ: يَا سَلَمَةُ أَنْتَ بِذَاكَ، قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ، وَهَا أَنَا صَابِرٌ نَفْسِي، فَاحْكُمْ فِيَّ مَا أَرَاكَ اللهُ، قَالَ: فَأَعْتِقْ رَقَبَةً، قَالَ: فَضَرَبْتُ صَفْحَةَ رَقَبَتِي، فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَصْبَحْتُ أَمْلِكُ رَقَبَةً غَيْرَهَا قَالَ: فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قُلْتُ: وَهَلْ أَصَابَنِي الَّذِي أَصَابَنِي إِلاَّ فِي الصِّيَامِ؟ قَالَ: فَأَطْعِمْ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ سِتِّينَ مِسْكِينًا، فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ بِتْنَا لَيْلَتَنَا وَحْشَى مَا لَنَا مِنَ الطَّعَامِ، قَالَ: فَانْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ وَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا، وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ، وَكُلْ بَقِيَّتَهُ أَنْتَ وَعِيَالُكَ، قَالَ: فَأَتَيْتُ قَوْمِي، فَقُلْتُ: وَجَدْتُ عِنْدَكُمُ الضِّيقَ، وَسُوءَ الرَّأْيِ، وَوَجَدْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ السَّعَةَ، وَحُسْنَ الرَّأْيِ، وَقَدْ أَمَرَنِي بِصَدَقَتِكُمْ».[1]

واتە: لە سەلەمەی کوڕی صەخری بەیاضیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: من کەسێک بووم ئەوەندە تووشی خێزانم دەبووم کەسی جگە لە من ئەوەندە تووش نەدەبوو (واتە: شەهوەتی زۆر بووە)، جا کاتێ مانگی ڕەمەزان هات ترسام لە شەودا تووشی شتێک ببم و ڕامبکێشێت و بەردەوامیم پێ بدات تاوەکو بەیانی دەکەمەوە، دەڵێ: بۆیە زیهارم کرد تاوەکو بەیانی دێت (واتە: زیهارم کرد بۆ ماوەیەکی کاتی)، جا لە کاتێکدا خێزانەکەم شەوێکیان خزمەتی دەکردم، لەناکاو بەشێکی جەستەی دەرکەوت و منیش خۆم بۆ نەگیرا و توشی بووم (جیماعم لەگەڵ کرد)، جا کە بەیانیم کردەوە دەرچووم بۆ لای قەومەکەم و پێم ڕاگەیاندن (کە توشی کارێکی ئاوا بووم) و وتم: لەگەڵم وەرن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوانیش وتیان: نا وەڵڵا لەگەڵت نایێین، ئێمە دڵنیانین کە قورئان دەربارەت دانابەزێت، یان (دڵنیا نین لەوەی) پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکت دەربارە بکات کە عەیب و شورەییەکەی ئێمەش بگرێتەوە، (بەڵکو) وابەستەی تاوانەکەت دەکەین (واتە: هەقمان نیە بەسەرتەوە، خۆت و تاوانەکەت)، بۆیە (بە تەنها) چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و چیرۆکی خۆم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەی سەلەمە تۆ ئەوەت کردوە؟ وتم: کردوومە، (دووبارە) فەرمووی: ئەی سەلەمە تۆ ئەوەت کردوە؟ وتم: کردوومە، (جارێکیتر) فەرمووی: ئەی سەلەمە تۆ ئەوەت کردوە؟ وتم: کردوومە و ئەوەتا من ئارامگرم و حوکمم بکە بەوەی خوا پێی نیشانداوی، فەرمووی: کەواتە بەندەیەک ئازاد بکە، دەڵێ: منیش دام لە پشتە ملم و وتم: سوێند بەوەی تۆی ڕەوانە کردوە بە هەق خاوەنی هیچ بەندە و کەسێک نیم جگە لەم ملە (واتە: تەنها خاوەنی خۆمم نە بەندە و نە پارەی بەندەم نیە تا ئازادی بکەم)، (دەڵێ:) فەرمووی: کەواتە دوو مانگ لەسەر یەک بە ڕۆژوو بە، وتم: ئەوەی توشم بووە هەر لەبەر ڕۆژوو بوو (خۆم بۆ ناگیرێ دڵنیام توشی خێزانم دەبمەوە)، فەرمووی: کەواتە وەسقێک (واتە: شەست صاع) لە خورما بدە بە شەست هەژار، منیش وتم: سوێند بەوەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە ئەم شەومان کردۆتەوە بە برسیەتی، هیچ خواردنێکمان نیە، فەرمووی: کەواتە بچۆ بۆ لای خاوەنی زەکاتی بەنی زوڕەیق و با پێت بدات و تۆش وەسقێک (شەست صاع) لە خورما بدە بە شەست هەژار و خۆت و

---

(١) ـ حسن.

خانەوادەكەشت ئەوەیتر بخۆن، دەڵێ: چووم بۆ لای قەومەكەم و وتم: لەلای ئێوە بەرتەسكی و بۆچونی خراپم دەستكەوت، لەلای پێغەمبەری خواش ﷺ فراوانی و بۆچونی چاكم دەستكەوت، وە فەرمانی پێ كردم بەوەی زەكاتی ئێوە بێنم.

## بابەت: دەربارەی ئافرەتی تەڵاقدراو كە ئایا شوێن و مەسرەفكێشانی بۆ هەیە یان نا؟

٢٣٢٥ - «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا فَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ نَفَقَةً، وَلاَ سُكْنَى، قَالَ سَلَمَةُ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِإِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: لاَ نَدَعُ كِتَابَ رَبِّنَا، وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ، بِقَوْلِ امْرَأَةٍ: فَجَعَلَ لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةَ».[١]

واتە: لە فاتیمەی كچی قەیسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە كە هاوسەرەكەی تەڵاقیداوە بە سێ تەڵاق و پێغەمبەر ﷺ مەسرەف و شوێنی بۆ دانەنا (لەسەر مێردەكەی)، سەلەمە وتویەتی: جا ئەوەم بۆ ئیبراهیم باس كرد، ئەویش وتی: عومەری كوڕی خەتتاب وتویەتی: ئێمە پەرتوكی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ واز لێناهێنین بۆ قسەی ئافرەتێك: جا (عومەر) شوێن و نەفەقە و مەسرەفی بۆ ئافرەتی سێ بە سێ تەڵاقدراو دادەنا.

٢٣٢٦ - «حَدَّثَتْنِي فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَعْتَدَّ عِنْدَ ابْنِ عَمِّهَا ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ».[٢]

واتە: لە فاتیمەی كچی قەیسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە كە هاوسەرەكەی تەڵاقیداوە بە سێ تەڵاق و پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردوە كە عیددە ببینێت لای ئیبنو ئوممی مەكتومی كوڕە مامی (واتە: لەوێ بمێنێتەوە).

٢٣٢٧- «عَنْ عُمَرَ ﵁، قَالَ: لاَ نَدَعُ كِتَابَ رَبِّنَا وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ، بِقَوْلِ امْرَأَةٍ الْمُطَلَّقَةُ، ثَلاَثًا لَهَا السُّكْنَى، وَالنَّفَقَةُ».[٣]

واتە: لە عومەرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە واز لە پەرتوكی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ ناهێنین بە قسەی ئافرەتێك: ئافرەتی سێ بەسێ تەڵاقدراو شوێن و نەفەقەی بۆ هەیە.

٢٣٢٨ - «أَخْبَرَنَا طَلْقُ بْنُ غَنَّامٍ، عَنْ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، عَنْ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ الأَسْوَدِ، عَنْ عُمَرَ ﵁ نَحْوَهُ».[٤]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

٢٣٢٩ - «عَنْ الأَسْوَدِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: لاَ نُجِيزُ قَوْلَ امْرَأَةٍ فِي دِينِ اللهِ الْمُطَلَّقَةُ، ثلاَثًا لَهَا السُّكْنَى، وَالنَّفَقَةُ».[١]

قَالَ أَبُو مُحَمَّد: لاَ أَرَى السُّكْنَى، وَالنَّفَقَةَ لِلْمُطَلَّقَةِ.

واتە: لە ئەسوەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتویەتی: قسەی تاكە ئافرەتێک جێبەجێ ناكەین لە دینی خوا: (بەڵكو) ئافرەتی سێ بەسێ تەڵاقدراو شوێن و نەفەقەی بۆ هەیە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: من ڕەئیم لەگەڵ ئەوە نیە شوێن و نەفەقە (واجب بێت دابنرێت) بۆ ئافرەتی سێ بە سێ تەڵاقدراو.

بابەت: دەربارەی عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو و ئافرەتی تەڵاقدراو

٢٣٣٠ - «أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ اجْتَمَعَ هُوَ وَابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فَذَكَرُوا الرَّجُلَ يُتَوَفَّى عَنِ الْمَرْأَةِ فَتَلِدُ بَعْدَهُ بِلَيَالٍ قَلاَئِلَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: حِلُّهَا آخِرُ الأَجَلَيْنِ، وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ إِذَا وَضَعَتْ، فَقَدْ حَلَّتْ، فَتَرَاجَعَا فِي ذَلِكَ بَيْنَهُمَا، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي ـ يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ ـ فَبَعَثُوا كُرَيْبًا مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَسَأَلَهَا فَذَكَرَتْ أُمُّ سَلَمَةَ أَنَّ سُبَيْعَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ الأَسْلَمِيَّةَ مَاتَ عَنْهَا زَوْجُهَا، فَنَفِسَتْ بَعْدَهُ بِلَيَالٍ، وَأَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ يُكَنَّى أَبَا السَّنَابِلِ خَطَبَهَا، وَأَخْبَرَهَا أَنَّهَا قَدْ حَلَّتْ، فَأَرَادَتْ أَنْ تَتَزَوَّجَ غَيْرَهُ، فَقَالَ لَهَا أَبُو السَّنَابِلِ: فَإِنَّكِ لَمْ تَحِلِّينَ، فَذَكَرَتْ سُبَيْعَةُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَمَرَهَا أَنْ تَتَزَوَّجَ».[٢]

واتە: لە ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە گێڕدراوەتەوە كە لەگەڵ ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) كۆبۆتەوە لەلای ئەبو هورەیرە ﷺ و باسی ئەو پیاوەیان كردوە كە دەمرێت و خێزانی لەدوای خۆی جێدەهێڵێ و خێزانەكەشی دوای مردنی ئەو بە چەند شەوێكی كەم منداڵی دەبێت، جا ئیبنو عەبباس وتی: حەڵاڵ بوونی (بۆ شوكردنەوە و كۆتایی هێنانی عیددەكەی بریتیە لە) دووەمین ماوە (واتە: ئەگەر حەملەكەی پێشی چوار مانگ و دە ڕۆژ دانا، ئەوە هەر دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕێ بكات ئنجا مێرد بكاتەوە، وە ئەگەر حەملەكەی دوای زیاتر لە چوارمانگ و دە ڕۆژ دادەنا ئەوە دەبێ تا حەملەكەی دادەنێ بوەستێت، واتە: كار بە تاخیرەكەیان و زیاترەكەیان دەكرێت)، ئەبو سەلەمەش وتی: (نەخێر من پێم وایە عیددەكەی بریتیە) لەو كاتەی حەملەكەی دادەنێت (جا زوو یان درەنگ)، ئەوە عیددەكەی كۆتایی دێت، جا هەر باسوخواسیان بوو دەربارەی ئەو بابەتە، ئەبو هورەیرەش وتی: من لەگەڵ كوڕی برامم ـ واتە: لەگەڵ ئەبو سەلەمەم ـ جا كوڕەیبی خزمەتكاری ئیبنو عەبباسیان نارد بۆ لای ئوممی سەلەمە و پرسیاری لێكرد، جا ئوممو سەلەمە باسی كرد، وتی: سوبەیعەی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

کوڕی حاریثی ئەسلەمی پیاوەکەی وەفاتی کرد و بە چەند شەوێک دوای مردنی مێردەکەی منداڵی بوو و، پیاوێکی بەنی (عبد الدار) کە پێی دەوترا ئەبو سەنابیل چووە داوای و پێی ڕاگەیاند کە مێرد کردنەوەی بۆ حەڵاڵ بووە (عیددەکەی کۆتایی هاتووە)، جا ئافرەتەکەش ویستی شوو بە کەسێکی جگە لەو بکات، جا (لەبەر حەسادەت) ئەبو سەنابیل پێی وت: تۆ حەڵاڵ نەبویتەوە (عیددەت تەواو نەبووە)، جا سوبەیعە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد و پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کرد کە شوو بکاتەوە (واتە قسەی ئەبو سەلەمە دەرچوو کە وتی عیددە بە دانانی حەملەکە کۆتایی دێت و حەڵاڵە شوو بکاتەوە).

٢٣٣١ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: تُوُفِّيَ زَوْجُ سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ فَوَضَعَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِأَيَّامٍ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ تَتَزَوَّجَ».[١]

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاوسەری سوبەیعەی کچی حاریث وەفاتی کرد و پاش وەفات کردنی هاوسەرەکەی بە چەند ڕۆژێک منداڵی بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد کە شوو بکاتەوە.

٢٣٣٢ - «عَنْ أَبِي السَّنَابِلِ ﷺ، قَالَ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ رَضِي اللهُ عَنْهَا، حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِبِضْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا، تَشَوَّفَتْ، فَعِيبَ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَذُكِرَ أَمْرُهَا لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنْ تَفْعَلْ، فَقَدِ انْقَضَى أَجَلُهَا».[٢]

واتە: لە ئەبو سەنابیلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوبەیعەی کچی حاریث منداڵی بوو (رَضِي اللهُ عَنْهَا) پاش وەفات کردنی هاوسەرەکەی بە بیست و هەندەک شەو، جا کە خوێنی منداڵ بوونی وەستا و خۆی جوان کرد (بۆ شوکردنەوە) لەسەر ئەوە عەیبدار کرا و ڕەخنەی لێگیرا، جا بابەتەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرا، ئەویش فەرمووی: ئەگەر وابکات (واتە: بیەوێ شوو بکاتەوە) ئەوە ماوەکەی تەواو بووە (واتە: عیددەکەی تەواو بووە، دەتوانێ شوو بکاتەوە و کێشە نیە).

٢٣٣٣ - «عَنْ الأَسْوَدِ، أَنَّ سُبَيْعَةَ وَضَعَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِأَيَّامٍ، فَتَشَوَّفَتْ، فَعَابَ أَبُو السَّنَابِلِ، فَسَأَلَتْ أَوْ ذَكَرَتْ أَمْرَهَا لِرَسُولِ اللهِ ﷺ ؟ فَأَمَرَهَا أَنْ تَتَزَوَّجَ».[٣]

واتە: لە ئەسوەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوبەیعە پاش وەفات کردنی هاوسەرەکەی بە چەند ڕۆژێک منداڵی بوو و خۆی ڕازاندەوە و ئەبو سەنابیلیش ڕەخنەی لێگرت، جا سوبەیعە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ـ یان بابەتی سوبەیعەی بۆ باسکرا ـ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کرد شوو بکاتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی گرنگی نەدانی ئافرەت بەخۆی (تەعزیەداری) لەسەر مردنی هاوسەرەكەی

٢٣٣٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، أَوْ تُؤْمِنُ بِاللهِ أَنْ تَحِدَّ عَلَى أَحَدٍ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، إلاَّ عَلَى زَوْجِهَا».[١]

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، كە فەرموویەتی: حەڵاڵ و دروست نیە بۆ ئافرەتێک كە بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت ـ یان (تەنها فەرمووی) بڕوای بە خوا هەبێت ـ خۆی بێ نیاز بكات لە بۆن خۆشكردن و گرنگی بەخۆدان و (تەعزیەداری كردن) زیاتر لە سێ ڕۆژ، تەنها لەسەر مردنی هاوسەرەكەی نەبێت (بۆ ئەو دروستە چوار مانگ و دە ڕۆژ تاعزیەداری بكات).

٢٣٣٥ - «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ أَخًا، لَهَا مَاتَ، أَوْ حَمِيمًا لَهَا، فَعَمَدَتْ إِلَى صُفْرَةٍ فَجَعَلَتْ تَمْسَحُ يَدَيْهَا، وَقَالَتْ: إِنَّمَا أَفْعَلُ هَذَا لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تَحِدَّ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إلاَّ عَلَى زَوْجِهَا، فَإِنَّهَا تَحِدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا».[٢]

واتە: لە ئوممو حەبیبەی كچی ئەبو سوفیانەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە كە برایەكی ـ یان خۆشەویستێكی ـ وەفاتی كرد و چوو بۆ لای صوفرەت (كە ڕوەكێك بوو وەک گوڵاو و بۆن بەكاردەهات) جا دەیدا لە دەستەكانی و دەیوت: ئەوە لەبەر ئەوە دەكەم چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ و دروست نیە بۆ ئافرەتێک كە بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت، خۆی بێ نیاز بكات لە بۆن خۆشكردن و گرینگی بەخۆدان و (تەعزیەداری كردن) زیاتر لە سێ ڕۆژ، تەنها لەسەر مردنی هاوسەرەكەی نەبێت، ئەویان دروستە چوار مانگ و دە ڕۆژ خۆی دوور بگرێت لە بۆن خۆشكردن و گرنگی بەخۆدان و تاعزیەداری كردن.

٢٣٣٦ - «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، قَالَ: سَمِعْتُ زَيْنَبَ بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، تُحَدِّثُ عَنْ أُمِّهَا أَوِ امْرَأَةٍ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ».[٣]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێردراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: نەهی کردن لە ئافرەت دەربارەی خۆ ڕازاندنەوە لە عیددەدا

٢٣٣٧ - «عَنْ أم عَطية رَضِي اللهُ عَنهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَحِدُّ الْمَرْأَةُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، إلاَّ عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تَحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، لاَ تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلاَ تَكْتَحِلُ، وَلاَ تَمَسُّ طِيبًا، إلاَّ فِي أَدْنَى طُهْرِهَا، إِذَا اغْتَسَلَتْ مِنْ مَحِيضِهَا نُبْذَةً مِنْ كُسْتٍ وَأَظْفَارٍ».[١]

واتە: لە ئوممو عەتییەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئافرەت واز لە خۆبۆنخۆش کردن و گرنگی بەخۆدان ناهێنێ زیاتر لە سێ ڕۆژ، تەنها لەسەر مردنی هاوسەرەکەی نەبێت، ئەویان چوار مانگ و دە ڕۆژ خۆی بۆن خۆش ناکات و (تەعزیەداری دەکات)، هیچ جلێکی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر ناکات تەنها کەمەربەند نەبێت (کە لە حاڵەتی حەیز دەبەسترا)، هەروەها چاوی کلڕێژ ناکات و بۆن لەخۆی نادات تەنها لەسەرەتای پاکبوونەوەی نەبێت، کاتێ خۆی شۆرد لە سوڕی مانگانەکەی (لە عادەکەی) ئەو کات کەمێک لە بۆن بەکاردەهێنێت.

## بابەت: دەربارەی دەرچوونی ئافرەتی مێرد مردوو (لە ماڵەوە)

٢٣٣٨ - «عَنْ سَعْد بِنْ إسْحَاق بن كعب بن عجزة عَنْ عَمَّتِهِ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّ الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكٍ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَخْبَرَتْهَا أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يَأْذَنَ لَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا؟ فَإِنَّ زَوْجَهَا قَدْ خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا فَأَدْرَكَهُمْ، حَتَّى إذَا كَانَ بِطَرَفِ الْقَدُومِ قَتَلُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: امْكُثِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ، فَقُلْتُ: إِنَّهُ لَمْ يَدَعْنِي فِي بَيْتٍ أَمْلِكُهُ، وَلاَ نَفَقَةٍ، فَقَالَ: امْكُثِي حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ فَاعْتَدَّتْ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَسَأَلَنِي عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَخْبَرْتُهُ فَاتَّبَعَ ذَلِكَ وَقَضَى بِهِ».[٢]

واتە: لە سەعدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی کەعبی کوڕی عوجزەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە پوریەوە لە زەینەبی کچی کەعبی کوڕی عوجزەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕاویەتیەوە کە فوڕەیعەی کچی مالیک (رَضِي اللهُ عَنهَا) هەواڵی پێداوە کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە تا مۆڵەتی بدات بگەڕێتەوە لای خزمەکانی؟ چونکە هاوسەرەکەی دەرچوو بوو بۆ بەدواگەڕانی چەند بەندەیەکی خۆی کە هەڵاتبوون، جا پێیان گەیشتبوو و دۆزیبوونیەوە جا لە تەڕەفول قەدووم (کە ناوی شوێنێکە) لەوێ کوشتبوویان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لە ماڵەکەتدا بمێنەوە تاوەکو ماوەکە تەواو دەبێت (واتە: تا عیددەت تەواو دەبێت)، (دەڵێ) منیش وتم: هاوسەرەکەم لە ماڵێکدا جێی نەهێشتووم کە هی خۆم بێت، وە نەفەقە و مەسرەفیشی بۆ جێ نەهێشتووم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لە ماڵەکەتدا بمێنەوە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

تاوەکو عیددە تەواو دەبێت، جا عیددەی چوار مانگ و دە ڕۆژ لە ماڵەکەیدا مایەوە، وتویەتی: جا لە سەردەمی عوسماندا (عوسمان) ناردی بەدوامدا و پرسیاری دەربارەی ئەوە لێکردم (کە ئایا دەکرێ ئافرەت دەربچێت لە ماوەی عیددەدا)؟ منیش پێم ڕاگەیاند و ئەویش شوێن ئەوە کەوت (کە بۆم گێڕایەوە) و حوکمی بەوەدا.

٢٣٣٩- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: طُلِّقَتْ خَالَتِي فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلاً لَهَا، فَقَالَ لَهَا رَجُلٌ: لَيْسَ لَكِ أَنْ تَخْرُجِي، قَالَتْ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: اخْرُجِي فَجُدِّي نَخْلَكِ، فَلَعَلَّكِ أَنْ تَصَدَّقِي أَوْ تَصْنَعِي مَعْرُوفًا».(١)

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خارەتم (واتە: خوشکی دایکم) تەڵاقدرا و ویستی بەری دار خورمایەکی خۆی بڕنێتەوە، جا پیاوێک پێی وت: تۆ بۆت نیە دەربچی، خارەتم وتی: منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی: دەربچۆ و بەری دار خورماکەت بڕنەوە بەڵکو بیکەیتە خێر و صەدەقە، یان چاکەیەکی پێ بکەیت (واتە: بۆ دەرچونێکی پێویست و کەم دەرچوون دروستە).

## بابەت: دەربارەی سەرپشک بوونی ئافرەتی کۆیلە کە خێزانی پیاوێکی کۆیلەیە و ئازاد دەکرێت

٢٣٤٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَأَرَادَ مَوَالِيهَا أَنْ يَشْتَرِطُوا وَلَاءَهَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: اشْتَرِيهَا فَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ فَاشْتَرَتْهَا، فَأَعْتَقَتْهَا، وَخَيَّرَهَا مِنْ زَوْجِهَا، وَكَانَ حُرًّا، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِلَحْمٍ فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ هَذَا؟ قِيلَ: تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ».(٢)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە کە ویستویەتی بەڕیرە بکڕێت، جا گەورەکانی بەڕیرە ویستیان میراتگرتنی بە مەرج دابنێن (واتە: دەیانەویست بیفرۆشن و دوای مردنی میراتەکەی بۆ ئەوان بێت)، جا عائیشەش ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیکڕە، میرات گرتنیش تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات، جا عائیشە کڕی و ئازادی کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ سەرپشکی کرد لە هاوسەرەکەی (کە ئایا لەلای دەمێنێتەوە یان شوو بە پیاوێکی تر دەکات) لەکاتێکدا پیاوەکەی ئازاد بوو (بەندە نەبوو)، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) گۆشتێکی بۆ هات و فەرمووی: ئەوە لە کوێ هاتووە؟ وترا: کراوەتە خێر و صەدەقە بۆ بەڕیرە، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: گۆشتەکە بۆ ئەو صەدەقەیە و بۆ ئێمەش دیاریە.

٢٣٤١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيَّ فَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ طَعَامًا، لَيْسَ فِيهِ لَحْمٌ، فَقَالَ: أَلَمْ أَرَ لَكُمْ قِدْرًا مَنْصُوبَةً، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ فَأَهْدَتْ لَنَا، قَالَ: هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، ولَنَا هَدِيَّةٌ وَكَانَ لَهَا زَوْجٌ فَلَمَّا عُتِقَتْ خُيِّرَتْ».(٣)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام و منیش خواردنێكم بۆ نزیك خستەوە، گۆشتی تیا نەبوو، فەرمووی: ئەدی مەنجەڵێكی تێوەم نەبینی (لەسەر ئاگر) دانرابوو؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە گۆشت بوو دەكرێتە خێر و صەدەقە بۆ بەڕیرە و كردویەتی بەدیاری بۆ ئێمە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ ئەو خێر و صەدەقەیە و بۆ ئێمەش دیاریە، جا (بەڕیرە) هاوسەرێكی هەبوو كاتێ ئازاد كرا سەرپشك كرا (كە ئایا لەلای دەمێنێتەوە، یان هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێكی تر دەكات).

٢٣٤٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ بَرِيرَةَ، حِينَ أَعْتَقَتْهَا عَائِشَةُ كَانَ زَوْجُهَا عَبْدًا فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ، يَحُضُّهَا عَلَيْهِ، فَجَعَلَتْ تَقُولُ: لِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَلَيْسَ لِي أَنْ أُفَارِقَهُ؟ قَالَ: بَلَى قَالَتْ: فَقَدْ فَارَقْتُهُ».[١]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێ عائیشە بەڕیرەی ئازاد كرد هاوسەرەكەی بەندە بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هانیدا لەلای بمێنێتەوە، ئەویش هەر بە پێغەمبەری خوای ﷺ دەوت: ئایا بۆم نیە لێی جیاببمەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با، (بەڕیرەش) وتی: دە ئەوە لێی جیابومەوە.

٢٣٤٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ، كَانَ عَبْدًا يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا يَبْكِي وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْعَبَّاسِ: يَا عَبَّاسُ أَلاَ تَعْجَبُ مِنْ شِدَّةِ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ، وَمِنْ شِدَّةِ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثًا، فَقَالَ لَهَا: لَوْ رَاجَعْتِيهِ فَإِنَّهُ أَبُو وَلَدِكِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَتَأْمُرُنِي؟ قَالَ: إِنَّمَا أَنَا شَافِعٌ، قَالَتْ: لاَ حَاجَةَ لِي فِيهِ».[٢]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاوسەری بەڕیرە پیاوێكی بەندە بوو، كە پێی دەوترا: موغیث، (من لەبەر چاومە) وەك ئەوەی ئێستا سەیری بكەم كە چۆن لە دواوەی بەریرە دەخولایەوە و دەگریا و فرمێسكەكانی بەسەر ڕیشیدا دەچۆڕایەوە (چونكە لێی جیابوویەوە)، پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی وت: ئەی عەبباس ئایا سەرت سوڕنامێنێت لە خۆشەویستی زۆری موغیث بۆ بەریرە و ڕقی زۆری بەریرەش بۆ موغیث، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) بە بەڕیرەی فەرموو: بۆچی ناگەڕێیتەوە لای، ئەو باوكی منداڵەكەتە؟ بورەیرەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێ دەكەیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (نەخێر) من تەنها تكاكارم، بەریرەش وتی: من پێویستیم پێی نیە.

## بابەت: دەربارەی سەرپشك كردنی منداڵ لە نێوان دایك و باوكی (دوای تەڵاق)

٢٣٤٤ - «عَنْ أَبِي مَيْمُونَةَ سُلَيْمَانَ ﷺ، مَوْلًى لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِوَلَدِي، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِذْ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ:

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِوَلَدِي أَوْ بِابْنِي، وَقَدْ نَفَعَنِي وَسَقَانِي مِنْ بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اسْتَهِمَا، أَوْ قَالَ: تَسَاهَمَا أَبُو عَاصِمٍ الشَّاكُّ، فَجَاءَ زَوْجُهَا، فَقَالَ: مَنْ يُخَاصِمُنِي فِي وَلَدِي أَوْ فِي ابْنِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا غُلَامُ هَذَا أَبُوكَ، وَهَذِهِ أُمُّكَ، فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ وَقَدْ قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: فَاتْبَعْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ فَانْطَلَقَتْ بِهِ».[١]

واتە: لە ئەبو مەیمونەوە ﷺ، (واتە) لە سولەیمانی خزمەتکاری یەکێک لە خەڵکی مەدینەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەلای ئەبو هورەیرە ﷺ بووم و ئافرەتێک هات بۆ لای و وتی: هاوسەرەکەم دەیەوێت منداڵەکەم لێ بسەنێت، ئەبو هورەیرەش وتی: لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لەو کاتەی ئافرەتێک هات بۆ لای و وتی: هاوسەرەکەم دەیەوێت منداڵەکەم لێ بسەنێت، لەکاتێکدا سودی زۆری پێگەیاندووم و ئاوی بۆ هێناوم لە بیری ئەبو عینەبە (واتە: من پێویستیم بە یارمەتی منداڵەکەم هەیە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەردوکتان تیروپشک بکەن، جا هاوسەرەکەی هات و وتی: کێ ڕکابەریم لەگەڵ دەکات لەسەر منداڵەکەم؟ (واتە: دەبێ هەر بۆ من بێت)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی منداڵ ئەوە باوکتە و ئەوەش دایکتە، جا دەستی هەر یەکێکیان بگرە کە دەتەوێت، ئەبو عاصیم وتویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی): دوای ئەوەیان بکەوە کە دەتەوێت، جا منداڵەکە دەستی دایکی گرت و، دایکی بردی.

## بابەت: دەربارەی تەڵاقی ئافرەتی کۆیلە

٢٣٤٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لِلأَمَةِ تَطْلِيقَتَانِ، وَقُرُوؤُهَا حَيْضَتَانِ قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: سَمِعْتُهُ مِنْ مُظَاهِرٍ».[٢]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئافرەتی کۆیلە دوو تەڵاقی بۆ هەیە، وە عیددەکەشی دوو پاکبوونەوەیە.

## بابەت: دەربارەی دڵنیابوونەوە لە ڕەحمی ئافرەتی کۆیلە

٢٣٤٦ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ ، وَرَفَعَهُ، أَنَّهُ قَالَ: فِي سَبَايَا أَوْطَاسٍ لاَ تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ حَمْلَهَا، وَلاَ غَيْرُ ذَاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً».[٣]

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە و وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئافرەتانی دەستگیرکراوی ئەوتاس (کە شوێنێکە) فەرموویەتی: هیچ ئافرەتێکی دوو گیان جیماعی لەگەڵ ناکرێ تاوەکو منداڵەکەی دادەنێ، وە جگە لە ئافرەتی دوو گیانیش جیماعی لەگەڵ ناکرێت تاوەکو حەیزێک نەبینێت (تاوەکو جارێک عادە دەبێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ اسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: قەڵەمی تاوان نوسین لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە

٢٣٤٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، وَقَدْ قَالَ حَمَّادٌ: أَيْضًا وَعَنِ الْمَعْتُوهِ حَتَّى يَعْقِلَ».[١]

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: قەڵەمی (تاوان) لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تاوەکو خەبەری دەبێتەوە، وە لەسەر بچوک تاوەکو بالغ دەبێت، وە لەسەر شێت تاوەکو چاک دەبێتەوە، وە حەمماد وتویەتی: وە لەسەر گێل هەڵگیراوە تاوەکو ژیر دەبێتەوە.

## بابەت: ئەو شتەی خوێنی مسوڵمانی پێ حەڵاڵ دەبێت

٢٣٤٨ - «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: بِكُفْرٍ بَعْدَ إِيمَانٍ، أَوْ بِزِنًى بَعْدَ إِحْصَانٍ، أَوْ يَقْتُلُ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ فَيُقْتَلُ».[٢]

واتە: لە عوسمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوێنی کەسی مسوڵمان حەڵاڵ نیە تەنها بە یەکێک لەو سێ شتانە نەبێت: بە کوفر کردن و کافربوونەوە دوای بڕواهێنان، یان بە زینا کردن دوای هاوسەرگیری، یان بەوەی کەسێک بکوژێت بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێت، ئەوە دەکوژرێتەوە.

٢٣٤٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَحِلُّ دَمُ رَجُلٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ إلاَّ أَحَدَ ثَلاَثَةِ نَفَرٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ».[٣]

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنی هیچ مرۆڤێک حەڵاڵ نیە کە شاهێدی بدات بەوەی: هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله، تەنها سێ کەس نەبێت: ئەوەی کەسێکی کوشتووە دەکوژرێتەوە، وە زیناکەری بە هاوسەر (ڕەجم دەکرێت)، وە ئەو مسوڵمانەی دینەکەی وازلێهێناوە و لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابۆتەوە و (لە دژیان دەوەستێتەوە، ئەوە شەڕی لەگەڵ دەکرێت و دەکوژرێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو دزەی شتە دزراوەکەی پێ دەبەخشرێت دوای ئەوەی دزی دەکات

٢٣٥٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ ﷺ نَائِمًا فِي الْمَسْجِدِ فَأَتَاهُ رَجُلٌ وَهُوَ نَائِمٌ، فَاسْتَلَّ رِدَاءَهُ، مِنْ تَحْتِ رَأْسِهِ، فَتَنَبَّهَ بِهِ، فَلَحِقَهُ، فَأَخَذَهُ، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كُنْتُ نَائِمًا فِي الْمَسْجِدِ فَأَتَانِي هَذَا، فَاسْتَلَّ رِدَائِي مِنْ تَحْتِ رَأْسِي، فَلَحِقْتُهُ، فَأَخَذْتُهُ، فَأَمَرَ بِقَطْعِهِ. فَقَالَ لَهُ صَفْوَانُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ رِدَائِي لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يُقْطَعَ فِيهِ هَذَا، قَالَ: فَهَلاَ قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ؟».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: صەفوانی کوڕی ئومەییە ﷺ خەوتبوو لە مزگەوت و، پیاوێک هاتە لای لەکاتێکدا ئەو خەوتبوو، جا بە ئەسپایی و هێواشی جوببەکەی لە ژێر سەری دەرهێنا، صەفوانیش خەبەری بویەوە و (دوایکەوت) و پێی گەیشتەوە و گرتی و بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من خەوتبووم لە مزگەوت و ئەوە هات بۆ لام و جوببەکەمی لەژێر سەرم دەرهێنا و بردی، منیش دوایکەوتم و پێی گەیشتمەوە و گرتم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد بە دەست بڕینی پیاوەکە، جا صەفوان بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوببەکەم ئەوە ناهێنێ دەستی لەسەر ببڕێت (لێی خۆش دەبم و بە دیاری پێی دەدەم)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەدی بۆچی (وات نەدەکرد) پێش ئەوەی بیهێنی بۆ لام؟.

## بابەت: ئەو ئەندازەیەی دەستی لەسەر دەبڕێت

٢٣٥١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ، فَصَاعِدًا».[٢]

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەست دەبڕدرێت لەسەر چارەکە دینارێکی زێڕ و زیاتر.

٢٣٥٢ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَطَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزی بڕیوە لەسەر قەڵغانێک کە قیمەتەکەی سێ دیرهەم بووە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: شەفاعەت و تكاكردن لە سزادان لەلای كاربەدەست

٢٣٥٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللهِ ﷺ ، قَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، حِبُّ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ، ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ فَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ، تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ، أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا».(١)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: قورەیشیەكان بابەتی ئەو ئافرەتە مەخزومیەیان لەلا گرینگ و گەورەبوو كە دزی كردبوو، بۆیە وتیان: كێ دەربارەی ئافرەتەكە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات؟ وتیان: جا كێ دەوێری جگە لە ئوسامەی كوری زەیدی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا (تەكلیفیان لە ئوسامە كرد) و ئوسامەش قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئایا شەفاعەت و تكا لە سزایەک لە سزاكانی خوا دەكەیت؟! دواتر هەڵسا و وتاریدا و فەرمووی: ئەوانەی پێشی ئێوە تەنها لەبەر ئەوە لەناوچوون (چونكە) ئەوان (عادەتیان وابوو) كاتێ كەسێكی ناودار و خاوەن بنەماڵە دزی بكردایە وازیان لێ دەهێنا (سزایان نەدەدا)، وە كاتێكیش كەسێكی بێ دەسەلات دزی بكردایە ئەوە سزایان لەسەر جێبەجێ دەكرد، جا سوێند بەخوا ئەگەر فاتیمەی كچی موحەممەد (واتە: فاتیمەی كچم) دزی بكات ئەوە دەستی دەبڕم.

## بابەت: ئەو كەسەی دان دەنێت بە دزی

٢٣٥٤ - «عَنْ أَبِي الْمُنْذِرِ، مَوْلَى أَبِي ذَرٍّ ﷺ عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الْمَخْزُومِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِسَارِقٍ اعْتَرَفَ اعْتِرَافًا لَمْ يُوجَدْ مَعَهُ مَتَاعٌ، فَقَالَ: مَا إِخَالُكَ سَرَقْتَ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: مَا إِخَالُكَ سَرَقْتَ؟ قَالَ: بَلَى. قَالَ: فَاذْهَبُوا، فَاقْطَعُوا يَدَهُ، ثُمَّ جِيئُوا بِهِ، فَقَطَعُوا يَدَهُ، ثُمَّ جَاءُوا بِهِ فَقَالَ: اسْتَغْفِرِ اللهَ، وَتُبْ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَسْتَغْفِرُ اللهَ، وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: اللهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ، اللهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ».(٢)

واتە: لە ئەبو مونذیری خزمەتكاری ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئەبو ئومەییەی مەخزومیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، وتویەتی: دزێک هێنرا لای پێغەمبەری خوا ﷺ، دزەكە دانینا و ئیعترافی كرد، هیچ كەلوپەلێكیشی لەلا نەبینرا، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: گومان نابەم دزیت كردبێت؟ وتی: بۆنا (دزیم كردوە)، (دووبارە) فەرمووی: گومان نابەم دزیت كردبێت؟ وتی: (دزیم كردوە)، فەرمووی: كەواتە ببەن و دەستی ببڕن، دواتر بیهێنن، جا دەستیان بڕی و دواتر هێنایان،

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە و بگەڕێوە بۆ لای خوا، دزەکەش وتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای و (پەشیمانم)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوایە تەوبەکەی لێ وەرگرە، خوایە تەوبەکەی لێ وەرگرە.

## بابەت: ئەو شتەی دەستی لەسەر نا بڕدرێت لە بەروبوم کاتێ بەسەر درەختەوەیە

٢٣٥٥ - «رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ».(١)

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین نیە لە بەروبوم کاتێ بەسەر درەختەوەیە، هەروەها (دەست بڕین نیە) لە کەثەر جوممار (کە بریتیە لە ناوکی دار خورما کە وەک ناوکی قەدی خاس وایە).

٢٣٥٦ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ».(٢)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین نیە لە بەروبوم کاتێ بەسەر درەختەوەیە، وە (دەست بڕین نیە) لە کەثەر جوممار (کە بریتیە لە ناوکی دار خورما کە وەک ناوکی قەدی خاس وایە).

٢٣٥٧ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ، وَلاَ كَثَرٍ».(٣)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین نیە لە بەروبوم کاتێ بەسەر درەختەوەیە، وە (دەست بڕین نیە) لە کەثەر جوممار (کە ناوکی دار خورمایە وەک ناوکی قەدی خاس وایە).

٢٣٥٨ - «حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ».(٤)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٣٥٩ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ، وَلاَ كَثَرٍ قَالَ: وَهُوَ شَحْمُ النَّخْلِ، وَالْكَثَرُ الْجُمَّارُ».(٥)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین نیە لە بەروبوم کاتێ بەسەر درەختەوەیە، وە (دەست بڕین نیە) لە کەثەر.

ڕافیع وتویەتی: (کەثەر) بەزی دار خورمایە، جومماڕە (کەثەر یان جومماڕ بریتیە لە ناوکی دار خورما، وەک ناوکی خاس وایە).

٢٣٦٠ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي كَثَرٍ قَالَ أَبُو مُحَمَّد الْقَوْلُ: مَا قَالَ أَبُو أُسَامَةَ».[١]

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین نیە لە کەثەر (کە ناوکی دار خورمایە وەک ناوکی قەدی خاس وایە).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: قسە ئەوەیە کە ئەبو ئوسامە وتویەتی (واتە: فەرموودەی ئەو ڕەت ناکرێتەوە).

## بابەت: ئەو دزانەی دەستیان نابڕێت

٢٣٦١ - «قَالَ جَابِرٌ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الْمُنْتَهِبِ، وَلاَ عَلَى الْمُخْتَلِسِ، وَلاَ عَلَى الْخَائِنِ قَطْعٌ».[٢]

واتە: جابر ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تاڵانکار و، ڕفێنەر و خائین دەست بڕینیان لەسەر نیە (سزای تریان لە سەرە).

## بابەت: دەربارەی سزای مەشڕوب خواردنەوە

٢٣٦٢ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ خَمْرًا فَضَرَبَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ ثُمَّ فَعَلَ أَبُو بَكْرٍ مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ اسْتَشَارَ النَّاسَ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَخَفُّ الْحُدُودِ ثَمَانِينَ، قَالَ: فَفَعَلَ».[٣]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە مەشڕوبی خواردبوویەوە، جا لێیدا (واتە: فەرمانی کرد چل داری لێبدرێت) بە دوو شوارکە دار، دواتر ئەبوبەکر (لە سەردەمی خۆی) وەک پێغەمبەری خوای کرد، جا کاتێ سەردەمی ئیمامی عومەر هات پرسی بە خەڵکی کرد، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفیش وتی: کەمترینی سزا هەشتایە (کەواتە: وەک تەعزیر دەکرێ بکرێتە هەشتا جەلدە)، (ئەنەس) دەڵێ: جا عومەر جێبەجێی کرد (واتە: لە جیاتی چل دار کردی بە هەشتا دار).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

٢٣٦٣ - «حَدَّثَنَا حُضَيْنُ بْنُ الْمُنْذِرِ الرَّقَاشِيُّ، قَالَ: شَهِدْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ وَأُتِيَ بِالْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ فَقَالَ عَلِيٌّ ﷺ جَلَدَ النَّبِيُّ ﷺ أَرْبَعِينَ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ، وَعُمَرُ ثَمَانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ».[1]

واتە: لە حوضەینی کوڕی مونذیری ڕەقاشیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بووم و وەلیدی کوڕی عوقبە هێنرا و عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ چل داری لە مەشڕوبخۆر داوە، ئەبوبەکریش چل داری لێداوە، عومەریش هەشتا داری لێداوە، هەمووشیان هەر سوننەتن (واتە: هەموویان هەر دروستن).

## بابەت: دەربارەی مەشڕوبخۆر کاتێ هێنرا بۆ جاری چوارەم

٢٣٦٤ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَاضْرِبُوهُ، ثُمَّ إِنْ عَادَ فَاضْرِبُوهُ، ثُمَّ إِنْ عَادَ فَاضْرِبُوهُ، ثُمَّ إِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ فَاقْتُلُوهُ».[2]

واتە: لە عەمری کوڕی شەریدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کاتێ یەکێک لە ئێوە مەشڕوبی خواردەوە ئەوە لێی بدەن (واتە: چل داری لێبدەن)، دواتر ئەگەر دووبارەی کردەوە ئەوە لێی بدەن، دواتر ئەگەر دیسان دووبارەی کردەوە ئەوە لێی بدەن، دواتر ئەگەر دیسان دووبارەی کردەوە بۆ جاری چوارەم ئەوە بیکوژن.

## بابەت: تەمێ کردن لەسەر گوناهـ و تاوان

٢٣٦٥ - «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَضْرِبَ أَحَدًا فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ، إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ».[3]

واتە: لە ئەبو بوردەی کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بۆ کەس حەڵاڵ و دروست نیە لە دە قامچی زیاتر لە هیچ کەسێک بدات، تەنها لە سزاکانی خوا دروستە (وەک سزای زینا و، مەشڕوب خواردن و، بوختان).

## بابەت: ئیعتیراف و داننان بە زینا

٢٣٦٦ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَحَدَّثَهُ أَنَّهُ زَنَى، فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَنَّهُ زَنَى، أَرْبَعًا فَأَمَرَ بِرَجْمِهِ، وَكَانَ قَدْ أُحْصِنَ».[4]

---

(١) ـ صحیح.
(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح، پێشەوا ترمذی دەڵێ: لای کۆی زانایان کار بەم فەرموودە ناکرێ .
(٣) ـ صحیح.
(٤) ـ ـ صحیح.

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە هۆزی ئەسلەم هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و بۆی باس کرد کە زینای کردوە و شاهێدی لەسەر خۆیدا بەوەی زینای کردوە، چوار جار (ئیعتیرافی کرد)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد بە ڕەجم کردن (بە بەرد بارانکردنی)، چونکە ژنی هێنابوو.

٢٣٦٧ - «عَنْ سِمَاكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ ﷺ، يَقُولُ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ رَجُلٍ قَصِيرٍ فِي إِزَارٍ مَا عَلَيْهِ رِدَاءٌ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَّكِئٌ عَلَى وِسَادَةٍ عَلَى يَسَارِهِ، فَكَلَّمَهُ فَمَا أَدْرِي مَا يُكَلِّمُهُ بِهِ، وَأَنَا بَعِيدٌ مِنْهُ بَيْنِي وَبَيْنَهُ الْقَوْمُ، فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ، ثُمَّ قَالَ: رُدُّوهُ فَكَلَّمَهُ أَيْضًا، وَأَنَا أَسْمَعُ غَيْرَ أَنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ الْقَوْمَ، ثُمَّ قَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ، ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَخَطَبَ وَأَنَا أَسْمَعُهُ، ثُمَّ قَالَ: كُلَّمَا نَفَرْنَا فِي سَبِيلِ اللهِ خَلَفَ أَحَدُهُمْ لَهُ نَبِيبٌ كَنَبِيبِ التَّيْسِ، يَمْنَحُ إِحْدَاهُنَّ الْكُثْبَةَ مِنَ اللَّبَنِ؟ وَاللهِ لاَ أَقْدِرُ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ إِلاَّ نَكَّلْتُ بِهِ».[1]

واتە: لە سیماکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە جابری کوڕی سەموڕە بوو ﷺ دەیوت: ماعیزی کوڕی مالیک هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کە پیاوێکی کورتە باڵا بوو جلی خوارەوەی لەبەردا بوو، جلی سەرەوەی لەبەر نەبوو (واتە: لە ناوقەدی بە خوارەوە جلی لەبەر بوو، بەڵام سەرەوەی جەستەی ڕووت بوو)، (کە هێنرا) پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵکەوتبوو لەسەر سەرینێک (لەسەر بالیفێک) لەسەر لای چەپەی، جا ماعیز قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، من نەمزانی قسەی چی لەگەڵ کرد، من لێی دوور بووم لە نێوان من و ئەودا خەڵکانێک هەبوو، دواتر (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ببەن و بەرد بارانی بکەن، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و وتاریدا، منیش گوێم لێی بوو، دواتر فەرمووی: هەموو جار کە دەچین بۆ جەنگ و جیهاد یەکێک لەوان دەمێنێتەوە و نایێت بۆ جیهاد و وەک نێری دەنگی شەهوەت و خراپەی لێوەدێت (بەناوی ئەوەی) تۆزێک شیر بدات بە ماڵ و منداڵی مسوڵمانان (واتە: بەناوی خزمەت کردنی منداڵ و خێزانی ئەو پیاوانەی چوون بۆ جیهاد)؟ دە سوێند بەخوا هیچ کەسێک لەوان نیە دەسەڵاتم بەسەریدا بشکێت و دەستم بکەوێت حەتمەن لەسەر ئەو کارە دەیکەم بە پەند.

٢٣٦٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ﷺ، وَشِبْلٍ، قَالُوا: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللهَ إِلاَّ قَضَيْتَ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ فَقَالَ: خَصْمُهُ وَكَانَ أَفْقَهَ مِنْهُ صَدَقَ اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَأْذَنْ لِي يَا رَسُولَ اللهِ أَنْ أَتَكَلَّمَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قُلْ، فَقَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى أَهْلِ هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَخَادِمٍ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رِجَالاً مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى ابْنِي جَلْدَ مِائَةٍ وَتَغْرِيبَ عَامٍ وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ الْمِائَةُ شَاةٍ وَالْخَادِمُ رَدٌّ عَلَيْكَ وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ. وَيَا أُنَيْسُ اغْدُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا فَسَلْهَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا، فَاعْتَرَفَتْ، فَرَجَمَهَا».[2]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ و زەیدی کوڕی خالید و شیبلەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویانە: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: سوێندت دەدەم بەخوا کە تەنها بە پەرتوکی خوا دادوەریمان لە نێواندا بکەیت، جا ڕکابەر و خەصمی پیاوەکە کە پیاوێکی ژیرتر بوو (بە شێوازێکی جوانتر) وتی: ڕاست دەکات، دادوەریمان لە نێوان بکە بە پەرتوکی خوا، وە ئیزن و مۆڵەتم پێ بدە ئەی پێغەمبەری خوا کە قسە بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڵێ (قسە بکە)، پیاوەکە وتی: کوڕی من بە کرێکاری بۆ ئەم پیاوە کاری کردوە و زینای لەگەڵ خێزانەکەی کردوە، منیش لە تۆڵەی ئەوە سەد بزن و خزمەتکارێکم داوەتێ، وە من پرسیارم لە چەندین پیاوی زانا و خاوەن زانست کردوە، ئەوانیش پێیان ڕاگەیاندووم کە کوڕەکەم سەد جەڵدی لەسەرە (دەبێ سەد شوارکی لێبدرێت) و ساڵێکیش دوور بخرێتەوە، وە خێزانی ئەو پیاوەش بەرد بارانکردنی لەسەرە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، دادوەریتان لە نێوان دەکەم بە پەرتوکی خوا، سەد بزن و خزمەتکارەکە دەگەڕێتەوە بۆت، کوڕەکەشت سەد جەلد و دوورخستنەوەی ساڵێکی لەسەرە، جا ئەنەسۆکە بڕۆ بۆ لای خێزانی ئەم پیاوە و پرسیاری لێ بکە، جا ئەگەر دانینا و ئیعترافی کرد ئەوە بەردبارانی بکە، جا ئیعتیڕافی کرد و بەرد بارانی کرد.

## بابەت: ئەو کەسەی ئیعترافی کردوە و پەشیمان دەبێتەوە لە ئیعتڕافەکەی

**٢٣٦٩** - «عَنْ أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ نَصْرِ بْنِ دَهْرٍ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَعْنِي مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ: فَلَمَّا وَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ جَزِعَ جَزَعًا شَدِيدًا، قَالَ: فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: فَهَلاَ تَرَكْتُمُوهُ».[1]

واتە: لە ئەبو هەیثەمی کوڕی نەصری کوڕی دەهری ئەسلەمیەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من لەناو ئەو خەڵکە بووم کە بەرد بارانیان کرد ـ ئەبو موحەممەد وتویەتی: مەبەستی بەردبارانکردنی ماعیزی کوڕی مالیکە ـ جا کاتێ ئازاری بەردەکانی پێگەیشت زۆر ترسا و ڕای کرد (ئەوانیش گرتیانەوە و بەتەواوی ڕەجمیان کرد و کوشتیان)، دەڵێ: جا ئەوەمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەدی بۆچی وازتان لێ نەهێنا؟!

## بابەت: چاڵ هەڵکەندن بۆ ئەو کەسەی بەتەمانە ڕەجمی بکەن

**٢٣٧٠** - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: انْطَلِقُوا بِمَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ فَارْجُمُوهُ فَانْطَلَقْنَا بِهِ إِلَى بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَوَاللهِ مَا أَوْثَقْنَاهُ، وَلاَ حَفَرْنَا لَهُ، وَلَكِنْ قَامَ فَرَمَيْنَاهُ بِالْعِظَامِ، وَالْخَزَفِ، وَالْجَنْدَلِ».[2]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماعیزی کوڕی مالیک ببەن و بەرد بارانی بکەن، ئێمەش بردمان بۆ بەقیعی غەرقەد (کە شوێنێکی مەدینەیە)،

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

جا سوێند بەخوا نەمانبەستایەوە و چاڵمان بۆ لێنەدا، بەڵکو وەستا و ئێمەش بە ئێسقان و چەگر و بەرد ڕەجممان کرد.

٢٣٧١ - «حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَجَاءَهُ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ فَاعْتَرَفَ عِنْدَهُ بِالزِّنَا، فَرَدَّهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ جَاءَ الرَّابِعَةَ، فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَحُفِرَ لَهُ حُفْرَةٌ، فَجُعِلَ فِيهَا إِلَى صَدْرِهِ، وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَرْجُمُوهُ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من دانیشتبووم لەلای پێغەمبەر ﷺ، پیاوێک هات بۆ لای، کە پێی دەوترا: ماعیزی کوڕی مالیک، جا ئیعترافی کرد و دانینا بە زینا لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ سێ جار گەڕاندیەوە و ڕەتی کردەوە، دواتر بۆ جاری چوارەم هاتەوە و ئیعتڕافی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد و چاڵێکی بۆ هەڵکەنرا و تا سینگی خرایە ناویەوە، وە فەرمانی بە خەڵکی کرد کە بەرد بارانی بکەن.

## بابەت: دەربارەی دادوەری کردن لە نێوان ئەهلی کتاب ئەگەر حوکمیان بردە لای کاربەدەستانی مسوڵمانان

٢٣٧٢- «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ الْيَهُودَ، جَاءُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِرَجُلٍ مِنْهُمْ، وَامْرَأَةٍ قَدْ زَنَيَا، فَقَالَ: كَيْفَ تَفْعَلُونَ بِمَنْ زَنَى مِنْكُمْ؟ قَالُوا: لاَ نَجِدُ فِيهَا شَيْئًا، فَقَالَ لَهُمْ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: كَذَبْتُمْ فِي التَّوْرَاةِ الرَّجْمُ، فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ، فَجَاءُوا بِالتَّوْرَاةِ فَوَضَعَ مِدْرَاسُهَا الَّذِي يَدْرُسُهَا مِنْهُمْ كَفَّهُ، عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، فَقَالَ: مَا هَذِهِ؟ فَلَمَّا رَأَوْا ذَلِكَ، قَالُوا: هِيَ آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَرُجِمَا قَرِيبًا، مِنْ حَيْثُ تُوضَعُ الْجَنَائِزُ عِنْدَ الْمَسْجِدِ قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَرَأَيْتُ صَاحِبَهَا يَجْنَأُ عَلَيْهَا، يَقِيهَا الْحِجَارَةَ».[٢]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جولەکەکان پیاوێک و ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە زینایان کردبوو، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: چی دەکەن لەو کەسانەی کە زینا دەکەن لە ئێوەن (واتە حوکمیان چۆنە لای ئێوەی جولەکە)؟ وتیان: (لای ئێمە) هیچ شتێک دەربارەی ئەوە نیە، جا عەبدوڵڵای کوڕی سەلام پێی وتن: درۆتان کرد، ڕەجم کردن لە تەوڕاتدا هەیە، دە تەوڕات بێنن و بیخوێننەوە ئەگەر ڕاست دەکەن، جا تەوڕاتیان هێنا و تەوڕاتخوێنەکەیان ئەوەی کە لەناو ئەمان تەوڕات دەخوێنێتەوە دەستی خستە سەر ئایەتی ڕەجم و شاردیەوە و وتی: کوانێ؟ جا کە ئەوەیان بینی (هەستیان کرد فێڵ دەکات و شتێکی لە ژێر دەستی شاردۆتەوە، سەیریان کرد و) وتیان: ئەوەتا ئەوە ئایەتی ڕەجمە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەرکرد دەربارەی دوو کەسەکە و لە نزیک ئەوێ ڕەجم کران، لەو شوێنەی کە لەلای مزگەوت جەنازەی لێ دادەنرا.

عەبدوڵڵا وتویەتی: جا بینیم پیاوەکە خۆی بەسەر ئافرەتەکە دادابوو دەیپاراست لە بەردەکان.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی سزای کەسانی بە هاوسەر لەسەر زیناکردن

٢٣٧٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى بَعَثَ مُحَمَّدًا ﷺ بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، وَكَانَ فِيمَا أَنْزَلَ آيَةُ الرَّجْمِ فَقَرَأْنَاهَا، وَوَعَيْنَاهَا، وَعَقَلْنَاهَا، وَرَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ، أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُ: لاَ نَجِدُ حَدَّ آيَةِ الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللهِ، وَالرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا أُحْصِنَ، إِذَا قَامَتْ عَلَيْهِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ، أَوِ الِاعْتِرَافُ».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتویەتی: خوای بەرز موحەممەدی ﷺ بە هەق ناردووە و قورئانی بۆ دابەزاندووە، جا لەوەی بۆی دابەزاندووە ئایەتی ڕەجمە، ئێمە خوێندومانەتەوە و لەبەرمان کردوە و لێی تێگەیشتووین و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی کردوە و ئێمەش دوای ئەو ڕەجممان کردوە، جا دەترسم کاتێکی دورو درێژ بەسەر خەڵکیدا تێپەڕ بێت و کەسێک بێت و بڵێت: ئایەتی سزای ڕەجم نابینین لە پەرتوکی خوادا، لە کاتێکدا ڕەجم لە پەرتوکی خوادا هەق و ڕاستە و (بوونی هەیە و حوکمەکەی ماوە) لەسەر ئەو کەسانەی زینا دەکەن لە پیاوان و ئافرەتان کاتێ کە هاوسەرگیریان کردبێت و، بەڵگەیان لەسەر ئیسپات بوو، یان حەمل و دووگیانی پەیدابوو، یان کە خۆیان ئیعترافیان کرد.

٢٣٧٤ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ».[٢]

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: شاهێدی و گەواهیدی دەدەم کە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پیاو و ئافرەتی خێزاندار کاتێ زینایان کرد بەردباران و ڕەجمیان بکەن بەبێ دودڵی.

## بابەت: ئافرەتی دووگیان کاتێ ئیعتراف دەکات و داندەنێت بە زینا کردن

٢٣٧٥ - «حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي غَامِدٍ فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ إِنِّي قَدْ زَنَيْتُ، وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ تُطَهِّرَنِي، فَقَالَ لَهَا: ارْجِعِي، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ أَيْضًا، فَاعْتَرَفَتْ عِنْدَهُ بِالزِّنَا، فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ طَهِّرْنِي فَلَعَلَّكَ أَنْ تَرْدُدَنِي، كَمَا رَدَدْتَ مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ، فَوَاللهِ إِنِّي لَحُبْلَى، فَقَالَ لَهَا: النَّبِيُّ ﷺ ارْجِعِي حَتَّى تَلِدِي، فَلَمَّا وَلَدَتْ جَاءَتْ بِالصَّبِيِّ تَحْمِلُهُ فِي خِرْقَةٍ، فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ هَذَا قَدْ وَلَدْتُ، فَقَالَ: فَاذْهَبِي فَأَرْضِعِيهِ، ثُمَّ افْطِمِيهِ، فَلَمَّا فَطَمَتْهُ، جَاءَتْ

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

بِالصَّبِيِّ فِي يَدِهِ كِسْرَةُ خُبْزٍ، فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ قَدْ فَطَمْتُهُ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالصَّبِيِّ، فَدُفِعَ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا فَحُفِرَ لَهَا حُفْرَةٌ، فَجُعِلَتْ فِيهَا إِلَى صَدْرِهَا، ثُمَّ أَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَرْجُمُوهَا، فَأَقْبَلَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ بِحَجَرٍ، فَرَمَى رَأْسَهَا فَتَلَطَّخَ الدَّمُ عَلَى وَجْنَةِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، فَسَبَّهَا، فَسَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ سَبَّهُ إِيَّاهَا، فَقَالَ: مَهْ يَا خَالِدُ لاَ تَسُبَّهَا، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا صَاحِبُ مَكْسٍ، لَغُفِرَ لَهُ، فَأَمَرَ بِهَا، فَصُلِّيَ عَلَيْهَا، وَدُفِنَتْ».[١]

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی بوڕەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من دانیشتبووم لەلای پێغەمبەر ﷺ و ئافرەتێکی غامیدی هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من زینام کردوە و دەمەوێت پاکم بکەیتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بگەڕێوە (برۆ)، جا کە بەیانی داهات دیسان هاتەوە بۆ لای و ئیعتڕافی لەلا کردەوە بە زینا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پاکم بکەرەوە، جا لەوانەیە ڕەتم بکەیتەوە وەک چۆن (چەند جار) ماعیزی کوڕی مالیکت گەڕاندەوە و ڕەت کردەوە، دە سوێند بە خوا من دووگیانم، پێغەمبەری خواش پێی فەرموو: بگەڕێوە بڕۆ، تا منداڵەکەت دەبێت، جا کە منداڵەکەی بوو، منداڵەکەی هێنا لەناو پەڕۆکێکدا هەڵی گرتبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەتا منداڵەکەم بوو، پێغەمبەری خوا فەرمووی: برۆ شیری پێ بدە، دواتر لە شیری بکەرەوە (دوای دوو ساڵ)، جا کە لە شیری کردەوە منداڵەکەی هێنا کە پارچە نانێکی لەدەست بوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شیرم کردۆتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد منداڵەکە بدرێت بە پیاوێکی مسوڵمان و (ئەو بەخێوی بکات و سەرپەرشتی بکات)، وە فەرمانی کرد دەربارەی ئافرەتەکە و چاڵێکی بۆ هەڵکەنرا و تا سینگی خرایە ناویەوە، دواتر فەرمانی بە خەڵکی کرد کە بەرد بارانی بکەن، جا خالیدی کوڕی وەلید بە بەردێک ڕوی تێکرد و لە سەریدا و خوێن کەوتە سەر کوڵمەی ڕومەتی خالیدی کوڕی وەلید و خالید جوێنێکی بە ئافرەتەکەدا، پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی لەو جوێنە بوو کە پێیدا، جا فەرمووی: وس (بێ دەنگبە) ئەی خالید، جوێنی پێ نەڵێی، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئافرەتەکە تەوبەیەکی کردوە ئەگەر گومرگ وەرگرێکی زاڵم ئەو تەوبەی بکردایە ئەوە خوا لێی خۆش دەبوو، جا فەرمانی کرد و نوێژی لەسەر کرا و بەخاک سپێردرا.

٢٣٧٦ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ وَهِيَ حُبْلَى مِنَ الزِّنَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَلِيَّهَا، فَقَالَ: اذْهَبْ فَأَحْسِنْ إِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ حَمْلَهَا، فَأْتِنِي بِهَا، فَفَعَلَ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا. فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَتُصَلِّي عَلَيْهَا، وَقَدْ زَنَتْ، فَقَالَ: لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، لَوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدْتَ أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟».[٢]

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئافرەتێک لە هۆزی جوهەینە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە دووگیان ببوو بە زینا کردن و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من توشی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

سزایەک بووم، بۆیە لەسەرم جێبەجێ بکە، (پێغەمبەری خوا) بانگی سەرپەرشتارەکەی کرد و فەرمووی: برۆ بیبە و لەگەڵی چاکبە، وە کاتێ حەملەکەی دانا بیهێنە بۆ لام، سەرپەرشتیارەکەش وای کرد و (لە کاتی خۆیدا هێنای)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد و کراسەکەی جوان لێ لولدرا، دواتر فەرمانی دەربارە دەرکرد و بەرد باران کرا، دواتر نوێژی لەسەر کرد، عومەریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژی لەسەر دەکەی لە کاتێکدا زینای کردوە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی تەوبەیەکی کردوە ئەگەر لە نێوان حەفتا کەسی خەڵکی مەدینەدا دابەش بکرێت ئەوە لێیان زیاد دەبێت، وە ئایا لەوە چاکترت بینیوە کە وەک ئەو ئافرەتە خۆی بکاتە قوربانی بۆ خوای زاڵی پایەدار (واتە: لەوە چاکترت بینیوە خۆی ئاوا بداتە بەر حوکمی خواو ئاوا ملکەچ بێت بۆ حوکم و بڕیاری خوا)؟

## بابەت: دەربارەی کۆیلەکان کاتێ زینا دەکەن، ئەوە گەورەکانیان سزاکەیان لەسەر جێبەجێ دەکەن نەوەک کاربەدەست

٢٣٧٧ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ الأَمَةِ تَزْنِي وَلَمْ تُحْصَنْ. فَقَالَ:إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، قَالَ: فَمَا أَدْرِي فِي الثَّالِثَةِ، أَوْ فِي الرَّابِعَةِ، فَبِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ».(١)

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی و ئەبو هورەیرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە وتویانە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئافرەتی کۆیلە کاتێ زینا دەکات و هاوسەرگیری نەکردوە، پێغەمبەری خواش فەرمووی: ئەگەر زینای کرد جەڵدی لێ بدەن، دواتر ئەگەر زینای کردەوە ئەوە جەڵدی لێ بدەن، (زوهری) وتویەتی: نازانم لە جاری سێیەم یان جاری چوارەم فەرمووی: (ئەگەر زینای کردەوە) ئەوە بیفرۆشن و بیگۆڕنەوە ئەگەر بە گوریسێک و پەتێکیش بێت (چونکە بێ کەڵکە و هەر بیری لەسەر بەدڕەوشتیە).

## بابەت: دەربارەی تەفسیری فەرمایشتی خوا عزَّ وجلَّ: ﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾﴾ النساء

٢٣٧٨ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلاً: الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ: الْبِكْرُ، جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ».(٢)

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لێم وەرگرن، لێم وەرگرن، بە دڵنیایی خوا بۆ ئافرەتانی زیناکار ڕێگایێکی بۆ داناون: سەڵت لەگەڵ سەڵت و، خاوەن هاوسەر لەگەڵ خاوەن هاوسەر (بۆ هەر یەکەیان ڕێگا و حوکمەکە ئاوایە): (سزای زیناکاری) سەڵت (واتە: کەسی بێ هاوسەر) سەد جەڵد و دوورخستنەوەی ساڵێکە، وە (سزای ئەو زیناکارەی) هاوسەرگیری کردوە سەد جەڵد و بەرد باران کردنە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح

٢٣٧٩ - «أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ الْحَسَنِ، عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ».[١]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی زینا لەگەڵ جاریە و خزمەتكاری خێزانەكەی دەكات

٢٣٨٠ - «عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ ﷺ، أَنَّ غُلَامًا، كَانَ يُنْبَزُ قُرْقُورًا فَوَقَعَ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ، فَرُفِعَ ذلك إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، فَقَالَ: لَأَقْضِيَنَّ فِيهِ بِقَضَاءٍ شَافٍ، إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ، جَلَدْتُهُ مِائَةً، وَإِنْ كَانَتْ لَمْ تُحِلَّهَا لَهُ، رَجَمْتُهُ. فَقِيلَ لَهَا: زَوْجُكِ، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَحْلَلْتُهَا لَهُ. فَضَرَبَهُ مِائَةً».[٢]

واتە: لە حەبیبی كوڕی سالمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گەنجێک كە بە نازناوی فوڕفوڕ (واتە: ئەو كەسەی زۆر قاقای پێكەنینیەتی) ناوزەند كرابوو توشی زینا ببوو لەگەڵ جاریەی خێزانەكەی، جا بابەتەكە بردرا لای نوعمانی كوڕی بەشیر و وتی: سوێند بە خوا دادوەریەكی شیفابەخشی تیا دەكەم، (وتی): ئەگەر خێزانەكەی بۆی حەڵاڵ كردبێت و مۆڵەتی پیاوەكەی دابێت جیماعی لەگەڵ بكات ئەوە سەد جەڵدە لە پیاوەكە دەدەم، وە ئەگەر بۆی حەڵاڵ نەكردبێت و مۆڵەتی نەدابێت ئەوە بەردبارانی دەكەم، جا بە خێزانەكەی وترا: مێردەكەت (ڕەجم دەكرێت)، ئافرەتەكەش وتی: من خۆم مۆڵەتم داوە و بۆم حەڵاڵ كردوە، جا (نوعمان) سەد جەڵدی لێدا.

٢٣٨١ - «حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَنْبَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ ﷺ، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ».[٣]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان حوكمی فەرموودەكە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: سزای شەرعی پاككەرەوەیە بۆ ئەو كەسەی لەسەری جێبەجێ دەكرێت

٢٣٨٢ - «عَنْ ابْنِ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أُقِيمَ عَلَيْهِ حَدٌّ غُفِرَ لَهُ، ذَلِكَ الذَّنْبُ».[٤]

واتە: لە ئیبنو خوزەیمەی كوڕی ثابیتەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک سزایەكی شەرعی لەسەر جێبەجێ بكرێت ئەوە لەو تاوانەی دەبوردرێت (كە لەسەری سزا دراوە).

---

(١) ـ صحيح

(٢) ـ موقوف ضعيف.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ إسناده حسن.

## بابەت: جێبەجێ كردنی نەزر

٢٣٨٣ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَمَاتَتْ، فَجَاءَ أَخُوهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ كَانَ عَلَيْهَا دَيْنٌ، أَكُنْتَ قَاضِيَهُ، قَالَ: نَعم، قَالَ: فَاقْضُوا اللهَ، فَاللهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ».(١)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک نەزری كردبوو حەج بكات، جا وەفاتی كرد (پێش ئەوەی نەزرەكەی جێبەجێ بكات)، جا براكەی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری دەربارەی ئەوە لێكرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر قەرزێكی لەسەربوایە ئایا تۆ دەتدایەوە (بۆت هەبوو بیدەیتەوە)؟ براكەی وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كەواتە قەرزی خوا بدەنەوە، خوا شایستەترە قەرزەكانی بدرێتەوە.

٢٣٨٤ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ إِنِّي نَذَرْتُ نَذْرًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، ثُمَّ جَاءَ الْإِسْلَامُ، قَالَ: فِ بِنَذْرِكَ».(٢)

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نەزرێكم كردوە لە سەردەمی نەزانیدا، دواتر ئیسلام هات (ئایا نەزرەكە دامەزراوە و جیبەجێی بكەم یان نا)؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: وەفا بە نەزرەكەت بكە (جێبەجێی بكە).

## بابەت: دەربارەی كەفارەتی نەزر

٢٣٨٥ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَحُجَّ لِلَّهِ مَاشِيَةً غَيْرَ مُخْتَمِرَةٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: مُرْ أُخْتَكَ فَلْتَخْتَمِرْ، وَلْتَرْكَبْ، وَلْتَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ».(٣)

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خوشكم نەزری كرد حەج بكات بە پێ بەبێ لەچک (بە سەر كۆتی)، (عوقبە دەڵێ): منیش ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، (پێغەمبەری خواش) فەرمووی: فەرمان بە خوشكت بكە لەچک بكاتە سەری و، سواری سواریش بێت و، سێ ڕۆژیش بەڕۆژوو بێت (واتە: دەبێ نەزرەكە بشكێنرێت و كەفارەتی بدرێت، كاتێ مرۆڤ نەزرێک دەكات كە حەڕامە یان حەڵاڵێک لە خۆی حەڕام دەكات، كەفارەتەكەش بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف ، لكن الحديث صحيح.

٢٣٨٦ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ أُخْتَ عُقْبَةَ، نَذَرَتْ أَنْ تَمْشِيَ، إِلَى الْبَيْتِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ عَنْ نَذْرِ أُخْتِكَ لِتَرْكَبْ، وَلْتُهْدِ هَدْيًا».(١)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خوشکی عوقبە نەزری کردبوو کە بە پێ بڕوات بۆ بەیت (بۆ حەج بۆ کەعبە)، پێغەمبەری خواش فەرمووی: خوا بێ نیازە لە نەزری خوشکەکەت، کەواتە با سواری وڵاغ بێت و هەدییێک بکات (واتە: ئاژەڵێک لە مەککە سەر ببڕێت).

٢٣٨٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَدْرَكَ شَيْخًا يَمْشِي بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: مَا شَأْنُ هَذَا الشَّيْخِ؟ فَقَالَ: ابْنَاهُ نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، فَقَالَ: ارْكَبْ فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنْكَ، وَعَنْ نَذْرِكَ».(٢)

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە پیاوێکی بە تەمەن کە لە نێوانی دوو کوڕەکانی دەڕۆیشت (قۆڵیان گرتبوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەم پیرە پیاوە چیەتی؟ دوو کوڕکانی وتیان: ئەوە نەزری کردوو کە بە پێ بڕوات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سواربە، خوا بێ نیازە لە تۆ و لە نەزرەکەت.

## بابەت: هیچ نەزرێک دانامەزرێت لە سەرپێچی کردنی خوا

٢٣٨٨ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ، وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ».(٣)

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جێبەجێ کردنی نەزر نیە لە سەرپێچی خوادا، وە (وە جێبەجێ کردنی نەزر نیە) لەوەی مرۆڤ خاوەنی نیە و لە توانایدا نیە.

٢٣٨٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يَطِيعَ اللهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللهَ فَلاَ يَعْصِهِ».(٤)

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نەزر بکات لە گوێڕایەڵی خوادا (واتە: نەزرێکی چاک بکات)، ئەوە با گوێڕایەڵی بکات (با نەزرە چاکەکەی جێبەجێ بکات)، وە هەر کەسێک نەزر بکات لە سەرپێچی خوادا ئەوە نابێ سەرپێچی بکات و (نەزرەکە جێبەجێ ناکرێت و کەفارەتی دەدرێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: هەر کەسێک نەزر بکات نوێژ لە بەیتول مەقدیس بکات، ئایا بەری دەکەوێت و دروستە نوێژەکە لە مەککە بکات (لە جیاتی بەیتول مەقدیس)؟

٢٣٩٠ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي نَذَرْتُ إِنْ فَتَحَ اللهُ عَلَيْكَ، أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَقَالَ: صَلِّ هَا هُنَا، فَأَعَادَ عَلَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَشَأْنُكَ إِذَنْ».[1]

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نەزرم کردوە ئەگەر خوا فەتحی مەککەت بە قسمەت بکات نوێژ لە بەیتول مەقدیس بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نوێژەکە لێرە بکە (لە مەککە)، پیاوەکەش سێ جار بۆی دووبارە کردەوە (هەر سوور بوو نەزرەکەی لە بەیتول مەقدیس جێبەجێ بکات)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەواتە بە کەیفی خۆت بە.

## بابەت: نەهی کردن لە نەزر

٢٣٩١ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ النَّذْرَ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ الشَّحِيحِ».[2]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەزر هیچ شتێک ناگەڕێنێتەوە (قەدەر ناگەڕێنێتەوە)، بەڵکو بەهۆیەوە شت لە دەستی کەسی ڕەزیل و چرووک دەهێنێتە دەرەوە.

تێبینی: بۆیە نەزر کاریگەری لەسەر ڕەت کردنەوەی شتەکان ناکات، چونکە صەدەقەو خێرێکە هێشتا نەتکردوە، بەڵکو دوای بەدەست هێنانی ئەو شتەی ئاواتت بۆ خواستووە دەیکەیت، خۆ ئەگەر نەزریشی نەکردبا هەر بەدەستی دەهێنا، بەڵام ئەگەر پێشی بەدەست هێنان شتەکە شتێکی چاک بکاتە خێر ئەوەیان بە دڵنیایی کاریگەری دەبێت و بەڵا و موصیبەت لادەدات.

جا بۆیە کاری ئەو کەسەی نەزر دەکات ڕەزیلی و چروکیە، چونکە خێرەکە ناکات تاوەکو شتێک بەدەست نەهێنێت، کەواتە لە موقابیلی شتێک دەیکات، بەڵام هەرچی صەدەقەیە لە موقابیلی هیچ شتێک نیە و کاری سەخاوەتە و خواش بەڵا لادان و چاکەی پێ عەتا دەکات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی سوێند بخورێت بە جگە لە خوا

٢٣٩٢ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَهُوَ يَسِيرُ فِي رَكْبٍ، وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ».[١]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری کوڕی خەتتاب گەیشت لە کاتێکدا لە ناو قافڵەدا دەڕۆیشت و سوێندی بە باوکی خۆی دەخوارد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوا نەهی لێ کردوون لەوەی سوێند بخۆن بە باوک و باپیرتان، جا هەر کەسێک سوێندی خوارد ئەوە با سوێند بە خوا بخوات، یان بێ دەنگ بێت (سوێند نەخوات).

## بابەت: دەربارەی (إن شاءالله) کردن لە سوێنددا

٢٣٩٣ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَقَدِ اسْتَثْنَى».[٢]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندێک بخوات، دواتر (هەر لەگەڵ سوێند خواردنەکە) وتی: إن شاءالله، ئەوە هەڵاوێردانی کردوە (کارەکەی بۆ لای مەشیئەتی خوا گەڕاندۆتەوە، کەواتە کەفارەتی سوێندی ناکەوێتە سەر ئەگەر بابەتەکەش ئەنجام نەدات).

٢٣٩٤ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَهُوَ بِالْخِيَارِ إِنْ شَاءَ فَعَلَ، وَإِنْ شَاءَ لَمْ يَفْعَلْ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندێک بخوات، دواتر (هەر لەگەڵ سوێند خواردنەکە) وتی: إن شاءالله، ئەوە سەرپشکە ئەگەر ویستی شتەکە جێبەجێ دەکات، وە ئەگەر ویستی نایکات (کەفارەتیشی ناکەوێتە سەر، چونکە شتەکەی بۆ مەشیئەتی خوا گەڕاندۆتەوە).

## بابەت: قەسەم وتن سوێند خواردنە

٢٣٩٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: لاَ تُقْسِمْ قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الْحَدِيثُ فِيهِ طُولٌ».[٤]

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەكری فەرمووی: قەسەم مەڵێ (واتە مەڵێ: أقسم بالله ئاوا و ئاوا...).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: فەرموودەكە درێژە.

## بابەت: ئەو كەسەی سوێندێک دەخوات و شتێكی جگە لە شتە سوێند بۆ خوراوەكە بە چاكتر دەبینێت (ئایا چی دەكات)؟

٢٣٩٦ - «عَنْ عَمْرِو ابْنُ مُرَّةَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو ﷺ، زَمَنَ الْجَمَاجِمِ يُحَدِّثُ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ عَدِيَّ بْنَ حَاتِمٍ؟ فَحَلَفَ أَنْ لاَ يُعْطِيَهُ شَيْئًا، ثُمَّ قَالَ: لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ».[1]

واتە: لە عەمری كوڕی موڕڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پیاوێک بوو پێی دەوترا: عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ﷺ زەمانی شەڕی جەماجیم دەیگێڕایەوە و دەیوت: پیاوێک داوایەكی لە عەدی كوڕی حاتەم كرد، ئەویش سوێندی خوارد كە هیچ شتێكی پێ نەدات، دواتر وتی: ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووایە كە دەیفەرموو: هەر كەسێک سوێندێكی خوارد و جگە لە سوێند بۆ خوراوەكەی بە چاكتر بینی، ئەوە با ئەوە جێبەجێ بكات كە چاكترە، وە با كەفارەتی سوێندەكەی بدات.

٢٣٩٧ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لاَ تَسْأَلِ الْإِمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا، عَنْ مَسْأَلَةٍ، وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ، أُعِنْتَ عَلَيْهَا، فَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ، وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ».[2]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی سەمورەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی عەبدوڕڕەحمان داوای پۆست مەكە، چونكە ئەگەر پۆستت پێ بدەم لەسەر داواكاری خۆت، ئەوە خۆت تەسلیمی پۆستەكە دەكرێیت (یارمەتی نادرێیت لەلای خواوە)، وە ئەگەر پێت بدەم بە بێ داواكردنی خۆت، ئەوە یارمەتی دەدرێیت لەسەری (خوا یاوەرت دەبێت)، جا ئەگەر سوێندێكت خواردو شتێكیترت بە باشتر زانی، ئەوە كەفارەتی سوێندەكەت بدەو باشترو چاكترەكە جێبەجێ بكە.

٢٣٩٨ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يُونُسَ، عَنْ الْحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَذَكَرَ نَحْوَ الْحَدِيثِ».[3]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەگەر هاتوو پیاو کەفارەتی ئازادکردنی بەندەیەکی بڕواداری لەسەر بوو

٢٣٩٩- «عَنْ الشَّرِيدِ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّ عَلَى أُمِّي رَقَبَةً، وَإِنَّ عِنْدِي جَارِيَةً سَوْدَاءَ نُوبِيَّةً، أَفَتُجْزِئُ عَنْهَا، قَالَ: ادْعُ بِهَا، فَقَالَ: أَتَشْهَدِينَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، قَالَتْ: نَعم، قَالَ: أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ».[١]

واتە: لە شەریدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتم: دایكم ئازادكردنی بەندەیەكی لەسەرە، منیش ئافرەتێكی بەندەی ڕەشی هۆزی نوبیەی سودانیم هەیە، جا ئایا بەری دەكەوێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بانگی بكە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) (بە ئافرەتە بەندەكەی) فەرموو: ئایا شایەدی دەدەیت كە هیچ خودایێک بە هەق نیە جگە لە الله؟ ئافرەتەكە وتی: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەریدی) فەرموو: ئازادی بكە، ئەوە بڕوادارە (بۆ كەفارەت دەشێت).

## بابەت: ئەو كەسەی سوێند لەسەر شتێک دەخوات فێڵ لە نیەتی سوێندەكەی دەكات

٢٤٠٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَمِينُكَ عَلَى مَا صَدَّقَكَ بِهِ صَاحِبُكَ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێندت لەسەر ئەو نیەتەیە كە هاوڕێكەت (بەرانبەرەكەت) بە ڕاستی دادەنێت (واتە: دەبێ سوێندەكەت لەسەر ئەو نیەتە بێت كە بەرانبەرەكەت داوای لێ كردووی، نەوەک سوێند بۆ شتێک بخۆیت خۆشت نیەتێكی ترت هەبێت، تاوەكو هاوڕێكەت بە هەڵەدا ببەیت و فێڵی لێ بكەی).

## بابەت: بە هەر ناوێكی خوا سوێند بخۆیت ئەوە سوێندەكە دامەزراوە

٢٤٠١- «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَتْ يَمِينُ رَسُولِ اللهِ ﷺ الَّتِي يَحْلِفُ بِهَا لاَ وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سوێندی دەخوارد دەیفەرموو: سوێند بەو كەسەی دڵەكان هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەكات.

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی کوشتنی بە ئەنقەست

٢٤٠٢ - «عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أُصِيبَ بِدَمٍ، أَوْ خَبْلٍ، وَالْخَبْلُ الْجُرْحُ، فَهُوَ بِالْخِيَارِ بَيْنَ إِحْدَى ثَلاَثٍ، فَإِنْ أَرَادَ الرَّابِعَةَ، فَخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ بَيْنَ أَنْ يَقْتَصَّ، أَوْ يَعْفُوَ، أَوْ يَأْخُذَ الْعَقْلَ، فَإِنْ أَخَذَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، ثُمَّ عَدَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَلَهُ النَّارُ خَالِدًا فِيهَا مُخَلَّدًا».[1]

واتە: لە ئەبو شورەیحی خوزاعیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەسێک خوێنی پێکرا (واتە: خزمێکی نزیکی کوژرا) یان ئەندامێکی تێکدرا و لەکارخرا ئەوە سەرپشکە لە نێوان یەکێک لە سێ شتەکان، جا ئەگەر ویستی چوارەم شت (دابهێنێت) و جێبەجێی بکات ئەوە دەستی بگرن مەهێڵن جێبەجێی بکات، (سێ شتەکانیش ئەمانەن): یان تۆڵەی لێدەکاتەوە (بە هەمان شێوە)، یان لێی خۆش دەبێت، یان قەرەبوو و پارەی خوێنەکە وەردەگرێت، جا ئەگەر شتێک لەمانەی وەرگرت، دواتر دەستدرێژی کرد پاش وەرگرتنی هەقی خۆی، ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، ماوەیەکی یەکجار زۆر تیایدا دەمێنێتەوە.

٢٤٠٣ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَكَانَ فِي كِتَابِهِ أَنَّ مَنِ اعْتَبَطَ مُؤْمِنًا قَتْلاً، عَنْ بَيِّنَةٍ، فَإِنَّهُ قَوَدُ يَدِهِ، إلاَّ أَنْ يَرْضَى أَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: اعْتَبَطَ قَتَلَ مِنْ غَيْرِ عِلَّةٍ».[2]

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ خەڵکی یەمەن نوسیوە، وە لە نوسراوەکەدا هاتووە: هەر کەسێک لە هیچ و خۆڕا بڕوادارێک بکوژێت بە بەڵگە (لەسەری ئیسپات بێت)، ئەوە کوژراوی دەستی خۆیەتی (واتە: بەهۆی کردەوەکەی خۆی دەبێ بکوژرێتەوە)، تەنها ئەگەر خزمە نزیکەکانی کوژراوەکە بە نەکوشتنەوەی ڕازی بن (ئەو کات ناکوژرێتەوە).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (اعْتَبَطَ) واتە: کوشتبێتی بەبێ هۆ.

## بابەت: دەربارەی سوێند خواردن (لەسەر دیاریکردنی بکوژ)

٢٤٠٤ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَهْلٍ ﷺ أَحَدُ بَنِي حَارِثَةَ إِلَى خَيْبَرَ مَعَ نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ يُرِيدُونَ الْمِيرَةَ بِخَيْبَرَ، قَالَ: فَعُدِيَ عَلَى عَبْدِ اللهِ فَقُتِلَ، فَتُلَّتْ عُنُقُهُ حَتَّى نُخِعَ، ثُمَّ طُرِحَ فِي مَنْهَلٍ مِنْ مَنَاهِلِ خَيْبَرَ، فَاسْتُصْرِخَ عَلَيْهِ أَصْحَابُهُ، فَاسْتَخْرَجُوهُ فَغَيَّبُوهُ، ثُمَّ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ ضعيف.

الْمَدِينَةَ فَتَقَدَّمَ أَخُوهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، وَكَانَ ذَا قِدَمٍ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَابْنَا عَمِّهِ مَعَهُ حُوَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، وَمُحَيِّصَةُ، فَتَكَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَكَانَ أَحْدَثَهُمْ سِنًّا، وَهُوَ صَاحِبُ الدَّمِ، وَذَا قَدَمٍ فِي الْقَوْمِ، فَلَمَّا تَكَلَّمَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْكُبْرَ، الْكُبْرَ، قَالَ: فَاسْتَأْخَرَ، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ، ثُمَّ هُوَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تُسَمُّونَ قَاتِلَكُمْ، ثُمَّ تَحْلِفُونَ عَلَيْهِ خَمْسِينَ يَمِينًا، ثُمَّ نُسَلِّمُهُ إِلَيْكُمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ مَا كُنَّا لِنَحْلِفَ عَلَى مَا لاَ نَعْلَمُ مَا نَدْرِي مَنْ قَتَلَهُ، إِلاَّ أَنَّ يَهُودَ عَدُوُّنَا، وَبَيْنَ أَظْهُرِهِمْ قُتِلَ، قَالَ: فَيَحْلِفُونَ لَكُمْ بِاللهِ إِنَّهُمْ لَبُرَءَاءُ مِنْ دَمِ صَاحِبِكُمْ، ثُمَّ يَبْرَءُونَ مِنْهُ، قَالُوا: مَا كُنَّا لِنَقْبَلَ أَيْمَانَ يَهُودَ مَا فِيهِمْ أَكْبَرُ مِنْ أَنْ يَحْلِفُوا عَلَى إِثْمٍ، قَالَ: فَوَدَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ بِمِائَةِ نَاقَةٍ».[1]

واتە: لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل ﷺ، کە یەکێکە لە بەنی حاریثە، دەرچوو بۆ خەیبەر لەگەڵ چەند کەسێکی قەومەکەی، دەیانەویست قوتێک و خواردنێک لە خەیبەر پەیدا بکەن، وتویەتی: جا دەستدرێژی کرایە سەر عەبدوڵڵا و کوژرا و گەرووی تا دڕکەپەتکی بڕابوو، دواتر فڕێدرابوو بۆ ناو ڕووبارێک لە ڕووبارەکانی خەیبەر، جا هاوارکرا بۆ هاوەڵەکانی تاوەکو بێنە سەری (بزانن کوژراوە)، ئەوانیش دەریانهێنا و شاردیانەوە و بە خاکیان سپارد، دواتر چوون بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهلی برای عەبدوڵڵا پێشکەوت، کە پێشینەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر بوو (زوو مسوڵمان ببوو)، وە دوو کوڕە مامیشی حوەییصە و موحەییصە لەگەڵی پێشکەوتن و، عەبدوڕڕەحمان دەستی بە قسە کردن کرد، لە کاتێکدا لەهەموویان بچوکتر بوو خاوەنی خوێنەکەش بوو و لەناو قەومەکەی زوتر مسوڵمان ببوو، جا کاتێ قسەی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گەورە گەورە (واتە: ڕێبدە گەورەتر قسە بکات)، دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانیش کشایە دواوە و حوەییصە و موحەییصە قسەیان کرد، دواتر عەبدوڕڕەحمان قسەی کرد، (پێغەمبەری خواش) فەرمووی: ناوی بکوژەکەتان دەهێنن و دواتر پەنجا سوێندی لەسەر دەخۆن (لەسەر ئەوەی ئەو کوشتویەتی)، دواتر کەسەکە تەسلیمی ئێوە دەکەین، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە سوێند ناخۆین لەسەر شتێک کە نایزانین، ئێمە نازانین کێ کوشتویەتی، تەنها ئەوە نەبێت کە جولەکەکان دوژمنمانن و لە نێوان ئەوان و لە ناوچەی ئەواندا کوژراوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: کەواتە: دەبێ جولەکەکان سوێندتان بۆ بەخوا بخۆن کە ئەوان بەرین لە کوشتن و خوێنی هاوەڵەکەتان، ئنجا بە بەری و بێ تاوان دادەنرێن، وتیان: ئێمە سوێندی جولەکەکان وەرناگرین و متمانەمان پێی نیە، ئەوەی لەناو ئەواندا هەیە (لە خیانەت و گوناە و تاوان) زۆر گەورەترە لەوەی سوێند بخۆن لەسەر تاوانێك (واتە: ئەو جۆرە سوێند خواردن و تاوانباربوونەیان پێ ئاو خواردنەوەیە، ئەوان تاوانی گەورەتر دەکەن تەقەی سەریان دێ)، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای خۆیەوە سەد وشتری پێدان (واتە: کاتێ بکوژەکە دەرنەکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی خوێنەکەی پێشکەش کردن).

---

(١) ـ صحيح.

## بابەت: تۆڵە کردنەوە (کوشتنەوە) لە نێوان پیاو و ئافرەتدا

٢٤٠٥ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَكَانَ فِي كِتَابِهِ أَنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ».(١)

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمرِی کوڕی حەزمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە  گێراویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی یەمەن نوسراوێکی نوسی، لە نوسراوەکەیدا هاتبوو: پیاو بە ئافرەت دەکوژرێتەوە (واتە: ئەگەر پیاوێک ئافرەتێک بکوژێت، ئەوە بە هۆی کوشتنی ئافرەتەکە دەکوژرێتەوە).

## بابەت: چۆن تۆڵە دەسەنرێتەوە؟

٢٤٠٦ - «عَنْ أَنَسٍ ، أَنَّ جَارِيَةً رُضَّ رَأْسُهَا بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ لَهَا: مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلَانٌ؟ أَفُلَانٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ؟ فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَبُعِثَ إِلَيْهِ، فَجِيءَ بِهِ، فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَرُضَّ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ».(٢)

واتە: لە ئەنەسەوە  گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک سەری کوترابوو لە نێوان دوو بەرد، جا (هێشتا نەمردبوو) پێیان وت: کێ وای بەسەرهێناوی؟ ئایا فڵان بوو؟ یان فڵان بوو؟ (هەر ناویان بۆ هێنا) تاوەکو ناوی جولەکەیەک هات و سەری لەقاند (واتە: بەڵێ ئەو وای لێکردووم)، جا ناردرا بەدوایدا و هێنرا و ئیعترافی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەرکرد کە سەری لە نێوان دوو بەرد بکوترێت (بە هەمان شێوە).

## بابەت: مسوڵمان بە کافر ناکوژرێتەوە

٢٤٠٧ - «عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ، قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ  يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، هَلْ عَلِمْتَ شَيْئًا مِنَ الْوَحْيِ إِلاَّ مَا فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى؟ قَالَ: لاَ وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ، وَبَرَأَ النَّسَمَةَ مَا أَعْلَمُهُ إِلاَّ فَهْمًا يُعْطِيهِ اللهُ الرَّجُلَ فِي الْقُرْآنِ، وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: الْعَقْلُ وَفِكَاكُ الأَسِيرِ، وَلاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِمُشْرِكٍ».(٣)

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عەلیم  وت: ئەی گەورەی بڕواداران ئایا هیچ شتێکت لە وەحیەوە زانیوە جگە لەوەی کە لە پەرتوکی خوادا هەیە؟ وتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی دەنک دەتەقێنێ و ڕوەک و درەخت دەڕوێنی، وە گیاندار دروست دەکات، هیچ نازانم جگە لەو تێگەیشتنەی خوا بە مرۆڤی دەدات لە قوڕئاندا، وە ئەوەیش کە لە صەحیفەدایە (واتە: ئەوەی لە

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

فەرمووده دایه)، (دەڵێ) وتم: چی لە صەحیفە (لە فەرموودەدا) هەیە؟ وتی: خوێن وەرگرتن و، ئەسیر ئازاد کردن و، نەکوژرانەوەی مسوڵمان بە کەسی بێبڕوا.

## بابەت: دەربارەی تۆڵەسەندنەوە و کوشتنەوە لە نێوان باوک و منداڵدا

٢٤٠٨ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ تُقَامُ الْحُدُودُ فِي الْمَسَاجِدِ، وَلاَ يُقَادُ بِالْوَلَدِ الْوَالِدُ».(١)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سزاکانی شەرعی لە مزگەوتدا جێبەجێ ناکرێن، هەروەها باوک بەهۆی منداڵیەوە ناکوژرێتەوە (واتە: ئەگەر باوکێک منداڵەکەی بکوژێت، ئەوە ناکوژرێتەوە، بەڵکو بە ڕێگای تر دادگای دەکرێت).

## بابەت: دەربارەی تۆڵەسەندنەوە و کوشتنەوە لە نێوان بەندە و گەورەکەی

٢٤٠٩ - «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَهُ جَدَعْنَاهُ» قَالَ: ثُمَّ نَسِيَ الْحَسَنُ هَذَا الْحَدِيثَ، وَكَانَ يَقُولُ: لاَ يُقْتَلُ حُرٌّ بِعَبْدٍ».(٢)

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەندەکەی خۆی بکوژێت ئەوە دەیکوژینەوە، وە هەر کەسێک دەم یان لوتی بەندەکەی ببڕێت، ئەوە دەم و لوتی دەبڕینەوە، دەڵێ: دواتر حەسەن ئەم فەرموودەیەی بیرچوبویەوە و دەیوت: کەسی ئازاد بە کەسی بەندە ناکوژرێتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی لە بکوژەکەی خۆش دەبێت

٢٤١٠ - «عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ الْحَضْرَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ أُتِيَ بِالرَّجُلِ الْقَاتِلِ يُقَادُ فِي نِسْعَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِوَلِيِّ الْمَقْتُولِ: أَتَعْفُو قَالَ: لاَ، قَالَ: فَتَأْخُذُ الدِّيَةَ، قَالَ: لاَ، قَالَ: فَتَقْتُلُهُ قَالَ: نَعم، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّكَ إِنْ عَفَوْتَ عَنْهُ، فَإِنَّهُ يَبُوءُ بِإِثْمِكَ، وَإِثْمِ صَاحِبِكَ، قَالَ: فَتَرَكَهُ، قَالَ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ قَدْ عَفَا عَنْهُ».(٣)

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلی حەضرەمیەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە وائیلی کوڕی حوجرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: لەلای پێغەمبەر ﷺ بووم کاتێ پیاوە قاتیلەکەیان هێنا بە پەتەکەیەوە تا بکوژرێتەوە، جا پێغەمبەری خوای ﷺ بە سەرپەشتیاری کوژراوەکەی فەرموو:

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

ئایا لێی دەبوری؟ وتی: نەخێر، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: کەواتە خوێنی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە دەیکوژیتەوە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لێی خۆش بیت ئەوە بکوژەکە تاوانی تۆ و تاوانی براکەت دەبات (واتە: خوا لە هەردووکتان خۆش دەبێت بە هۆی ئەوەوە)، دەڵێ: جا وازی لێ هێنا، دەڵێ: من بینیم پەتەکەی لەدوای خۆی ڕادەکێشا (کابرای ئازاد کرد) و، لێی خۆش بوو.

## بابەت: هەڕەشەی یەکجار توند دەربارەی کوشتنی کەسی مسوڵمان

٢٤١١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْكَبَائِرُ الْإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ شُعْبَةُ الشَّاكُّ أَوِ الْيَمِينُ الْغَمُوسُ».[1]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: تاوانە گەورەکان بریتین لە: هاوبەش دانان بۆ خوا و، ئازاردانی دایک و باوک و، کوشتنی کەسێکی مسوڵمان ـ یان سوێند خواردنی بە درۆ ـ

## بابەت: هەڕەشەی یەکجار توند لەسەر ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت

٢٤١٢ - «عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ فِي الدُّنْيَا عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[2]

واتە: لە ثابیتی کوڕی ضەحاکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرەت کردن لە کەسی بڕوادار وەک کوشتنیەتی، وە هەر کەسێک خۆی بکوژێت بە شتێک لە دونیادا، ئەوە بەو شتە ئازار دەدرێت لە ڕۆژی دواییدا.

٢٤١٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ، يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِسُمٍّ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَهُوَ يَتَرَدَّى فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا».[3]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆی بکوژێت بە ئاسنێک (چەقۆ بێت، یان هەر ئاسنێکی تر) ئاسنەکە لە دەستیەتی و دەیدات لە سکی لەناو دۆزەخدا هەتا هەتایی دەمینێتەوە (ئەگەر خۆ کوشتنی پێ حەڵاڵ بێت، ئەگەر پێشی حەرام

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

بێت، بەڵام هەر خۆی بكوژێت، ئەوە ماوەیەكی یەكجار زۆر تیایدا دەمێنێتەوە)، وە هەر كەسێكیش خۆی بە ژەهر بكوژێت ژەهرەكەی لە دەستی دایە و قوم قوم دەیخواتەوە لەناو دۆزەخدا هەتا هەتایی دەمێنێتەوە (ئەگەر پێی حەڵاڵ بووبێت)، وە هەر كەسێكیش خۆی بخاتە خوارەوە لە چیایێك (یان شوێنێكی بڵند) و خۆی بكوژێت، ئەوە خۆی لەناو بەرزاییەكانی دۆزەخدا دەخاتە خوارەوە و تیایدا دەمێنێتەوە هەتا هەتایی (ئەگەر پێی حەڵاڵ بووبێت).

## بابەت: تۆڵە و خوێن چەندە لە زێڕ و زیودا؟

**٢٤١٤ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَتَلَ رَجُلٌ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ دِيَتَهُ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا، فهو قَوْلُهُ،** ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ﴿٧٤﴾ ﴾ **التوبة، بِأَخْذِهِمُ الدِّيَةَ».**[1]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك پیاوێكی كوشت لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنەكەی دوازدە هەزار دانا، جا ئەوە فەرمایشتی خوایە كە فەرموویەتی: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ﴿٧٤﴾ ﴾ التوبة، واتە: {دوو ڕووەكان سوێند بەخوا دەخۆن كە قسەیەكی نابەجێیان نەكردوە، كەچی سوێند بەخوا بەڕاستی ئەمانە درۆ دەكەن، بەڵكو گوفتاری كوفر و بێ بڕوایی هات بە دەمیانا، ئەمانە دوای مسوڵمانبوونیان بێبڕوا بوونەوە، خەریكی (پیلان) و نەخشەیەك بوون، بەڵام بۆیان نەلوا و پێی نەگەیشتن كە بریتی بوو لە شەهید كردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، هیچ شتێك ئەمانی تووڕە نەكردوە تەنها ئەوە نەبێت خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ ئیماندارانیان دەوڵەمەن و بەهرەوەر كرد لە فەزڵ و زیادە ڕزقی خۆی} بە وەرگرتنی خوێن و تۆڵەی جەریمەكان.

تێبینی: هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بوو یەكێك لە مونافیقەكان زۆر هەژار بوو، جا بەندە و خزمەتكارەكەی كوژرا، پێغەمبەری خواش فەرمانی كرد بەوەی خوێنی بەندەكەی پێ بدرێت و بەهۆی ئەوەوە دەوڵەمەند بوو، بەڵام دواتر سپڵە و بێ نمەك بوو بەرانبەر ئیسلام و هەڵگەڕایەوە، جا ئەم ئایەتە باسی ئەوە دەكات. والله أعلم.

**٢٤١٥ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَعَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ، أَلْفُ دِينَارٍ».**[2]

واتە: لە ئەبوبەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوك و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا بۆ خەڵكی یەمەنی نوسی: لەسەر ئەو كەسانەی زێڕیان هەیە، هەزار دیناری زێڕ واجبە (واتە: واجبە بدرێتە هەقی خوێن).

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ ضعيف.

## بابەت: خوێن چەندە لە وشتردا؟

٢٤١٦ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ قِيَلِ ذِي رُعَيْنٍ وَمَعَافِرَ وَهَمْدَانَ فَكَانَ فِي كِتَابِهِ وَإِنَّ فِي النَّفْسِ الدِّيَةَ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ».[١]

واتە: لە ئەبوبەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە  گێڕاویەتیەوە، (وتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵكی یەمەنی نوسی: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ شورەحبیلی كوڕی عەبدی كولال و حاریثی كوڕی عەبدی كولال پادشایانی ذی روعەین و مەعافیر و هەمەدان، جا لە نوسراوەكەیدا هاتبوو: لە تۆڵەی كوشتنی كەسێک خوێن هەیە: (كە بریتیە لە) سەد وشتر.

٢٤١٧ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَكَانَ فِي كِتَابِهِ وَفِي الْأَنْفِ إِذَا أُوعِبَ جَدْعُهُ الدِّيَةُ، وَفِي اللِّسَانِ الدِّيَةُ، وَفِي الشَّفَتَيْنِ الدِّيَةُ، وَفِي الْبَيْضَتَيْنِ الدِّيَةُ، وَفِي الذَّكَرِ الدِّيَةُ، وَفِي الصُّلْبِ الدِّيَةُ، وَفِي الْعَيْنَيْنِ الدِّيَةُ، وَفِي الرِّجْلِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ، وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ مِنَ الْإِبِلِ».[٢]

واتە:: لە ئەبوبەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە  گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵكی یەمەن نوسراوێكی نوسی، جا لە نوسراوەكەدا هاتبوو: لە لوتدا ئەگەر بە تەواوی بڕابوو خوێنی تەواو هەیە، وە لە زماندا خوێنی تەواو هەیە، وە لە دوو لێوەكاندا خوێنی تەواو هەیە، وە لە دوو هێلكەكاندا خوێنی تەواو هەیە، وە لە ئەندامی نێرینەدا خوێنی تەواو هەیە، وە لە فەوتاندن و لەناوبردنی شەهوەتی جنسیدا خوێنی تەواو هەیە، وە لە دوو چاوەكاندا خوێنی تەواو هەیە، وە لە یەک قاچدا نیوەی خوێن هەیە، وە لە سەر شكانی قوڵدا كە بگاتە پەردەی دەماغ سێیەكی خوێن هەیە، وە لەو برینەی بگاتە بۆشایی سێیەكی خوێن هەیە، وە لەو شكانەی كە ئێسقان لە شوێنی خۆی دەربچێ پازدە وشتر هەیە.

## بابەت: جێبەجێ كردن چۆنە لە وەرگرتنی خوێنی بەهەڵە كوشتن؟

٢٤١٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَعَلَ الدِّيَةَ فِي الْخَطَإِ أَخْمَاسًا».[٣]

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ ضعيف.

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی بە هەڵە کوشتنی کردوە بە پێنج جۆر (واتە سەد وشتر دابەش دەکرێت بەسەر پێنج جۆر و لەو پێنج جۆرە وشترە خوێنەکە دەدرێت، لە هەر جۆرێک بیست دانە، کە کۆی گشتی دەکاتە سەد).

## بابەت: دەربارەی تۆڵەسەندنەوە لە نێوان بەندەکان

٢٤١٩ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدًا، لِأُنَاسٍ فُقَرَاءَ قَطَعَ يَدَ غُلَامٍ لِأُنَاسٍ أَغْنِيَاءَ، فَأَتَى أَهْلُهُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّهُ لِأُنَاسٍ فُقَرَاءَ؟ فَلَمْ يَجْعَلْ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا».[١]

واتە: لە عیمڕانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەندەیەکی خەڵکانێکی هەژار دەستی بەندەیەکی خەڵکانێکی دەوڵەمەندی بڕی، جا خاوەنی بەندە دەست بڕاوەکە هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بەندەی خەڵکانێکی هەژارە؟ جا پێغەمبەر ﷺ هیچی لەسەر دانەنا.

## بابەت: دەربارەی خوێنی پەنجەکان

٢٤٢٠ - «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ، قَالَ: فَقُلْتُ: عَشْرٌ عَشْرٌ؟، قَالَ: نَعم».[٢]

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەموو پەنجەکان وەکو یەکن (لە ڕوی خوێنەوە)، دەڵێ منیش وتم: دە دەیە (واتە: هەر پەنجەی دە وشتری لەسەر وەردەگیرێ)؟ فەرمووی: بەڵێ.

٢٤٢١ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: هَذَا وَهَذَا سَوَاءٌ، وَقَالَ: بِخِنْصِرِهِ وَإِبْهَامِهِ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەوە و ئەوە وەکو یەکن (لە ڕووی خوێن وەرگرتنەوە)، ئاماژەی بۆ پەنجەی بچکۆڵە و پەنجەی گەورە کرد.

٢٤٢٢ - «أَبُو بَكْرِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَفِي كُلِّ إِصْبَعٍ مِنْ أَصَابِعِ الْيَدِ، وَالرِّجْلِ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ».[٤]

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢)ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ ضعيف.

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی حەزمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی یەمەن نوسراوێکی نوسی (تیایدا هاتبوو): لە هەموو پەنجەیەک لە پەنجەکانی دەست و پێ دە وشتر هەیە.

## بابەت: دەربارەی سەر یان ڕوخسار شکاندن

٢٤٢٣ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسًا، خَمْسًا مِنَ الْإِبِلِ».[١]

واتە: لە عەمڕی کوڕی شوعەیبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شکاندنەکانی سەر و ڕوخسار پێنج پێنج وشتری بڕیاردا.

٢٤٢٤ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَفِي كُلِّ إِصْبَعٍ مِنْ أَصَابِعِ الْيَدِ، وَالرِّجْلِ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ».[٢]

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی حەزمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی یەمەن نوسراوێکی نوسی (لە نوسراوەکەدا هاتبوو): لە هەموو پەنجەیەک لە پەنجەکانی دەست و پێ دە وشتر هەیە، وە لە سەر یان ڕوخسار شکاندنیشدا پێنج وشتر هەیە.

## بابەت: دەربارەی خوێنی ددان شکاندن

٢٤٢٥ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الْأَسْنَانِ خَمْسًا خَمْسًا مِنَ الْإِبِلِ».[٣]

واتە: لە عەمڕی کوڕی شوعەیبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شکاندنی ددانەکان پێنج پێنج لە وشتری بڕیاردا (واتە: بۆ هەر ددانێک پێنج وشتر).

٢٤٢٦ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ».[٤]

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ حسن.

(٤) ـ ضعيف.

واتە: لە ئەبوبەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمڕی كوڕی حەزمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوك و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵكی یەمەن نوسراوێكی نوسی (لە نوسراوەكەدا هاتبوو): لە شكاندنی ددانەكاندا پێنج وشتر هەیە.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی گاز و قەمپاڵ لە دەستی كەسێك دەدات و كەسە گاز لێگیراوەكەش دەستی بە توندی دەردەهێنێت

۲٤۲۷ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ، قَالَ: فَنَزَعَ يَدَهُ فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ، فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ؟ لاَ دِيَةَ لَكَ».[۱]

واتە: لە عیمڕانی كوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك گازی گرت لە دەستی پیاوێكی تر، دەڵێ: كابرای گاز لێگیراویش دەستی بە توندی دەرهێنا و، دوو ددانەكانی پێشەوەی گازلێدەرەكە كەوتن، جا كێشەكەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (كابرای گازلێدەرەكە داوای خوێنی ددانەكانی دەكرد)، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: یەكێك لە ئێوە گاز دەدات لە براكەی وەك چۆن نێری گاز دەهاوێژێت؟! هیچ خوێنت بۆ نیە.

## بابەت: بریندارکردن لەلایەن گیاندارەوە خوێنی لەسەر نیە

۲٤۲۸ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْعَجْمَاءُ جُرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ».[۲]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گیانلەبەر بریندارکردنەكەی خوێنی لەسەر نیە، وە لە بیر هەڵكەندن كە كەسێك بكەوێتە ناویەوە خوێن لەسەر خاوەنەكەی نیە، وە لە چاڵ هەڵكەندن بۆ زێڕو زیو و نەوت خوێنی لەسەر نیە (ئەگەر كرێكار یان كەسێكی تر كەوتە ناویەوە)، وە لە خەزێنەی زەویدا پێنج یەك زەكات هەیە.

۲٤۲۹ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: جُرْحُ الْعَجْمَاءِ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ».[۳]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بریندارکردن لە لایەن گیانلەبەرەوە خوێنی لەسەر نیە، وە بیر هەڵكەندن كە كەسێك بكەوێتە ناویەوە

---

(۱) ـ صحيح.

(۲) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(۳) ـ صحيح.

خوێن لەسەر خاوەنەکەی نیە، وە چاڵ هەڵکەندن بۆ زێڕو زیو و نەوت خوێنی لەسەر نیە (ئەگەر کرێکار یان کەسێکی تر کەوتە ناویەوە)، وە لە خەزێنەی زەویدا پێنج یەک زەکات هەیە.

٢٤٣٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَالسَّائِمَةُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاڵ هەڵکەندن بۆ زێڕو زیو و نەوت خوێنی لەسەر نیە (ئەگەر کرێکار یان کەسێک کەوتە ناویەوە)، وە ئەو گیاندارەی لە دەرەوە دەلەوەڕێت برینداركردنەكەی خوێنی لەسەر نیە، وە بیر هەڵکەندن کە کەسێک بکەوێتە ناویەوە خوێن لەسەر خاوەنەکەی نیە، وە لە خەزێنەی زەویدا پێنج یەک زەکات هەیە.

## بابەت: دەربارەی خوێنی فەوتاندنی منداڵی ناو سک

٢٤٣١ - «عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا تَحْتَ رَجُلٍ فَتَغَايَرَتَا فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِعَمُودٍ فَقَتَلَتْهَا، وَمَا فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَضَى فِيهِ غُرَّةً، وَجَعَلَهَا عَلَى عَاقِلَةِ الْمَرْأَةِ».[٢]

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە دوو ئافرەت لە ژێر نیکاحی پیاوێک بوون (خێزانی پیاوێک بوون)، جا غیرەیان لە یەکتری کرد و بووە کێشەیان، یەکێکیان بە ئەستوندەیەک دای لەوەیتریان و ئافرەتەکە و منداڵەکەی لە سکیدا بوو کوشتنی (بەو لێدانە)، جا کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) بڕیاریدا بەوەی لە تۆڵەی منداڵەکە کۆیلەیەک بدرێت، وە تۆڵەکەی خستە ئەستوی خزم و کەسی ئافرەتەکە.

٢٤٣٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عُمَرَ ﷺ، نَشَدَ النَّاسَ قَضَاءَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الْجَنِينِ فَقَامَ حَمَلُ بْنُ مَالِكِ بْنِ النَّابِغَةِ، فَقَالَ: كُنْتُ بَيْنَ امْرَأَتَيْنِ، فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِمِسْطَحٍ فَقَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي جَنِينِهَا بِغُرَّةٍ، وَأَنْ تُقْتَلَ بِهَا».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ پرسیاری لە خەڵکی کرد دەربارەی بڕیاری پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە منداڵی ناو سک، جا حەمەلی کوڕی مالیکی نابیغە هەڵسایەوە و وتی: من لە نێوان دوو ئافرەت بووم، جا یەکێکیان دای لەوەیتریان بە دینگەی خێوەت و (ئافرەتەکە و منداڵەکەی ناو سکی کوشت بەو لێدانە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆڵەی منداڵەکە بڕیاریدا بە پێدانی بەندەیەک و ئافرەتەکەش بکوژرێتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣)ـ صحيح.

## بابەت: خوێنی كوشتنی بە هەڵە لەسەر كێیە؟

٢٤٣٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ اقْتَتَلَتَا، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِحَجَرٍ، فَقَتَلَتْهَا، وَمَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا فِي الدِّيَةِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ، وَقَضَى بِدِيَتِهَا عَلَى عَاقِلَتِهَا، وَرَثَّتَهَا وَلَدُهَا، وَمَنْ مَعَهَا، فَقَالَ حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ: كَيْفَ أُغَرَّمُ مَنْ لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا هُوَ مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: دوو ئافرەت لە قەبیلەی هوذەیل بەشەڕهاتن و یەكێكیان بەردێكی گرتە ئەوەیتریان و ئافرەتەكە و منداڵەكەی ناو سكی كوشت، جا كێشەیەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) بڕیاریدا بەوەی خوێنی منداڵەكە بریتیە لە بەندەیەك جا نێر بێت یان مێ، وە بڕیاریدا خوێنەكەی بكەوێتە سەر خزم و كەسەكانی، بەندەكەش ببێتە میرات بۆ منداڵەكەی و ئەوەی لەگەڵێن (لە میراتگران)، جا حەمەلی كوڕی نابیغەی هوذەلی وتی: چۆن تۆڵەی منداڵێك بدەم كە نە خواردویەتیەوە و نە خواردویەتی و نەقسەی كردوە و نە دەنگی دەرهاتووە، هاوشێوەی ئەو شتە بەتاڵە (هیچی بۆ داناندرێت)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (ئەو پیاوە لە برای فاڵچیانە) لەبەر ڕێكخستنی وشەكانی (بۆ قەناعەت دروست كردن، چونكە جوملە سەرەكیەكانی بە پیتی لام كۆتایی پێ هێنا و وتی: (كَيْفَ أُغَرَّمُ مَنْ لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ، وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ).

## بابەت: خوێنی كوشتنی نیمچە ئەنقەست (شبه العمد)

٢٤٣٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دِيَةُ قَتِيلِ الْخَطَإِ، شِبْهِ الْعَمْدِ، وَمَا كَانَ بِالسَّوْطِ، وَالْعَصَا مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا، أَوْلاَدُهَا».[٢]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنی كوشتنی بە هەڵە هەروەها خوێنی كوشتنی نیمچە ئەنقەست (كە بریتیە لەو كوشتنەی كەسە بكوژەكە بە مەبەست لە كەسەكە بدات، بەڵام بە شتێك لێی بدات كە بە پێی عادەت مرۆڤ نابێ پێی بمرێت، كەچی كەسەكە پێی مرد، وەك مست وەشاندن)، هەروەها كوژراوی قامچی و دار، (ئەمانە گشتیان سەد وشتریان لە تۆڵە دەدرێت) چلیان لەو وشترانە دەبێ ئاوس بن، پێچویان لە سكدا بێت.

## بابەت: ئەو كەسەی سەیری ماڵی خەڵكانێك دەكات بەبێ مۆڵەتی ئەوان

٢٤٣٥ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي حُجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِدْرًى يُخَلِّلُ بِهَا رَأْسَهُ، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُنِي لَطَعَنْتُ بِهَا فِي عَيْنَيْكَ، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ النَّظَرِ».[٣]

---

(١) ـ صحيح

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە کونێکەوە سەیری ماڵی پێغەمبەری ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش تۆقەیەکی پێ بوو (وەك شوژن وابوو) سەری پێ دەخوراند، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کابرای بینی و فەرمووی: ئەگەر بمزانیایە تۆ سەیرم دەکەیت، ئەوە بە تۆقەکە دەمدا لە چاوت، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: مۆڵەت وەرگرتن تەنها هەر لەبەر سەیرکردن داندراوە (تا مرۆڤ یەکتری لەسەر شێوازی ناڕێک و تایبەتی نەبینێت، کەواتە چۆن دەبێت بێ مۆڵەت سەیری ماڵی یەکتری بکەن).

٢٤٣٦- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حُجْرَةٍ وَمَعَهُ مِدْرًى يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ، اطَّلَعَ عَلَيْهِ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُ لَقُمْتُ حَتَّى أَطْعَنَ بِهِ عَيْنَيْكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ النَّظَرِ».(١)

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێک لە ماڵەکانیدا بوو و تۆقەیەکی لەدەست بوو سەری پێ دەخوراند، پیاوێک (لە کونێکەوە) سەیری کرد، پێغەمبەری خواش پێی فەرمووی: ئەگەر بمزانیایە تۆ سەیر دەکەیت، ئەوە هەڵدەستام و بە شانەکە دەمدا لە چاوەکانت، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: مۆڵەت وەرگرتن تەنها هەر لەبەر سەیرکردن داندراوە (تا مرۆڤ یەکتری لەسەر شێوازی ناڕێک و تایبەتی نەبینێت).

## بابەت: هیچ قوڕەیشییێک بە تەعزیب و هێواشی ناکوژرێت

٢٤٣٧ - «عَنْ مُطِيعٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ لاَ يُقْتَلُ قُرَشِيٌّ صَبْرًا بَعْدَ هَذَا الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ».(٢)

واتە: لە موتیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا دەیفەرموو: هیچ قوڕەیشییێک لەمڕۆ بەدواوە ناکوژرێت بە ئازاردان، تاوەکو ڕۆژی دوایی.

٢٤٣٨ - «عَنْ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مُطِيعٍ ﷺ: سَمِعْتُ مُطِيعًا يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: فَسَّرُوا ذَلِكَ أَنْ لاَ يُقْتَلَ قُرَشِيٌّ عَلَى الْكُفْرِ - يَعْنِي لاَ يَكُونُ هَذَا أَنْ يَكْفُرَ قُرَشِيٌّ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ - فَأَمَّا فِي الْقَوَدِ فَيُقْتَلُ».(٣)

واتە: لە عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلای کوڕی مەتیع وتویەتی: گوێم لە موتیع بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا هەمان فەرموودەی گێڕایەوە.

---

(١) - صحيح.
(٢) - صحيح.
(٣) - صحيح.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: زانایان ئەم فەرموودەیان لێکداوەتەوە بەوەی: هیچ قورەیشییێک ناکوژرێت لەسەر کوفر (چونکە گشتیان بوونەتە مسوڵمان)، واتە هیچ قورەیشییێک کافر نابێتەوە دوای ئەم ڕۆژە (کەواتە: لەسەر کوفر ناکوژرێت)، ئەدی لەسەر کوشتن، ئەوە دەکوژرێنەوە.

## بابەت: کەس بە تاوانی جگە لە خۆی تێوەناگلێ

٢٤٣٩ - «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَمَعِيَ ابْنٌ لِي وَلَمْ نَكُنْ رَأَيْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَتَيْتُهُ فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ. فَلَمَّا رَأَيْتُهُ عَرَفْتُهُ بِالصِّفَةِ، فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا الَّذِي مَعَكَ؟ قُلْتُ ابْنِي، وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: ابْنُكَ؟ فَقُلْتُ: أَشْهَدُ بِهِ. قَالَ: فَإِنَّ ابْنَكَ هَذَا لاَ يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلاَ تَجْنِي عَلَيْهِ».[1]

واتە: لە ئەبو ریمثەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ مەدینە و کوڕێکی خۆم لەگەڵ بوو، پێغەمبەری خوامان ﷺ نەبینی بوو، جا چووم بۆ لای و ئەویش هاتە دەرەوە لەکاتێکدا دوو پارچە جلی سەوزی لەبەردا بوو، جا کە بینیم بە صیفاتەکانی ناسیمەوە، چووم بۆ لای و فەرمووی: ئەوە کێیە لەگەڵتە؟ وتم: کوڕمە سوێند بە خوای کەعبە، ئەویش فەرمووی: کوڕتە؟ منیش وتم: شاهێدی دەدەم کە کوڕمە، فەرمووی: ئەم کوڕەی تۆ نە تاوانەکانی دەکەونە سەر تۆ نە ئەویش تاوانی تۆی دەکەوێتە سەر (واتە: هەر یەکەتان ئۆباڵی تاوانەکەی لەسەر خۆیەتی، ئەگەر کوڕت کەسێک بکوژێت ئەوە ئەو دەکوژرێتەوە نەک تۆ، تۆش کەسێک بکوژی دەکوژرێیتەوە نەک ئەو، بەو شێوەیە).

٢٤٤٠ - «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ، قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ لِأَبِي: ابْنُكَ هَذَا؟ فَقَالَ: إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ. قَالَ: حَقًّا؟ قَالَ: حَقًّا أَشْهَدُ بِهِ قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ضَاحِكًا مِنْ ثَبَتِ شَبَهِي فِي أَبِي، وَمِنْ حَلِفِ أَبِي عَلَيَّ. فَقَالَ: إِنَّ ابْنَكَ هَذَا لاَ يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلاَ تَجْنِي عَلَيْهِ، قَالَ: وَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۝١٦٤﴾ الأنعام».[2]

واتە: لە ئەبو ریمثەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لەگەڵ باوکم چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوکمی وت: ئەوە کوڕتە؟ باوکم وتی: بەڵێ، سوێند بە خوای کەعبە، فەرمووی: هەر بەڕاست؟ باوکم وتی: هەر بەڕاست، شاهێدی دەدەم، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنە پێکەنی لەبەر زۆر وێکچوونم بە باوکم و لەبەر زۆر سوێند خواردنی باوکم لەسەر من، وە فەرمووی: ئەم کوڕەی تۆ نە تاوانەکانی دەکەونە سەر تۆ، نە ئەویش تاوانی تۆی دەکەوێتە سەر، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۝١٦٤﴾ الأنعام.

---

(١) صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: جیهاد و تێكۆشان لە پێناوی خوا چاكترین و گەورەترین كردەوەیە

٢٤٤١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ، قَالَ: قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَتَذَاكَرْنَا فَقُلْنَا: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ تَعَالَى لَعَمِلْنَاهُ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾﴾ الصف، حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا ابْنُ سَلَامٍ: قَالَ يَحْيَى: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا أَبُو سَلَمَةَ، وَقَرَأَهَا عَلَيْنَا يَحْيَى، وَقَرَأَهَا عَلَيْنَا الأَوْزَاعِيُّ، وَقَرَأَهَا عَلَيْنَا مُحَمَّدٌ».(١)

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی سەلامەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: چەند نەفەرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتین و بیرەوەری چاكەمان دەكرد و وتمان: خۆزگە بمانزانیایە كام كردەوە لای خوا خۆشەویسترینە تا ئەنجاممان بدایە، جا خوای بەرز ئەو ئایەتانەی دابەزاند: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾﴾ الصف، تا كۆتایی بە سورەتەكە هێنا، عەبدوڵڵا وتویەتی: پێغەمبەری خواش بۆی خوێندینەوە تاوەكو كۆتایی بە سورەتەكە هێنا، ئەبو سەلەمە وتویەتی: ئیبنو سەلامیش سورەتەكەی خوێندەوە بەسەرمانەوە، یەحیا وتویەتی: ئەبو سەلەمە سوورەتەكەی بەسەردا خوێندینەوە و یەحیاش بەسەریدا خوێندینەوە و ئەوزاعیش بەسەریدا خوێندینەوە و موحەممەدیش بەسەریدا خوێندینەوە (واتە: هەموو ڕاویەكان ئەم سوورەتەیان بەسەر كەسانی دوای خۆیان خوێندۆتەوە، كە باسی گەورەیی جیهاد و تێكۆشان دەكات لەناو سورەتەكەدا).

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی جیهاد

٢٤٤٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَكَفَّلَ اللهُ لِمَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ جِهَادٌ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَتَصْدِيقُ بِكَلِمَاتِهِ، أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ».(٢)

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا گرەتنی پاراستنی ئەو كەسە دەكات كە لە ماڵەكەی دەرچووە و، هیچ شتێك وەدەری نەناوە تەنها جیهاد و تێكۆشان لە پێناوی خوا و بەڕاست دانان و بڕوابوون بە وتە و ئایەتەكانی خوا نەبێت، (كەفالەتی ئەو كەسە دەكات) كە بیخاتە بەهەشتەوە (ئەگەر شەهید بێت)، یانیش بیگەڕێنیتەوە بۆ ئەو ماڵ و شوێن و جێگەی كە لێوەی دەرچووە، بە پاداشت و دەستكەوتەوە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف لنفسه، صحيح لغيره.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: كام جیهاد و تێكۆشان گەورەترین و باشترینە

٢٤٤٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ عُقِرَ جَوَادُهُ، وَأُهْرِيقَ دَمُهُ».(١)

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كام جیهاد و تێكۆشان گەورەترین و چاكترینە؟ فەرمووی: ئەو كەسەی ئەسپەكەی بكوژرێ و، خۆشی خوێنی لێ بچۆڕی و شەهید ببێت.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی كە ئایا كام كردەوە چاكترینە

٢٤٤٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيمَانٌ بِاللهِ وَرَسُولِهِ، قَالَ: قِيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ، قِيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ حَجٌّ مَبْرُورٌ».(٢)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێكرا كام كردەوە چاكترینە؟ فەرمووی: بڕوابوون بە خواو بە پێغەمبەرەكەی ﷺ، (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: وترا: دواتر چ كردەوەیەک؟ فەرمووی: دواتر جیهاد و تێكۆشان لە پێناوی خوا وترا: دواتر چ كردەوەیەک؟ فەرمووی: حەجێكی قەبوڵكراو.

## بابەت: ئەو كەسەی دەجەنگێ لە پێناوی خوا بە ئەندازەی وشتر دۆشینێک

٢٤٤٥ - «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللهِ فُوَاقَ نَاقَةٍ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ وَهُوَ قَدْرُ مَا يدُرُّ حَلَبَهَا لِمَنْ حَلَبَهَا».(٣)

واتە: لە موعاذی كوڕی جەبەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک بجەنگێ لە پێناوی خوا بە ئەندازەی دۆشینی وشترێک، ئەوە بەهەشتی بۆ واجب دەبێت.

(فُوَاقَ نَاقَةٍ) واتە: ئەندازەی دۆشینی وشترێک بە نسبەت ئەو كەسەی دەیدۆشێت.

## بابەت: چاكترینی خەڵكی پیاوێكە سەر و (هەوساری) ئەسپەكەی بەدەستەوە گرتووە بۆ جیهاد و تێكۆشان لە پێناوی خوا

٢٤٤٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَلَيْهِمْ، وَهُمْ جُلُوسٌ فَقَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ مَنْزِلَةً؟ قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: رَجُلٌ مُمْسِكٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ، أَوْ قَالَ فَرَسٍ: فِي سَبِيلِ اللهِ، حَتَّى يَمُوتَ أَوْ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

يُقْتَلَ. قَالَ: فَأُخْبِرُكُمْ بِالَّذِي يَلِيهِ، فَقُلْنَا: نَعم يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: امْرُؤٌ مُعْتَزِلٌ فِي شِعْبٍ يُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَعْتَزِلُ شُرُورَ النَّاسِ، قَالَ: فَأُخْبِرُكُمْ بِشَرِّ النَّاسِ مَنْزِلَةً؟ فَقُلْنَا: نَعم يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: الَّذِي يُسْأَلُ بِاللهِ الْعَظِيمِ وَلاَ يُعْطِي بِهِ».[(١)]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ لایان، لەکاتێکدا دانیشتبوون و فەرمووی: ئایا چاکترینی خەڵکیتان پێ ڕانەگەیەنم لە ڕووی پلەو مەنزیلەتەوە؟ وتمان: با، فەرمووی: پیاوێکە سەر و هەوساری ئەسپەکەی گرتۆتە دەست لە پێناوی خوا تاوەکو وەفات دەکات یان دەکوژرێت، فەرمووی: هەروەها کەسی دواترتان پێ ڕابگەیەنم؟ ئێمەش وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: کەسێکە خۆی دورخستۆتەوە، لە دۆڵێکدا گیرساوەتەوە و نوێژ دەکات و زەکات دەدات و لە خەڵکی خراپ دور دەکەوێتەوە، فەرمووی: هەروەها هەواڵتان پێ بدەم بە خراپترینی خەڵکی مسوڵمان لە ڕووی پلە و مەنزیلەتەوە؟ ئێمەش وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەو کەسەی بە ناوی خوای گەورە سواڵ دەکات و بۆ خواش نابەخشێت.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی پلەی ئەو پیاوەی جیهاد دەکات لە پێناوی خوا

٢٤٤٧ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَقَامُ الرَّجُلِ فِي الصَّفِّ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَفْضَلُ مِنْ عِبَادَةِ الرَّجُلِ سِتِّينَ سَنَةً».[(٢)]

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پلەی ئەو پیاوەی لە ڕیزی موجاهید و تێکۆشەراندایە لە پێناوی خوا، چاکترە لە پەرستشی ئەو پیاوەی شەست ساڵ عیبادەت دەکات.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی تۆزاوی بوون لە پێناوی خوا

٢٤٤٨ - «أَنَّ مَالِكَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، مَرَّ عَلَى حَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةَ ﷺ - أَوْ حَبِيبٌ مَرَّ عَلَى مَالِكٍ - وَهُوَ يَقُودُ فَرَسًا يَمْشِي، فَقَالَ: أَلا تَرْكَبُ حَمَلَكَ اللهُ؟، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ».[(٣)]

واتە: مالیکی کوڕی عەبدوڵلا بەلای حەبیبی کوڕی مەسلەمەدا تێپەڕی ـ یانیش حەبیب بەلای مالیکدا تێپەڕی ـ لە کاتێکدا ئەسپێکی لێدەخوڕی و بە پیادە دەڕۆیشت، ئەویش وتی: بۆ سوار نابی خوا سواریت پێ ببەخشێت و سواری ببیت؟ وتی: (بۆیە سوار نابم چونکە) هەر کەسێک دوو قاچەکانی تۆزاوی بن لە پێناوی خوا، ئەوە خوا حەڕامی دەکات لەسەر ئاگر و (ناچێتە دۆزەخ).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح لغيره.

## بابەت: بەیانیەک یان ئێوارەیەک (تێکۆشان) لە پێناوی خوا

٢٤٤٩ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَغَدْوَةٌ فِي سبِيلِ اللهِ، أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا».[1]

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەیانیەک تێکۆشان لە پێناوی خوا، یان ئێوارەیەک تێکۆشان لە پێناوی خوا چاکتر و گەورەترە لە دونیا و ئەوەی تیایەتی.

## بابەت: ئەو کەسەی یەک ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت لە پێناوی خوا

٢٤٥٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ، إِلاَّ بَاعَدَ اللهُ بَيْنَ وَجْهِهِ، وَبَيْنَ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا».[2]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر بەندەیەک یەک ڕۆژ بەڕۆژو بێت لە ڕێگای خوا، مەبەستی خوابێت، حەتمەن خوا نێوانی ئەو و ئاگر حەفتا پایز دوردەخاتەوە (واتە: حەفتا ساڵ لە ئاگر دوورە و ناچێتە ناویەوە).

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی شەونخونی و ئێشکگری دەکات لە پێناوی خوا

٢٤٥١ - «عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةٍ فَسَمِعَهُ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهُوَ يَقُولُ: حُرِّمَتِ النَّارُ عَلَى عَيْنٍ سَهِرَتْ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَحُرِّمَتِ النَّارُ عَلَى عَيْنٍ دَمَعَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ قَالَ: وَقَالَ: الثَّالِثَةَ فَنَسِيتُهَا، قَالَ أَبُو شُرَيْحٍ: سَمِعْتُ مَنْ يَقُولُ: ذَاكَ حُرِّمَتِ النَّارُ عَلَى عَيْنٍ غَضَّتْ عَنْ مَحَارِمِ اللهِ، أَوْ عَيْنٍ فُقِئَتْ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ».[3]

واتە: لە ئەبو ڕەیحانەوە گێڕدراوەتەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە لە غەزایێک و گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو شەوێکیان دەیفەرموو: ئاگری دۆزەخ حەرام کراوە لەسەر چاوێک شەونخونی و ئێشکگری کردبێت لە پێناوی خوا، وە ئاگری دۆزەخ حەرام کراوە لەسەر چاوێک فرمێسک دەڕژێنێت لە ترسی خوا، (ئەبو ڕەیحانە) دەڵێت: سێیەمیانیشی فەرموو، بەڵام من بیرم نەماوە، ئەبو شورەیح وتویەتی: گوێم لێبووە لە یەکێک وتویەتی: سێیەمیان ئەوەیە: ئاگری دۆزەخ حەرام کراوە لەسەر

---

(١) ـ صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

چاوێک دەنوقێنرێت لە سەیرکردنی حەرامکراوەکانی خوا، یان چاوێکە کە ڕژاوە لە پێناوی خوای زاڵی پایەدار (لە جیهاد).

٢٤٥٢ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: رَحِمَ اللهُ حَارِسَ الْحَرَسِ».

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لە حاریسی حەرەس بێت (واتە: ڕەحمەتی خوا لە حاریسی جەیشی مسوڵمانان بێت، بۆیە ناوی جەیشی مسوڵمانانیشی بە حەرەس هێناوە، چونکە ئەوان حەرەسی دین و ژینی مسوڵمانانن).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی مەسرەف کردن لە جیهاد لە پێناوی خوا

٢٤٥٣ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ، فَقَالَ: هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعُ مِائَةِ نَاقَةٍ كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ».[١]

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وشترێکی هەوسارکراوی هێنا و وتی: ئەوە لە پێناوی خوایە (بۆ جیهاد دەیبەخشم)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەهۆی ئەو وشترەوە لە ڕۆژی دواییدا حەوت سەد (٧٠٠) وشترت بۆ هەیە هەموویان هەوسارکراون.

## بابەت: ئەو کەسەی دوانەیەک لە ماڵەکەی دەبەخشێت بۆ جیهاد لە پێناوی خوا

٢٤٥٤ - «عَنْ صَعْصَعَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ ﷺ، قَالَ: لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ وَهُوَ يَسُوقُ جَمَلاً لَهُ أَوْ يَقُودُهُ فِي عُنُقِهِ قِرْبَةٌ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا ذَرٍّ مَالُكَ، قَالَ لِي: عَمَلِي، فَقُلْتُ: مَالُكَ قَالَ لِي: عَمَلِي، قُلْتُ: حَدِّثْنِي حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ مِنْ مَالٍ فِي سَبِيلِ اللهِ إِلاَّ ابْتَدَرَتْهُ حَجَبَةُ الْجَنَّةِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هُوَ دِرْهَمَيْنِ، أَوْ أَمَتَيْنِ، أَوْ عَبْدَيْنِ، أَوْ دَابَّتَيْنِ».[٢]

واتە: لە صەعصەعەی کوڕی موعاویەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئەبو ذەڕ گەیشتم، لەکاتێکدا وشترێکی ڕادەکێشا یان لێی دەخوڕی مەتارەیەکیشی لە مل بوو، منیش وتم: ئەی ئەبو ذەڕ: چیت بۆ هەیە؟ پێی وتم: کردەوەی خۆم، منیش (دووبارە) وتم: ئەی ئەبو ذەڕ: چیت بۆ هەیە؟ پێی وتم: کردەوەی خۆم، جا وتم: فەرموودەیەکم بۆ بگێڕەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێت لێ بووبێت، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێک دوانەیەک لە ماڵ و سەروەتەکەی لە پێناوی خوا ببەخشێت حەتمەن دەرگاوانەکانی بەهەشت پێشبڕکێ و دەست پێشخەری دەکەن بۆ لای (تاوەکو دەرگای بەهەشتی بۆ بکەنەوە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (جا دوانەكە) دوو درهەم، یان دوو جاریە، یان دوو بەندە، یان دوو وڵاغ بێت.

## بابەت: گەورەیی نیشان شكاندن و تیرهاوێژی و فەرمان پێكردنی

٢٤٥٥ - «عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، مَرْثَدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّهُ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾ ﴾ الأنفال، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ».[1]

واتە: لە ئەبول خەیر، مەرثەدی كوڕی عەبدوڵلاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عوقبەی كوڕی عامیری ﷺ گێڕدراوەتەوە كە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾ ﴾ الأنفال، واتە: [خۆتانیان بۆ ئامادە بكەن لە هێز ئەوەی لە تواناتاندا هەیە] (عوقبە وتی): بزانن هێز (لەم ئایەتەدا) نیشان شكاندن و تیرهاوێژیە.

٢٤٥٦ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يُدْخِلُ الثَّلاَثَةَ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ الْجَنَّةَ: صَانِعَهُ يَحْتَسِبُ فِي صَنْعَتِهِ الْخَيْرَ، وَالْمُمِدَّ بِهِ، وَالرَّامِيَ بِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ارْمُوا وَارْكَبُوا وَلأَنْ تَرْمُوا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ تَرْكَبُوا، وَقَالَ: كُلُّ شَيْءٍ يَلْهُو بِهِ الرَّجُلُ بَاطِلٌ، إِلاَّ رَمْيَ الرَّجُلِ بِقَوْسِهِ، وَتَأْدِيبَهُ فَرَسَهُ، وَمُلاَعَبَتَهُ أَهْلَهُ، فَإِنَّهُنَّ مِنَ الْحَقِّ، وَقَالَ: مَنْ تَرَكَ الرَّمْيَ بَعْدَمَا عُلِّمَهُ فَقَدْ كَفَرَ الَّذِي عُلِّمَهُ».[2]

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار سێ كەس بەهۆی یەک تیرەوە دەخاتە بەهەشتەوە: دروستكەری تیرەكە كە مەبەستی لە دروستكردنەكەی چاكە بێت، وە ئەو كەسەی كە تیرەكە دەداتە دەستی تیرهاوێژ تا بیهاوێژێ، وە تیر هاوێژەكە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تیرهاوێژی بكەن و سواری وڵاغیش بن، وە ئەگەر هاتوو تیرهاوێژیەكە بكەن پێم خۆشتر و باشترە لەوەی سواری وڵاغ بن (بێ هونەری جەنگی و تیرهاوێژی)، هەروەها فەرموویەتی: هەموو شتێک كە مرۆڤ یاری پێ بكات بێ سودە، تەنها تیرهاویشتنی پیاو بە كەوانەكەی و، ڕاهێنانی ئەسپەكەی (لەسەر جەنگ و جیهاد) و، یاری كردنی لەگەڵ ژن و منداڵەكەی نەبێت، ئەمانە لە بەشی هەقن.

هەروەها فەرموویەتی: هەر كەسێک تیرهاوێژی واز لێ بێنێت پاش ئەوەی فێركراوە، ئەوە بێ نمەک بووە بەرانبەر بەوەی فێركراوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی ئەو کەسەی بریندار کراوە لە جیهاددا لە پێناوی خوا

٢٤٥٧ - « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ مَجْرُوحٍ يُجْرَحُ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، إِلاَّ بَعَثَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَجُرْحُهُ يَدْمَى الرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ، وَاللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ».[1]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ برینداریک نیە بریندار بکرێت لە جیهاددا لە پێناوی خوای زاڵی پایەدار حەتمەن خوای زاڵی پایەدار لە دواڕۆژدا زیندووی دەکاتەوە لەکاتێکدا برینەکەی خوێنی لێدێ، بۆنەکەی بۆنی میسکە و ڕەنگەکەشی ڕەنگی خوێنە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی داوای شەهیدی لە خوا دەکات

٢٤٥٨ - «عن سهل بن أمامة بن سهل بن حنيف ﷺ يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ صَادِقًا مِنْ قَلْبِهِ بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ».[2]

واتە: سەهلی کوڕی ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی ئەحنەفەوە لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک داوای شەهید بوون بکات لە دڵەوە، ئەوە خوا دەیگەیەنێت بە پلەی شەهیدان، هەرچەندە لەسەر جێگای خۆشی بمرێت (واتە: هەر چەندە لە جیهادیش نەکوژرێت).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی شەهید

٢٤٥٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنْ أَلَمِ الْقَتْلِ، إِلاَّ كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنْ أَلَمِ الْقَرْصَةِ».[3]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی توشی شەهید دەبێت لە ئێش و ئازاری کوشتن، وەکو ئازاری هەر یەکێک لە ئێوە وایە لە ئازاری قونجیرکە.

تێبینی: قونجیرکە بریتیە لە لولدانی پێست بە پەنجەی گەورەی دەست و پەنجەی شاتومان، جا ئازارەکەی چەندە شەهیدیش تەنها ئەوەندە ئازارە هەست پێ دەکات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

## بابەت: ئەوەی شەهید ئاواتی بۆ دەخوازێ لە گەڕانەوە بۆ دونیا

٢٤٦٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ فَتَدْخُلُ الْجَنَّةَ، فَتَوَدُّ أَنَّهَا رَجَعَتْ إِلَيْكُمْ، وَلَهَا الدُّنْيَا، وَمَا فِيهَا إِلاَّ الشَّهِيدَ، فَإِنَّهُ يَوَدُّ أَنَّهُ قُتِلَ كَذَا مَرَّةً لِمَا رَأَى مِنَ الثَّوَابِ».[١]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە بمرێت و بچێتە بەهەشتەوە، دواتر ئاوات بخوازێت بگەڕێتەوە بۆ لاتان ئەگەرچی هەموو دونیا و ئەوەی لە ناویشی دایە بۆ ئەو بێت، جگە لە شەهید، ئەو ئاوات دەخوازێت چەندان جار بکوژرێت، لەبەر ئەو پاداشتەی بینیویەتی پێی بەخشراوە.

## بابەت: ڕۆحی شەهیدەکان

٢٤٦١ - «عَنْ مَسْرُوقٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللهِ ﷺ عَنْ أَرْوَاحُ الشُّهَدَاءِ، وَلَوْلاَ عَبْدُ اللهِ، لَمْ يُحَدِّثْنَا أَحَدٌ، قَالَ: أَرْوَاحُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي حَوَاصِلِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ فِي أَيِّ الْجَنَّةِ شَاءُوا، ثُمَّ تَرْجِعُ إِلَى قَنَادِيلِهَا فَيُشْرِفُ عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ فَيَقُولُ: أَلَكُمْ حَاجَةٌ؟ تُرِيدُونَ شَيْئًا؟ فَيَقُولُونَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ نَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَنُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرَى».[٢]

واتە: لە مەسروقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارمان لە عەبدوڵلا ﷺ کرد دەربارەی ڕۆحی شەهیدەکان، ئەگەر عەبدوڵلا نەبووایە ئەوە کەس بۆی نەدەگێڕاینەوە، (عەبدوڵلا) وتی: ڕۆحی شەهیدەکان لەلای خوا لە ڕۆژی دواییدا لەناو سینگی باڵندەیەکی سەوز دایە (یان شەهیدەکان کراونەتە باڵندەیەکی سەوز)، چرایان هەیە هەڵواسراوە بە عەرشەوە(کە وەک لانە وایە)، دەخوات و دەخواتەوە لە هەر شوێنێکی بەهەشت کە بیەوێ، دواتر دەگەڕێنەوە ناو چراکان، جا پەروەردگاریان سەیریان دەکات و دەفەرموێت: ئایا پێویستییێکتان هەیە؟ شتێکتان دەوێت؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر، تەنها ئەوە نەبێت دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ دونیا و جارێکیتر بکوژرێین (لەبەر ئەو هەموو نازو نیعمەت و ڕێزلێنانە).

## بابەت: دەربارەی سیفەتی کوژراوانی پێناوی خوا

٢٤٦٢ - «عَنْ عُتْبَةَ بْنِ عَبْدٍ السُّلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْقَتْلَى ثَلاَثَةٌ: مُؤْمِنٌ جَاهَدَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، إِذَا لَقِيَ الْعَدُوَّ، قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ « قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِيهِ: فَذَلِكَ الشَّهِيدُ الْمُمْتَحَنُ فِي خَيْمَةِ اللهِ، تَحْتَ عَرْشِهِ، لاَ يَفْضُلُهُ النَّبِيُّونَ إِلاَّ بِدَرَجَةِ النُّبُوَّةِ، وَمُؤْمِنٌ خَلَطَ عَمَلاً صَالِحًا، وَآخَرَ سَيِّئًا جَاهَدَ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

بِنَفْسِهِ، وَمَالِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، إِذَا لَقِيَ الْعَدُوَّ قَاتَلَ حَتَّى يُقْتَلَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فِيهِ مُمَصْمِصَةٌ مَحَتْ ذُنُوبَهُ، وَخَطَايَاهُ، إِنَّ السَّيْفَ مَحَّاءٌ لِلْخَطَايَا، وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شَاءَ، وَمُنَافِقٌ جَاهَدَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَإِذَا لَقِيَ الْعَدُوَّ قَاتَلَ حَتَّى يُقْتَلَ، فَذَاكَ فِي النَّارِ، إِنَّ السَّيْفَ لاَ يَمْحُو النِّفَاقَ، قَالَ عَبْد اللهِ: يُقَالُ لِلثَّوْبِ: إِذَا غُسِلَ مُصْمِصَ».(١)

واتە: لە عوتبەی کوڕی عەبدی ئەسلەمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کوژراوان سێ جۆرن: (جۆری یەکەمیان): بڕوادارێکە بە نەفس و بە ماڵ تێکۆشانی لە پێناوی خوا ﷻ کردوە، کاتێ بە دوژمن گەیشتووە شەڕی کردوە تاوەکو کوژراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: ئەوە شەهیدێکی پاڵفتەیە و لە ژێر خێمەی خوا لە ژێر عەرش، پێغەمبەران لەوان گەورەتر و بەرزتر نین تەنها بە پلەی پێغەمبەرایەتی نەبێت، وە (جۆری دووەم): بڕوادارێکە کردەوەی چاک و خراپی تێکەڵ کردوە، بە نەفس و بە ماڵ جیهاد و تێکۆشانی لە پێناوی خوا کردوە، کاتێ بە دوژمن گەیشتووە شەڕی کردوە تاوەکو کوژراوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: پاککراوەتە، گوناهو تاوانی سڕاونەتەوە، (چونکە) شمشێر زۆر بە باشی تاوانەکان دەسڕێتەوە، وە (سێیەمیان): مونافیقێکە بە نەفس و بە ماڵ جیهاد و تێکۆشانی (بە ڕوکەش) لە پێناوی خوا کردوە، کاتێ بە دوژمن دەگات شەڕ دەکات تاوەکو دەکوژرێت، ئەوەیان بۆ ئاگرە، (چونکە) شمشێر نیفاق و دوو ڕویی پاک ناکاتەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی دەجەنگێت لە پێناوی خوا بە ئارامگری و چاوبڕینە پاداشتەوە

٢٤٦٣ - «عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَامَ فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ ذَكَرَ الْجِهَادَ، فَلَمْ يَدَعْ شَيْئًا أَفْضَلَ مِنْهُ إِلاَّ الْفَرَائِضَ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَهَلْ ذَلِكَ مُكَفِّرٌ عَنْهُ خَطَايَاهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعم، إِذَا قُتِلَ صَابِرًا، مُحْتَسِبًا، مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ، إِلاَّ الدَّيْنَ، فَإِنَّهُ مَأْخُوذٌ بِهِ كَمَا زَعَمَ لِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و وتاریدا، (لە وتارەکەیدا) سوپاسی خوای کرد و بە جوانی وەسفی کرد، دواتر باسی جیهاد و تێکۆشانی کرد، جا هیچ شتێکی نەهێشتەوە چاکتربێت لە جیهاد تەنها نوێژە فەرزەکان نەبێت، جا پیاوێک هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەبینی و پێت چۆنە کەسێک لە پێناوی خوا بکوژرێت، ئایا ئەوە تاوانەکانی لەسەر دەسڕێتەوە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر بکوژرێ بە ئارامگری و، چاوەڕێی پاداشت بێ، ڕووی کردبێتە دوژمن، ڕای نەکردبێ و پشتی لە لە دوژمن نەکردبێ، (ئەو کەسە هەموو تاوانەکانی دەسڕێنەوە) جگە لە قەرز، چونکە لێپێچینەوەی لەسەر قەرز لەگەڵ دەکرێت، وەک جیبریل ﷺ پێی وتووم.

---

(١) إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: ئەوانەی بە شەهید هەژمار دەکرێن

٢٤٦٤ - «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ، وَالْغَرَقُ شَهَادَةٌ، وَالْغَزْوُ شَهَادَةٌ، وَالْبَطْنُ، وَالنُّفَسَاءُ».(١)

واتە: لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: (مردن بە نەخۆشی) تاعون شەهیدیە، خنکانیش شەهیدیە، (کوژران لە) غەزا و جیهادیش شەهیدیە، (مردن بە) زک ئێشەش (شەهیدیە)، (مردن بەهۆی) منداڵ بوونیش (شەهیدیە).

٢٤٦٥ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهَادَةٌ، وَالطَّاعُونُ شَهَادَةٌ، وَالْبَطْنُ شَهَادَةٌ، وَالْمَرْأَةُ يَقْتُلُهَا وَلَدُهَا جُمْعًا شَهَادَةٌ».(٢)

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کوژران لە پێناوی خوا شەهیدیە، وە (مردن بە) تاعون شەهیدیە، وە (مردن بە) زک ئێشە شەهیدیە، وە ئەو ئافرەتەی منداڵەکەی دەیکوژێت (واتە: ئەو ئافرەتەی بە هۆی لەدایکبوونەوە دەمرێت) کاتێ هێشتا منداڵەکەی لە سکیەتی شەهیدیە.

## بابەت: ئەوەی تووشی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بووە لە سەغڵەتی لە جیهاد و غەزاکانیان

٢٤٦٦ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، مَا لَنَا طَعَامٌ إِلاَّ هَذَا السَّمُرُ وَوَرَقُ الْحُبْلَةِ حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، مَا لَهُ خِلْطٌ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ يُعَزِّرُونِي لَقَدْ خِبْتُ إِذَنْ وَضَلَّ عَمَلِي».(٣)

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ غەزامان کرد، هیچ خواردنێکمان نەبوو تەنها بەری داری سەموڕ لەگەڵ پەلکی داری سەموڕ نەبێت، هەتا (لەبەر بێ خۆراکی وامان لێهاتبوو) هەر یەکێک لە ئێمە ئەوەی دایدەنا وەک هی بزن بوو (واتە: پاشەڕۆی وەک قشپل بوو) تێکەڵ نەدەبوو، ئنجا (لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی چێشتم لەسەر ئیسلامەتی) وای لێبێ بەنی ئەسەد لۆمەی من بکەن (گوایە ڕایان لە دینداری من نیە و ئەوان فێرم بکەن)!، بەڕاستی ئەو کات خەسارەتمەندم و کردەوەم بە فیڕۆ ڕۆیشتووە.

تێبینی: سەعد بۆیە وای وت، چونکە بەنی ئەسەد چوون بۆ لای ئیمامی عومەر و وتیان سەعد نازانێ نوێژ بکات.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو کەسەی جیهاد و غەزا بکات، نیەتی هەر شتێک بهێنێت

٢٤٦٧ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ غَزَا فِي سَبِيلِ اللهِ، وَهُوَ لاَ يَنْوِي فِي غَزَاتِهِ إِلاَّ عِقَالاً فَلَهُ مَا نَوَى».[1]

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک غەزا و تێکۆشان بکات لە پێناوی خوا (بە ڕووکەش) و، هیچ نیەتێکیشی نەبێت تەنها پەتک و گوریسی وشتر بەستنەوە نەبێت (واتە: تەنها نیەتی دەستکەوت و غەنیمەت بەدەستهێنان بێت)، ئەوە ئەوەی بۆ هەیە کە نیەتی بۆ هێناوە.

## بابەت: غەزا دوو جۆرە

٢٤٦٨ - «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْغَزْوُ غَزْوَانِ فَأَمَّا مَنْ غَزَا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ، وَأَطَاعَ الإِمَامَ، وَأَنْفَقَ الْكَرِيمَةَ، وَيَاسَرَ الشَّرِيكَ، وَاجْتَنَبَ الْفَسَادَ، فَإِنَّ نَوْمَهُ، وَنُبْهَهُ أَجْرٌ كُلُّهُ، وَأَمَّا مَنْ غَزَا فَخْرًا وَرِيَاءً، وَسُمْعَةً وَعَصَى الإِمَامَ، وَأَفْسَدَ فِي الأَرْضِ فَإِنَّهُ لاَ يَرْجِعُ بِالْكَفَافِ».[2]

واتە: لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: غەزا و جیهاد دوو جۆرە: (یەکەمیان): هەرچی ئەو کەسەیە کە شەڕ و غەزا دەکات لە پێناوی ڕەزامەندی خوا و، گوێڕایەڵی ئیمام دەکات و، شتی چاک سەرف دەکات لە پێناوی خوا و، مامەڵەی چاک و ئاسان لەگەڵ هاوەڵەکەی دەکات و، لە ئاشوب دوور بکەوێتەوە، ئەوە خەوتن و بە ئاگابوونی هەمووی پاداشتە، وە هەرچی ئەو کەسەشە کە شەڕ و غەزا دەکات بۆ ڕیایی و ناوبانگ و، سەرپێچی ئیمام دەکات و، ئاشوب لە زەویدا بڵاودەکاتەوە، ئەوە ناگەڕێتەوە تەنها بە مایەی خۆی نەبێت (واتە: هیچ پاداشتی نیە).

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی مردووە و غەزای نەکردوە

٢٤٦٩ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يَغْزُ، أَوْ يُجَهِّزْ غَازِيًا، أَوْ يَخْلُفْ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ أَصَابَهُ اللهُ بِقَارِعَةٍ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ».[3]

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک غەزا و جیهاد نەکات، یان موجاهید و تێکۆشەرێک پڕ چەک و ئامادە نەکات، یان لەناو خانەوادەی موجاهیدێک نەمێنێتەوە بۆ خزمەتکردن و مەسرەفکردنیان، ئەوە خوا کارەساتێکی گەورەی توش دەکات لە دونیا پێشی ڕۆژی دوایی.

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ اسناده ضعيف ، لكن الحديث حسن.

(٣) ـ حسن.

## بابەت: دەربارەی ئەجر و گەورەیی ئەو کەسەی تێکۆشەرێک ئامادە بکات بۆ جیهاد

٢٤٧٠ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ كَتَبَ اللهُ لَهُ، مِثْلَ أَجْرِهِ إلاَّ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الْغَازِي شَيْئًا».[1]

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەینیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک تێکۆشەرێک پڕچەک و ئامادە بکات لە پێناوی خوا، یان لەناو ماڵ و منداڵی موجاهیدێک بمێنێتەوە چاودێری و مەسرەفیان بکات، ئەوە خوا هەمان پاداشتی تێکۆشەرەکەی بۆ دەنوسێت، تەنها ئەوەندە نەبێت ئەوە هیچ لە پاداشتی تێکۆشەرەکە کەم ناکاتەوە.

## بابەت: عوزر و بەهانە بۆ دواکەوتن و نەچوون بۆ جیهاد

٢٤٧١ - «أَنْبَأَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ ﷺ، يَقُولُ: « لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾ النساء، دَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، زَيْدًا فَجَاءَ بِكَتِفٍ فَكَتَبَهَا. وَشَكَا ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ضَرَارَتَهُ فَنَزَلَتْ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ النساء».[2]

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە بەڕڕاء بوو ﷺ دەیوت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾ النساء، واتە: [ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران و جەنگ ناکەن لەگەڵ ئەوانەی جیهاد و کۆشش دەکەن لە پێناوی خوادا بە ماڵ و سامان و نەفسی خۆیان ئەوە وەکو یەک نین]، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) بانگی زەیدی کرد و ئەویش بە ئێسقانێکی شانی ئاژەڵەوە هاتوو نوسیەوە، ئیبنو ئوممی مەکتومیش شکاتی چاو کوێریەکەی کرد (کە لەبەر ئەوە ناتوانێ جیهاد بکات)، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ النساء، واتە: [ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران و جەنگ ناکەن جگە لە کوێر و شەل و نەخۆش لەگەڵ ئەوانەی جیهاد و کۆشش دەکەن لە پێناوی خوادا بە ماڵ و سامان و نەفسی خۆیان ئەوە وەکو یەک نین].

## بابەت: گەورەیی جەنگاوەرانی دەریا

٢٤٧٢ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ حَرَامٍ بِنْتُ مِلْحَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: فِي بَيْتِهَا يَوْمًا، فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: أُرِيتُ قَوْمًا مِنْ أُمَّتِي يَرْكَبون ظَهْرَ هَذَا الْبَحْرِ كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ قَالَ: أَنْتِ مِنْهُمْ، ثُمَّ نَامَ أَيْضًا فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: أُرِيتُ قَوْمًا مِنْ أُمَّتِي

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

يَرْكَبوون ظهر هَذَا الْبَحْرَ كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: أَنْتِ مِنْهُمْ، ثُمَّ نَامَ أَيْضًا فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: أُرِيتُ قَوْمًا مِنْ أُمَّتِي يَرْكَبون هَذَا الْبَحْرَ كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ: قلت: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ، قَالَ: فَتَزَوَّجَهَا عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ فَغَزَا فِي الْبَحْرِ، فَحَمَلَهَا مَعَهُ، فَلَمَّا قَدِمُوا قُرِّبَتْ لَهَا بَغْلَةٌ لِتَرْكَبَهَا، فَصَرَعَتْهَا، فَدُقَّتْ عُنُقُهَا، فَمَاتَتْ».[1]

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئوممو حەڕامی کچی میلحان (رَضِي اللهُ عَنْهَا) بۆی گێڕامەوە، (وتی): پێغەمبەر ﷺ سەرخەوێکی شکاند لە ماڵەکەی، دواتر خەبەری بویەوە و پێدەکەنی، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی وای لێکردی پێبکەنی؟ فەرمووی: خەڵکانێکم پێ نیشاندرا لە ئوممەتی من کە سواری پشتی دەریا ببوون هەر وەک چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ لە خوا بکە کە بمکات بە یەکێک لەوان، فەرمووی: تۆ لەوانی، دواتر دیسان خەوتەوە و هەڵسایەوە و پێدەکەنی، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی وای لێکردی پێبکەنی؟ فەرمووی: خەڵکانێکم پێ نیشاندرا لە ئوممەتی من سواری پشتی دەریا ببوون وەک چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ لە خوا بکە کە بمکات بە یەکێک لەوان، فەرمووی: تۆ لەوانی، دواتر دیسان خەوتەوە و هەڵسایەوە و پێدەکەنی، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چی وای لێکردی پێبکەنی؟ فەرمووی: خەڵکانێکم پێ نیشاندرا لە ئوممەتی من سواری پشتی دەریا ببوون وەک چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزام بۆ لە خوا بکە کە بمکات بە یەکێک لەوان، فەرمووی: تۆ لە یەکەمەکانی، (ئەنەس) دەڵێ: جا عوبادەی کوڕی صامیت ئوممو حەڕامی خواست و بوو بە خێزانی ئەو و عوبادە لە دەریادا جەنگا و ئوممو حەڕامی خێزانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بردی، جا ماینێکی بۆ نزیکخرایەوە تاوەکو سواری بێت، جا (بەڵام) ماینەکە خستیە سەر زەوی و (بەریدایەوە) ملی ورد بوو و وەفاتی کرد (قسەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدی).

## بابەت: دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کە غەزا دەکەن شان بە شانی پیاوان

٢٤٧٣ - «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، سَبْعَ غَزَوَاتٍ أُدَاوِي الْجَرِيحَ، أَوِ الْجَرْحَى، وَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ، وَأَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ».[2]

واتە: لە ئوممو عەتییەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشداری حەوت غەزام کردوە تیایاندا بریندارم تیمار دەکرد و، چێشتم بۆ دروست دەکردن و، لەناو بارگەکانیان دەمامەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەندێک لە خێزانەکانی بۆ جەنگ و جیهاد

٢٤٧٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَطَارَتِ الْقُرْعَةُ عَلَى عَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، فَخَرَجَتَا مَعَهُ جَمِيعًا».[١]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەردەچوو تیروپشکی لە نێوان خێزانەکانی دەکرد، جا (جارێکیان) تیروپشکەکە کەوتە سەر عائیشەو حەفصە، جا هەردووکیان بەیەکەوە لەگەڵی دەرچوون.

## بابەت: گەورەیی ئەو کەسەی شەو و ڕۆژێک سەنگەر بگرێت

٢٤٧٥- «عَنْ أَبِي صَالِحٍ ﷺ، مَوْلَى عُثْمَانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ، عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَقُولُ: إِنِّي كُنْتُ كَتَمْتُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، كَرَاهِيَةَ تَفَرُّقِكُمْ عَنِّي، ثُمَّ بَدَا لِي أَنْ أُحَدِّثَكُمُوهُ لِيَخْتَارَ امْرُؤٌ لِنَفْسِهِ مَا بَدَا لَهُ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ يَوْمٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَنَازِلِ».[٢]

واتە: لە ئەبو صاڵحی ﷺ خزمەتکاری عوسمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عوسمان بوو لەسەر مینبەر و دەیوت: من فەرموودەیەکم لێ شاردبوونەوە کە گوێم لێ ببوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، لە ترسی ئەوەی لێم دووربکەونەوە، دواتر بۆم دەرکەوت (وا باشە) بۆتان بگێڕمەوە، تاوەکو هەر کەسێک چی پێ باش بێت بۆ خۆی هەڵیبژێرێت، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەموو: (ڕاوەستان لە بەرانبەر دوژمن) ڕۆژێک لە پێناوی خوا چاکترە لە هەزار ڕۆژیتر لە ماڵەوە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی ئەو کەسەی بە سەنگەرگرتویی دەمرێت

٢٤٧٦ - «عَنْ مِشْرَحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: كُلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ، إِلاَّ الْمُرَابِطَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَإِنَّهُ يُجْرَى لَهُ عَمَلُهُ حَتَّى يُبْعَثَ».[٣]

واتە: لە میشرەحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیر بوو ﷺ دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو مردووێک خەتم لەسەر کردەوەکانی دەدرێت و کردەوەکانی دادەخرێن، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە سەنگەری گرتووە لە پێناوی خوا، ئەویان کردەوەکانی بۆ گەشە پێ دەدرێت و زیاد و چەند قات دەکرێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: گەورەیی ئەسپی جیهاد لە پێناوی خوا

٢٤٧٧ - «عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ».[١]

واتە: لە عوڕوەی باریقیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ خێر و چاكەی بە نەوچەوانیەوە وابەستەیە، تاوەكو ڕۆژی دوایی، (خێرو چاكەكەش بریتیە لە): پاداشت و دەستكەوت.

٢٤٧٨ - «عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، الأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە عوڕوەی باریقیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ خێر و چاكەی بە نەوچەوانیەوە وابەستەیە تاوەكو ڕۆژی دوایی، (خێرو چاكەكەش بریتیە لە): پاداشت و دەستكەوت.

## بابەت: ئەو ئەسپەی چاكە و ئەوەی چاك نیە

٢٤٧٩ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَشْتَرِيَ فَرَسًا، فَأَيُّهَا أَشْتَرِي؟ قَالَ: اشْتَرِ أَدْهَمَ أَرْثَمَ مُحَجَّلَ طَلْقَ الْيَدِ الْيُمْنَى أَوْ مِنَ الْكُمْتِ عَلَى هَذِهِ الشِّيَةِ، تَغْنَمْ وَتَسْلَمْ».[٣]

واتە: لە ئەبو قەتادەی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەمەوێ ئەسپێك بكڕم، كام جۆریان بكڕم؟ فەرمووی: ئەسپی ڕەشی دەم و لوت و قاچ سپی، (بەڵام) قاچی ڕاستەی سپی نەبێت، یان لەنێوان ڕەش و سور بێت، ئەسپێك كە لەسەر ئەو سیفەتانە بێت، ئەوە شت بەدەست دەهێنیت و سەلامەتیش دەبی.

## بابەت: دەربارەی پێشبڕكێ

٢٤٨٠ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُسَابِقُ بَيْنَ الْخَيْلِ الْمُضَمَّرَةِ مِنَ الْحَفْيَاءِ إِلَى الثَّنِيَّةِ وَالَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَأَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا».[٤]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ئەسپی دابەستی ڕامهاتووی بەهێز پێشبڕکێی دەکرد لە حەیفاء تاوەکو ئەنییە (کە ناوی دوو شوێنن)، وە ئەو ئەسپەی دابەستی بەهێز نەبووایە پێشبڕکێی پێ دەکرد لە ئەنییەوە تاوەکو مزگەوتی بەنی زورەیق (مەودایەکەی کەمتر دادەنا)، ئیبنو عومەریش لەوانە بوو کە پێشبڕکێی پێ دەکرد.

## بابەت: دەربارەی پێشبڕکێی ئەسپ لەسەر خەڵات

٢٤٨١ - «عَنْ أَبِي لَبِيدٍ ﷺ، قَالَ: أُجْرِيَتِ الْخَيْلُ فِي زَمَنِ الْحَجَّاجِ - وَالْحَكَمُ بْنُ أَيُّوبَ عَلَى الْبَصْرَةِ، فَأَتَيْنَا الرِّهَانَ، فَلَمَّا جَاءَتِ الْخَيْلُ، قَالَ: قُلْنَا: لَوْ مِلْنَا إِلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فَسَأَلْنَاهُ: أَكَانُوا يُرَاهِنُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: فَأَتَيْنَاهُ وَهُوَ فِي قَصْرِهِ فِي الزَّاوِيَةِ، فَسَأَلْنَاهُ فَقُلْنَا لَهُ: يَا أَبَا حَمْزَةَ أَكُنْتُمْ تُرَاهِنُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُرَاهِنُ؟ قَالَ: نَعم، لَقَدْ رَاهَنَ وَاللهِ عَلَى فَرَسٍ لَهُ يُقَالُ لَهُ سَبْحَةُ، فَسَبَقَ النَّاسَ، فَأَنْهَشَ لِذَلِكَ، وَأَعْجَبَهُ، قَالَ عَبْدُ اللهِ: أَنْهَشَهُ: يَعْنِي: أَعْجَبَهُ».[١]

واتە: لە ئەبو لەبیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەسپ پێشبڕکێیان کرد لە سەردەمی حەججاج و حەکەمی کوڕی ئەیوبدا و، خەڵاتی پێشبڕکێیان بۆ هێنابن، جا کاتێ ئەسپەکان هاتن دەڵێ: وتمان: ئەگەر بچین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیک و پرسیاری لێ بکەین: کە ئایا پێشبڕکێیان کردوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر خەڵات؟ دەڵێ: جا چووین بۆ لای ئەنەس لەکاتێکدا لە کۆشکەکەی بوو لە زاویە، پرسیارمان لێ کرد و پێمان وت: ئەی ئەبو حەمزە (ئەی ئەنەس) ئایا ئێوە پێشبڕکێتان دەکرد لەسەر خەڵات لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی دەکرد؟ وتی: بەڵێ: بە دڵنیایی سوێند بە خوا پێشبڕکێی کرد لەسەر پشتی ئەسپێکی خۆی، کە پێی دەوترا: سەبحە (سەبحە ئەوەیە کە زۆر بە چاکی دوو قاچەکانی درێژ بکات لە کاتی بازدان و ڕاکردن)، جا پێشی خەڵکی کەوتەوە و خەڵکەکەش پێی سەرسام بوون.

عەبدوڵڵا وتویەتی: (أَنْهَشَهُ) واتە: پێی سەرسام بوون.

## بابەت: دەربارەی تێکۆشان بە دەست و زمان بەرانبەر بە بێبڕوایان

٢٤٨٢ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ».[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (بەرانبەر) بێ بڕوایان تێبکۆشن بە ماڵەکانتان و گیانی خۆتان و زمانتان.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: بەردەوام کۆمەڵێک لەم ئوممەتە لەسەر هەق دەجەنگن

٢٤٨٣ - «عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَزَالُ قَوْمٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى النَّاسِ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ».[١]

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵکانێک لە ئوممەتی من ئاشکرا و زاڵن بەسەر بێبڕوایاندا، تاوەکو فەرمانی خوا دەگات (کە ڕۆژی قیامەتە) لە کاتێکدا ئەوان هەر زاڵ و ئاشکران.

٢٤٨٤ - «عَنْ سلمان بن ربيع عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَزَالُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ».[٢]

واتە: لە سەلمانی کوڕی ڕەبیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عومەر بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵکانێک لە ئوممەتی من زاڵ و ئاشکران لەسەر هەق.

## بابەت: دەربارەی جەنگ کردن لەگەڵ خەواریجدا

٢٤٨٥ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ مِنْ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي قَوْمًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَلاَقِيمَهُمْ، يَخْرُجُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَخْرُجُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لاَ يَعُودُونَ فِيهِ، هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ، قَالَ سُلَيْمَانُ قَالَ حُمَيْدٌ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الصَّامِتِ: فَلَقِيتُ رَافِعًا أَخَا الْحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو الْغِفَارِيِّ فَحَدَّثْتُ هَذَا الْحَدِيثَ. قَالَ رَافِعٌ وَأَنَا أَيْضًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ».[٣]

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی لە دوای من هەندێک خەڵک لە ئوممەتی من پەیدا دەبن، قوڕئان دەخوێنن و لە گەروویان ناچێتە خوارەوە (واتە: تەنها بە زمان دەیخوێنن و ناگاتە دڵیان)، لە دین دەردەچن وەک چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، دواتریش ناگەڕێنەوە ناو دین، ئا ئەمانە خراپترینی دروستکراوەکانن.

سولەیمان وتویەتی: حومەید وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی صامیت وتویەتی: بە ڕافیعی برای حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری گەیشتم و ئەم فەرموودەیەم بۆ باس کرد، ڕافیع وتی: هەروەها منیش ئەم فەرموودەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: بەرەكەت بخەیتە ئوممەتەكەم لە بەیانیاندا

٢٤٨٦ - «عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً بَعَثَهَا مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ، قَالَ: وكَانَ هَذَا الرَّجُلُ رَجُلاً تَاجِرًا، فَكَانَ يَبْعَثُ غِلْمَانَهُ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ فَكَثُرَ مَالُهُ».[١]

واتە: لە صەخری غامیدیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە بەرەكەت بخەیتە ئوممەتەكەم لە بەیانیەكانیاندا، وە هەر كات پێغەمبەری خوا ﷺ پۆلێكی (بۆ جیهاد ڕەوانە دەكرد) لە سەرەتای ڕۆژ ڕەوانەی دەكرد (لە بەیانی زوو)، (یەكێك لە ڕاویەكانی ئەم فەرموودەیە) وتویەتی: ئەو پیاوە (واتە: صەخری غامیدی) پیاوێكی بازرگان بوو، جا (ئەم فەرموودەیەی جێبەجێ دەكرد)، بازرگانیەكەی خۆی لە سەرەتای ڕۆژدا (لە بەیانی زوو) دەنارد و دەستی پێ دەكرد، بۆیە ماڵ و سەروەتەكەی زۆر بوو (بەرەكەتی تێكەوت).

## بابەت: دەربارەی دەرچوون لە ڕۆژی پێنجشەم

٢٤٨٧ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَقَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، يَخْرُجُ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا إِلاَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ».[٢]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی كەعبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: كەم جار هەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووبێت كاتێ ویستبێتی سەفەر بكات تەنها ڕۆژی پێنجشەم نەبێت (واتە: زۆربەی سەفەرەكانی لە ڕۆژی پێنجشەم بوون).

## بابەت: دەربارەی چاكی هاوەڵ و هاوڕێیەتی

٢٤٨٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ».[٣]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتی: چاكترین هاوەڵ و هاوڕێ لای خوا بریتیە لە چاكترینیان بۆ هاوڕێكەی، وە چاكترین هاوسێ لای خوا بریتیە لە چاكترینیان بۆ هاوسێكەی.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی چاكترینی هاوەڵ و كەتیبە و سوپا

٢٤٨٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَيْرُ الأَصْحَابِ أَرْبَعَةٌ، وَخَيْرُ الْجُيُوشِ أَرْبَعَةُ آلاَفٍ، وَخَيْرُ السَّرَايَا أَرْبَعُ مِائَةٍ، وَمَا بَلَغَ اثْنَي عَشَرَ أَلْفًا فَصَبَرُوا وَصَدَقُوا فَغُلِبُوا مِنْ قِلَّةٍ».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاكترینی (بەیەكەوە بوونی) هاوەڵان ئەوەیە چوار بن، وە چاكترین سوپاش ئەوەیە چوار هەزار بن، وە چاكترین سریەش ئەوەیە چوار سەد بن، وە ئەو سوپایەی دەگاتە دوازدە هەزار كەس و ئارام دەگرن و ڕاستگۆ دەبن و هەرەس دەهێنن، ئەوە لەبەر كەمی ژمارە نیە (بەڵكو لەبەر هۆكاری ترە، چونكە نابێ ئەم ژمارەیە شكست بێنێ ئەگەر خەلەلی مەعنەوی نەبێت).

## بابەت: ئامۆژگاری ئیمام و خەلیفە بۆ كەتیبەی سوپا

٢٤٩٠ - «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ، إِذَا أَمَّرَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ بِتَقْوَى اللهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا وَقَالَ: اغْزُوا بِسْمِ اللهِ وَفِي سَبِيلِ اللهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللهِ اغْزُوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تُمَثِّلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا».[٢]

واتە: لە سولەیمانی كوڕی بوڕەیدەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ پیاوێكی دەكرد بە سەركردە لەسەر سوپایێك، ئامۆژگاری دەكرد دەربارەی خودی خۆی بەوەی تەقوای خوا بكات و پارێزكار بێت، وە ئامۆژگاریشی دەكرد بەرانبەر بە مسوڵمانان (كە بەرانبەر سوپاكە چاك بێت)، وە دەیفەرموو: بجەنگە بە ناوی خوا و، لە پێناوی خوا، بجەنگە لەگەڵ هەر كەسێک بڕوای بەخوا نیە، بجەنگە و، غەدر مەكە و، دەستكەوت بۆخۆت نەبەیت بەر لە دابەش كردنی و، (جەستەی دوژمن) هەتک مەكە و مەیشێوێنە و، منداڵی (دوژمن)یش مەكوژە.

## بابەت: ئاواتی گەیشتن بە دوژمن مەخوازن

٢٤٩١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَاسْأَلُوا اللهَ الْعَافِيَةَ، فَإِنْ لَقِيتُمُوهُمْ، فَاثْبُتُوا، وَأَكْثِرُوا ذِكْرَ اللهِ، فَإِنْ أَجْلَبُوا وَضَجُّوا، فَعَلَيْكُمْ بِالصَّمْتِ».[٣]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئاواتی گەیشتن بە دوژن مەخوازن و داوای سەلامەتی لە خوا بكەن، وە ئەگەر بە دوژمنیش گەیشتن ڕاگیراو بن و زۆر زیكر و یادی خوا بكەن، جا ئەگەر بوو بە ژاوەژاو و دەنگە دەنگ (بە شێوەیەک لەیەكتری حاڵی نەدەبوون)، ئەوە بێ دەنگ بن.

---

(١) ـ اسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ اسناده ضعيف.

## بابەت: دەربارەی دووعا كردن لە كاتی جەنگدا

٢٤٩٢ - «عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ، كَانَ يَدْعُو أَيَّامَ حُنَيْنٍ اللَّهُمَّ بِكَ أُحَاوِلُ وَبِكَ أُصَاوِلُ وَبِكَ أُقَاتِلُ».(١)

واتە: لە سوهەیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژانی جەنگی حونەیندا دووعای دەكرد (دەیفەرموو): پەروەردگارا بە پشتیوانی تۆ جووڵە دەكەم و ئازارەكانی دوژمن لەخۆم دووردەخەمەوە، وە بە پشتیوانی تۆ زەبر لە دوژمن دەوەشێنم و بەسەریدا زاڵ دەبم، وە بە پشتیوانی تۆ دەجەنگم.

## بابەت: دەربارەی بانگەوازكردن بۆ ئیسلام پێشی جەنگ

٢٤٩٣ - «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ، أَمَّرَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ: إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلاَثِ خِلاَلٍ - أَوْ ثَلاَثِ خِصَالٍ، فَأَيَّتُهُمْ مَا أَجَابُوكَ إِلَيْهَا، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ إِنْ هُمْ فَعَلُوا أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَأَنَّ عَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُسلمين وَلَيْسَ لَهُمْ فِي الْفَيْءِ وَالْغَنِيمَةِ نَصِيبٌ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ. فَإِنْ هُمْ أَبَوْا أَنْ يَدْخُلُوا فِي الإِسْلاَمِ، فَسَلْهُمْ إِعْطَاءَ الْجِزْيَةِ، فَإِنْ فَعَلُوا، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَقَاتِلْهُمْ. وَإِنْ حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ، فَإِنْ أَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ، وَلاَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ، وَلَكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَبِيكَ، وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ، فَإِنَّكُمْ إِنْ تُخْفِرُوا ذِمَّتَكُمْ وَذِمَّةَ آبَائِكُمْ أَهْوَنُ عَلَيْكُمْ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّةَ رَسُولِهِ. وَإِنْ حَاصَرْتَ حِصْنًا فَأَرَادُوكَ أَنْ يَنْزِلُوا عَلَى حُكْمِ اللهِ، فَلاَ تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللهِ، وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللهِ فِيهِمْ أَمْ لاَ، ثُمَّ اقْضِ فِيهِمْ بِمَا شِئْتَ».(٢)

واتە: لە سولەیمانی كوڕی بورەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ پیاوێكی دەكردە ئەمیر و فەرماندە لەسەر كەتیبەیەكی سەربازی ئەوە ئامۆژگاری دەكرد (دەیفەرموو): كاتێ گەیشتی بە دوژمنەكەت لە بێ بڕوایان، ئەوە بانگیان بكە بۆ یەكێك لەو سێ شتانە، جا بۆ هەر كامێكیان وەڵامیان دایەوە و جێبەجێیان كرد ئەوە لێیان قبوڵ بكە و وازیان لێ بێنە، دواتر بانگیان بكە بۆ ئیسلام، جا ئەگەر ئەوان وەڵامیان دایەوە و بوون

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

بە مسوڵمان، ئەوە لێیان قبوڵ بکە و وازیان لێ بێنە (جەنگیان لەگەڵ مەکە)، دواتر داوایان لێ بکە کەماڵیان بگوازنەوە بۆ شوێنی کۆچکەران (کۆچ بکەن بۆ مەدینە)، وە هەواڵیشیان پێ بدە بەوەی ئەگەر وایان کرد ئەوە ئەوەیان بۆ هەیە لە دەستکەوت و نەفەقە و یارمەتی دان کە بۆ کۆچکەران هەیە، وە هەواڵیان پێ بدە ئەوەشیان لەسەر واجبە کە لەسەر کۆچکەران واجبە (لە جیهاد کردن)، جا ئەگەر ڕەتیان کردەوە (جیهاد بکەن)، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە وەکو ئەعرابی مسوڵمانان حیسابیان بۆ دەکرێت، حوکمەکانی خوایان بەسەر جێبەجێ دەبێت کە لەسەر مسوڵمانان جێبەجێ دەبێت، وە هیچ پشکێکیان لە دەستکەوت بۆ نیە تەنها ئەو کاتە نەبێت کە لەگەڵ مسوڵمانان جیهاد بکەن، وە ئەگەر ڕەتیان کردەوە بێن بۆ ناو ئیسلام، ئەوە داوای سەرانەدانیان لێ بکە، جا ئەگەر جێبەجێیان کرد، ئەوە لێیان وەرگرە و وازیان لێ بێنە، جا ئەگەر ڕەتیان کردەوە (سەرانە بدەن)، ئەوە پشت بە خوا ببەستە و لەگەڵیان بجەنگە، وە ئەگەر گەمارۆی خەڵکی قەڵایێکتدا و ویستیان پەیمانی خوا و پێغەمبەریان پێ بدەیت، ئەوە پەیمانی خوا و پێغەمبەریان پێ مەدە، بەڵکو پەیمانی خۆت و باوکت و هاوەڵەکانتیان پێ بدە، چونکە ئەگەر پەیمانی ئێوە بشکێنن لەسەرتان سوکتر و بچوکترە لەوەی پەیمان و بەڵێنی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بشکێنن، وە ئەگەر گەمارۆی قەڵاییکتدا و داوایان لێ کردی تەنازول بکەن بۆ حوکمی خوا، ئەوە تەنازولەکەیان وەرمەگرە لەسەر حوکمی خوا، بەڵکو حوکمی خۆتیان بەسەر بچەسپێنە، چونکە تۆ نازانی ئایا حوکمی خوا دەپێکی بەرانبەریان یان نا، دواتر حوکمیان بەسەردا بدە بەوەی دەتەوێت (بەوەی بە باشی دەزانی).

٢٤٩٤ - «قَالَ عَلْقَمَةُ ﷺ: فَحَدَّثْتُ بِهِ مُقَاتِلَ بْنَ حَيَّانَ فَقَالَ: حَدَّثَنِي مُسْلِمُ بْنُ هَيْصَمٍ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ».[١]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێردراوەتەوە.

٢٤٩٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَا قَاتَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَوْمًا حَتَّى دَعَاهُمْ، قَالَ عَبْد اللهِ: سُفْيَانُ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ يَعْنِي هَذَا الْحَدِيثَ».[٢]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەڕی لەگەڵ هیچ قەومێک و خەڵکانێک نەکردوە تا بانگی کردوون بۆ ئیسلام.

## بابەت: هێرش کردنەسەر دوژمن

٢٤٩٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُغِيرُ عِنْدَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، وَكَانَ يَسْتَمِعُ فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذَانًا، أَغَارَ».[٣]

---

(١) ـ اسناده حسن، والحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ (عادەتی وابوو) لەکاتی نوێژی بەیانی هێرشی دەکرد و، گوێی ڕادەگرت، جا ئەگەر گوێی لە بانگ بووایە هێرشی نەدەکرد (دەیزانی بوونەتە مسوڵمان و وازیان لە دوژمنکاری هێناوە)، وە ئەگەر گوێی لە بانگ نەبووایە ئەوە هێرشی دەکرد.

## بابەت: دەربارەی جەنگ کردن لەسەر وتنی: (لا إله إلا الله)

٢٤٩٧ - «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَوْسَ بْنَ أَبِي أَوْسٍ الثَّقَفِيَّ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ، قَالَ: وَكُنْتُ فِي أَسْفَلِ الْقُبَّةِ لَيْسَ فِيهَا أَحَدٌ إِلاَّ النَّبِيُّ ﷺ، نَائِمٌ إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَسَارَّهُ فَقَالَ: اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ ثُمَّ قَالَ: أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ؟، قَالَ شُعْبَةُ: وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا، حَرُمَتْ عَلَيَّ دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا، قَالَ: وَهُوَ الَّذِي قَتَلَ أَبَا مَسْعُودٍ قَالَ: وَمَا مَاتَ حَتَّى قَتَلَ خَيْرَ إِنْسَانٍ بِالطَّائِفِ».[١]

واتە: لە نوعمانی کوڕی سالیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سالیمی کوڕی ئەوسی ثەقەفی ﷺ بوو وتی: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ وەفدی ثەقیف، دەڵێ: من لە خوارەوەی قوببەکە بووم، کەسی تیا نەبوو جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە خەوتبوو، لەناکاو پیاوێک هات بۆ لای و بە ئەسپایی و بە نهێنی قسەی لەگەڵ کرد، (پێغەمبەری خواش بە پیاوەکەی) فەرمووی: بیکوژە، دواتر فەرمووی: ئایا شایەتومان ناهێنێت بەوەی هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله؟ شوعبە وتویەتی: (ئەوەشی وت): ئایا شاتومان ناهێنێت لەسەر ئەوەی موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ؟ پیاوەکە وتی: با، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من فەرمانم پێکراوە کە جەنگ لەگەڵ بێ بڕوایان بکەم تاوەکو شایەتومان دێنن و دەڵێن: هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله، جا کاتێ ئەوەیان وت: ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەرم حەرام دەبێت، تەنها بە هەقی (لا إله إلا الله) نەبێت، (ئەوس) وتویەتی: هەر ئەو کەسە بوو کە ئەبو مەسعودی کوشت، وتویەتی: نەمرد تاوەکو چاکترین مرۆڤی کوشت لە تائیف (کە ئەبو مەسعود بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا پێشی ئەوە وازی هێنا لە کوشتنی لەبەر ئەوەی شاتومانی هێنابوو).

## بابەت: ڕشتنی خوێنی هیچ مرۆڤێک حەڵاڵ نیە کە شایەدی بدات بەوەی: هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله

٢٤٩٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَحِلُّ دَمُ رَجُلٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ إِلاَّ إِحْدَى ثَلاَثَةِ نَفَرٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ».[٢]

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنی هیچ مرۆڤێک حەڵاڵ نیە کە شایەدی بدات بەوەی: هیچ خودایەکی بە هەق نیە جگە لە الله، تەنها سێ کەس

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

نەبێت: ئەوەی کەسێکی کوشتووە دەکوژرێتەوە، وە زیناکەری بە هاوسەر (ڕەجم دەکرێت)، وە ئەو مسوڵمانەی دینەکەی وازلێهێناوە و لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابۆتەوە و (لە دژیان دەوەستێتەوە، ئەوە شەڕی لەگەڵ دەکرێت و دەکوژرێت).

## بابەت: دەربارەی ڕوونکردنەوەی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ (الصلاة جامعة)

٢٤٩٩ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ سُمَيْرٍ، قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ رَبَاحٍ الأَنْصَارِيُّ ﷺ، وَكَانَتِ الأَنْصَارُ تُفَقِّهُهُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، بَعَثَ جَيْشَ الآمَرَاءِ. قَالَ: فَانْطَلَقُوا فَلَبِثُوا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ صَعِدَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمِنْبَرَ، فَأَمَرَ فَنُودِيَ: الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ».[١]

واتە: لە خالیدی کوڕی سومەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباحی ئەنصاڕی ﷺ هات بۆ لامان، کە ئەنصاریەکان بە فەقیهو شەرعزانیان دەزانی، وتی: ئەبو قەتادە ﷺ بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ئومەڕاء (واتە: سوپای شەڕی موئتەی) ڕەوانەکرد، (قەتادە) وتویەتی: ئەوانیش ڕۆیشتن و ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو مانەوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەر مینبەر و فەرمانی کرد (بانگ بدرێت بۆ نوێژ)، جا بانگدرا (بە گۆتە و وتنی): (الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ) واتە: نوێژ کۆکەرەوەیە (ئەمە پێش ئەوەی بانگ دابنرێت).

تێبینی: بۆیە بە سوپای موئتە دەوترا: سوپای ئومەڕاء چونکە سێ ئەمیر و سەرکردەی هەبوو.

## بابەت: ڕاوێژکار جێگەی متمانەیە

٢٥٠٠ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ».[٢]

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصارِیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ڕاوێژکار جێگەی متمانەیە.

## بابەت: لە جەنگدا فێڵ و تاکتیک هەیە

٢٥٠١ - «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، إِذَا أَرَادَ غَزْوَةً وَرَّى بِغَيْرِهَا».[٣]

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە شەڕێک (لەگەڵ خەڵکانێک) بکات کارەکەی دەشاردەوە و وا نیشانی دەدا شەڕەکەی لەگەڵ خەڵکانیترە (دواتر لەناکاو ڕووی وەردەچەرخاند و هەڵی دەکوتایە سەریان، ئەمە تاکتیکی بوو).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ اسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: گوتاف و دروشم

٢٥٠٢ - «عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: بَارَزْتُ رَجُلاً فَقَتَلْتُهُ، فَنَفَّلَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ، سَلَبَهُ، فَكَانَ شِعَارُنَا مَعَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ: أَمِتْ، يَعْنِي: اقْتُلْ».(١)

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: (لە شەڕێکدا) بۆ پیاوێک چوومە مەیدان و کوشتم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ شتومەکی بە کەڵکی پیاوە سەربازەکەی پێ بەخشیم، جا گوتاف و دروشممان لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید (ئەوە بوو دەمان وت): أَمِتْ، واتە: بکوژە.

## بابەت: دەربارەی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ (کە فەرمووی): ڕووەکان ڕیسوا و نابووت بن

٢٥٠٣ - «عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْفِهْرِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ، فِي غَزْوَةِ حُنَيْنٍ، فَكُنَّا فِي يَوْمٍ قَائِظٍ شَدِيدِ الْحَرِّ، فَنَزَلْنَا تَحْتَ ظِلاَلِ الشَّجَرِ، فَذَكَرَ الْقِصَّةَ، ثُمَّ أَخَذَ كَفًّا مِنْ تُرَابٍ قَالَ: فَحَدَّثَنِي الَّذِي هُوَ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنِّي أَنَّهُ ضَرَبَ بِهِ وُجُوهَهُمْ، وَقَالَ شَاهَتِ الْوُجُوهُ فَهَزَمَ اللهُ الْمُشْرِكِينَ، قَالَ يَعْلَى: فَحَدَّثَنِي أَبْنَاؤُهُمْ أَنَّ أَبَاءَهُمْ « قَالُوا: فَمَا بَقِيَ مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ امْتَلأَتْ عَيْنَاهُ وَفَمُهُ تُرَابًا».(٢)

واتە: لە ئەبو عەبدوڕڕەحمانی فیهریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە غەزا و شەڕی حونەین، جا ئێمە لە ڕۆژێکی یەکجار گەرمدا بووین، بۆیە لە ژێر سێبەری دار گیرساینەوە، سەرگوزشتە و چیرۆکەکەی گێڕایەوە (واتە: ئەو شتانەی لەم ڕیواتەدا باس نەکراوە بەڵکو لە ڕیوایەتی تردا بە درێژی باس کراوە، ئەوانیشی باس کرد، جا یەکێک لە شتەکان ئەوەبوو) پێغەمبەری خوا مشتێک لە خۆڵی هەڵگرت و (وەشاندی) و فەرمووی: ڕووەکان ڕیسوا و نابووت بن، جا خوا هەرەسی بە هاوبەش دانەران هێنا، یەعلا وتویەتی: منداڵەکانی هاوبەش دانەران بۆیان گێڕامەوە کە باوکیان وتویانە: هیچ کەسێک لە ئێمە نەما حەتمەن چاوەکان و دەمی پڕ بوو لە خۆڵ.

## بابەت: دەربارەی بەیعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٥٠٤ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ مَعَهُ فِي مَجْلِسٍ: بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، فَمَنْ وَفَى مِنكُمْ، فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَسَتَرَهُ اللَّهُ، فَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ، إِنْ

---

(١) ـ حسن.

(٢)ـ حسن لغيره.

شَاءَ عَاقَبَهُ، وَإِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَمَنْ أَصَابَ شَيْئًا فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، قَالَ: فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ».[١]

واتە: لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتین لەكاتێكدا ئێمە لەگەڵی بووین لە شوێنێک، (فەرمووی): پەیمانم پێ بدەن لەسەر ئەوەی هیچ هاوبەشێک بۆ خوا دانەنێن و، دزی نەكەن و، زینا و دامێن پیسی نەكەن و، منداڵەكانتان نەكوژن و، بوختان بە ناو چوار پەلتان نەكەن (واتە: یەكتری بە درۆ تاوانبار نەكەن بە زینا كردن)، جا هەر كەسێک لە ئێوە پەیمانەكەی خۆی بردە سەر ئەوە پاداشتەكەی لەسەر خوایە (بە دڵنیایی خوا پاداشتی دەداتەوە)، وە هەر كەسێكیش شتێک لەمانەی تووش ببێت (ئەنجامی بدات و بەڵێنەكەی بشكێنێت و كارەكەی ئاشكرا نەبێت، بەڵكو هەر خۆی و خوا بیزانن) ئەوە كاروباری لەلای خوایە، ئەگەر بیەوێ (سزای بدات) ئەوە سزای دەدات، وە ئەگەر بشیەوێ (لێی خۆش ببێت) ئەوە لێی خۆش دەبێت، وە هەر كەسێكیش شتێک لەمانەی تووش ببێت (ئەنجامی بدات و بەڵێنەكەی بشكێنێت و كارەكەی ئاشكرا ببێت لە دەوڵەتی ئیسلامی) و بەهۆیەوە سزا (شەرعیەكەی) وەرگرێت لە دونیادا، ئەوە كەفارەت و سڕانەوەی تاوانەكەیەتی، (عوبادە) دەڵێت: ئێمەش لەسەر ئەوە پەیمان و بەیعەتمان پێدا.

## بابەت: دەربارەی پەیمان و بەیعەتی ڕانەكردن (لە دوژمن)

٢٥٠٥ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَ مِائَةٍ، فَبَايَعْنَاهُ وَعُمَرُ آخِذٌ بِيَدِهِ تَحْتَ الشَّجَرَةِ وَهِيَ: سَمُرَةٌ. وَقَالَ: بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لاَ نَفِرَّ، وَلَمْ نُبَايِعْهُ عَلَى الْمَوْتِ».[٢]

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لە ڕۆژی حودەیبیەدا هەزار و چوارسەد كەس بووین، جا پەیمان و بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەكاتێكدا عومەر دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ گرتبوو لە ژێر درەختەكەدا، درەختی سەمورە، (جابر) دەڵێ: پەیمان و بەیعەتمان پێدا لەسەر ئەوەی ڕانەكەین (لە دوژمن)، بەڵام پەیمانمان پێنەدا لەسەر مردن.
تێبینی: هەندێک لە هاوەڵان بەیعەتیان لەسەر مردن دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وەک لە فەرموودەیتردا هاتووە، هەرچەندە ئەم فەرموودەیەش دەیگرێتەوە، هەندێكیش بەیعەتیان نەداوە لەسەر مردن.

## بابەت: دەربارەی هەڵكەندنی چاڵ (بۆ شەڕی خەندەق)

٢٥٠٦- «حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، يَنْقُلُ مَعَنَا التُّرَابَ يَوْمَ الأَحْزَابِ، وَقَدْ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ إِبِطَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا إِنَّ الأُلَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا وَإِنْ أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا وَيَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ».[٣]

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە بەڕڕائی کوڕی عازیب ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئێمەدا خۆڵی دەکێشایەوە لە کاتی شەڕی ئەحزابدا، لە کاتێکدا خۆڵ سپیایی بن باڵەکانی داپۆشیبوو، ئەویش دەیفەرموو: ((ئەی خوایە، ئەگەر تۆ نەبووای و ڕێنمایت نەکردباین ئەوە ئەو ڕێنماییەمان نەدەبوو، وە خێر و صەدەقەمان نەدەکرد، کەواتە ئارامی دابەزێنە بەسەرمانەوە و قاچەکانمان جێگیر بکە ئەگەر گەیشتین (بە دوژمن)، ئەمانە دەست درێژی دەکەنە سەرمان، وە ئەگەر هەر خراپەیەکیان بوێت پێی ڕازی نابین)) بە دەنگی بەرز دەیفەرموو.

## بابەت: پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن چوو بۆ ناو مەککە

٢٥٠٧ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ، دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْتُلُوهُ».(١)

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ مەککە لە ساڵی ئازادکردنی مەککەدا و، دڕعی لەسەر سەر بوو، جا کاتێ دڕعەکەی لادا پیاوێک هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئیبنو خەطەڵە خۆی بە پەردەی کەعبەوە هەڵواسیوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیکوژن.

(جا کوشتیان، چونکە لە ئیسلام هەڵگەڕابویەوە و خزمەتکارە مسوڵمانەکەی خۆی کوشتبوو و جوێنی زۆر قێزەونی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان و، دوژمنێکی سەرسەخت بوو).

## بابەت: دەربارەی سەری دەسکی شمشێری پێغەمبەر ﷺ

٢٥٠٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ قَبِيعَةُ سَيْفِ النَّبِيِّ ﷺ، مِنْ فِضَّةٍ»(٢).

واتە: لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەری دەسکی شمشێری پێغەمبەر ﷺ لە زیو بوو.

## بابەت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ زاڵ دەبوو بەسەر قەومێک سێ ڕۆژ لە گۆڕەپانێکی ناوەڕاستی قەومەکە دەمایەوە

٢٥٠٩ - «عَنِ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَحَبَّ أَنْ يُقِيمَ بِعَرْصَتِهِمْ ثَلاَثًا»(٣).

واتە: لە ئەبو تەڵحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ زاڵ دەبوو بەسەر قەومێک، پێی خۆش بوو سێ ڕۆژان لە گۆڕەپانێکی ناوەڕاستی قەومەکەدا بمێنێنەوە (تا سەرکەوتنەکەی بەتەواوی ڕوون و چەسپاو بێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی سوتاندنی دارخورماكانی بەنی نەضیر لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ

٢٥١٠ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: حَرَّقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دارخورماكانی بەنی نەضیری سوتاند.

## بابەت: دەربارەی نەهی كردن لە سزادانی شت بە سزای خوا (كە ئاگرە)

٢٥١١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيِّ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فِي سَرِيَّةٍ فَقَالَ: إِنْ ظَفِرْتُمْ بِفُلاَنٍ وَفُلاَنٍ فَحَرِّقُوهُمَا بِالنَّارِ حَتَّى إِذَا كَانَ الْغَدُ، بَعَثَ إِلَيْنَا فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ بِتَحْرِيقِ هَذَيْنِ الرَّجُلَيْنِ، ثُمَّ رَأَيْتُ أَنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يُعَذِّبَ بِالنَّارِ إِلاَّ اللَّهُ، فَإِنْ ظَفِرْتُمْ بِهِمَا، فَاقْتُلُوهُمَا»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەی دەوسیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی كردین لە مەفرەزەیەكدا و فەرمووی: ئەگەر فڵان و فڵانتان دەستكەوت ئەوە بە ئاگر بیانسوتێنن، جا كە بەیانی داهات بەدوایدا ناردین و فەرمووی: من فەرمانم پێ كردن بە سوتاندنی ئەم دوو پیاوە، دواتر بینیم (واتە: بە وەحی پێم وترا) بۆ هیچ كەسێک دروست نیە كەس سزا بدات بە ئاگر جگە لە خوا، جا ئەگەر دەستتان كەوتن ئەوە بیانكوژن (بە ئاگر مەیانسوتێنن).

## بابەت: دەربارەی نەهی كردن لە كوشتنی ئافرەتان و منداڵان

٢٥١٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: وُجِدَ فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللهِ ﷺ، امْرَأَةٌ مَقْتُولَةٌ فَنَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە یەكێک لە جەنگەكانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئافرەتێكی كوژراو هەبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كرد لە كوشتنی ئافرەتان و منداڵان.

٢٥١٣ - «عَنْ الأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فِي غَزَاةٍ فَظَفِرْنَا بِالْمُشْرِكِينَ، فَأَسْرَعَ النَّاسُ فِي الْقَتْلِ حَتَّى قَتَلُوا الذُّرِّيَّةَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ ذَهَبَ بِهِمُ الْقَتْلُ حَتَّى قَتَلُوا الذُّرِّيَّةَ؟ أَلاَ لاَ تُقْتَلَنَّ ذُرِّيَّةٌ ثَلاَثًا»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی سەریعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین بۆ جەنگێک و موشریکەکانمان کەوتە چنگ و خەڵکەکە پەلەیان کرد لە کوشتن، هەتا منداڵیشیان کوشت، جا ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە خەڵکانێک چیانە، بۆچی کوشتن زێدەڕۆیی پێ کردوون، هەتا منداڵیشیان کوشتووە؟! ئاگاداربن منداڵ نەکوژن، سێ جار فەرمووی.

## بابەت: تەمەنی منداڵ چەندە، کەی دەکوژرێت؟

٢٥١٤ - «عَنْ عَطِيَّةَ الْقُرَظِيِّ ﷺ، قَالَ: عُرِضْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، يَوْمَئِذٍ، فَمَنْ أَنْبَتَ الشَّعْرَ، قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ، تُرِكَ، فَكُنْتُ أَنَا مِمَّنْ لَمْ يُنْبِتِ الشَّعْرَ، فَلَمْ يَقْتُلُونِي يَعْنِي يَوْمَ قُرَيْظَةَ»[١].

واتە: لە عەتییەی کوڕی قورەیظەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەو ڕۆژەی خستراینە ڕوو بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا هەر کەسێک مووی هاتبوو کوژرا، وە هەر کەسێک مووی نەهاتبوو وازی لێهێنرا، وە من لەوانە بووم کە موویان لێ نەهاتبوو نەیانکوشتم، واتە: لە ڕۆژی شەڕی بەنی قورەیظەدا.

## بابەت: دەربارەی ئازادکردنی زیندانی

٢٥١٥ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: فُكُّوا الْعَانِيَ، وَأَطْعِمُوا الْجَائِعَ»[٢].

واتە: لە ئەبو موساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: زیندانی ئازاد بکەن و، برسیش نان بدەن.

## بابەت: دەربارەی کڕینەوەی زیندانیان

٢٥١٦ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَادَى رَجُلاً بِرَجُلَيْنِ»[٣].

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بە دوو پیاو گۆڕیەوە (لە زیندانیان).

## بابەت: دەستکەوت بۆ هیچ کەسێکی پێشی ئێمە حەڵاڵ نەبووە

٢٥١٧ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ نَبِيٌّ قَبْلِي: بُعِثْتُ إِلَى الأَحْمَرِ وَالأَسْوَدِ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

شَهْرًا، يُرْعَبُ مِنِّي الْعَدُوُّ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَقِيلَ لِي: سَلْ تُعْطَهْ. فَاخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي، وَهِيَ نَائِلَةٌ مِنْكُمْ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى مَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللهِ شَيْئًا»[1].

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شتم پێدراوە بە هیچێک لە پێغەمبەرانی پێش من نەدراوە (شتەکانیش ئەمانەن): نێردراوم بۆ سور و ڕەش (واتە: بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوم)، وە هەموو زەویم بۆ کراوەتە مزگەوت و دەستنوێژ (واتە: بۆمان حەڵاڵە لە شوێنی دەستنوێژ تەیمووم بکەین و لە هەر جێیەکی پاکیش کە بمانەوێ نوێژ بکەین)، وە دەستکەوتم بۆ حەڵاڵ کراوە، کەچی بۆ هیچ کەسێکی پێشی من حەڵاڵ نەبووە، وە سەرخراوم بە ترس (خوا ترس دەخاتە دڵی دوژمنەکانم)، مانگێک دوژمن لێم ترسێنراوە بە ئەندازەی مانگە ڕێیەک (واتە: مانگە ڕێیەک دوریم لە دوژمن هێشتا شکستی پێ دەهێنێت)، وە پێم وتراوە: داوابکە پێت دەدرێت، جا من داواکردنەکەم هەڵگرتووە و کردوومە بە شەفاعەت بۆ ئوممەتەکەم، ئەو شەفاعەت و تکاکاریەشم دەگات بە هەر کەسێک لە ئێوە کە هیچ هاوبەشێک بۆ خوا دانەنێ.

## بابەت: دەربارەی دابەش کردنی دەستکەوت لە ناوچەکانی دوژمن

٢٥١٨ - «عَنْ أَبِي وَائِلٍ ﷺ، قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، غَنَائِمَ حُنَيْنٍ بِالْجِعْرَانَةِ، قَالَ عَبْد اللهِ: عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ فِي الإِسْنَادِ»[2].

واتە: لە ئەبو وائیلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتەکانی جیعڕانەی لە حونەین دابەش کرد.

## بابەت: دەربارەی دابەش کردنی دەستکەوت، چۆن دابەش دەکرێت؟

٢٥١٩ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: شَهِدْتُ فَتْحَ خَيْبَرَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَانْهَزَمَ الْمُشْرِكُونَ، فَوَقَعْنَا فِي رِحَالِهِمْ، فَابْتَدَرَ النَّاسُ مَا وَجَدُوا مِنْ جَزُورٍ، قَالَ: فَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ بِأَسْرَعَ مِنْ أَنْ فَارَتْ الْقُدُورُ فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأُكْفِئَتْ. قَالَ: ثُمَّ قَسَمَ بَيْنَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَجَعَلَ لِكُلِّ عَشَرَةٍ شَاةً. قَالَ: وَكَانَ بَنُو فُلاَنٍ مَعَهُ تِسْعَةً، وَكُنْتُ وَحْدِي فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِمْ فَكُنَّا عَشَرَةً بَيْنَنَا شَاةٌ»[3].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئامادەی فەتحی خەیبەر بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، جا موشریکەکان هەرەسیان هێنا و کەوتینە ناو بارگە و کەلوپەلەکانیان، جا خەڵک زوو ئەوەی دەستیانکەوت لە وشتر بردیان، دەڵێ: جا کارەکە خێراتر نەبوو بەوەی مەنجەڵەکان بکوڵێن (واتە: تەنها بەوە ڕاگەیشتن گۆشتەکە بخەنە ناو مەنجەڵان بۆ کوڵاندن)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد بەوەی مەنجەڵەکان بڕژێنرێن

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(واتە: ئاوەكەيان ڕشت و گۆشتەكەيان گەڕاندەوە، چونكە بێ هەق و حیساب دابەشیان كردبوو)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دابەشی كرد لەنێوان ئێمەدا، بۆ هەر دە كەسێک سەر ئاژەڵێكی دانا، دەڵێ: بەنی فلان نۆ كەس بوون منیش بە تەنها بووم، جا ئاوڕم لێدانەوە و (وەگەریان كەوتم) و بووین بە دە كەس و سەر ئاژەڵێكمان بەركەوت.

٢٥٢٠ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَحْوَهُ، قَالَ: فَأَلْفْتُ إِلَيْهِمْ. قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الصَّوَابُ عِنْدِي مَا قَالَ زَكَرِيَّا: فِي الإِسْنَادِ»(١).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبی لەیلاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ و ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: وەگەریانكەوتم.

## بابەت: پشكی خزمەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٥٢١ - «عَنْ يَزِيدَ بْنِ هُرْمُزَ ، قَالَ: كَتَبَ نَجْدَةُ بَنُ عَامِرٍ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، يَسْأَلُهُ عَنْ أَشْيَاءَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنَّكَ سَأَلْتَ عَنْ سهْمِ ذِي الْقُرْبَى الَّذِي ذَكَرَهُ اللَّهُ، وَإِنَّا كُنَّا نَرَى أَنَّ قَرَابَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، هُمْ، فَأَبَى ذَلِكَ عَلَيْنَا قَوْمُنَا»(٢).

واتە: لە یەزیدی كوڕی هورموزەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نەجدەی كوڕی عامیر (نامەیەكی) بۆ ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) نوسی: پرسیاری لێ كرد دەربارەی چەند شتێک، جا ئیبنو عەبباس (لە وەڵامدا) بۆی نوسی: تۆ پرسیارت كردوە دەربارەی پشكی خزمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، كە خوا باسی كردوە، وە ئێمە پێمان وایە خزمانی پێغەمبەری خوا ئەوانن (واتە: بەنی هاشم و بەنی موتەڵیب)، جا قەومەكەمان بەوە ڕازی نەبوون (واتە: ڕازی نەبوون كە ئەو پشكە تەنها بۆ ئەوان خەرج بكرێت، بەڵكو پێیان وابوو دەبێ بۆ مەسڵەحەتی گشتی مسوڵمانان بێت).

## بابەت: دەربارەی پشكی ئەسپ

٢٥٢٢ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَسْهَمَ يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَارِسِ ثَلاَثَةَ أَسْهُمٍ، وَلِلرَّاجِلِ سَهْمًا»(٣).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگی خەیبەردا سێ پشكی بۆ سوارچاک دانا (واتە: ئەو كەسەی بە ئەسپ دەجەنگێت، پشكێک بۆ خۆی و دوو پشكیش بۆ مەسرەفی سواریەكەی)، وە بۆ جەنگاوەری پیادەش پشكێكی دانا.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

٢٥٢٣ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ، نَحْوَهُ»(١).

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی دوای ئازادکردن (دەگاتە سەر دەسکەوت)، ئایا پشکی بۆ دادەنرێت؟

٢٥٢٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، قَالَ: مَا شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، مَغْنَمًا إِلاَّ قَسَمَ لِي، إِلاَّ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَإِنَّهَا كَانَتْ لأَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ خَاصَّةً، وَكَانَ أَبُو مُوسَى وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَاءَا بَيْنَ الْحُدَيْبِيَةِ وَخَيْبَرَ»(٢).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ جارێک نەبووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی دەستکەوتبم حەتمەن پشکی پێداوم، تەنها ڕۆژی خەیبەر نەبێت، چونکە ئەویان بۆ خەڵکی حودەیبیە بوو بە تایبەت، وە ئەبو موسا و ئەبو هورەیرەش لە نێوان حودەیبیە و خەیبەر هاتن.

## بابەت: دەربارەی پشکی بەندە و منداڵان

٢٥٢٥ - «عَنْ عُمَيْرٍ، مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ ﷺ، قَالَ: شَهِدْتُ خَيْبَرَ وَأَنَا عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، فَأَعْطَانِي رَسُولُ اللهِ ﷺ، مِنْ خُرْثِيِّ الْمَتَاعِ، وَأَعْطَانِي سَيْفًا، فَقَالَ: تَقَلَّدْ بِهَذَا»(٣).

واتە: لە عومەیری خزمەتکاری ئەبو لەحمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە شەڕی خەیبەر ئامادە بووم لەکاتێکدا من بەندە بووم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەلوپەلی ناو ماڵی پێی بەخشیم، وە شمشێرێکیشی پێ بەخشیم و فەرمووی: بیخەرە شان و ملتەوە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فرۆشتنی دەستکەوت تاوەکو دابەش دەکرێت

٢٥٢٦ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ نَهَى أَنْ تُبَاعَ السِّهَامُ حَتَّى تُقْسَمَ»(٤).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، کە نەهی کردوە لەوەی پشکی دەستکەوت بفرۆشرێت تاوەکو دابەش دەکرێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی دڵنیابوونەوە لە ڕەحمی ئافرەتی دەستکەوت

٢٥٢٧ - «حَدَّثَنِي حَنَشٌ الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: غَزَوْنَا الْمَغْرِبَ وَعَلَيْنَا رُوَيْفِعُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ ﷺ، فَافْتَتَحْنَا قَرْيَةً يُقَالُ لَهَا جَرْبَةُ، فَقَامَ فِينَا رُوَيْفِعُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ خَطِيبًا، فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَقُومُ فِيكُمْ إِلاَّ بِمَا سَمِعْتُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَامَ فِينَا يَوْمَ خَيْبَرَ حِينَ افْتَتَحْنَاهَا فَقَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلاَ يَأْتِي شَيْئًا مِنَ السَّبْيِ حَتَّى يَسْتَبْرِئَهَا»[١].

واتە: لە حەنەشی صەنعانیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جەنگمان لەگەڵ مەغریب کرد، جا ڕوەیفیعی کوڕی ثابیتی ئەنصاری ﷺ گەورەبوو بەسەرمانەوەو، گوندێکمان ئازاد کرد پێی دەوترا: جەڕبە، جا ڕوەیفیعی کوڕی ثابیتی ئەنصاری لەناو ئێمەدا هەڵسایەوە وتاریدا و، وتی: من هەڵناسم بە ئەنجامدانی هیچ کارێک تەنها ئەوە نەبێت کە لە پێغەمبەری خواوەم ﷺ گوێ لێبووە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە ڕۆژی خەیبەردا هەڵسایەوە لەناو ئێمەدا کاتێ ئازادمان کرد و فەرمووی: هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە ئەوە با نەچێتە لای ئافرەتانی دەستگیرکرا و تاوەکو لێی دڵنیادەبێت (واتە: تا دڵنیا دەبێت کە ڕەحمی پاکە و دوو گیان نیە، بەوەی بوەستێت تاوەکو حەیزێک دەبینێت).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە جیماع کردن لەگەڵ ئافرەتی دووگیان

٢٥٢٨ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، رَأَى امْرَأَةً مُجِحَّةً يَعْنِي: حُبْلَى، عَلَى بَابِ: فُسْطَاطٍ، فَقَالَ: لَعَلَّهُ قَدْ أَلَمَّ بِهَا؟. قَالُوا: نَعم قَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَلْعَنَهُ لَعْنَةً تَدْخُلُ مَعَهُ قَبْرَهُ، كَيْفَ يُوَرِّثُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ، وَكَيْفَ يَسْتَخْدِمُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ؟ »[٢].

واتە: لە ئەبو دەرداءەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتێکی دوو گیانی بینی لەبەر دەرگای خێمەیەک و فەرمووی: خاوەنەکەی ڕەنگە بچێتە لای؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ویستم نەفرینێکی لێ بکەم کە لەگەڵی بچێتە گۆڕەکەیەوە، چۆن (منداڵەکەی سکی ئافرەتەکە کە هی موشریکانە) دەیکات بە میراتگری خۆی لەکاتێکدا بۆی حەڵاڵ نیە، وە چۆن بەکاری دەهێنێت لەکاتێکدا بۆی حەڵاڵ نیە؟

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە جیاکردنەوە و جیاوازی خستنە نێوان دایک و منداڵ

٢٥٢٩ - «عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ ﷺ: أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ كَانَ فِي جَيْشٍ فَفُرِّقَ بَيْنَ الصِّبْيَانِ وَبَيْنَ أُمَّهَاتِهِمْ، فَرَآهُمْ يَبْكُونَ، فَجَعَلَ يَرُدُّ الصَّبِيَّ إِلَى أُمِّهِ. وَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الْوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا، فَرَّقَ اللهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الأَحِبَّاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسن.

واتە: لە ئەبو عەبدورڕەحمانی حوبولیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو ئەیوب لەناو سوپایێک بوو، جا منداڵەکان و دایکەکان لێک جیاکرانەوە و بینی دەگرین، بۆیە منداڵەکەی دەگەڕاندەوە بۆ دایکی و دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دایک و منداڵەکەی لێک جیا بکاتەوە ئەوە خوا ئەو و خۆشەویستانی لێک جیا دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: کاتێ کافری جەنگی دەبێتە مسوڵمان

٢٥٣٠ - «عَنْ صَخْرِ بْنِ الْعَيْلَةِ ﷺ قَالَ: أَخَذْتُ عَمَّةَ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، فَقَدِمْتُ بِهَا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَمَّتَهُ. فَقَالَ: يَا صَخْرُ إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا، أَحْرَزُوا أَمْوَالَهُمْ وَدِمَاءَهُمْ، فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ. وَكَانَ مَاءٌ لِبَنِي سُلَيْمٍ، فَأَسْلَمُوا فَأَتَوْهُ فَسَأَلُوهُ ذَلِكَ، فَدَعَانِي، فَقَالَ: يَا صَخْرُ إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا أَحْرَزُوا أَمْوَالَهُمْ وَدِمَاءَهُمْ، فَادْفَعْهُ إِلَيْهِمْ فَدَفَعْتُهُ»(١).

واتە: لە صەخری کوڕی عەیلەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پوری موغیرەی کوڕی شوعبەم دەستگیر کرد و بردم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، جا (شوعبە) داوای پورەکەی کرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئەی صەخر ئەم خەڵکانە کاتێ مسوڵمان دەبن ماڵ و خوێنیان بەدەست دەهێنن (بەهۆی مسوڵمانبوونەوە)، جا پورەکەی بدەرەوە، منیش پورەکەیم دایەوە، وە ئاوێک هەبوو هی بەنی سولەیم بوو (دەستمان بەسەر داگرتبوو)، جا بوون بە مسوڵمان و داوایان کردەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بانگی کردم و فەرمووی: ئەی صەخر ئەم خەڵکە کاتێ مسوڵمان دەبن ماڵ و خوێنیان بەدەست دەهێنن (بەهۆی مسوڵمانبوونەوە)، جا بیاندەرەوە، منیش پێمدانەوە.

## بابەت: پێدانی دەستکەوتی زیادە بە فەرمانی گەورەی مسوڵمانانە

٢٥٣١ - «عَنْ اِبنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، سَرِيَّةً فِيهَا ابْنُ عُمَرَ فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً، فَكَانَتْ سُهْمَانُهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا - أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيرًا - وَنُفِّلُوا بَعِيرًا بَعِيرًا»(٢).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مەفرەزەیەکی ڕەوانە کرد ئیبنو عومەری تیا بوو، جا وشتری زۆریان دەستکەوت و، پشکی هەر یەکەیان دوازدە ـ یان یازدە ـ وشتر بوو ـ وە هەر یەکە و وشترێکیان بە زیادە پێدرا.

---

(١) ـ إسناده حسن.
(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی چواریەک لە دەستکەوت بدرێت بە جەنگاوەرانی پێشەوە لە سەرەتای جەنگ و سێیەکیشیان پێ بدرێت لە گەڕانەوە و کۆتایی جەنگ

٢٥٣٢ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، إِذَا أَغَارَ فِي أَرْضِ الْعَدُوِّ نَفَّلَ الرُّبُعَ، وَإِذَا أَقْبَلَ رَاجِعًا وَكَلَّ النَّاسُ نَفَّلَ الثُّلُثَ»[١].

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هێرشی دەکردە سەر خاکی دوژمن چواریەکی لە دەستکەوت بە دیاری دەدا بە ڕیزەکانی پێشەوەی سوپا (ئەو ڕیزانەی قەڵغانی سوپا و داپلۆسێنەری دوژمنن)، وە کاتێ دەگەڕایەوە و خەڵکی سوپاکە شەکەت و هیلاک بوون سێیەکی پێ دەدان (چونکە زەحمەتی زۆریان کێشاوە).

## بابەت: دەربارەی نەفل دوای پێنجیەک

٢٥٣٣ - «عَنْ حَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَفَّلَ الثُّلُثَ بَعْدَ الْخُمُسِ»[٢].

واتە: لە حەبیبی کوڕی مەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ سێیەکی نەفلی داوە دوای پێدانی پێنجیەک.

## بابەت: هەر کەسێک جەنگاوەرێکی کوشت ئەوە کەلوپەلەکانی بۆ ئەوە

٢٥٣٤ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ كَافِرًا فَلَهُ سَلَبُهُ فَقَتَلَ أَبُو طَلْحَةَ: يَوْمَئِذٍ عِشْرِينَ، وَأَخَذَ أَسْلَابَهُمْ»[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک (جەنگاوەرێکی) کافری شەڕکەر بکوژێت ئەوە کەلوپەلەکانی بۆ خۆیەتی، جا ئەبو تەڵحە ئەو ڕۆژە بیست (جەنگاوەری کافری) کوشت و کەلوپەلەکانیشی بردن.

٢٥٣٥ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: بَارَزْتُ رَجُلاً فَقَتَلْتُهُ فَنَفَّلَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ سَلَبَهُ»[٤].

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتمە مەیدان بۆ پیاوێک و کوشتم، پێغەمبەری خواش ﷺ کەلوپەلەکانی ئەوی پێدام.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی پێ چاک نەبوونی ئەنفال و فەرموویەتی:تا فەزڵی بڕوادرانی بەهێز نەدرێ بەسەر بێ هێزەکانیان

٢٥٣٦ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ يَكْرَهُ الأَنْفَالَ وَيَقُولُ: لِيَرُدَّ قَوِيُّ الْمُسْلِمِينَ عَلَى ضَعِيفِهِمْ»[١].

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەنفالی پێ چاک نەبووە (واتە: پێی باش نەبووە یەک لەسەر پێنج زیاتر لە بەخششی جەنگ بدرێ بە جەنگاوەرانی زەبر وەشێن)، وە دەیفەرموو: تاکو ڕێگە بگیرێ لە فەزڵدانی کەسانی بەهێزی مسوڵمان بەسەر کەسانی بێهێزی مسوڵمان.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داو و دەرزی بدەنەوە[٢]

٢٥٣٧ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: أَدُّوا الْخِيَاطَ وَالْمَخِيطَ، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُولَ فَإِنَّهُ عَارٌ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داو و دەرزی بدەنەوە و نەکەن دزی لە دەستکەوت بکەن (ئەگەر بچوکترین شتیش بێ)، چونکە دزی کردن لە دەستکەوت شورەییە بەسەر خاوەنەکەی لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: نەهی کردن لە سواربوونی وڵاغی دەستکەوت و پۆشینی جلی دەستکەوت

٢٥٣٨ - «حَدَّثَنِي حَنَشٌ الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: غَزَوْنَا الْمَغْرِبَ وَعَلَيْنَا رُوَيْفِعُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ ﷺ، فَافْتَتَحْنَا قَرْيَةً يُقَالُ لَهَا جَرْبَةُ فَقَامَ فِينَا رُوَيْفِعُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ خَطِيبًا فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَقُومُ فِيكُمْ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَامَ فِينَا يَوْمَ خَيْبَرَ حِينَ افْتَتَحْنَاهَا: « مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَرْكَبَنَّ دَابَّةً مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَجْحَفَهَا أَوْ قَالَ: أَعْجَفَهَا - قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَنَا أَشُكُّ فِيهِ - رَدَّهَا وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَلْبَسْ ثَوْبًا مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَخْلَقَهُ رَدَّهُ فِيهِ»[٤].

واتە: لە حەنەشی صەنعانیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جەنگی مەغریبمان کرد و ڕوەیفیعی کوڕی ثابیتی ئەنصاری ﷺ گەورەبوو بەسەرمانەوە و گوندێکمان ئازاد کرد پێی دەوترا: جەڕبە، جا ڕوەیفیعی کوڕی سابیتی ئەنصاری لەناوماندا هەڵسایەوە وتاریدا و وتی: من هیچ شتێک لە ناو ئێوەدا ئەنجام نادەم تەنها ئەوە نەبێت کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێ بووە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە ڕۆژی

---

(١) ـ إسناده حسن.
(٢) ـ واتە: کەمترین شت نەدزن لە دەستکەوتدا.
(٣) ـ إسناده حسن.
(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

خەیبەردا لەناو ئێمەدا هەڵسایەوە کاتێ خەیبەرمان ئازاد کرد، فەرمووی: هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە ئەوە با سواری وڵاغێک نەبێت لە دەستکەوتی مسوڵمانان بە جۆرێک بێهێزی دەکات یان فەرمووی: بە جۆرێک لاوازی دەکات ئنجا دەیگەڕێنێتەوە، وە هەر کەسێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با هیچ جلێکی دەستکەوت لەبەر نەکات بە جۆرێک کۆنی بکات ئنجا بیگەڕێنێتەوە.

## بابەت: ئەو هەڕەشانەی دەربارەی دزیکردن لە دەستکەوت هاتوون

٢٥٣٩ - «حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قُتِلَ نَفَرٌ يَوْمَ خَيْبَرَ « فَقَالُوا: فُلاَنٌ شَهِيدٌ حَتَّى ذَكَرُوا رَجُلاً فَقَالُوا: فُلاَنٌ شَهِيدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَلاَّ إِنِّي رَأَيْتُهُ فِي النَّارِ فِي عَبَاءَةٍ أَوْ فِي بُرْدَةٍ غَلَّهَا ثُمَّ قَالَ لِي: يَا ابْنَ الْخَطَّابِ قُمْ فَنَادِ فِي النَّاسِ أَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ، فَقُمْتُ فَنَادَيْتُ فِي النَّاسِ»[١].

واتە: لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چەندین کەس کوژران لە ڕۆژی شەڕی خەیبەردا، جا وتیان: فڵانە کەس شەهیدە (فڵانە کەس شەهیدە...)، تاوەکو ناوی پیاوێکیان هێنا و وتیان: فڵان شەهیدە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نەخێر، من بینیم لەناو ئاگر دابوو بە عەباێکەوە ـ یان بە جوببەیەکەوە ـ کە دزیبوی لە دەستکەوت، دواتر پێی فەرمووم: ئەی کوڕی خەتتاب هەڵسە و لەناو خەڵکدا بانگ ڕادێرە (بڵێ): کەس ناچێتە بەهەشت تەنها بڕواداران نەبن، منیش هەڵسام و لەناو خەڵکیدا بانگم ڕاهێشت.

## بابەت: دەربارەی سزای ئەو کەسەی دزی لە دەستکەوت دەکات

٢٥٤٠ - «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ وَجَدْتُمُوهُ غَلَّ، فَاضْرِبُوهُ وَأَحْرِقُوا مَتَاعَهُ»[٢].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێکتان دەستکەوت کە دزی کردبوو لە دەستکەوت ئەوە لێی بدەن و کەلوپەلەکانیشی بسوتێنن.

## بابەت: دەربارەی کەسی دزیکەر لە دەستکەوت کە (لە ڕۆژی دوایی) دێت بەو شتەی دزیویەتی

٢٥٤١ - «حَدَّثَنِي كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ نَهْبَ، وَلاَ إِغْلاَلَ، وَلاَ إِسْلاَلَ، ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۝١٦١﴾ آل عمران، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الإِسْلاَلُ: السَّرِقَةُ»[٣].

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە کەثیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عەوفی موزەنیەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە تاڵانکردن و، نە بردنی دەستکەوت و، نە دزی (نابێ هەبێت و، هەموویان حەڕامن)، ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ﴿١٦١﴾﴾ آل عمران، واتە: [وە هەر کەسێکیش دزی بکات و (یەکێک لەمانە ئەنجام بدات) ئەوە لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەو شتە دێت کە دزیویەتی].

## بابەت: دەربارەی دەست نەبڕین (لەسەر دزینی دەستکەوت) لە جەنگدا

٢٥٤٢ - «عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ، قَالَ: لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ ابْنَ أَرْطَاةَ ﷺ، يَقُولُ: قَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي الْغَزْوِ لَقَطَعْتُهَا»[١].

واتە: لە جونادەی کوڕی ئەبو ئومەییەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر من گوێم لە ئیبنو ئەرتات ﷺ نەبووایە کە دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست نابڕدرێت لە جەنگدا، ئەوە دەمبڕی.

تێبینی: کە دروست نیە حەد جێبەجێ بکرێت لە جەنگ، ئەوە یان لەبەر ئەوەیە کە لە خاکی دوژمنن، یان تایبەتە بەو جەنگەی گەورەی مسوڵمانان خۆی تیایدا ئامادە نیە و، بەشداری جەنگەکەی نەکردوە، بۆ ئەمیری جەنگیش دروست نیە لە شوێنی ئەو حوکمەکە جێبەجێ بکات، خیلافەکە بەو شێوەیە.

## بابەت: دەربارەی فەرمانبەر کاتێ شتێک بەدەست دەهێنێت لە کارەکەی

٢٥٤٣ - «أخبرني عروة بن الزبير عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، اسْتَعْمَلَ عَامِلاً عَلَى الصَّدَقَةِ، فَجَاءَهُ الْعَامِلُ حِينَ فَرَغَ مِنْ عَمَلِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا الَّذِي لَكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَهَلاَ قَعَدْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ، فَنَظَرْتَ أَيُهْدَى لَكَ أَمْ لاَ، ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ عَشِيَّةً بَعْدَ الصَّلاَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَتَشَهَّدَ فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ الْعَامِلِ نَسْتَعْمِلُهُ، فَيَأْتِينَا فَيَقُولُ: هَذَا مِنْ عَمَلِكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي، فَهَلاَ قَعَدَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ فَيَنْظُرَ أَيُهْدَى لَهُ أَمْ لاَ؟ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لاَ يَغُلُّ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْهَا شَيْئًا، إلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى عُنُقِهِ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا جَاءَ بِهِ لَهُ رُغَاءٌ، وَإِنْ كَانَتْ بَقَرَةً جَاءَ بِهَا لَهَا خُوَارٌ، وَإِنْ كَانَتْ شَاةً جَاءَ بِهَا تَيْعِرُ، فَقَدْ بَلَّغْتُ، قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: ثُمَّ رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ، يَدَيْهِ حَتَّى إِنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى عُفْرَةِ إِبِطَيْهِ، قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: وَقَدْ سَمِعَ ذَلِكَ مَعِي مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فَسَلُوهُ»[٢].

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئەبو حومەیدی ساعدیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێی ڕاگەیاندووە پێغەمبەر ﷺ فەرمانبەرێکی دامەزراند لەسەر کۆکردنەوەی زەکات، جا فەرمانبەرەکە

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە کارەکەی تەواو بوو و وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بۆ ئێوەیە (زەکاتە کۆم کردۆتەوە)، ئەوەش دیاریە کراوەتە دیاری بۆ من، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جا بۆ لە ماڵی باوک و دایکت دانەدەنیشتی و چاوەڕێت نەدەکرد تا بزانی دیاریت بۆ دێت یان نا؟ دواتر دانی ئێوارەیەک پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژ لەسەر مینبەر وەستا و شایەتومانی هێنا و مەدح و سەنای خوا کرد بەوەی شایستەیەتی، دواتر فەرمووی: أما بعد، ئەوە چ کارێکی ئەو فەرمانبەرەیە کە کردوومانە بە فەرمانبەر (بۆ کۆکردنەوەی زەکات) و هاتۆتەوە لامان و دەڵێت: ئەوە هی کاری ئێوەیە (هی زەکاتە)، وە ئەوەش کراوەتە دیاری بۆم؟! جا بۆ لە ماڵی باوک و دایکی دانەدەنیشت و چاوەڕێی نەدەکرد تا بزانێ دیاری بۆ دێت یان نا؟ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێک نیە لە ئێوە شتێکی تیا بدزێت حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا دێت و شتە دزراوەکەشی بەسەر شانیەوە هەڵگرتووە، ئەگەر وشتر بێت ئەوە دەیهێنێت و وشترەکە دەبۆڕێنێت، وە ئەگەر مانگا بێت دەیهێنێت و دەقوڕێنێت، وە ئەگەر مەڕ یان بزن بێت ئەوە دەیهێنێت و دەباڕێنێت، بزانن بە دڵنیایی ڕامگەیاند.

ئەبو حومەید وتویەتی: دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوە تاوەکو پەمبایەتی بن باڵەکانیمان بینی، ئەبو حومەید وتی: زەیدی کوڕی ثابیت لەگەڵ من ئەوەی لە پێغەمبەری خوا گوێ لێبووە و پرسیاری لێبکەن.

## بابەت: دەربارەی وەرگرتنی دیاری هاوبەش دانەران

٢٥٤٤ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ مَلِكَ ذِي يَزَنَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ حُلَّةً أَخَذَهَا بِثَلَاثَةٍ وَثَلَاثِينَ بَعِيرًا، أَوْ ثَلَاثٍ وَثَلَاثِينَ نَاقَةً، فَقَبِلَهَا»(١).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پادشای ذی یەزەن تاخمە جلێکی کردە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە بە سیوسێ (٣٣) وشتری نێر ـ یان بە سیوسێ (٣٣) وشتری مێ ـ کڕی بووی، پێغەمبەری خواش ﷺ وەریگرت.

٢٥٤٥ - «عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: بَعَثَ صَاحِبُ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِكِتَابٍ، وَأَهْدَى لَهُ بَغْلَةً بَيْضَاءَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَهْدَى لَهُ بُرْدًا»(٢).

واتە: لە ئەبو حومەیدی ساعیدیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پادشای قودس نوسراوێکی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ماینێکی سپیشی کرد بە دیاری، پێغەمبەری خواش ﷺ نوسراوێکی بۆ نوسیەوە و جلێکی گرانبەهای شایستەشی بۆ کرد بە دیاری.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ئێمە یارمەتی وەرناگرین لە هاوبەش دانەران

٢٥٤٦ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّا لاَ نَسْتَعِينُ بِمُشْرِكٍ»(١).

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە یارمەتی لە هاوبەشدانەران وەرناگرین.

٢٥٤٧ - «أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ، عَنْ رَوْحٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ فُضَيْلٍ هُوَ ابْنُ أَبِي عَبْدِ اللهِ هُوَ الْخَطْمِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ نِيَارٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَطْوَلُ مِنْهُ»(٢).

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە، بەڵام بە درێژتر.

## بابەت: وەدەرنانی هاوبەشدانەران لە دوورگەی عەرەبی

٢٥٤٨ - «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ فِي آخِرِ مَا تَكَلَّمَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: أَخْرِجُوا يَهُودَ مِنَ الْحِجَازِ، وَأَهْلَ نَجْرَانَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ»(٣).

واتە: لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کۆتاییەکانی ئەو قسانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردنی (یەکێکیان بریتی بوو لەوەی) فەرمووی: جولەکەکان وەدەرنێن لە حیجاز، ئەهلی نەجرانیش (کە هاوبەش دانەر بوون) وەدەریاننێن لە دوورگەی عەرەبی.

## بابەت: دەربارەی خواردنەوە لە قاپ و قاچاغی هاوبەش دانەران

٢٥٤٩ - «حَدَّثَنِي أَبُو ثَعْلَبَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا بِأَرْضِ أَهْلِ الْكِتَابِ فَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنْ كُنْتَ بِأَرْضٍ كَمَا ذَكَرْتَ، فَلاَ تَأْكُلُوا فِي آنِيَتِهِمْ إِلاَّ أَنْ لاَ تَجِدُوا مِنْهَا بُدًّا، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مِنْهَا بُدًّا، فَاغْسِلُوهَا، ثُمَّ كُلُوا فِيهَا»(٤).

واتە: لە ئەبو ثەعلەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە ناوچەی ئەهلی کتابین (لە ناو جولەکە و دیانین) جا ئایا لەناو قاپ و قاچاغیان

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

بخۆین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لە ناوچەیەکی ئاوای وەک باست کرد، ئەوە لە قاپ و قاچاغیان مەخۆن تەنها ئەگەر بەدیلتان دەست نەکەوێت، جا ئەگەر قاپ و قاچاغی ترتان دەست نەکەوت، ئەوە هی ئەوان بشۆرن، دواتر تیایدا بخۆن.

## بابەت: خواردنی دەستکەوتی (جەنگی) بەر لەوەی دەستکەوت دابەش بکرێت

٢٥٥٠ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: دُلِّيَ جِرَابٌ مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَالْتَزَمْتُهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: لاَ أُعْطِي مِنْ هَذَا أَحَدًا الْيَوْمَ شَيْئًا، فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، يَبْتَسِمُ إِلَيَّ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کوپێک لە ڕوونم پێ نیشاندرا لە ڕۆژی خەیبەردا، دەڵێ: جا چووم بۆ لای ڕوونەکە و لای مامەوە و جێم نەهێشت (هەر دەمخوارد)، دەڵێ: دواتر وتم: هیچ لەمە نادەم بە کەس (گشتی بۆ منە)، جا ئاوڕمدایەوە لە ناکاو پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پێم پێدەکەنی.

## بابەت: دەربارەی وەرگرتنی جیزیە لە مەجوسیەکان[٢]

٢٥٥١ - «عَنْ عَمْرٍو، عَنْ بَجَالَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ عُمَرُ ﷺ أخذ الْجِزْيَةَ مِنَ الْمَجُوسِ، حَتَّى شَهِدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ»[٣].

واتە: لە عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە بەجالەی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: گوێم لێی بوو دەیوت: عومەر ﷺ سەرانەی وەرنەدەگرت لە مەجوسیەکان تا ئەو کاتەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ شاهێدیدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ جزیەی وەرگرتووە لە مەجوسیەکانی هەجەر.

## بابەت: نزمترین مسوڵمانان دەتوانێ کافر داڵدە بدات و بیپارێزێت لە مسوڵمانان

٢٥٥٢ - «عَنْ أَبِي النَّضْرِ، أَنَّ أَبَا مُرَّةَ، مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، تُحَدِّثُ، أَنَّهَا ذَهَبَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً أَجَرْتُهُ فُلاَنُ بْنُ هُبَيْرَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ»[٤].

واتە: لە ئەبو نەضرەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەبو موڕڕەی خزمەتکاری عەقیلی کوڕی ئەبو طالیب پێی ڕاگەیاندووە کە گوێی لە ئوممو هانیئی (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) کچی ئەبو طالیب بووە، وتویەتی: چۆتە لای

---

(١) ـ صحيح.
(٢) واتە : وەرگرتنی سەرانەی هاوڵاتی بوون لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازاد کردنی مەککەدا و وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کوڕی دایکم (واتە: برای ڕاستیم، عەلی کوڕی ئەبو طالیب) وتویەتی ئەو پیاوە دەکوژم، کە من داڵدەم داوە ـ کە کوڕی هوبەیرەیە ـ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی ئێمە داڵدەی کەسێکمان داوە کە تۆ داڵدەت دابێت ئەی ئوممو هانیئ (کەواتە: کەس ناتوانێت دەستی بۆ درێژ بکات).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە کوشتنی وەفد و نێردراوان

٢٥٥٣ - «عَنْ ابْنِ مُعَيْزٍ السَّعْدِيِّ، قَالَ: خَرَجْتُ أُسْفِرُ فَرَسًا لِي مِنَ السَّحَرِ، فَمَرَرْتُ عَلَى مَسْجِدٍ مِنْ مَسَاجِدِ بَنِي حَنِيفَةَ، فَسَمِعْتُهُمْ يَشْهَدُونَ أَنَّ مُسَيْلِمَةَ رَسُولُ اللهِ، فَرَجَعْتُ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمُ الشُّرَطَ فَأَخَذُوهُمْ فَجِيءَ بِهِمْ إِلَيْهِ، فَتَابَ الْقَوْمُ وَرَجَعُوا عَنْ قَوْلِهِمْ فَخَلَّى سَبِيلَهُمْ، وَقَدَّمَ رَجُلاً مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ النَّوَاحَةِ فَضَرَبَ عُنُقَهُ، فَقَالُوا لَهُ: تَرَكْتَ الْقَوْمَ وَقَتَلْتَ هَذَا؟ فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ جَالِسًا إِذْ دَخَلَ هَذَا وَرَجُلٌ وَافِدَيْنِ مِنْ عِنْدِ مُسَيْلِمَةَ، فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَشْهَدَانِ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَقَالاَ لَهُ: نَشْهَدُ أَنَّ مُسَيْلِمَةَ رَسُولُ اللهِ، فَقَالَ: آمَنْتُ بِاللهِ وَرُسُلِهِ، لَوْ كُنْتُ قَاتِلاً وَفْدًا، لَقَتَلْتُكُمَا، فَلِذَلِكَ قَتَلْتُهُ، وَأَمَرَ بِمَسْجِدِهِمْ فَهُدِمَ»[1].

واتە: لە ئیبنو موعەیزی سەعدیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: دەرچووم تا شوێنی ئەسپەکەم پاک بکەمەوە لەکاتی سەحەردا (پێشی نوێژی بەیانی)، جا تێپەڕ بووم بەلای مزگەوتێک لە مزگەوتەکانی بەنی حەنیفە و، گوێم لە خەڵکی مزگەوتەکە بوو شاهێدیان دەدا بەوەی موسەیلیمە پێغەمبەری خوایە (بڕوایان پێ هێنا بوو)، جا گەڕامەوە و چووم بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ، و پێم ڕاگەیاند، ئەویش چەندین شوڕتەی نارد و ئەوانیان گرت و هێنانیان بۆ لای و، خەڵکەکە تەوبەیان کرد و لە قسەکەیان پاشگەز بوونەوە و ئەویش وازی لێهێنان، وە پیاوێکیان لەوان هێنا کە پێی دەوترا: عەبدوڵلای کوڕی نەواحە، جا عەبدوڵلا لەسەریدا و کوشتی، خەڵکیش وتی: ئەوە بۆچی وازت لە هەموو قەومەکە هێنا و ئەوەشت کوشت؟ عەبدوڵلا وتی: من لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووم، لەناکاو ئەو پیاوەو پیاوێکی تر بە وەفد لەلای موسەیلیمە هاتبوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەردووکیانی فەرموو: ئایا شاهێدی دەدەن کە من پێغەمبەری خوام؟ هەردووکیان پێیان وت: شاهێدی دەدەین کە موسەیلیمە پێغەمبەری خوایە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕوام بە خوا و پێغەمبەرەکانی هێناوە، ئەگەر وەفدێک و نێردراوێکم بکوشتایە ئەوە ئێوەم دەکوشت، جا عەبدوڵلا وتی: بۆیە کوشتم (چونکە هەقی کوشتنی هەبوو و ئێستاش وەفد نیە و دژایەتی ئیسلام دەکات)، وە فەرمانی کرد بە ڕوخاندنی مزگەوتەکەیان و ڕوخێندرا.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە کوشتنی هاوپەیمانان

٢٥٥٤ - «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا فِي غَيْرِ كُنْهِهِ، حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ»[١].

واتە: لە ئەبو بەکرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک هاوپەیمانێک بکوژێت لە غەیری ئەو کاتەی کە هەقیەتی بکوژرێت، ئەوە خوا بەهەشتی لەسەر حەڕام کردوە.

## بابەت: کاتێ دوژمن شتێک بەدەست دێنن لە سەروەت و سامانی مسوڵمانان

٢٥٥٥ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، قَالَ: كَانَتِ الْعَضْبَاءُ لِرَجُلٍ مِنْ بَنِي عُقَيْلٍ، فَأُسِرَ وَأُخِذَتِ الْعَضْبَاءُ، فَمَرَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَهُوَ فِي وَثَاقٍ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، عَلَى مَا تَأْخُذُونِي، وَتَأْخُذُونَ سَابِقَةَ الْحَاجِّ، وَقَدْ أَسْلَمْتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ قُلْتَهَا وَأَنْتَ تَمْلِكُ أَمْرَكَ أَفْلَحْتَ كُلَّ الْفَلاَحِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَأْخُذُكَ بِجَرِيرَةِ حُلَفَائِكَ، وَكَانَتْ ثَقِيفٌ قَدْ أَسَرُوا رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى حِمَارٍ عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي جَائِعٌ فَأَطْعِمْنِي، وَظَمْآنُ فَاسْقِنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَذِهِ حَاجَتُكَ، ثُمَّ إِنَّ الرَّجُلَ فُدِيَ بِرَجُلَيْنِ، فَحَبَسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْعَضْبَاءَ لِرَحْلِهِ، وَكَانَتْ مِنْ سَوَابِقِ الْحَاجِّ، ثُمَّ إِنَّ الْمُشْرِكِينَ أَغَارُوا عَلَى سَرْحِ الْمَدِينَةِ، فَذَهَبُوا بِهِ فِيهَا الْعَضْبَاءُ، وَأَسَرُوا امْرَأَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَكَانُوا إِذَا نَزَلُوا - قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: ثُمَّ ذَكَرَ كَلِمَةً - إِبِلُهُمْ فِي أَفْنِيَتِهِمْ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ قَامَتِ الْمَرْأَةُ وَقَدْ نُوِّمُوا، فَجَعَلَتْ لاَ تَضَعُ يَدَيْهَا عَلَى بَعِيرٍ إِلاَّ رَغَا، حَتَّى أَتَتِ الْعَضْبَاءَ فَأَتَتْ عَلَى نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، ذَلُولٍ مُجَرَّسَةٍ فَرَكِبَتْهَا، ثُمَّ تَوَجَّهَتْ قِبَلَ الْمَدِينَةِ، وَنَذَرَتْ لَئِنِ اللهُ نَجَّاهَا لَتَنْحَرَنَّهَا، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَتْ عُرِفَتِ النَّاقَةُ، فَقِيلَ: نَاقَةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَتَوْا بِهَا النَّبِيَّ ﷺ، وَأَخْبَرَتِ الْمَرْأَةُ بِنَذْرِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِئْسَمَا جَزَيْتِهَا، أَوْ بِئْسَمَا جَزَتْهَا، إِنِ اللهُ نَجَّاهَا لَتَنْحَرَنَّهَا، لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ، وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ»[٢].

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وشتری عەضباء هی پیاوێک بوو لە بەنی عوقەیل، جا پیاوەکە ئەسیر کرا و عەضبائیش دەست بەسەر کرا (لەلایەن مسوڵمانانەوە)، پێغەمبەری خواش بەلایدا تێپەڕ بوو لە کاتێکدا کابرا لە کۆتوبەند دابوو، جا کابرا وتی: ئەی موحەممەد بۆچی من و ئەو وشترەت گرتووە کە پێشی وشترەکانی حاجیان دەکەوێتەوە لە مەوسیمی حەج، لە کاتێکدا من ئێستا بووم بە مسوڵمان؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموی: ئەگەر شەهادەت بهێنایە لەو کاتەی تۆ کارەکەت لە دەستی خۆت بوو (واتە: بەر لەوەی دەستگیر بکرێی) ئەوە گشت سەرفرازییەکت

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

بەدەست دەهێنا (ئەجرت بەدەست دەهێنا و ئەسیر نەدەكرای و دەستكەوتت بە نسیب دەبوو)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستگیرت دەكەین بەهۆی تاوانی هاوپەیمانەكانت (كە بەنی ئەقیفە)، چونكە بەنی ئەقیف دوو پیاویان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا دەستگیر كردبوو، جا پێغەمبەری خوا بە گوێدرێژێكەوە هات كە جلێكی بە ڕیشنی لەسەر پشت بوو، كابرا وتی: ئەی موحەممەد من برسیمە خواردنم پێ بدە، هەروەها تێنیمە ئاوم پێ بدە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ها ئەوە پێویستیەكانتە (خواردن و خواردنەوەی پێدا)، دواتر ئەم پیاوە ئازادكرا بە دوو پیاو (واتە: مسوڵمانان ئەم پیاوەیان تەسلیمی بەنی عەقیل كردەوە كە هاوپەیمانی بەنی ئەقیف بوون، بەنی ئەقیفیش دوو پیاوەكەی مسوڵمانانیان تەسلیمی مسوڵمانان كردەوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ وشتری عەضبائی بۆ خۆی گێڕایەوە بۆ هاتوچۆی خۆی، كە وشترێكی خێرا بوو پێشی وشترەكانی حاجیان دەكەوتەوە، دواتر هاوبەش دانەران هەڵیانكوتایە سەر لەوەڕی مەدینە و ئاژەڵەكانیان برد عەضبائیشی تیا بوو، وە ئافرەتێكی مسوڵمانانیشیان دەستگیر كرد، جا موشریكەكان كاتێ دەگەیشتنەوە شوێنی خۆیان وشترەكانیان لە حەوشە ڕادەگرت (لە ترسی مسوڵمانان، نەوەک بێن و بیانبەنەوە)، جا شەوێكیان ئافرەتەكە هەڵسایەوە (بۆ ئەوەی ڕابكات) لەكاتێكدا هاوبەش دانەران لە خەوێكی قوڵ دابوون، جا دەستی لەسەر هەر وشترێک دادەنا حەتمەن دەیبۆڕاند، تاوەكو چوو بۆ لای عەضباء كە وشترێكی گوێڕایەڵ و ڕاهێنراو بوو، جا سواری بوو، و ڕووی كردە مەدینە و نەزری كرد ئەگەر خوا ڕزگاری بكات عەضباء سەر ببڕێت و بیكات بە خێر، دەڵێ: جا كە گەیشت بە مەدینە وشترەكە ناسرایەوە و وترا: ئەمە وشتری پێغەمبەری خوایە، جا ئافرەتەكەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا و ئافرەتەكەش هەواڵی نەزرەكەی دا بە پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خراپترین پاداشتت داوەتە وشترەكە، بۆ خوا ڕزگاری كردی تاوەكو سەری ببڕی؟! بزانن وەفا بە نەزرێكەوە ناكرێت كە سەرپێچی خوای تیا بێت، هەروەها وەفا بە نەزرێكیش ناكرێت و جێبەجێ ناكرێ لە شتێكدا كە مرۆڤ هی خۆی نەبێت (عەضبائیش هی ئافرەتەكە نەبوو، بەڵكو هی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو).

## بابەت: دەربارەی بەجێگەیاندنی پەیمان بۆ بێبڕوایان

٢٥٥٦ - «عَنْ مُحَرَّرِ بْنِ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ لَمَّا بَعَثَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَنَادَى بِأَرْبَعٍ حَتَّى صَحَلَ صَوْتُهُ: أَلاَ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَلاَ يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَهْدٌ فَإِنَّ أَجَلَهُ إِلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، فَإِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ فَإِنَّ اللهَ بَرِيءٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ»(١).

واتە: لە موحەڕڕەری كوڕی ئەبی هورەیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبی تالیب بووم ﷺ كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی كرد (تا بانگڕادێرێت)، جا بانگی ڕادێرا بە چوار شت تاوەكو دەنگی نوسا و دەنگی گڕ بوو (شتەكانیش ئەمانە

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

بوون): ئاگاداربن هیچ كەسێك ناچێتە بەهەشت جگە لە مسوڵمان، وە هیچ هاوبەش دانەرێك حەج ناكات (لێی قەدەغە دەكرێت دوای ئەم ساڵ)، وە هیچ كەسێكی ڕوتیش تەواف ناكات بە دەوری كەعبەدا و (ڕێگە دەگیرێت لەو شێوازە جاهیلیە)، وە هەر كەسێك لە نێوان خۆی و پێغەمبەری خوا پەیمانێكی هەیە ئەوە ماوەكەی تا چوار مانگە، جا كاتێ چوار مانگەكە تێپەڕی ئەوە خواو پێغەمبەرەكەی بەرین لە گشت هاوبەش دانەرێك.

## بابەت: دەربارەی صوڵحی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی حودەیبیە

٢٥٥٧ - «عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، فَأَبَى أَهْلُ مَكَّةَ أن يَدَعُوهُ أن يَدْخُلَ مَكَّةَ، حَتَّى قَاضَاهُمْ عَلَى أَنْ يُقِيمَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَتَبُوا: هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالُوا: لاَ نُقِرُّ بِهَذَا، لَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ مَا مَنَعْنَاكَ شَيْئًا، وَلَكِنْ أَنْتَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ: أَنَا رَسُولُ اللهِ، وَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ لِعَلِيٍّ: « امْحُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ «، فَقَالَ: لاَ وَاللهِ، لاَ أَمْحُوهُ أَبَدًا، فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْكِتَابَ، وَلَيْسَ يُحْسِنُ يَكْتُبُ، فَكَتَبَ مَكَانَ رَسُولِ اللهِ، هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ: أَنْ لاَ يَدْخُلَ مَكَّةَ بِسِلاَحٍ إلاَّ السَّيْفَ فِي الْقِرَابِ، وَأَنْ لاَ يُخْرِجَ مِنْ أَهْلِهَا أَحَدًا أَرَادَ أَنْ يَتْبَعَهُ، وَلاَ يَمْنَعَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ أَرَادَ أَنْ يُقِيمَ بِهَا، فَلَمَّا دَخَلَهَا وَمَضَى الأَجَلُ أَتَوْا عَلِيًّا، فَقَالُوا: قُلْ لِصَاحِبِكَ فَلْيَخْرُجْ عَنَّا فَقَدْ مَضَى الأَجَلُ»[١].

واتە: لە بەڕائی كوڕی عازیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی كرد لە مانگی ذیلقەعدە، جا خەڵكی مەككە ڕەتیان كردەوە بهێڵن (پێغەمبەری خوا ﷺ) بچێتە مەككە، تا ئەو كاتەی صوڵحیان لەگەڵ كردن بەوەی سێ ڕۆژ بمێننەوە (لە مەككە، لە ساڵی داهاتوودا)، جا كاتێ نوسیان: ئەمە ئەو ڕێككەوتنەیە كە موحەممەدی پێغەمبەری خوا ﷺ صوڵحی لەسەر كردوە، هاوبەش دانەرانی مەككە وتیان: ئێمە دان بەوە دانانێین، ئەگەر پێمان وابووایە تۆ پێغەمبەری ئەوە لە هیچ شتێك ڕێگریمان لێ نەدەكردی، بەڵكو تۆ موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: من پێغەمبەری خوام و موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵاشم، جا بە عەلی فەرموو: ڕستەی «موحەممەدی پێغەمبەری خوا» بسڕەوە، عەلی وتی: نەخێر سوێند بەخوا هەرگیز نایسڕمەوە، جا پێغەمبەری خوا نوسراوەكەی وەرگرت، لە كاتێكدا نەیدەزانی بنوسێت، لە شوێنی ڕستەی (پێغەمبەری خوا) نوسی: ئەمە ئەو ڕێككەوتنەیە كە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا صوڵحی لەسەر كردوە بەوەی نەچێتە ناو مەككە بە چەكەوە تەنها بە شمشێری ناو كێلانەوە نەبێت، هەروەها كەس نەهێنێتە دەرەوە لە مەككە كە بیەوێت شوێنی موحەممەد بكەوێت، وە هیچ كەسێكیش قەدەغە نەكات لە هاوەڵانی ئەگەر بیەوێ لە مەككە بمێنێتەوە و لە شوێنكەوتنی موحەممەد هەڵگەڕایەوە، جا كاتێ لە ساڵی داهاتوو پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو مەككە و سێ ڕۆژەكە تەواو بوو، قوڕەیشیەكان هاتن بۆ لای عەلی و وتیان: بە هاوڕێكەت بڵێ (بە موحەممەد بڵێ) با لەناو ئێمە بچێتە دەرەوە كاتەكە تەواو بوو.

---

(١) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی بەندەی موشریكەكان كە هەڵدێن بۆ لای مسوڵمانان

٢٥٥٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ عَبْدَانِ مِنَ الطَّائِفِ، فَأَعْتَقَهُمَا، أَحَدُهُمَا أَبُو بَكْرَةَ»(١).

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو بەندە لە تائیف هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ (هەڵاتبوون لەدەست هاوبەش دانەران)، پێغەمبەر ﷺ ئازادی كردن، یەكێكیان ئەبوبەكرە بوو.

## بابەت: دابەزین و ملدانانی بەنی قورەیضە بۆ حوكمی سەعدی كوڕی موعاذ

٢٥٥٩ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رُمِيَ يَوْمَ الأَحْزَابِ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَطَعُوا أَبْجَلَهُ، فَحَسَمَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّارِ، فَانْتَفَخَتْ يَدُهُ فَنَزَفَهُ، فَحَسَمَهُ أُخْرَى، فَانْتَفَخَتْ يَدُهُ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تُخْرِجْ نَفْسِي حَتَّى تُقِرَّ عَيْنِي مِنْ بَنِي قُرَيْظَةَ، فَاسْتَمْسَكَ عِرْقُهُ فَمَا قَطَرَ قَطْرَةً حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَحَكَمَ أَنْ تُقْتَلَ رِجَالُهُمْ، وَتُسْتَحْيَى نِسَاؤُهُمْ وَذَرَارِيُّهُمْ لِيَسْتَعِينَ بِهِمُ الْمُسْلِمُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَصَبْتَ حُكْمَ اللهِ فِيهِمْ، وَكَانُوا أَرْبَعَ مِائَةٍ، فَلَمَّا فُرِغَ مِنْ قَتْلِهِمْ، انْفَتَقَ عِرْقُهُ فَمَاتَ»(٢).

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەعدی كوڕی موعاذ تیرێكی لێدرا و شادەماری باسكیان بڕی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنی برینەكەی داغ كرد بە ئاگر (تاوەكو خوێنەكەی بوەستێ)، جا دەستی هەرپەما و ئەستور بوو و خوێنی فوارەی كرد و زۆر دەهات، جارێكی تر داغی كرد، جا دیسان دەستی ئەستور و بادەفە بوو، جا كە بینی (داغ كردنیش سودی پێ ناگەیەنێ دوعای كرد و) وتی: خوایە گیانم نەكێشی تاوەكو چاوم ڕۆشن دەبێتەوە لە بەنی قورەیضە (واتە: تا بەسەریاندا زاڵ دەبین)، جا دەمارەكەی لە خوێن پڕژان وەستا و یەک دڵۆپ خوێنی لێ نەهات تاوەكو بەنی قورەیضە دابەزین لەسەر حوكمی سەعد (واتە: حوكمی سەعدیان بەسەر چەسپا و ئەو سزایەكەیانی دیاری كرد)، جا ناردرا بە دوای سەعد و ئەویش بڕیاریدا كە پیاوەكانیان بكوژرێن و ئافرەت و منداڵەكانیشیان بهێڵرێنەوە و نەكوژرێن تاوەكو مسوڵمانان سودیان لێ وەرگرن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حوكم و بڕیاری خوات پێكا دەربارەی ئەوان، ژمارەشیان چوارسەد كەس بوو، جا كاتێ تەواو بوون لە كوشتنیان، دەمارەكەی دەستی سەعد تەقیەوە و خوێنی نەوەستا و وەفاتی كرد.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەرکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە

٢٥٦٠ - «أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَدِيِّ بْنِ الْحَمْرَاءِ الزُّهْرِيَّ ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ وَاقِفًا بِالْحَزْوَرَةِ يَقُولُ: وَاللهِ، إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللهِ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللهِ إِلَى اللهِ، وَلَوْلاَ أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەدیی کوڕی حەمرائی زوهری  وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەکاتێکدا لەسەر سواریەکەی بوو لە حەزوەرە وەستابوو و دەیفەرموو: سوێند بە خوا (ئەی مەککە) تۆ چاکترین خاکی، وە خۆشەویست ترین خاکیشی لای خوا، جا ئەگەر من لە تۆ وەدەرنەنرابام ئەوە دەرنەدەچووم.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە جوێندان بە مردوو

٢٥٦١- «قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِي اللهُ عَنْهَا: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا»[٢].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوێن بە مردووەکان مەدەن، چونکە ئەوان ڕۆیشتوون بەلای ئەو کردەوانەی پێش خۆیان خستووە (ئەگەر خراپ بووبن ئەوە سزای خراپیەکانیان وەردەگرن، کەواتە کارتان بەسەریانەوە نەماوە و خزمەکانیشیان ئەزیەت دەخۆن بە جوێندان پێیان).

## بابەت: کۆچ کردن (بۆ خەڵکی مەککە) نیە دوای ئازادکردنی مەککە

٢٥٦٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ» وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: کاتێک فەتحی مەککە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیجرەت و کۆچ کردن نیە (بۆ خەڵکی مەککە) دوای ئازادکردنی مەککە (چونکە بۆتە خاکی مسوڵمانان)، بەڵکو جیهاد و نیەت هەیە (واتە: تەنها بۆ جیهاد هیجرەت بکەن بۆ شوێنێکی تر، وە لە نیەتی خراپ هیجرەت بکەن بۆ نیەتی چاک)، وە کاتێ داوای دەرچوونی سەرتانسەریتان لێکرا (بۆ بەرپەرچ دانەوەی دوژمن و دەرچوون بۆ جیهاد) ئەوە دەرچن.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: کۆچ کردن ناپچڕێ (بۆ ساتێکیش کۆتایی نایێت)

٢٥٦٣ - «عَنْ أَبِي هِنْدٍ الْبَجَلِيِّ، وَكَانَ مِنَ السَّلَفِ، قَالَ: تَذَاكَرُوا الْهِجْرَةَ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ ﷺ وَهُوَ عَلَى سَرِيرِهِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ - ثَلاَثًا - وَلاَ تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا»[١].

واتە: لە ئەبو هیندی بەجەلیەوە گێڕدراوەتەوە، کە یەکێکە لە پێشینە چاکەکان، وتویەتی: باسی هیجرەتیان کرد لەلای موعاویە ﷺ لەکاتێکدا لەسەر جێگاکەی بوو، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیجرەت و کۆچ کردن ناپچڕێت و (کۆتایی نایێت) تاوەکو تەوبە دەپچڕێت و کۆتایی دێت ـ سێ جار ئاوای فەرموو ـ وە تەوبەش ناپچڕێت و کۆتایی نایێت تاوەکو ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێت.

## بابەت: وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمویەتی: ئەگەر کۆچ کردن نەبووایە، دەبووم بە یەکێک لە ئەنصارِیەکان

٢٥٦٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَءًا مِنَ الأَنْصَارِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆچکردن نەبووایە (کە بە هۆیەوە بومەتە موهاجیر) ئەوە دەبووم بە کەسێک لە ئەنصاریەکان.

## بابەت: توندی و سەخت بوون دەربارەی پۆست و کاربەدەستی

٢٥٦٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ أَمِيرِ عَشَرَةٍ إلاَّ يُؤْتَى بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مَغْلُولَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ، أَطْلَقَهُ الْحَقُّ أَوْ أَوْبَقَهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەی دە کەسان (واتە: خاوەنی بچوکترین پۆست) حەتمەن دەهێنرێت لە ڕۆژی دواییدا دەستەکانی لەگەردنی بەستراونەتەوە، جا (یان ئەوەتەیە) هەق دەیکاتەوە و ڕزگاری دەکات (ئەگەر بە هەق کاری کردبێت)، یانیش لە ناوی دەبات (ئەگەر کاری پێ نەکردبێت).

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە ستەم

٢٥٦٦ - «عَنْ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: لە ئەبو کەثیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ بوو ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕایەوە کە فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم، چونکە ستەم تاریکاییە لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: خوای زاڵی پایەدار پاڵپشتی ئەو ئاینە دەکات بە پیاوی خراپەکاریش بێ

٢٥٦٧ - «أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ يُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ»[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو هورەیرە ﷺ وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا پاڵپشتی ئەو ئاینە دەکات بە پیاوی خراپەکاریش بێت.

تێبینی: زۆربەی کات میصداقی ئەم فەرمووده شیرینە دەبینین، بۆ نمونە حەڕەکات و سەکەناتی قوڕئان بە فەرمانی حەججاج دانرا، کەچی خوێنڕێژ و فاسق بوو.

## بابەت: دەربارەی دابەشبوونی ئەم ئوممەتە

٢٥٦٨ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَامَ فِينَا، فَقَالَ: أَلاَ إِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ افْتَرَقُوا عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَإِنَّ هَذِهِ الأُمَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ، اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ»[٣].

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە لەناو ئێمەدا و فەرمووی: ئاگاداربن ئەوانەی پێشی ئێوە لە ئەهلی کتاب دابەش بوون بەسەر حەفتا و دوو گروپ، ئەم ئوممەتەش دابەش دەبێت بەسەر حەفتا و سێ گروپ، حەفتا و دووی بۆ ئاگرە یەکێکیش بۆ بەهەشتە.

تێبینی: بەڵام ئەم یەکەیان زۆرینەن و حەفتا و دوو بەشەکەیتر زۆر بچکۆڵە و کەمن.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسن.

## بابەت: دەربارەی گوێڕایەڵی و پەیوەست بوون بە كۆمەڵی مسوڵمانانەوە

٢٥٦٩ - «حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ الْعُطَارِدِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، يَرْوِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ، فَلْيَصْبِرْ، فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَحَدٍ يُفَارِقُ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا، فَيَمُوتُ، إلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً»[١].

واتە: لە ئەبو عەتائی عوتاردیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) لە پێغەمبەری ﷺ دەگێڕایەوە كە فەرموویەتی: هەر كەسێک شتێكی لە سەركردەكەی بینی پێی ناخۆش بوو (چونكە كارەكە چاک نەبوو) ئەوە با ئارام بگرێت (ئەگەر كارەكە گەورە نەبێت تاوەكو فیتنە نەنێتەوە)، چونكە هیچ كەسێک نیە بستێک لە كۆمەڵی مسوڵمانان دابڕێت و بمرێت حەتمەن ئەوە بە مردنێكی نەزانی مردوە.

## بابەت: ئەوەی چەک دژی ئێمە هەڵگرێت، ئەوە لە ئێمە نیە

٢٥٧٠ - «حَدَّثَنَا إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ سَلَّ عَلَيْنَا السِّلاَحَ، فَلَيْسَ مِنَّا»[٢].

واتە: لە ئیاسی كوڕی سەلەمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: هەر كەسێک چەک لە ئێمە ڕابكێشێت ئەوە لە ئێمە نیە (لەو سیفەتە شەڕانگێزیە).

## بابەت: دەسەڵات بۆ قورەیشە

٢٥٧١ - «كان محمد بن جبير بن مطعم يحدث عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ وَهُوَ عِنْدَهُ فِي وَفْدٍ مِنْ قُرَيْشٍ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إنَّ هَذَا الأَمْرَ فِي قُرَيْشٍ، لاَ يُعَادِيهِمْ أَحَدٌ إلاَّ كَبَّهُ اللهُ عَلَى وَجْهِهِ، مَا أَقَامُوا الدِّينَ»[٣].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی جوبەیری كوڕی موتعیمەوە گێردراوەتەوە كە باسی موعاویەی ﷺ كردوە ـ لەكاتێكدا وەفدێک لە قورەیشیەكانی لەلا بوو ـ وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەم خەلافەت و دەسەڵاتە بۆ قورەیشە، هیچ كەسێک نیە بەربەرەكانێیان لەگەڵ بكات (لەسەر دەسەڵات) حەتمەن خوا دەیخاتە سەر ڕوو (واتە: سزای دەدات)، هەتا ئەو كاتەی قورەیش

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ئاین جێبەجێ بکەن (واتە: تا قورەیش جێبەجێکاری ئاین بن دروست نیە کەسیتر پێشەوا بێت، چونکە ئەوان شایستەترن بەو کارە، بەڵام ئەگەر دینیان جێبەجێ نەکرد ئەو کات کێ دین جێبەجێ بکات ئەو دەبێ دەسەڵات بگرێتە دەست و ئەو شایستەیە نەک قورەیش).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی قورەیش

٢٥٧٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قُرَيْشٌ، وَالأَنْصَارُ، وَمُزَيْنَةُ، وَجُهَيْنَةُ، وَأَسْلَمُ، وَغِفَارٌ، وَأَشْجَعُ لَيْسَ لَهُمْ مَوْلًى دُونَ اللهِ وَرَسُولِهِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: قورەیش و، ئەنصار و، موزەینە و، جوهەینە و، ئەسلەم و، غیفار و، ئەشجەع، هیچ سەرپەرشتێکیان بۆ نیە جگە لە خوا و پێغەمبەرەکەی (واتە: مسوڵمانەکانیان ئەوەندە لە خواو پێغەمبەر نزیکن بۆیە خواو پێغەمبەرەکەی سەرپەرشتیاری ئەوانن).

٢٥٧٣- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ أَسْلَمُ وَغِفَارٌ خَيْرًا مِنَ الْحَلِيفَيْنِ أَسَدٍ وَغَطَفَانَ أَتُرَوْنَهُمْ خَسِرُوا؟ قَالُوا: نَعم، قَالَ: فَإِنَّهُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ، قَالَ: أَفَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَتْ مُزَيْنَةُ وَجُهَيْنَةُ خَيْرًا مِنْ تَمِيمٍ وَعَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ - وَمَدَّ بِهَا صَوْتَهُ - أَتُرَوْنَهُمْ خَسِرُوا؟ قَالُوا: نَعم، قَالَ: فَإِنَّهُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ»[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکرە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا پێتان وایە ئەگەر قەبیلەی ئەسلەم و غیفار چاکتر بن لە دوو هاوپەیمانەکان کە بریتین لە ئەسەد و غەتەفان ئایا پێتان وایە (ئەسەد و غەتەفان) خەسارەتمەند بوون؟ وتیان: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: دەبزانن بە دڵنیایی ئەوان چاکترن لەوان (واتە ئەسلەم و غیفار چاکترن لە ئەسەد و غەتەفان).

جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پێتان وایە ئەگەر موزەینە و جوهەینە چاکتر بن لە تەمیم و عامیری کوڕی صەعصەعە ـ جا دەنگی بەرز کردەوە و فەرمووی ـ ئایا پێتان وایە (تەمیم و عامر) خەسارەت مەند بوون؟ وتیان: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: دە بزانن بە دڵنیایی ئەوان چاکترن لەوان (واتە: موزەینە و جوهەینە چاکترن لە تەمیم و عامیری کوڕی صەعصەعە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: گەورەیی هۆزی ئەسلەم و غیفار

٢٥٧٤ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: غِفَارٌ غَفَرَ اللهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ»[١].

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لە هۆزی غیفار خۆش بێت و، هۆزی ئەسلەمیش سەلامەت بکات.

٢٥٧٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: غِفَارٌ غَفَرَ اللهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ، وَعُصَيَّةُ عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهُ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لە هۆزی غیفار خۆش بێت و، هۆزی ئەسلەمیش سەلامەت بکات و، هۆزی عوصەییەش سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەیان کرد.

## بابەت: هیچ پەیمانێک لە ئیسلامدا نیە[٣]

٢٥٧٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قِيلَ لِشَرِيكٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: نَعم لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ، وَالْحِلْفُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ إِلاَّ شِدَّةً وَجِدَّةً»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە ـ بە شەریک وترا: ئیبنو عەبباس لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە؟ وتی: بەڵێ ـ (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی): هیچ پەیمانێک لە ئیسلامدا نیە (واتە: دابەش کردنی هەق و میرات و شتیتر بە ڕێککەوتن نابێت بەڵکو خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕوونیان کردتەوە).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی کە خزمەتکار و کوڕی خوشکی خەڵکانێک لە خۆیانن

٢٥٧٧ - «حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: قُلْتُ لِمُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ: أَكَانَ أَنَسٌ ﷺ يَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلنُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ: ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ؟، قَالَ: نَعم»[٥].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ واتە : دابەش کردنی هــەق و میرات و شتیتر بە ڕێککەوتن و پەیمان نابێت، بەڵکو خــوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕوونیان کردتەوە.

(٤) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە شوعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە موعاویەی کوڕی قوڕڕەم وت: ئایا ئەنەس ﷺ باسی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ بە نوعمانی کوڕی موقەڕینی فەرمووبێت: کوڕی خوشکی خەڵکانێک یەکێکە لە خۆیان؟ وتی: بەڵێ.

تێبینی: ئەو فەرموودەیە لەو کاتەدا وتراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنصاریەکانی کۆکردەوە و فەرمووی: کەسی جگە لە خۆتان تیایە؟ وتیان: نەخێر، تەنها کوڕە خوشکێکمان نەبێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کوڕە خوشکیش هەر لە خۆتانە (بۆیە هەقی هەیە لە زۆربەی شتەکان بەشداری پێ بکرێت و لە نزیکەکانتانی بزانن).

٢٥٧٨ - «عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْهُمْ، وَحَلِيفُ الْقَوْمِ مِنْهُمْ، وَابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ»[1].

واتە: لە کەثیری کوڕی عەبدوڵلاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندە و خزمەتکاری خەڵکانێک یەکێکە لەخۆیان، وە کەسێک کە هاوپەیمانی قەومێک بێت یەکێکە لەخۆیان، وە کوڕی خوشکی قەومێک لەوانە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی خۆی دەداتە پاڵ جگە لە گەورەکەی

٢٥٧٩ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ تَحْتَ نَاقَةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ، رَغْبَةً عَنْهُمْ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ»[2].

واتە: لە عەمرِی کوڕی خاریجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لە ژێر وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ بووم (سەری وشترەکەی لەبان سەرم بوو) و گوێم لێی بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بانگەشە بکات و خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی و (بە باوکی خۆی بزانێت)، یان خۆی بداتە پاڵ جگە لە گەورەکانی، پشت لە گەورەکانی بکات، ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی بە تێکڕایی لێ بێت، هیچ واجب و سوننەتێکی لێ قبوڵ ناکرێت.

٢٥٨٠ - «عَنْ سَعْدٍ، وَأَبِي بَكْرَةَ ﷺ، أَنَّهُمَا حَدَّثَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ»[3].

واتە: لە سەعد و ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بانگەشە بۆ جگە لە باوکی بکات و خۆی بداتە پاڵی و بەباوکی خۆی بزانێت لەکاتێکدا

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دەزانێت ئەو باوكی نیە، ئەوە بەهەشتی لەسەر حەڕامە (واتە: سەرەتا ناچێتە بەهەشت، بەڵكو دوای وەرگرتنی سزای خۆی دەچێتە بەهەشت ئەگەر بڕوادار بێت).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی حەڵاڵ ڕوونە و حەڕامیش ڕوونە

٢٥٨١ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الْحَلاَلُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُتَشَابِهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ، اسْتَبْرَأَ لِعِرْضِهِ وَدِينِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ، وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، فَيُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ، وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ»[١].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو ﷺ دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ ڕوونە و حەڕامیش ڕوونە، وە لە نێوانیاندا شتانێکی گوماناوی هەن، کە زۆرێک لە خەڵکی نایانزانن، جا هەر کەسێک خۆی لە شتی گوماناوی بپارێزێت ئەوە داوای سەلامەتی بۆ سومعە و ئاینی خۆی کردوە (واتە: سومعە و ئایینی سەلامەت بووە)، وە هەر کەسێکیش بکەوێتە ناو گومانەکان ئەوە کەوتۆتە ناو حەڕامەوە، (نمونەکەی) وەکو شوانێک وایە کە ئاژەڵەکانی دەلەوەڕێنێ لە دەوری توخوب، جا نزیکە بکەوێتە ناویەوە (بە دڵنیایی بەین بەینە ئاژەڵەکانی دەچنە ناو توخوبەکە و شوانەکە توشی حەڕام خواردن دەبێت بەهۆی بەزاندنی توخوبی خەڵکی)، دە ئاگاداربن توخوبی خواش حەڕامکراوەکانیەتی، ئاگاداربن لە جەستەدا پارچە گۆشتێک هەیە کاتێ چاک بوو ئەوە هەموو جەستە چاک دەبێت، وە کاتێ تێکچوو ئەوە هەموو جەستە تێک دەچێت، بزانن ئەو پارچە گۆشتە دڵە.

## بابەت: واز لەو شتە بێنە کە گومانت لێی هەیە و بچۆرە لای ئەو شتەی کە گومانت لێی نیە

٢٥٨٢ - «عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ، قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ: مَا تَحْفَظُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: سَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ مَسْأَلَةٍ لاَ أَدْرِي مَا هِيَ؟ فَقَالَ: دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ»[٢].

واتە: لە ئەبو حەوڕائی سەعدیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە حەسەنی کوڕی عەلیم وت ﷺ: چیت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەر کردوە؟ وتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد نازانم پرسیارەکە چی بوو؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: واز بێنە لەو شتەی گومانت لێی هەیە و، بچۆ بەلای ئەو شتەی گومانت لێی نیە.

٢٥٨٣ - «عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ الأَسَدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِوَابِصَةَ: جِئْتَ تَسْأَلُ عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟، قَالَ: قُلْتُ: نَعم، قَالَ: فَجَمَعَ أَصَابِعَهُ فَضَرَبَ بِهَا صَدْرَهُ، وَقَالَ: اسْتَفْتِ نَفْسَكَ، اسْتَفْتِ قَلْبَكَ يَا وَابِصَةُ - ثَلاَثًا - الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ، وَاطْمَأَنَّ إِلَيْهِ الْقَلْبُ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ، وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە وابیصەی کوڕی مەعبەدی ئەسەدیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە وابیصەی فەرموو: هاتوی پرسیار لە چاکە و خراپە دەکەیت؟ دەڵێ: وتم: بەڵێ، دەڵێ: جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) پەنجەکانی کۆکردەوە و (کردی بە مشتەکۆڵە) و دای لە سینگی وابیصە و فەرمووی: لە خۆت بپرسە، لە دڵت بپرسە ئەی وابیصە ـ سێ جار ئاوای فەرموو ـ (دواتر فەرمووی): چاکە بریتیە لەوەی کە نەفست پێی ئارامە و دڵیشت پێی ئارامە، خراپەش بریتیە لەوەی کە لە نەفست جێگیر دەبێت و لە سینگ و دڵت دێت و دەچێت (واتە: دڵت خورپەیەتی کە ئاخۆ بیکەیت یان نەیکەیت، هەر دوو دڵی)، هەر چەندە خەڵک فەتواشت بۆ بدەن.

## بابەت: دەربارەی ئەو سوو خواردنەی لە سەردەمی نەزانیدا هەبوو

٢٥٨٤ - «عَنْ أَبِي حُرَّةَ الرَّقَاشِيِّ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ آخِذًا بِزِمَامِ نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فِي أَوْسَطِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، أَذُودُ النَّاسَ عَنْهُ، فَقَالَ: أَلاَ إِنَّ كُلَّ رِبًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، أَلاَ وَإِنَّ اللهَ قَدْ قَضَى أَنَّ أَوَّلَ رِبًا يُوضَعُ رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ، وَلاَ تُظْلَمُونَ»[1].

واتە: لە ئەبو حوڕەی ڕەقاشیەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە مامیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من هەوساری وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو لە ناوەڕاستی ڕۆژەکانی تەشریق (کە دەکاتە دووەمین ڕۆژی تەشریق) و خەڵکیم لە (پێغەمبەری خوا ﷺ) دوردەخستەوە و (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئاگاداربن هەموو ڕیبا و سووێک کە لە سەردەمی نەزانی جێبەجێ کراوە ئەوە واز لێهێنراوە (واتە: دەبێ وازی لێ بهێنن)، ئاگاداربن خوا بڕیاریداوە یەکەم ڕیبا کە واز لێبهێنرێت ڕیبای عەبباسی کوڕی موتەللیبە، پێویستە سەرمایەیماڵەکانتان بۆخۆتان بێ، نە ستەم دەکەن و نە ستەمتان لێدەکرێت.

## بابەت: دەربارەی ڕیباخۆر و ڕیبادەر

٢٥٨٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا وَمُؤْكِلَهُ»[2].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە ڕیباخۆر و ڕیبادەر.

## بابەت: دەربارەی سزای توند بۆ ڕیباخۆر

٢٥٨٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيَأْتِيَنَّ زَمَانٌ لاَ يُبَالِي الْمَرْءُ بِمَا أَخَذَ الْمَالَ، بِحَلاَلٍ أَمْ بِحَرَامٍ»[3].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث حسن لغيره.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەردەمێک دێت مرۆڤ گوێ نادات بەو ماڵەی بەدەستی دێنێت بە حەڵاڵ بێت یان بە حەڕام.

## بابەت: دەربارەی کاسبی کردن و کار کردنی پیاو بە دەستی خۆی

٢٥٨٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَحَقَّ مَا يَأْكُلُ الرَّجُلُ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِهِ»[١].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شایستەترین ئەو ڕۆزیەی پیاو بیخوات بریتیە لە پاکترینی کەسابەتەکەی، وە منداڵەکەشی بەشێکە لە پاکترینی کارەکانی (واتە: بۆی دروستە لە ماڵ و سەروەتی کوڕەکەی بخوات ئەگەر پێویستی پێی بوو).

## بابەت: دەربارەی بازرگانی

٢٥٨٨ - «عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الْبَقِيعِ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، حَتَّى إِذَا اشْرَأَبُّوا، قَالَ: التُّجَّارُ يُحْشَرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فُجَّارًا، إِلاَّ مَنِ اتَّقَى اللهَ وَبَرَّ وَصَدَقَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: « كَانَ أَبُو نُعَيْمٍ يَقُولُ: عُبَيْدُ اللهِ بْنُ رِفَاعَةَ، وَإِنَّمَا هُوَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ رِفَاعَةَ»[٢].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ڕیفاعەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ بەقیع و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی بازرگانان ـ جا هەموویان سەریان بەرزکردەوە و ئاوڕیان دایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ـ فەرمووی: بازرگانان بە کەسی خراپەکار حەشر دەکرێن لە ڕۆژی دواییدا، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە لە خوا ترسە و چاکە دەکات و ڕاستی دەڵێت.

## بابەت: دەربارەی بازرگارنی ڕاستگۆ

٢٥٨٩ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: التَّاجِرُ الصَّدُوقُ الأَمِينُ مَعَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ»[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: بازرگانی ڕاستگۆ و ئەمین لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان دایە.

## بابەت: دەربارەی ئامۆژگاری

٢٥٩٠ - «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پەیمانمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر: ئەنجامدانی نوێژ و، زەکاتدان و، ئامۆژگاری کردنی گشت مسوڵمانێک.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فێڵ و غەش

٢٥٩١ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، مَرَّ بِطَعَامٍ بِسُوقِ الْمَدِينَةِ فَأَعْجَبَهُ حُسْنُهُ، فَأَدْخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ فِي جَوْفِهِ، فَأَخْرَجَ شَيْئًا لَيْسَ كَالظَّاهِرِ، فَأَفَّفَ لِصَاحِبِ الطَّعَامِ، ثُمَّ قَالَ: لاَ غِشَّ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای خواردنێکدا تێپەڕ بوو لە بازاڕی مەدینە و دڵی جوانی خواردنەکەی گرت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە ناویەوە (هەڵگێڕ و وەرگێڕی کرد) و شتێک دەرکەوت کە وەکو ڕووکەش و ئەوە نەبوو کە بە دەرەوەیە، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) ئاخی بۆ خاوەن خۆراکەکە هەڵکێشا، دواتر فەرمووی: هیچ فێڵ و غەشێک نابێ بکرێت لە نێوان مسوڵمانان، هەر کەسێک غەش و فێڵ و خیانەت بکات ئەوە (لەو سیفەتە قێزەونە) لە ئێمە نیە.

## بابەت: دەربارەی غەدر

٢٥٩٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانٍ»[2].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەموو غەدرکەرێک و ستەمکارێک ئاڵایێکی هەیە لە ڕۆژی دواییدا، دەوترێت: ئەوە غەدری فڵانە کەسەیە (واتە: بە هۆی ئاڵاکەی لەناو هەموو خەڵکی دیار دەبێت و فەزع دەبێت بەر لە سزادان).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە قۆرخکاری

٢٥٩٣ - «عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ نَافِعِ بْنِ نَضْلَةَ الْعَدَوِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَحْتَكِرُ إلاَّ خَاطِئٌ ـ مَرَّتَيْنِ»[3].

واتە: لە مەعمەڕی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی نافیعی کوڕی نەضلەی عەدەویەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کەس قۆرخکاری ناکات جگە لە تاوانبار، دوو جار (ئاوای فەرموو).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

٢٥٩٤ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْجَالِبُ مَرْزُوقٌ، وَالْمُحْتَكِرُ مَلْعُونٌ»[1].

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەو کەسەی خۆراک و شتومەک لە وڵات و شوێنان بۆ شوێن و خەڵکی خۆی دەگوازێتەوە و پێیان دەفرۆشێت و نایشارێتەوە ئەوە ڕۆزی دراوە (واتە: خوا بەرەکەت دەخاتە ڕۆزیەکەی و قازانجێکی چاک و پاک دەکات)، وە کەسی قۆرخکاریش کە خواردن و شتومەک دەشارێتەوە تاوەکو گران ببێت لەسەر خەڵکی و، دواتر بە چەند قیمەت پێیان بفرۆشێت، ئەوە نەفرین لێکراوە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لەوەی نرخ دابنرێت لەناو مسوڵمانان

٢٥٩٥ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: غَلاَ السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ، غَلاَ السِّعْرُ، فَسَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ هُوَ الْخَالِقُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ، الْمُسَعِّرُ، وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ أَلْقَى رَبِّي وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يَطْلُبُنِي بِمَظْلِمَةٍ ظَلَمْتُهَا إِيَّاهُ بِدَمٍ وَلاَ مَالٍ»[2].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نرخی شتومەک گران بوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، خەڵکیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا نرخی شتومەک گران بووە و، نرخمان بۆ دیاری بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا خۆی دروستکارە (بۆ سەرووەتی زەوی و بەرهەمەکان) و گرەرەوەیە (هەندێ جار ڕۆزی کەم دەکاتەوە) و پێدەرە (لە ڕۆزی فراوان کردن) و ڕۆزیدەرە (ڕۆزیەکە لەدەست ئەوە بە کەم و زۆریەوە) و نرخ دانەرە (بەهۆی کەم و زۆر کردنی ڕۆزی و، ئەمانە هەمووی کاری ئەون و بۆ من نیە دەستکاری بکەم)، وە من ئومێدەوارم کە بگەم بە پەروەردگارم لەکاتێکدا کە کەس لە ئێوە داوای تۆڵەی ئەو ستەمەم لێنەکات کە لێم کردوە چ بە خوێن و چ بە ماڵ.

تێبینی: نرخ دانان لەبەر ئەوە چاک نیە چونکە مرۆڤ تەصەڕووف لە موڵکی خەڵکیدا دەکات و لەبری ئەوان نرخ دادەنێت، کە ڕەنگە هەندێکیان بەوە ستەمیان لێ بکرێت و، مامەڵە و ڕێککەوتن و یارمەتیدانی یەکتری نامێنێت، لەبەر ئەوەی نرخەکان نەگۆڕن و مەجالی تیا نامێنێت. والله أعلم.

## بابەت: دەربارەی چاوپۆشی کردن

٢٥٩٦ - «عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، أَنَّ حُذَيْفَةَ ﷺ حَدَّثَهُمْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَلَقَّتِ الْمَلاَئِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ قَبْلَكُمْ، فَقَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئًا؟ فَقَالَ: لاَ، قَالُوا: تَذَكَّرْ، قَالَ: كُنْتُ أُدَايِنُ النَّاسَ، فَآمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا الْمُعْسِرَ، وَيَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُوسِرِ، قَالَ: قَالَ اللَّهُ: تَجَاوَزُوا عَنْهُ»[3].

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ڕیبعی كوڕی حیراشەوە گێڕدراوەتەوە كە حوذەیفە ﷺ بۆی گێڕاونەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتە گەیشتن بە ڕۆحی پیاوێكی پێشی ئێوە (تا ڕۆحی بكێشن) و پێیان وت: ئایا هیچ خێرێكت كردوە؟ وتی: نەخێر، وتیان: بیربكەرەوە، وتی: (بیرم كەوتەوە) من قەرزم دەدا بە خەڵك و فەرمانم بە خزمەتكار و شاگردەكانم دەكرد كە مۆڵەتی زیاتر بدەن بە كەسی نەدار و سەبری زیاتری لەسەر بگرن بۆ دانەوەی قەرزەكەی و، لە هەندێك قەرزی كەسی هەبوویش خۆش بن و چاوپۆشی لە بەشێكی بكەن، (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەفەرمووێ: خوا (بە فریشتەكانی) فەرموو: چاوپۆشی لێ بكەن (لە تاوانەكانی خۆش بووم).

## بابەت: دوو مامەڵەكارەكان سەرپشكن[١] مادەم هێشتا لێك جیانەبوونەتەوە و لە مەجلیسی مامەڵەكەن

٢٥٩٧ - «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا، بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا، مُحِقَ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا»[٢].

واتە: لە حەكیمی كوڕی حیزامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو مامەڵەكارەكان سەرپشكن (لە جێبەجێ كردن و هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەكەیان) مادەم هێشتا لێك جیانەبوونەتەوە (لە مەجلیسی ڕێككەوتنەكە)، وە ئەگەر لەگەڵ یەكتری ڕاستیان كرد و شتەكانی خۆیان ڕوونكردەوە، ئەوە بەرەكەت دەخرێتە مامەڵەكەیان (هەردوولا خێری لێ دەبینن)، وە ئەگەر درۆشیان لەگەڵ یەكتری كرد و (عەیبیان) شاردەوە لە یەكتری، ئەوە بەرەكەتی مامەڵەكەیان لەناو بردراوە (خوا بەرەكەتەكە لەناو دەبات).

٢٥٩٨ - «أَخْبَرَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، بِإِسْنَادِهِ مِثْلَهُ»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: كاتێ دوو مامەڵەكارەكە جیاوازیان دەكەوێتە نێوان

٢٥٩٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الْبَيِّعَانِ إِذَا اخْتَلَفَا، وَالْبَيْعُ قَائِمٌ بِعَيْنِهِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ، فَالْقَوْلُ مَا قَالَ الْبَائِعُ، أَوْ يَتَرَادَّانِ الْبَيْعَ»[٤].

---

(١) ـ لە بەرێكردن و هەڵوەشانەوەی معامەلەكەیان.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دوو مامەڵەکارەکان کاتێ جیاوازیان کەوتە نێوان و، مامەڵەکەش وەکو خۆی مابێتەوە (ڕەفز نەکرابێتەوە) و، هیچ شاهێدێک و بەڵگەو نوسراوێکیشیان لە نێواندا نەبێت، ئەوە قسە قسەی فرۆشیارە (دەبێ قسەی ئەو وەربگیرێ)، یانیش مامەڵەکە هەڵبوەشێننەوە.

## بابەت: هیچ کەسێک نابێت مامەڵە بەسەر مامەڵەی برای مسوڵمانیەوە بکات

٢٦٠٠ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ لِاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَبِيعَ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَهُ»(١).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت مامەڵە بکات بەسەر مامەڵەی برای مسوڵمانی، تاوەکو ئەو وازی لێ دەهێنێت.

## بابەت: دەربارەی سەرپشکبوون و گرەنتی

٢٦٠١ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: عُهْدَةُ الرَّقِيقِ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ»(٢).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەمانەتی بەندە (واتە: گرەنتی نەبوونی بەندەی فرۆشراو) سێ ڕۆژە.

٢٦٠٢ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: عُهْدَةُ الرَّقِيقِ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، فَفَسَّرَهُ قَتَادَةُ: إِنْ وَجَدَ فِي الثَّلاَثِ عَيْبًا رَدَّهُ بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ، وَإِنْ وَجَدَهُ بَعْدَ ثَلاَثٍ لَمْ يَرُدَّهُ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ»(٣).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەمانەتی بەندە سێ ڕۆژە.

جا قەتادە ئاوای لێکداوەتەوە: ئەگەر کڕیار لەو سێ ڕۆژانە عەیبێکی دیتەوە ئەوە بۆی دەگەڕێنێتەوە بەبێ بەڵگە، وە ئەگەر عەیبی دۆزیەوە دوای سێ ڕۆژ ئەوە بۆی ناگەڕێنێتەوە تەنها بە بەڵگە نەبێت (واتە: دەبێ بەڵگەی هەبێت کە عەیبەکە هی لای فرۆشیارە).

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ ضعيف.
(٣) ـ ضعيف.

## بابەت: دەربارەی موحەففەلات (کۆکراوەکان)

٢٦٠٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى شَاةً مُصَرَّاةً، أَوْ لَقْحَةً مُصَرَّاةً، فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ رَدَّهَا رَدَّ مَعَهَا صَاعًا مِنْ طَعَامٍ لاَ سَمْرَاءَ»(١).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مەڕێکی کڕی شیری لە گوانی جێهێڵدرابوو تاوەکو بە مەڕێکی پڕ شیر دەربکەوێت، یان ئاژەڵێکی کڕی کە تازە زابوو و شیری لە گوانی جێهێڵدرابوو، ئەوە سێ ڕۆژان سەرپشکە (دەتوانێ بیگەڕێنێتەوە، چونکە فێڵی لێکراوە)، جا ئەگەر گەڕاندیەوە ئەوە صاعێک لە خواردنی لەگەڵ دەگەڕێنێتەوە (لە بری ئەو شیرەی دۆشیویەتی) بەڵام گەنم نەبێت.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە مامەڵەی فێڵ تێداکراو

٢٦٠٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ»(٢).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە مامەڵەی بە فێڵ (مامەڵەی فێڵ و خیانەت تێداکراو).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە مامەڵە کردن بە بەروبوم تاوەکو پێدەگات

٢٦٠٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ»(٣).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە مامەڵە کردن بە بەروبوم تاوەکو پێدەگات، نەهی لە فرۆشیار و کڕیار کردوە.

## بابەت: دەربارەی بەروبومی بە ئافات

٢٦٠٦ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ ابْتَاعَ ثَمَرَةً فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَلاَ يَأْخُذَنَّ مِنْهُ شَيْئًا، بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقٍّ؟»(٤).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەروبومێکی کڕی و ئافەتێک لێیدا و (هەمووی یان بەشێکی لەناوچوو)، ئەوە هیچ لە فرۆشیارەکە وەرناگیرێتەوە (چونکە ئافات لای کڕیارەکە لێیداوە)، بۆچی ماڵی برای مسوڵمانت وەردەگری بەبێ هەق؟

## بابەت: دەربارەی مامەڵەکردن بە گەنمی نەدورایەوەو بە چڵتوک بەرامبەر بە گەنمی دورایەوەو بێ چڵتوک و، مامەڵەکردن بە ڕوتاب بەسەر دارەوە بەرامبەر بە خورمای وشک

٢٦٠٧ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ، قَالَ عَبْد اللهِ: الْمُحَاقَلَةُ: بَيْعُ الزَّرْعِ بِالْبُرِّ، وَقَالُوا: كَذَلِكَ يَقُولُ ابْنُ الْمُسَيَّبِ»[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە مامەڵەکردن بە گەنمی نەدورایەوە و بە چڵتوک بەرامبەر بە گەنمی دورایەوە و بێ چڵتوک و، مامەڵەکردن بە ڕوتاب بەسەر دارەوە بەرامبەر بە خورمای وشک.

عەبدوڵلا وتویەتی: الْمُحَاقَلَةِ (بریتیە لە): فرۆشتنی دەغل (کە هێشتا نەدوراوەتەوە) بە گەنمی دوراوە، وە وتویانە: ئیبنو موسەییەبیش هەمان شتی دەوت.

## بابەت: دەربارەی عەڕایا (واتە: گۆڕینەوەی قەسپ بە ڕوتاب)

٢٦٠٨ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِالتَّمْرِ وَالرُّطَبِ، وَلَمْ يُرَخِّصْ فِي غَيْرِ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخسەت و ڕێگەی داوە بە عەڕایا لە خورماو لە ڕوتاب و، ڕێگەی نەداوە لە شتی تری جگە لەوە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فرۆشتنی خواردن بەرلەوەی وەری بگرێت

٢٦٠٩ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک خواردنێکی کڕی ئەوە با نەیفرۆشێتەوە تاوەکو وەریدەگرێت (چونکە هەتا وەری نەگرێت زەمانەت نیە و وەک ئەوە وایە نەبێت و، ڕەنگە لەناو بچێت پێش ئەوەی بگاتە دەستی).

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی دوو مەرج لە مامەڵەیەکدا

٢٦١٠ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ سَلَفٍ وَبَيْعٍ، وَعَنْ شَرْطَيْنِ فِي بَيْعٍ، وَعَنْ رِبْحِ مَا لَمْ يُضْمَنْ»[١].

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە قەرز و فرۆشتن بەیەکەوە (وەک بڵێت: ئەو شتەت بەوەندە پێ دەفرۆشم وە دەبێ تۆش ئەوەندە پارەم بە قەرز بدەیتێ)، هەروەها نەهی کردوە لە دانانی دوو مەرج لە یەک مامەڵەدا (وەک بڵێت: ئەو شتەت پێ دەفرۆشم بە نەقد بە ئەوەندە و بە قست و قەرزیش بەوەندە، یەکێکیشیان دیاری نەکرێت)، هەروەها نەهی کردوە لە فرۆشتنی شتێک کە زەمانەتی نیە و هێشتا خۆی وەرینەگرتووە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی بەندەیەک دەفرۆشێت لەکاتێکدا بەندەکە ماڵ و سەروەتی هەیە

٢٦١١ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى عَبْدًا وَلَمْ يَشْتَرِطْ مَالَهُ، فَلاَ شَيْءَ لَهُ»[٢].

واتە: لە سالمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەندەیەکی کڕی و ماڵەکەی بە مەرج نەگرت (نەیوت دەبێ ماڵەکەشی لەگەڵ بێت)، ئەوە هیچ شتێکی بۆ نیە (لە ماڵەکەیدا).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە مونابەزە و مولامەسە

٢٦١٢ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعَتَيْنِ، وَعَنْ لِبْسَتَيْنِ، عَنْ بَيْعِ الْمُنَابَذَةِ وَالْمُلاَمَسَةِ، قَالَ عَبْد اللهِ: الْمُنَابَذَةُ: يَرْمِي هَذَا إِلَى ذَاكَ، وَيَرْمِي ذَاكَ إِلَى هَذَا، قَالَ: كَانَ هَذَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ»[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە دوو مامەڵە لە یەک کاتدا، وە نەهی کردوە لە دوو جۆر جل پۆشین (یەکیان: ئەوەیە جلەکەی بخاتە سەر شانێکی و شانێکی تریشی بەدەرەوەبێت، دووەمیان: ئەو جۆرە جل پۆشینەیە کە لەکاتی دانیشتن عەورەتی دەربکەوێت)، وە نەهی کردوە لە مونابەذە و مولامەسە (مولامەسە ئەوەیە: موشتەری لەناو

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

تاریکی دەستی دابنێت لەسەر جلێک و مامەڵەکە دەکەوتە سەر ئەو جلە و دەبووایە هەر ئەو شتەی ببردایە، یان بە پێچراوەیی دەستی لەسەر دابنێت، جا چاک دەرچووایە یان خراپ، وەک یانسیب وابوو).

عەبدوڵڵا وتویەتی: (مونابەذە) ئەوەیە: کەسێک بەردێک یان شتێک دەگرێتە ئەوێیێ و، ئەوێهێش بەرد دەگرێتە ئەوە (واتە: بەردیان دەگرتە شتانێک جا بەر چی بکەوتایە ئەوە دەبووە شتە فرۆشراوەکە) ئەوە لە سەردەمی نەزانیدا هەبوو.

## بابەت: دەربارەی مامەڵەی بەرد هاویشتن

٢٦١٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ، وَعَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ، قَالَ عَبْد اللهِ: إِذَا رَمَى بِحَصًا وَجَبَ الْبَيْعُ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە مامەڵەی بە غەش و فێڵ و، لە مامەڵەی بەرد هاوێشتن.

عەبدوڵڵا وتویەتی: کاتێ (مامەڵەکارەکە) بەردی دەهاویشت ئەوە مامەڵەکە جێگیر دەبوو (پەشیمان بوونەوە نەبوو).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ

٢٦١٤ - «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً»[٢].

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بە قەرز.

تێبینی: ئەوە بەڵگەی ئەو زانایانەیە کە ڕێگە نادەن بەو جۆرە مامەڵەیە، بەڵام کۆمەڵێک لە زانایانی تر ڕێگەی پێ دەدەن و فەرموودەی تریان لەبەر دەست دایە، وەك لە فەرموودەكانی داهاتوو.

## بابەت: دەربارەی ڕوخسەت و مۆڵەتدان بە قەرز کردنی ئاژەڵ

٢٦١٥ - «عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: اسْتَسْلَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَكْرًا، فَجَاءَتْ إِبِلٌ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ، قَالَ أَبُو رَافِعٍ: فَأَمَرَنِي أَنْ أَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ، فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ فِي الإِبِلِ إِلاَّ جَمَلاً خِيَارًا رَبَاعِيًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَعْطِهِ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خَيْرَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً، قَالَ عَبْد اللهِ: هَذَا يُقَوِّي قَوْلَ مَنْ يَقُولُ: الْحَيَوَانُ بِالْحَيَوَانِ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو ڕافیعی ﷺ خزمەتكاری پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێكی تازە پێگەیشتوی قەرز كرد، جا هەندێك وشتر لە وشتری صەدەقە هاتن، ئەبو ڕافیع دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمانی پێ كردم كە وشترە قەرزەكەی بدەمەوە، منیش وتم: هیچ وشترێكی تازە پێگەیشتوی وەک هی كابرام دەست نەكەوت تەنها وشتری چاک و نایابی لێیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیدەرێ، چونكە چاكترینی خەڵكی ئەوەیە چاكترینیان بێت لە قەرز دانەوە.

عەبدوڵڵا وتویەتی: ئەو فەرموودەیە بۆچونی ئەو كەسانە بەهێز دەكات كە دەڵێن: (دروستە مامەڵەی ئاژەڵ بە ئاژەڵ.

## بابەت: نەهی كرد لە خۆگەیاندنە مامەڵەكاران و بازرگانان[١]

٢٦١٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَلَقَّوْا الْجَلَبَ، مَنْ تَلَقَّاهُ فَاشْتَرَى مِنْهُ شَيْئًا فَهُوَ بِالْخِيَارِ إِذَا دَخَلَ السُّوقَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان نەگەینە ئەو كەسانەی شتومەک و خۆراک بۆ ئاوایی و شار دەهێنن، بە نیەتی ئەوەی بە نرخێكی هەرزان و ناڕاست لەژێر دەستیان دەربێنن و بلێن ئەوە نرخی شارە، هەر كەسێک خۆیانی گەیاندێ و شتێكیان لێ كڕی، ئەوە سەرپشكە (واتە: بازرگانەكە سەرپشكە و بۆی هەیە شتەكەی خۆی لێ بسەنێتەوە) كاتێ هاتە ناو شار و بینی نرخەكە ڕاست نەبووە.

## بابەت: نابێ مسوڵمان مامەڵە بەسەر مامەڵەی براكەیەوە بكات

٢٦١٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ تَلَقَّوْا السِّلَعَ حَتَّى يُهْبَطَ بِهَا الأَسْوَاقَ، وَلاَ تَنَاجَشُوا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەندێک لە ئێوە نابێت مامەڵە بەسەر مامەڵەی هەندێكی ترەوە بكات، وە خۆتان مەگەیەننە شتومەک (لە دەرەوەی بازاڕ تا لە ژێر دەستی خاوەنەكانیان دەریبێنن بە پولی كەم) تا ئەو كاتەی دەخرێتە ناو بازاڕەوە، وە مەزادیش مەكەن (بەوەی كەسێک لە خۆتان لەناو خەڵک بوەستێت و نرخی زۆر بڵێت و مەبەستی كڕین نەبێت، بەڵكو مەبەستی ئەوە بێت تاوەكو ئەوانیتریش نرخێكی زۆر بڵێن و نرخی شتومەكەكە گران بكەن و بە كەسێكی ساغ بكەنەوە بەو نرخە گرانە).

---

(١) ـ لە دەرەوەی شار و ئاوایی، تاوەكو بە نرخێكی درۆیینە لە ژێر دەستیان دەربهێنن و بە نرخی زیاتر بیدەن بە خەڵكی ئاوایی و شار.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە پارەی سەگ

٢٦١٨ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ، قَالَ عَبْد اللهِ: حُلْوَانُ الْكَاهِنِ، مَا يُعْطَى عَلَى كَهَانَتِهِ»(١).

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە پارەی سەگ و، پارەی زیناکەر و، پارەی فاڵچی.

عەبدوڵڵا وتویەتی: واتە: ئەوەی پێی دەدرێت لەسەر فاڵچیایەتی.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە مامەڵەی مەشرۆب

٢٦١٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتِ الآيَةُ فِي آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي الرِّبَا، خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَتَلاَهُنَّ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ حَرَّمَ التِّجَارَةَ فِي الْخَمْرِ»(٢).

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ ئایەتەکە دابەزی لە کۆتایی سوڕەتی بەقەڕەدا دەربارەی ڕیبا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو و بەسەر خەڵکیدا خوێندیەوە، دواتر بازرگانی و مامەڵەکردنی بە مەشرۆبەوە حەڕام کرد.

٢٦٢٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتِ الآيَاتُ مِنْ أَوَاخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَتَلاَهُنَّ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ نَهَى عَنِ التِّجَارَةِ فِي الْخَمْرِ»(٣).

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ چەند ئایەتەکەی کۆتایی سوڕەتی بەقەڕە دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بەسەر خەڵکیدا خوێندیەوە، دواتر نەهی کرد لەوەی بازرگانی و مامەڵە بکرێت بە مەشرۆبەوە.

٢٦٢١ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ وَعْلَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ جُلُودِ الْمَيْتَةِ؟ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دِبَاغُهَا طَهُورُهَا، وَسَأَلْتُهُ عَنْ بَيْعِ الْخَمْرِ مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ لَنَا أَعْنَابًا، وَإِنَّا نَتَّخِذُ مِنْهَا هَذِهِ الْخُمُورَ فَنَبِيعُهَا مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَهْدَى رَجُلٌ مِنْ ثَقِيفٍ، أَوْ دَوْسٍ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ رَاوِيَةً مِنْ خَمْرٍ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَمَا عَلِمْتَ يَا أَبَا فُلاَنٍ، أَنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَهَا؟، قَالَ: لاَ وَاللهِ، قَالَ: فَإِنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَهَا، فَالْتَفَتَ إِلَى غُلاَمِهِ، فَقَالَ: اخْرُجْ بِهَا إِلَى الْحَزْوَرَةِ فَبِعْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَوَ مَا عَلِمْتَ يَا أَبَا فُلاَنٍ، أَنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا، حَرَّمَ بَيْعَهَا؟، قَالَ: فَأَمَرَ بِهَا فَأُفْرِغَتْ فِي الْبَطْحَاءِ»(٤).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی وەعلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەربارەی پێستی مردارەوەبوو؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دیباغ کردن و خۆشکردنی دەبێتە پاکبوونەوەی، وە پرسیارم لێکرد دەربارەی مەشروب بۆ ئەهلی زیممە (بۆ کەسی هاوپەیمان) و پێم وت: ئێمە ترێی زۆرمان هەیە و ئەو مەشروبەی لێ دروست دەکەین و دەیفرۆشینە ئەهلی زیممە (کەسانی هاوپەیمان)، ئیبنو عەبباس وتی: پیاوێک لە هۆزی ثەقیف یان دەوس مەتارەیەک لە مەشروبی کرد بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا، (پێغەمبەری خواش ﷺ) پێی فەرموو: ئەی فلان مەگەر نەتزانیوە خوا مەشروبی حەرام کردوە؟ وتی: نا واللە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بەدی) خوا حەرامی کردوە، جا پیاوەکە ئاوڕی دایەوە بۆ لای خزمەتکارەکەی و وتی: ئەوە لەگەڵ خۆت ببە بۆ دەرەوە بۆ حەزوەرە و بیفرۆشە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مەگەر نەتزانیوە ئەی فلان ئەوەی خواردنەوەکەی حەرام کردوە فرۆشتنەکەشی حەرام کردوە؟ (ئیبنو عەبباس) دەڵێ: پیاوەکەش فەرمانی کرد بەوەی مەتارە مەشروبەکە بەتاڵ بکرێت و بڕژێنرێت بەسەر زەویدا.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فرۆشتنی وەلاء

**٢٦٢٢** - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ، قَالَ عَبْد اللهِ: الأَمْرُ عَلَى هَذَا لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی وەلائو کردنە دیاری (واتە: فرۆشتنی ئەو سودانەی بۆ کەسی ئازادکاری کۆیلە هەیە بەسەر کۆیلە ئازادکراوەکەوە، وەک ئەوەی کاتێ کۆیلەکە دەمرێت و خزم و کەسی نیە ئەوە میراتەکەی دەدرێت بە ئازادکارەکەی).

عەبدوڵڵا وتویەتی: کار بەوە دەکرێت: (ولاء) نە دەفرۆشرێت و نە دەکرێتە دیاری.

## بابەت: دەربارەی فرۆشتنی کۆیلەی چاوەڕوانکراو

**٢٦٢٣** - «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيَّ ﷺ، قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنَّا عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، قَالَ: فَدَعَا بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَبَاعَهُ، قَالَ جَابِرٌ: وَإِنَّمَا مَاتَ عَامَ أَوَّلَ قِيلَ لِعَبْدِ اللهِ: تَقُولُ بِهِ؟ قَالَ: قَوْمٌ يَقُولُونَ»[2].

واتە: لە عەمری کوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری بوو ﷺ وتی: پیاوێک لە ئێمە بەندەیەکی بە چاوەڕوانکراوی ئازاد کرد (وتی: ئەگەر من مردم تۆ ئازاد بیت)، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) بانگی کرد و فرۆشتی.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

جابیر وتویەتی: لە ساڵی یەکەم وەفاتی کرد، بە عەبدوڵڵا وترا: ئەوە وەردەگری و فەتوای پێ دەدەی؟ وتی: هەندێک لە زانایان وەریان گرتووە و فەتوایان پێداوە.

## بابەت: دەربارەی فرۆشتنی دایکی منداڵان (واتە: فرۆشتنی ئەو ئافرەتە کۆیلەی خاوەنەکەی منداڵی لێی بووە)

٢٦٢٤ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا وَلَدَتْ أَمَةُ الرَّجُلِ مِنْهُ، فَهِيَ مُعْتَقَةٌ، عَنْ دُبُرٍ مِنْهُ، أَوْ بَعْدَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر جاریەی پیاوێک منداڵی لە پیاوەکە بوو، ئەوە ئازاد دەبێت، بە چاوەڕوانکراوی دوای مردنی پیاوەکە.

## بابەت: دەربارەی صاع و موددی مەدینە

٢٦٢٥ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ، وَبَارِكْ لَهُمْ فِي صَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ يَعْنِي الْمَدِينَةَ»[٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە بەرەکەت بخەیتە پێوانەکەیان، هەروەها بەرەکەت بخەیتە صاعیان و موددیان (کە ناوی دوو جۆر لە پێوانەن)، واتە: صاع و موددی مەدینە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فرۆشتنی خواردن ئەگەر وەک یەک نەبێت (لە ئەندازەدا)

٢٦٢٦ - «عَنْ بِلَالٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ عِنْدِي مُدُّ تَمْرٍ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَوَجَدْتُ أَطْيَبَ مِنْهُ صَاعًا بِصَاعَيْنِ، فَاشْتَرَيْتُ مِنْهُ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ لَكَ هَذَا يَا بِلَالُ؟ قُلْتُ: اشْتَرَيْتُ صَاعًا بِصَاعَيْنِ، قَالَ: رُدَّهُ، وَرُدَّ عَلَيْنَا تَمْرَنَا»[٣].

واتە: لە بیلالەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موددێک لە خورمای پێغەمبەرم ﷺ لەلابوو، جا لەو خورما چاکترم دۆزیەوە (لە بازار) صاعێک بە دوو صاع بوو جا ئەوم پێ کڕی و بردم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەوەت لەکوێ هێناوە ئەی بیلال؟ وتم: کڕیومە، صاعێک بە دوو صاع، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیبەوە و خورمای ئێمەش بگەڕێنەوە (ئەوە ڕیبایە).

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.




٢٦٢٧ - «عن سعيد بن مسيب يُحَدِّثُ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا حَدَّثَاهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، بَعَثَ أَخَا بَنِي عَدِيٍّ الأَنْصَارِيَّ فَاسْتَعْمَلَهُ عَلَى خَيْبَرَ، فَقَدِمَ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ - قَالَ ابْنُ مَسْلَمَةَ: يَعْنِي جَيِّدًا - فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟، قَالَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا لَنَشْتَرِي الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ مِنَ الْجَمْعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَفْعَلُوا، وَلَكِنْ مِثْلاً بِمِثْلٍ، أَوْ بِيعُوا هَذَا وَاشْتَرُوا بِثَمَنِهِ مِنْ هَذَا، وَكَذَلِكَ الْمِيزَانُ»[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا)، بۆیان گێڕاوەتەوە، وتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ برای بەنی عەدی ئەنصاری نارد و کردی بە کاربەدەست بەسەر خەیبەرەوە، جا هاتەوە بە خورمایێکی جەنیبەوە ـ ئیبنو مەسلەمە وتویەتی: جەنیب واتە: خورمایێکی نایاب ـ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا هەموو خورمای خەیبەر ئاوا نایابە؟ وتی: ناوەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە یەک صاع (لەم نایابە) بە دوو صاعی خراپ دەکڕین، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئاوا نەکەن (ئەوە ڕیبایە)، بەڵکو دەبێ بە یەک ئەندازە بیگۆڕنەوە و وەکو یەک بن (بۆ نمونە صاعێک بە صاعێک)، یانیش ئەوەی خۆتان بفرۆشن و بە پارەکەی لەو نایابە بکڕن، کێشانیش بەو شێوەیەیە و هەمان حوکمی هەیە (واتە: دەبێ شتی کێشراو وەک شتی پێوراو دەبێ ئەندازەیان یەک بێت).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە زیادە

٢٦٢٨ - «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ هَاءَ وَهَاءَ، وَلاَ فَضْلَ بَيْنَهُمَا»[٢].

واتە: لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەبێ زێڕ بە زێڕ دەست بەدەست بێت، وە زیو بە زیو دەست بە دەست بێت، وە خورما بەخورما دەست بەدەست بێت، وە گەنم بە گەنم دەست بەدەست بێت، وە جۆ بەجۆ دەست بەدەست بێت، بێ هیچ زیادەیەک لە نێوانیاندا.

٢٦٢٩ - «عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ الصَّنْعَانِيِّ ﷺ، قَالَ: قَامَ أُنَاسٌ فِي إِمَارَةِ مُعَاوِيَةَ يَبِيعُونَ آنِيَةَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ إِلَى الْعَطَاءِ، فَقَامَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةِ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرِّ بِالْبُرِّ، وَالتَّمْرِ بِالتَّمْرِ، وَالشَّعِيرِ بِالشَّعِيرِ، وَالْمِلْحِ بِالْمِلْحِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو ئەشعەثی صەنعانیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: خەڵکانێک لە سەردەمی موعاویە هەڵسان قاپ و قاچاغی زێڕ و زیویان دەفرۆشت تا ئەو کاتەی زێڕ و زیوی زەکاتیان بۆ دێت (واتە: مامەڵەکەیان دەست بەدەست نەبوو، بەڵکو شتێکیان دەفرۆشت کە هێشتا نەهاتبوو)، جا عوبادەی کوڕی صامیت هەڵسایەوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ و، زیو بە زیو و، گەنم بە گەنم و، خورما بەخورماو، جۆ بەجۆ و، خوێ بە خوێ، تەنها هاوشێوەی یەک و یەک ئەندازە نەبێت، وە هەر کەسێکیش زیاد بدات یان زیاد وەرگرێت ئەوە ڕیبای کردوە.

## بابەت: ڕیبا تەنها لە قەرزدا هەیە (دەربارەی پارەو پول)

٢٦٣٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا الرِّبَا فِي الدَّيْنِ، قَالَ عَبْد اللهِ: مَعْنَاهُ دِرْهَمٌ بِدِرْهَمَيْنِ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ هەواڵی پێداوم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیبا تەنها لە قەرزدا هەیە (دەربارەی پارەوپول)، عەبدوڵلا وتویەتی: واتە: درهەمێک بە دوو درهەم (بە قەرز بدەیت).

تێبینی: ڕیبا لە هەموو خواردنێکدا هەیە ئەگەر زیادەی بێتە سەر، بەڵام ئەوە تایبەتە بە پارەوپوڵ.

## بابەت: ڕوخسەت و مۆڵەتدان لە وەرگرتنی زیو لەبری زێڕ

٢٦٣١ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ، فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ وَآخُذُ الدَّنَانِيرَ - وَرُبَّمَا قَالَ: أَقْبِضُ - فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، رُوَيْدَكَ أَسْأَلُكَ: إِنِّي أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ، فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ وَآخُذُ الدَّنَانِيرَ، قَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَ بِسِعْرِ يَوْمِكَ، مَا لَمْ تَفْتَرِقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: من وشترم لە بەقیع دەفرۆشت، جا بە دینارم دەفرۆشت (کە لە زێڕ دروست کرابوو) و درهەمم لەبری وەردەگرت (کە لە زیو دروستکرابوو)، وە (جاری وا هەبوو) بە درهەم دەمفرۆشت و دینارم لەبری وەردەگرت، جا چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆزێک مۆڵەت بدە پرسیارت لێ دەکەم: من وشتر لە بەقیع دەفرۆشم، جا بە دینار دەفرۆشم و درهەم وەردەگرم، وە بە درهەم دەیفرۆشم و دینار وەردەگرم (ئایا دروستە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کێشەی تیا نیە ئەگەر بە نرخی ڕۆژەکەت وەریبگریت مادەم لێک جیا نەبوونەتەوە و شتێکتان لە نێوان نەماوە (واتە: بەو دوو مەرجە دروستە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

## بابەت: دەربارەی ڕەهن

٢٦٣٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَإِنَّ دِرْعَهُ لَمَرْهُونَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ بِثَلَاثِينَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، لەکاتێکدا زرێپۆشەکەی ڕەهن و بارمتە بوو لەلای پیاوێک لە جولەکەکان لە جیاتی سی صاع لە جۆ (کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە قەرز لێی کڕی بوو و زرێپۆشەکەی بە بارمتە لەلا دانابوو).

## بابەت: دەربارەی سەلەم

٢٦٣٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي الثِّمَارِ فِي سَنَتَيْنِ وَثَلَاثٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَسْلِفُوا فِي الثِّمَارِ، فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، وَقَدْ كَانَ سُفْيَانُ يَذْكُرُهُ زَمَانًا: إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ، ثُمَّ شَكَّكَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ كَثِيرٍ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە لەکاتێکدا سەلەمیان دەکرد لە بەروبومدا لە دوو ساڵ و سێ ساڵ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەلەم بکەن لە بەروبومدا بە پێوانەی زانراو و ڕوون و بە کێشانی زانراو و ڕوون، جا سوفیان ماوەیەکی زۆر باسی دەکرد (کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەشی فەرمووە): تاوەکو ماوەیەکی زانراو و ڕوون و دیاریکراو، دواتر عەبدوڵلای کوڕی کەثیر خستیە گومانەوە (وتی: وانازانم ئەو ڕستەیەی تیابێت).

## بابەت: دەربارەی جوان دانەوەی قەرز

٢٦٣٤ - «عَنْ مُحَارِبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ: وَزَنَ لَهُ دَرَاهِمَ، فَأَرْجَحَهَا»[٣].

واتە: لە موحاریبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابر بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ درهەمی بۆ حیساب کرد (واتە: فەرمانی بە بیلال کرد درهەمی بۆ حیساب بکات بۆ کڕینی وشترێک لە جابر) و درهەمەکانی زیاد حیساب کرد (دواتریش وشترەکەی بە دیاری پێ بەخشی، مەبەستی ئەوەبوو لە ڕێگەی کڕینی وشترەکە یارمەتی بدات).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: زیاد و قورستر كێشان و پێوان

٢٦٣٥ - «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَمَةُ الْعَبْدِيُّ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، بَزًّا مِنَ الْبَحْرَيْنِ إِلَى مَكَّةَ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يَمْشِي، فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ أَوِ اشْتَرَى مِنَّا سَرَاوِيلَ، وَثَمَّ وَزَّانٌ يَزِنُ بِالأَجْرِ، فَقَالَ لِلْوَزَّانِ: زِنْ وَأَرْجِحْ، فَلَمَّا ذَهَبَ يَمْشِي قَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ»[1].

واتە: لە سوەیدی كوڕی قەیسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من و مەخرەمەی عەبدی (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) جل و بەرگمان لە بەحرەین هێنا بۆ مەككە و پێغەمبەری خواش ﷺ هات بۆ لامان بە پێیان بوو، شەرواڵێک (جلێكی بەشی خوارەوەی جەستەی) لێ كڕین، لەولاش كێشەر هەبوو كە پارە و شتومەكی دەكێشا (بۆ خەڵک بە كرێ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە كێشەرەكەی فەرموو: بكێشەو زیاد دابنێ، جا كاتێ ڕۆیشت وتیان: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ.

## بابەت: دەربارەی تاخیركردنی قەرز لەلایەن كەسی دەوڵەمەند ستەمە

٢٦٣٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تاخیركردنی قەرز لەلایەن كەسی دەوڵەمەندەوە ستەمە، وە ئەگەر تەحویل و ڕەوانەكران بۆ لای دەوڵەمەندێک (تاوەكو قەرزەكە لە بری قەرزارەكە بداتەوە و قەرزارەكە فەرمانی بەوە كرد) ئەوە بڕۆن بۆ لای (قەرزەكەتان لەو وەرگرنەوە، چونكە تەحویل دروستە).

## بابەت: دەربارەی چاوەڕێ كردن و مۆڵەتدانی زیاتری كەسی هەژار (بۆ دانەوەی قەرز)

٢٦٣٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ تَقَاضَى مِنَ ابْنِ أَبِي حَدْرَدٍ ﷺ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا فَنَادَى: يَا كَعْبُ، قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ: ضَعْ مِنْ دَيْنِكَ - فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ - أَيِ الشَّطْرَ، قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ، قَالَ: قُمْ فَاقْضِهِ»[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی كەعبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە: (دوای چاوەڕوان كردنێكی زۆر و مۆڵەتدانێكی زۆر) دەیویست قەرز لە ئیبنو ئەبی حەدرەد ﷺ وەربگرێتەوە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

لە مزگەوت کە قەرزی ئەوی لەسەر بوو، جا دەنگیان بەرزبویەوە (بە هۆی دەمەقاڵێ) تاوەکو پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو لەکاتێکدا لە ماڵەکەیدا بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لایان و بانگی کرد فەرمووی: ئەی کەعب، کەعبیش وتی: لە خزمەتم ئەی پێغەمبەری خوا، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: وازبێنە لە قەرزەکەت ـ جا ئاماژەی بۆ کرد ـ واتە: نیوەی واز لێ بێنە، دەڵێ: منیش وامکرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) (بە ئەبو حەدرەدی) فەرموو: هەڵسە (ئەو نیوەی ماوەتەوە) بیدەرەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی کاتی زیاتر و مۆڵەتی زیاتر دەدات بە قەرزاری هەژار

٢٦٣٨ - «عَنْ أَبِي الْيَسَرِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا، أَوْ وَضَعَ عَنْهُ، أَظَلَّهُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ، قَالَ: فمزق صحيفتَه، فَقَالَ: اذْهَبْ فَهِيَ لَكَ - لِغَرِيمِهِ - وَذَكَرَ أَنَّهُ كَانَ مُعْسِرًا»[١].

واتە: لە ئەبو یەسەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک مۆڵەتی زیاتری قەرزاری نەبووی بدات، یان لە (بەشێک یان لە گشتی) خۆش بێت، ئەوە خوا (لە ڕۆژی دواییدا) دەیخاتە ژێر سێبەری خۆی کە هیچ سێبەرێک نیە جگە لە سێبەری ئەو، جا (ئەبو یەسەر) پەڕاوەکەی دڕاند و (بە قەرزارەکەی خۆی وت): بڕۆ ئەوە بۆ تۆ (لە قەرزەکەم خۆش بووم)، جا باسی کرد کە ئەو هەژار و نەبووی بوو.

٢٦٣٩ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ نَفَّسَ عَنْ غَرِيمِهِ، أَوْ مَحَا عَنْهُ، كَانَ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک ماوە بدات بە قەرزارەکەی یان قەرزەکەی لەسەر بسڕێتەوە (جا بەشێکی بێت یان گشتی)، ئەوە لە ژێر سێبەری عەرش دایە لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: دەربارەی موفلیس کاتێ (خاوەنی قەرزەکە) شتە قەرزکراوەکەی خۆی لەلای کەسی موفلیس دەبینێت

٢٦٤٠ - «سَمِعَ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ إِنْسَانٍ قَدْ أَفْلَسَ، أَوْ عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ»[٣].

واتە: ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریثی کوڕی هیشام گوێی لە ئەبو هوڕەیڕە بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گەیشت بە خودی ماڵەکەی خۆی لەلای

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.

کەسێک کە ئیفلاسی هێناوە و (قەرزەکەی پێ نادرێتەوە)، ئەوە خاوەنی شتە قەرزکراوەکە شایستەتر و ئەهەق ترە بە ماڵەکەی لە کەسێکی تر (کەواتە: دەتوانێ ماڵەکەی خۆی بباتەوە).

## بابەت: دەربارەی خەتەری قەرز

٢٦٤١ - «عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ مَا كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفسی کەسی بڕوادار ڕاگیراوە (لە چونە بەهەشت و لێخۆشبوون و قبوڵ کردن) مادەم قەرزێکی لەسەر بێت.

٢٦٤٢ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلَاثٍ، دَخَلَ الْجَنَّةَ: مِنَ الْكِبْرِ، وَالْغُلُولِ، وَالدَّيْنِ»[٢].

واتە: لە ثەوبانی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕۆحی جیابێتەوە لە جەستەی لەکاتێکدا بەری بێت لە سێ شت (سێ شتی لەسەر نەبێت) ئەوە دەچێتە بەهەشت: (بەری بێت) لە خۆ بەزلزانی و، دزی و، قەرز.

## بابەت: دەربارەی نوێژ کردن لەسەر ئەو کەسەی مردوە و قەرزێکی لەسەرە

٢٦٤٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، أُتِيَ بِرَجُلٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ فَإِنَّ عَلَيْهِ دَيْنًا، قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: هُوَ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: بِالْوَفَاءِ؟ قَالَ: بِالْوَفَاءِ، قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پیاوێکی مردوو هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەکو نوێژی لەسەر بکات، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن ئەو قەرزی لەسەرە (من نوێژی لەسەر ناکەم)، ئەبو قەتادە وتی: قەرزەکەی لەسەر من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: من بۆی دەدەمەوە)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: وەعد بێت دەیدەیتەوە؟ قەتادە وتی: وەعد بێت دەیدەمەوە، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ڕوخسەت و مۆڵەتدان بۆ نوێژ لەسەر کردن

٢٦٤٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا عَلَى الأَرْضِ مُؤْمِنٌ إلاَّ وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِهِ، فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا، أَوْ ضَيَاعًا، فَلأُدْعَ لَهُ فَأَنَا مَوْلاَهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِعَصَبَتِهِ مَنْ كَانَ، قَالَ عَبْد اللهِ: ضَيَاعًا: يَعْنِي: عِيَالاً، وَقَالَ: فَلأُدْعَ لَهُ، يَعْنِي: ادْعُونِي لَهُ أَقْضِ عَنْهُ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ بڕوادارێک نیە لەسەر زەوی حەتمەن من لە هەموو کەس نزیکتر و ئەولاترم پێی، جا هەر کەسێک قەرزێکی لەدوای خۆی جێهێشتبێت و (نەیدابێتەوە) یان ماڵ و منداڵی لەدوای خۆی جێهێشتبێت و (کەس نەبێت مەسرەفیان بکات)، جا منی بۆ بانگ بکەن (بۆ دانەوەی قەرزەکەی و مەسرەفی منداڵەکانی) ئەوە من سەرپەرشتیاریانم (هەموویان بۆ جێبەجێ دەکەم)، وە هەر کەسێک ماڵ و سامانێک لەدوای خۆی جێبهێڵێت ئەوە بۆ عەصەبەکانی خۆیەتی کە هەیەتی.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی کە کەسی قەرزار یارمەتیدراوە (لەلایەن خواوە)

٢٦٤٥ - «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ مَعَ الدَّائِنِ حَتَّى يُقْضَى دَيْنُهُ، مَا لَمْ يَكُنْ فِيمَا يَكْرَهُ اللَّهُ، قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ يَقُولُ لِخَازِنِهِ: اذْهَبْ فَخُذْ لِي بِدَيْنٍ فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَبِيتَ لَيْلَةً إلاَّ وَاللهُ مَعِي، بَعْدَمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ»[2].

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا لەگەڵ کەسی قەرزارە تاوەکو قەرزەکەی دەدرێتەوە مادەم قەرزەکەی بۆ شتێک نەبێت کە خوا پێی ناخۆش بێت، دەڵێ: جا عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بە سەرپەرشتیاری ماڵ و سامانەکەی خۆی دەوت: بڕۆ قەرزێکم بۆ بێنە (واتە: پارەم بۆ قەرز بکە) من پێم ناخۆشە هیچ شەوێک بە تەنها بمێنمەوە حەتمەن دەبێت خوام لەگەڵ بێت دوای ئەوەی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە (واتە: بە هۆی قەرزەکە حەز دەکەم هەمیشە خوام لەگەڵ بێت).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی دەبێ شتی خواستراو بگەڕێنرێتەوە

٢٦٤٦ - «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلَى الْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی مرۆڤ لەسەری واجبە ئەو شتەی وەریگرتووە بیداتەوە.

## بابەت: دەربارەی دانەوەی سپاردە و دوورکەوتنەوە لە خیانەت و ناپاکی

٢٦٤٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: سپاردە بدەرەوە بۆ ئەو کەسەی لای داناوی و بە ئەمینی زانیوی، وە خیانەتیش لەو کەسە مەکە کە خیانەتی لێ کردووی (با هەر ئەو خراپەکار بێت نەک تۆش).

## بابەت: هەر کەسێک شتێک بشکێنێت ئەوە هاوشێوەی ئەو شتەی لەسەر واجبە

٢٦٤٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: أَهْدَى بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، إِلَيْهِ قَصْعَةً فِيهَا ثَرِيدٌ، وَهُوَ فِي بَيْتِ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ، فَضَرَبَتِ الْقَصْعَةَ فَانْكَسَرَتْ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْخُذُ الثَّرِيدَ، فَيَرُدُّهُ فِي الصَّحْفَةِ، وَهُوَ يَقُولُ: كُلُوا غَارَتْ أُمُّكُمْ، ثُمَّ انْتَظَرَ حَتَّى جَاءَتْ قَصْعَةٌ صَحِيحَةٌ، فَأَخَذَهَا فَأَعْطَاهَا صَاحِبَةَ الْقَصْعَةِ الْمَكْسُورَةِ «، قَالَ عَبْد اللهِ: نَقُولُ بِهَذَا»[٢].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: یەکێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەنێک و (قاپێکی گەورەی) کرد بە دیاری بۆ (پێغەمبەری خوا ﷺ) کە تەشریبی تیابوو، لە کاتێکدا (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە ماڵی یەکێک لە خێزانەکانی بوو، جا ئەو خێزانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای بوو لە لەگەنەکەیدا و لەگەنەکە شکا، پێغەمبەری خواش ﷺ خەریک بوو تەشریبەکەی هەڵدەگرتەوە و دەیخستەوە ناو لەگەنەکە و (بە خەڵکەکەی لای خۆی) دەفەرموو: بخۆن ئەوە دایکتان غیرەی کرد (واتە: دایکی بڕواداران)، دواتر چاوەڕێی کرد تاوەکو لەگەنێکی ساغ هێنرا و، پێغەمبەری خواش ﷺ وەریگرت و دای بە خاوەنی لەگەنە شکاوەکە.

عەبدوڵڵا وتویەتی: فەتوا بەوە دەدەین (واتە: دەبێ شتی فەوتێنراو بۆ خاوەنەکەی قەرەبوو بکرێتەوە).

## بابەت: دەربارەی شتی دۆزراوە

٢٦٤٩ - «عَنْ عَمْرٍو، وَعَاصِمٍ، ابْنَيْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَبِيعَةَ الثَّقَفِيِّ، أَنَّ سُفْيَانَ بْنَ عَبْدِ اللهِ وَجَدَ عَيْبَةً، فَأَتَى بِهَا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ عُرِفَتْ فَذَاكَ، وَإِلاَّ فَهِيَ لَكَ، فَلَمْ تُعْرَفْ، فَلَقِيَهُ بِهَا فِي الْعَامِ الْمُقْبِلِ فِي الْمَوْسِمِ، فَذَكَرَهَا لَهُ، فَقَالَ عُمَرُ: هِيَ لَكَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَمَرَنَا بِذَلِكَ، قَالَ: لاَ حَاجَةَ لِي بِهَا، فَقَبَضَهَا عُمَرُ، فَجَعَلَهَا فِي بَيْتِ الْمَالِ»[٣].

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

واتە: لە عەمرِ و عاصمەوە کە دوو کوڕی سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعەی ثەقەفی گێڕدراوەتەوە، وتویانە: سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵا جانتایێکی جل و بەرگی دۆزیەوە و بردی بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، عومەریش وتی: ساڵێک بانگەوازی بۆ بکە، جا ئەگەر زانرا هی کێیەو (خاوەنەکەی پەیابوو) ئەوە تەواو، ئەگەرنا ئەوە بۆ تۆیە (دەبێتە هی خۆت)، جا نەزانرا و (خاوەنەکەی پەیا نەبوو) و سوفیان بۆ ساڵی داهاتوو بە جانتاکەوە گەیشت بە عومەر لە کاتی حەجدا و بۆ عومەری باس کرد کە خاوەنەکەی نەزانرا، عومەریش وتی: بۆ تۆیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە پێ کردووین، سوفیان وتی: هیچ پێویستییێکم پێی نیە، جا عومەر وەری گرت و لە ماڵی گشتی مسوڵمانان داینا.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە هەڵگرتنەوەی شتی ونبوی حاجیان

٢٦٥٠ - «حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ عَامَ فُتِحَتْ مَكَّةُ، قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ، وَسَلَّطَ عَلَيْهِمْ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَالْمُؤْمِنِينَ. أَلاَ وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَلاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِي، أَلاَ وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ، لاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا، وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلاَ تُلْتَقَطُ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: لەو ساڵەی مەککە ئازادکرا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە و فەرمووی: بێگومان خوا ڕێگری لە فیل کرد بۆ مەککە (بۆ ڕوخاندنی)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕوادارانی بەسەر زاڵ کردن (واتە: بەسەر ئەهلی مەککە)، ئاگاداربن ئەوە بۆ هیچ کەسێکی پێشی من حەڵاڵ نەبووە، وە بۆ هیچ کەسێکی دوای من حەڵاڵ نیە، ئاگاداربن لەو کاتەوە حەرامە نە پاوانی دەبڕێت و، نە دارەکانی دەبڕێن و، نە شتە کەوتوو و ونبوەکانیشی هەڵدەگیرێنەوە تەنها بۆ کەسێک نەبێت کە بەردەوام بانگەوازی بۆ بکات و (بە هیچ شێوەیەک نەبێت بە هی خۆی).

## بابەت: دەربارەی شتی ونبوو

٢٦٥١ - «عَنِ الْجَارُودِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ»[٢].

واتە: لە جارودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شتی بزربووی کەسی مسوڵمان بریتیە گڕو تینی ئاگر (بۆ ئەو کەسەی هەڵی بگرێتەوە بەنیازی خیانەت و خواردنی).

٢٦٥٢ - «عَنِ الْجَارُودِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ، ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ، ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ، لاَ تَقْرَبَنَّهَا، قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، اللُّقَطَةُ نَجِدُهَا، قَالَ: أَنْشِدْهَا وَلاَ تَكْتُمْ، وَلاَ تُغَيِّبْ، وَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا، فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ، وَإِلاَّ فَمَالُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە جارودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شتی بزربووی مسوڵمان گڕو تینی ئاگرە، شتی بزربووی مسوڵمان گڕو تینی ئاگرە، شتی بزربووی مسوڵمان گڕو تینی ئاگرە، نزیکی نەکەونەوە، دەڵێ: پیاوێکیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی کەوتوو دەدۆزینەوە (ئەی چی لێ بکەین)؟ فەرمووی: بانگەوازی بۆ بکە و خۆت بێ دەنگ مەکە و مەیشارەوە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە، وە ئەگەر خاوەنەکەی نەدۆزرایەوە ئەوە ماڵی خوایە دەیدات بە هەر کەسێک کە بیەوێ (واتە: خوا داویەتی بە تۆ).

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی ماڵی مسوڵمان دادەبڕێت بۆ خۆی بە هۆی سوێندەکەی

٢٦٥٣ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَإِنْ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ»[1].

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک هەق و ماڵی کەسێکی مسوڵمان داببڕێت و (لێی زەوت بکات) بە هۆی سوێندخواردنەکەی، ئەوە خوا ئاگری بۆ واجب کردوە و، بەهەشتیشی لەسەر حەرام کردوە، جا پیاوێک پێی وت: ئەدی ئەگەر شتێکی کەم بێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەرچی لکە دارێکی ئەڕاک بێت (واتە: لکێک لەو دارەی کە بۆ سیواک بەکاردێت و نرخەکەی زۆر کەمە).

٢٦٥٤ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَخَاهُ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، يُحَدِّثُ أَنَّ أَبَا أُمَامَةَ الْحَارِثِيَّ ﷺ، حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[2].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی سوێندی درۆ

٢٦٥٥ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ هُمْ خَابُوا وَخَسِرُوا؟ فَأَعَادَهَا، فَقُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: الْمُسْبِلُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ كَاذِبًا»[3].

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سێ کەس هەن خوا قسەی (بەڕەحمەتیان) لەگەڵ ناکات و، (بە چاوی ڕەحمەتیش) سەیریان ناکات و، (لە تاوانیش) پاکیان ناکاتەوە و، سزای بە ئێشیشیان بۆ هەیە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە کێن ماڵ وێران و خەسارەتمەند بوون؟ ئەویش دووبارەی کردەوە، منیش وتم: ئەمانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو کەسەی جلی درێژ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دەکات و لەدوای دەخشێ لەبەر فیز و کەشخە، ئەو کەسەی منەت دەکات و، ئەو کەسەی شتومەک و کەلوپەلەکانی پڕ فرۆش دەکات بە سوێندی درۆ.

## بابەت: ئەو کەسەی بستێک لە زەوی زەوت بکات

٢٦٥٦ - «أَنَّ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأَرْضِ شِبْرًا، فَإِنَّهُ يُطَوَّقُهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ»[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بستێک ستەم بکات لە زەوی و زار و داگیری بکات، ئەوە هەر حەوت چینەکانی زەوی دەخرێتە گەردەنی.

## بابەت: هەر کەسێک زەوییەکی مردوو (بێ خزمەت) زیندوو بکاتەوە (بە داچاندنی بەروبووم و زەویەکەش هی کەس نەبێت) ئەوە بۆ ئەوە

٢٦٥٧ - «أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قال: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَلَهُ فِيهَا أَجْرٌ وَمَا أَكَلَتِ الْعَافِيَةُ مِنْهَا، فَلَهُ فِيهَا صَدَقَةٌ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الْعَافِيَةُ: الطَّيْرُ وَغَيْرُ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک زەوییەکی مردووی بێ خزمەت زیندوو بکاتەوە و (دایبچێنێت) ئەوە پاداشتی تیادا بۆ هەیە، وە هەر باڵندە و شتێک و کەسێک لێی بخوات ئەوە پاداشتی تیادا بۆ هەیە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: واتە: باڵندە و شتی تر.

## بابەت: دەربارەی پێدانی زەوی (بۆ ئاوەدان کردنەوە و داچاندن)

٢٦٥٨ - «عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ ﷺ قال: أَنَّهُ اسْتَقْطَعَ الْمِلْحَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ الَّذِي يُقَالُ لَهُ مِلْحُ سدِّ مَأْرِبَ فَأَقْطَعَهُ، ثُمَّ إِنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ التَّمِيمِيَّ قَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنِّي قَدْ وَرَدْتُ الْمِلْحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَهُوَ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مَاءٌ، وَمَنْ وَرَدَهُ، أَخَذَهُ، وَهُوَ مِثْلُ مَاءِ الْعِدِّ. فَاسْتَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ الأَبْيَضَ فِي قَطِيعَتِهِ فِي الْمِلْحِ. فَقُلْتُ: قَدْ أَقَلْتُهُ عَلَى أَنْ تَجْعَلَهُ مِنِّي صَدَقَةً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ مِنْكَ صَدَقَةٌ، وَهُوَ مِثْلُ مَاءِ الْعِدِّ، مَنْ وَرَدَهُ، أَخَذَهُ، قَالَ: وَقَطَعَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَرْضًا وَنَخْلاً كَذَا بِالْجَوْفِ: جَوْفِ مُرَادٍ مَكَانَهُ حِينَ أَقَالَهُ مِنْهُ قَالَ الْفَرَجُ: فَهُوَ عَلَى ذَلِكَ: مَنْ وَرَدَهُ، أَخَذَهُ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ حسن.

واتە: لە ئەبیەضی کوڕی حەممالەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆی داوای ناوچەیەکی خوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە پێی دەوترا: خوێی سەددی مەئرەب، ئەویش پێیدا، دواتر ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە سەردەمی نەفامی چووم بۆ سەر ئەو خوێیە، ئەوە لە شوێنێکە هیچ ئاوێکی لێ نیە و، هەر کەسێکیش بچێتە سەری لێی دەبات و، وەک ئاوی بەردەوام وایە (هەموو خەڵک سودی لێ دەبینێ و موڵکی گشتیە)، پێغەمبەری خواش ﷺ داوای لە ئەبیەض کرد پەشیمان بوونەوەی لێ قبوڵ بکات لە پێدانی ناوچەی خوێیەکە، (ئەبیەض دەڵێ) منیش وتم: ئەوە قەبوڵم کرد لەسەر ئەوەی کە لە منەوە وەریبگریتەوە و بیکەیتە صەدەقە (تا خێرێکم پێ ببرێت)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لەتۆوە صەدەقە و خێرە و، وەک ئاوی بەردەوام وایە، هەر کەسێک بچێتە سەری لێی دەبات و سودی لێ دەبینێت (خێرەکەشی بۆ تۆ دەنوسرێت)، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ خورما و زەوییەکی پێدا لە جەوف، واتە: جەوفی موراد (کە شوێنێکە لە مەدینە) لە جێگەی زەوی خوێیەکە، کاتێ زەویەکەی دایەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و پەشیمان بوونەوەکەی لێ قبوڵ کرد.

٢٦٥٩ - «عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَقْطَعَهُ أَرْضًا قَالَ: فَأَرْسَلَ مَعِي مُعَاوِيَةَ قَالَ: أَعْطِهَا إِيَّاهُ»[١].

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، (وتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ زەوییەکی پێدا (بۆ بوژاندنەوە)، دەڵێ: جا موعاویەی لەگەڵ ناردم، (بە موعاویەی) فەرمووی: پێی بدە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی دار چاندن

٢٦٦٠ - «حَدَّثَتْنِي أُمُّ مُبَشِّرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، امْرَأَةُ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فِي حَائِطٍ لِي، فَقَالَ: يَا أُمَّ مُبَشِّرٍ، أَمُسْلِمٌ غَرَسَ هَذَا، أَمْ كَافِرٌ؟ قُلْتُ: مُسْلِمٌ، فَقَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا فَيَأْكُلُ مِنْهُ إِنْسَانٌ، أَوْ دَابَّةٌ، أَوْ طَيْرٌ، إِلاَّ كَانَتْ لَهُ صَدَقَةٌ»[٢].

واتە: ئوممو موبەششیرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، کە خێزانی زەیدی کوڕی حاریثەیە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام لە ناو باخەکەی خۆم فەرمووی: ئەی ئوممو موبەششیر، ئایا مسوڵمان ئەم باخەی چاندووە یان کافر؟ وتم: مسوڵمان، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: هەر مسوڵمانێک درەختێک بڕوێنێت و، مرۆڤێک یان ئاژەڵێک یان باڵندەیەک لێی بخوات (یان سود لە سێبەرەکەی ببینێت)، حەتمەن بۆی دەبێتە صەدەقە و خێر.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی شوڕە و توخوب

٢٦٦١ - «حدثنا الفرج بن سعيد أَخْبَرَنِي عَمِّي ثَابِتُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ سَعِيدٍ، عَنْ جَدِّهِ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ حِمَى الأَرَاكِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ حِمَى فِي الأَرَاكِ فَقَالَ: أَرَاكَةٌ فِي حِظَارِي؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ حِمَى فِي الأَرَاكِ، قَالَ فَرَجٌ: يَعْنِي ابن أَبْيَضَ: بِحِظَارِي: الأَرْضَ الَّتِي فِيهَا الزَّرْعُ الْمُحَاطُ عَلَيْهَا»[1].

واتە: لە فەڕەجی کوڕی سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ثابیتی کوڕی سەعیدی مامم بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە سەعیدی باوکیەوە و لە ئەبیەضی کوڕی حەممالی باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: خۆی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی توخوبی داری ئەڕاک (کە لەناو ئەو زەویە ڕوابوو کە پێی درابوو تاوەکو بیبوژێنێتەوە بە دانەوێڵە)؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: شوڕە و توخوب لە داری ئەڕاکدا نیە (واتە: هەموو خەڵک پێویستیانە دەبێ موڵکی گشتی بێت)، ئەویش وتی: داری ئەڕاک لەناو شوڕەی من بێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: شوڕە و توخوب لە داری ئەڕاکدا نیە.

فەڕوج واتە: نەوەی ئەبیەض وتویەتی: (بِحِظَارِي) واتە: ئەو زەویەی دەغڵی تیایە و شوڕەی بۆ کراوە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە فرۆشتنی ئاو

٢٦٦٢ - «عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ، قَالَ: سَمِعْتُ إِيَاسَ بْنَ عَبْدٍ الْمُزَنِيَّ ﷺ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَبِيعُوا الْمَاءَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَنْهَى عَنْ بَيْعِ الْمَاءِ وَ، قَالَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ: لاَ نَدْرِي أَيَّ مَاءٍ؟ قَالَ: يَقُولُ: لاَ أَدْرِي مَاءً جَارِيًا، أَوِ الْمَاءَ الْمُسْتَقَى؟»[2].

واتە: لە ئەبو مینهالەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیاسی کوڕی عەبدوڕڕەحمان بوو ـ کە یەکێک بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتویەتی: ئاو مەفرۆشن، من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو نەهی دەکرد لە فرۆشتنی ئاو، جا عەمری کوڕی دینار وتویەتی: نازانین کام ئاوەیە؟ دەڵێ: دەیوت: نازانین ئاوی لەبەر ڕۆیشتووە یان ئاوی هەڵێنجراوە؟

تێبینی: فرۆشتنی ئاو ئەگەر لە موڵکی کەسەکە بێت و خۆی بیری هەڵکەندبێت، ئەوە دەبێتە موڵکی ئەو و بۆی هەیە بیفرۆشێت، بەڵام لە موڵکی گشتی بۆی نیە.

---

(١) ـ حسن لغيره.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو شتەی دروست نیە قەدەغە بکرێت

٢٦٦٣ - «عَنْ بُهَيْسَةَ، عَنْ أَبِيهَا ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَاسْتَأْذَنَهُ فَدَخَلَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَمِيصِهِ - وَقَدْ قَالَ عُثْمَانُ: فَالْتَزَمَهُ - فَقَالَ: مَا الشَّيْءُ الَّذِي لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ فَقَالَ: الْمِلْحُ وَالْمَاءُ. قَالَ: مَا الشَّيْءُ الَّذِي لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: إِنْ تَفْعَلِ الْخَيْرَ خَيْرٌ لَكَ. قَالَ: مَا الشَّيْءُ الَّذِي لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: إِنْ تَفْعَلِ الْخَيْرَ خَيْرٌ لَكَ وَانْتَهَى إِلَى الْمِلْحِ وَالْمَاءِ قِيلَ لِعَبْدِ اللهِ: تَقُولُ بِهِ؟ فَأَوْمَأَ بِرَأْسِهِ»[1].

واتە: لە بوهەیسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، کە چۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای ئیزنی لێ کردوە (بەوەی دەست بدات لە جەستەی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ و باوەشی تێبکات بۆ بەرەکەت)، جا چووە نێوانی پێغەمبەری خوا ﷺ و قەمیسەکەی ـ جا عوثمان وتویەتی: باوەشی تێکرد (لە ژێر قەمیسەکەی) و ـ وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەو شتە چیە کە دروست نیە قەدەغە بکرێت؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: خوێ و ئاو، (ئەویش دووبارە) وتی: ئەو شتە چیە کە دروست نیە قەدەغە بکرێت؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر کاری چاک بکەیت بۆ خۆت باشە، (ئەویش دیسان) وتی: ئەو شتە چیە کە دروست نیە قەدەغە بکرێت؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر کاری چاک بکەیت بۆ خۆت باشە، هەر بۆ خوێ و ئاو چوو (ئەو خوێ و ئاوەی موڵکی گشتیە نەک تایبەت).

بە عەبدوڵلا وترا: ئەوە وەردەگری؟ ئەویش بە سەری ئاماژەی کرد (واتە: بەڵێ وەریدەگرم).

## بابەت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵکی خەیبەر پێکهات لەسەر باغەوانی

٢٦٦٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، عَامَلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ أَوْ زَرْعٍ»[2].

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵکی خەیبەر پێکهات کە باغەکانی بۆ ئاو بدەن و پەروەردەی بکەن و (باغەوانی بۆ بکەن) بە نیوەی ئەو بەرهەمەی لێی دەردەچێ لە میوە و دانەوێڵە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە باغەوانی

٢٦٦٥ - «حَدَّثَنَا أَبُو الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا ﷺ، يَقُولُ: كُنَّا نُخَابِرُ قَبْلَ أَنْ يَنْهَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْخِبْرِ بَسَنَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثٍ، عَلَى الثُّلُثِ، وَالشَّطْرِ، وَشَيْءٍ مَنْ تِبْنٍ. فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَحْرُثْهَا، فَإِنْ كَرِهَ أَنْ يَحْرُثَهَا، فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ، فَإِنْ كَرِهَ أَنْ يَمْنَحَهَا أَخَاهُ، فَلْيَدَعْهَا»[3].

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە گوێی لە جابیر بوو ﷺ دەیوت: ئێمە باغەوانیمان دەکرد پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیمان لێ بکات لە باغەوانی بە دوو ساڵ یان سێ، لەسەر سێیەک و نیوەی بەرهەمەکە و شتێک لە قەرسیل، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموویین: هەر کەسێک زەوی هەیە با بیکێڵێت، جا ئەگەر پێی خۆش نەبوو خۆی بیکێڵێت، ئەوە با بیدات بە براکەی (با مسوڵمانێک بۆ خۆی بیکێڵێت و سوودی لێ ببینێت)، جا ئەگەر پێی خۆش نەبوو بیدات بە براکەی، ئەوە با وازی لێ بهێنێت.

## بابەت: دەربارەی سەپانی بە نیوە تۆ یان بە بنەتۆ بە سێیەک و چواریەک

٢٦٦٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَعْقِلٍ، عَنِ الْمُزَارَعَةِ فَقَالَ: أَخْبَرَنِي ثَابِتُ بْنُ الضَّحَّاكِ الأَنْصَارِيُّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَارَعَةِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی سائیبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی مەعقەل کرد دەربارەی سەپانی بە بنەتۆ، ئەویش وتی: ثابیتی کوڕی ضەححاکی ئەنصاری ﷺ پێی ڕاگەیاندووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە سەپانی بنەتۆ.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە بەکرێدانی زەوی بۆ چەند ساڵێک

٢٦٦٧ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الأَرْضِ الْبَيْضَاءِ سَنَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا»[٢].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی زەوی ڕووت و بێ دارو دەغڵ بۆ دوو ساڵ، یان سێ ساڵ.

## بابەت: دەربارەی ڕوخسەت و مۆڵەتدان بە بەکرێدانی زەوی بە زێڕ و زیو (بە پارە)

٢٦٦٨ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِمَا عَلَى السَّوَاقِي مِنَ الزَّرْعِ، وَبِمَا سَعِدَ مِنَ الْمَاءِ مِنْهَا، فَنَهَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ ذَلِكَ، وَأَذِنَ لَنَا - أَوْ قَالَ رَخَّصَ لَنَا - فِي أَنْ نُكْرِيَهَا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ»[٣].

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەویمان بە کرێ دەدا بەوەی ئەوەی کەوتۆتە لێواری ڕووبار و ئاوی بەسەردا دەڕوات بۆ خاوەن دەغڵەکە بێت (ئەوەی تریشی بۆ کابرا بێت کە بە کرێی دەگرتەوە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

نەهی لێ کردین لەوەدا (چونکە پشکەکە مەعلوم نەبوو و جاری وا هەبوو هی یەکێکیان لەناو دەچوو و زەرەر و ناڕوونی تیا بوو)، جا ئیزنی پێ داین - یان وتی: ڕوخسەتی داین ـ لەوەی بە کرێی بدەین بە زێڕ و زیو (واتە: فەرمووی: بەو شێوەیە حەڵاڵە کە لەسەر بەشێک لە پارەی دیاریکراو ڕێک بکەون، یان پشکێک دابنرێت کە مەعلوم بێت).

## بابەت: دەربارەی تەخمین و قرساندن

٢٦٦٩ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَسْعُودِ بْنِ نِيَارٍ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: جَاءَ سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، إِلَى مَجْلِسِنَا فَحَدَّثَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا خَرَصْتُمْ، فَخُذُوا وَدَعُوا، دَعُوا الثُّلُثَ، فَإِنْ لَمْ تَدَعُوا الثُّلُثَ، فَدَعُوا الرُّبُعَ»[١].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەسعودی کوڕی نیاری ئەنصاریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ هات بۆ مەجلیسی ئێمە و گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ تەخمین و قرساندنتان کرد (بۆ دانەوێڵە و شت) ئەوە وەربیگرن و وازیشی لێبێنن، واز لە سێیەک بێنن (حیسابی مەکەن)، جا ئەگەر وازتان لە سێیەکیش نەهێنا، ئەوە واز لە چواریەک هەر بێنن.

تێبینی: لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردوە کە کاتێ دەغڵ و دان و میوە تەخمین دەکرێت هەمووی حیساب نەکرێت، بەڵکو سێیەک یان چواریەک وازی لێ بهێنرێت لە حیساب کردندا، تاوەکو ئەوەندەی خەڵک دەیخۆن و خەسار دەبێت و باڵندە دەیخۆن و دەڕژێت نەبێتە زەرەر بەسەر خاوەنەکەی.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە کەسابەتی ئافرەتی کۆیلە

٢٦٧٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ كَسْبِ الإِمَاءِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە کار و کەسابەتی ئافرەتی کۆیلە (لەبەر ئەوەی نەوەک توشی کاری خراپ بن، چونکە خەڵک دەسەڵاتی بەسەردا دەشکان).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە کەسابەتی کەڵەشاخکار (حیجامەکار)

٢٦٧١ - «أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، حَدَّثَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: كَسْبُ الْحَجَّامِ خَبِيثٌ، وَمَهْرُ الْبَغِيِّ خَبِيثٌ، وَثَمَنُ الْكَلْبِ خَبِيثٌ»[٣].

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسابەتی کەڵەشاخکار پیسە (پارەکەی حەڵاڵ نیە)، وە کرێی ئافرەتی زیناکار پیس و حەڕامە، وە پارەی سەگ فرۆشتنیش پیس و حەڕامە.

تێبینی: ئەو بەشەی لە فەرموودەکە باسی کەڵەشاخکار دەکات حوکمەکەی هەڵوەشاوەتەوە بە فەرموودەی داهاتوو.

## بابەت: دەربارەی ڕوخسەتدان بە کەسابەت و کرێی کەڵەشاخکار (حیجامەکار)

٢٦٧٢ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ وَأَمَرَ لَهُ بِصَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ»[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو تەیبە حیجامەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمانی کرد دوو صاع لە خواردنی پێ بدرێت (وەک پاداشت و کرێی کارەکەی).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە تۆوی نێرەی ئاژەڵ و پەڕاندنی نێرە

٢٦٧٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَنْ ثَمَنِ عَسْبِ الْفَحْلِ»[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە پارەی تۆوی ئاژەڵی نێرە، یان پارە و کرێی پەڕاندنەکەی بۆ سەر مێیە.

٢٦٧٤ - «قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ، وَأَجْرِ الْمُومِسَةِ»[3].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە پارەی تۆوی ئاژەڵی نێرە، یان پارەی کرێی پەڕاندنەکەی بۆ سەر مێیە و، کرێی ئافرەتی زیناکار.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی خانوێک دەفرۆشێت و پارەکەی لە خانوێکیتر سەرف ناکات

٢٦٧٥ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ حُرَيْثٍ ﷺ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ بَاعَ مِنْكُمْ دَارًا أَوْ عَقَارًا، فإنَّه قَمِنٌ أَنْ لاَ يُبَارَكَ لَهُ إلاَّ أَنْ يَجْعَلَهُ فِي مِثْلِهِ»[4].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن.

واتە: لە سەعیدی کوڕی حورەیثەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە ـ کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە ﷺ ـ وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک لە ئێوە خانوێک یان زەوییێک بفرۆشێت، ئەوە هەقیەتی بەرەکەتی بۆ نەخرێتە پارەکەوە تەنها ئەگەر پارەکە بخاتە هاوشێوەکەی (واتە: خانوێکی تر یان زەوییێکی تری پێ بکڕێتەوە، چونکە زەوی و خانوو پێویستییێکی گرنگە و پارەکەی نادزرێت و نافەوتێت و سەرف ناکرێت، بەڵکو هەر دەمێنێت و پارەی خۆی دەکات و بەرەکەتی زیاترە).

## بابەت: دەربارەی سنوری بیر

٢٦٧٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ احْتَفَرَ بِئْرًا، فَلَيْسَ لأَحَدٍ أَنْ يَحْفِرَ حَوْلَهُ أَرْبَعِينَ ذِرَاعًا عَطَنًا لِمَاشِيَتِهِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک بیرێک هەڵکەنێت (لە زەوییێک کە موڵکی کەس نەبێت)، ئەوە بۆ کەس نیە لە چواردەوری بیرەکەی بە ئەندازەی چل باڵ (چل ذيراع) بیر هەڵکەنێت، یان بیکاتە مۆڵگەی ئاژەڵەکانی.

## بابەت: دەربارەی شوفعە

٢٦٧٧ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فِي الشُّفْعَةِ إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا؟ قَالَ: يُنْظَرُ بِهَا، وَإِنْ كَانَ صَاحِبُهَا غَائِبًا»[٢].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە دەربارەی شوفعە کاتێ دوو شەریکەکە ڕێگایان یەکە؟ فەرموویەتی: تاخیر دەکرێت و چاوەڕێ دەکرێت (تا بزانرێت شەریکەکەی تر ڕازیە)، هەرچەندە شەریک و هاوەڵەکەشی ئامادە نەبێت و غائیب بێت (هەر دەبێ چاوەڕێی بکەن).

تێبینی: شوفعە: بریتیە لە هەقی سەندنەوەی شتێکی فرۆشراو بە کەسێکی بێگانە لەلایەن شەریکەکەی، چونکە ئەم شەریکە هەقی خۆیەتی کەسێک نەبێتە شەریکی ڕێگا و ماڵ و کۆڵان و هەر بابەتێکی تر کە تێکەڵی تێدابێت و ترسی ئەوەی لێ بکرێت ناڕەحەت بکرێت.

٢٦٧٨ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شِرْكٍ لَمْ يُقْسَمْ: رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ شَاءَ، أَخَذَ، وَإِنْ شَاءَ، تَرَكَ، فَإِنْ بَاعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ، قِيلَ لأَبِي مُحَمَّدٍ: تَقُولُ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعم»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن لغيره.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكنا الحديث صحيح.

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری بە شوفعەدا لە گشت پشکێک و شەریکایەتییێک کە دابەش نەکرێت و لێک جیانەبێتەوە (پەیوەندییێک هەر بمێنێ، وەک): خانوو یان دیوار، بۆ شەریک دروست نیە بیفرۆشێت تاوەکو پرس و مۆڵەت وەرنەگرێت لە شەریکەکەی، جا (شەریکەکەی) ئەگەر ویستی بۆ خۆی هەڵیدەگرێتەوە، وە ئەگەر (ویستی مۆڵەتی بدات) ئەوە وازی لێ دەهێنێت (بۆ خۆی هەڵیناگرێتەوە)، جا ئەگەر شەریکەکەی فرۆشتی و پرسی پێ نەکرد، ئەوە (شەریکە پرس پێنەکراوەکە) شایستەتر و ئەهەقترە بەماڵەکە (بۆیە دەتوانێ مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە و بۆ خۆی هەڵی بگرێتەوە).

بە ئەبو موحەممەد وترا: فەتوا بەوە دەدەیت؟ وتی: بەڵێ.

## بابەت: داوای مۆڵەتکردن سێ جارە

٢٦٧٩ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ ﷺ، اسْتَأْذَنَ عَلَى عُمَرَ ﷺ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَرَجَعَ، فَقَالَ: مَا رَجَعَكَ؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا اسْتَأْذَنَ الْمُسْتَأْذِنُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ: فَإِنْ أُذِنَ لَهُ وَإِلاَّ، فَلْيَرْجِعْ « فَقَالَ: لَتَأْتِيَنِّ بِمَنْ يَشْهَدُ مَعَكَ، أَوْ لأَفْعَلَنَّ، وَلأَفْعَلَنَّ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: وأَتَانَا وَأَنَا فِي قَوْمٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، وَهُوَ فَزِعٌ مِنْ وَعِيدِ عُمَرَ إِيَّاهُ، فَقَامَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: أَنْشُدُ اللهَ مِنْكُمْ رَجُلاً سَمِعَ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلاَّ شَهِدَ لِي بِهِ. قَالَ: فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَقُلْتُ: أَخْبِرْهُ أَنِّي مَعَكَ عَلَى هَذَا. وَقَالَ ذَاكَ آخَرُونَ، فَسُرِّيَ عَنْ أَبِي مُوسَى»(١).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ سێ جار لە دەرگای ماڵی عومەریدا ﷺ داوای مۆڵەتی چوونە ژورەوەی کرد و مۆڵەتیان نەدا و گەڕایەوە، (جا دوای ئەوەی هەندێک دوورکەوتەوە عومەر دەرگەی کردەوە) و وتی: چی تۆی گەڕاندەوە (بۆ لە دەرگا دەدەیت و دواتریش دەڕۆیت)؟ ئەبو مووساش وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کاتێ کەسێک داوای مۆڵەت دەکات و (لە دەرگا دەدات) سێ جار: جا ئەگەر مۆڵەتیان پێدا و (دەرگایان کردەوە، ئەوە باشە)، ئەگەرنا با بگەڕێتەوە، عومەریش وتی: دەبێ کەسێک بهێنیت لەگەڵ تۆ شاهێدی بدات کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرمووە یانیش ئاوا و ئاوات لێ دەکەم (هەڕەشەی لێکرد)، ئەبو سەعید دەڵێ: ئەبو موسا هات بۆ لامان لەکاتێکدا من لەناو کۆمەڵە خەڵکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە مزگەوت، لەکاتێکدا زۆر ترسا بوو لە هەڕەشەکەی عومەر، جا لەلامان وەستا و وتی: داواتان لێ دەکەم لەبەر خاتری خوا پیاوێک لە ئێوە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووبێ حەتمەن دەبێ شاهێدیم بۆ بدات، ئەبو سەعید دەڵێت: منیش سەرم بەرز کردەوە و وتم: بە عومەر ڕابگەیەنە من لەگەڵتم لەسەر ئەو بابەتە و ئەمانەش (لە هاوەڵان لە گەڵتن)، جا ئەبو موسا ترسی نەما.

## بابەت: مۆڵەت چۆنە؟

٢٦٨٠ - «عن محمد بن المنكدر قال: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَضَرَبْتُ بَابَهُ، فَقَالَ: مَنْ ذَا؟. فَقُلْتُ: أَنَا. فقَالَ: أَنَا؟ أَنَا؟ فَكَرِهَ ذَاكَ»(٢).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا بوو (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتی: چووم بۆ لای (ماڵی) پێغەمبەری خوا ﷺ و لە دەرگای ماڵەکەمدا و فەرمووی: ئەوە کێیە؟ منیش وتم: منم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منم؟! منم؟!، ئەوەی پێ خۆش نەبوو (چونکە ئەوە نابێتە خۆناساندن).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەهی كردن لەوەی پیاو بە شەو بگەڕێتەوە لای خێزانەكەی

٢٦٨١ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ لَيْلاً، أَوْ يُخَوِّنَهُمْ، أَوْ يَلْتَمِسَ عَثَرَاتِهِمْ»[١].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵلاوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لەوەی پیاو بە شەو بچێتەوە لای خێزانەكەی (كاتێ لە سەفەر دەگەڕێتەوە)، یان بە خیانەت كردن تۆمەتباریان بكات و دڵ پیسیان لێ بكات، یان بەدوای هەڵەو عەیبیاندا بگەڕێت.

## بابەت: دەربارەی سەلام كردن

٢٦٨٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، اسْتَشْرَفَهُ النَّاسُ، فَقَالُوا: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ: فَخَرَجْتُ فِيمَنْ خَرَجَ، فَلَمَّا رَأَيْتُ وَجْهَهُ، عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ. فَكَانَ أَوَّلَ مَا سَمِعْتُهُ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَفْشُوا السَّلاَمَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصِلُوا الأَرْحَامَ، وَصَلُّوا وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلاَمٍ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی سەلامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە (بۆ یەكەم جار)، خەڵک دەرچوون بۆ لای و وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ هات، دەڵێ: منیش دەرچووم بۆ لای (پێغەمبەری خوا ﷺ) لەگەڵ ئەوانەی دەرچوون، جا كاتێک ڕوخسارم بینی، زانیم ڕوخسارەكەی ڕوخساری هی درۆزن نیە، وە یەكەم شت كە لێوەی گوێم لێ بوو ئەوە بوو دەیفەرموو: ئەی خەڵكینە سەلام كردن و ئاشتەوایی بڵاو بكەنەوە (لەناو یەكتریدا)، وە خواردن ببەخشن، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنن، وە شەونوێژ بكەن لەكاتێكدا كە خەڵک خەوتووە، (ئەگەر واتان كرد) دەچنە بەهەشت بە سەلامەتی.

## بابەت: دەربارەی هەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان

٢٦٨٣ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِلْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ: يُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِذَا لَقِيَهُ، وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ، وَيَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيَشْهَدُهُ إِذَا تُوُفِّيَ، وَيُحِبُّ لَهُ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ، وَيَنْصَحُ لَهُ بِالْغَيْبِ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەشە: دەبێ سەلامی لێ بکات کاتێ پێی گەیشت، وە بڵێت (یرحمک الله) کاتێ دەپشمێت، وە سەردانی بکات کاتێ نەخۆش دەکەوێت، وە وەڵامی داوەتنامەکەی بداتەوە کاتێ داوەتی کرد، وە ئامادەی جەنازەکەی بێت کاتێ وەفات دەکات، وە ئەو شتەی بۆ برای مسوڵمانی پێ خۆش بێت کە بۆ خۆی پێی خۆشە، وە بە تەنهاش (دوور لە چاوی خەڵک) ئامۆژگاری بکات (کاتێ هەڵەیەک دەکات).

## بابەت: دەربارەی سەلام کردنی کەسی بە سواری لە کەسی بە پیادە

٢٦٨٤ - «عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْقَائِمُ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»[١].

واتە: لە فەضالەی کوڕی عوبەیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کەسی بە سواری سەلام دەکات لە کەسی بە پیادە و، کەسی وەستا و سەلام دەکات لە کەسی دانیشتوو و، کۆمەڵی کەم سەلام دەکەن لە کۆمەڵی زۆر.

## بابەت: دەربارەی وەڵامدانەوەی سەلامی ئەهلی کیتاب

٢٦٨٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الْيَهُودَ إِذَا سَلَّمَ أَحَدُهُمْ، فَإِنَّمَا يَقُولُ: السَّامُ عَلَيْكَ، قُلْ: عَلَيْكَ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جولەکەکان کاتێ هەر یەکێکیان سەلام دەکات دەڵێت: (السام علیکم) واتە: مردنتان توش بێت و بمرن، (تۆش) بڵێ: لەسەر تۆش.

## بابەت: دەربارەی سەلام کردن لە منداڵان

٢٦٨٦ - «عَنْ سَيَّارٍ، قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَحَدَّثَ ثَابِتٌ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ أَنَسٍ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَحَدَّثَ أَنَسٌ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ»[٣].

واتە: لە سەییارەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ ثابیتی بوونانی دەڕۆیشتم، جا بەلای منداڵاندا تێپەڕ دەبوو سەلامی لێدەکردن و ثابیت گێڕایەوە کە لەگەڵ ئەنەس بووە و بەلای منداڵاندا تێپەڕ بووە و سەلامی لێکردوون، وە ئەنەسیش گێڕاویەتیەوە کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووە و بەلای منداڵاندا تێپەڕ بووە و سەلامی لێکردوون.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.




## بابەت: دەربارەی سەلام کردن لە ئافرەتان

٢٦٨٧ - «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ - إِحْدَى نِسَاءِ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ - أَنَّهَا بَيْنَا هِيَ فِي نِسْوَةٍ مَرَّ عَلَيْهِنَّ النَّبِيُّ ﷺ فَسَلَّمَ عَلَيْهِنَّ»(١).

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی سەکەنەوە گێڕدراوەتەوە ـ کە یەکێکە لە ئافرەتانی بەنی ئەشهەل ـ وتویەتی: خۆی لەکاتێکدا لەناو کۆمەڵە ئافرەتێک بووە، پێغەمبەری خواش ﷺ بەلایان تێپەڕ بووە و سەلامی لێکردوون.

## بابەت: کاتێ سەلام بە کەسێک دەگەیەنرێ چۆن وەڵام دەداتەوە؟

٢٦٨٨ - «أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا عَائِشُ، هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ، قَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ. قَالَتْ: وَهُوَ يَرَى مَا لاَ أَرَى»(٢).

واتە: لە عائیشەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی عائیش (لەبەر خۆشەویستی ناوەکەی تەواو نەوتووە تەنها فەرمویەتی عائیش) ـ ئەوە جیبریلە ﷺ سەلامت لێ دەکات، عائیشە وتی: (وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیبینی من نەمدەبینی (بۆیە من بە زەمیری غائیب سەلامەکەم وەڵام دایەوە).

## بابەت: دەربارەی وەڵامدانەوەی سەلام

٢٦٨٩ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَتَيْتُهُ حِينَ قَضَى صَلاَتَهُ، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ حَيَّا بِتَحِيَّةِ الإِسْلاَمِ. قَالَ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ، مِمَّنْ أَنْتَ؟، قَالَ: قُلْتُ: مِنْ غِفَارٍ. قَالَ: فَأَهْوَى بِيَدِهِ. قُلْتُ فِي نَفْسِي: كَرِهَ أَنِّي انْتَمَيْتُ إِلَى غِفَارٍ»(٣).

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد و، منیش چووم بۆ لای کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، جا من یەکەم کەس بووم کە سەلامی ئیسلامم جێبەجێ کرد و (سەلامم لێ کرد)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (عَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ) تۆ لە چ هۆزێکی؟ وتم: لە غیفارم، ئەویش دەستی بە خۆیدا شۆڕکردەوە، لە دڵی خۆم وتم: پێی ناخۆش بووە کە من لە هۆزی غیفارم.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سەلام کردن و وەڵامدانەوەی

٢٦٩٠ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ عَلَيْهِ وَقَالَ: عَشْرٌ. ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ فَسَلَّمَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَقَالَ: عِشْرُونَ. ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ فَسَلَّمَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَرَدَّ عَلَيْهِ وَقَالَ: ثَلَاثُونَ»[١].

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا و ﷺ وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ) پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و فەرمووی: دە، دواتر پیاوێکی تر هات و سەلامی کرد و وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و فەرمووی: بیست، دواتر پیاوێکی تر هات و سەلامی کرد و وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و فەرمووی: سی (واتە: بە پێی کاملّی وشەکانی سەلام خێریان بۆ دەنوسرێ).

## بابەت: کاتێ سەلام لە کەسێک دەکرێت لەکاتێکدا لەسەرئاوە

٢٦٩١ - عَنْ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ ﷺ: أَنَّهُ سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَبُولُ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ حَتَّى تَوَضَّأَ، فَلَمَّا تَوَضَّأَ، رَدَّهُ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: لە وەهاجیری کوڕی قونفوذەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەلامم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە لەکاتێکدا لەسەرئاو بووە، جا سەلامەکەی وەڵام نەداوەتەوە تاوەکو دەستنوێژی شۆردووە، جا کاتێ دەستنوێژی شۆرد سەلامەکەی وەڵام دایەوە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە چونە لای ئافرەتان (بە تەنها)

٢٦٩٢ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَا تَدْخُلُوا عَلَى النِّسَاءِ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِلاَّ الْحَمْوُ. قَالَ: الْحَمْوُ: الْمَوْتُ قَالَ يَحْيَى: الْحَمْوُ يَعْنِي: قَرَابَةَ الزَّوْجِ»[٣].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەچونە لای ئافرەتان، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (مەبەستت) جگە لە خزمانی پیاوەکەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خزمانی مێردەکەی هەر مردنە (واتە: جاری وا هەیە کارەساتی کوژرانی لێ دەکەوێتەوە، یان مەبەستی ئەوەیە بمرێت باشترە نەک شتی وا بکات، یان مەبەستی ئەوەیە دوعای لێ بکات بەوەی: دەک بمرێت چۆن شتی وا دەکات).

یەحیا وتویەتی: (الْحَمْوُ) واتە: خزمانی مێرد.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نەزەری لەناکاو

٢٦٩٣ - «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ نَظْرَةِ الْفَجْأَةِ؟ فَقَالَ: اصْرِفْ بَصَرَكَ»[١].

واتە: لە جەریرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی نەزەری لەناکاو؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: چاوت لادە (بۆ جاری دووەم).

## بابەت: دەربارەی دامێنی کراس و مەکسی ئافرەتان

٢٦٩٤ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ذَيْلِ الْمَرْأَةِ، فَقَالَ: شِبْرًا. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذَنْ تَبْدُوَ أَقْدَامُهُنَّ؟ قَالَ: قَدْرَ ذِرَاعٍ لاَ يَزِدْنَ عَلَيْهِ، قَالَ عَبْد اللهِ: النَّاسُ يَقُولُونَ: عَنْ نَافِعٍ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ»[٢].

واتە: لە ئوممو سەلەمەی (رَضِي اللهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی دامێنی کراسی ئافرەتان و فەرمووی: با بستێک بێت، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کات قاچەکانیان دەردەکەوێت؟ فەرمووی: با بە ئەندازەی باڵێک بێت و زیاتری نەکەن.

## بابەت: دەربارەی خراپی دەرخستنی شتی خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوە

٢٦٩٥ - «عَنْ أُخْتٍ لِحُذَيْفَةَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَتْ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، أَمَا لَكُنَّ فِي الْفِضَّةِ مَا تَحَلَّيْنَ بِهِ؟ أَمَا إِنَّهُ لَيْسَتْ مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تَحَلَّى الذَّهَبَ فَتُظْهِرَهُ، إلاَّ عُذِّبَتْ بِهِ»[٣].

واتە: لە خوشکێکی حوذەیفەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَما)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان مەگەر لە زیودا بۆتان نیە خۆتانی پێ برازێننەوە؟ ئاگاداربن هیچ ئافرەتێک لە ئێوە نیە خۆی بە زێڕ برازێنێتەوە و دەریبخات (بۆ سەرنج ڕاکێشان)، حەتمەن بەهۆیەوە سزا دەدرێت.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە گوڵاو کاتێ ئافرەت دەردەچێت

٢٦٩٦ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ، ثُمَّ خَرَجَتْ لِيُوجَدَ رِيحُهَا، فَهِيَ زَانِيَةٌ، وَكُلُّ عَيْنٍ زَانِيَةٌ وَقَالَ أَبُو عَاصِمٍ: يَرْفَعُهُ بَعْضُ أَصْحَابِنَا»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢)ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ حسن.

واتە: لە ئەبو موساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر ئافرەتێک خۆی بۆن خۆش بکات، دواتر بچێتە دەرەوە تاوەکو بۆنی بکەن، ئەوە زیناکارە (واتە: زینای چاو دەکات و خەڵکیش توشی زینای چاو دەکات).

ئەبو عاصم وتویەتی: هەندێک لە هاوەڵانی ئێمە (هەندێک لە گێڕەرەوانی فەرموودە) بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ بەرز کردۆتەوە (واتە: وتویانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی).

## بابەت: دەربارەی ئەو ئافرەتەی قژی دەلکێنێت بە قژی ئافرەتێکی تر و ئەوەیشی کە داوای لێ دەکات قژی پێ بدات

٢٦٩٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لَعَنَ اللهُ الْوَاشِمَاتِ، وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ يَعْقُوبَ، فَجَاءَتْ فَقَالَتْ: بَلَغَنِي أَنَّكَ لَعَنْتَ كَيْتَ وَكَيْتَ؟ فَقَالَ: وَمَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَهُوَ فِي كِتَابِ اللهِ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ اللَّوْحَيْنِ، فَمَا وَجَدْتُ فِيهِ مَا تَقُولُ. قَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ، لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، أَمَا قَرَأْتِ: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر؟ فَقَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّهُ قَدْ نَهَى عَنْهُ. فَقَالَتْ: فَإِنِّي أَرَى أَهْلَكَ يَفْعَلُونَهُ؟ قَالَ: فَادْخُلِي فَانْظُرِي. فَدَخَلَتْ فَنَظَرَتْ، فَلَمْ تَرَ مِنْ حَاجَتِهَا شَيْئًا، فَقَالَ: لَوْ كَانَتْ كَذَلِكِ مَا جَامَعْتُهَا»[1].

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نەفرەتی خوا لەو کەسانە بێت کە خەڵکی دەکوتن و لەوەیشی کە داوای کوتین دەکات و لەوەیشی کە موی برۆ و ڕوخساری دەردێنێ و (بۆ جوانی و سەرنج ڕاکێشی باریکی دەکاتەوە) و لەوەیشی کە کەلێن دەخاتە نێوان ددانەکانی بۆ جوانی، ئەوانە دەستکردی خوا دەگۆڕن، جا ئەو قسەیە گەیشت بە ئافرەتێک لە بەنی ئەسەد کە پێی دەوترا: ئوممو یەعقوب، ئەویش هات و وتی: پێم گەیشتووە (ئەی عەبدوڵلا) کە تۆ نەفرەتت لەوە و لەوە کردوە (واتە: نەفرەتت لەم چەند جۆرە کەسە کردوە)؟ عەبدوڵلاش وتی: بۆچی نەفرەت لە کەسانێک نەکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لێکردوون لەکاتێکدا لە پەرتوکی خواشدا هەیە؟ ئافرەتەکەش وتی: من قورئانم لە بەرگ بۆ بەگ خوێندۆتەوە و ئەوەم تیادا نەبینیوە کە دەیڵێی!، عەبدوڵلا وتی: ئەگەر خوێندباتەوە (بە تێفکرین و تێگەیشتن) ئەوە دەتدۆزیەوە، مەگەر ئەو ئایەتەت نەخوێندۆتەوە: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر، واتە: (ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتن و بۆی هێنان ئەوە وەریبگرن و، ئەوەیشی لێتان قەدەغە دەکات ئەوە وازی لێبهێنن، تەقوای خواش بکەن، چونکە خوا سزای توندو سەختە) جا ئافرەتەکە وتی: بۆنا (خوێندومەتەوە)، عەبدوڵلا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لەم شتانە کردوە و قەدەغەی کردوە، ئافرەتەکەش وتی: من پێم وایە خێزانەکەشت دەیکات (واتە: بڕۆی دەکات)، عەبدوڵلا (بە ئافرەتەکەی) وت: بڕۆ ژوورەوە (بۆ ماڵەکەم) و سەیری خێزانم بکە، جا ئافرەتەکە چووە ژوورەوە و سەیری کرد و هیچی نەدۆزیەوە لەوەی دەیویست (تا

---

(١) ـ صحيح.

بیکاتە بەڵگە)، جا عەبدوڵڵا وتی: ئەگەر ئاوا بێت (واتە: ئەگەر بڕۆی بکات وەک تۆ دەڵێیت) ئەوە لەگەڵی نەدەخەوتم یان تاکو وازی لێ دەهێنا).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە بەیەکەوە خەوتنی پیاو لەگەڵ پیاو و ئافرەت لەگەڵ ئافرەت

٢٦٩٨ - «عَنْ أَبِي عَامِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا رَيْحَانَةَ ﵁، صَاحِبَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ عَشْرِ خِصَالٍ: مُكَامَعَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ فِي شِعَارٍ لَيْسَ بَيْنَهُمَا شَيْءٌ. وَمُكَامَعَةِ الْمَرْأَةِ الْمَرْأَةَ فِي شِعَارٍ وَاحِدٍ لَيْسَ بَيْنَهُمَا شَيْءٌ. وَالنَّتْفِ، وَالْوَشْمِ، وَالنُّهْبَةِ، وَرُكُوبِ النُّمُورِ، وَاتِّخَاذِ الدِّيبَاجِ هَا هُنَا عَلَى الْعَاتِقَيْنِ، وَفِي أَسْفَلِ الثِّيَابِ قَالَ عَبْد اللهِ: أَبُو عَامِرٍ. شَيْخٌ لَهُمْ، وَالْمُكَامَعَةُ: الْمُضَاجَعَةُ»[1].

واتە: لە ئەبو عامڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو ڕەیحانەی ﵁ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە دە سیفات: لە بەیەکەوە خەوتنی پیاو لەگەڵ پیاو لە ناو یەک پۆشاکدا لەکاتێکدا هیچیان لە نێواندا نەبێت (بە شێوەیەک جەستەیان بەیەک بگات)، وە لە بەیەکەوە خەوتنی ئافرەت لەگەڵ ئافرەت لە ناو یەک پۆشاکدا لە کاتێکدا هیچیان لە نێواندا نەبێت، وە لە دەرهێنانی موی ڕوخسار، وە لە تاتۆ و کوتان و، وە لە تاڵان و، وە لە سواربوونی پڵنگ و دڕندە، وە لە بەکارهێنانی حەریری دیباج لەسەر شانەکان (واتە: بەکارهێنانی شاڵی حەریر)، وە لە خوارەوەی جل و بەرگ (واتە: درێژکردنی دامێنی جل و بەرگ لە خوارەوەی گۆزینگ).

## بابەت: نەفرەت کردن لەو پیاوانەی خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان وە لەو ئافرەتانەش کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان

٢٦٩٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، لَعَنَ الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ، وَالْمُتَرَجِّلَاتِ مِنَ النِّسَاءِ، وَقَالَ: أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ، قَالَ: فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فُلَانًا، وَأَخْرَجَ عُمَرُ فُلَانًا أَوْ فُلَانَةَ، قَالَ عَبْد اللهِ: فَأَشُكُّ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردوە لەوانەی خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان لە پیاوان (جا وێکچواندنەکە چ لە ڕووی ڕووکەش بێت چ لە ڕوی سیفاتەوە)، وە نەفرەتی کردوە لەوانەش کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان لە ئافرەتان (جا وێکچواندنەکە چ لە ڕووی ڕوکەش بێت چ لە ڕووی سیفاتەوە)، وە فەرمووی: وەدەریان بنێن لە ماڵەکانتان، (ئیبنو عەبباس) وتویەتی: جا پێغەمبەر ﷺ فلان پیاوی وەدەرنا (لەسەر ئەو سیفەتە)، عومەریش فلانە پیاو ـ یان فلانە ئافرەتی ـ وەدەرنا، عەبدوڵڵا وتویەتی: گومانم هەیە (نازانم پیاو بوو یان ئافرەت، ئەوەی ئیمامی عومەر وەدەرینا).

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی کە ڕان عەوڕەتە

٢٧٠٠ - «عَنْ زُرْعَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ - وَكَانَ مِن أَصْحَابِ الصُّفَّةِ - قَالَ: جَلَسَ عِنْدَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَفَخِذِي مُنْكَشِفَةٌ. فَقَالَ: خَمِّرْ عَلَيْكَ، أَمَا عَلِمْتَ، أَنَّ الْفَخِذَ عَوْرَةٌ»[١].

واتە: لە زورعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە ـ کە یەکێک بووە لە جەماعەتی صوففە ـ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلامان دانیشتبوو، ڕانی منیش بەدەرەوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕانت داپۆشە، مەگەر نەتزانیوە ڕان عەوڕەتە؟!

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە چونە حەمامی گشتی بۆ ئافرەتان

٢٧٠١ - «عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، قَالَ: دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، نِسْوَةٌ مِنْ أَهْلِ حِمْصٍ يَسْتَفْتِينَهَا، فَقَالَتْ: لَعَلَّكُنَّ مِنَ النِّسْوَةِ اللاَّتِي يَدْخُلْنَ الْحَمَّامَاتِ؟ قُلْنَ: نَعم. قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنَ امْرَأَةٍ تَضَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا، إلاَّ هَتَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»[٢].

واتە: لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کۆمەڵە ئافرەتێکی خەڵکی حیمص هاتن بۆ لای عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) پرسیاریان لێکرد، ئەویش وتی: ڕەنگە ئێوە ئەو ئافرەتانە بن کە دەچنە حەمامە گشتیەکان؟ وتیان: بەڵێ، عائیشە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک جلەکانی دابکەنێ لە جگە لە ماڵی مێردەکەی حەتمەن پەیوەندی نێوان خۆی و خوای زاڵی پایەداری تێکداوە.

٢٧٠٢ - «قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، هَذَا الْحَدِيثَ»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: با هیچ کەسێک لە ئێوە براکەی لە شوێنی دانیشتنەکەی هەڵنەستێنێت

٢٧٠٣ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ - يَعْنِي: أَخَاهُ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَقْعُدُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا»[٤].

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده منقطع، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەسێک براکەی هەڵنەستێنێت لە شوێنەکەی، دواتر بچێت خۆی تیایدا دابنیشێت، بەڵکو جێگەی یەکتری بکەنەوە و مەجلیس فراوان بکەن.

## بابەت: ئەگەر کەسێک لە شوێنی خۆی هەڵسا (لە مەجلیس)، دواتر گەڕایەوە بۆی، خۆی شایستە ترە بە شوێنەکە

٢٧٠٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ - أَوِ الرَّجُلُ - مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە هەڵسا لە دانیشتگاکەی، دواتر گەڕایەوە، ئەوە خۆی شایستەترە بە شوێنەکە.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە دانیشتن لەناو ڕێگەو کوچەو کۆڵانەکان

٢٧٠٥ - «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَرَّ بِنَاسٍ جُلُوسٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتُمْ لاَ بُدَّ فَاعِلِينَ، فَاهْدُوا السَّبِيلَ، وَأَفْشُوا السَّلاَمَ، وَأَعِينُوا الْمَظْلُومَ، قَالَ شُعْبَةُ: لَمْ يَسْمَعْ هَذَا الْحَدِيثَ أَبُو إِسْحَاقَ مِنَ الْبَرَاءِ»[٢].

واتە: لە بەڕائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای خەڵکانێک لە ئەنصاریەکاندا تێپەڕ بوو (کە لە کۆڵان دانیشتبوون)، فەرمووی: ئەگەر هەر دەیکەن (واتە: هەر لە کۆڵان دادەنیشن) ئەوە ڕێگە نیشان بدەن (بە کەسی ناشارەزا و کوێرو ..هتد)، وە سەلام بڵاو بکەنەوە و سەلام لە یەکتری بکەن، وە یارمەتی ستەملێکراو بدەن (کاتێک دەیبینن ستەمی لێ دەکرێت).

## بابەت: دەربارەی قاچ لەسەر قاچ دانان

٢٧٠٦ - «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ، وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الآخْرَى»[٣].

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە مامیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر پشت ڕاکشابوو لە مزگەوت، لەکاتێکدا قاچێکی لەسەر قاچەکەی تر دانابوو.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده منقطع، لكن الحديث صحيح المتن.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دوو کەس پستە پست و قسەی نهێنی ناکەن بەبێ هاوەڵی سێیەمیان

٢٧٠٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً، فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ سێ کەس بوون، ئەوە با دوو کەس قسەی نهێنی و پستە پست نەکەن بەبێ هاوڕێکەیان (بەبێ کەسی سێیەم)، چونکە ئەوە دڵتەنگی دەکات (لەبەر ئەوەی لە دڵی خۆی دەڵێت: دیارە خەریکی پلانێکن دژی من، یان دەڵێت: دیارە متمانەیان بە من نیە و شایستەی قسە لەلا کردن نیم).

## بابەت: دەربارەی کەفارەتی مەجلیس

٢٧٠٨ - «عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: لَمَّا كَانَ بِأَخَرَةٍ، كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا جَلَسَ فِي الْمَجْلِسِ فَأَرَادَ أَنْ يَقُومَ، قَالَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ لَتَقُولُ الآنَ كَلاَمًا، مَا كُنْتَ تَقُولُهُ فِيمَا خَلاَ، فَقَالَ: هَذَا كَفَّارَةٌ لِمَا يَكُونُ فِي الْمَجَالِسِ»[٢].

واتە: لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا کاتێ لە مەجلیس دادەنیشت دواتر دەیەویست هەڵسێت دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) واتە: (پاک و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ پەروەردگار، شاهێدی دەدەم کە هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات)، جا (هاوەڵەکان) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئێستا وتەیەک دەڵێیت پێشتر نەتدەوت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو زیکرە کەفارەت و سڕەرەوەی ئەوەیە کە پەیدا دەبێت لە مەجلیس (لە هەڵە و پەڵە و قسەی زیاد و ناڕەوا).

## بابەت: کاتێ کەسێک دەپشمێت چی دەڵێت؟

٢٧٠٩ - «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعَاطِسُ يَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ. وَيَقُولُ الَّذِي يُشَمِّتُهُ: يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ، وَيَرُدُّ عَلَيْهِ: يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ»[٣].

واتە: لە ئەبو ئەییوبی ئەنصاریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەو کەسەی دەپشمێ دەڵێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ)، وە ئەوەی وەڵامیشی دەداتەوە و

---

(١) ـ صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(دڵخۆشی دوژمنەکەی کە بریتیە لە شەیتان لەسەری لادەبات) و دەڵێت: (يَرْحَمُكُمُ اللّهُ) واتە: خوا ڕەحمتان پێ بکات، وە کەسەکەش وەڵامی دەداتەوە دەڵیت: (يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ) واتە: خوا ڕێنموییتان بکات و کاروبارتان ڕێک بخات.

## بابەت: کاتێ کەسێک دەپشمێت ناڵێ: (الحمد لله) ئەوە پێی ناوترێت (يرحمكم الله)

٢٧١٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: عَطَسَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَشَمَّتَ، أَحَدَهُمَا وَلَمْ يُشَمِّتِ الآخَرَ، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، شَمَّتَّ هَذَا وَلَمْ تُشَمِّتِ الآخَرَ؟ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللهَ، وَإِنَّ هَذَا لَمْ يَحْمَدِ اللهَ»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو پیاو لەلای پێغەمبەر ﷺ پشمین، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) (يرحمكم الله)ی بۆ یەکێکیان فەرموو و بۆ ئەوەیتری نەیفەرموو، جا پێی وترا: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) (يرحمكم الله)ت بۆ ئەوە کرد و بۆ ئەوەیترت نەکرد؟ ئەویش فەرمووی: ئەوەیان ستاییشی خوای کرد (وتی: الحمد لله)، ئەوەشیان ستاییشی خوای نەکرد.

## بابەت: چەند جار وەڵامی ئەو کەسە دەدرێتەوە و پێی دەوترێت (يرحمكم الله) کە دەپشمێت؟

٢٧١١ - «حَدَّثَنِي إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي ﷺ، قَالَ: عَطَسَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ. ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى فَقَالَ: الرَّجُلُ مَزْكُومٌ»[2].

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باوکم ﷺ بۆی گێڕامەوە، وتی: پیاوێک لای پێغەمبەر ﷺ پشمی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (يرحمک الله)، دواتر جارێکی تر پشمی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوەکە پەسیوی لێیە (واتە: نەخۆشە و چیتر «يرحمكم الله»ی بۆ ناوترێت).

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە وێنە

٢٧١٢ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِي اللهُ عَنْهَا: كَانَ لَنَا ثَوْبٌ فِيهِ تَصَاوِيرُ، فَجَعَلْتُهُ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، فَنَهَانِي - أَوْ قَالَتْ: فَكَرِهَهُ - قَالَتْ: فَجَعَلْتُهُ وَسَائِدَ»[3].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) وتویەتی: جلێکمان هەبوو وێنەی لەسەر بوو، منیش لە بەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ دامنا لەکاتێکدا نوێژی دەکرد، جا نەهی لێ کردم ـ یانیش وتی: پێی ناخۆش بوو ـ عائیشە دەڵێت: منیش کردم بە پشتی و (بالیف).

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.

## بابەت: فریشتە ناچێتەماڵێک و ژورێکەوە کە وێنەی تیا بێت

٢٧١٣ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْمَلَكَ لاَ يَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ، وَلاَ صُورَةٌ، وَلاَ جُنُبٌ»[١].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتە ناچنە ماڵێک و ژورێکەوە کە سەگ و وێنە و کەسی جەنابەتداری تیابێت.

## بابەت: دەربارەی نەفەقە کێشان و مەسرەفکردنی خانەوادە

٢٧١٤ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الْمُسْلِمُ إِذَا أَنْفَقَ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا، فَهِيَ لَهُ صَدَقَةٌ»[٢].

واتە: لە ئەبو مەسعودی بەدریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کەسی مسوڵمان کاتێ مەسرەفێک دەکات بۆ خێزان و منداڵەکانی و چاوەڕێی پاداشتە، ئەوە مەسرەفەکە بۆ ئەو صەدەقە و خێرە.

## بابەت: دەربارەی سواری کە سێ کەس سواری پشتی ببن

٢٧١٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا قَفَلَ، تُلُقِّيَ بِي وَبِالْحَسَنِ - أَوْ بِالْحُسَيْنِ قَالَ: وَأُرَاهُ قَالَ: الْحَسَنَ - فَحَمَلَنِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالْحَسَنَ وَرَاءَهُ، حَتَّى قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ عَلَى الدَّابَّةِ الَّتِي عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ (لە سەفەر) گەڕایەوە گەیشت بە من و حەسەن ـ یان حوسەین ـ دەڵێ: (زیاتر) پێم وابێ وتی: حەسەن ـ جا منی هەڵگرت و لە پێشەخۆی دانام و حەسەنیشی لەدواوەی خۆی دانا تاوەکو گەیشتینە مەدینە، لەکاتێکدا ئێمە لەسەر ئەو سواریە بووین کە پێغەمبەری خوای ﷺ لەسەر بوو.

## بابەت: دەربارەی ئەوەی کە خاوەنی سواری شایستەترە بە پێشەوە

٢٧١٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ الْخَطْمِيِّ، وَكَانَ أَمِيرًا عَلَى الْكُوفَةِ، قَالَ: أَتَيْنَا قَيْسَ بْنَ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فِي بَيْتِهِ، فَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِلصَّلاَةِ، وَقُلْنَا لِقَيْسٍ: قُمْ فَصَلِّ لَنَا، فَقَالَ: لَمْ أَكُنْ لأُصَلِّيَ بِقَوْمٍ لَسْتُ عَلَيْهِمْ بِأَمِيرٍ. فَقَالَ

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح، دون قوله (ولا جنب).

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

رَجُلٌ لَيْسَ بِدُونِهِ. يُقَالُ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ حَنْظَلَةَ بْنِ الْغَسِيلِ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الرَّجُلُ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِهِ، وَصَدْرِ فِرَاشِهِ، وَأَنْ يَؤُمَّ فِي رَحْلِهِ، فقَالَ قَيْسُ بْنُ سَعْدٍ: عِنْدَ ذَاكَ: يَا فُلاَنُ - لِمَوْلًى لَهُ: قُمْ فَصَلِّ لَهُمْ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی یەزیدی خەتمیەوە گێڕدراوەتەوە ـ كە كاربەدەست و گەورەی كوفە بووە ـ وتویەتی: هاتین بۆ لای قەیسی كوڕی سەعدی كوڕی عوبادە لە ماڵەكەی خۆی و بانگبێژ بانگیدا بۆ نوێژ و بە قەیسمان وت: هەڵسە نوێژمان بۆ بكە، ئەویش وتی: من نوێژ ناكەم بۆ خەڵكانێك كە من ئەمیر و گەورەیان نیم، جا پیاوێك كە پێی دەوترا: عەبدوڵڵای كوڕی حەنظەلەی كوڕی غەسیل وتی: بێ ئەو ئەمیرو گەورایەتیە نیت (واتە: بە شێوەیەک لە شێوەكان شایستەی پێشنوێژ كردنی، چونكە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو شایستەترە بە پێشەوەی سواری و، بە سەرەوەی شوێنی دانیشتنی (سەرە مەجلیس) و، بە پێشنوێژی كردن لەناو خیوەت و (ماڵەكەی) خۆی، جا قەیسی كوڕی سەعد لەو كاتەدا بە خزمەتكارێكی خۆی وت: هەڵسە نوێژیان بۆ بكە.

## بابەت: ئەو فەرموودەیەی هاتووە دەربارەی ئەوەی لەسەر هەموو چڵەپۆپە و بەرزایی پشتی وشتر شەیتانێک هەیە

٢٧١٧ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَسْلَمِيِّ، قَالَ: وَقَدْ صَحِبَ أَبُوهُ ﷺ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلَى ذِرْوَةِ كُلِّ بَعِيرٍ شَيْطَانٌ، فَإِذَا رَكِبْتُمُوهَا فَسَمُّوا اللهَ وَلاَ تُقَصِّرُوا عَنْ حَاجَاتِكُمْ»[2].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی حەمزەی كوڕی عەمڕی ئەسلەمیەوە گێڕدراوەتەوە، ـ كە باوكی ﷺ هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوای ﷺ كردوە ـ وتویەتی: گوێم لە باوكم بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر چڵەپۆپەو بەرزایی پشتی هەموو وشترێک شەیتانێک هەیە، جا كاتێ سواری پشتی بوون ناوی خوا بێنن (بسم الله) بكەن و كەمتەرخەمی مەكەن لە پێویستیەكانتان (واتە: نەكەن لەبەر ئەوە بترسن و سواری نەبن و نەچن بەدوای پێویستیەكانتان، نەخێر مەترسن چونكە (بسم الله)تان كردوە).

٢٧١٨ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: ارْكَبُوا هَذِهِ الدَّوَابَّ سَالِمَةً، وَلاَ تَتَّخِذُوهَا كَرَاسِيَّ»[3].

واتە: لە سەهلی كوڕی موعاذی كوڕی ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێراویەتیەوە ـ كە یەكێک بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ـ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سواری ئەو ئاژەڵانە ببن بە سەلامەتی (واتە: شتێک مەكەن ئەو تەحەممولی نەكات و سەلامەت نەبێت یان زەبرێک لە ئێوە بدات و ئێوە سەلامەت نەبن، كەواتە: چاوتان لەوان و لەخۆشتان بێت)، وە مەشیانكەن

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

بە کورسی (بەوەی ماوەیەکی زۆر بە بێ پێویستی لەسەر پشتیان بمێننەوە و دەمە تەقێ بکەن و قورساییتان لەسەر پشتی ئەو بەستەزمانە بمێنێتەوە بەبێ پێویستی).

٢٧١٩ - «أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ اللَّيْثِ ﷺ، إلاَّ أَنَّهُ يُخَالِفُ شَبَابَةَ فِي شَيْءٍ»[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی صالح بۆی گێڕاینەوە، ئەویش (هەمان فەرموودەی) لە لەیث ﷺ گێڕاوەتەوە تەنها ئەوە نەبێت شتێکی جیاوازە لەگەڵ ڕیوایەتی شەبابە ( چونکە ڕستەی: «وایتدعوها سالمة»ی تێدایە).

## بابەت: سەفەر پارچەیەکە لە سزا و سەغڵەتی

٢٧٢٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ وَجْهِهِ فَلْيُعَجِّلِ الرَّجْعَةَ إِلَى أَهْلِهِ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەفەر پارچەیەکە لە سزا و ناخۆشی، هەر یەکێک لە ئێوە خۆی لە خەوتن و خواردن و خواردنەوەکەی خۆی دەگرێتەوە و (شتەکان وەک ماڵەوە نابێت)، بۆیە کاتێ هەر یەکێک لە ئێوە پێویستی و کارەکەی خۆی تەواو کرد لەو شوێنەی ڕوی تێکردوە، ئەوە با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ لای خانەوادەکەی.

## بابەت: ئەوەی (مسوڵمان) دەیڵێت کاتێ کەسێک بەڕێ دەکات و ماڵئاوایی لێ دەکات

٢٧٢١ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنِّي أُرِيدُ السَّفَرَ، فَقَالَ لَهُ: مَتَى؟، قَالَ: غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ، قَالَ: فَأَتَاهُ، فَأَخَذَ بِيَدِهِ، فَقَالَ لَهُ: فِي حِفْظِ اللهِ، وَفِي كَنَفِهِ، زَوَّدَكَ اللهُ التَّقْوَى، وَغَفَرَ لَكَ ذَنْبَكَ، وَوَجَّهَكَ لِلْخَيْرِ أَيْنَمَا تَوَخَّيْتَ، أَوْ أَيْنَمَا تَوَجَّهْتَ، شَكَّ سَعِيدٌ فِي إِحْدَى الْكَلِمَتَيْنِ»[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا من بە نیازی سەفەرم، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: کەی؟ پیاوەکە وتی: بەیانی إن شاءالله، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (بەیانی) چوو بۆ لای و دەستی گرت و پێی فەرموو: لە حیفزی خوا و چاودێری و پارێزراوی ئەو بیت، خوا توێشوی تەقوات پێ ببەخشێت و، لە تاوانەکانت خۆش بێت و، ڕووت بکاتە خێر و چاکە هەر جێگەیەکت مەبەست بێت ـ یان ڕوو لە هەر لایێک بکەیت ـ سەعید (کە یەکێکە لە ڕاویەکان) گومانی لە یەکێک لەو دوو وشانە هەیە (کە ئاخۆ فەرمووی: هەر جێگەیەکت مەبەست بێت، یانیش فەرمووی: ڕوو لە هەر لایێک بکەیت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسن.

## بابەت: دەربارەی دووعای مسوڵمان کاتێ سەفەر دەکات و کاتێ دەگەڕێتەوە

٢٧٢٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، إِذَا سَافَرَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الأَهْلِ وَالْمَالِ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەفەری دەکرد دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الأَهْلِ وَالْمَالِ) واتە: خوایە من پەنات پێدەگرم لە زەحمەت و ناخۆشی سەفەر و، (وە پەنات پێدەگرم لە) دڵتەنگی گۆڕانی چاکە بە خراپە بە هۆی ڕوداوێک و، (وە پەنات پێدەگرم لە) کەمبوونەوەی (لە خۆشی و چاکە و سەلامەتی و سەرکەوتن) دوای ئەوەی پێت بەخشیوم، (وە پەنات پێدەگرم لە) نزای ستەملێکراو و، بینینی دیمەنی ناخۆش و خراپ لە خانەوادە و سەروەت و سامان.

٢٧٢٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَافَرَ فَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ، كَبَّرَ ثَلَاثًا وَيَقُولُ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝١٤﴾ الزخرف، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِي سَفَرِي هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى، اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ، وَاطْوِ لَنَا بُعْدَ الأَرْضِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا فِي سَفَرِنَا، وَاخْلُفْنَا فِي أَهْلِنَا بِخَيْرٍ»[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەفەری دەکرد و سواری سواریەکەی دەبوو سێ جار (الله أكبر)ی دەکرد و دەیفەرموو: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝١٤﴾ الزخرف، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِي سَفَرِي هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى، اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ، وَاطْوِ لَنَا بُعْدَ الأَرْضِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا فِي سَفَرِنَا، وَاخْلُفْنَا فِي أَهْلِنَا بِخَيْرٍ) واتە: پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەو هۆکاری گواستنەوەیەی بۆ ڕام هێناوین و موسەخخەری کردوە و ئێمەشی بەسەردا دەست شکاوە و باڵادەست کردوە، وە بە دڵنیاییش ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، خوایە من لەم سەفەرەدا داوای چاکە و تەقوا و پارێزکاری و ئەو کردەوەیەت لێ دەکەم کە تۆ پێی ڕازیت، خوایە سەفەرەکەمان لەسەر ئاسان بکەیت و دووری زەویەکەشمان بۆ بپێچیتەوە و نزیکی بخەیتەوە (هەست بە دووریەکەی نەکەین)، خوایە تۆ هاوڕێ و هاودەمی لە سەفەردا، وە پارێزەری ماڵ و منداڵیشی، خوایە لەگەڵمانبە لە سەفەرەکەمان و وە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەشمانبە بە خێر و چاکە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

بابەت: ئەوەی (مسوڵمان) دەیڵێت لە كاتی سەركەوتنی شوێنی بەرز و دابەزین بۆ شوێنی نزم

٢٧٢٤ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا، وَإِذَا هَبَطْنَا سَبَّحْنَا»[١].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە كاتێ سەر بەرزایی دەكەوتین (الله أكبر)مان دەكرد، وە كاتێ دەهاتینە خوارەوە بۆ شوێنی نزم (سبحان الله)مان دەكرد.

بابەت: دەربارەی نەهی كردن لە زەنگوڵە (جەڕەس)

٢٧٢٥ - «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعِيرُ الَّتِي فِيهَا الْجَرَسُ، لاَ تَصْحَبُهَا الْمَلاَئِكَةُ»[٢].

واتە: لە ئوممی حەبیبەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: ئەو وشتر و بارەی زەنگوڵە و جەڕەسی تیایە فریشتە لەگەڵی نابن.

٢٧٢٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رِفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ أَوْ جَرَسٌ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: فریشتە هاوەڵایەتی كۆمەڵێك ناكەن و لەگەڵیان نابن كە سەگ یان زەنگوڵە و جەڕەسیان تیابێت.

بابەت: نەهی كردن لە نەفرەتكردن لە ئاژەڵ

٢٧٢٧ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ، فَسَمِعَ لَعْنَةً، فَقَالَ: مَا هَذَا؟. قَالُوا: فُلاَنَةُ لَعَنَتْ رَاحِلَتَهَا، فَقَالَ: ضَعُوا عَنْهَا فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ. قَالَ: فَوَضَعُوا عَنْهَا قَالَ عِمْرَانُ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهَا نَاقَةً وَرْقَاءَ»[٤].

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێكدا بوو گوێی لە نەفرەت كردنێك بوو، فەرمووی: ئەوە كێیە؟ وتیان: فڵانە ئافرەتەیە نەفرەتی لە سواریەكەی كرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: شتەكان لەسەر پشتی سواریەكە بخەنە خوارەوە، چونكە ئاژەڵەكە نەفرەتی لێكراوە، دەڵێت: جا هێنایانە خوارەوە، عیمران دەڵێت: لە پێش چاومە وەك ئەوە وایە ئێستا سەیری بكەم وشترێكی ڕەش و سپی بوو.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣)ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: ئافرەت سەفەری دوور ناكات مەگەر مەحرەمێكی لەگەڵ بێت

٢٧٢٨ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ سَفَرًا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا إِلاَّ وَمَعَهَا أَبُوهَا، أَوْ أَخُوهَا، أَوْ زَوْجُهَا، أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا»[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت سەفەر ناكات سەفەرێك سێ ڕۆژ بەسەرەوە (واتە: سەفەری دور ناكات) حەتمەن دەبێت باوكی، یان برای، یان هاوسەری، یان مەحرەمێكی لەگەڵ بێت.

## بابەت: كەسێك بە تەنها لە سەفەردا شەیتانە

٢٧٢٩ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الْوَحْدَةِ، لَمْ يَسْرِ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ أَبَدًا»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك بیانزانیایە چ هەیە (لە شەڕ و خراپە و نەگبەتی) لە تەنیاییدا، ئەوە هیچ سوارێك بە شەو بە تەنها ڕێی نەدەكرد و نەدەڕۆیشت.

## بابەت: ئەو زیكرەی مسوڵمان دەیڵێت كاتێ لە شوێنێك دادەبەزێت و دەگیرسێتەوە

٢٧٣٠ - «عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا نَزَلَ مَنْزِلاً، قَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ فِي ذَلِكَ الْمَنْزِلِ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْهُ»[٣].

واتە: لە خەولەی كچی حەكیمەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر یەكێك لە ئێوە كاتێ لە شوێنێك دابەزی و وتی: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) واتە: پەنا دەگرم بە وشەو وتەكانی خوا كە تەواون و كەموكوڕیان تیا نیە لە شەڕ و خراپەی ئەوەی خوا دروستی كردوە، جا هیچ شتێك زەرەر و زیانی پێ ناگەیەنێ لەو شوێنە تاوەكو لێی دەردەچێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو دوو ڕەکعەتە نوێژەی کاتێ کەسێک لە شوێنێک دادەبەزێت و دەگیرسێتەوە

٢٧٣١ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا نَزَلَ مَنْزِلاً، لَمْ يَرْتَحِلْ مِنْهُ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ، أَوْ يُوَدِّعَ الْمَنْزِلَ بِرَكْعَتَيْنِ، قَالَ عَبْد اللهِ: عُثْمَانُ بْنُ سَعْدٍ ضَعِيفٌ»[١].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە شوێنێک دادەبەزی و دەگیرسایەوە لەو شوێنە نەدەڕۆیشت تاوەکو دوو ڕەکعەت نوێژی دەکرد، یان ماڵئاوایی لە شوێنەکە دەکرد بە دوو ڕەکعەت نوێژ.

## بابەت: ئەو زیکرەی مسوڵمان دەیڵێت کاتێ لە سەفەر دەگەڕێتەوە

٢٧٣٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَجَعَ مِنْ سَفَرِهِ قَالَ: آيِبوون إِنْ شَاءَ اللهُ تَائِبون عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە سەفەرێکی دەگەڕایەوە دەیفەرموو: گەڕاینەوە (لە سەفەرەکەمان) إن شاءالله بە تەوبەکاری و بە بەندایەتیەوە، سوپاس و ستایشکاری پەروەردگارمانین.

## بابەت: دووعای کاتی خەوتن

٢٧٣٣ - «حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ رَجُلاً إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، فَإِنْ مَاتَ، مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ»[٣].

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە بەڕرائی کوڕی عازیب بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە پیاوێک کرد کە کاتێک دەچێتە سەر جێگاکەی بڵێت: (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) واتە: خوایە نەفسی خۆم

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

تەسلیمی تۆ کرد و، ڕووم کردە تۆ و، کاروباری خۆمم سپارد بە تۆ و، وە پشتم بەست بە تۆ، (جا کە ئاوا دەکەم) لەبەر چاوبڕینە لەو چاکی و باشیەی لای تۆ هەیە، وە لەبەر ترسە لە خراپە و شتی ناخۆش کە لەلای تۆ ڕەت دەبێتەوە، هیچ پەناگەیەک و ڕزگاربوونێک نیە لە تۆ تەنها خۆت نەبێت (واتە: تەنها بە گەڕانەوە و ملکەچی بۆ لای تۆ پەنا و ڕزگاریمان لە سزای تۆ دەست دەکەوێت)، بڕوام هێنا بەو پەرتوکەی تۆ داتبەزاندووە (کە قورئانە)، وە بڕوام هێنا بەو پێغەمبەرەی کە تۆ ڕەوانەت کردووە (کە موحەممەدە ﷺ)، جا ئەگەر کەسەکە (دوای وتنی ئەم نزایانە) مرد، ئەوە لەسەر ئیسلامەتی مردووە.

٢٧٣٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ، فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ فِيهِ، وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، اللَّهُمَّ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا، فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ»[1].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە چوو بۆ سەر جێگای خەوتنی، ئەوە با جێگەکەی داوەشێنێت بە لیچک و دامێنی جلەکەی، چونکە ئەو نازانێت دوای ئەو چ شتێک کەوتۆتە ناو جێگەکەی و چی ڕویداوە، وە با بڵێت: (اللَّهُمَّ بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، اللَّهُمَّ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا، فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ) واتە: خوایە بە کاری تۆ و بە ناوی تۆوە لەسەر تەنیشت پاڵ کەوتووم (واتە: ئەگەر تۆ خەلقی قودرەتی ئەو پاڵکەوتنەم بۆ نەکەی خۆم ناتوانم، جا بۆیە ناوی تۆ دەهێنم و ستاییشت دەکەم لەسەر ئەوە)، وە بە کاری تۆ و بە ناوی تۆوەش هەڵدەستم و تەنیشتەکەم بەرز دەکەمەوە، خوایە ئەگەر نەفسی منت کێشا و مراندت، ئەوە لێی خۆش بە، وە ئەگەر ڕێگەتدا (جارێکیتر بگەڕێتەوە مەیدانی ژیان)، ئەوە بیپارێزە بەوەی بەندە چاکەکانی خۆت پێ دەپارێزیت.

## بابەت: دەربارەی تەسبیحات کردن لەکاتی خەوتن

٢٧٣٥ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى وَضَعَ قَدَمَهُ بَيْنِي وَبَيْنَ فَاطِمَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، فَعَلَّمَنَا مَا نَقُولُ إِذَا أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا: ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ تَسْبِيحَةً، وَثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ تَحْمِيدَةً، وَأَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ تَكْبِيرَةً، قَالَ عَلِيٌّ: فَمَا تَرَكْتُهَا بَعْدُ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ؟ قَالَ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ»[2].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان (بۆ ماڵەوە) تاوەکو پێی خستە نێوان من و فاتیمە (رَضِي اللهُ عَنْهَا)، فێری کردین چی بڵێین کاتێ چوینە سەر جێگاکەمان، (فێری کردین ئەو زیکر و تەسبیحاتانە بکەین): سیوسێ (٣٣) جار سبحان الله و، سیوسێ (٣٣) جار الحمد لله و، سیوچوار (٣٤) جار الله أكبر، عەلی وتویەتی: جا دوای ئەوە وازم لێ نەهێناوە هەر کردوومە، جا پیاوێک پێی وت: هەتا لە شەوی شەڕی صیففینیش وازت لێ نەهێناوە (کە چەندە بە پەژارەو سەرقاڵیش بووی)؟ عەلی وتی: هەتا شەوی شەڕی صیففینیش وازم لێ نەهێناوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: (مسوڵمان) چی دەڵێت کاتێ لە خەو خەبەری دەبێتەوە

٢٧٣٦ - «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[1].

واتە: لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە خەو خەبەری دەبویەوە دەیفەرموو: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ) واتە: سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندنی، وە لای ئەویش زیندوو دەکرێینەوە.

٢٧٣٧ - «حَدَّثَنِي عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ « ثُمَّ قَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي - أَوْ قَالَ: ثُمَّ دَعَا - اسْتُجِيبَ لَهُ فَإِنْ عَزَمَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى تُقُبِّلَتْ صَلاَتُهُ»[2].

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک بە شەو خەبەری بویەوە و وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ « ثُمَّ قَالَ: « رَبِّ اغْفِرْ لِي) واتە: وتی: هیچ خودایەکی بە هەق نیە جگە لە الله کە تەنهایە و هیچ هاوەڵ و شەریکێکی نیە، موڵک و ستایش هەر بۆ ئەوە، وە ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، پاک و بێگەردی بۆ خوا و، سوپاس و ستاییش بۆ خوا، هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله و، خوا لە هەموو شتێک گەورەترە و، هیچ لادان لە خراپەیەک نیە و هیچ هێزێک بۆ بە ئەنجامگەیاندنی چاکەو عیبادەت نیە تەنها بە کاری خوا نەبێت، دواتریش بڵێت: خوایە لێم خۆشبە ـ یان فەرمووی: دواتر دووعاو نزا بکات ـ ئەوە دوعاو نزاکەی قەبوڵە، وە ئەگەر دەستنوێژیشی شۆرد و دواتر نوێژی کرد ئەوە نوێژەکەی قەبوڵە (بە هۆی ئەو زیکر و ویردانەوە).

## بابەت: مسوڵمان چی دەڵێت کاتێ بەیانی دادێت

٢٧٣٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، إِذَا أَصْبَحَ، قَالَ: أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ، وَكَلِمَةِ الإِخْلاَصِ، وَدِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ ﷺ، وَمِلَّةِ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِمًا»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبزاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ كاتێ بەیانی دەكردەوە دەیفەرموو: (أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ، وَكَلِمَةِ الإِخْلاَصِ، وَدِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ ﷺ، وَمِلَّةِ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِمًا) واتە: بەیانیمان كردەوە لەسەر فیترەت و سروشتی ئیسلام و، لەسەر ڕستەی ئیخلاس (واتە: لا إله إلا الله) و، لەسەر دینی پێغەمبەرەكەمان موحەممەد ﷺ و لەسەر ڕێچكە و ڕێبازی ئیبراهیم، بە لادان لە شیرك و گومڕایی و بە مسوڵمانی.

٢٧٣٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، مُرْنِي بِشَيْءٍ أَقُولُهُ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ، قَالَ: « قُلْ: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، قَالَ: قُلْهُ إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەكر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێ بكە بە شتێك كە بیڵێم كاتێ بەیانی و ئێوارەم كردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێ: (اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ) واتە: ئەی خوایە، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی زانای پەنهان و ئاشكرا، ئەی پەروەردگاری خاوەن هەموو شتێك، شاهێدی دەدەم كە هیچ خودایەكی بە هەق نیە جگە لە تۆ، پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی نەفسی خۆم و شەڕ و خراپەی شەیتان و هاوبەش دانانەكەی (واتە: ئەو وەسوەسانەی دروستی دەكات تا هاوبەش بۆ خوا دابنێیت).

## بابەت: مسوڵمان چی دەڵێت كاتێ جلێكی نوێ دەپۆشێت

٢٧٤٠ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ لَبِسَ ثَوْبًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واتە: لە سەهلی كوڕی موعاذی كوڕی ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك جلێكی (نوێی) پۆشی و وتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ) واتە: سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی كە پۆشتەی كردم بەم جل و بەرگە و پێی بەخشیم بەبێ هێز و توانای خۆم (بەڵكو هەموو هێز و توانایەكە لای ئەو بووە)، ئەوە لە هەموو تاوانە (بچوكەكانی) پێشووی دەبوردرێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

## بابەت: مسوڵمان چی دەڵێت کاتێ دەچێتە ناو مزگەوت و کاتێ دەردەچێت

**٢٧٤١ - «عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ، أَوْ أَبِي أُسَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ»(١).**

واتە: لە ئەبو حومەیدەوە یان لە لە ئەبو ئوسەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە چووە ناو مزگەوت با بڵێت: (اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) واتە: خوایە دەرگای ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەیتەوە، وە کاتێ هاتە دەرەوە با بڵێت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ) واتە: خوایە من داوای بەشێک لە بەخششەکەت لێ دەکەم.

## بابەت: مسوڵمان چی دەڵێت کاتێ دەچێتە ناو بازاڕ

**٢٧٤٢- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ وَاسِعٍ، قَالَ: قَدِمْتُ مَكَّةَ فَلَقِيتُ بِهَا أَخِي سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، فَحَدَّثَنِي عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ، وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ، وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ قَالَ: فَقَدِمْتُ خُرَاسَانَ فَلَقِيتُ قُتَيْبَةَ بْنَ مُسْلِمٍ فَقُلْتُ: إِنِّي أَتَيْتُكَ بِهَدِيَّةٍ، فَحَدَّثْتُهُ، فَكَانَ يَرْكَبُ فِي مَوْكِبِهِ فَيَأْتِي السُّوقَ، فَيَقُومُ، فَيَقُولُهَا، ثُمَّ يَرْجِعُ»(٢).**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی واسیعەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هاتم بۆ مەککە و گەیشتم بە براکەم سالمی کوڕی عەبدوڵڵا و لە باوک و باپیریەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک چوو بۆ بازار و وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) واتە: وتی: هیچ خودایەکی بە هەق نیە جگە لە الله کە تەنهایە و هیچ هاوبەشێکی نیە (لە دروستکردن و کردار و سیفاتدا)، موڵک و سوپاس و ستاییش هەر بۆ ئەوە، دەژیێنێت و دەمرێنێت، هەموو خێر و چاکەیەک بەدەستی ئەوە و، بەسەر هەموو شتێک بە توانایە، ئەوە خوا هەزار هەزار (واتە: یەک ملیۆن) چاکەی بۆ دەنوسێت، وە هەزار هەزار خراپەشی لەسەر دەسڕێتەوە، وە هەزار هەزار پلەش بەرزی دەکاتەوە.

جا موحەممەدی کوڕی واسع دەڵێت: چووم بۆ خۆراسان و گەیشتم بە قوتەیبەی کوڕی موسلیم و وتم: من بە دیارییەکەوە هاتووم بۆ لات، جا فەرموودەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش لە ناو ئاپۆڕای دار ودەستەکەی سوار دەبوو و دەچوو بۆ بازاڕ و لەوێ دەوەستا و ئەو زیکرەی دەخوێند، دواتر دەگەڕایەوە (تاوەکو پاداشتەکەی پێ ببڕێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن.

## بابەت: ناوبنێن بەناوی منەوە، بەڵام کونیە دامەنێن بە کونیەکەی من

٢٧٤٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَسَمَّوْا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي»(١).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەی: ناوبنێن بە ناوی منەوە (واتە: دروستە ناوی خۆتان یان منداڵەکانتان بنێن: محمد، أحمد، حاشیر، ماحی)، بەڵام کونیە دامەنێن بە کونیەی من (واتە: خۆتان ناوزەند مەکەن بە ئەبو قاسم).

## بابەت: دەربارەی ناوی خۆش

٢٧٤٤ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ، فَأَحْسِنُوا أَسْمَاءَكُمْ»(٢).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە لە ڕۆژی دوایی بانگ دەکرێن بە ناوی خۆتان و بە ناوی باوکتان، بۆیە ناوی جوان و خۆش بۆ خۆتان دابنێن.

## بابەت: چ ناوێک چاک و سوننەتە

٢٧٤٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللهِ: عَبْدُ اللهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ»(٣).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترینی ناوەکان لای خوا: (دوو ناون:) عەبدوڵلا و عەبدوڕڕەحمانە.

## بابەت: چ ناوێک چاک نیە

٢٧٤٦ - «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ نُسَمِّيَ أَرِقَّاءَنَا أَرْبَعَةَ أَسْمَاءٍ: أَفْلَحُ، وَنَافِعٌ، وَرَبَاحٌ، وَيَسَارٌ»(٤).

واتە: لە سەمورەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردووین لەوەی بەندەکانمان ناو بنێین بە چوار ناو: ئەفلەح و، نافیع و، ڕەباح و، یەسار.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

تێبینی: چونکە ئەو ناوانەیان کە لێدەنان بە نیازی بەدەست هێنانی مانای ناوەکانیان بوون واتە: بۆ دەستکەوتنی (سەرفرازی و، سود و، قازانج و، دەوڵەمەندی) ئەو ناوانەیان لێ دەنان، جا ڕەنگە کاتێ پێچەوانەی ئەو شتانە بهاتبایە دی ئەوە گومانی خراپیان بەرامبەر خوای پەروەردگار دروست ببووایە، بۆیە لەوکاتە نەهی لێکراوە کە بەو نیەتانە بێت. والله أعلم

## بابەت: دەربارەی گۆڕینی ناو

٢٧٤٧ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ أُمَّ عَاصِمٍ كَانَ يُقَالُ لَهَا عَاصِيَةُ، فَسَمَّاهَا النَّبِيُّ ﷺ جَمِيلَةَ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئوممو عاصیم پێی دەوترا عاصیە (واتە: سەرپێچیکار)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ناوینا جەمیلە (واتە: جوان).

٢٧٤٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ اسْمُ زَيْنَبَ بَرَّةَ، فَسَمَّاهَا النَّبِيُّ ﷺ زَيْنَبَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ناوی زەینەب بەڕڕە بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ناوینا زەینەب.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لەوەی مرۆڤی مسوڵمان بڵێ:
## بە ویستی خوا و بە ویستی فڵان

٢٧٤٩ - «عَنْ الطُّفَيْلِ أَخِي عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا: قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ لِرَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: نِعْمَ الْقَوْمُ أَنْتُمْ لَوْلاَ أَنَّكُمْ تَقُولُونَ: مَا شَاءَ اللَّهُ، وَشَاءَ مُحَمَّدٌ. فَسَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: لاَ تَقُولُوا: مَا شَاءَ اللهُ وَشَاءَ مُحَمَّدٌ، وَلَكِنْ، قُولُوا: مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ شَاءَ مُحَمَّدٌ»[٣].

واتە: لە توفەیلی برای عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە موشریکەکان بە پیاوێک لە مسوڵمانانی وت: ئێوە چاکترین خەڵکن ئەگەر نەتانوتایە: ئەوەی خوا و موحەممەد ویستی لەسەر بێ، جا پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو و فەرمووی: مەڵێن: ئەوەی خواو موحەممەد ویستی لەسەر بێ، بەڵکو بڵێن: ئەوەی خوا ویستی لەسەر بێ، دواتر ئەوەی موحەممەد ویستی لەسەر بێ (واتە: نابێ ویستی خواو ویستی مەخلوق لە یەک ئاست دابنرێت و وەکو یەک سەیر بکرێت، بەڵام دروستە ویستی مەخلوق بە تابیع و بە بچوکتر باس بکرێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: بە عینەب ناوترێت کەڕم

٢٧٥٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَقُولُوا لِحَائِطِ الْعِنَبِ الْكَرْمُ، إِنَّمَا الْكَرْمُ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بیستانی ترێ مەڵێن کەڕم (بەڵکو بڵێن: عینەب)، چونکە کەڕم بریتیە لە کەسی مسوڵمان (واتە: ناوەکە بۆ مرۆڤی مسوڵمان دەشێت کە دایم خاوەنی کەڕەم و سەخاوەتە، نەک بۆ ترێ کە هەم سودی هەیە و هەم زیان، چونکە مەشڕوبی لێ دروست دەکرێت).

## بابەت: دەربارەی گەمە و یاری

٢٧٥١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ غُلاَمٌ يَسُوقُ بِأَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدًا سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[٢].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: بەندەیەک کە ناوی (ئەنجەشە) بوو، وشتری خێزانەکانی پێغەمبەری ﷺ لێدەخوڕی (بۆ خۆشی و یاری، جا خێرایی زیاد دەکردن و وشترەکانی ڕاو دەنان)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەنجەشە لێخورینی شوشەکان (واتە: ئافرەتەکان) هێواش بکەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی درۆ دەکات تاوەکو خەڵک پێی پێبکەنن

٢٧٥٢ - «أَخْبَرَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ، وَيْلٌ لَهُ وَيْلٌ لَهُ»[٣].

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: وەیل بۆ ئەو کەسەی قسە دەکات و، درۆ دەکات تاوەکو خەڵک پێی پێبکەنن، وەیل بۆ ئەو، وەیل بۆ ئەو.

## بابەت: دەربارەی شیعر و هۆنراوە

٢٧٥٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: صدق النَّبِيُّ ﷺ أُمَيَّةَ بْنَ أَبِي الصَّلْتِ فِي بَيْتَيْنِ مِنَ شِعْرِهِ، فَقَالَ:

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ ليس له إسناد معتمد، لكن الحديث صحيح من حديث أنس.

(٣) ـ حسن.

رَجُلٌ وَثَوْرٌ تَحْتَ رِجْلِ يَمِينِهِ ... وَالنَّسْرُ لِلْأُخْرَى وَلَيْثٌ مُرْصَدُ

فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ. قَالَ:

وَالشَّمْسُ تَطْلُعُ كُلَّ آخِرِ لَيْلَةٍ ... حَمْرَاءَ يُصْبِحُ لَوْنُهَا يَتَوَرَّدُ

فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ. فقَالَ قائل:

تَأْبَى فَمَا تَطْلُعُ لَنَا فِي رِسْلِهَا ... إِلاَّ مُعَذَّبَةً وَإِلاَّ تُجْلَدُ

فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئومەییەی كوڕی ئەبو صەڵتی بە ڕاستگۆ دانا لە دوو دێر لە هۆنراوەكەی، (كاتێ) وتی:

ڕەجول و ئەوڕ لە ژێر پێچكەی ڕاستی عەرشن نەسر و لەیثیش لەلای چەپەن سەنگەریان پێ گیراوە

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەكات، ئومەییەش (دێری دووەمی دەست پێ كرد) و وتی:

خۆریش هەڵدێت لە كۆتایی هەموو شەوێكدا بە ڕەنگ سوری، ڕەنگی دەبێتە ڕەنگی گوڵین

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەكات، جا كەسێكیش وتی:

ڕۆژ ڕەتی كردەوە بەوەی بە ئارەزووی خۆی بۆمان هەڵبێ تەنها بە سزادراوی و بە زۆرلێكراوی نەبێت

تێبینی: ئومەییەی كوڕی صەڵت لە دوو دێرە شیعرەكانی باسی هەڵگرانی عەرش و هەڵاتنی خۆر دەكات، جا دێرە شیعری سێیەم كە زیادكراوە باس لەوە دەكات كە خۆر بە ئارەزوی خۆی هەڵنایێت چونكە پێی خۆش نیە هەڵبێت بەسەر كەسانێك كە خۆر دەپەرستن و پەرستشی خوا ناكەن، جا خوای پەروەردگار فەرمان بە فریشتەكان دەكات ئەگەر بە زۆریش بێت دەبێت هەڵبێت، جا هەڵدێت بە ڕەنگ پەڕیوی (ئەوە مەبەستی شیعرەكەیە).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی كە هەندێك لە هۆنراوە حیكمەت و داناییین

٢٧٥٤ - «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً»[2].

واتە: لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: بە دڵنیایی هەندێك لە شیعر و هۆنراوە حیكمەت و داناییین.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: ئەگەر ناخی یەکێک لە ئێوە پڕ بێت (لە کێم و زوخاو چاکترە لەوەی پڕ بێت لە شیعرو هۆنراوە)

٢٧٥٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لأنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا أَوْ دَمًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ناخی یەکێک لە ئێوە پڕ بێت لە کێم و زوخا و چاکترە بۆی لەوەی پڕ بێت لە شیعر و هۆنراوە (ئەگەر هۆنراوەکان خراپ بن، یان ئەگەر هەر لە دوای خۆشویستنی وشەکاری بێت و واز لە قورئان و فەرموودە و واجبی سەر شانی و هەقیقەت بهێنێت).




# پەرتوکی ریقـــاق

## (ئەو باسانەی کە دڵی مرۆڤ نەرم دەکەن)



## بابەت: خوا بیەوێت چاکە لەگەڵ کەسێک بکات لە ئایین شارەزای دەکات

٢٧٥٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا، يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خوا بیەوێ خێر و چاکەی لەگەڵ بکات ئەوە لە ئاینی ئیسلام شارەزای دەکات.

## بابەت: ئەوەی هاتووە دەربارەی لەش ساغی و هەبوونی دەرفەت و کات

٢٧٥٧ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الصِّحَّةَ وَالْفَرَاغَ نِعْمَتَانِ مِنْ نِعَمِ اللهِ، مَغْبون فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ: لەش ساغی و کات و دەرفەت هەبوون دوو نیعمەتن لە نیعمەتەکانی خوا، زۆر لە خەڵکی دۆڕاو و فێڵ لێکراون (چونکە ئەو دوو نیعمەتە ناقۆزنەوە بۆ شتی بە سودی دونیا و دواڕۆژیان، بەڵکو لە شتی پوچ و توڕەهات بەسەری دەبەن).

## بابەت: دەربارەی پاراستنی بیستن و بینین (پاراستنی چاو و گوێ)

٢٧٥٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک گوێ ڕادێرێت و گوێ بداتە قسەی خەڵکانێک لەکاتێکدا ئەوان پێیان ناخۆشە ئەو گوێی لێبێ، ئەوە مس دەکرێتە گوێچکەیەوە.

٢٧٥٩ - «عَنْ عَلِيٍّ ؓ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ الأُولَى لَكَ، وَالآخِرَةَ عَلَيْكَ»[٤].

واتە: لە عەلیەوە ؓ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەزەرێکی بە ئەنقەست مەکە دوای نەزەرێکی لەناکاو و بێ ویست، چونکە هی یەکەم بۆ خۆتە (واتە: تاوانت لەسەر نیە، چونکە بێ ویستی تۆ بووە)، (بەڵام) هی دووەمیان لەسەرتە (گوناهەکەی).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ حسن.

## بابەت: دەربارەی پاراستنی زمان

٢٧٦٠- «عَنِ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ فِي الإِسْلاَمِ لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا. قَالَ: اتَّقِ اللهَ، ثُمَّ اسْتَقِمْ. قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ شَيْءٍ؟ قَالَ: فَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ»(١).

واتە: لە یەعلای کوڕی عەتائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی سوفیان بوو، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێ بدە بە کردەوەیەک لە ئیسلام (کە زۆر گشتگیر بێت) پرسیاری لێ لە کەس نەکەم، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: تەقوای خوا بکە، دواتر بەردەوامبە (لەسەر تەقواکەت)، دەڵێ وتم: دواتر چ شتێکی تر؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ زمانی کرد (واتە: زمانت بپارێزە لە تاوان و شتی پڕ و پوچ).

٢٧٦١ - «عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مُرْنِي بِأَمْرٍ أَعْتَصِمُ بِهِ. قَالَ: قُلْ رَبِّيَ اللهُ ثُمَّ اسْتَقِمْ. قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ مَا أَكْثَرُ مَا تَخَوَّفُ عَلَيَّ؟ قَالَ: فَأَخَذَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ بِلِسَانِهِ ثُمَّ قَالَ: هَذَا»(٢).

واتە: لە سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم بە کارێک پێ بکە دەستی پێوە بگرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێ الله پەروەردگارمە، دواتر بەردەوامبە (لەسەر ئەم تەوحیدە)، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە چی دەترسێیت لە مندا؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زمانی خۆی گرت و فەرمووی: ئەمە.

٢٧٦٢ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ: أَيُّ الإِسْلاَمِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»(٣).

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام ئیسلامەتی (کەسی مسوڵمان) چاکترینە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی مسوڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەتن (کەس ئازار و ناڕەحەتی بەدەست و زمانیەوە نابینێت).

## بابەت: دەربارەی بێ دەنگی

٢٧٦٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ صَمَتَ نَجَا»(٤).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بێ دەنگ بێت ڕزگاری بووە (لە سزای دواڕۆژ و بەڵای دونیا).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی غەیبەت (باسکردنی پاشە ملە)

٢٧٦٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قِيلَ لَهُ: مَا الْغِيبَةُ؟ قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ. قِيلَ: وَإِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: فَإِنْ كَانَ فِيهِ، فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ، فَقَدْ بَهَتَّهُ»(١).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێراوەتەوە پێی وتراوە: غەیبەت چیە؟ فەرمووی: (غەیبەت بریتیە لە) باسکردنی برای مسوڵمانت (یان خوشکی مسوڵمانت) بەوەی پێی ناخۆشە، وترا: ئەی ئەگەر براکەم (یان خوشکەکەم) ئەوەی تیا بوو کە دەیڵێم (واتە: قسەکەم ڕاست بوو)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر شتەکەی تیا بێت ئەوە غەیبەتت کردوە، ئەگەر تیاشی نەبێت ئەوە بوختانت پێی کردوە (لە غەیبەت گەورەتر).

## بابەت: دەربارەی درۆ

٢٧٦٥ - «عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ - يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ شَرَّ الرَّوَايَا رَوَايَا الْكَذِبِ، وَلاَ يَصْلُحُ مِنَ الْكَذِبِ جِدٌّ وَلاَ هَزْلٌ، وَلاَ يَعِدُ الرَّجُلُ ابْنَهُ ثُمَّ لاَ يُنْجِزُ لَهُ: إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّهُ يُقَالُ لِلصَّادِقِ: صَدَقَ وَبَرَّ، وَيُقَالُ لِلْكَاذِبِ: كَذَبَ وَفَجَرَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقًا، وَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّابًا، وَإِنَّهُ قَالَ لَنَا: هَلْ أُنَبِّئُكُمْ مَا الْعَضْهُ؟ وَإِنَّ الْعَضْهَ: هِيَ النَّمِيمَةُ الَّتِي تُفْسِدُ بَيْنَ النَّاسِ»(٢).

واتە: لە ئەبو ئەحوەصەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خراپترین گێڕانەوەکان گێڕانەوەی درۆیە و، نە لە کاتی ئاسایی و جیددی و نە لە کاتی گاڵتەدا درۆ ناگونجێ، وە با هیچ کەسێک بەڵێن نەدات بە منداڵەکەی و دواتریش بۆی جێبەجێ نەکات (حەتمەن ئەوەش هەر درۆیە)، ڕاستگۆیی ڕێ نیشاندەرە بۆ چاکە، چاکەش ڕێ نیشاندەرە بۆ بەهەشت، درۆش پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ خراپەکاری، خراپەکاریش دەبێتە هۆکار بۆ ئاگر و چوونە دۆزەخ، وە بە کەسی ڕاستگۆ دەوترێت: ڕاستی کرد و چاکەی کرد، وە بەکەسی درۆزنیش دەوترێت: درۆی کرد و خراپەی کرد، وە مرۆڤ هەیە ئەوەندە ڕاست دەڵێت تاوەکو لای خوا بە ڕاستگۆ دەنوسرێت و ناوی تۆمار دەکرێت، وە مرۆڤ هەیە ئەوەندە درۆ دەکات تاوەکو لای خوا بە درۆزن تۆمار دەکرێت و بە درۆزن ناوی دەنوسرێت، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: ئایا پێتان بڵێم عیضە چیە؟ نەمیمەت و قسە هێنان و بردنە کە بەینی خەڵک تێک دەدات.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی پاراستنی دەست

٢٧٦٦ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»(١).

واتە: لە شەعبیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرِ بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت بن.

## بابەت: دەربارەی خواردنی پاک و حەڵاڵ

٢٧٦٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ الطَّيِّبَ، إِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، قَالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ المؤمنون، وَقَالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟»(٢).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە خوا پاکە و هیچ شتێک قبوڵ ناکات جگە لە پاک و حەڵاڵ، خوا فەرمانی بە بڕواداران کردوە بە هەمان ئەو شتەی فەرمانی بە پێغەمبەران کردوە، فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: (ئەی پێغەمبەران لە شتی پاک و حەڵاڵ بخۆن و کردەوەی چاک ئەنجام بدەن، من بەو کردەوانەی دەیکەن زانام) وە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بخۆن لەو شتە پاک و حەڵاڵانەی کە پێمان بەخشیون، وە شوکرانەبژێری خوا بکەن ئەگەر ئێوە ئەو دەپەرستن).

دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دواتر باسی پیاوێکی کرد سەفەرێکی درێژ دەکات، قژی ئاڵۆزی تێک قژقژای تۆزاویە، دەستی بەرەو ئاسمان درێژ دەکات و دەڵێت: ئەی پەروەردگارا (واتە: دوعا و نزای زۆر دەکات)، لەکاتێکدا خواردنی حەڕامە و، پۆشاکی حەڕامە و، خواردنەوەی حەڕامە، چۆن وەڵامی نزاکانی دەدرێتەوە؟

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو ئەندازەیەی بەسە لە دونیادا

٢٧٦٨ - «عَنْ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَكْفِي أَحَدَكُمْ مِنَ الدُّنْيَا خَادِمٌ وَمَرْكَبٌ»(١).

واتە: لە بورەیدەی ئەسلەمیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خزمەتكارێک و سوارییێک بەسە بۆ هەر یەكێكتان لە دونیا (واتە: دانەیەک بەسە لەو شتە پێویستیانە).

## بابەت: دەربارەی ڕۆیشتن و مردن و نەمانی چاكەكاران

٢٧٦٩ - «عَنْ مِرْدَاسٍ الأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ أَسْلاَفًا، وَيَبْقَى حُثَالَةٌ كَحُثَالَةِ الشَّعِيرِ»(٢).

واتە: لە میرداسی ئەسلەمیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاكەكاران دەمرن لە پێشدا، پوشو پەڵاشیش دەمێننەوە وەک پوشو پەڵاش و قەرسیلی جۆ (واتە: خەڵكی خاپەڕۆک دەمێننەوە).

## بابەت: دەربارەی پارێزگاری كردن لە ڕۆژوو

٢٧٧٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كَمْ مِنْ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلاَّ الظَّمَأُ، وَكَمْ مِنْ قَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قِيَامِهِ إِلاَّ السَّهَرُ»(٣).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: چەند ڕۆژووگر هەیە هیچی بۆ نامێنێتەوە لە ڕۆژووەكەی تەنها تینوەتی نەبێت، وە چەند شەونوێژكاری زۆر هەیە هیچی بۆ نامێنێتەوە لە شەونوێژەكەی تەنها شەونخونی و خەو زڕان نەبێت.

## بابەت: دەربارەی پارێزگاری كردن لە نوێژ

٢٧٧١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ الصَّلاَةَ يَوْمًا فَقَالَ: مَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا، كَانَتْ لَهُ نُورًا، وَبُرْهَانًا، وَنَجَاةً مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهَا، لَمْ تَكُنْ لَهُ نُورًا، وَلاَ نَجَاةً، وَلاَ بُرْهَانًا، وَكَانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَعَ قَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ، وَأُبَيِّ بْنِ خَلَفٍ»(٤).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە ڕۆژێکیان باسی نوێژی کرد و فەرمووی: هەر کەسێک پارێزگاری لێ بکات، ئەوە بۆی دەبێتە ڕووناکی و بەڵگە و ڕزگاری لە ئاگر لە ڕۆژی دواییدا، وە هەر کەسێکیش پارێزگاری لێ نەکات، ئەوە نە بۆی دەبێتە ڕووناکی و نە ڕزگاری و نە بەڵگە، وە لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ قاڕوون و فیرعەون و هامان و ئوبەی کوڕی خەلەفە (واتە: لەگەڵ ئەوانە لە دۆزەخ).

## بابەت: دەربارەی شەونوێژ

٢٧٧٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَرْغَبُ فِي قِيَامِ اللَّيْلِ حَتَّى قَالَ: وَلَوْ رَكْعَةً»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەدا بۆ شەونوێژ هەتا فەرمووی: ئەگەر ڕەکعەتێکیش بێت.

## بابەت: دەربارەی داوای لێخۆشبوون (لە خوا) کردن

٢٧٧٣ - «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ فِي لِسَانِي ذَرَبٌ عَلَى أَهْلِي، وَلَمْ يَكُنْ يَعْدُوهُمْ إِلَى غَيْرِهِمْ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَيْنَ أَنْتَ مِنَ الإِسْتِغْفَارِ؟ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللهَ كُلَّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ».

«قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ أَبَا بُرْدَةَ، وَأَبَا بَكْرٍ، ابْنَيْ أَبِي مُوسَى، قَالاَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَسْتَغْفِرُ اللهَ كُلَّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، أَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ»[٢].

واتە: لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زمانم تیژ بوو لەسەر خانەوادەکەم (زۆر قسەم پێ دەوتن)، بەڵام لەوان تێپەڕی نەدەکرد بۆ غەیری ئەوان (واتە: بۆ خەڵکی وا نەبووم)، جا پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد (وتم: ڕەنگە بچم بۆ دۆزەخ بەهۆی زمانمەوە، جا چی بکەم)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ چۆنی لە ئیستیغفار کردن (ئەم تاوانانە پێویستیان بە ئیستیغفارە)؟ من هەموو ڕۆژێک سەد جار ئیستیغفار و داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم.

ئەبو ئیسحاق وتویەتی: منیش ئەو فەرموودەیەم بۆ ئەبو بوردە و ئەبوبەکر ـ دوو کوڕەکانی ئەبو موسا ـ گێڕایەوە، وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ڕۆژێک سەد جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای و تەوبە دەکەم.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ ضعيف.

## بابەت: دەربارەی پارێزکاری

٢٧٧٤ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَرَأَ: ﴿ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾ ﴾ المدثر، قَالَ: قَالَ رَبُّكُمْ: أَنَا أَهْلٌ أَنْ أُتَّقَى، فَمَنِ اتَّقَانِي فَأَنَا أَهْلٌ أَنْ أَغْفِرَ لَهُ»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، کە ئەو ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾ ﴾ المدثر، فەرمووی: پەروەردگارتان فەرموویەتی: [من ئەهلی ئەوەم کە لێم بترسن و بەحیساب بۆ خەشم و توڕەبوونم بکرێت، جا هەر کەسێک پارێزکار بوو، ئەوە من ئەهلی ئەوەم لێی خۆش ببم].

٢٧٧٥ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي لأَعْلَمُ آيَةً لَوْ أَخَذَ بِهَا النَّاسُ لَكَفَتْهُمْ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق»[2].

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من ئایەتێک دەزانم ئەگەر خەڵک دەستی پێوە بگرن ئەوە بەسیانە: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق، (چونکە لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت: هەر کەسێک پارێزگاری لە سنوری خوا بکات ئەوە خوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوە).

## بابەت: دەربارەی تاوانە بەکەمدانراوەکان

٢٧٧٦ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا عَائِشُ، إِيَّاكِ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ، فَإِنَّ لَهَا مِنَ اللهِ طَالِبًا»[3].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەی عائیشە خۆت بپارێزە لە تاوانە بەکەمدانراوەکان، چونکە ئەو تاوانانە لای خوای پەروەردگار داواکراوە و خوا داوای دەکات و لێپێچینەوەی لەسەرە.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی تەوبە و پەشیمانی

٢٧٧٧ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو نەوەی ئادەم گوناهی زۆرە و، چاكترینی گوناهبارانیش ئەوانەن كە زۆر تەوبەكارن و زوو زوو دەگەڕێنەوە.

## بابەت: خوا خۆشحاڵترە بەتەوبەی بەندەكەی
## (زیاتر لەهەر مرۆڤێک كاتێك ئەوپەڕی خۆشحاڵە)

٢٧٧٨ - «عَنِ النُّعْمَانِ هُوَ ابْنُ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: سَافَرَ رَجُلٌ فِي أَرْضٍ تَنُوفَةٍ، فَقَالَ: تَحْتَ شَجَرَةٍ وَمَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا زَادُهُ وَطَعَامُهُ، فَاسْتَيْقَظَ وَقَدْ ذَهَبَتْ رَاحِلَتُهُ، فَعَلاَ شَرَفًا، فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، ثُمَّ عَلاَ شَرَفًا، فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، ثُمَّ عَلاَ شَرَفًا، فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، قَالَ: فَالْتَفَتَ، فَإِذَا هُوَ بِهَا تَجُرُّ خِطَامَهَا، فَمَا هُوَ بِأَشَدَّ فَرَحًا بِهَا مِنَ اللهِ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ إِذَا تَابَ إِلَيْهِ»[2].

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک سەفەری كرد لە ناوچەیەكی وشک و بێ ئاو، بە ڕۆژ سەرخەوێكی شكاند لە ژێر درەختێک و سواریەكەشی لەگەڵ بوو، توێشوو و خۆراكەكەی لەسەر پشتی وڵاغەكەی بوو، جا خەبەری بوویەوە لە خەوەكەی لەكاتێكدا سواریەكەی ڕۆیشتبوو (لە پەتەكەی ببوویەوە و هەڵاتبوو)، جا بەسەر شوێنێكی بەرز كەوت (بەڵكو بیدۆزێتەوە)، بەڵام هیچ شتێكی نەبینی، دواتر بەسەر شوێنێكی تری بەرز كەوت و هیچ شتێكی نەبینی، جا (چاوەڕێی مردنی دەكرد و بێ ئومێد بوو) و خەوی لێكەوت و (لەناكاو) ئاوڕی دایەوە بینی وڵاغەكە لەلایەتی و هەوسارەكەی لەدوای خۆی ڕادەكێشێت و (گەڕاوەتەوە)، جا ئەم پیاوە خۆشحاڵتر و ڕازیبوونی زیاتر نیە (بەگەڕانەوەی ژیانی) لە خۆشحاڵی و ڕازیبوونی خوای پەروەردگار بە گەڕانەوە و تەوبەی بەندەكەی كاتێ دەگەڕێتەوە بۆ لای.

## بابەت: دەربارەی ئاوات و ئەجەل

٢٧٧٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ خَطًّا مُرَبَّعًا، ثُمَّ خَطَّ وَسَطَهُ خَطًّا، ثُمَّ خَطَّ حَوْلَهُ خُطُوطًا، وَخَطَّ خَطًّا خَارِجًا مِنَ الْخَطِّ، فَقَالَ: هَذَا الإِنْسَانُ لِلْخَطِّ الأَوْسَطِ، وَهَذَا الأَجَلُ مُحِيطٌ بِهِ، وَهَذِهِ الأَعْرَاضُ لِلْخُطُوطِ فَإِذَا أَخْطَأَهُ وَاحِدٌ نَهَشَهُ الآخَرُ، وَهَذَا الأَمَلُ لِلْخَطِّ الْخَارِجِ»[3].

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هێڵێکی بۆ کێشاین، هێڵێکی چوارگۆشە، دواتر هێڵێکی لە ناوەڕاستی کێشا، دواتر چەندین هێڵی لە دەوروبەری کێشان، وە هێڵێکیشی لە دەرەوەی هێڵە چوارگۆشەکە کێشا و بە هێڵەکەی ناوەڕاستی فەرموو: ئەمەیان مرۆڤە، وە ئەمەشیان ئەجەلە دەورەیداوە (مەبەستی چوارگۆشەکەیە)، ئەمانەش ناخۆشی و نەخۆشین (بە کۆمەڵە هێڵەکانی دەوروبەری هێڵەکەی ناوەڕاستی فەرموو)، جا ئەگەر یەکێک لەو بەڵایانە نەیگرێت ئەوەیتر دەیگرێت (واتە: مەحاڵە تووشی لەمپەر و ناخۆشی نەبێت و ڕێگەی لێ نەگیرێت لە هەندێک لە ئاواتەکانی)، وە ئەمەشیان خۆزگە و ئاواتە، بە هێڵەکەی دەرەوەی فەرموو (واتە: هەردەم ئاواتەکانی مرۆڤ لە دواوەی ئەجەلن، یانی: هێشتا ئاوات و خۆزگەکانی تەواو نابن ئەو تەمەنی تەواو دەبێت و ئەجەل یەخەی دەگرێت).

## بابەت: ماڵ پەرستی لە گورگ خراپتر بەسەر دین دەهێنن

٢٧٨٠ - «عَنْ ابْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا ذِئْبَانِ جَائِعَانِ أُرْسِلاَ فِي غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَهَا مِنْ حِرْصِ الْمَرْءِ عَلَى الْمَالِ وَالشَّرَفِ لِدِينِهِ»[١].

واتە: لە ئیبنو کەعبی کوری مالیکەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو گورگی برسی کە بەربدرێنە ناو ڕانە مەڕێک خراپتری لێناکەن لەوەی حەریصی و چڵێسی مرۆڤ لەسەر سەروەت و سامان و، شوهرەت و ناوبانگویستی بە دینی مرۆڤی دەکات (واتە: دینی مرۆڤ خراپتری بەسەر دێت بە هۆی حەریصی لەسەر سەروەت و شوهرەت لەو ڕانە مەڕەی دوو گورگی برسی دەکەونە ناوی).

## بابەت: دەربارەی گومانی چاک بردن بە خوا

٢٧٨١ - «عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، فَلْيَظُنَّ بِي مَا شَاءَ»[٢].

واتە: لە واثیلەی کوڕی ئەسقەفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خوای تبارک و تعالی فەرموویەتی: من لەگەڵ گومانی بەندەکەمم بە من، کەواتە با چۆنی دەوێت گومانم پێ بەرێت (بەپێی گومانی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکەم).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: هۆز و خزمە نزیکەکانی خۆت ئاگادار بکەرەوە: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ ﴾ الشعراء

٢٧٨٢ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ ﴾ الشعراء، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللهِ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئًا، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللهِ شَيْئًا، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللهِ، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئًا، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، سَلِينِي مَا شِئْتِ، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ وتویەتی: کاتێ خوای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ ﴾ الشعراء، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورەیش، خۆتان بکڕنەوە لە خوا، من هیچ سودتان پێناگەیەنم لە سزای خوا (ناتوانم بتانپارێزم)، ئەی بەنی عەبدی مەناف، من هیچ سودتان پێناگەیەنم لە سزای خوا (ناتوانم بتانپارێزم)، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، من هیچ سودت پێناگەیەنم لە سزای خوا (ناتوانم بتپارێزم)، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد، هەرچی دەتەوێ داوام لێ بکە، بەڵام من هیچ سودت پێناگەیەنم لە سزای خوا (ناتوانم بتپارێزم).

## بابەت: هیچ کەسێک لە ئێوە کردەوەکەی ڕزگاری ناکات

٢٧٨٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَنْ يُنْجِيَهُ عَمَلُهُ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَلاَ أَنْتَ؟ قَالَ: وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ»[٢].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزیک بکەونەوە (لە تەواوترین و کاملترین کردەوەکان) و پابەندی ئیستیقامە و ناوەندگیری بن، وە بزانن هیچ کەسێک لە ئێوە کردەوەکانی ڕزگاری ناکات، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هەتا تۆش؟ فەرمووی: هەتا منیش، مەگەر خوا بە ڕەحمەت و فەزڵی خۆی دامبپۆشێت.

## بابەت: هیچ کەسێک نیە لە ئێوە حەتمەن جنێکی لەگەڵە

٢٧٨٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَمَعَهُ قَرِينُهُ مِنَ الْجِنِّ، وَقَرِينُهُ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ. قَالُوا: وَإِيَّاكَ؟ قَالَ: نَعم وَإِيَّايَ، وَلَكِنَّ اللهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: مِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ: أَسْلَمَ: اسْتَسْلَمَ يَقُولُ: ذَلَّ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە لە ئێوە حەتمەن هاوەڵێکی بەردەوامی لە جنۆکە و هاوەڵێکی بەردەوامی لە فریشتەی لەگەڵە، وتیان: تۆش؟ فەرمووی: بەڵێ منیش، بەڵام خوا یارمەتیدام بۆ زاڵ بوون بەسەریدا و مسوڵمان بوو.

## بابەت: ئەگەر بزانن ئەوەی من دەیزانم

٢٧٨٥ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»[١].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر بزانن ئەوەی من دەیزانم، ئەوە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان.

٢٧٨٦ - «حَدَّثَنَا عَفَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِمِثْلِ هَذَا»[٢].

واتە: لەم ڕێگەیەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی بێ نرخی دونیا لای خوا

٢٧٨٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِسَخْلَةٍ جَرْبَاءَ قَدْ أَخْرَجَهَا أَهْلُهَا، قَالَ: تُرَوْنَ هَذِهِ هَيِّنَةً عَلَى أَهْلِهَا؟ قَالُوا: نَعم. قَالَ: وَاللهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ هَذِهِ عَلَى أَهْلِهَا»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەلای کاریلەیەکی تازە لەدایکبووی گوڕی تێپەڕ بوو (کە نەخۆشی گوڕی بوونی گرتبوو و مردبوو) خاوەنەکەی فڕێیدابوو، فەرمووی: دەبینن ئەوە چەند بێ نرخە لای خاوەنەکەی؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: سوێند بەخوا دونیا زۆر بێ نرخترە لای خوا لەو کاریلە گوڕیە لای خاوەنەکەی.

## بابەت: کام کردەوە چاکترینە

٢٧٨٩ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيمَانٌ بِاللهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِ اللهِ»[٤].

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی: کام لە کردەوە چاکترینە؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بڕواهێنان بە خوا و تێکۆشان لە پێناوی خوا.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف جداً، لكن الحديث صحيح لغيره.

(٤) ـ صحيح.

٢٧٩٠ - «عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَفْضَلُ الأَعْمَالِ عِنْدَ اللهِ إِيمَانٌ لاَ شَكَّ فِيهِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَبُو جَعْفَرٍ: رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ»[١].

واتە: لە ئەبو جەعفەرەوە گێردراوەتەوە کە گوێی لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین کردەوە لای خوا بڕوایێکە کە گومانی تیا نەبێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەبو جەعفەر پیاوێکە لە ئەنصاریەکان.

## بابەت: هیچ یەکێکتان ئیمانی تەواو نابێت تا ئەوشتانەی پێ خۆش نەبێت بۆ براکەی، کە بۆ خۆی پێی خۆشە

٢٧٩١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[٢].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەس لە ئێوە بڕوا و ئیمانی تەواو نابێت تاوەکو ئەوەی پێ خۆش نەبێت بۆ براکەی کە بۆ خۆی پێی خۆشە.

٢٧٩٢ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ، وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[٣].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کەستان ئیمان و بڕوای تەواو نابێت تاوەکو منی خۆشتر نەوێت لە باوکی و منداڵەکانی و خەڵکی بە تێکڕا.

## بابەت: کام لە بڕواداران چاکترینە

٢٧٩٣ - «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: مَنْ طَالَ عُمُرُهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ، قَالَ: فَأَيُّ النَّاسِ شَرٌّ؟ قَالَ: مَنْ طَالَ عُمُرُهُ، وَسَاءَ عَمَلُهُ»[٤].

واتە: لە ئەبو بەکرە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام لە خەڵکی چاکترینە؟ فەرمووی: ئەوەی تەمەنی درێژە و کردەوەشی چاکە، پیاوەکە وتی: ئەی کام لە خەڵکی خراپترینە؟ فەرمووی: ئەوەی تەمەنی درێژە و کردەوەشی خراپە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

٢٧٩٤ - «حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، بِإِسْنَادِهِ، مِثْلَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی و فەزڵی كۆتایی ئەم ئوممەتە

٢٧٩٥ - «عَنْ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي جُمُعَةَ ﷺ - رَجُلٍ مِنَ الصَّحَابَةِ: حَدِّثْنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: نَعم أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا جَيِّدًا: تَغَدَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَمَعَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَحَدٌ خَيْرٌ مِنَّا؟ أَسْلَمْنَا وَجَاهَدْنَا مَعَكَ؟ قَالَ: نَعم، قَوْمٌ يَكُونُونَ مِنْ بَعْدِكُمْ يُؤْمِنُونَ بِي وَلَمْ يَرَوْنِي»[٢].

واتە: لە ئەبو موحەیریزەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئەبو جومەعەم ﷺ وت كە پیاوێک بوو لە هاوەڵان وتم: فەرموودەیەكمان بۆ بگێڕەوە كە گوێبیستی بوویت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، وتی: بەڵێ باشە فەرموودەیەكی چاكت بۆ دەگێڕمەوە، نانی ئێوارەمان خوارد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕڕاحیشمان لەگەڵ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا كەسێک هەیە لە ئێمە چاكتر بێت؟ ئێمە مسوڵمان بووین و جیهادمان كردوە لەگەڵ تۆ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ (كەسێک هەیە چاكتر بێت لە ئێوە)، خەڵكانێكن لە دوای ئێوە دێن، بڕوام پێ دەهێنن و نەیان بینیوم.

## بابەت: دەربارەی بێ ئاگا نەبوون لە قوڕئان

٢٧٩٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: بِئْسَمَا لأَحَدِكُمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ، فَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَسْرَعُ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ مِنْ عُقُلِهَا»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتی: خراپترین شت بۆ یەكێک لە ئێوە ئەوەیە كە دەڵێت: ئەوەندە و ئەوەندە ئایەتەم لەبیر چۆتەوە، (لەبیری نەچۆتەوە) بەڵكو لەبیری براوەتەوە (چونكە مراجەعەی نەكردۆتەوە و بێ ئاگا بووە لێی)، زۆر قوڕئان دەور بكەنەوە، چونكە خێراتر دەڕوات و دەردەچێت لە سینگی كەسەكان لە دەرچونی وشتر لە پەتەكەی.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: بۆ کەس نیە بڵێت: من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتا[(١)]

٢٧٩٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى»[(٢)].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ کەسێک لە ئێوە نەڵێت: من باشترم لە پێغەمبەر یونسی کوڕی مەتا (تەنها لەبەر ئەوەی گەلەکەی جێهێشت، نەخێر کەس ناگات بە ئەو، چونکە ئەو پێغەمبەرە).

## بابەت: خێر و صەدەقە لەسەر هەموو مسوڵمانێک پێویستە

٢٧٩٨ - «عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يَعْتَمِلُ بِيَدَيْهِ فَيَأْكُلُ مِنْهُ وَيَتَصَدَّقُ. قَالُوا: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ، قَالُوا: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يَأْمُرُ بِالْخَيْرِ. قَالُوا: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: يُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ»[(٣)].

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ﵁ گێڕدرەوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر هەموو مسوڵمانێک خێر و صەدەقە پێویستە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نەیتوانی، یان نەیکرد؟ فەرمووی: ئیش دەکات بە دەستەکانی و لێی دەخوات و خێر و صەدەقەی پێ دەکات، وتیان: ئەی ئەگەر نەیکرد؟ فەرمووی: یارمەتی کەسێکی خاوەن پێویستی و گیرۆدە دەدات، وتیان: ئەگەر ئەوەشی نەکرد؟ فەرمووی: فەرمان بە چاکە دەکات، وتیان: ئەگەر ئەوەشی نەکرد؟ فەرمووی: خۆی دەگرێتەوە لە خراپە (نابێتە بەشێک لە خراپە)، ئەوە بۆ ئەو خێر و صەدەقەیە.

## بابەت: هەر کەسێک ڕووپامایی بکات بۆ ئەوەی خەڵک چاکەکانی ببینێت ئەوە خوا ڕیسوای دەکات و ڕیسواییەکەی بە خەڵک نیشان دەدات

٢٧٩٩ - «حَدَّثَنِي أَبُو هِنْدٍ الدَّارِيُّ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَامَ مَقَامَ رِيَاءٍ وَسُمْعَةٍ، رَاءَى اللهُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَسَمَّعَ»[(٤)].

واتە: لە ئەبو هیندی داریەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بکەوێتە شوێن ڕیابازی و ناوبانگەوە (کردەوەکانی بۆ خەڵک ئەنجام بدات تا گوێی لە مەدحی

---

(١) ـ تەنها لەبەرئەوەی قەومەکەی جێهێشت.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

خۆی بێت)، ئەوە خوا کردەوەکانی بە خەڵک نیشان دەدات و گوێبیستیان دەکات، بەوەی فڵان کەس کردەوەکانی بۆ خوا نەبوو، ڕیسواییەکەی دەردەخات لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: نمونەی کەسی بڕوادار وەک نمونەی دەغڵ وایە

٢٨٠٠ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَثَلُ الْمُؤْمِنِ مَثَلُ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ تُفَيِّئُهَا الرِّيَاحُ: تُعَدِّلُهَا مَرَّةً، وَتُضْجِعُهَا أُخْرَى حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمَوْتُ. وَمَثَلُ الْكَافِرِ كَمَثَلِ الأَرْزَةِ الْمُجْذِيَةِ عَلَى أَصْلِهَا لاَ يُصِيبُهَا شَيْءٌ حَتَّى يَكُونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِدَةً قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الْخَامَةُ: الضَّعِيفُ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە کەعبی کوڕی مالیکی باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نمونەی بڕوادار وەک نمونەی چوقڵی لاوازی دانەوێڵە وایە، با دەیجوڵێنێت: جارێک ڕاستی دەکاتەوە و جارێکیش لە زەوی ڕایدەکێشێت (واتە: ئەوەندە نەرمونیانە)، تاوەکو مردن بۆی دێت و دەمرێت، نمونەی کافریش وەک سنۆبەرێکی جێگیر وایە هیچی بەسەر نایێت (واتە: هەر لەسەر ڕەقی کوفرەکەی بەردەوامە)، تاوەکو هەڵکەندنەکەی بە یەک جاری دێت (واتە: تا ئەو کاتەی لەناکاو دەمرێت).

## بابەت: دونیا سەوز و شیرینە

٢٨٠١ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا حَكِيمُ إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرٌ حُلْوٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ، بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى»[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییب و عوروەی کوڕی زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ وتویەتی: داوای (ماڵ و سامانم) لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و پێیدام، دواتر داوام لێ کرد و پێیدام، دواتر داوام لێ کرد و پێیدام، دواتر داوام لێ کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی حەکیم ئەو ماڵ و سامانە سەوز و شیرینە، جا هەر کەسێک بە نەفسێکی سەخیەوە وەریبگرێت (واتە: زۆر لە دڵی شیرین نەبێت)، ئەوە بەرەکەتی تیا دەخرێت بۆی، وە هەر کەسێکیش بە نەفسێکی حەریس و برسی وەریبگرێت (واتە: هەموو ئاواتی پارە بێت و نەفسێکی پارە دۆستی هەبێت)، ئەوە بەرەکەتی بۆ تیا ناخرێت و، وەک ئەو کەسە وایە کە هەر دەخوات و تێر نابێت، وە دەستی بەرز و بەخشەر چاکترە لە دەستی نزم و وەرگر.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: خوا قسەو قسەلۆكی لێ قەدەغە كردوون

٢٨٠٢ - «عَنْ الْمُغِيرَةِ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ وَأْدِ الْبَنَاتِ، وَعُقُوقِ الأُمَّهَاتِ، وَعَنْ مَنْعٍ وَهَاتِ، وَعَنْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ»[١].

واتە: لە موغیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە: لە زیندەبەچاڵ كردنی كچان و، لە ئازاردانی دایكان و، لە قەدەغەكردن و نەدانی هەق و واجباتەكان و وەرگرتنی شت بە ناهەق و، لە قسەو قسەلۆك و، لە زۆر داواكردن و دەرۆزەكردن و، لە ماڵ بە فیڕۆدان.

## بابەت: دەربارەی پێشەوایانی گومڕاكەر

٢٨٠٣ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الأَئِمَّةَ الْمُضِلِّينَ»[٢].

واتە: لە ثەوبانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەنها لە پێشەوایانی گومڕاكەر دەترسم لەسەر ئوممەتەكەم.

## بابەت: براكەت سەر بخە چ ستەمكار بێت چ ستەملێكراو

٢٨٠٤ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لِيَنْصُرِ الرَّجُلُ أَخَاهُ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا، فَإِنْ كَانَ ظَالِمًا، فَلْيَنْهَهُ، فَإِنَّهُ لَهُ نُصْرَةٌ، وَإِنْ كَانَ مَظْلُومًا، فَلْيَنْصُرْهُ»[٣].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با پیاو براكەی سەربخات چ ستەمكار بێت چ ستەملێكراو، ئەگەر ستەمكار بوو با نەهی لێ بكات و نەهێڵێت ستەم بكات (بەمە سەركەوتووی دونیاو دوارۆژی دەكات) ئەوە بۆی دەبێتە سەركەوتن، ئەگەر ستەملێكراویش بوو ئەوە سەری بخەن (هەقی بسەنن لە ستەمكار).

تێبینی: هەمان ئەو وتەیە هەبوو و كاری پێ دەكرا لە سەردەمی نەزانیدا، بۆیە ئەگەر خەڵكانی نزیک و هۆزی خۆیان شەڕو كێشەیەكیان هەبووایە گشت هۆزەكە پشتیان دەگرت جا هەق با یان ناهەق، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان وتەی بەكارهێنا تەنها ماناكەی بەم شێوەیە گۆڕی.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دین ئامۆژگاریە

٢٨٠٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: الدِّينُ النَّصِيحَةُ. قَالَ: قُلْنَا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: دین ئامۆژگاریە، دەڵێ: وتمان: بۆ کێیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بۆ خوایە (بەوەی بڕوای پێ بهێنن)، وە بۆ پێغەمبەرەکەیەتی (بەوەی بڕوای پێ بهێنن و بە قسەی بکەن)، وە بۆ پەرتوکی خواشە (بەوەی بڕوای پێ بهێنن و جێبەجێی بکەن)، وە بۆ گەورە و کاربەدەست و زانایانی مسوڵمانانە (بەوەی گوێڕایەڵیان بکرێت لە چاکە)، وە بۆ گشت مسوڵمانانە (بەوەی یەکتری ڕێنموییی بکەن بۆ شتی چاک).

## بابەت: ئیسلام سەرەتا دەرکەوتووە بە غەریبی

٢٨٠٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا - أَظُنُّ حَفْصًا قَالَ - فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ، قِيلَ: وَمَنِ الْغُرَبَاءُ؟ قَالَ: النُّزَّاعُ مِنَ الْقَبَائِلِ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: ئیسلام سەرەتا دەرکەوت بە غەریبی (ژمارەی مسوڵمانان کەمبوون و نامۆ بوون لەناو خەڵکی)، وە بە غەریبیش دەگەڕێتەوە (واتە: دووبارە لە کۆتا زەمان کۆمەڵێکی کەمی مسوڵمانی ڕاستەقینە دەمێننەوە و نامۆ دەبن لای خەڵکی و پشتیوانیان نیە)، ـ پێم وابێ حەفص بوو ـ وتی: خۆشبەختی (بەهەشت) بۆ غەریبەکان، وترا: غەریبەکان کێن؟ وتی: ئەوانەن کە هۆزەکانی خۆیان جێهێشتووە (واتە: لە پێناوی دینی خوا دورکەوتونەتەوە، جا بۆ جیهاد بێت یان خوێندنی زانستی شەرعی بێت یان بۆ هەر بەرژەوەندیەکی سەرخستنی دینی خوا).

## بابەت: دەربارەی خۆشەویستی و حەز کردن بە گەیشتن بە خوا

٢٨٠٧ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ، كَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا - أَوْ بَعْضُ أَزْوَاجِهِ: إِنَّا لَنَكْرَهُ الْمَوْتَ. قَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ، وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوَانِ اللهِ وَكَرَامَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَأَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ وَأَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِعَذَابِ اللهِ وَعُقُوبَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَهَ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَكَرِهَ لِقَاءَ اللهِ، وَكَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ»[٣].

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پێی خۆش بێت بگات بە خوا ئەوە خواش پێگەیشتنی ئەوی پێ خۆشە، وە هەر کەسێک پێی ناخۆش بێت بگات بە خوا، ئەوە خواش پێگەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە، جا عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) ـ یان یەکێک لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ـ وتی: ئێمە مردنمان پێ ناخۆشە (ئەی ئەوە نابێتە پێ ناخۆش بوونی گەیشتن بەخوا)؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەوە هەو نیە، بەڵکو کەسی بڕوادار کاتێ مردنی دەگاتێ موژدەی پێ دەدرێت بە ڕەزامەندی خوا و ڕێزلێنانی، جا لەو کاتەدا هیچ شتێک نیە لای خۆشەویست تر بێت لەوەی لەبەردەمیەتی (واتە: حەز لە ڕۆح دەرچوون و گەیشتن بە خوا دەکات)، وە کەسی کافریش کاتێ مردن دەیگاتێ هەواڵی سزای خوا و تۆڵە لێ سەندنەوەی پێ دەدرێت، جا هیچ شتێک نیە لای ناخۆشتر بێت لەوەی لەبەر دەمیەتی، بۆیە گەیشتن بە خوای پێی ناخۆش دەبێت، وە خواش گەیشتن بەوی پێ ناخۆش دەبێت.

## بابەت: دەربارەی خۆشەویستانی پێناوی خوا

٢٨٠٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابون بِجَلاَلِي؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إلاَّ ظِلِّي»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز لە ڕۆژی دواییدا دەفەرموێت: کوا ئەوانەی یەکتریان خۆشدەویست لە پێناوی من؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە بەر سێبەری خۆم (واتە: سێبەری عەڕش) ئەو ڕۆژەی هیچ سێبەرێک نیە جگە لە سێبەری (عەڕشی) من.

## بابەت: با کەس لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت

٢٨٠٩ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَتَمَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ: إِمَّا مُحْسِنًا، فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ إِحْسَانًا، وَإِمَّا مُسِيئًا، فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: با هیچ کەسێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت: (چونکە کەسەکە) یان چاکەکارە، بەڵکو چاکە زیاد بکات، یان خراپەکارە، بەڵکو خۆی لۆمە بکات و پەشیمان ببێتەوە و تەوبە بکات (کەواتە: هەر ئومێدی ژیان چاکترە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمویەتی: من نێردراوم لە کاتێکدا لەگەڵ قیامەت ئاوەهام[١]

٢٨١٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ وَهْبٌ بِالسَّبَّاحَةِ وَالْوُسْطَى».[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: من نێردراوم لەگەڵ بەرپابوونی قیامەت وەک ئەم دووانە، جا وەهب (کە یەکێکە لە ڕاویەکان) ئاماژەی کرد بە پەنجەی شاتومان و ناوەڕاست (واتە: ئەوەندە لە یەکتری نزیکین).

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ئێوە کۆتا ئوممەتن

٢٨١١ - «حَدَّثَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّكُمْ وَفَّيْتُمْ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ آخِرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللهِ».[٣]

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئێوە ژمارەی حەفتا ئوممەتەکەتان تەواو کرد، ئێوە کۆتایی ئوممەتەکانن و بەڕێزترینیانن لای خوا.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی پلەی ئەهلی بەدر

٢٨١٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَيْنَ فُلَانٌ؟ فَغَمَزَهُ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ: إِنَّهُ، وَإِنَّهُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَلَيْسَ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا؟. قَالُوا: بَلَى. قَالَ: فَلَعَلَّ اللهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ، فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ».[٤]

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کوانێ فڵان؟ جا پیاوێک لەوان ئاماژەیەکی کرد و وتی: ئاوا و ئاوایە (واتە: زەمی کابرای کرد)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: مەگەر لە شەڕی بەدر ئامادە نەبووە و بەشداری نەکردوە؟ وتیان: با، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا سەیری ئەهلی بەدری کرد و فەرمووی: ئەوەی دەتانەوێت ئەنجامی بدەن، ئەوە لێتان خۆش بووم.

---

(١) ـ ئاماژەی بە پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاست کرد.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسنز

(٤) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی (مسوڵمان) بڵێت: بارانمان بۆ باری بە جوڵەی فڵان و فڵان شت

٢٨١٣ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَوْ حَبَسَ اللهُ الْقَطْرَ عَنْ أُمَّتِي عَشْرَ سِنِينَ: ثُمَّ أَنْزَلَهُ، لَأَصْبَحَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي بِهَا كَافِرِينَ يَقُولُونَ: هُوَ بِنَوْءِ مِجْدَحٍ « قَالَ: الْمِجْدَحُ: كَوْكَبٌ يُقَالُ لَهُ: الدَّبَرَانُ».[١]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا باران ڕابگرێت لە ئوممەتەکەم دە ساڵان و دواتر بیبارێنێت، ئەوە گروپێک لە ئوممەتەکەم پێی کافر دەبن دەڵێن: ئەو بارینە بە جوڵەی میجدەح بوو.

وتویەتی: میجدەح ئەستێرەیەکە، پێشی دەوترێت: دەبەڕان.

## بابەت: چاکەیەک بە دە ئەوەندەی خۆیەتی

٢٨١٤ - «عَنْ عِيَاضِ بْنِ غُطَيْفٍ، قَالَ: أَتَيْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ ﷺ، نَعُودُهُ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا».[٢]

واتە: لە عیاضی کوڕی غوطەیفەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتین بۆ لای عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح ﷺ لەبەر نەخۆشی سەردانمان کرد، جا وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چاکەیەک بە دە ئەوەندەی خۆیەتی.

## بابەت: ئەوەی وتراوە دەربارەی دوو زمان (دوو ڕوو)

٢٨١٥ - «عَنْ عَمَّارٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ ذَا وَجْهَيْنِ فِي الدُّنْيَا، كَانَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِسَانَانِ مِنْ نَارٍ».[٣]

واتە: لە عەممارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک خاوەنی دوو ڕوو بێت (واتە: بە ڕووێک و زمانێک بچێتە لای خەڵکانێک و قسەیان بۆ بکات دواتریش بە ڕووێکیتر و زمانێکی تر بچێتە لای خەڵکانێکی تر تاوەکو دڵیان لێک بکات)، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دوو زمانی هەیە لە ئاگر (واتە: دوو زمانەکانی ئاگرن و دەم و لێو و ڕوخساری بەردەوام دەسوتێنن).

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن .

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرمویەتی: هەر پیاوێک نەفرەتم لێ کردبێت یان جوێنم پێدابێت

٢٨١٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اللَّهُمَّ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، فَأَيُّ الْمُسْلِمِينَ لَعَنْتُهُ أَوْ شَتَمْتُهُ أَوْ جَلَدْتُهُ، فَاجْعَلْهَا لَهُ صَلاَةً وَرَحْمَةً وَقُرْبَةً تُقَرِّبُهُ بِهَا إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».(١)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من هەر مرۆڤم، جا هەر یەكێک لە مسوڵمانان كە من نەفرەتم لێ كردبێت، یان جوێنم پێدابێت، یان جەڵدم لێدابێت، ئەوە بۆی بكەرە نوێژ و ڕەحمەت و بەزەیی و نزیكبوونەوە لە خۆت لە ڕۆژی دواییدا.

٢٨١٧ - «عَنْ جَابِرٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ، إِلاَّ أَنَّ فِيهِ زَكَاةً وَرَحْمَةً».(٢)

واتە: لە جابرەوە ﵁ هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە، تەنها زەكات و ڕەحمەتی تیا بووە.

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرمویەتی: ئەگەر هاوشێوەی چیای ئوحود زێڕم دەبوو

٢٨١٨ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا يَسُرُّنِي أَنَّ جَبَلَ أُحُدٍ لِي ذَهَبًا أَمُوتُ يَوْمَ أَمُوتُ عِنْدِي دِينَارٌ أَوْ نِصْفُ دِينَارٍ، إِلاَّ لِغَرِيمٍ».(٣)

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دڵخۆشم ناكات ئەگەر بە ئەندازە و هاوشێوەی چیای ئوحود زێڕم هەبێت و، لەو ڕۆژەی دەمرم دینارێک یان نیو دینارم لابێت، حەتمەن دەیدەم بە قەرزارێک (واتە: ئەگەر بە ئەندازەی ئوحود زێڕم هەبێت هەمووی دەدەم بە كەسانی قەرزاری ئوممەتەكەم).

## بابەت: دەربارەی تاوانە لەناوبەرەكان

٢٨١٩ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ قُرْطٍ ﵁، قَالَ: إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ أُمُورًا هِيَ أَدَقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنَ الشَّعْرِ، كُنَّا نَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنَ الْمُوبِقَاتِ فَذُكِرَ لِمُحَمَّدٍ يَعْنِي ابْنَ سِيرِينَ، فَقَالَ: صَدَقَ، فَأَرَى جَرَّ الإِزَارِ مِنْ ذَلِكَ».(٤)

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عوبادەی کوڕی قوڕتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێوە شتانێک ئەنجام دەدەن لەبەر چاوتان بچوکترە لە دەنکە جۆ، ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تاوانە لەناوبەرەکان ئەژمارمان دەکردن، جا ئەوە باسکرا بۆ موحەممەد ـ واتە: بۆ ئیبنو سیرین ـ ئەویش وتی: ڕاست دەکات، پێم وایە جل و بەرگ لە دواخشان (بۆ فیز و کەشخەلێدان) لەوەیە (واتە: یەکێک لەو تاوانانەیە کە ئێستا حیسابی بۆ ناکرێت، کەچی لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوانێکی گەورەبوو).

## بابەت: تا بەشێکە لە بڵاوبوونەوەی گەرمای دۆزەخ[1]

٢٨٢٠ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، أَوْ مِنْ فَوْرِ جَهَنَّمَ، فَأَبْرِدُوهَا بِالْمَاءِ».[2]

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەرمایەتی تا (بڵاوبوونەوەکەی) بەشێکە لە بڵاوبوونەوەی گەرمای دۆزەخ (واتە: وەک گەرمای دۆزەخ خێرا بە جەستەدا بڵاو دەبێتەوە)، بۆیە ساردی بکەنەوە بە ئاو (واتە: ئەگەر تایەکە بەهۆی گەرماوەبوو ئەوە بە ئاو خواردنەوە و تەڕکردنی ڕوخسار تایەکە دابەزێنن).

## بابەت: نەخۆشی کەفارەتی گوناهە

٢٨٢١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يُصَابُ بِبَلَاءٍ فِي جَسَدِهِ، إِلاَّ أَمَرَ اللهُ الْحَفَظَةَ الَّذِينَ يَحْفَظُونَهُ، فَقَالَ: اكْتُبُوا لِعَبْدِي فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، مِثْلَ مَا كَانَ يَعْمَلُ مِنَ الْخَيْرِ، مَا كَانَ مَحْبُوسًا فِي وِثَاقِي».[3]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک لە مسوڵمانان نیە توشی بەڵایێک و نەخۆشیێک ببێت لە جەستەی خۆیدا، حەتمەن خوا فەرمان بەو فریشتانە دەکات کە پاداشتی کەسەکە تۆمار دەکەن (پێیان) دەفەرموێت: هەمان ئەو خێر و چاکانە بۆ بەندەکەم بنوسن لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا کە پێشتر ئەنجامی دەدا، هەتا بەسترابێتەوە بە زنجیری من (واتە: هەتا بەڵا و ناخۆشی منی لەسەر بێت، هەر خێری ڕۆژانی ساغی بۆ بنوسن).

---

(١) ـ واتە: وەك گەرمای دۆزەخ زۆر بەخێرایی بە جەستەدا بڵاو دەبێتەوە.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: پاداشتی کەسی نەخۆش

٢٨٢٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ يُوعَكُ، فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، فَقَالَ: إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلاَنِ مِنْكُمْ. قَالَ: قُلْتُ: ذَلِكَ بِأَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ؟ قَالَ: أَجَلْ، وَمَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، مَرَضٌ فَمَا سِوَاهُ، إِلاَّ حُطَّ عَنْهُ مِنْ سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێکدا تای لێبوو، جا دەستم لەسەری دانا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ تایێکی زۆر بەهێزت لێیە، ئەویش فەرمووی: من تا دەگرم وەک چۆن دوو پیاو لە ئێوە تا دەگرن (واتە: تاکەی من بە ئەندازەی تای دوو کەس بەهێزە)، دەڵێ: منیش وتم: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە تۆ دوو پاداشتت بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، هیچ مسوڵمانێک نیە توشی ئازارێک ببێت، جا نەخۆشی بێت یان جگە لە نەخۆشی، حەتمەن تاوانەکانی دەوەرێندرێن هەر وەک چۆن درەخت گەڵاکانی دەخاتە خوارەوە و دەوەرن.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٨٢٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً وَاحِدَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْرًا».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک یەک صەڵاوەتم لەسەر بدات، خوا دە صەڵاواتی لەسەر دەدات.

٢٨٢٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا وَهُوَ يُرَى الْبِشْرُ فِي وَجْهِهِ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَرَى فِي وَجْهِكَ بِشْرًا لَمْ نَكُنْ نَرَاهُ؟ قَالَ: أَجَلْ، إِنَّ مَلَكًا أَتَانِي فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ رَبَّكَ يَقُولُ لَكَ: أَمَا يُرْضِيكَ أَنْ لاَ يُصَلِّيَ عَلَيْكَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِكَ، إِلاَّ صَلَّيْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا، وَلاَ يُسَلِّمَ عَلَيْكَ، إِلاَّ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى».[٣]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ هات لە کاتێکدا خۆشحاڵی بە ڕوخساریەوە دەبینرا، جا وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خۆشحاڵیەک بە ڕوخسارتەوە دەبینین کە پێشتر نەمان بینیوە؟ فەرمووی: وایە، فریشتەیەک هات بۆ لام و پێی وتم: ئەی موحەممەد پەروەردگارت پێت دەڵێت: ئایا ڕازیت دەکات بەوەی هیچ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

کەسێک لە ئوممەتەکەت نیە صەڵاواتێکت لەسەر لێبدات حەتمەن من دە صەڵاوەتی لەسەر لێدەدەم، وە هەرکەس سەلامێکت لەسەر بدات حەتمەن دە سەلامی لەسەر لێدەدەم (واتە: لە دە شت سەلامەتی دەکەم)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: وتم: با (ڕازیم).

٢٨٢٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ فِي الأَرْضِ يُبَلِّغُونِي عَنْ أُمَّتِي السَّلَامَ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا کۆمەڵە فریشتەیەکی گەڕۆکی لە زەوی هەنە کە سەلامی ئوممەتەکەم پێ ڕادەگەیەنن.

## بابەت: دەربارەی ناوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٨٢٦ - «أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ لِي أَسْمَاءً: أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى عَقِبِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ، وَالْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ أَحَدٌ».[٢]

واتە: لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی مەتعیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵁ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: من چەند ناوێکم هەیە: من موحەممەدم، وە من ئەحمدم، وە من ماحیم ئەوەی خوا بەهۆیەوە کوفری پێ دەسڕێتەوە، وە من حاشیرم ئەوەی خەڵک حەشر دەکرێت لەسەر ڕێگەی من، وە من عاقیبم ئەوەی کەس لەدوای ئەو نیە (واتە: کۆتا پێغەمبەرم).

## بابەت: دەربارەی حەڕام

٢٨٢٧ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَا كَعْبُ بْنَ عُجْرَةَ، إِنَّهُ لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ».[٣]

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کەعبی کوڕی عوجرە گۆشتێک ناچێتە بەهەشت کە گەشەی کردبێت بە حەڕام (واتە: کەسی حەڕامخۆر ناچێتە بەهەشت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح .

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: کەسی بڕوادار پاداشت دەدرێتەوە لە گشت شتێکدا

٢٨٢٨ - «عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ جَالِسٌ إِذْ ضَحِكَ فَقَالَ: أَلاَ تَسْأَلُونِي مِمَّا أَضْحَكُ؟ فَقَالُوا: مِمَّ تَضْحَكُ؟ قَالَ: عَجَبًا مِنْ أَمْرِ الْمُؤْمِنِ كُلُّهُ لَهُ خَيْرٌ: إِنْ أَصَابَهُ مَا يُحِبُّ، حَمِدَ اللهَ عَلَيْهِ، فَكَانَ لَهُ خَيْرٌ، وَإِنْ أَصَابَهُ مَا يَكْرَهُ فَصَبَرَ، كَانَ لَهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ كُلُّ أَحَدٍ أَمْرُهُ لَهُ خَيْرٌ إِلاَّ الْمُؤْمِنَ».(١)

واتە: لە سوهەیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو لەناکاو پێکەنی و فەرمووی: ئایا پرسیار ناکەن لەبەرچی پێدەکەنم؟ هاوەڵانیش وتیان: لەبەرچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: لەبەر سەرسامی لە کاروباری کەسی بڕوادار، گشت کاروبارەکانی بۆ ئەو خێر و چاکەیە: ئەگەر شتێکی توش ببێت کە پێی خۆش بێت، ئەوە سوپاس و ستاییشی خوای لەسەر دەکات، ئەوە بۆی دەبێتە خێر و چاکە، وە ئەگەر شتێکی توش ببێت کە پێی ناخۆش بێت، ئەوە ئارامی لەسەر دەگرێت، ئەوەش بۆی دەبێتە خێر و چاکە، جا هیچ کەسێک نیە هەموو کاروبارەکانی بەخێر بشکێنەوە جگە لە کەسی بڕوادار.

## بابەت: ئەگەر نەوەی ئادەم دوو دۆڵ لە سەروەت و سامانی هەبێت (هەر چاوی تێر نابێت)

٢٨٢٩ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَلاَ أَدْرِي أَشَيْءٌ أُنْزِلَ عَلَيْهِ أَمْ شَيْءٌ يَقُولُهُ، وَهُوَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لاَبْتَغَى إِلَيْهِمَا ثَالِثًا، وَلاَ يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللهُ عَلَى مَنْ تَابَ».(٢)

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا نازانم ئایا فەرموودەکەی بۆ دابەزی بوو (واتە: نازانم فەرموودەکە قودسیە) یان خۆی دەیفەرموو (قودسی نەبوو)، دەیفەرموو: ئەگەر نەوەی ئادەم دوو دۆڵ لە سەروەت و ماڵی هەبێت حەز دەکات سێیەمی وەگەرکەوێت (ببێتە سێ دۆڵ)، جا هیچ شتێک ناخی نەوەی ئادەم پڕناکاتەوە (تەماحەکەی کۆتایی پێ ناهێنێت) تەنها خۆڵ نەبێت (واتە: مردن و ژێرخاک کردنی کۆتایی بە تەماحکاریەکەی دەهێنێت)، وە خواش تەوبە وەردەگرێت و لەو کەسەی تەوبە دەکات (واتە: تەوبە وەرگرتنی خواش کۆتایی نیە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی گێڕانەوەی فەتوا

٢٨٣٠ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَقُصُّ إلاَّ أَمِيرٌ، أَوْ مَأْمُورٌ، أَوْ مُرَاءٍ» قُلْتُ لِعَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ: إِنَّا كُنَّا نَسْمَعُ مُتَكَلِّفٌ. فَقَالَ: هَذَا مَا سَمِعْتُ».[١]

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەس (فەتوا) ناگێڕێتەوە تەنها کاربەدەست و فەرمانبەر و ڕیاباز نەبێت، (واتە: ئەم سێیانە فەتوا دەدەن و فەتوا نەقڵ دەکەن)، جا عەبدوڵڵای کوڕی عامیر دەڵێت: بە عەمری کوڕی شوعەیبم وت: ئێمە گوێمان لێ بووە (چوارەمیشیان تیایە کە بریتیە لە کەسی) زۆر لەخۆکار، ئەویش وتی: ئەوە ئەوەیە کە گوێم لێ بووە (واتە: من ئەو جارە ئەو سێیەم گوێ لێ بوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسی چوارەمی نەکرد لەلای من).

## بابەت: دەربارەی مۆڵەتدان بە چیرۆک گێڕانەوە

٢٨٣١- «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ كُرْدُوسًا - وَكَانَ قَاصًّا - يَقُولُ: أَخْبَرَنِي رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لأنْ أَقْعُدَ فِي مِثْلِ هَذَا الْمَجْلِسِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أَرْبَعَ رِقَابٍ، قَالَ: قُلْتُ أَنَا: أَيُّ مَجْلِسٍ يَعْنِي؟ قَالَ: كَانَ حِينَئِذٍ يَقُصُّ. قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الرَّجُلُ مِنْ أَصْحَابِ بَدْرٍ هُوَ: عَلِيٌّ».[٢]

واتە: لە عەبدولمەلیکی کوڕی مەیسەرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە کوردوس بوو ـ کە چیرۆک گێڕەرەوە و قازی بوو ـ دەیوت: پیاوێک لە ئەهلی بەدر پێی ڕاگەیاندم کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: ئەگەر لە مەجلیسی ئاوا دابنیشم ئەوە لام خۆشەویستترە لەوەی چوار بەندە ئازاد بکەم، دەڵێ: وتم: واتە: چ مەجلیسێک؟ وتی: (پێغەمبەر) لەو کاتەدا (کە ئەمەی فەرموو) چیرۆکی دەگێڕایەوە (واتە: مەجلیسی چیرۆک، بە مەرجێک چیرۆکەکە چیرۆکی زانستی و دادگەری و ڕاستی بێت).

## بابەت: کەسی بڕوادار دوو جار لە یەک کونەوە پێوەی نادرێت (ناگەسترێ)

٢٨٣٢ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ».[٣]

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی بڕوادار دوو جار لە یەک کونەوە پێوەی نادرێت (واتە: لە بابەتێک دوو جار تێناکەوێت و فێڵی لێ ناکرێت، بەڵکو دەبێ پەند لە جاری یەکەم وەربگرێت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: شەیتان بەناو لاشەی مرۆڤ دێ و دەچێ وەک چۆن خوێن دێ و دەچێ

٢٨٣٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: وَرُبَّمَا سَكَتَ عَنْ جَابِرٍ - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَدْخُلُوا عَلَى الْمُغِيبَاتِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ ابْنِ آدَمَ كَمَجْرَى الدَّمِ. قَالُوا: وَمِنْكَ؟ قَالَ: نَعم، وَلَكِنَّ اللهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمُ».(١)

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەچوونە لای ئەو ئافرەتانەی مێردەکانیان لێیان دوورن و بە تەنیان (نەوەک شەیتان فریوتان بدات و توشی خراپەتان بکات)، چونکە شەیتان لەناو لاشەی بەنی ئادەمدا دێت و دەچێت وەک چۆن خوێن دێت و دەچێت، هاوەڵەکان وتیان: لەناو لاشەی تۆشدا بوونی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ: بەڵام خوا یارمەتیدام بەسەریدا زاڵ ببم و مسوڵمان بوو (بۆیە وەسوەسەی خراپم بۆ دروست ناکات).

## بابەت: دەربارەی ئەوانەی بە قورسی تاقیدەکرێنەوە

٢٨٣٤ - «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صَلاَبَةٌ زِيدَ صَلاَبَةً، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ، خُفِّفَ عَنْهُ، وَلاَ يَزَالُ الْبَلاَءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَمْشِيَ عَلَى الأَرْضِ مَا لَهُ خَطِيئَةٌ».(٢)

واتە: لە سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا وترا: کام لە خەڵکی بەڵایان زیاتر و قورسترە؟ فەرمووی: پێغەمبەران، ئنجا چاکترین و چاکترینی خەڵکی لەدوای ئەوان (واتە: بە پێی پلەبەندیە، لە پێغەمبەرانەوە بۆ خوارەوە شۆڕ دەبێتەوە)، مرۆڤ تاقیدەکرێتەوە بە پێی دینەکەی، جا ئەگەر تۆکمەیی لە دینەکەیدا هەبوو و (دیندارێکی تۆکمە بوو) ئەوە تۆکمەیی و توندی بۆ بەڵاکانی زیاد دەکرێت، وە ئەگەر دینی تەنک و لاواز بوو، ئەوە لەسەری سوک دەکرێت (چونکە بەرگە ناگرێت)، وە بەردەوام بەڵا و تاقیکردنەوە بەرۆکی بەندە دەگرێت تاوەکو وایلێدێت بەسەر زەویدا دەڕوات یەک تاوانیشی نیە (واتە: پاک پاک دەبێتەوە لە تاوان).

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمویەتی:
## زێدەڕۆیی مەکەن لە بەگەورە دانانم

٢٨٣٥ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تُطْرُونِي كَمَا تُطْرِي النَّصَارَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، وَلَكِنْ قُولُوا: عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ».(٣)

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زیاد بەرزم مەکەنەوە و زێدەڕۆیی مەکەن لە بەگەورەگرتنم وەک چۆن نەصرانیەکان عیسای کوڕی مەڕیەمیان ﷺ لە ئەندازەی خۆی گەورەتر کرد (وتیان: خوایە و کوڕی خوایە)، بەڵکو بڵێن: (موحەممەد) بەندەی خوا و پێغەمبەری خوایە ﷺ.

## بابەت: خوا سەد بەش لە ڕەحمەتی هەیە

٢٨٣٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: جَعَلَ اللهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ، وَأَنْزَلَ فِي الأَرْضِ جُزْءًا وَاحِدًا، فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ، حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ».(١)

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا ڕەحمەتی کردۆتە سەد بەش و نەوەد و نۆی لای خۆی گرتۆتەوە (نەیبەخشیوە)، یەک بەشیشی ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، جا لەو تاکە بەشەیە مەخلوقات ڕەحم بە یەکتری دەکەن، (بەم تاکە ڕەحمەتە مەخلوقات وایان لێهاتووە) هەتا ئەسپ سمی قاچەکانی بەرز دەکاتەوە و لە بێچووەکەی لایدەدات لە ترسی ئەوەی نەوەک بەری بکەوێت (نەوەد و نۆیەکەی تریش لە ڕۆژی دوایی بۆ بڕوادارانە).

## بابەت: هەر کەسێک نیەتی وا بێت چاکەیەک بکات

٢٨٣٧- «حَدَّثَنَا الْجَعْدُ أَبُو عُثْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا رَجَاءٍ الْعُطَارِدِيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ رَبَّكُمْ رَحِيمٌ: مَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا، كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا، كُتِبَتْ لَهُ عَشْرًا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا، كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا، كُتِبَتْ وَاحِدَةً، أَوْ يَمْحُوهَا. وَلاَ يَهْلِكُ عَلَى اللهِ إِلاَّ هَالِكٌ».(٢)

واتە: لە جەعد ـ لە ئەبو عوسمانەوە ـ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو ڕەجائی عوتاریدی بوو وتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە خوای عزَّ وجلَّ دەیگێڕایەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان پەروەردگارتان بەبەزەییە، هەر کەسێک نیەتی هێنا چاکەیەک بکات و نەشیکرد، ئەوە چاکەیەکی بۆ نوسراوە، وە ئەگەر کردیشی ئەوە دە بۆ حەوت سەد قات و زۆر قاتی زیاتریش چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە هەر کەسێک نیەتی هێنا خراپەیەک بکات و نەیکرد، ئەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، وە ئەگەر کردیشی ئەوە یەک خراپەی بۆ دەنوسرێت یان عەفو دەکرێت و لەسەری دەسڕێتەوە، وە کەس توشی لەناوچوون نابێت بە دەستی خوا تەنها کەسێکی زۆر نەگبەت و لەناوبەر نەبێت بۆ خۆی.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: مرۆڤ لەگەڵ ئەو كەسەدایە كە خۆشی دەوێت

٢٨٣٨ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، الرَّجُلُ يُحِبُّ الْقَوْمَ ولاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِمْ؟ قَالَ: أَنْتَ يَا أَبَا ذَرٍّ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ. قُلْتُ: فَإِنِّي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ: أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ».(١)

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو هەیە كەسانێكی خۆش دەوێت و (حەزی لە كردەوە چاكەكانی ئەوانە) و ناتوانێت كردەوەی وەک كردەوەی ئەوان ئەنجام بدات (هیممەتەكەی وەک ئەوان بەرز نیە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ ئەی ئەبو ذەڕ لەگەڵ ئەو كەسەی كە خۆشت دەوێت، وتم: من خوا و پێغەمبەرەكەیم ﷺ خۆش دەوێت، فەرمووی: (لە دواڕۆژدا) تۆ لەگەڵ ئەو كەسەی كە خۆشت دەوێت.

## بابەت: كاتێ بەندە لە خوا نزیک دەكەوێتەوە

٢٨٣٩ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ قَالَ: يَا ابْنَ آدَمَ، إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي، غَفَرْتُ لَكَ عَلَي مَا كَانَ فِيكَ، ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ إِنْ تَلْقَانِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا، لَقِيتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً بَعْدَ أَنْ لاَ تُشْرِكَ بِي شَيْئًا، ابْنَ آدَمَ، إِنَّكَ إِنْ تُذْنِبْ حَتَّى يَبْلُغَ ذَنْبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ، ثُمَّ تَسْتَغْفِرُنِي أَغْفِرْ لَكَ وَلاَ أُبَالِي».(٢)

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە ئەویش لە خوای پەروەردگاری گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم تۆ تا ئەو كاتەی داوام لێ بكەیت و ئومێدت پێم بێت لێت خۆش دەبم و لەوەی لە تۆدا هەیە (لە هەڵە و پەڵە و تاوان)، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر پێم بگەیت بە ئەندازەی زەوی لە گوناح، ئەوە پێت دەگەم بە ئەندازەی زەوی لە لێخۆشبوون (بە مەرجێک) دوای ئەوە شیرک و هاوەڵت بۆ بریار نەدابم، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر گوناح بكەیت تاوەكو دەگاتە هەورەكانی ئاسمان، دواتر داوای لێخۆشبوونم لێ بكەیت ئەوە لێت خۆش دەبم و لاریم نیە.

## بابەت: دەربارەی چاكە و خراپە

٢٨٤٠ - «عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ البر وَالإِثْمِ، فَقَالَ: الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَعْلَمَهُ النَّاسُ».(٣)

واتە: لە نەوواسی كوڕی سەمعانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی چاكە و خراپە، ئەویش فەرمووی: چاكە ڕەوشت چاكیە، خراپەش ئەوەیە كە خورپەی لە دڵ و

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن

(٣) ـ إسناده حسن .

دەرونت بێت و بچێت (واتە: دڵە خورپەت بێت و دوو دڵ بیت لە ئەنجامدانی) و پێت ناخۆش بێت خەڵک بیزانێ.

٢٨٤١ - «أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عِيسَى، عَنْ مَعْنِ بْنِ عِيسَى، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ بِنَحْوِهِ».(١)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێردراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی ڕەوشت جوانی

٢٨٤٢ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اتَّقِ اللهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ».(٢)

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە خوا بترسەو پارێزکاربە لە هەر شوێنێک بوویت، لەوە دوای خراپە چاکە ئەنجام بدە دەیسڕێتەوە، وە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکە بە ڕەوشت و هەڵسوکەوتی جوان.

٢٨٤٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا».(٣)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەواوترینی بڕواداران لە ڕووی ئیمانەوە چاکترینیانە لە ڕووی ڕەوشتەوە.

## بابەت: دەربارەی نەرمونیانی

٢٨٤٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَيْهِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ».(٤)

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خوا نەرمونیانە، نەرمونیانیشی خۆش دەوێت، وە ئەوەی لەسەر نەرمونیانی دەیبەخشێت (بە بەندەکانی) لەسەر توندوتیژی و ڕژدی و زبری نایبەخشێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن .

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

٢٨٤٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ».[١]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خوا لە هەموو کارێکدا نەرمونیانی پێ خۆشە.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی چاوی لەدەست بدات و ئارام بگرێت

٢٨٤٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَذْهَبْتُ حَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ وَاحْتَسَبَ، لَمْ أَرْضَ لَهُ بِثَوَابٍ دُونَ الْجَنَّةِ».[٢]

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو خۆشەویستەکانی (واتە: دوو چاوەکانی) لێ بسەنم و ئارام بگرێت و چاوەڕێی پاداشت بێت، ئەوە بۆ ئەو کەسە بە هیچ پاداشتێک ڕازی نیم جگە لە بەهەشت.

## بابەت: دەربارەی دادگەری لە نێوان ژێردەستە (هاوڵاتیان)

٢٨٤٧ - «عَنْ الْحَسَنِ: أَنَّ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ زِيَادٍ، عَادَ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ لَهُ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ لَوْ عَلِمْتُ أَنَّ لِي حَيَاةً ما حَدَّثْتُكَ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ، وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إِلاَّ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ».[٣]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوبەیدی کوڕی زیاد سەردانی مەعقیلی کوڕی یەساری کرد ﷺ لە نەخۆشیەکەی کە دواتر تیایدا وەفاتی کرد، جا مەعقیل پێی وت: من فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێ بووە، ئەگەر بمزانیایە دەژیم بۆم نەدەگێڕایتەوە، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ بەندەیەک نیە خوا کردبێتیە کاربەدەستی خەڵکی و لەو ڕۆژەی دەمرێت بمرێت لەکاتێکدا خیانەتی لە ژێردەستەکانی و هاوڵاتیانی کردبێت، حەتمەن خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

## بابەت: دەربارەی گوێڕایەڵی و پەیوەست بوون بە کۆمەڵی مسوڵمانانەوە

٢٨٤٨ - «سَمِعْتُ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ الأَشْجَعِيَّ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: خِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمْ، الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ،

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ. قُلْنَا: أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ يَا رَسُولَ اللهِ عِنْدَ ذَلِكَ؟ قَالَ: لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ، أَلاَ مَنْ وُلِّيَ عَلَيْهِ وَالٍ فَرَآهُ يَأْتِي شَيْئًا مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ، فَلْيَكْرَهْ مَا يَأْتِي مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ، وَلاَ يَنْزِعَنَّ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ، قَالَ ابْنُ جَابِرٍ: فَقُلْتُ: اللهِ يَا أَبَا الْمِقْدَامِ آلله أَسَمِعْتَ هَذَا مِنْ مُسْلِمِ بْنِ قَرَظَةَ؟ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: اللَّه لَسَمِعْتُ هَذَا مِنْ مُسْلِمِ بْنِ قَرَظَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ عَمِّي عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُهُ».[1]

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چاکترینی ئوممەتەکەتان ئەوانەن کە خۆشتان دەوێن و، خۆشیان دەوێن و، دوعایان بۆ دەکەن و، دوعاتان بۆ دەکەن (یان نوێژ لەسەر یەکتری دەکەن کاتێ یەکێکتان وەفات دەکات)، وە خراپترینی ئوممەتەکەتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ڕقیان لێتانە و، وە نەفرەتیان لێ دەکەن و نەفرەتتان لێ دەکەن، وتمان: ئایا لەو کاتەدا واز لە هاوپەیمانێتیان نەهێنین (مادەم ئەوەندە خراپن)؟ فەرمووی: نەخێر، مادەم لەناو تێوەدا نوێژ بکەن، ئاگاداربن هەر کەسێک کاربەدەستێکی بۆ دانرا و شتێک لە سەرپێچی خوای لێ بینی ئەوە با نەهی لێ بکات و پێی ناخۆش بێت لەوەی سەرپێچی خوا دەکات، وە دەست لە گوێڕایەڵی دەرمەهێنن (یاخی مەبن بەرامبەر کاربەدەستانی مسوڵمانی جێبەجێکاری شەریعەت، ئەگەرچی هەندێک کەم وکوڕیشیان هەبێت، چونکە شەڕو ئاژاوە و تەفرەقە سەرپێچی خراپتر و گەورەتری تیایە).

ئیبنو جابر وتی: ئەی ئەبو میقداد سوێند بەخوا دەخۆیت ئەوەت گوێ لێ بووە لە موسلیمی کوڕی قەرەظە؟ ئەبو میقدادیش ڕوی کردە قیبلەو چووە سەر ئەژنۆ و وتی: سوێند بەخوا گوێم لە موسلیمی کوڕی قەرەظە بوو دەیوت: گوێم لە مامم عەوفی کوڕی مالیک بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ئاوای دەفەرموو.

## بابەت: دەربارەی نەفخی صور

٢٨٤٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الصُّورِ فَقَالَ: قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ».[2]

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی صوڕ، فەرمووی: صوڕ بوقێکە (وەک قۆچ وایە) فوی تیا دەکرێت.

## بابەت: دەربارەی کاروباری قیامەت و دابەزینی خوای عزَّ وجلَّ

٢٨٥٠ - «سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: يَقْبِضُ اللهُ الأَرْضَ وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ؟».[3]

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا زەوی لەناو دەبات و ئاسمانیش بە قودرەتی[1] خۆی دەپێچێتەوە، دواتر دەفەرموێت: من پادشام، کوان پادشاکانی زەوی؟

٢٨٥١ - «عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قِيلَ لَهُ: مَا الْمَقَامُ الْمَحْمُودُ؟ قَالَ: ذَاكَ يَوْمٌ يَنْزِلُ اللهُ تَعَالَى عَلَى كُرْسِيِّهِ يَئِطُّ كَمَا يَئِطُّ الرَّحْلُ الْجَدِيدُ مِنْ تَضَايُقِهِ بِهِ، وَهُوَ كَسَعَةِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَيُجَاءُ بِكُمْ حُفَاةً، عُرَاةً، غُرْلاً، فَيَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُكْسَى إِبْرَاهِيمُ، يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: اكْسُوا خَلِيلِي، فَيُؤْتَى بِرَيْطَتَيْنِ بَيْضَاوَيْنِ مِنْ رِيَاطِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ أُكْسَى عَلَى أَثَرِهِ، ثُمَّ أَقُومُ عَنْ يَمِينِ اللهِ مَقَامًا يَغْبِطُنِي الْأَوَّلُونَ وَالآخِرُونَ».[2]

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: بە پێغەمبەری خوا وترا؟ مەقامی مەحمود چیە؟ فەرمووی: ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوای بەرز شوێنەواری عەزەمەتی خۆی بەسەر کورسی و تەختی مەلیکایەتیەکەی نیشانی بەندەکانی دەدات [3]، جا کورسی و تەختی فەرمانڕەواییەکەی جیرە و دەنگی لێوە دێت وەک کورتانێکی نوێ، لەبەر خۆدەبەرنەگرتنی شوێنەواری عەزەمەتی پەروەردگار و (ترسان لە دەسەڵاتەکەی و زۆری ژمارەی فریشتەکان لەو کاتەدا)، لەکاتێکدا تەخت و کورسی فەرمانڕەواییەکەی وەک فراوانی نێوانی زەوی و ئاسمانە، جا ئێوە دەهێنرێن بە پێ پەتی و ڕوتی و خەتەنە نەکراوی، جا یەکەم کەس کە جل دەکرێتە بەری ئیبراهیمە، خوا دەفەرموێ: خەلیلەکەم پۆشتە بکەن (کە ئیبراهیمە)، وە دوو پارچە جلی نەرم و تەنک لە جلەکانی بەهەشت دەهێنرێت، دواتر دوای ئیبراهیم من پۆشتە دەکرێم، دواتر لەلای ڕاستەی خوا ڕادەوەستم (واتە: لەو شوێنە ڕادەوەستم کە خوای پەروەردگار بە لای ڕاستە دایدەنێت و شوێنێکی ڕێزلێنراوە)، ئا ئەوە مەقام و پلەیەکە هەموو مرۆڤ و جنۆکەکان تەمەننا و ئاواتی بۆ دەخوازن.

## بابەت: سەیرکردنی خوا

٢٨٥٢ - «أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ، وَعَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ اللَّيْثِيُّ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، أَخْبَرَهُمَا: أَنَّ النَّاسَ قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ: هل نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ تُمَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ؟ قَالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: فَهَلْ تُمَارُونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ».[4]

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییب و عەتائی کوڕی یەزیدی لەیثیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ بۆی گێڕاونەتەوە وتویەتی: خەڵک بە پێغەمبەریان ﷺ وت: ئایا پەروەردگارمان دەبینین

---

(١) ـ بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە (ستاف).

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ خوای بەرز لەسەر کورسیەکەی دێتە خوارەوە.

(٤) ـ صحيح.

[redacted]
ﷺ)، فەرمووی: ئایا گومان و ڕاجیایی و کێشمەکێشم دەکەن لە بینینی خۆر کە هیچ هەورێکی لەبەر دەم نەبێت؟ وتیان: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە ئێوە خوای پەروەردگار دەبینن ئا بەو شێوەیە (بە ڕوونی و بێ گومان).

## بابەت: دەربارەی چۆنیەتی حەشر کردن

٢٨٥٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ إِلَى اللهِ تَعَالَى حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ الأنبياء».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا و فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێوە حەشر دەکرێن و کۆدەکرێنەوە بۆ لای خوا، بە پێ پەتی و ڕوتی و خەتەنە نەکراوی، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ الأنبياء، واتە: (وەک چۆن لە سەرەتاوە دروستمان کرد وەک ئەوسای خۆی لێ دەکەینەوە، جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین).

## بابەت: دەربارەی کڕنوش بردنی بڕواداران لە ڕۆژی دواییدا

٢٨٥٤ - «أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ يَسَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا جَمَعَ اللهُ الْعِبَادَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، نَادَى مُنَادٍ: لِيَلْحَقْ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، فَيَلْحَقُ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، وَيَبْقَى النَّاسُ عَلَى حَالِهِمْ، فَيَأْتِيهِمْ فَيَقُولُ: مَا بَالُ النَّاسِ ذَهَبُوا وَأَنْتُمْ هَا هُنَا؟ فَيَقُولُونَ: نَنْتَظِرُ إِلَهَنَا، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَهُ؟ فَيَقُولُونَ: إِذَا تَعَرَّفَ إِلَيْنَا، عَرَفْنَاهُ، فَيَكْشِفُ لَهُمْ عَنْ سَاقِهِ فَيَقَعُونَ سُجُودًا، فَذَلِكَ قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ الأنبياء، يَبْقَى كُلُّ مُنَافِقٍ فَلاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ يَقُودُهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ».[٢]

واتە: لە سەعیدی کوڕی یەسارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە بوو ﷺ دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کاتێ خوا بەندەکان لە یەک پانتایی کۆدەکاتەوە بانگکەرێک بانگ دەکات دەڵێت: با هەر قەومێک خۆی بگەیەنێتە لای ئەوەی دەیپەرست (لە دونیادا)، جا هەر قەومێک خۆی دەگەیەنێتە ئەوەی پەرستویەتی و خەڵکانێکیش وەک خۆیان دەمێننەوە (ناچن بۆ لای هیچ شتێک)، جا خوا پێیان دەفەرموێت: ئەوە بۆچی خەڵکی هەمووی ڕۆیشتن بە دەم

---

- صحيح.
٢- صحيح.

پەرستراوەکەیان و ئێوەش لێرەدا ماونەتەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: چاوەڕێی پەرستراوی خۆمان دەکەین، دەفەرموێت: ئایا دەیناسن؟ دەڵێن: ئەگەر شتێکمان پێ نیشان بدات دەیناسینەوە، جا خوای بەرز نیشانەیەکی زاتی خۆیان[1] پێ نیشان دەدات، جا (بڕواداران) دەکەونە کڕنوش بردن، ئەوە واتای ئەو وتەیەی خوا :﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء، جا هەموو منافیق و دوو ڕووێک دەمێننەوە و ناتوانن کڕنوش بەرن، دواتر خوا (بڕواداران) دەبات بۆ بەهەشت.

## بابەت: دەربارەی شەفاعەت

٢٨٥٥ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا جَمَعَ اللهُ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فَقَضَى بَيْنَهُمْ وَفَرَغَ مِنَ الْقَضَاءِ، قَالَ الْمُؤْمِنُونَ: قَدْ قَضَى بَيْنَنَا رَبُّنَا، فَمَنْ يَشْفَعُ لَنَا إِلَى رَبِّنَا؟ فَيَقُولُونَ: انْطَلِقُوا إِلَى آدَمَ، فَإِنَّ اللهَ خَلَقَهُ بِيَدِهِ، وَكَلَّمَهُ، فَيَأْتُونَهُ، فَيَقُولُونَ: قُمْ فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّنَا. فَيَقُولُ آدَمُ: عَلَيْكُمْ بِنُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا، فَيَدُلُّهُمْ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَدُلُّهُمْ عَلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى، فَيَدُلُّهُمْ عَلَى عِيسَى، فَيَأْتُونَ عِيسَى، فَيَقُولُ: أَدُلُّكُمْ عَلَى النَّبِيِّ الأُمِّيِّ قَالَ: فَيَأْتُونِي فَيَأْذَنُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لِي أَنْ أَقُومَ إِلَيْهِ، فَيَثُورُ مَجْلِسِي أَطْيَبَ رِيحٍ شَمَّهَا أَحَدٌ قَطُّ، حَتَّى آتِيَ رَبِّي فَيُشَفِّعَنِي وَيَجْعَلَ لِي نُورًا مِنْ شَعْرِ رَأْسِي إِلَى ظُفْرِ قَدَمِي، فَيَقُولُ الْكَافِرُونَ عِنْدَ ذَلِكَ لإِبْلِيسَ: قَدْ وَجَدَ الْمُؤْمِنُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَهُمْ، فَقُمْ أَنْتَ فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّكَ أَنْتَ أَضْلَلْتَنَا. قَالَ: فَيَقُومُ، فَيَثُورُ مَجْلِسُهُ أَنْتَنَ رِيحٍ شَمَّهَا أَحَدٌ قَطُّ، ثُمَّ يَعْظُمُ لِجَهَنَّمَ، فَيَقُولُ عِنْدَ ذَلِكَ: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ ﴿٢٢﴾﴾ إبراهيم، إِلَى آخِرِ الآيَةِ».[2]

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کاتێ خوا یەکەمەکان و کۆتاییەکان کۆدەکاتەوە (واتە: هەموو مرۆڤەکان کۆدەکاتەوە لە ئادەم هەتا کۆتا مرۆڤ) و دادوەری لە نێوانیاندا دەکات و لە دادگا کردنەکەی تەواو دەبێت، بڕواداران دەڵێن: پەروەردگارمان دادوەری لە نێوانماندا کرد، جا کێ شەفاعەت و تکامان بۆ دەکات لای پەروەردگارمان ؟ خەڵکەکە دەڵێن: بڕۆن با بچین بۆ لای ئادەم، خوا بە دەستی قودرەتی خۆی دروستی کرد و قسەی لەگەڵ کرد، جا دەچن بۆ لای و دەڵێن: هەڵسە شەفاعەت و تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارمان، ئادەم دەفەرموێت: بچن بۆ لای نوح ، جا دەچن بۆ لای نوح، نوحیش ڕەوانیان دەکات بۆ لای ئیبراهیم، جا دەچن بۆ لای ئیبراهیم، ئیبراهیمیش ڕەوانیان دەکات بۆ لای مووسا، جا دەچن بۆ لای مووسا، مووساش ڕەوانیان دەکات بۆ لای عیسا، جا دەچن بۆ لای عیسا ، عیساش دەفەرموێت: ڕەوانتان دەکەم بۆ لای پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: جا دێن بۆ لام و خوای عزَّ وجلَّ مۆڵەتم دەدات هەڵسم بچم بۆ لای، جا شوێنی دانیشتنم خۆشترین بۆن دەردەدات کە کەس هەرگیز بۆنی نەکردبێت (دەڕۆم) تاوەکو دەچم بۆ لای پەروەردگارم و تکاکاریەکەم قبوڵ دەکات و

---

(١) ـ جا خوا قاچی خۆی پیشانیان دەدات (بەوشێوەیە کە شایستەی خۆیەتی) ستاف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

نورو ڕووناکییەک دەخاتە جەستەمەوە لە مووی سەرم تاوەکو نینۆکی قاچم، جا کەسی کافر لەو کاتەدا بە ئیبلیس دەڵێت: بڕواداران تکاکاری خۆیان دەست کەوت، دە تۆش هەڵسە شەفاعەت و تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، چونکە تۆ ئێمەت گومڕا کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: جا شەیتان (لەبەریان ڕادەکات) و هەڵدەستێت لە شوێنی خۆی و شوێنەکەی بۆنێک دەردەکات بۆگەنترین بۆنە کە هەرگیز هیچ کەسێک بۆنی نەکردوە، دواتر خەڵکەکە دەنگی گریان و هاوارکردنیان زۆر زیاد بەرز دەبێتەوە (هەر داوای لێ دەکەن) ئەو کات شەیتان دەڵێت: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ ﴿٢٢﴾ ﴾ إبراهيم، تا کۆتایی ئایەتەکە.

مانای تەواوی ئایەتەکە واتە: (شەیتان بە فەرمانی خوا دێتە قسەو ڕوو بە پەیڕەوانی دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پێ ڕاگەیاندبوون، منیش بەڵێنی درۆ و نادروستم پێ دان و توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبوبێت جگە لەوەی بە وەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵ بانگم کردن بۆ خوا نەناسی و تاوان ئێوەش بە دەممەوە هاتن و بە قسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن کە ئاوا گێلانە بێ بیرکردنەوە بە قسەتان کردم، ئەمڕۆ من ناتوانم بە هانا و هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هانا و هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبوو بە شەریک و هاوبەش، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بە ئێش دەدرێن).

## بابەت: بۆ هەر پێغەمبەرێک ﷺ دووعایەکی قبوڵکراو هەیە

٢٨٥٦ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ، وَأُرِيدُ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ هەر پێغەمبەرێک دووعایەکی قبوڵکراو هەیە، وە من إن شاءاللە تعالى دەمەوێ دووعاکەم هەڵبگرم و بیکەمە شەفاعەت بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی دواییدا.

٢٨٥٧ - «حَدَّثَنَا الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَنْبَأَنَا شُعَيْبٌ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ أَسِيدِ بْنِ جَارِيَةَ، مِثْلَ ذَلِكَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١)ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

## بابەت: حەفتا هەزار کەس دەچن بۆ بەهەشت (بەبێ حیساب)

٢٨٥٨ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَدْخُلُ الْجَنَّةَ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ أُمَّتِي بِغَيْرِ حِسَابٍ. فَقَالَ عُكَّاشَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا، فَقَالَ آخَرُ: ادْعُ اللهَ لِي، فَقَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ».(١)

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ لە پێغەمبەری ﷺ دەیگێڕایەوە کە فەرموویەتی: حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتەکەم دەچن بۆ بەهەشت بەبێ لێپێچینەوە، جا عوککاشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە خوا بکە من لەوان دابنێت، (پێغەمبەری خواش ﷺ) دوعای کرد، جا یەکێکی تر لە هاوەڵان وتی: داوا لە خوا بکە بۆ منیش، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: عوککاشە پێشت کەوتەوە.

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمویەتی: بە شەفاعەتی پیاوێک لە ئوممەتی من حەفتا هەزار کەس دەچن بۆ بەهەشت

٢٨٥٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي الْجَدْعَاءِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ بِشَفَاعَةِ رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَكْثَرُ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ. قَالُوا: سِوَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: سِوَايَ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو جەدعائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە شەفاعەتی پیاوێک لە ئوممەتی من خەڵکێکی زیاتر لە خەڵکی بەنی تەمیم دەچن بۆ بەهەشت، هاوەڵەکان وتیان: (پیاوێکی) جگە لە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: جگە لە من.

## بابەت: وتەی خوای پەروەردگار: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ ﴿٤٨﴾ ﴾ إبراهيم

٢٨٦٠ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَرَأَيْتِ قَوْلَ اللهِ تَعَالَى: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾ إبراهيم، أَيْنَ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: عَلَى الصِّرَاطِ».(٣)

واتە: لە مەسروقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عائیشەم (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) وت: ئەی دایکی بڕواداران ئەمەت بینیوە کە خوای بەرز دەفەرموێ:﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: (لەو ڕۆژەی کە ئەم زەویە دەگۆڕدرێت بە زەویێکی تر و هەروەها

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.

ئاسمانەکانیش دەگۆڕێن بە شێوازێکی تر و هەموو ئەو خەڵکە دەردەکەون و ئامادەن لە بەردەم دادگای خودای تاک و تەنها و بە دەسەڵات و خەشمگیر لە کافران) لەو ڕۆژەدا خەڵک لە کوێن؟ عائیشە وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەوە و فەرمووی: لەسەر سیراتن.

## بابەت: دەربارەی تێپەڕ بوون بەناو دۆزەخدا

٢٨٦١ - «عَنْ السُّدِّيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ مُرَّةَ، عَنْ قَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم، فَحَدَّثَنِي: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، حَدَّثَهُمْ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ ثُمَّ يَصْدُرُونَ عَنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ، فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ الْبَرْقِ، ثُمَّ كَالرِّيحِ، ثُمَّ كَحُضْرِ الْفَرَسِ، ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ، ثُمَّ كَمَشْيِهِ».[١]

واتە: لە سودییەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە موڕڕە کرد دەربارەی وتەی خوای عزَّ وجلَّ کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم، واتە: (ئێوە خەڵکینە کەستان نیە تێپەڕ نەبێت بەسەر دۆزەخدا، ئەم پێشهاتە بڕیاردراوە هەر جێبەجێ دەکرێت)، جا موڕڕە بۆی گێڕامەوە وتی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ بۆی گێڕاونەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو خەڵک دەچنە ناو دۆزەخ، دواتر لێی دەردەچن بە هۆی کردەوەکانیان، یەکەمیان وەک تیشکی بروسک دەردەچن، دواتر وەک با، دواتر وەک ئەسپێکی خێرا، دواتر وەک سوارێکی ناو قافلە، دواتر وەک ڕاکردنی پیاوێک، دواتر وەک ڕۆیشتنێکی ئاسایی.

## بابەت: دەربارەی کوشتنەوەی[٢] مردن

٢٨٦٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَكَبْشٍ أَغْبَرَ، فَيُوقَفُ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، وَيُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، وَيَرَوْنَ أَنْ قَدْ جَاءَ الْفَرَجُ، فَيُذْبَحُ وَيُقَالُ: خُلُودٌ لاَ مَوْتَ».[٣]

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: مردن دەهێنرێت لەسەر شێوازی بەرانێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی و، لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیرێت و، دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت، جا خەڵکی بەهەشت ملیان درێژ دەکەن و سەیر دەکەن، وە دەوترێت: ئەی خەڵکی دۆزەخ، جا خەڵکی دۆزەخ ملیان درێژ دەکەن و سەیر دەکەن و وادەزانن ڕزگاربوونیان بۆ هاتووە، جا مردن سەر دەبڕێت و دەوترێت: ژیانی بەردەوام (بۆ هەردوو لا) بەبێ مردن.

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ سەر بڕینی.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی ترساندن لە ئاگر

٢٨٦٣ - «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: أَنْذَرْتُكُمُ النَّارَ، أَنْذَرْتُكُمُ النَّارَ، أَنْذَرْتُكُمُ النَّارَ فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى لَوْ كَانَ فِي مَقَامِي هَذَا، لَسَمِعَهُ أَهْلُ السُّوقِ، حَتَّى سَقَطَتْ خَمِيصَةٌ كَانَتْ عَلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ».(١)

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو وتاری دەدا فەرمووی: ئێوەم ترساند لە ئاگر (ئاگادارم کردنەوە)، ئێوەم ترساند لە ئاگر، ئێوەم ترساند لە ئاگر، بەردەوام دەیوتەوە هەتا ئەگەر لەو شوێنەی من بووایە ئەوە هەموو خەڵکی بازار گوێبیستی دەبوون، (جا ئەوەندە دووبارەی کردەوە) هەتا پەشتەماڵەکەی کەوتە خوارەوە لای قاچەکانی.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی وتی: کاتێ مردم بمسوتێنن

٢٨٦٤ - «أَخْبَرَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: كَانَ عَبْدٌ مِنْ عِبَادِ اللهِ، وَكَانَ لاَ يَدِينُ لِلَّهِ دِينًا، وَإِنَّهُ لَبِثَ حَتَّى ذَهَبَ مِنْهُ عُمُرٌ وَبَقِيَ عُمُرٌ، فَعَلِمَ أَنَّهُ لَمْ يَبْتَئِرْ عِنْدَ اللهِ خَيْرًا، فَدَعَا بَنِيهِ فَقَالَ: أَيُّ أَبٍ تَعْلَمُونِي؟ قَالُوا: خَيْرُهُ يَا أَبَانَا، قَالَ: فَإِنِّي لاَ أَدَعُ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ مَالاً هُوَ مِنِّي إِلاَّ أَخَذْتُهُ أَوْ لَتَفْعَلُنَّ مَا آمُرُكُمْ «، قَالَ: « فَأَخَذَ مِنْهُمْ مِيثَاقًا وَرَبِّي قَالَ: أَمَّا أَنَا إِذَا مُتُّ فَخُذُونِي فَأَحْرِقُونِي بِالنَّارِ حَتَّى إِذَا كُنْتُ حُمَمًا فَدُقُّونِي ثُمَّ اذْرُونِي فِي الرِّيحِ، قَالَ: فَفَعَلُوا ذَلِكَ بِهِ وَرَبِّ مُحَمَّدٍ حِينَ مَاتَ، فَجِيءَ بِهِ أَحْسَنَ مَا كَانَ قَطُّ، فَعُرِضَ عَلَى رَبِّهِ فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى النَّارِ؟ قَالَ: خَشْيَتُكَ يَا رَبِّ، قَالَ: إِنِّي أَسْمَعُكَ لَرَاهِبًا، قَالَ: فَتِيبَ عَلَيْهِ».(٢)

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەندەیەک لە بەندەکانی خوا هیچ شتێکی چاکی دینداری نەبوو (تەنها بڕوادار بوو)، جا ماوەیەکی زۆر لە تەمەنی ڕۆیشت و کەمێک لە تەمەنی مابوو و زانی هیچ توێشویەکی چاکەی نیە لای خوا، بۆیە منداڵەکانی خۆی بانگ کرد و وتی: چ باوکێکم؟ وتیان: چاکترین باوکی ئەی باوکە، وتی: من هیچ ماڵ و سەروەتێکی خۆم واز لێ ناهێنم کە لای هەر یەکێک لە ئێوەیە، هەمووتان لێ دەسەنمەوە یانیش ئەوە جێبەجێ دەکەن کە فەرمانتان پێ دەکەم، دەڵێ: جا پەیمانی لێ وەرگرتن (کە داواکەی جێبەجێ بکەن) سوێند بە خوا، وتی: کاتێ من مردم بمبەن و بە ئاگر بمسوتێنن تاوەکو دەبم بە خەڵوز، جا بمکوتن و پەرش و بڵاوم بکەن لە بەردەم با، (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەفەرموێت: جا سوێند بە خوای موحەممەد وایان لێکرد کاتێ مرد، جا (زیندوکرایەوە) و هێنرا بە جوانترین شێوەی خۆی و بەرامبەر پەروەردگاری ڕاگیرا، خوای پەروەردگار فەرمووی: چی وایلێکردی

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ إسناده حسن .

فەرمان بکەیت بە ئاگر بسوتێنرێیت؟ وتی: ترسی تۆ وایلێکردم ئەی پەروەردگار، (خوای پەروەردگار) فەرمووی: من دەبیستم تۆ دەترسیت (لە سزای من)، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: عەفو کرا.

## بابەت: ئافرەتێک چووە ئاگرەوە بەهۆی پشیلەیەکەوە

٢٨٦٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ، فَقِيلَ: لاَ أَنْتِ أَطْعَمْتِيهَا وَسَقَيْتِيهَا، وَلاَ أَنْتِ أَرْسَلْتِيهَا فَتَأْكُلَ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ».[١]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئافرەتێک چووە ئاگرەوە بە هۆی پشیلەیەکەوە و پێی وترا: تۆ نە خواردن و ئاوت پێدا، وە نە ئازادیشت کرد تاوەکو لە زیندەوەری زەوی بۆ خۆی بخوات (بەڵکو زیندانیت کردو مرد).

## بابەت: دەربارەی سەختی سزای خەڵکی دۆزەخ

٢٨٦٦ - « سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُسَلَّطُ عَلَى الْكَافِرِ فِي قَبْرِهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ تِنِّينًا تَنْهَشُهُ وَتَلْدَغُهُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَلَوْ أَنَّ تِنِّينًا مِنْهَا نَفَخَ فِي الأَرْضِ مَا أَنْبَتَتْ خَضْرَاءَ».[٢]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەوەدو نۆ تنین (کە ژەهراویترین جۆری مارە) دەخرێنە سەر کەسی کافر لە گۆڕەکەیدا، لێک و پێکی دەردەهێنن و پێوەی دەدەن تاوەکو قیامەت دادێت، ئەگەر تنینێک لەو تنینانە ژەهر بکاتە زەوی ئەوە سەوزایی ناڕوێت.

## بابەت: دەربارەی دۆڵەکانی دۆزەخ

٢٨٦٧ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ وَاسِعٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى بِلاَلِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ فَقُلْتُ: إِنَّ أَبَاكَ، حَدَّثَنِي، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِي جَهَنَّمَ وَادِيًا يُقَالُ لَهُ هَبْهَبُ، يَسْكُنُهُ كُلُّ جَبَّارٍ، فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ».[٣]

واتە: لە موحەممەدی کوڕی واسیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ لای بیلالی کوڕی ئەبو بوردە و وتم: باوکت لە باوکیەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: لە دۆزەخدا دۆڵێک هەیە پێی دەوترێت هەب هەب، هەموو خۆ بە زلزانەکان لەوێ نیشتەجێ دەبن، جا نەکەیت تۆ لەوان بیت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده ضعيف .

## بابەت: ئەوانەی خوا دەریان دەهێنێت لە دۆزەخ بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی

٢٨٦٨ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُ النَّارِ، فَإِنَّهُمْ لاَ يَمُوتُونَ فِي النَّارِ، وَأَمَّا نَاسٌ مِنَ النَّاسِ، فَإِنَّ النَّارَ تُصِيبُهُمْ عَلَى قَدْرِ ذُنُوبِهِمْ، فَيُحْرَقُونَ فِيهَا حَتَّى إِذَا صَارُوا فَحْمًا، أُذِنَ فِي الشَّفَاعَةِ فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ، فَيُنْثَرُونَ عَلَى أَنْهَارِ الْجَنَّةِ. فَيُقَالُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ أَفِيضُوا عَلَيْهِمْ مِنَ الْمَاءِ، قَالَ: فَيُفِيضُونَ عَلَيْهِمْ فَتَنْبُتُ لُحُومُهُمْ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ».(١)

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرچی ئەوانەی خەڵکی دۆزەخن و (کافرن) ئەوانە خەڵکی دۆزەخن (لێی دەرناچن) و لەناو دۆزەخدا نامرن، هەرچی خەڵکی ترە ئەوە ئاگر بەریان دەکەوێت بە ئەندازەی گوناهەکانیان دەسوتێنرێن تاوەکو دەبن بە خەڵوز، ئنجا مۆڵەت بە شەفاعەت دەدرێت و لە ئاگر دێنە دەرەوە دەستە دەستە و دەچنە سەر ڕوبارەکانی بەهەشت و بە خەڵکی بەهەشت دەوترێت ئاویان بەسەردا بڕێژن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: جا ئاویان بەسەردا دەڕێژن و گۆشتیان دەڕوێتەوە وەک چۆن تۆو لە دەوروبەری لیتەی لافاو بە خێرایی دەڕوێتەوە.

## بابەت: دەربارەی دەرگاکانی بەهەشت

٢٨٦٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لِلْجَنَّةِ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابٍ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە.

## بابەت: هەر کەسێک بچێتە بەهەشت ناخۆشی نابینێت

٢٨٧٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ دَخَلَ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لاَ يَبْؤُسُ: لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُ، وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُ، وَلَهُ فِي الْجَنَّةِ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ».(٣)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بچێتە بەهەشت ناخۆشی نابینێت: پۆشاکەکەی کۆن نابێ و، گەنجایەتیەکەی لەناوناچێت و، لە بەهەشتدا شتانێکی بۆ هەیە نە چاو بینیویەتی، نە گوێ بیستویەتی، نە بە دڵی هیچ کەسێکدا هاتووە (واتە: بە خەیاڵیش تەسەوڕ نەکراوە، خۆشیەکان و شتەکانی خەیاڵبڕە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن .

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: سوێند بەخوا شوێنی قامچیەک لە بەهەشتدا چاکترە لە دونیا و ئەوەی تیایەتی

٢٨٧١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَاقْرَؤوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ آل عمران».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: سوێند بە خوا شوێنی قامچیەک (کە چەندە باریکە) لە بەهەشتدا چاکترە لە دونیا و ئەوەی تیایەتی، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: (هەموو کەسێک دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، تەنها لە ڕۆژی دواییدا پاداشتتان بە تەواوی پێ دەدرێت، ئەوسا ئەوەی دورخرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی سەرفراز بووە، ژیانی دونیاش جگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نیە).

## بابەت: دەربارەی بیناکانی بەهەشت

٢٨٧٢ - «حَدَّثَنَا أَبُو مُدِلَّةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، الْجَنَّةُ مَا بِنَاؤُهَا؟ قَالَ: لَبِنَةٌ مِنْ ذَهَبٍ وَلَبِنَةٌ مِنْ فِضَّةٍ، مِلَاطُهَا الْمِسْكُ الأَذْفَرُ، وَحَصْبَاؤُهَا الْيَاقُوتُ وَاللُّؤْلُؤُ، وَتُرَابُهَا الزَّعْفَرَانُ، مَنْ يَدْخُلْهَا يَخْلُدْ فِيهَا يَنْعَمُ لاَ يَبْؤُسُ، لاَ يَفْنَى شَبَابُهُمْ، وَلاَ تَبْلَى ثِيَابُهُمْ».[٢]

واتە: لە ئەبو مودیللەوە گێردراوەتەوە کە گوێی لە ئەبو هورەیرە بووە ﷺ کە دەیوت: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیناکانی بەهەشت چۆنە؟ فەرمووی: خشتێک و بلۆکێکی لە زێڕە و خشتێک و بلۆکێکی لە زیوە، ئەوەی نێوانیشیان (لە جێگای چیمەنتۆ و قوڕ) میسکی بۆن خۆشە، وە چەگر و بەردەکەشی یاقوت و مەرجانە، وە خۆڵەکەشی زەعفەڕانە، هەر کەسێک بچێتە ناویەوە هەتا هەتایی خۆشی بەسەردەبات و ناخۆشی نابینێت، گەنجێتیان لەناوناچێت و، پۆشاکەکانیان کۆن نابن.

## بابەت: دەربارەی بەهەشتەکانی فیردەوس

٢٨٧٣ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ أَرْبَعٌ: ثِنْتَانِ مِنْ ذَهَبٍ: حِلْيَتُهُمَا وَآنِيَتُهُمَا، وَمَا فِيهِمَا، وَثِنْتَانِ مِنْ فِضَّةٍ: حِلْيَتُهُمَا وَآنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَلَيْسَ

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح .

(٢) ـ إسناده حسن

بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ، وَهَذِهِ الأَنْهَارُ تَشْخُبُ مِنْ جَنَّاتِ عَدْنٍ فِي جَوْبَةٍ، ثُمَّ تَصْدَعُ بَعْدُ أَنْهَارًا، قَالَ عَبْد اللهِ: جَوْبَةٌ: مَا يُجَابُ عَنْهُ الأَرْضُ».[١]

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی قەیسەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەهەشتەکانی فیردەوس چوارن: دووانیان لە زێڕە: کەلوپەلی جوانکاریەکانیان و قاپ و قاچاغەکانیان و ئەوەی تیایاندایە (هەمووی لە زێڕە)، دووانیشیان لە زیوە: کەلوپەلی جوانکاریەکانیان و قاپ و قاچاغەکانیان و ئەوەی تیایاندایە (هەمووی لە زیوە)، وە لە نێوان خەڵکەکە و لە نێوان بینینی پەروەردگار هیچ شتێک نیە تەنها ڕیدائی گەورەیی نەبێت لەبەردەم زاتیدا لە بەهەشتی عەدن (چونکە بەهەشتی عەدن لە سەروی بەهەشتی فیردەوسە)، ئەم ڕوبارانەش (واتە: ڕووبارەکانی بەهەشتی فیردەوس) لە بەهەشتی عەدنەوە دەڕژێنە ناو گۆمە مەزنەکان (لە بەهەشتی فیردەوس)، دواتر دەبن بە ڕووبار.

## بابەت: دەربارەی یەکەم پۆل کە دەچنە بەهەشت

٢٨٧٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَحْسَنِ كَوْكَبٍ إِضَاءَةً فِي السَّمَاءِ فَقَامَ عُكَّاشَةُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ. ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم پۆل کە دەچن بۆ بەهەشت لە ئوممەتەکەی من لەسەر شێوەی مانگن بە شەوی چواردە (ئەوەندە گەشاوەن)، دواتر ئەوانەی لەدوای ئەوانن لەسەر شێوەی جوانترین ئەستێرەی گەشن لە ئاسمان، جا عوککاشە هەڵسایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە خوا بکە من لەوان دابنێت، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: خوایە لەوانی دابنێیت، دواتر پیاوێکی تر لە هاوەڵان هەڵسایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوا لە خوا بکە من لەوان دابنێت، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: عوککاشە پێشت کەوت.

## بابەت: چی بە خەڵکی بەهەشت دەوترێت کاتێ دەچنە ناویەوە

٢٨٧٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝٤٣﴾ الأعراف، قَالَ: نُودُوا: أن صِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا، وَانْعَمُوا فَلاَ تَبْأَسُوا، وَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا، وَاخْلُدُوا فَلاَ تَمُوتُوا».[٣]

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعیدەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێراویانەتەوە (دەربارەی ئەم ئایەتە): ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾ الأعراف، فەرموویەتی: خەڵكی بەهەشت بانگ دەكرێن: هەر ساغ و سەلامەت بن و نەخۆش نەكەون، وە لە خۆشیدابن و ناخۆشی نەبینن، وە هەر گەنج بن و پیر نەبن، وە هەتا هەتایی بژین و نەمرن.

## بابەت: دەربارەی خەڵكی بەهەشت و خۆشیەكانی

٢٨٧٦ - «عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عُقْبَةَ الْمُحَلِّمِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الرَّجُلَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ لَيُعْطَى قُوَّةَ مِائَةِ رَجُلٍ فِي الأَكْلِ وَالشُّرْبِ وَالْجِمَاعِ وَالشَّهْوَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ: إِنَّ الَّذِي يَأْكُلُ وَيَشْرَبُ تَكُونُ مِنْهُ الْحَاجَةُ؟ فَقَالَ: يَفِيضُ مِنْ جِلْدِهِ عَرَقٌ، فَإِذَا بَطْنُهُ قَدْ ضَمَرَ».[١]

واتە: لە ثومامەی كوڕی عوقبەی موحەللیمیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە زەیدی كوڕی ئەرقەم بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوی خەڵكی بەهەشت هێزی سەد پیاوی پێ دەدرێت لە خواردن و خواردنەوە و جیماع و ئارەزوودا، جا پیاوێكی جولەكە وتی: ئەوەی بخوات و بخواتەوە دەبێ فرێشی بداتە دەرەوە (واتە: سەر ئاو بكات)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئارەقە دەردەكات (نەك پیسایی، ئارەقەكەش بۆنی زۆر خۆشە)، جا سكی ڕێك و بچوك دەبێتەوە.

٢٨٧٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَهْلُ الْجَنَّةِ شَبَابٌ، جُرْدٌ، مُرْدٌ، كُحْلٌ، لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُمْ، وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُمْ».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەدا ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێراوەتەوە كە فەرموویەتی: خەڵكی بەهەشت گەنجن، بێ موون، بێ ڕیش و سمێڵن، چاو كلدارن (واتە: وەك ئەوە وان كلیان كردبێتە چاویان، ئەوەندە برژانگ پڕ و جوانن)، جلەكانیان كۆن و ڕزیو نابن و، گەنجایەتیەكەیان لەناو ناچێت.

٢٨٧٨ - «أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا ﷺ قِيلَ لأَبِي عَاصِمٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ؟ قَالَ: نَعم - أَهْلُ الْجَنَّةِ لاَ يَبُولُونَ، وَلاَ يَمْتَخِطُونَ، وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، وَيَكُونُ ذَلِكَ مِنْهُمْ جُشَاءً، يَأْكُلُونَ، وَيَشْرَبون، وَيُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالْحَمْدَ، كَمَا يُلْهَمُونَ النَّفَسَ».[٣]

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە گێردراوەتەوە كە گوێی لە جابر بووە ﷺ جا بە ئەبو عاصم وترا: جابر لە پێغەمبەری ﷺ گێرایەوە؟ وتی: بەڵێ ـ (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی): خەڵكی بەهەشت میز ناكەن و، چڵمیان نیە و دەرینادەن و، پیسایی ناكەن و، بەڵكو وەك قرپ دەری دەكەن (بەڵام بۆنی

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

نیە)، دەخۆن و، دەخۆنەوە و، تەسبیحات و ستاییشیان پێ ئیلهام دەکرێت و (بەبێ زەحمەت و بەبێ ئیرادەی خۆیان تەسبیحات دەکەن) هەر وەک چۆن نەفەسیان پێ دەدرێت.

## بابەت: ئەوەی خوا ئامادەی کردوە بۆ بەندە چاکەکانی

٢٨٧٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ، مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة».[1]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێت: ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم شتانێک کە نە چاو بینیویەتی و، نە گوێ بیستویەتی و، نە بە دڵی هیچ مرۆڤێکیش داهاتووە (هەمووی خەیاڵبڕە)، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة، واتە: [جا هیچ لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوە و شاردراوەتەوە لە نازو نیعمەتی جۆراوجۆر لای پەروەردگاری، کە چاوان پێی گەش دەبنەوە و بە دیتنی شاد دەبن، لە پاداشتی کار و کردەوەی چاک و پاکیاندا کە ئەنجامیان دەدا].

## بابەت: دەربارەی کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت

٢٨٨٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلاً مَنْ يَتَمَنَّى عَلَى اللهِ، فَيُقَالُ لَهُ: لَكَ ذَاكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ. إِلاَّ أَنَّهُ يُلَقَّى سِوَى كَذَا وَكَذَا. فَيُقَالُ لَهُ: ذَاكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَيُقَالُ لَهُ: ذَاكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ».[2]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەمترینی خەڵکی بەهەشت لە ڕووی پلەو پایەوە ئەوەیە کە ئاوات لەسەر خوا دەخوازێت (واتە: هەر چەندێکی بوێت داوای دەکات)، جا پێی دەوترێت: ئەوەندە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت، بەڵام (هێشتا ئیلهامی بۆ دەکرێت و) پێی دەوترێت داوای ئەوەندە و ئەوەندە بکات، جا (دوای ئەوەی داوای دەکات) پێی دەوترێت: ئەوە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت، ئەبو سەعیدی خودری وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوە و دە ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت (واتە: دە ئەوەندەی ئاواتی بۆ دەخوازێت پێی دەدرێت، ئا ئەمە کەمترین پشکی خەڵکە).

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی ژوور و خانوەكانی بەهەشت

٢٨٨١ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ كَمَا تَرَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ فِي السَّمَاءِ».[١]

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خەڵكی بەهەشت ژوورو خانوەكانی یەكتری دەبینن هەر وەک چۆن ئەستێرەی گەشاوە دەبینرێت لە ئاسماندا (واتە: ئەوەندە جیاوازی لە نێوان پلەكانیان هەیە و خانوەكانیان ئەوەندە گەشاوە و جوانن).

٢٨٨٢ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الْكَوْكَبُ الدُّرِّيُّ فِي الأُفُقِ الشَّرْقِيُّ وَالْغَرْبِيُّ» [٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (خەڵكی بەهەشت ژوورو خانوەكانی یەكتری دەبینن) وەک ئەستێرەی گەشاوە لە بەرزایی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

## بابەت: دەربارەی سیفەتی ئافرەتی بەهەشت

٢٨٨٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا فِي الْجَنَّةِ أَحَدٌ، إِلاَّ لَهُ زَوْجَتَانِ، إِنَّهُ لَيَرَى مُخَّ سَاقِهِمَا مِنْ وَرَاءِ سَبْعِينَ حُلَّةً، مَا فِيهَا مِنْ عَزَبٍ».[٣]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ كەسێک نیە لە بەهەشت حەتمەن دوو خێزانی هەیە، موخی قاچەكانی لە دواوەی حەفتا بەرگ دەبینێت (ئەوەندە موخەكەی سپی و ڕوون و كەشاوە و بە ڕەونەقە، لە جوانیەكانی بەشەكانی تریشی هەر مەپرسە)، هیچ كەسێكی بێ هاوسەر لە بەهەشتدا نیە.

تێبینی: لەم فەرموودەیە دەردەكەوێت كە زۆرترین خەڵكی بەهەشت ئافرەتن، هەر وەک زۆرترینی خەڵكی دۆزەخیش هەر ئافرەتن، ئەمە لەبەر زۆری ژمارەی ئافرەتانە.

## بابەت: دەربارەی خیوەتەكانی بەهەشت

٢٨٨٤ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْخَيْمَةُ دُرَّةٌ مُجَوَّفَةٌ، طُولُهَا فِي السَّمَاءِ سِتُّونَ مِيلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ لِلْمُؤْمِنِ لاَ يَرَاهُمُ الآخَرُونَ».[٤]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قەیسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خیوەتی بەهەشت بریتیە لە مەرجانی ناو بۆش، درێژیەکەی بۆ بڵندی شەست میلە، لە هەموو قوڕنیچکێکی خێزانێکی بۆ پیاوی بڕوادار تیایە ئەوانیتر نایبینن (واتە: شوێنیان جیایە و یەکتری نابینن هەرچەندە مەرجانەکان شەفافن، بەڵام قوڕنیچکەکان جیاوازن).

## بابەت: دەربارەی منداڵی خەڵکی بەهەشت

٢٨٨٥ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا اشْتَهَى الْوَلَدَ فِي الْجَنَّةِ، كَانَ حَمْلُهُ وَوَضْعُهُ وَسِنُّهُ فِي سَاعَةٍ كَمَا اشْتَهَى».[١]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کەسی بڕوادار کاتێ حەز بە منداڵ بکات لە بەهەشتدا، ئەوە حەملەکەی و لەدایکبوونەکەی و تەمەنەکەی لە یەک کاتدا دەبێت بەو شێوەیەی حەزیان لێیە و دەیانەوێت.

## بابەت: دەربارەی ڕیزەکانی خەڵکی بەهەشت

٢٨٨٦ - «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ - قَالَ: أُرَاهُ - عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَهْلُ الْجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ: ثَمَانُونَ مِنْهَا أُمَّتِي، وَأَرْبَعُونَ سَائِرُ النَّاسِ».[٢]

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بوڕەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەهەشت سەد و بیست ڕیزن، هەشتایان لە ئوممەتی منن و، چلیش خەڵکانی ترە.

## بابەت: دەربارەی ڕووبارەکانی بەهەشت

٢٨٨٧ - «عَنْ حَكِيمِ بْنِ مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَحْرَ اللَّبَنِ وَبَحْرَ الْعَسَلِ وَبَحْرَ الْخَمْرِ، ثُمَّ تَشَقَّقُ مِنْهُ الأَنْهَارُ».[٣]

واتە: لە حەکیمی کوڕی موعاویەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە بەهەشتدا دەریای شیر و، دەریای هەنگوین و، دەریای مەشروبی (بە چێژ و بێ سەرخۆشکەر) هەیە، دواتر ڕووباری زۆریان لێ دەبنەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی کەوسەر

٢٨٨٨ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَـٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١﴾ الكوثر، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ نَهْرٌ فِي الْجَنَّةِ حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ، يَجْرِي عَلَى الدُّرِّ وَالْيَاقُوتِ، تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَطَعْمُهُ أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، وَمَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەڕەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ ئایەتی:﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَـٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١﴾ الكوثر، دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە ڕوبارێکە لە بەهەشت دەورەکەی لە زێڕە، ئاوەکەی بەسەر یاقوت و مەرجاندا دەڕوات، خۆڵەکەی بۆنی خۆشترە لە میسک و تامی ئاوەکەشی شیرینترە لە هەنگوین و ئاوەکەشی سپیترە لە بەفر.

## بابەت: دەربارەی درەختەکانی بەهەشت

٢٨٨٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ۝٣٠﴾ الواقعة».[٢]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە بەهەشتدا (جۆرە) دارێک هەیە سوار لە ژێر سێبەرەکەیدا سەد ساڵ دەڕوات نایبڕێت (ئەوەندە درێژە و سێبەرەکەی ئەوەندە درێژ ڕۆیشتووە)، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ۝٣٠﴾ الواقعة، واتە: لە ژێر سێبەری دورو درێژدان.

٢٨٩٠ - «عَنْ أَبِي الضَّحَّاكِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا، هِيَ شَجَرَةُ الْخُلْدِ».[٣]

واتە: لە ضەححاکەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو ﵁ لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕایەوە کە فەرموویەتی: لە بەهەشتدا (جۆرە) دارێک هەیە سوار لە ژێر سێبەرەکەیدا سەد ساڵ دەڕوات نایبڕێت، ئەوە درەختی خولدە.

## بابەت: دەربارەی خورمای عەجوە

٢٨٩١ - «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ».[٤]

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیە و شیفایە بۆ ژەهر.

## بابەت: دەربارەی بازاڕی بەهەشت

٢٨٩٢ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَسُوقًا. قَالُوا: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: كُثْبَانٌ مِنْ مِسْكٍ يَخْرُجُونَ إِلَيْهَا فَيَجْتَمِعُونَ فِيهَا، فَيَبْعَثُ اللهُ عَلَيْهِمْ رِيحًا فَتُدْخِلُهُمْ بُيُوتَهُمْ، فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا، وَيَقُولُونَ لأَهْلِيهِمْ مِثْلَ ذَلِكَ»[١].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە فەرموویەتی: لە بەهەشتدا بازاڕێک هەیە، هاوەڵەکان وتیان: بازاڕەکە چیە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: تەپۆڵکەی میسکن خەڵکی بەهەشت دەچنە ئەوێ و لەوێ کۆدەبنەوە، جا خوا شنە بایێک هەڵدەکات و دەچێتە ماڵەکانیان، جا (کە دەگەڕێنەوە ماڵەوە) ماڵەوەیان پێیان دەڵێن: لە دوای ئێمە زۆر جوانتر بوون، ئەوانیش هەمان قسە بە ماڵەوەیان دەڵێن.

٢٨٩٣ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِنَحْوِهِ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

## بابەت: بەهەشت بە ناخۆشی دەورەدراوە

٢٨٩٤ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ».[٣]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەهەشت بە ناخۆشی دەورەدراوە (بە خۆ ماندوکردن و ڕەچاوکردنی سنورەکان خوا پێی دەگەیت)، دۆزەخیش بە ئارەزووەکان دەورەدراوە (کەسێک دوای شەهوەتی بکەوێت دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە).

## بابەت: دەربارەی ئەوەی کە هەژارەکان بەر لە دەوڵەمەندەکان دەچن بۆ بەهەشت

٢٨٩٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: بَيْنَا أَنَا قَاعِدٌ فِي الْمَسْجِدِ وَحَلْقَةٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ قُعُودٌ، إِذْ دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَعَدَ إِلَيْهِمْ، فَقُمْتُ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لَهُمْ: لِيُبْشِرْ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ بِمَا يَسُرُّ وُجُوهَهُمْ، فَإِنَّهُمْ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ الأَغْنِيَاءِ بِأَرْبَعِينَ عَامًا. قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَلْوَانَهُمْ أَسْفَرَتْ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو: حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە وتویەتی: لەکاتێکدا ئێمە دانیشتبوین لە مزگەوت، جا کۆڕێک و حەلقەیەکیش لە هەژارانی کۆچکەران دانیشتبوون، لەناکاو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە و لەلای ئەوان دانیشت، عەبدوڵڵا دەڵێ: منیش چووم بۆ لای ئەوان، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: هەژارانی کۆچکەران موژدەیەکیان لێ بێت بەهۆیەوە ڕوخساریان بگەشێتەوە، (موژدەکەش ئەوەیە) ئەوان چڵ ساڵ بەر لە دەوڵەمەندەکان دەچن بۆ بەهەشت، عەبدوڵڵا دەڵێت: جا بینیم ڕەنگ و ڕوویان گەشایەوە، عەبدوڵڵا وتویەتی: تا وام لێهات ئاواتم خواست منیش یەکێک بم لەوان.

## بابەت: دەربارەی نەفەسدانی دۆزەخ

٢٨٩٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا، فَقَالَتْ: يا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَأَذِنَ الله تبارك وتعالى لَهَا بِنَفَسَيْنِ: نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ، فَهُوَ أَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْحَرِّ، وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الزَّمْهَرِيرِ»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرمویەتی: دۆزەخ شکاتی حاڵی خۆی کرد لای پەروەردگاری و وتی: ئەی پەروەردگارا هەندێکم هەندێکی تری خواردەوە (گەرمایی و کوڵان و قرچانەوەکەم لە سنور تێپەڕی کردوە، بەرگەی خۆم ناگرم)، جا خوای تبارک و تعالی ڕێگەی پێدا بە دوو نەفەس: نەفەسێک لە زستان و نەفەسێکیش لە هاوین، جا (ئەو نەفەسەی لە هاوین دەیدات)، بریتیە لە توندترین و بەهێزترینی ئەوەی هەستی پێ دەکەن لە گەرمای هاوین و، (نەفەسەکەی زستانیشی بریتیە لە) توندترین و بەهێزترینی ئەوەی هەستی پێ دەکەن لە ساردی و سەرمای زستاندا.

٢٨٩٧ - «أَخْبَرَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِنَحْوِهِ»[٢]

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەشەوە ﷺ هەمان فەرمودە گێردراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ئەم ئاگرەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ

٢٨٩٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ نَارَكُمْ هَذِهِ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ».[٣]

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەم ئاگرەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ.

## بابەت: سوکترین سزای خەڵکی دۆزەخ

٢٨٩٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَهْوَنُ النَّاسِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلَانِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ».[١]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: سوکترینی خەڵکی لە ڕوی سزاوە (لە دۆزەخدا) ئەو کەسەیە کە دوو نەعلەی (ئاگرینی) لەبەردایە مێشکی لەگەڵ دەکوڵێ.

## بابەت: دەربارەی فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێت: ﴿ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ ق

٢٩٠٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يُلْقَى فِي النَّارِ أَهْلُهَا، وَتَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ - ثَلَاثًا - حَتَّى يَأْتِيَهَا رَبُّهَا ـ تعالى ـ فَيَضَعَ قَدَمَهُ عَلَيْهَا[٢] فَتَنْزَوِي، وَتَقُولُ: قَطْ قَطْ قَطْ».[٣]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی دۆزەخ دەخرێنە ناو ئاگرەوە، جا دۆزەخ دەڵێت: ئایا زیاتر هەیە، ئایا زیاتر هەیە ـ سێ جار ـ تاوەکو پەروەردگاری بەرز هەموو ئەو کەسانە تەواو دەکات کە قەرارە بچنە دۆزەخ و بە ڕیسوایی دەیانخاتە ژێر دەسەڵات و سزای خۆی و کەس نامێنێت، ئنجا دۆزەخ وێکدێتەوە و دەڵێت: بەسمە بەسمە بەسمە.

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ هەتا خوای (بێ وێنە) پێی خۆی دەخاتە سەر دۆزەخ (ستاف).

(٣) ـ صحیح.

## بابەت: دەربارەی فێربوونی میرات

٢٩٠١ - «قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: تَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ وَاللَّحْنَ وَالسُّنَنَ كَمَا تَعَلَّمُونَ الْقُرْآنَ».(١)

واتە: لە عومەری كوڕی خەتتابەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان فێری میرات و قەواعیدەكانی زمانی عەرەبی و ئەحكامەكانی شەریعەت بكەن، وەک چۆن خۆتان فێری قورئان دەكەن.

٢٩٠٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: تَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ فَإِنَّهَا مِنْ دِينِكُمْ».(٢)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتویەتی: خۆتان فێری میرات بكەن، چونكە بەشێكە لە ئایینەكەتان.

٢٩٠٣ - «قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: لَوْ هَلَكَ عُثْمَانُ وَزَيْدٌ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، فِي بَعْضِ الزَّمَانِ، لَهَلَكَ عِلْمُ الْفَرَائِضِ، لَقَدْ أَتَى عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ وَمَا يَعْلَمُهَا غَيْرُهُمَا».(٣)

واتە: ئیبنو شیهاب وتویەتی: ئەگەر عوسمان و زەید (واتە: ئەگەر میراتزانانی وەک عوسمان و زەید) (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) نەمێنن لە سەردەمێک لە سەردەمەكان، ئەوە زانستی میرات لەناو دەچێت، ئێستا زەمانێک بەسەر خەڵكیدا هاتووە جگە لەو دووانە كەس لە میرات نازانێ.

٢٩٠٤ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ وَالْفَرَائِضَ، فَإِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ يَفْتَقِرَ الرَّجُلُ إِلَى عِلْمٍ كَانَ يَعْلَمُهُ، أَوْ يَبْقَى فِي قَوْمٍ لاَ يَعْلَمُونَ».(٤)

واتە: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: خۆتان فێری قورئان و میرات بكەن، چونكە نزیكە پیاو پێویستی بە زانستێک ببێت (لە ئایندەیەكی نزیكدا) كە پێشتر فێری بووە، یان لەناو خەڵكانێک بمێنێتەوە كە نەیزانن (كەواتە پێویستیان بە زانستی تۆ دەبێت، جگە لەوەی خۆشت پێویستتە).

٢٩٠٥ - «قَالَ أَبُو مُوسَى ﷺ: مَنْ عَلِمَ الْقُرْآنَ وَلَمْ يَعْلَمِ الْفَرَائِضَ، فَإِنَّ مَثَلَهُ مَثَلُ الْبُرْنُسِ، لاَ وَجْهَ لَهُ، أَوْ لَيْسَ لَهُ وَجْهٌ».(٥)

واتە: ئەبو مووسا ﷺ وتویەتی: هەر كەسێک قورئان بزانێت و میرات نەزانێت، ئەوە نمونەكەی وەک بورنس وایە بێ ڕووە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.
(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.
(٣) ـ إسناده صحيح.
(٤) ـ إسناده ضعيف .
(٥) ـ إسناده ضعيف

تێبینی: بوڕنوس جلێکە ڕوی نیە، واتە: هەردوو لای وەکو یەکە.

٢٩٠٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَلْقَمَةَ ﷺ: مَا أَدْرِي مَا أَسْأَلُكَ عَنْهُ، قَالَ: أَمِتْ جِيرَانَكَ».(١)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عەلقەمەم وت: نازانم پرسیاری چی میراتت لێ بکەم (هیچم بۆ نایێت)؟ عەلقەمەش وتی: جیرانەکەت بمرێنە (واتە: وادابنێ جیرانەکەت مرد و پرسیار لە میراتی ئەوان بکە، نمونەیەک دروست بکە).

٢٩٠٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: تَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ وَالطَّلَاقَ وَالْحَجَّ، فَإِنَّهُ مِنْ دِينِكُمْ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان فێری میرات و تەڵاق و حەج بکەن، چونکە ئەمانە بەشێکن لە ئاینەکەتان.

٢٩٠٨ - «عَنْ الْحَسَنِ ﷺ، قَالَ: كَانُوا يُرَغِّبون فِي تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَالْفَرَائِضِ وَالْمَنَاسِكِ».(٣)

واتە: لە حەسەنەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەوان (واتە: خۆی و زانایانی سەردەمی ئەو) هانی زۆری خەڵکیان دەدا بۆ فێربوونی قورئان و میرات و حەج.

٢٩٠٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ، فَلْيَتَعَلَّمِ الْفَرَائِضَ، فَإِنْ لَقِيَهُ أَعْرَابِيٌّ قَالَ: يَا مُهَاجِرُ، أَتَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ فَإِنْ قَالَ: نَعم، قَالَ: تَفْرِضُ؟ فَإِنْ قَالَ: نَعم، فَهُوَ زِيَادَةٌ وَخَيْرٌ، وَإِنْ قَالَ: لَا، قَالَ: فَمَا فَضْلُكَ عَلَيَّ يَا مُهَاجِرُ».(٤)

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک قورئان بخوێنێ، با خۆی فێری میرات بکات، چونکە ئەگەر بگات بە کابرایەکی دەشتەکی و گوندنشین دەڵێت: ئەی کۆچکەر (واتە: ئەی ئەو کەسەی وازت لە گوند هێنا و چویتە شار) ئایا قورئان دەخوێنی (دەزانی بیخوێنی)؟ جا ئەگەر وتی: بەڵێ، کابرا دەڵێت: میرات دەزانی؟ جا ئەگەر وتی: بەڵێ، ئەوە زێدە و چاکە، وە ئەگەر وتی: نەخێر، کابرای دەشتەکی دەڵێت: ئەی کەواتە: گەورەیی تۆ بەسەر منەوە چیە ئەی کۆچکەر؟ (گوندت جێ هێشتووە و هیچیش فێر نەبووی، وەک من نەزانی).

٢٩١٠ - «عَنْ مُسْلِمٍ، قَالَ: سَأَلْنَا مَسْرُوقًا: كَانَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، تُحْسِنُ الْفَرَائِضَ؟ قَالَ: وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ، لَقَدْ رَأَيْتُ الْأَكَابِرَ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ يَسْأَلُونَهَا عَنِ الْفَرَائِضِ».(٥)

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە موسلیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارمان لە مەسرِوق کرد وتمان: ئایا دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زانستی میراتی باش بوو؟ مەسرِوق وتی: سوێند بەو خوایەی هیچ خوایێکی بە هەق جگە لەو نیە، من زۆر کەسی گەورە و مەزنم بینیوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لە دایکمان عائیشە کردوە دەربارەی زانستی میرات.

## بابەت: هەر کەسێک نەسەبی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی خۆی

٢٩١١ - «عن سعد بن أبي وقاص ﷺ وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ - قَالَ شُعْبَةُ: هَذَا أَوَّلُ مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَهَذَا تَدَلَّى من حِصْنِ الطَّائِفِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ - إِنَّهُمَا حَدَّثَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ».[1]

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﷺ و ئەبو بەکرە گێڕدراوەتەوە، شوعبە وتویەتی: ئەو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسە یەکەم کەس بوو کە تیری هاویشت لە پێناوی خوا، ئەو ئەبو بەکرەش هاتە خوارەوە لە قەڵای تائیف بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەردووکیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایانەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک نەسەبی خۆی پاڵبداتە پاڵ کەسێکی جگە لە باوکی و (کەسێکی جگە لە باوکی بکات بە باوکی)، لە کاتێکدا خۆی دەزانێ ئەو باوکی نیە، ئەوە بەهەشتی لەسەر حەڕامە.

٢٩١٢ - «عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، قَالَ: كُفْرٌ بِاللهِ ادِّعَاءٌ إِلَى نَسَبٍ لاَ يُعْرَفُ، وَكُفْرٌ بِاللهِ تَبَرُّؤٌ مِنْ نَسَبٍ وَإِنْ دَقَّ».[2]

واتە: لە ئەبوبەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بانگەشەکردن و خۆدانە پاڵ نەسەبێک کە نەزانرێت (واتە: ناڕاست بێت و لەناو خەڵک نەزانرابێت ئەو کەسە باوکی بوبێت) کوفرە بە خوای پەروەردگار (واتە: کوفرانەی یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوا)، وە خۆ تەبەڕڕا کردن و بردنە دەرەوە لە نەسەبێک ئەگەرچی زۆر بچوک و وردیش بێت (واتە: ئەگەرچی کەمترین لادانیشی تیا بکرێت) ئەوە کوفرە بە خوای پەروەردگار.

٢٩١٣ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَكَرِيَّا أَبِي يَحْيَى، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ، يُحَدِّثُ عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، نَحْوًا مِنْهُ».[3]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٢٩١٤ - «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ لأُبَايِعَهُ، فَجِئْتُ وَقَدْ قُبِضَ، وَأَبُو بَكْرٍ ، قَائِمٌ فِي مَقَامِهِ، فَأَطَالَ الثَّنَاءَ وَأَكْثَرَ الْبُكَاءَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: كُفْرٌ بِاللهِ انْتِفَاءٌ مِنْ نَسَبٍ وَإِنْ دَقَّ، وَادِّعَاءُ نَسَبٍ لاَ يُعْرَفُ».(١)

واتە: لە قەیسی کوڕی ئەبو حازمەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ تاوەکو پەیمانی پێ بدەم، جا کە چووم ئەو وەفاتی کردبوو، ئەبوبەکر  لە شوێنی ئەو وەستا بوو و وتاری دەدا، زۆر مەدحی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد و زۆر گریا و وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لابردن و لادانی بەشێک لە نەسەب هەر چەندە کەمیش بێت، هەروەها ئیدیعا کردن و خۆدانە پاڵ نەسەبێک کە نەزانرێت، ئەوە کوفرە بەخوا (واتە: کوفرانەی یەکێک لە گەورەترین نیعمەتەکانی خوایە).

٢٩١٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّمَا رَجُلٍ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ وَالِدِهِ، أَوْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ الَّذِينَ أَعْتَقُوهُ، فَإِنَّ عَلَيْهِ لَعْنَةَ اللهِ، وَالْمَلاَئِكَةِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ».(٢)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نەسەبی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی، یان خۆی بکاتە وەلی جگە لەو بەندانەی ئازادی کردوون، ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و خەڵکی بە تێکڕایی لێ بێت تاوەکو ڕۆژی دوایی، نە واجب و نە سوننەتیشی لێ وەرناگیرێت.

## بابەت: دەربارەی میراتی مێرد و دایک و باوک و، ژن و دایک و باوک

٢٩١٦ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ: كَانَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، إِذَا سَلَكَ بِنَا طَرِيقًا، وَجَدْنَاهُ سَهْلاً، وَإِنَّهُ قَالَ فِي زَوْجٍ وَأَبَوَيْنِ: لِلزَّوْجِ النِّصْفُ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ».(٣)

واتە: عەبدوڵلا وتویەتی: عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) کاتێ بە ڕێگایەکی دادەبردین (واتە: کاتێ ڕێگا چارەیەکی بۆ کێشەکانمان دەدۆزیەوە و حوکمی بۆ دەردەکردین)، ڕێگاکە ئاسان دەردەچوو (چونکە بڕیارەکانی عومەر هەمووی هەر چاک بوو)، جا عومەر دەربارەی میراتی مێرد و دایک و باوک وتی: مێرد نیوەی بۆ هەیە، دایکیش سێیەکی ئەوەی بۆ هەیە کە ماوەتەوە (ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ باوکە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف جدا.

(٢) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف .

٢٩١٧ - «حَدَّثَنَا يَزِيدُ الرِّشْكُ، قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، عَنْ رَجُلٍ تَرَكَ امْرَأَتَهُ، وَأَبَوَيْهِ؟ فَقَالَ: قَسَّمَهَا زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، مِنْ أَرْبَعَةٍ».[١]

واتە: لە یەزیدی ڕیشكەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە سەعیدی كوڕی موسەییب كرد دەربارەی پیاوێک كە خێزانەكەی و دایک و باوكی لەدوای خۆی جێهێشتووە؟ ئەویش وتی: زەیدی كوڕی ثابیت مەسئەلەكەی دابەش كرد بەسەر چوار (واتە: لە چوار بەش: یەک لەسەر چوار بۆ ژنەكەیە، سێ بەشیش دەمێنێتەوە، یەک لەسەر سێش بۆ دایكیەتی، دوو بەش دەمێنێتەوە، دووەكەش بۆ باوكەكەیە بە عەصەبایەتی دەیبات).

٢٩١٨ - «عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ: لِلْمَرْأَةِ الرُّبُعُ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ».[٢]

واتە: لە ئەبو موهەللەبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ دەربارەی مەسئەلەی میراتی ژنێک و دایک و باوک وتویەتی: چواریەک بۆ ژنەكە و، سێیەكی ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ دایک و (ئەوەی تریش بۆ باوک).

٢٩١٩ - «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لِلْمَرْأَةِ الرُّبُعُ: سَهْمٌ مِنْ أَرْبَعَةٍ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ سَهْمٌ، وَلِلأَبِ سَهْمَانِ».[٣]

واتە: لە عوسمانی كوڕی عەففانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە وتویەتی: چواریەک بۆ ژنەكەیە: كە دەكاتە پشكێک لە چوار پشک، وە پشكێک (لەو سێ پشكەی دەمێنێتەوە) بۆ دایكەكەیە، دوو پشكەكەی تریش كە ماوەتەوە بۆ باوكە.

٢٩٢٠ - «أَخْبَرَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ حَجَّاجٍ، عَنْ عُمَيْرِ بْنِ سَعِيدٍ ، أَنَّهُ سَأَلَ الْحَارِثَ الأَعْوَرَ عَنِ امْرَأَةٍ، وَأَبَوَيْنِ فَقَالَ مِثْلَ قَوْلِ عُثْمَانَ ﷺ».[٤]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان شت لە عوسمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

٢٩٢١ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ فِي امْرَأَةٍ تَرَكَتْ زَوْجَهَا وَأَبَوَيْهَا: لِلزَّوْجِ النِّصْفُ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ».[٥]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف .

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی میراتی ئافرەتێک کە: مێرد و دایک و باوکی دوای خۆی جێهێشتووە، وتویەتی: نیوە بۆ مێردەکەیە و، سێیەکی ماوەکەش بۆ دایکە (ئەوەی تریشی بۆ باوکە).

٢٩٢٢ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ قَالَ: مِنْ أَرْبَعَةٍ: لِلْمَرْأَةِ الرُّبُعُ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأَبِ».(١)

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی میراتی: ژنێک و دایک و باوک وتویەتی: (مەسئەلەکە) لە چوارە: چواریەک بۆ ژنەکەیە و، سێیەکی ماوەکەش بۆ دایکە و، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ باوکە.

٢٩٢٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: كَانَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، إِذَا سَلَكَ بِنَا طَرِيقًا اتَّبَعْنَاهُ فِيهِ وَجَدْنَاهُ سَهْلاً، وَإِنَّهُ قَضَى فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ مِنْ أَرْبَعَةٍ فَأَعْطَى الْمَرْأَةَ الرُّبُعَ، وَالأمَّ ثُلُثَ مَا بَقِيَ، وَالأَبَ سَهْمَيْنِ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵلاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) كاتێ بە ڕێگەیەکی دادەبردین و شوێنی دەکەوتین دەمانبینی ڕێگەکە ئاسانە (حوکمەکانی لە شوێنی خۆی بوو)، جا ئەو دادوەری کرد دەربارەی مەسئەلەی ژنێک و دایک و باوک، لە چوار (واتە: مەسئەلەکەی لە چوار حەل کرد، بەم شێوەیە): چواریەکی دا بە ژنەکە و، سێیەکی ماوەکەشی دا بە دایک و، دوو پشکیشی دا بە باوک.

٢٩٢٤ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عِيسَى، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ».(٣)

واتە: هەمان شت لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

٢٩٢٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ يَقُولُ: مَا كَانَ اللهُ لِيَرَانِي أَنْ أُفَضِّلَ أُمًّا عَلَى أَبٍ».(٤)

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە دەیوت: نابێ خوا بمبینێ فەزڵی دایک بدەم بەسەر باوک (واتە: پشکی دایک زیاتر دانانێم لە باوک).

٢٩٢٦ - «عَنْ عِكْرِمَةَ ﷺ، قَالَ: أَرْسَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: أَتَجِدُ فِي كِتَابِ اللهِ لِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ؟. فَقَالَ زَيْدٌ: إِنَّمَا أَنْتَ رَجُلٌ تَقُولُ بِرَأْيِكَ، وَأَنَا رَجُلٌ أَقُولُ بِرَأْيِي».(٥)

---

(١) ـ إسناده ضعيف .

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عیکریمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) ناردی بەدوای زەیدی کوڕی ثابیت ﷺ (تا پرسیاری لێ بکات): ئایا تۆ لە پەرتوکی خوا (لە قورئاندا) بینیوتە سێیەکی ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ دایک بێت؟ زەیدیش وتی: تۆ پیاوێکیت بە ئیجتیهادی خۆت دەکەیت، منیش پیاوێکم بە ئیجتیهادی خۆم دەکەم (واتە: هەردووکمان هەر لە قورئان ئیجتیهادمان کردوە، بەڵام بە تێگەیشتنی جیاواز، دیاریش نیە کاممان هەڵەین کەواتە جارێ هەردووکمان ڕاستین).

٢٩٢٧ - «عن عطاء عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُمَا قَالاَ فِي زَوْجٍ وَأَبَوَيْنِ: لِلزَّوْجِ النِّصْفُ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ جَمِيعِ الْمَالِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأَبِ».[١]

واتە: لە عەتاء و ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، هەردووکیان دەربارەی مەسئەلەی میراتی: مێرد و دایک و باوک وتویانە (مەسئەلەکە لە شەشە): نیوە بۆ مێردە و، سێیەکی کۆی گشتی ماڵەکەش بۆ دایکە و، ئەوەی دەمێنێتەوەش بۆ باوکە.

تێبینی: ئەم مەسئەلە پێی دەوترێت مەسئەلەی: غەڕەوییە یان غەریبە یان عومەرییە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر سەیری پەرتوکێکی میرات بکە.

٢٩٢٨ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: لِلأُمِّ ثُلُثُ جَمِيعِ الْمَالِ فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ، وَفِي زَوْجٍ وَأَبَوَيْنِ».[٢]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سێیەکی کۆی گشتی ماڵەکە بۆ دایکە (لە مەسئەلەی غەڕەوییەتان، کە بریتیە لە): ژن و دایک و باوک، یان مێرد و دایک و باوک.

٢٩٢٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: خَالَفَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَهْلَ الْقِبْلَةِ فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ: جَعَلَ لِلأُمِّ الثُّلُثَ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ».[٣]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) پێچەوانەی ئەهلی قیبلەی کردوە (واتە: پێچەوانەی زانایانی کردوە) دەربارەی (مەسئەلەی غەڕەوییە کە بریتیە لە): ژن و دایک و باوک، سێیەکی کۆی گشتی ماڵەکەی بۆ دایک داناوە (کەچی زانایانی تر سێیەکی ماوەکە دەدەن بە دایک دوای دانانی پشکی ژن).

## بابەت: دەربارەی کچ و خوشک

٢٩٣٠ - «عَنْ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: قَضَى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﷺ، بِالْيَمَنِ فِي بِنْتٍ وَأُخْتٍ، فَأَعْطَى الْبِنْتَ النِّصْفَ، وَالأُخْتَ النِّصْفَ».[٤]

---

(١) ـ إسناده ضعيف .

(٢) ـ إسناده منقطع .

(٣) ـ رجاله ثقات .

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ دادوەری کردوە لە یەمەن دەربارەی (مەسئەلەی میراتی): کچ و خوشکێک، نیوەی دا بە کچ و، نیوەشی دا بە خوشک (مەسئەلەکەش لە «دوو»ـە).

٢٩٣١ - «عَنْ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانَ لاَ يُوَرِّثُ الآخْتَ مِنَ الأَبِ، وَالآمِّ مَعَ الْبِنْتِ حَتَّى حَدَّثَهُ الأَسْوَدُ أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، جَعَلَ لِلْبِنْتِ النِّصْفَ، وَلِلأُخْتِ النِّصْفَ فَقَالَ: أَنْتَ رَسُولِي إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، فَأَخْبِرْهُ بِذَاكَ وَكَانَ قَاضِيَهُ بِالْكُوفَةِ».[١]

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو زوبەیر ﷺ خوشکی لە باوک و دایکی نەدەکرد بە میراتگر لەگەڵ کچدا، تاوەکو ئەسوەد بۆی گێڕایەوە کە موعاذی کوڕی جەبەل نیوەی داناوە بۆ کچ و، نیوەشی داناوە بۆ خوشک، جا وتی: تۆ نێردراوی منی بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عوتبە و ئەوەی پێ ڕابگەیەنە، عەبدوڵلای کوڕی عوتبە قازی ئەو بوو لە کوفە.

٢٩٣٢ - «حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ رَجُلٍ تَرَكَ بِنْتًا وَأُخْتًا؟ فَقَالَ: لإِبْنَتِهِ النِّصْفُ، وَلأُخْتِهِ مَا بَقِيَ قَالَ: وَقَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ كَانَ يَجْعَلُ الأَخَوَاتِ مَعَ الْبَنَاتِ عَصَبَةً، لاَ يَجْعَلُ لَهُنَّ إِلاَّ مَا بَقِيَ»[٢]

واتە: لە بیشری کوڕی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو ئەبی زیناد کرد دەربارەی پیاوێک کە مردووە و دوای خۆی کچێک و خوشکێکی جێهێشتووە؟ ئەویش وتی: نیوە بۆ کچەکەیەتی و، ئەوەشی دەمێنێتەوە بۆ خوشکەکەیەتی.

هەروەها وتویەتی: باوکم لە خاریجەی کوڕی زەیدەوە بۆی گێڕامەوە کە زەیدی کوڕی ثابیت خوشکی بە عەصەبە دادەنا لەگەڵ هەبوونی کچ، تەنها ئەوەی بۆ دادەنان کە دەمایەوە.

## بابەت: دەربارەی مەسئەلەی موشتەڕەکە

٢٩٣٣ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي زَوْجٍ، وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ لأَبٍ وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ لأُمٍّ؟ قَالَ: كَانَ عُمَرُ، وَعَبْدُ اللهِ، وَزَيْدٌ ﷺ، يُشَرِّكُونَ، وَقَالَ عُمَرُ: لَمْ يَزِدْهُمُ الأَبُ إِلاَّ قُرْبًا».[٣]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی (مەسئەلەی میراتی): مێرد و، دایک و، برای لە دایک و باوک و، برای تەنها لە دایک، وتویەتی: عومەر و، عەبدوڵلا و، زەید ﷺ، بەشداریان پێ دەکردن (واتە: برای لە دایک و باوک لەگەڵ برای تەنها لە دایکیان بەشداری پێ دەکرد لە سێیەک)، عومەریش وتویەتی: باوک (بە نسبەت برای لە دایک و باوک) هیچیان بۆ زیاد ناکات جگە لە نزیکی.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

تێبینی: لەبەر ئەوەی «برای لە دایک و باوک» پشکی بۆ دیاری نەکراوە نە لە قورئان و نە لە فەرموودە، بەڵکو ئەوەی پشکی بۆ دانراوە بریتیە لە «برای تەنها لە دایک»، بۆیە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا «برای لە دایک و باوک» پشکی میراتی پێ نەدەدرا، بەڵام دواتر ئیمامی عومەر بیری کردەوە کە «برای لە دایک و باوک» لە پێشتریشە لە «برای تەنها لە دایک»، بۆیە هەردووکی بەیەکەوە کردن لە شەریکی ئەو پشکەی کە بۆ برای تەنها لە دایک دانراوە، کە بریتیە لە سێیەک. ئەم مەسەلەیەش چەندین ناوی هەیە کە بریتین لە: موشتەرەکە و، موشەڕەکە و، حیماریە و، حەجەرییە و، یەممییە.

٢٩٣٤ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يُشَرِّكُ».(١)

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە (برای لە دایک و باوکی) بەشداری پێ نەکردوون لە میراتدا (واتە: میراتی پێ نەداون).

٢٩٣٥ - «عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، أَنَّ عُثْمَانَ ﷺ، كَانَ يُشَرِّكُ، وَعَلِيٌّ، كَانَ لاَ يُشَرِّكُ».(٢)

واتە: لە ئەبو میجلەزەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوسمان ﷺ (برای لە دایک و باوکی) بەشداری پێ دەکرد لە سێیەکی (برای تەنها لە دایک)، عەلیش بەشداری پێ نەدەکرد.

٢٩٣٦ - «عَنِ ابْنِ ذَكْوَانَ، أَنَّ زَيْدًا ﷺ، كَانَ يُشَرِّكُ».(٣)

واتە: لە ئیبنو زەکوانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زەید ﷺ (برای لە دایک و باوکی) بەژداری پێ دەکرد لە سێیەکی (برای تەنها لە دایک).

٢٩٣٧ - «عَنْ شُرَيْحٍ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ يُشَرِّكُ».(٤)

واتە: لە شورەیحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە (برای لە دایک و باوکی) بەشداری پێ دەکرد لە سێیەکی (برای تەنها لە دایک).

٢٩٣٨ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ فَيْرُوزَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ، قَالَ فِي الْمُشَرَّكَةِ: لَمْ يَزِدْهُمُ الأَبُ، إِلاَّ قُرْبًا».(٥)

واتە: لە سەعیدی کوڕی فەیروزەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە عومەر ﷺ دەربارەی مەسئەلەی موشتەرەکە وتویەتی: باوک (بۆ برای لە دایک و باوک) هیچ زیاد ناکات جگە لە نزیکی (کەواتە لە برای تەنها لە دایک لەپێشترە بۆیە بەژداری پێ دەکەین لە سێیەکی برای تەنها لە دایک).

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن .

(٥) ـ إسناده ضعيف .

## بابەت: دەربارەی دوو کوره مام: یەکێکیان مێرده و ئەوەی تریان برایه له دایک

٢٩٣٩ - «عَنْ الْحَارِثِ الأَعْوَرِ، قَالَ: أُتِيَ عَبْدُ اللهِ ﷺ، فِي فَرِيضَةِ بَنِي عَمٍّ، أَحَدُهُمْ أَخٌ لأُمٍّ، فَقَالَ: الْمَالُ أَجْمَعُ لأَخِيهِ لأُمِّهِ، فَأَنْزَلَهُ بِحِسَابِ أَوْ بِمَنْزِلَةِ الأَخِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ. فَلَمَّا قَدِمَ عَلِيٌّ، سَأَلْتُهُ عَنْهَا وَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ: « يَرْحَمُهُ اللَّهُ: إِنْ كَانَ لَفَقِيهًا، أَمَّا أَنَا فَلَمْ أَكُنْ لأَزِيدَهُ، عَلَى مَا فَرَضَ اللهُ لَهُ، سَهْمٌ السُّدُسُ، ثُمَّ يُقَاسِمُهُمْ كَرَجُلٍ مِنْهُمْ».[١]

واته: له حاریثی ئەعوەڕەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: خەڵک هاتوون بۆ لای عەبدوڵڵا ﷺ دەربارەی میراتی دوو کوڕە مام: یەکێکیان برای له دایک بووه، عەبدوڵڵا وتویەتی: ماڵەکە گشتی بۆ برای له دایکه ـ دوای دەرکردنی پشکی مێرد ئەگەر هەبێت ـ (چونکه برای له دایک شەش یەکی ماڵەکە بە فەرز دەبات و باقیەکەی تریش بە عەصەبایەتی دەبات)، (حاریث دەڵێ): جا کاتێ عەلی هات پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەمە و قسەی عەبدوڵڵام پێ ڕاگەیاند، ئەویش وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت، هەر چەندە زانایەکی فەقیهو تێگەیشتووە لە دین، بەڵام ئەگەر من بام ئەوە بۆم زیاد نەدەکرد لەسەر ئەو بەشەی خوا بۆی داناوە کە شەش یەکە (واتە: یەک لەسەر شەشە)، دواتر بەشداریش دەبێت لەوەی دەمێنێتەوە وەک هەر پیاوێک لەوان.

٢٩٤٠ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّهُ أُتِيَ فِي ابْنَيْ عَمٍّ أَحَدُهُمَا أَخٌ لأُمٍّ، فَقِيلَ لِعَلِيٍّ: إِنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ، كَانَ يُعْطِيهِ الْمَالَ كُلَّهُ، فَقَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: إِنْ كَانَ لَفَقِيهًا، وَلَوْ كُنْتُ أَنَا أَعْطَيْتُهُ السُّدُسَ، وَمَا بَقِيَ كَانَ بَيْنَهُمْ».[٢]

واته: له عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە هاتونەتە لای دەربارەی دوو کوڕە مام: یەکێکیان برای له دایک بووه، جا بە عەلی وتراوە: ئیبنو مەسعود گشت ماڵەکەی داوەتێ (واتە: فەتوای داوە بەوەی دەبێ گشت ماڵەکە بۆ ئەو بێت)، عەلیش وتی: هەر چەندە زانایەکی فەقیهو شەرعزانە، بەڵام ئەگەر من بام تەنها شەش یەکم پێ دەدا، وە ئەوەی دەشمایەوە دابەشم دەکرد لە نێوانیان (واتە: ئەویشی دوبارە دەگرتەوە).

## بابەت: دەربارەی کچ و کچە برا و خوشکی له دایک و باوک

٢٩٤١ - «عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، وَإِلَى سَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ، فَسَأَلَهُمَا عَنْ بِنْتٍ، وَبِنْتِ ابْنٍ، وَأُخْتٍ لأُمٍّ وَأَبٍ، فَقَالاَ: لِلإِبْنَةِ النِّصْفُ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ. وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ، فَإِنَّهُ سَيُتَابِعُنَا، فَجَاءَ الرَّجُلُ إِلَى عَبْدِ اللهِ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذًا، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، وَإِنِّي أَقْضِي بِمَا قَضَى بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِلإِبْنَةِ النِّصْفُ، وَلإِبْنَةِ الإِبْنِ السُّدُسُ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ».[٣]

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ إسناده حسن .

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە هوذەیلی کوڕی شوڕەحبیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری و سەلمانی کوڕی ڕەبیعە و ﷺ پرسیاری لێ کردن دەربارەی (میراتی): کچ و، کچە برا و، خوشکی لە دایک و باوک، ئەوانیش وتیان: نیوە بۆ کچەکەیە و ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ خوشکەکەیە (هیچیشیان نەدا بە کچە برا)، جا وتیان: بچۆ بۆ لای ئیبنو مەسعود، چونکە بە دڵنیایی چاودێریمان دەکات، جا پیاوەکە چوو بۆ لای عەبدوڵلا و پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو مەسئەلە، ئەویش وتی: (ئەگەر بە سوننەت بڕیار نەدەم) ئەو کات من گومڕا بووم و لە ڕێنموییکراوان نیم، من بڕیار بەوە دەدەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری پێداوە: نیوە بۆ کچەکەیە و، شەش یەکیش بۆ کچی برایە و، ئەوەیشی دەمێنێتەوە بۆ خوشکەکەیە.

## بابەت: دەربارەی برا و خوشک و منداڵ و منداڵی کوڕ

٢٩٤٢ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي أَخَوَاتٍ لأَبٍ وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ لأَبٍ، لِلأَخَوَاتِ لِلأَبِ وَالأَمِّ الثُّلُثَانِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلذُّكُورِ دُونَ الإِنَاثِ « فَقَدِمَ مَسْرُوقٌ الْمَدِينَةَ، فَسَمِعَ قَوْلَ زَيْدٍ، فِيهَا فَأَعْجَبَهُ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: أَتَتْرُكُ قَوْلَ عَبْدِ اللهِ؟ قَالَ: إِنِّي أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَوَجَدْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ مِنَ الرَّاسِخِينَ فِي الْعِلْمِ قَالَ أَحْمَدُ: فَقُلْتُ لأَبِي شِهَابٍ: وَكَيْفَ قَالَ زَيْدٌ فِيهَا؟ قَالَ: شَرَّكَ بَيْنَهُمْ».[1]

واتە: لە مەسڕوقەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەربارەی (مەسئەلەی میراتی): خوشکی لە دایک و باوک و، برا و خوشکی تەنها لە باوک، وتویەتی: سێیەک بۆ خوشکی لە دایک و باوکە و، ئەوەیشی کە دەمێنێتەوە بۆ نێرینەکانە نەک مێینەکان، جا مەسڕوق چوو بۆ مەدینە و گوێبیستی قسە و فەتوای زەید بوو و زۆر دڵی گرتی، جا هەندێک لە هاوەڵەکانی پێیان وت: ئایا قسە و فەتوای عەبدوڵلا واز لێ دەهێنیت (لەو مەسئەلەیە)؟ ئەویش وتی: من هاتم بۆ مەدینە و بینیم زەیدی کوڕی ثابیت ﷺ لە ڕۆچوانی زانستە (لە زانا هەرە قوڵ و بلیمەتەکانە)، ئەحمەد وتویەتی: جا بە ئەبو شیهابم وت: قسە و فەتوای زەید چی بوو لەو بابەتەدا؟ وتی: هەموویانی بەشداری پێ دەکرد (واتە: میراتی دا بە هەموویان).

تێبینی: ئەصلی ئەم مەسئەلە لە شەشە، خوشکی لە دایک و باوک نیوەی دەبات، کە دەکاتە سێ بەش، خوشکی تەنها لە باوکیش شەش یەک دەبات، کە دەکاتە بەشێک، برای تەنها لە باوکیش یەک لەسەر سێ دەبات، کە دەکاتە دوو بەش، کۆی گشتیش دەکاتە شەش بەش.

٢٩٤٣- «عَنْ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: ذَكَرْنَا عِنْدَ حَكِيمِ بْنِ جَابِرٍ: أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ فِي أَخَوَاتٍ لأَبٍ وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ لأَبٍ: أَنَّهُ كَانَ يُعْطِي الأَخَوَاتِ مِنَ الأَبِ وَالأَمِّ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلذُّكُورِ دُونَ الإِنَاثِ فَقَالَ حَكِيمٌ: قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: هَذَا مِنْ عَمَلِ الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ يَرِثَ الرِّجَالُ دُونَ النِّسَاءِ، إِنَّ إِخْوَتَهُنَّ قَدْ رُدُّوا عَلَيْهِنَّ».[2]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیسماعیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای حەكیمی كوڕی جابر باسی ئەوەمان كرد كە ئیبنو مەسعود ﷺ دەربارەی (میراتی): خوشكی لە دایك و باوك و، برا و خوشكی تەنها لە باوك وتویەتی: سێیەك دەدات بە خوشكی لە دایك و باوك و، ئەوەی دەشمێنێتەوە ئەوە بۆ نێرینەكانە نەك مێینەكان، جا حەكیم وتی: زەیدی كوڕی ثابیت وتویەتی: ئەوە لە كردەوەی سەردەمی جاهیلیە كە تەنها پیاو میرات بگرن نەك ئافرەت، براكانیان بۆیان دەگەڕێننەوە (واتە: دەبێ پشكیان پێ بدرێت).

٢٩٤٤- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا كَانَتْ تُشَرِّكُ بَيْنَ ابْنَتَيْنِ وَابْنَةِ ابْنٍ، وَابْنِ ابْنٍ: تُعْطِي الإِبْنَتَيْنِ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَشَرِكَتْهُمْ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ، لاَ يُشَرِّكُ يُعْطِي الذُّكُورَ دُونَ الإِنَاثِ، وَقَالَ: الأَخَوَاتُ بِمَنْزِلَةِ الْبَنَاتِ».[١]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە كە هاوبەشی خستۆتە نێوان (میراتی): دوو كچ و كچی كوڕ و كوڕی كوڕ، دوو لەسەر سێی داوە بە دوو كچەكە و، ئەوەی ماوەتەوەش دابەشی كردوە لە نێوانیان (واتە: بەوەی دوو بەش بۆ كوڕەكان بێت و بەشێكیش بۆ كچەكان بێت لەو سێیەكەی دەمێنێتەوە، بە عەصەبایەتی).

هەرچی عەبدوڵلاشە بەشداری پێ نەدەكردن، دەیدا بە نێرینەكان نەك مێینەكان، وە دەیوت: خوشك لە مەرتەبەی كچە.

تێبینی: لەسەر مەزهەبی دایكمان عائیشە ئەصلی ئەم مەسئەلە لەسەر نۆیە، دوو كچەكان دوو لەسەر سێ دەبەن، كە دەكاتە شەش بەش، كچی كوڕیش لەگەڵ كوڕی كوڕ بە یەكەوە لە سێیەكەكە دەبەن كە ماوەتەوە، بەوەی دوو بەش بۆ كوڕەكە بێت و بەشێكیش بۆ كچەكە.

٢٩٤٥ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، كَانَ يَقُولُ فِي بِنْتٍ وَبَنَاتِ ابْنٍ، وَابْنِ ابْنٍ: إِنْ كَانَتِ الْمُقَاسَمَةُ بَيْنَهُمْ أَقَلَّ مِنَ السُّدُسِ، أَعْطَاهُمُ السُّدُسَ، وَإِنْ كَانَ أَكْثَرَ مِنَ السُّدُسِ، أَعْطَاهُمُ السُّدُسَ».[٢]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، كە ئیبنو مەسعود ﷺ هەموو جار فەتوای دەدا دەربارەی (مەسئەلەی میراتی): كچ و، كچی كوڕ و، كوڕی كوڕ، ئەگەر دابەشبوونەكە لە نێوانیاندا كەمتر بووایە لە شەش یەك، ئەوە شەش یەكی پێ دەدان، وە ئەگەر زیاتربا لە شەش یەك ئەوە هەر شەش یەكی پێ دەدان (واتە: مەسئەلەكە لە شەشە: نیوەی بۆ كچەكەیە، كە دەكاتە سێ بەش، شەش یەكیش بۆ كچی كوڕە، كە دەكاتە یەك بەش، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ كوڕی كوڕە، كە دەكاتە دوو بەش).

٢٩٤٦ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، أَنَّهُ كَانَ يُشَرِّكُ، فَقَالَ لَهُ عَلْقَمَةُ ﷺ: هَلْ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَثْبَتُ مِنْ عَبْدِ اللهِ؟ فَقَالَ: لاَ، وَلَكِنِّي رَأَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَأَهْلَ الْمَدِينَةِ يُشَرِّكُونَ فِي ابْنَتَيْنِ وَبِنْتِ ابْنٍ، وَابْنِ ابْنٍ، وَأُخْتَيْنِ».[٣]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە مەسروقەوە گێڕدراوەتەوە کە (کچی کوڕ و کوڕی کوڕی) بەشدار کردوون لە میرات، جا عەلقەمە ﷺ پێی وت: ئایا هیچ کەسێک هەیە لە زانایان جێی متمانەتر بێت لە عەبدوڵڵا؟ (کەچی واناکات، بەڵکو تەنها دەیدات بە کوڕی کوڕ)!، مەسروقیش وتی: زەیدی کوڕی ثابیت و ئەهلی مەدینەم بینیوە بەژداریان پێ کردوون (میراتیان داوە بە گشتیان) لە مەسئەلەی: دوو کچ و کچی کوڕ و، کوڕی کوڕ و، دوو خوشک (کەسیان لەمانە بێ بەش نەکردوە).

٢٩٤٧- «عَنْ شُرَيْحٍ ﷺ فِي امْرَأَةٍ تَرَكَتْ زَوْجَهَا، وَأُمَّهَا، وَأُخْتَهَا لأَبِيهَا وَأُمِّهَا، وَأُخْتَهَا لأَبِيهَا، وَإِخْوَتَهَا لأُمِّهَا، جَعَلَهَا مِنْ سِتَّةٍ، ثُمَّ رَفَعَهَا فَبَلَغَتْ عَشَرَةً، لِلزَّوْجِ النِّصْفُ ثَلاَثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأمِّ النِّصْفُ ثَلاَثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلأُمِّ السُّدُسُ سَهْمٌ، وَلِلإِخْوَةِ مِنَ الأُمِّ الثُّلُثُ سَهْمَانِ، وَلِلأُخْتِ مِنَ الأَبِ سَهْمٌ تَكْمِلَةُ الثُّلُثَيْنِ».[1]

واتە: لە شوڕەیحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتێک کە (وەفاتی کردبوو) و مێرد و، دایکی و، خوشکی لە دایک و باوکی و، خوشکی تەنها لە باوکی و، خوشکی تەنها لە دایکی، دوای خۆی جێهێشتبوو، (شوڕەیح): مەسئەلەکەی دابەش کرد بەسەر شەش، دواتر (عەولی کرد و بەرزی کردەوە) و گەیاندیە دە، نیوە بۆ مێردەکە، کە دەکاتە سێ پشک، نیوەشی بۆ خوشکی لە دایک و باوکە، کە دەکاتە سێ پشک، شەش یەکیش بۆ دایکە، کە دەکاتە یەک پشک، سێیەکیش بۆ برای لە دایکە، کە دەکاتە دوو پشک، وە تەکمیلەی دوو لەسەر سێش بۆ خوشکی لە باوکە، کە دەکاتە یەک پشک (ئەوە دە پشک و مەسئەلەکە لە دە حەل دەبێت بە عەولەوە).

تێبینی: ئەصلی ئەم مەسئەلە لە شەشە، بەڵام دەبێ عەول بکرێت بۆ نۆ، جا یەک لەسەر شەش بۆ دایکە، کە دوای عەول دەکاتە یەک لەسەر نۆ، نیوەش بۆ مێردە، بەڵام دوای عەول دەکاتە یەک لەسەر سێ، نیوەش بۆ خوشکی لە دایک و باوکە، بەڵام دوای عەول دەبێتە یەک لەسەر سێ، یەک لەسەر شەشیش بۆ خوشکی تەنها لە دایکە، کە دەکاتە یەک لەسەر نۆ دوای عەول، کۆی گشتیش دەکاتە نۆ بەش.

## بابەت: دەربارەی بەندەو ئەهلی کتاب

٢٩٤٨ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ عَلِيًّا، وَزَيْدًا رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، كَانَا لاَ يَحْجُبَانِ بِالْكُفَّارِ، وَلاَ بِالْمَمْلُوكِينَ، وَلاَ يُوَرِّثَانِهِمْ شَيْئًا وَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَحْجُبُ بِالْكُفَّارِ، وَبِالْمَمْلُوكِينَ، وَلاَ يُوَرِّثُهُمْ».[2]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی و زەید (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) نە بە هۆی (خزم و کەسی) کافر و نە بەهۆی بەندە حوجبیان نەدەکرد (واتە: خزمی بەندە و کافریان نە دەکردن بە هۆکاری حوجبی حیرمان یان حوجبی نوقصان لە بابەتی میراتدا)، وە هیچ میراتێکیشیان پێ نەدەدان، هەرچی عەبدوڵلاشە حوجبی دەکرد بە کافر و بەندە (واتە: دەیکردن بە هۆکاری حوجب) بەڵام میراتی پێ نەدەدان.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف .

تێبینی: بۆ نمونە ئەگەر ئافرەتێکی مسوڵمان تەنها منداڵی کافری هەبێت، ئەوە کاتێ مێردەکەی وەفات دەکات پشکی ئافرەتەکە لە چواریەکەوە نابێتە هەشت یەک بەهۆی هەبوونی منداڵە کافرەکانەوە، منداڵەکانیش میرات وەرناگرن، ئەمە لەسەر مەزهەبی عەلی و زەید ڕەزای خوایان لێ بێت.

هەرچی مەزهەبی عەبدوڵڵایە ئەوە بەهۆی منداڵە کافرەکانەوە پشکی ئافرەتەکەی دەکرد بە هەشت یەک و حیسابی بۆ هەبوونی منداڵە کافرەکان دەکرد، بەڵام وەک عەلی و زەید هیچیشی نەدەدا بە منداڵە کافرەکان.

ئەمە نمونەی حوجبی نوقصان بوو بە هۆی کەسی کافر، جا جەنابیشت قیاسی حوجبی حیرمانیش بۆ خۆت بکە بە هۆی بەندە و کەسی کافر، بەم شێوەیەی باسمان کرد.

**٢٩٤٩** - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ عَلِيًّا، وَزَيْدًا رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: الْمَمْلُوكُونَ وَأَهْلُ الْكِتَابِ لاَ يَحْجُبون وَلاَ يَرِثُونَ وَقَالَ عَبْدُ اللهِ: يَحْجُبون وَلاَ يَرِثُونَ».[١]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): عەلی و زەید (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویانە: بەندە و ئەهلی کتاب نە حوجب دەکەن و نە میرات دەبەن، عەبدوڵڵاش وتویەتی: حوجب دەکەن بەڵام میرات نابەن.

## بابەت: (میراتی) باپیر

**٢٩٥٠** - «عَنْ سَعِيدٍ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ، كَانَ كَتَبَ مِيرَاثَ الْجَدِّ حَتَّى إِذَا طُعِنَ دَعَا بِهِ فَمَحَاهُ. ثُمَّ قَالَ: سَتَرَوْنَ رَأْيَكُمْ فِيهِ».[٢]

واتە: لە سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ میراتی باپیری نوسیەوە تا ئەو کاتەی پێکرا و لێیدرا (بە خەنجەر لە ناو نوێژدا)، جا بانگی کرد بۆی بێنن و نوسراوەکەی سڕیەوە، دواتر وتی: بۆچونی خۆتان دەبێت تیایدا.

**٢٩٥١** - «عَنْ ابْنِ سِيرِينَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَبِيدَةَ: حَدِّثْنِي عَنِ الْجَدِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي لأَحْفَظُ فِي الْجَدِّ ثَمَانِينَ قَضِيَّةً مُخْتَلِفَةً».[٣]

واتە: لە ئیبنو سیرینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عەبیدەم وت: دەربارەی میراتی باپیر بۆم بگێڕەوە، ئەویش وتی: من دەربارەی میراتی باپیر هەشتا نمونەی جیاوازی میراتی باپیرم لەبەر کردوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف .

٢٩٥٢ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: أَتَاهُ رَجُلٌ فَسَأَلَهُ عَنْ فَرِيضَةٍ، فَقَالَ: إِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا جَدٌّ فَهَاتِهَا».[١]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هاتۆتە لای و پرسیاری لێ کردوە دەربارەی میرات، عەلیش وتویەتی: ئەگەر باپیری تیا نەبێت بیڵێ (واتە: باپیری تیا بێت خۆی لێ نادەم و حەلی ناکەم).

٢٩٥٣ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ مُرَادٍ، سَمِعَ عَلِيًّا، يَقُولُ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتَقَحَّمَ جَرَاثِيمَ جَهَنَّمَ، فَلْيَقْضِ بَيْنَ الْجَدِّ وَالإِخْوَةِ».[٢]

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی مورادی گوێ لێ بووە گوێی لە عەلی بووە کە دەیوت: ئەوەی پێی خۆشە خۆی بخاتە بنی دۆزەخ با دادوەری بکات و قسە بکات لە مەسئەلەی میراتی باپیر و برا.

## بابەت: قسە و بۆچونی ئەبوبەکر دەربارەی باپیر

٢٩٥٤ - «أَخْبَرَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ».[٣]

واتە: لە ئەبو سعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکری صددیق ﷺ میراتی باپیری وەکو میراتی باوک داناوە (تەنها لە مەسئەلەی غەڕاوییتان یان عومەرییەتان نەبێت).

٢٩٥٥ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ، جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا».[٤]

واتە: لە عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکری صدیق ﷺ میراتی باپیری وەک میراتی باوک داناوە.

٢٩٥٦ - «عَنْ أَبِي مُوسَى، أَنَّ أَبا بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا».[٥]

واتە: لە ئەبو موساوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکری صدیق ﷺ میراتی باپیری وەک میراتی باوک داناوە.

٢٩٥٧ - «عَنْ أَبِي مُوسَى، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا».[٦]

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده حسن .

(٦) ـ إسناده حسن .

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئەبو موساوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکری صدیق ﷺ باپیری بە باوک داناوە (میراتی وەکو یەکتری داناون).

٢٩٥٨ - «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَانَ يَجْعَلُ الْجَدَّ أَبًا».[١]

واتە: لە عوسمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکر ﷺ میراتی باپیری وەک میراتی باوک دادەنا.

٢٩٥٩ - «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَانَ يَجْعَلُ الْجَدَّ أَبًا».[٢]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە عوسمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکر ﷺ میراتی باپیری وەک میراتی باوک دادەنا.

٢٩٦٠ - «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ، قَالَ: لَقِيتُ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ بِالْمَدِينَةِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَبِي مُوسَى أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّ الْجَدَّ لاَ يُنَزَّلُ فِيكُمْ مَنْزِلَةَ الأَبِ وَأَنْتَ لاَ تُنْكِرُ؟ قَالَ: قُلْتُ: وَلَوْ كُنْتَ أَنْتَ لَمْ تُنْكِرْ. قَالَ مَرْوَانُ: فَأَنَا أَشْهَدُ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، أَنَّهُ شَهِدَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ أَنَّهُ جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا، إِذَا لَمْ يَكُنْ دُونَهُ أَبٌ».[٣]

واتە: لە ئەبو بوڕدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە مەڕوانی کوڕی حەکەم گەیشتم لە مەدینە، وتی: ئەی کوڕی ئەبو مووسا مەگەر هەواڵم پێ نەدراوە (واتە: وادەزانی نازانم) کە باپیر لە شوێن و مەرتەبەی باوک دانادرێت لەناو ئێوەدا و تۆش ئینکاری ناکەیت و بەوە ڕازیت؟! دەڵێ: وتم: تۆش بیت ئینکاری ناکەیت، مەڕوان وتی: من شاهێدی دەدەم لەسەر عوسمانی کوڕی عەففان کە شاهێدیدا لەسەر ئەبوبەکر کە باپیری بە باوک داناوە کاتێ باوکی لەگەڵ نەبوویێت.

٢٩٦١ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَانَ يَجْعَلُ الْجَدَّ أَبًا».[٤]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکر باپیری بە باوک دادەنا (هەمان ئەندازەی میراتی باوکی پێ دەدا).

٢٩٦٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَعَلَهُ الَّذِي قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا أَحَدًا خَلِيلاً، لاَتَّخَذْتُهُ خَلِيلاً، وَلَكِنْ أُخُوَّةُ الإِسْلاَمِ أَفْضَلُ يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ، جَعَلَهُ أَبًا يَعْنِي: الْجَدَّ».[٥]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر کەسێکم بکردایە بە خەلیلی خۆم ئەوە ئەوم دەکرد بە خەلیلی خۆم، بەڵام برایەتی

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ إسناده حسن .

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ صحيح .

ئیسلامەتی چاکترە ـ کە مەبەستی ئەبوبەکر بوو ـ (ئا ئەو پیاوە خاوەن ڕێزو پلەیە) باپیری بە باوک داناوە.

٢٩٦٣ - «عَنْ ابْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا».(١)

واتە: لە ئیبنو زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکر ﷺ باپیری بە باوک داناوە.

٢٩٦٤ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: إِنَّ الْجَدَّ قَدْ مَضَتْ سُنَّتُهُ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا، وَلَكِنَّ النَّاسَ تَخَيَّرُوا».(٢)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باپیر سوننەتەکەی تێپەڕیوە (واتە: باس کردنی بڕاوەتەوە و فەتوا دراوە و بۆچونی تر دروست نیە لەوەی کە هەیە)، ئەبوبەکریش ﷺ باپیری بە باوک داناوە، بەڵام خەڵک سەرپشکە چ فەتوایێک هەڵدەبژێرێ و قەناعەت بە کامیان دەکات (کە هاوەڵان لەسەری بوون، بەڵام لەسەر ئەساسی زانست، نەک ئارەزوو و حەز لێبوون).

## بابەت: دەربارەی قسە و بۆچونی عومەر دەربارەی باپیر

٢٩٦٥ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جَدٍّ وَرِثَ فِي الإِسْلَامِ عُمَرُ ﷺ».(٣)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: یەکەم باپیر کە میراتی گرت لە ئیسلامدا عومەر ﷺ بوو.

٢٩٦٦ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جَدٍّ وَرِثَ فِي الإِسْلَامِ عُمَرُ ﷺ، فَأَخَذَ مَالَهُ فَأَتَاهُ عَلِيٌّ وَزَيْدٌ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، فَقَالاَ: لَيْسَ لَكَ ذَاكَ، إِنَّمَا أَنْتَ كَأَحَدِ الأَخَوَيْنِ».(٤)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: یەکەم باپیر کە میراتی گرت لە ئیسلامدا عومەر بوو، جا (کە نەوەیەکی وەفاتی کرد) عومەر گشت ماڵەکەی هەڵگرتو و چوو بۆ لای عەلی و زەید (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، ئەوانیش وتیان ئەوە بۆ تۆ نابێت (واتە: گشتی هەقی تۆ نیە)، بەڵکو تۆ تەنها وەک یەکێک لە براکانی (کەواتە لەسەر بۆچونی زەید باپیر وەک برا سێیەک دەبات و لەسەر بۆچونی عەلیش شەش یەک دەبات).

٢٩٦٧ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: كَانَ عُمَرُ ﷺ، يُقَاسِمُ بِالْجَدِّ مَعَ الأَخِ وَالأَخَوَيْنِ فَإِذَا زَادُوا، أَعْطَاهُ الثُّلُثَ، وَكَانَ يُعْطِيهِ مَعَ الْوَلَدِ السُّدُسَ».(٥)

---

(١) ـ صحيح .

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده حسن .

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف جدا .

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ باپیری بەشداری پێ دەکرد لەگەڵ میرات و پشکی برایەک و دوان، جا ئەگەر براکان زیاتر بووان ئەوە سێیەکی دەدا بە باپیر، وە شەش یەکیشی پێ دەدا ئەگەر مەسئەلەکە منداڵی لەگەڵ بووایە.

٢٩٦٨ - «عَنِ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ لَمَّا طُعِنَ، اسْتَشَارَهُمْ فِي الْجَدِّ، فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ رَأَيْتُ فِي الْجَدِّ رَأْيًا، فَإِنْ رَأَيْتُمْ أَنْ تَتَّبِعُوهُ فَاتَّبِعُوهُ» فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: إِنْ نَتَّبِعْ رَأْيَكَ فَإِنَّهُ رَشَدٌ، وَإِنْ نَتَّبِعْ رَأْيَ الشَّيْخِ، فَلَنِعْمَ ذُو الرَّأْيِ كَانَ».(١)

واتە: لە مەڕوانی کوڕی حەکەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پێکرا و (بە خەنجەر لێیدرا) ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد و وتی: من دەربارەی باپیر بۆچونێکم هەبووە، جا ئەگەر پێتان باشە شوێنی بکەون ئەوە شوێنی بکەون، جا عوسمان پێی وت: ئەگەر شوێنی بۆچونی تۆ بکەوین ئەوە ژیری و ڕاستیە، وە ئەگەر شوێن بۆچونی شێخ بکەوین (واتە: بۆچونی ئەبوبەکر) ئەوە بەڕاستی چاکترین کەسی خاوەن بۆچوون بوو.

## بابەت: قسە و بۆچونی عەلی دەربارەی باپیر

٢٩٦٩ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: كَتَبَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، إِلَى عَلِيٍّ ﷺ وَابْنُ عَبَّاسٍ بِالْبَصْرَةِ: إِنِّي أُتِيتُ بِجَدٍّ، وَسِتَّةِ إِخْوَةٍ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَلِيٌّ: أَنْ أَعْطِ الْجَدَّ سُدُسًا، وَلاَ تُعْطِهِ أَحَدًا بَعْدَهُ».(٢)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) لە کاتێکدا لە بەصرە بوو بۆ عەلی ﷺ نوسی: من بابەتی میراتی باپیر و شەش برام هاتۆتە لا (چی بکەم)؟ عەلیش بۆی نوسی: شەش یەک بدە بە باپیر و مەیدە بە کەسی تر لە دوای باپیر (واتە: تەنها لەو مەسئەلە یەک لەسەر شەش دەبا، لە مەسئەلەی تر پشکی دەگۆڕێ).

٢٩٧٠ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي سِتَّةِ إِخْوَةٍ وَجَدٍّ، قَالَ: أَعْطِ الْجَدَّ السُّدُسَ قَالَ أَبُو مُحَمَّد: كَأَنَّهُ يَعْنِي: عَلِيًّا ﷺ، الشَّعْبِيُّ يَرْوِيهِ عَنْ عَلِيٍّ ﷺ».(٣)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی مەسئەلەی میراتی شەش برا و باپیر وتویەتی: شەش یەک بدە بە باپیر.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: وەک بڵێی مەبەستی عەلییە، شەعبی لە عەلیەوە گێڕاویەتیەوە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف .

(٢) ـ إسناده حسن .

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي .

٢٩٧١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَمَةَ، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ كَانَ يَجْعَلُ الْجَدَّ أَخًا، مَتَى يَكُونَ سَادِسًا».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیمامی عەلی ﷺ باپیری دەکرد بە برا (واتە: بەشداری پێ دەکرد لە پشکی برا) تاوەکو دەبوو بە شەشەم کەس (لەو کاتەی پێنج برا هەبن لە مەسئەلەکەدا).

٢٩٧٢ - «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ كَانَ يُشَرِّكُ الْجَدَّ مَعَ الإِخْوَةِ إِلَى السُّدُسِ».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ بەشداری بە باپیر دەکرد لەگەڵ براکاندا بە شەش یەک.

٢٩٧٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَمَةَ، قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ ﷺ، يُشَرِّكُ بَيْنَ الْجَدِّ وَالإِخْوَةِ حَتَّى يَكُونَ سَادِسًا».[٣]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ باپیری بەشداری پێ دەکرد لەگەڵ براکان تاوەکو دەبوو بە شەشەم.

٢٩٧٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ ﷺ، يُشَرِّكُ الْجَدَّ إِلَى سِتَّةٍ مَعَ الإِخْوَةِ، يُعْطِي كُلَّ صَاحِبِ فَرِيضَةٍ فَرِيضَتَهُ، وَلاَ يُوَرِّثُ أَخًا لأُمٍّ مَعَ جَدٍّ، وَلاَ أُخْتًا لأُمٍّ، وَلاَ يَزِيدُ الْجَدَّ مَعَ الْوَلَدِ عَلَى السُّدُسِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ غَيْرُهُ، وَلاَ يُقَاسِمُ بِأَخٍ لأَبٍ، مَعَ أَخٍ لأَبٍ وَأُمٍّ، وَإِذَا كَانَتْ أُخْتٌ لأَبٍ وَأُمٍّ، وَأَخٌ لأَبٍ، أَعْطَى الأُخْتَ النِّصْفَ، وَالنِّصْفَ الآخَرَ بَيْنَ الْجَدِّ وَالأَخِ نِصْفَيْنِ، وَإِذَا كَانُوا إِخْوَةً وَأَخَوَاتٍ شَرَّكَهُمْ مَعَ الْجَدِّ إِلَى السُّدُسِ».[٤]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ بەشداری بە باپیر دەکرد تاوەکو دەبوو بە شەشەمیان لەگەڵ براکان، پشکی دیاریکراوی هەر خاوەن میراتێکی دەدا، وە هیچ برایەکی تەنها لە دایک و هیچ خوشکێکی تەنها لە دایکی نەدەکرد بە میراتگر لەگەڵ باپیردا، وە لە شەش یەک زیاتری نەدەدا بە باپیر لەگەل منداڵدا (واتە: لەو حاڵەتەی منداڵ ـ واتە: کوڕ یان کچی مردووەکە ـ لە مەسەلەکەدا هەبوبێت)، ئیللا ئەگەر جگە لە منداڵ هەبوبێت (واتە: منداڵی تیا نەبوبێت و جگە لە منداڵی تیا بوبێت ئنجا زیاتری لە شەش یەکی پێداوە)، وە موقاسەمەی بە برای لە باوک نەدەکرد لەگەڵ برای لە دایک و باوک، وە ئەگەر خوشکی لە دایک و باوک و برای لە باوک هەبووبا، ئەوە نیوەی دەدا بە خوشک و، نیوەکەیتریشی لە نێوان باپیر و تاقە برایەک دەکرد بە دوو بەش، وە ئەگەر چەندین برا و خوشک بوان ئەوە بەژداری پێ دەکردن لەگەڵ باپیر بە شەش یەک.

---

(١) ـ إسناده حسن .

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٣) ـ إسناده حسن .

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: قسە و بۆچونی ئیبنو عەبباس دەربارەی باپیر

٢٩٧٥ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَعْقِلٍ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ الْجَدِّ؟ فَقَالَ: أَيُّ أَبٍ لَكَ أَكْبَرُ؟ فَقُلْتُ أَنَا: آدَمُ. قَالَ: أَلَمْ تَسْمَعْ إِلَى قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾».(١)

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەعقیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) پرسیاری لێکرا دەربارەی باپیر؟ ئەویش وتی: کام باوکی تۆ گەورەترە؟ عەبدوڕڕەحمانیش دەڵێ (من لە جیاتی کابرا وەڵامم دایەوە) و وتم: ئادەم، ئیبنو عەبباس وتی: ئایا گوێت لە وتەی خوای بەرز نەبووە (کە دەفەرموێت): ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، واتە: (ئەی نەوەی ئادەم).

٢٩٧٦- «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَوَدِدْتُ أَنِّي وَالَّذِينَ يُخَالِفُونَنِي فِي الْجَدِّ تَلاَعَنَّا أَيُّنَا أَسْوَأُ قَوْلاً».(٢)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەزم دەکرد من و ئەوانەی بۆچوونیان پێچەوانەی منە مولاعەنەمان بکردایە دەربارەی باپیر لەسەر ئەوەی قسەی کامەمان خراپ و ناڕاستە.

٢٩٧٧ - «حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا «أَنَّهُ جَعَلَ الْجَدَّ أَبًا».(٣)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە کە باپیری بە باوک داناوە.

## بابەت: قسە و بۆچونی ئیبنو مەسعود دەربارەی باپیر

٢٩٧٨ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى شُرَيْحٍ، وَعِنْدَهُ عَامِرٌ، وَإِبْرَاهِيمُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ ﷺ فِي فَرِيضَةِ امْرَأَةٍ مِنَّا: الْعَالِيَةِ، تَرَكَتْ زَوْجَهَا، وَأُمَّهَا، وَأَخَاهَا لأَبِيهَا، وَجَدَّهَا. فَقَالَ لِي: هَلْ مِنْ أُخْتٍ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: لِلْبَعْلِ الشَّطْرُ، وَلِلأُمِّ الثُّلُثُ. قَالَ: فَجَهِدْتُ عَلَى أَنْ يُجِيبَنِي، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلاَّ بِذَلِكَ. فَقَالَ إِبْرَاهِيمُ، وَعَامِرٌ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ: مَا جَاءَ أَحَدٌ بِفَرِيضَةٍ أَعْضَلَ مِنْ فَرِيضَةٍ جِئْتَ بِهَا. قَالَ: فَأَتَيْتُ عَبِيدَةَ السَّلْمَانِيَّ - وَكَانَ يُقَالُ: لَيْسَ بِالْكُوفَةِ أَحَدٌ أَعْلَمَ بِفَرِيضَةٍ مِنْ عَبِيدَةَ وَالْحَارِثِ الأَعْوَرِ. وَكَانَ عَبِيدَةُ يَجْلِسُ فِي الْمَسْجِدِ، فَإِذَا وَرَدَتْ عَلَى شُرَيْحٍ فَرِيضَةٌ فِيهَا جَدٌّ، رَفَعَهُمْ إِلَى عَبِيدَةَ، فَفَرَضَ - فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: إِنْ شِئْتُمْ نَبَّأْتُكُمْ بِفَرِيضَةِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، فِي هَذَا: جَعَلَ لِلزَّوْجِ ثَلاَثَةَ أَسْهُمٍ النِّصْفَ، وَلِلأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ، السُّدُسُ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ، وَلِلأَخِ سَهْمٌ، وَلِلْجَدِّ سَهْمٌ، قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: الْجَدُّ أَبُو الأَبِ».(٤)

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه .

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ لای شورەیح، عامیر و، ئیبراهیم، عەبدورڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵاشی ﷺ لەلا بوو (چوم بۆ لای بۆ مەسئەلەی) میراتی ئافرەتێکی پایە بەرزی ئێمە کە: مێردی و، دایکی و، برای لە باوکی و، باپیری دوای خۆی جێهێشتبوو، جا شورەیح پێی وتم: ئایا خوشک هەیە؟ وتم: نەخێر، وتی: نیوە بۆ مێردە و، سێیەکیش بۆ دایکە، دەڵێ: جا زۆر هەوڵمدا وەڵامم بداتەوە (دەربارەی باپیر) بەڵام وەڵامی نەدامەوە تەنها بەوە نەبێت کە پێشتر وتی (واتە: هەر وتی: نیوە بۆ مێردە و، سێیەکیش بۆ دایکە، نەپرژایە سەر میراتی باپیر)، جا ئیبراهیم و عامیر و عەبدورڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا وتیان: کەس میراتی ئەوەندە قورس و ناخۆشی نەهێناوە وەک ئەوەی تۆ هێناوتە، دەڵێ: جا چووم بۆ لای عەبیدەی سەلمانی ـ دەوترا: کەس لە کوفەدا نیە زاناتر بێت بە زانستی میرات لە عەبیدە و حاریثی ئەعوەر، وە عەبیدە لە مزگەوت دادەنیشت، جا کاتێ میراتێک کە باپیری تیابووایە بهاتایە بۆ لای شورەیح ئەوە دەیناردن بۆ لای عەبیدە و بۆی حەل دەکردن ـ جا پرسیارم لێ کرد، ئەویش وتی: ئەگەر حەز دەکەیت هەواڵت پێ دەدەم بە دابەشکردنی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەربارەی ئەو بابەتەی تۆ، عەبدوڵڵا: سێ پشکی دادەنا بۆ مێرد، کە دەکاتە نیوە، سێیەکی ماوەشی دادەنا بۆ دایک، کە دەکاتە شەش یەکی کۆی گشتی ماڵەکە، وە پشکێکیشی دادەنا بۆ برا، وە پشکێکیشی دادەنا بۆ باپیر.

ئەبو ئیسحاق وتویەتی: مەبەست بە باپیر لێرەدا: باوکی باوکە (نەک باوکی دایک).

## بابەت: قسە و بۆچونی زەید دەربارەی باپیر

٢٩٧٩ - «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ زَيْدًا ﷺ، كَانَ يُشَرِّكُ الْجَدَّ مَعَ الإِخْوَةِ إِلَى الثُّلُثِ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: زەید ﷺ بەشداری بە باپیر دەکرد لەگەڵ براکان لە سێیەک.

٢٩٨٠ - عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ «أَنَّهُ كَانَ يُقَاسِمُ بِالْجَدِّ مَعَ الإِخْوَةِ إِلَى الثُّلُثِ ثُمَّ لاَ يُنْقِصُهُ».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێراویەتەوە کە باپیری لەگەڵ براکان بەشداری پێ دەکرد لە سێیەک، دواتریش لێی کەم نەدەکردەوە.

٢٩٨١ - «عَنْ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: قَالَ عَامِرٌ: خُذْ مِنْ أَمْرِ الْجَدِّ مَا اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يَعْنِي: قَوْلَ زَيْدٍ ﷺ».[٣]

---

(١) ـ إسناده صحيح. إلى الحسن .

(٢) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم .

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي .

واتە: لە ئیسماعیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عامیر وتویەتی: ئەوە وەربگرە دەربارەی باپیر کە خەڵک لەسەری کۆکە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: واتە: قسە و بۆچوونی زەید ﷺ وەربگرە.

## بابەت: مەسئەلەی ئەکدەرییە کە بریتیە لە:
## مێرد و، خوشکی لە باوک و دایک و، باپیر و، دایک

٢٩٨٢ - «عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ فِي أُخْتٍ، وَأُمٍّ، وَزَوْجٍ، وَجَدٍّ، قَالَ: جَعَلَهَا مِنْ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ: لِلأُمِّ سِتَّةٌ، وَلِلزَّوْجِ تِسْعَةٌ، وَلِلْجَدِّ ثَمَانِيَةٌ، وَلِلأُخْتِ أَرْبَعَةٌ».(١)

واتە: لە قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زەیدی کوڕی ثابیت ﷺ دەربارەی: خوشک و، دایک و، مێرد و، باپیر، وتویەتی: (ئەصلی مەسئەلەکە) لە بیست و پێنجە: شەش بەشی بۆ دایکە و، نۆ بەشیش بۆ مێردە و، هەشت بەشیش بۆ باپیرە و، چوار بەشیش بۆ خوشکە.

## بابەت: دەربارەی داپیر

٢٩٨٣ - «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جَدَّةٍ أُطْعِمَتْ فِي الإِسْلاَمِ سَهْمًا أُمُّ أَبٍ وَابْنُهَا حَيٌّ».(٢)

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: یەکەم داپیر لە ئیسلامدا پشکی لە میرات پێدرا: دایکی باوکێک بوو لەکاتێکدا کوڕەکەی زیندوو بوو.

٢٩٨٤ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَطْعَمَ جَدَّةً سُدُسًا».(٣)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ شەش یەکی دا بە داپیرەیەک.

٢٩٨٥ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ وَرَّثَ جَدَّةً مَعَ ابْنِهَا».(٤)

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ داپیرەیەک و کوڕەکەی بەیەکەوە کرد بە میراتگر.

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى قتادة.

(٢) ـ ضعيف .

(٣) ـ إسناده ضعيف .

(٤) ـ إسناده ضعيف .

٢٩٨٦ - «أَخْبَرَنِي مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، قَالَ: سَمِعْتُ إِبْرَاهِيمَ ، قَالَ: أَطْعَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَلاَثَ جَدَّاتٍ سُدُسًا. قَالَ: قُلْتُ لإِبْرَاهِيمَ: مَنْ هُنَّهْ؟ قَالَ: جَدَّتَاكَ مِنْ قِبَلِ أَبِيكَ، وَجَدَّتُكَ مِنْ قِبَلِ أُمِّكَ».(١)

واتە: لە مەنصوری کوڕی موعتەمیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبراهیم بوو  وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەک لەسەر شەشی دا بە سێ داپیرە، دەڵێ: بە ئیبراهیمم وت: داپیرەکان کێن (لە کام لان)؟ وتی: دوو داپیرت لەلای باوکت و، داپیرێکت لەلای دایکت.

٢٩٨٧ - «حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: أَنْبَأَنِي الْحَسَنُ، قَالَ: تَرِثُ الْجَدَّةُ وَابْنُهَا حَيٌّ».(٢)

واتە: لە یەزیدی کوڕی ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەسەن پێی ڕاگەیاندم وتی: داپیر میرات دەگرێت لەکاتێکدا کە کوڕەکەی زیندووە (واتە: میرات لە نەوەکەی دەگرێ، با باوکی نەوەکەش زیندووبێ).

٢٩٨٨ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: لاَ تَرِثُ أُمُّ أَبِ الأمِّ، ابْنُهَا الَّذِي تُدْلِي بِهِ لاَ يَرِثُ فَكَيْفَ تَرِثُ هِيَ؟».(٣)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دایکی باوکی دایکی میرات نابات، (چونکە) کوڕەکەی کە ئەو بەهۆیەوە نزیک دەبێتەوە میرات ناگرێت ئەی چۆن ئەو میرات دەگرێت؟

٢٩٨٩ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ، قَالَ: تَرِثُ الْجَدَّةُ وَابْنُهَا حَيٌّ»(٤).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داپیر میرات دەگرێت لەکاتێکدا کوڕەکەی زیندووە.

## بابەت: قسە و بۆچونی ئەبوبەکری صدیق دەربارەی داپیر

٢٩٩٠ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: جَاءَتْ إِلَى أَبِي بَكْرٍ  جَدَّةٌ أُمُّ أَبٍ أَوْ أُمُّ أُمٍّ، فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَ ابْنِي أَوِ ابْنَ ابْنَتِي تُوُفِّيَ، وَبَلَغَنِي أَنَّ لِي نَصِيبًا، فَمَا لِي؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ فِيهَا شَيْئًا، وَسَأَسْأَلُ النَّاسَ. فَلَمَّا صَلَّى الظُّهْرَ، فقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ فِي الْجَدَّةِ شَيْئًا؟ فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: أَنَا. قَالَ: مَاذَا؟ قَالَ: أَعْطَاهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ سُدُسًا، قَالَ: أَيَعْلَمُ ذَاكَ أَحَدٌ غَيْرُكَ؟ فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ: صَدَقَ. فَأَعْطَاهَا أَبُو بَكْرٍ السُّدُسَ، فَجَاءَتْ إِلَى عُمَرَ، مِثْلُهَا فَقَالَ: مَا أَدْرِي، مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيهَا شَيْئًا، وَسَأَسْأَلُ النَّاسَ فَحَدَّثُوهُ بِحَدِيثِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ وَمُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ. فَقَالَ عُمَرُ: أَيُّكُمَا خَلَتْ بِهِ، فَلَهَا السُّدُسُ، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فَهُوَ بَيْنَكُمَا».(٥)

---

(١) ـ إسناده معضل .

(٢) ـ موقوف بسند صحيح على الحسن .

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٤) ـ موقوف بسند صحيح على عمران.

(٥) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن .




واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داپیرەیەک هات بۆ لای ئەبوبەکر ﷺ، دایکی باوک یان دایکی دایک بوو وتی: کوڕی کوڕم یان کوڕی کچم وەفاتی کردوە، منیش پێم گەیشتووە کە پشکم هەیە لە میراتەکەی؟ ئەبوبەکریش وتی: من هیچم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەبیستووە دەربارەی ئەوە، جا پرسیار لە خەڵک دەکەم (ڕاوێژ بە هاوەڵان دەکەم)، جا کاتێ نوێژی نیوەڕۆی کرد وتی: کێتان گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە شتێکی دەربارەی داپیر فەرموبێت؟ موغیرەی کوڕی شوعبە وتی: من گوێم لێ بووە، ئەبوبەکر وتی: چی؟ موغیرە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەش یەکی پێدا، ئەبوبەکر وتی: ئایا کەسێکیتر جگە لە تۆ ئەوە دەزانێت؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە وتی: ڕاست دەکات (واتە: منیش ئەوە دەزانم)، جا ئەبوبەکر شەش یەکی پێدا، جا داپیرەیەکی تر چوو بۆ لای عومەر و (پرسیاری لێ کرد) عومەریش وتی: نازانم، هیچم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێ لێ نەبووە و پرسیار لە خەڵک دەکەم، جا فەرموودەی مەغیرەی کوڕی شوعبە و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیان بۆ گێڕایەوە، عومەر وتی: هەر یەکێکتان بە تەنها بوبێت (واتە: ئەگەر یەکێکیشتان بە تەنها بیگێرابایەوە ئەوە هەر قبوڵم دەکرد) هەر یەک لە داپیرەکان ئەگەر بە تەنها بێت ئەوە شەش یەکی بۆ هەیە، ئەگەر کۆشببنەوە (لە داپیرەیەک زیاتر بن) ئەوە شەش یەکتان بۆ هەیە لە نێوانتان دابەش دەکرێت.

## بابەت: قسە و بۆچونی عەلی و زەید دەربارەی داپیرە

٢٩٩١ - «عَنْ عَلِيٍّ، وَزَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: إِذَا كَانَتِ الْجَدَّاتُ سَوَاءً، وَرِثَ ثَلاَثُ جَدَّاتٍ، جَدَّتَا أَبِيهِ أُمُّ أُمِّهِ وَأُمُّ أَبِيهِ، وَجَدَّةُ أُمِّهِ، فَإِنْ كَانَتْ إِحْدَاهُنَّ أَقْرَبَ، فَالسَّهْمُ لِذَوِي الْقُرْبَى».[١]

واتە: لە عەلی و زەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەگەر داپیرەکان وەکو یەکتری بوون (لە نزیکی)، ئەوە سێ داپیرە میرات دەگرن، دوو داپیری باوکی: دایکی دایکی و، دایکی باوکی، وە داپیرێکی دایکی، وە ئەگەر هاتوو یەکێکیان نزیکتر بوو، ئەوە پشکەکە بۆ نزیکترەکەیە.

٢٩٩٢ - «عَنْ عَلِيٍّ، وَزَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُمَا كَانَا لاَ يُوَرِّثَانِ الْجَدَّةَ أُمَّ الأَبِ مَعَ الأَبِ».[٢]

واتە: لە عەلی و زەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، کە هەردووکیان میراتیان نەداوە بە دایکی باوک لە حاڵەتی هەبوونی باوک.

٢٩٩٣ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ عُثْمَانَ ﷺ كَانَ لاَ يُوَرِّثُ الْجَدَّةَ وَابْنُهَا حَيٌّ».[٣]

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوسمان ﷺ داپیری نەکردۆتە میراتگر لە کاتێکدا کوڕەکەی زیندوو بوبێت.

---

(١) ـ إسناده ضعيف .

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الزهري .

## بابەت: قسە و بۆچونی ئیبنو مەسعود دەربارەی داپیر

٢٩٩٤ - «عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: إِنَّ الْجَدَّاتِ لَيْسَ لَهُنَّ مِيرَاثٌ إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أُطْعِمْنَهَا، وَالْجَدَّاتُ أَقْرَبُهُنَّ وَأَبْعَدُهُنَّ سَوَاءٌ».[١]

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داپیر میراتیان بۆ نیە، بەڵکو تەنها بژێوێکە پێیان دراوە، داپیرەکان دوور و نزیکیان وەکو یەکن.

٢٩٩٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: تَرِثُ الْجَدَّةُ وَابْنُهَا حَيٌّ».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: داپیر میرات دەگرێت لەکاتێکدا کوڕەکەی زیندووە.

## بابەت: قسە و بۆچونی مەسرِوق دەربارەی داپیر

٢٩٩٦ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ قَالَ: جِئْنَ أَرْبَعُ جَدَّاتٍ يَتَسَاوَقْنَ إِلَى مَسْرُوقٍ، فَأَلْغَى أُمَّ أَبِي الأُمِّ، وَوَرَّثَ ثَلاَثًا: جَدَّتَيْ أَبِيهِ: أُمَّ أُمِّهِ، وَأُمَّ أَبِيهِ، وَجَدَّةَ أُمِّهِ».[٣]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چوار داپیرە پاڵیان بەیەکەوە دەنا هاتن بۆ لای مەسرِوق، مەسرِوقیش دایکی باوکی دایکی ڕەت کردەوە و (میراتی بەو نەدا)، وە میراتی دا بە سێیەکانی تر: دوو داپیرەی باوکی: دایکی دایکی و، دایکی باوکی و، داپیرەی دایکیشی.

## بابەت: قسە و بۆچونی عەلی و عەبدوڵلا و زەید (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەربارەی ڕەد (واتە: ساغکردنەوە و ڕەدکردنەوەی بەشە میراتە زێدەکە بۆ سەر میراتگران)

٢٩٩٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، فِي ابْنَةٍ، وَابْنَةِ ابْنٍ، قَالَ: النِّصْفُ وَالسُّدُسُ، وَمَا بَقِيَ فَرَدٌّ عَلَى الْبِنْتِ».[٤]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی کچ و کچی کوڕ وتویەتی: نیوە (بۆ کچەکەیە) و، شەش یەکیش (بۆ کچی کوڕە)، ئەوەی دەشمێنێتەوە دەگەڕێندرێتەوە و دەدرێت بە کچ.

تێبینی: ئەصڵی ئەم مەسەلەیە لەسەر شەشە، بەڵام بە ڕەد دەیبەینەوە سەر چوار و، بەم شێوەیە دابەش دەکرێت لەسەر مەزهەبی عەبدوڵلا: نیوە بۆ کچە وەک هەقی ئەصلی، دواتر بەهۆی ڕەد پشکەکەی

---

(١) ـ إسناده ضعيف منقطع .

(٢) ـ إسناده ضعيف .

(٣) ـ إسناده ضعيف .

(٤) ـ إسناده ضعيف،لكن الحديث صحيح .

زیاد دەکات و دەبێتە سێ لەسەر چوار، یەک لەسەر شەشیش بۆ کچی کوڕە بە هەقی ئەصلی، دواتر بە هۆی ڕەد پشکەکەی زیاد دەکات و دەبێتە یەک لەسەر چوار.

٢٩٩٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ: أَنَّهُ أُتِيَ فِي إِخْوَةٍ لأُمٍّ، وَأُمٍّ، فَأَعْطَى الإِخْوَةَ مِنَ الأمِّ الثُّلُثَ، وَالأمَّ سَائِرَ الْمَالِ. وَقَالَ: الأُمُّ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ».(١)

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە هاتوونەتە لای بۆ مەسەلەی میراتی: دایک و، چەند برایەکی لە دایک و، ئەویش سێیەکی داوە بە برای لە دایک و، گشت ماڵەکەی تریشی داوە بە دایک و وتویەتی: دایک عەصەبەی ئەو کەسەیە کە عەصەبەی نیە.

٢٩٩٩ - «عَنْ حَسَن عَنْ أبيهِ، قَالَ سَأَلْتُ الشعبي عَنْ رَجُلٍ مَاتَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ، لاَ يُعْلَمُ وَارِثٌ غَيْرُهَا، قَالَ: لَهَا الْمَالُ كُلُّهُ».(٢)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پرسیارم لە شەعبی کرد دەربارەی پیاوێک کە مردووە و کچەکەی خۆی دوای خۆی جێهێشتووە، هیچ میراتگرێکی تری نازانرێت هەبێت جگە لەو، (شەعبی) وتویەتی: گشت ماڵەکە بۆ ئەوە.

٣٠٠٠ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ كَانَ لاَ يَرُدُّ عَلَى أَخٍ لأُمٍّ، مَعَ أُمٍّ، وَلاَ عَلَى جَدَّةٍ إِذَا كَانَ مَعَهَا غَيْرُهَا مِمَّنْ لَهُ فَرِيضَةٌ، وَلاَ عَلَى ابْنَةِ ابْنٍ، مَعَ ابْنَةِ الصُّلْبِ، وَلاَ عَلَى امْرَأَةٍ وَزَوْجٍ وَكَانَ عَلِيٌّ، يَرُدُّ عَلَى كُلِّ ذِي سَهْمٍ إِلاَّ الْمَرْأَةَ وَالزَّوْجَ ».(٣)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو مەسعود ﷺ میراتی زێدەی ڕەد نەدەکردەوە بۆ سەر برای لە دایک کە لەگەڵ دایک بێت، وە ڕەدی نەدەکردەوە بۆ سەر داپیر کاتێ یەکێکی تری لەگەڵ بووایە کە خاوەن پشک بێت، وە ڕەدی نەدەکردەوە بۆ سەر کچی کوڕ کە لەگەڵ کچی پشتێ بووایە، وە ڕەدیشی نەدەکردەوە بۆ سەر ژن و مێرد، عەلیش میراتی ڕەد دەکردەوە بۆ سەر هەموو خاوەن پشکێک جگە لە ژن و مێرد.

٣٠٠١ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: أَنَّهُ أُتِيَ فِي ابْنَةٍ، أَوْ أُخْتٍ، فَأَعْطَاهَا النِّصْفَ، وَجَعَلَ مَا بَقِيَ فِي بَيْتِ الْمَالِ وقَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ: عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَالِمٍ، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ خَارِجَةَ».(٤)

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە هاتونەتە لای دەربارەی میراتی کچێک یان خوشکێک، ئەویش نیوەی پێدا، ئەوەی کە مایەوەش لە خەزێنەی گشتی مسوڵمانانی دانا (واتە: بۆ میراتگرەکەی ڕەد نەکردەوە).

---

(١) ـ موقوف بسند صحيح على عبدالله .

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي .

(٣) ـ إسناده ضعيف .

(٤) ـ إسناده ضعيف .

## بابەت: دەربارەی میراتی منداڵی ئەو ئافرەتەی مولاعەنەی کردوە

٣٠٠٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ فِي ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ قَالَ: مِيرَاثُهُ لأُمِّهِ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی میراتی منداڵی ئەو ئافرەتەی بە مولاعەنەکردن جیابۆتەوە وتویەتی: میراتەکەی بۆ دایکیەتی.

٣٠٠٣ - «حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً سَأَلَ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ وَلَدِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ لِمَنْ مِيرَاثُهُ؟ قَالَ: لأُمِّهِ وَأَهْلِهَا».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمی کوڕی تەهمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پیاوێک بوو پرسیاری لە عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباح کرد دەربارەی منداڵی ئەو ژن و مێردەی مولاعەنەیان کردوە کە ئایا میراتەکەی بۆ کێیە (بۆ دایکیەتی یان باوکی)؟ وتی: بۆ دایکی و خزم و کەسی دایکیەتی.

٣٠٠٤ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ، فِي ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ: تَرَكَ أَخَاهُ لأُمِّهِ، وَأُمَّهُ، لأَخِيهِ السُّدُسُ، وَلأُمِّهِ الثُّلُثُ، ثُمَّ يُرَدُّ عَلَيْهِمَا فَيَصِيرُ لِلأَخِ الثُّلُثُ، وَلِلأُمِّ الثُّلُثَانِ وقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: لأَخِيهِ السُّدُسُ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُمِّ».[٣]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ دەربارەی میراتی کوڕێکی ئافرەتێکی مولاعەنەکار کە: برایەکی لە دایکی و، دایکی، دوای خۆی جێهێشتووە وتویەتی: شەش یەک بۆ براکەیەتی، سێیەکیش بۆ دایکیەتی، دواتر ڕەد دەکرێتەوە سەر هەردووکیان و هی براکە دەبێتە سێیەک و هی دایکیش دەبێتە دوو لەسەر سێ، ئیبنو مەسعودیش وتویەتی: شەش یەک بۆ براکەیەتی و، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ دایکە.

٣٠٠٥ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ تَرَكَ ابْنَ أَخٍ وَجَدًّا، قَالَ: الْمَالُ لاِبْنِ الأَخِ».[٤]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی میراتی کوڕی ئافرەتێکی مولاعەنە کە: کوڕە برایەک و باپیری دوای خۆی جێهێشتبوو، وتویەتی: ماڵەکە گشتی بۆ کوڕە برایە.

٣٠٠٦ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، فِي مِيرَاثِ ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ: لأُمِّهِ الثُّلُثُ، وَالثُّلُثَانِ لِبَيْتِ الْمَالِ».[٥]

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه .

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف .

(٤) ـ إسناده ضعيف .

(٥) ـ إسناده حسن .

واتە: لە زەیدی كوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی میراتی كوڕی ئافرەتێكی مولاعەنە وتویەتی: سێیەک بۆ دایكیەتی و، دوو لەسەر سێش بۆ بەیتول مال و خەزێنەی گشتی مسوڵمانانە.

٣٠٠٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مِيرَاثُهُ لأُمِّهِ تَعْقِلُ عَنْهُ عَصَبَةُ أُمِّهِ وقَالَ قَتَادَةُ: عَنْ الْحَسَنِ: لأُمِّهِ الثُّلُثُ، وَبَقِيَّةُ الْمَالِ لِعَصَبَةِ أُمِّهِ».[١]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: میراتەكەی بۆ دایكیەتی، خزمەكانی دایكیشی تۆڵەی خوێنی بۆ دەدەن (كاتێ خوێنی دەكەوێتە سەر)، قەتادەش لە حەسەنەوە گێڕاویەتەوە وتویەتی: سێیەک بۆ دایكیەتی و، ئەوەی دەمێنێتەوەش لە ماڵەكە بۆ خزمەكانی دایكیەتی.

٣٠٠٨ - «حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، أَخْبَرَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ عَلِيًّا، وَابْنَ مَسْعُودٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ فِي وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ تَرَكَ جَدَّتَهُ وَإِخوَتَهُ لأُمِّهِ قَالَ: لِلْجَدَّةِ الثُّلُثُ، وَلِلإِخوَةِ الثُّلُثَانِ وقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: لِلْجَدَّةِ السُّدُسُ، وَلِلإِخوَةِ لِلأُمِّ الثُّلُثُ، وَمَا بَقِيَ فَلِبَيْتِ الْمَالِ».[٢]

واتە: لە حەممادی كوڕی سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قەتادە هەواڵی پێداوین كە عەلی و ئیبنو مەسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەربارەی میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنە كە: داپیر و، چەند برایەكی لە دایكی دوای خۆی جێهێشتووە، وتویانە: سێیەک بۆ داپیرە و، دوو لەسەر سێش بۆ براكانە، زەیدی كوڕی ثابیتیش وتویەتی: شەش یەک بۆ داپیرە و، یەک لەسەر سێش بۆ براكانی لە دایكە، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ خەزێنەی گشتی مسوڵمانان.

٣٠٠٩ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: تَرِثُهُ أُمُّهُ يَعْنِي: ابْنَ الْمُلاَعَنَةِ».[٣]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دایكی میراتی لێ دەگرێت، واتە: لە كوڕی ئافرەتی مولاعەنە.

٣٠١٠ - «حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، أَنَّ النَّخَعِيَّ، وَالشَّعْبِيَّ، قَالاَ: تَرِثُهُ أُمُّهُ»[٤].

واتە: لە حەجاجەوە گێڕدراوەتەوە كە نەخەعی و شەعبی وتویانە: دایكی میراتەكەی دەگرێت.

٣٠١١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ ﷺ، قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى أَخٍ لِي، مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ أَسْأَلُهُ: لِمَنْ قَضَى النَّبِيُّ ﷺ فِي ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ؟ فَكَتَبَ إِلَيَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِهِ لأُمِّهِ هِيَ بِمَنْزِلَةِ أُمِّهِ وَأَبِيهِ وقَالَ سُفْيَانُ: الْمَالُ كُلُّهُ لِلأُمِّ، هِيَ بِمَنْزِلَةِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ»[٥].

---

(١) ـ إسناده منقطع .

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه .

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بۆ برایەکی خۆم نوسی لە بەنی زوڕەیق و پرسیارم لێی کرد و وتم: پێغەمبەر ﷺ حوکمی بۆ کێ داوە دەربارەی میراتی کوڕی ئافرەتی مولاعەنە (ئایا میراتەکەی بۆ کێیە)؟ ئەویش بۆی نوسیم: پێغەمبەر ﷺ حوکمی بۆ دایکی دا، (چونکە) ئەو لە شوێنی دایک و باوکیەتی (جێگای باوکیشی بۆ گرتۆتەوە)، سوفیانیش وتویەتی: ماڵەکە گشتی بۆ دایکە، دایکەکە لە پلەی دایکی و باوکیەتی.

٣٠١٢ - «عَنْ الْحَسَنِ، فِي ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ تَرَكَ أُمَّهُ وَعَصَبَةَ أُمِّهِ. قَالَ: الثُّلُثُ لأُمِّهِ، وَمَا بَقِيَ فَلِعَصَبَةِ أُمِّهِ»[١].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی کوڕی ئافرەتی مولاعەنە کە دایکی و عەصەبەی دایکی دوای خۆی جێهێشتبێت، وتویەتی: یەک لەسەر سێ بۆ دایکیەتی، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ عەصەبەکانی دایکیەتی.

٣٠١٣ - «عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، فِي ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ قَالاَ: عَصَبَتُهُ عَصَبَةُ أُمِّهِ»[٢].

واتە: لە عەلی و عەبدوڵڵا (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە دەربارەی میراتی کوڕی ئافرەتی مولاعەنە وتویانە: (میراتەکەی بۆ) عەصەبەکەیەتی، عەصەبەی دایکی.

٣٠١٤ - «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مِيرَاثُ وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ لأُمِّهِ. قُلْتُ: فَإِنْ كَانَ لَهُ أَخٌ مِنْ أُمِّهِ؟ قَالَ: لَهُ السُّدُسُ»[٣].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنە بۆ دایکیەتی، (یونس دەڵێت) وتم: ئەی ئەگەر برایەکی لە دایکی هەبوو؟ وتی: (برایەکە) شەش یەکی بۆ هەیە.

٣٠١٥ - «حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، قَالَ: وَلَدُ الْمُلاَعَنَةِ لأُمِّهِ، تَرِثُ فَرِيضَتَهَا مِنْهُ، وَسَائِرُ ذَلِكَ فِي بَيْتِ الْمَالِ»[٤].

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (میراتی) منداڵی ئافرەتی مولاعەنە بۆ دایکیەتی، ئەوەندەی فەرز و پشکی خۆیەتی وەریدەگرێت، ئەوەی تریش کە دەمێنێتەوە بۆ خەزێنەی گشتی مسوڵمانانە (بيت المال).

٣٠١٦ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِذَا تَلاَعَنَا، فُرِّقَ بَيْنَهُمَا وَلَمْ يَجْتَمِعَا، وَدُعِيَ الْوَلَدُ لأُمِّهِ. يُقَالُ: ابْنُ فُلاَنَةَ، هِيَ عَصَبَتُهُ يَرِثُهَا وَتَرِثُهُ، وَمَنْ دَعَاهُ لِزِنْيَةٍ، جُلِدَ»[٥].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ژن و مێرد مولاعەنەیان کرد، ئەوە لەیەکتری جیادەکرێنەوە و نابنەوە ژن و مێردی یەکتری، وە منداڵەکە بە ناوی دایکی بانگ

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن إلى الحسن.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الزهري.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

دەكرێت، دەوترێت: كوڕی فڵانە ئافرەتە (یان كچی فڵانە ئافرەتە)، جا دایكی عەصەبەیەتی، منداڵەكە میراتی لێ دەگرێت و ئەویش میرات لە منداڵەكە دەگرێت، وە هەر كەسێک بانگی منداڵەكە بكات بە منداڵی زیناكار ئەوە ئەو كەسە جەڵدی لێ دەدرێت (هەشتا جەڵدی بوختان هەڵبەستن).

٣٠١٧ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي وَلَدِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ: أَنَّهُ تَرِثُهُ عَصَبَةُ أُمِّهِ، وَهُمْ يَعْقِلُونَ عَنْهُ»[١].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی منداڵی ژن و مێردی مولاعەنەكار وتویەتی: عەصەبەكانی دایكی میراتەكەی دەگرن، ئەوانیش خوێنی بۆ دەدەن (ئەگەر منداڵەكە خوێنی كوشتنی كەسێكی بكەوێتە سەر).

٣٠١٨ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، فِي وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ - هُوَ الَّذِي لاَ أَبَ لَهُ: تَرِثُهُ أُمُّهُ، وَإِخْوَتُهُ مِنْ أُمِّهِ، وَعَصَبَةُ أُمِّهِ، فَإِنْ قَذَفَهُ قَاذِفٌ، جُلِدَ قَاذِفُهُ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، دەربارەی میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنە كە باوكی نیە وتویەتی: دایكی و، براكانی لە دایكی و، عەصەبەكانی دایكی، میراتی لێ دەگرن، جا ئەگەر كەسێک بوختانی بەو منداڵە كرد (وتی: هەی كوڕی زیناكار یان كچی زیناكار) ئەوە كەسەكە جەڵدی بوختانی لێ دەدرێت.

٣٠١٩ - «عَنْ مَكْحُولٍ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ مِيرَاثِ وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ لِمَنْ هُوَ؟ قَالَ: جَعَلَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ لأُمِّهِ فِي سَبَبِهِ لِمَا لَقِيَتْ مِنَ الْبَلاَءِ، وَلإِخْوَتِهِ مِنْ أُمِّهِ، وقَالَ مَكْحُولٌ: فَإِنْ مَاتَتِ الأُمُّ، وَتَرَكَتِ ابْنَهَا، ثُمَّ تُوُفِّيَ ابْنُهَا الَّذِي جُعِلَ لَهَا، كَانَ مِيرَاثُهُ لإِخْوَتِهِ مِنْ أُمِّهِ كُلُّهُ، لأَنَّهُ كَانَ لأُمِّهِمْ وَجَدِّهِمْ، وَكَانَ لأَبِيهَا السُّدُسُ مِنَ ابْنِ ابْنَتِهِ، وَلَيْسَ يَرِثُ الْجَدُّ إِلاَّ فِي هَذِهِ الْمَنْزِلَةِ، لأَنَّهُ إِنَّمَا هُوَ أَبُ الأُمِّ، وَإِنَّمَا وَرِثَ الإِخْوَةُ مِنَ الأُمِّ أُمَّهُمْ، وَوَرِثَ الْجَدُّ ابْنَتَهُ لأَنَّهُ جُعِلَ لَهَا، فَالْمَالُ الَّذِي لِلْوَلَدِ لِوَرَثَةِ الأُمِّ وَهُوَ يُحْرِزُهُ الْجَدُّ وَحْدَهُ إِذَا لَمْ يَكُنْ غَيْرُهُ»[٣].

واتە: لە مەكحولەوە گێڕدراوەتەوە كە پرسیاری لێكراوە دەربارەی میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنە كە ئایا بۆ كێیە؟ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ میراتەكەی بۆ دایكی داناوە لەبەر هۆكاری ئەوەی بەڵای توش بووە، وە بۆ براكانیەتی لە دایكی، وە مەكحول وتویەتی: ئەگەر دایكەكە مرد و كوڕەكەی دوای خۆی جێهێشت، دواتر كوڕەكەش مرد كە میراتەكە دەبووە هی ئەو، ئەوە گشت میراتەكەی بۆ براكانیەتی لە دایكی، چونكە میراتەكەیان بۆ داكیان و باپیریانە، جا باوكی ژنەكە (واتە: باپیری منداڵەكە) شەش یەک دەگرێت لە كوڕی كچەكەی، باپیر (لە لای دایكەوە، واتە: باوكی دایک) میرات ناگرێت تەنها لەو پلەیە نەبێت، لەبەر ئەوەی ئەو باوكی دایكە، وە براكانی لە دایک میرات لە دایكیان دەگرن، هەروەها باپیریش میرات لە كچەكەی دەگرێت، چونكە میراتی باپیر بۆ كچەكەیە، كەواتە: ئەو

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى ابن عباس.

(٣) ـ مرسل صحيح.

ماڵەی بۆ منداڵەکەیە بۆ میراتگرانی دایکیەتی (کاتێ خۆی مرد)، باپیریش گشت میراتەکە دەبات ئەگەر کەسی تری لەگەڵ نەبێت.

٣٠٢٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ قَوْمًا اخْتَصَمُوا إِلَى عَلِيٍّ، رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ فِي وَلَدِ الْمُتَلَاعِنَيْنِ، فَجَاءَ عَصَبَةُ أَبِيهِ يَطْلُبون مِيرَاثَهُ. فَقَالَ: إِنَّ أَبَاهُ كَانَ تَبَرَّأَ مِنْهُ، فَلَيْسَ لَكُمْ مِنْ مِيرَاثِهِ شَيْءٌ فَقَضَى بِمِيرَاثِهِ لأُمِّهِ، وَجَعَلَهَا عَصَبَتَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە وتویەتی: خەڵکانێک کێشەیان بردە لای عەلی دەربارەی میراتی منداڵی ژن و مێردی مولاعەنەکار، جا عەصەبەی باوکی هاتبوون داوای میراتەکەیان دەکرد، عەلیش وتی: باوکی تەبەڕای کردوە و خۆی بەری کردوە لێی (بەوەی کاتی خۆی وتویەتی خێزانم زینای کردوە)، کەواتە: ئێوە هیچ میراتێکتان بۆ نیە، جا بڕیاریدا بەوەی میراتەکەی بۆ دایکی بێت، ئەوی کرد بە عەصەبەکەی.

## بابەت: دەربارەی میراتی نێرەموک

٣٠٢١- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، فِي الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ مَا لِلرَّجُلِ وَمَا لِلْمَرْأَةِ مِنْ أَيِّهِمَا يُوَرَّثُ؟ فَقَالَ: مِنْ أَيِّهِمَا بَالَ»[٢].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە (پرسیاری لێکراوە) دەربارەی ئەو کەسەی ئەندامی نێرینە و ئەندامی مێیینەی هەیە (واتە: نێرەموکە) کە ئایا میرات بە کامیان دەگرێت (پشکی پیاو یان پشکی ژنی پێ دەدرێت)؟ ئەویش وتی: بە کامیان (واتە: بە کام ئەندام) میز بکات ئەوی بۆ حیسابە (واتە: ئەگەر بە ئەندامی پیاوەتی سەر ئاوی کرد، ئەوە پشکی پیاوی پێ دەدرێت، ئەگەریش بە ئەندامی ئافرەت، ئەوە پشکی ئافرەت).

٣٠٢٢ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، فِي الْخُنْثَى، قَالَ: يُوَرَّثُ مِنْ قِبَلِ مَبَالِهِ»[٣].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەربارەی نێرەموک وتویەتی: میرات دەگرێت بە پێی ئەندامی میز کردنی.

٣٠٢٣ - «حَدَّثَنَا أَبُو هَانِئٍ، قَالَ: سُئِلَ عَامِرٌ، عَنْ مَوْلُودٍ وُلِدَ وَلَيْسَ بِذَكَرٍ وَلاَ أُنْثَى، لَيْسَ لَهُ مَا لِلذَّكَرِ، وَلَيْسَ لَهُ مَا لِلأُنْثَى، يُخْرِجُ مِنْ سُرَّتِهِ كَهَيْئَةِ الْبَوْلِ وَالْغَائِطِ، سُئِلَ عَنْ مِيرَاثِهِ فَقَالَ: نِصْفُ حَظُّ الذَّكَرِ، وَنِصْفُ حَظُّ الآنْثَى»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٣) ـ سنده ضعيف منقطع.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە ئەبو هانیئەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عامیر پرسیاری لێکرا دەربارەی منداڵێک کە لە دایک بووە نە نێرە و نەمێیە، ئەوەی نیە کە نێر هەیەتی (واتە: نێر نیە)، وە ئەوەشی نیە کە مێ هەیەتی (واتە: مێیەش نیە)، لە ناوکی میز و پیسایی دەردەکات، پرسیار دەربارەی میراتەکەی کرا، عامیریش وتی: نیوەی پشکی نێر دەبات و نیوەی پشکی مێیەش دەبات.

## بابەت: کەلالە

٣٠٢٤ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: سُئِلَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ، عَنِ الْكَلاَلَةِ فَقَالَ: إِنِّي سَأَقُولُ فِيهَا بِرَأْيِي، فَإِنْ كَانَ صَوَابًا فَمِنَ اللهِ، وَإِنْ كَانَ خَطَأً فَمِنِّي وَمِنَ الشَّيْطَانِ: أُرَاهُ مَا خَلاَ الْوَالِدَ وَالْوَلَدَ، فَلَمَّا اسْتُخْلِفَ عُمَرُ، قَالَ: إِنِّي لَأَسْتَحْيِي اللهَ أَنْ أَرُدَّ شَيْئًا قَالَهُ أَبُو بَكْرٍ»[١].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەلالە (کە ئایا بە کێ دەوترێت)، ئەویش وتی: من قسەی تیادا دەکەم بە بۆچون و ئیجتیهادی خۆم، ئەگەر ڕاست بوو ئەوە لە خواوەیە، ئەگەر هەڵەش بوو ئەوە لە من و لە شەیتانەوەیە، (جا وتی): پێم وایە کەلالە ئەو کەسەیە کە باوک و منداڵی نەبێت، جا کە عومەر کرا بە جێنشین و خەلیفە وتی: من شەرم لە خوا دەکەم شتێک ڕەت بکەمەوە کە ئەبوبەکر وتبێتی.

٣٠٢٥ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: مَا أَعْضَلَ بِأَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَيْءٌ مَا أَعْضَلَتْ بِهِمُ الْكَلاَلَةُ»[٢].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: هیچ شتێک ئەوەندە گران نەبوو تەنگی بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەچنی وەک ئەوەی بابەتی کەلالە تەنگی پێ هەڵچنین (بۆیان ڕوون نەدەبوویەوە کە ئایا بە دڵنیایی بە کێ دەوترێت).

٣٠٢٦ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: الْكَلاَلَةُ: مَا خَلاَ الْوَالِدَ وَالْوَلَدَ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەلالە ئەوەیە کە باوک و منداڵی نەبێت.

٣٠٢٧ - «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ ﴿١٢﴾﴾النساء، قَالَ سَعْدٌ: لأُمٍّ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ ﴿١٢﴾ ﴾ النساء، سەعد وتویەتی: لە دایک (واتە: تەفسیری وشەی خوشکی کرد لە ئایەتەکە و وتی: مەبەستی خوشکی لە دایکە).

## بابەت: دەربارەی میراتی (ذوي الأرحام)

٣٠٢٨ - «حَدَّثَنَا أَبُو الأَسْوَدِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ، أَنَّ عَاصِمَ بْنَ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ الأَنْصَارِيَّ، أَخْبَرَهُ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ الْتَمَسَ مَنْ يَرِثُ ابْنَ الدَّحْدَاحَةِ، فَلَمْ يَجِدْ وَارِثًا، فَدَفَعَ مَالَ ابْنِ الدَّحْدَاحَةِ إِلَى أَخْوَالِ ابْنِ الدَّحْدَاحَةِ»[١].

واتە: لە ئەبو ئەسوەدەوە لە موحەممەدی کوڕی عەبدورڕەحمانی کوڕی نەوفلەوە گێڕدراوەتەوە کە عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەی ئەنصاری پێی ڕاگەیاندووە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری کردوە و گەڕاوە بەدوای کەسێک تاوەکو میراتی ئیبنو دەحداحە بگرێت (کاتێ وەفاتی کرد)، جا هیچ میراتگرێکی دەست نەکەوت، بۆیە ماڵەکەی ئیبنو دەحداحەی دا بە خاڵەکانی ئیبنو دەحداحە (کە دەکاتە زەویل ئەرحام، واتە: ئەو خزمایەتیەی بە هۆی سک و ڕەحمەوە).

٣٠٢٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: اللهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ»[٢].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە وتویەتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرپەرشتیاری ئەو کەسەن کە سەرپەرشتیاری نیە، خاڵیش میراتگری ئەو کەسەیە کە میراتگری نیە.

٣٠٣٠ - «عَنْ زِيَادٍ، قَالَ: أُتِيَ عُمَرُ، فِي عَمٍّ لأُمٍّ، وَخَالَةٍ، فَأَعْطَى الْعَمَّ لِلأُمِّ الثُّلُثَيْنِ، وَأَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ»[٣].

واتە: لە زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتوون بۆ لای عومەر دەربارەی مامی لە دایک و دەربارەی خارەت (کە دەکاتە خوشکی دایک)، ئەویش دوو لەسەر سێی دا بە مامی لە دایک و، یەک لەسەر سێشی دا بە خارەت.

٣٠٣١ - «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، أَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ، وَالْعَمَّةَ الثُّلُثَيْنِ»[٤].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ یەک لەسەر سێی داوە بە خارەت و، دوو لەسەر سێشی داوە بە پور.

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده حسن، والشطر الأخير منه صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

٣٠٣٢ - «عَنْ قَيْسِ بْنِ حَبْتَرٍ النَّهْشَلِيِّ، قَالَ: أُتِيَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ فِي خَالَةٍ وَعَمَّةٍ، فَقَامَ شَيْخٌ، فَقَالَ: شَهِدْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، أَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ، وَالْعَمَّةَ الثُّلُثَيْنِ، قَالَ: فَهَمَّ أَنْ يَكْتُبَ بِهِ، ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ زَيْدٌ عَنْ هَذَا»[١].

واتە: لە قەیسی کوڕی حەبتەری نەهشەلیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتوون بۆ لای عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان دەربارەی (میراتی): خارەت و پور، جا شەیخێک هەڵسایەوە و وتی: لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئامادە بووم، یەک لەسەر سێی دا بە خارەت و، دوو لەسەر سێشی دا بە پور، وتی: جا عەبدولمەلیک ویستی بینوسێتەوە، دواتر وتی: زەید لە کوێیە بۆ ئەمە؟

٣٠٣٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ، وَالْعَمَّةُ بِمَنْزِلَةِ الأَبِ، وَبِنْتُ الأَخِ بِمَنْزِلَةِ الأَخِ، وَكُلُّ ذِي رَحِمٍ بِمَنْزِلَةِ رَحِمِهِ الَّتِي يُدْلِي بِهَا إِذَا لَمْ يَكُنْ وَارِثٌ ذُو قَرَابَةٍ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خارەت لە پلەی دایک دایە، پوریش لە پلەی باوک دایە، کچی براش لە پلەی برا دایە، وە هەموو خزمێک لە (ذوي الأرحام) لە پلەی ئەو خزمە دایە کە بە هۆیەوە شۆڕ بۆتەوە کاتێ هیچ میراتگرێکی نزیکی نەبێت.

## بابەت: عەصەبە (میراتگری پشتێ)

٣٠٣٤ - «حَدَّثَنِي الضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ، قَضَى فِي أَهْلِ طَاعُونِ عَمَوَاسَ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا كَانُوا مِنْ قِبَلِ الأَبِ سَوَاءً، فَبَنُو الأُمِّ أَحَقُّ، وَإِذَا كَانَ بَعْضُهُمْ أَقْرَبَ مِنْ بَعْضٍ بِأَبٍ، فَهُمْ أَحَقُّ بِالْمَالِ»[٣].

واتە: لە ضەححاکی کوڕی قەیسەوە گێڕدراوەتەوە کە عومەر ﷺ دادوەری کردوە بۆ ئەهلی تاعونی عەمەواس بەوەی ئەگەر خزمەکان لە ڕووی باوکەوە وەکو یەکتر بن (واتە: نزیکی تیا نەبێت و هەموویان دوور بن)، ئەوە خزمانی دایک لەپێشترن (ئەوان میرات دەگرن)، وە ئەگەر هەندێک لە خزمانی تەڕەفی باوک نزیکتر بوون لە هەندێکی تری تەڕەفی دایک ئەوە ئەوان لەپێشترن بەماڵەکە.

٣٠٣٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ، قَالَ: أُصِيبَ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ يَوْمَ الْيَمَامَةِ، فَبَلَغَ مِيرَاثُهُ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: احْبِسُوهَا عَلَى أُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَ عَلَى آخِرِهَا»[٤].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی شەددادی کوڕی هادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سالمی خزمەتکاری ئەبو حەنیفە لە ڕۆژی یەمامە پێکرا (واتە: لە شەڕی یەمامە کوژرا)، وە میراتەکەی گەیشتە دووسەد درهەم، جا عومەر ﷺ وتی: مەیدە بە دایکی تا لە کۆتاییدا نۆرەی دێت.

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.
(٢) ـ إسناده ضعيف.
(٣) ـ إسناده صحيح.
(٤) ـ إسناده قوي.

٣٠٣٦ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الإِخْوَةُ مِنَ الأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلاَتِ، يَرِثُ الرَّجُلُ أَخَاهُ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ، دُونَ أَخِيهِ لأَبِيهِ»[١].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: برایانی لە دایک میرات لە یەکتری دەگرن نەک عەللات (واتە: نەک ئەوانەی باوکیان یەکە، بەڵام دایکیان جیاوازە)، پیاو میرات لە برای لە باوک و لە دایکی دەگرێت نەک لە برای تەنها لە باوک.

٣٠٣٧ - «عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ، قَالَ: قُلْتُ لإِبْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: أَرَأَيْتَ رَجُلاً تَرَكَ ابْنَ ابْنَتِهِ، أَيَرِثُهُ؟ قَالَ: لاَ»[٢].

واتە: لە نوعمانی کوڕی سالمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئیبنو عومەرم وت (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا): ئەگەر پیاوێک کوڕە کچی دوای خۆی جێ بهێڵێت ئایا میراتی لێ دەگرێت؟ وتی: نەخێر.

٣٠٣٨- «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: الأُمُّ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ، وَالأُخْتُ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ»[٣].

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: دایک عەصەبەی ئەو کەسەیە کە عەصەبەی نیە، خوشکیش عەصەبەی ئەو کەسەیە کە عەصەبەی نیە.

٣٠٣٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ، فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: میرات بگەیەنن و بیدەن بە خاوەن پشکەکان، ئەوەیشی دەمێنێتەوە بۆ نزیکترین نێرینەیە (لە عەصەبەکان، واتە: لە خزمی پشتێ).

## بابەت: دەربارەی میراتی ئەهلی شیرک و ئەهلی ئیسلام

٣٠٤٠ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الأَشْعَثِ، أَنَّ عَمَّةً لَهُ تُوُفِّيَتْ يَهُودِيَّةً بِالْيَمَنِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: يَرِثُهَا أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَيْهَا مِنْ أَهْلِ دِينِهَا»[٥].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەشعەثەوە گێڕدراوەتەوە کاتێ پورەکەی مرد لە یەمەن کە جوولەکە بوو، جا ئەوەی گێڕایەوە بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، ئەویش وتی: نزیکترین کەس لە خاوەن دینەکەی میراتەکەی لێ دەگرێت.

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ موقوف بسند صحيح على ابن عمر.

(٣) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ إسناده حسن.

٣٠٤١ - «عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، قَالَ: مَاتَتْ عَمَّةُ الأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ وَهِيَ يَهُودِيَّةٌ، فَأَتَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: أَهْلُ دِينِهَا يَرِثُونَهَا»(١).

واتە: لە تاریقی كوڕی شیهابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پوری ئەشعەثی كوڕی قەیس مرد لە كاتێكدا كە جوولەكە بوو، جا ئەشعەث هات بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ، ئەویش وتی: خاوەنی دینەكەی ئافرەتەكە میراتەكەی لێ دەگرن.

٣٠٤٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَهْلُ الشِّرْكِ لاَ نَرِثُهُمْ وَلاَ يَرِثُونَا»(٢).

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: ئەهلی شیرك نە میراتیان لێ دەگرین و نە میراتمان لێ دەگرن.

٣٠٤٣ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالُوا: لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ دِينَيْنِ»(٣).

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەكر و عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویانە: خەڵكی دوو ئاین میرات لە یەكتری ناگرن.

٣٠٤٤ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ»(٤).

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵكی دوو ئاین میرات لە یەكتری ناگرن.

٣٠٤٥ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: لاَ نَرِثُ أَهْلَ الْكِتَابِ وَلاَ يَرِثُونَا إِلاَّ أَنْ يَمُوتَ لِلرَّجُلِ عَبْدُهُ أَوْ أَمَتُهُ»(٥).

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: میرات لە ئەهلی كتاب ناگرین و ئەوانیش میرات لە ئێمە ناگرن، تەنها ئەوە نەبێت ئەگەر كەسێك بەندەكەی بمرێت (جا بەندەكە پیاو بێت یان ژن، ئەو كات میراتی لێ دەگرێت).

٣٠٤٦ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ نَرِثُ أَهْلَ الْكِتَابِ وَلاَ يَرِثُونَا إِلاَّ الرَّجُلُ يَرِثُ عَبْدَهُ أَوْ أَمَتَهُ»(٦).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە میرات لە ئەهلی کتاب ناگرین و، ئەوانیش میرات لە ئێمە ناگرن، تەنها ئەوە نەبێت مرۆڤ میراتی بەندەکەی دەگرێت (جا بەندەکە پیاو بێت یان ژن).

٣٠٤٧ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: كَانَ مُعَاوِيَةُ ﷺ، يُوَرِّثُ الْمُسْلِمَ مِنَ الْكَافِرِ، وَلاَ يُوَرِّثُ الْكَافِرَ مِنَ الْمُسْلِمِ، قَالَ: قَالَ مَسْرُوقٌ: وَمَا حَدَثَ فِي الإِسْلاَمِ قَضَاءٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ قِيلَ لأَبِي مُحَمَّدٍ: تَقُولُ بِهَذَا؟، قَالَ: لاَ»[1].

واتە: لە مەسرِوقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موعاویە ﷺ مسوڵمانی دەکرد بە میراتگری کافر، بەڵام کافری نەدەکرد بە میراتگری مسوڵمان، مەسرِوق دەڵێ: لە ئیسلامەتی هیچ حوکم و دادوەرییێک نەکراوە پێم خۆشتر بێت لەوە.

بە ئەبو موحەممەد وترا: لەگەڵ ئەوەیت؟ وتی: نەخێر.

٣٠٤٨ - «عَنْ عَامِرٍ، أَنَّ الْمُعْزِلَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ تُوُفِّيَتْ بِالْيَمَنِ وَهِيَ يَهُودِيَّةٌ فَرَكِبَ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ، وَكَانَتْ عَمَّتَهُ، إِلَى عُمَرَ ﷺ فِي مِيرَاثِهَا، فَقَالَ عُمَرُ: لَيْسَ ذَاكَ لَكَ، يَرِثُهَا أَقْرَبُ النَّاسِ مِنْهَا مِنْ أَهْلِ دِينِهَا، لاَ يَتَوَارَثُ مِلَّتَانِ»[2].

واتە: لە عامیرەوە گێڕدراوەتەوە، کاتێ موعزیلەی کچی حاریث مرد لە یەمەن لە کاتێکدا جوولەکە بوو (لەسەر دینی یەهودی بوو)، جا ئەشعەثی کوڕی قەیس ـ کە ئافرەتەکە دەکاتە پلکی ئەو ـ سواری وڵاغەکەی بوو بۆ لای عومەر چوو دەربارەی میراتەکەی (پرسیاری لێ کرد)، عومەریش ﷺ وتی: بۆ تۆ نیە (چونکە ئەو جوولەکەیە و تۆش مسوڵمانی)، نزیکترین کەس لە خەڵکی دینەکەی میراتەکەی دەگرێت، خەڵکی دوو ئاین میرات لە یەکتری ناگرن.

٣٠٤٩ - «حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ سِيرِينَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: لاَ يَتَوَارَثُ مِلَّتَانِ شَتَّى، وَلاَ يَحْجُبُ مَنْ لاَ يَرِثُ»[3].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی سیرینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: دوو کەسی خاوەن ئاینی جیاواز میرات لە یەکتری ناگرن و، وە حوجبیش ناکات ئەو کەسەی میرات نەگرێت.

٣٠٥٠ - «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ»[4].

---

(١) ـ إسناده صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت و، کافریش میرات لە مسوڵمان ناگرێت.

٣٠٥١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ وَجَبَتِ الْحُقُوقُ لأَهْلِهَا، وَلَمْ يَجْعَلْ لِمَنْ أَسْلَمَ أَوْ أُعْتِقَ قَبْلَ أَنْ يُقْسَمَ الْمِيرَاثُ شَيْئًا»[١].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ کەسێک دەمرێت هەقەکانی دەچەسپێن بۆ خزم و کەسەکانی (واتە: میراتەکە بۆ ئەوان دەبێت)، وە هیچیش لە میرات داناندرێت بۆ ئەو کەسەی کە مسوڵمان دەبێت، یان بەندە ئازاد دەکات بەر لە دابەش کردنی میرات (چونکە ڕەنگە بۆ میراتەکە بوبێتە مسوڵمان تاوەکو بەری بکەوێت).

٣٠٥٢ - «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت و، کافریش میرات لە مسوڵمان ناگرێت.

٣٠٥٣ - «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت و، کافریش میرات لە مسوڵمان ناگرێت.

## بابەت: بەندەی نوسراوپێدراو

٣٠٥٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لَيْسَ لِلْمُكَاتَبِ مِيرَاثٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ شَيْءٌ مِنْ مُكَاتَبَتِهِ»[٤].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەندەی نوسراوپێدراو هیچ میراتێکی بۆ نیە، هەتا شتێک و بەشێک لە پارەی موکاتەبەکەی لەسەر مابێت (واتە: تاوەکو پارەی خۆ کڕینەوەکەی خۆی تەواو نەدات میرات ناگرێت).

٣٠٥٥ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي رَجُلٍ لَهُ بَنُونَ قَدْ أَعْتَقَ مِنْ بَعْضِهِمُ النِّصْفَ، وَمِنْ بَعْضِهِمُ الثُّلُثَ، وَمِنْ بَعْضِ الرُّبُعَ، قَالَ: لاَ يَرِثُونَ حَتَّى يُعْتَقُوا»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٥) ـ إسناده صحيح إلى عطاء.

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە چەندین کوڕی هەنە، لە هەندێکیان نیوەی ئازاد کردوە و، لە هەندێکیانیش سێیەکی ئازاد کردوە و، لە هەندێکیانیش چواریەکی ئازاد کردوە، وتویەتی: میرات ناگرن تاوەکو (بە تەواوی) ئازاد دەکرێن.

٣٠٥٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي رَجُلٍ اشْتَرَى ابْنَهُ فِي مَرَضِهِ قَالَ: إِنْ خَرَجَ مِنَ الثُّلُثِ وَرِثَهُ، وَإِنْ وَقَعَتْ عَلَيْهِ السِّعَايَةُ لَمْ يَرِثْ»[١].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە کوڕی خۆی کڕیوەتەوە لە کاتی نەخۆشیەکەی (واتە: لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگی)، ئیبراهیم وتویەتی: ئەگەر کڕینەوەکە پێک بێت لە سێیەک (واتە: ئەگەر لە سێیەک زیاتر نەبوو)، ئەوە میرات دەگرێت، وە ئەگەر (لە سێیەک زیاتر بوو) و کوڕەکەی خۆ ماندوکردنی کەوتە سەر بۆ هەوڵدان و پەیاکردنی پارە زیادەکە، ئەوە میرات ناگرێت (ئەگەر میراتگرەکان ڕازی نەبوون).

٣٠٥٧ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: حَدُّ الْمُكَاتَبِ حَدُّ الْمَمْلُوكِ حَتَّى يُعْتَقَ»[٢].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سنوری بەندەی نوسراوپێدراو بریتیە لە سنوری بەندەی ئاسایی تاوەکو ئازاد دەکرێت (واتە: حوکمیان وەکو یەکە، هیچیان میرات نابەن تاوەکو بە تەواوی ئازاد نەبن).

## بابەت: وەلاء (خزمایەتی ئازادکردن)

٣٠٥٨ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: الْمَوْلَى أَخٌ فِي الدِّينِ، وَنِعْمَةٌ وَأَحَقُّ النَّاسِ بِمِيرَاثِهِ أَقْرَبُهُمْ مِنَ الْمُعْتِقِ»[٣].

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەندە (خزمەتکار) برای دینیە و، نیعمەتێکە، جا شایستەترینی خەڵکی بە میراتەکەی نزیکترینیانە لە کەسە ئازادکەرەکەی.

٣٠٥٩ - «عَنِ الحَسَنِ وعَنْ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ أَعْتَقَ مَمْلُوكًا ثُمَّ مَاتَ الْمَوْلَى وَالْمَمْلُوكُ وَتَرَكَ الْمُعْتِقُ أَبَاهُ وَابْنَهُ، قَالاَ: الْمَالُ لِلإِبْنِ»[٤].

واتە: لە حەسەن و شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە بەندەیەکی ئازاد کردوە و، دواتر گەورەکە و بەندەکە هەردووکیان مردوون، ئازادکەرەکەش باوک و کوڕی دوای خۆی جێهێشتووە، وتویانە: ماڵەکە بۆ کوڕەکەیە (چونکە ئەو نزیکترە لە ئازادکەرەکە).

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

٣٠٦٠ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، فِي رَجُلٍ تَرَكَ أَبَاهُ وَابْنَ ابْنِهِ، فَقَالَ: الْوَلَاءُ لِابْنِ الِابْنِ»[١].

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە باوکی و کوڕی کوڕی دوای خۆی جێهێشتووە، وتویەتی: وەلائەکە بۆ کوڕی کوڕیەتی.

٣٠٦١ - «عَنْ زِيَادِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، أَنَّ امْرَأَةً أَعْتَقَتْ عَبْدًا لَهَا، ثُمَّ تُوُفِّيَتْ وَتَرَكَتِ ابْنَهَا وَأَخَاهَا، ثُمَّ تُوُفِّيَ مَوْلَاهَا، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ ابْنُ الْمَرْأَةِ وَأَخُوهَا فِي مِيراثه، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مِيرَاثُهُ لِابْنِ الْمَرْأَةِ. فَقَالَ أَخُوهَا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ أَنَّهُ جَرَّ جَرِيرَةً، عَلَى مَنْ كَانَتْ؟ قَالَ: عَلَيْكَ»[٢].

واتە: لە زیادی کوڕی ئەبو مەریەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک بەندەیەکی خۆی ئازادکرد، دواتر ئافرەتەکە مرد و کوڕێکی خۆی و برایەکی خۆی دوای خۆی جێهێشت، دواتر بەندەکەشی مرد، جا کوڕی ئافرەتەکە و براکەی هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ میراتی بەندەکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: میراتەکە بۆ کوڕی ئافرەتەکەیە، جا برای ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بەندەکە تاوانێک بکات تۆڵەکەی دەکەوێتە سەر کێ؟ فەرمووی: دەکەوێتە سەر تۆ.

٣٠٦٢ - «أَخْبَرَنَا مُغِيرَةُ، قَالَ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ رَجُلٍ أَعْتَقَ مَمْلُوكًا لَهُ فَمَاتَ وَمَاتَ الْمَوْلَى، وَتَرَكَ الْمُعْتِقُ أَبَاهُ وَابْنَهُ، فَقَالَ: لِأَبِيهِ كَذَا، وَمَا بَقِيَ فَلِابْنِهِ»[٣].

واتە: لە موغیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبراهیم کرد دەربارەی پیاوێک کە بەندەیەکی خۆی ئازاد کردوە و مردووە، هەروەها بەندەکەش مردووە، جا ئازادکەرەکە باوکی و کوڕی دوای خۆی جێهێشتووە، (ئیبراهیم) وتی: شەش لەسەر یەک بۆ باوکی و، ئەوەی مایەوەش بۆ کوڕەکەیەتی.

٣٠٦٣ - «عَنْ شُعْبَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْحَكَمَ، وَحَمَّادًا يَقُولَانِ: هُوَ لِلِابْنِ»[٤].

واتە: لە شوعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەکەم و حەمماد بوو، دەیانووت: (میراتی بەندەکە دوای مردنی خۆی و ئازادکەرەکە) بۆ کوڕەکەیە (واتە: بۆ کوڕی ئازادکەرەکە).

٣٠٦٤ - «عَنِ الْحَسَنِ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْبَقِيعِ فَرَأَى رَجُلًا يُبَاعُ، فَأَتَاهُ فَسَاوَمَ بِهِ، ثُمَّ تَرَكَهُ، فَرَآهُ رَجُلٌ فَاشْتَرَاهُ، فَأَعْتَقَهُ، ثُمَّ جَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي اشْتَرَيْتُ هَذَا فَأَعْتَقْتُهُ، فَمَا تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ: هُوَ أَخُوكَ وَمَوْلَاكَ. قَالَ: مَا تَرَى فِي صُحْبَتِهِ؟ فَقَالَ: إِنْ شَكَرَكَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ وَشَرٌّ لَكَ، وَإِنْ كَفَرَكَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ وَشَرٌّ لَهُ. قَالَ: مَا تَرَى فِي مَالِهِ؟ قَالَ: إِنْ مَاتَ وَلَمْ يَتْرُكْ عَصَبَةً، فَأَنْتَ وَارِثُهُ»[٥].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ بەقیع و بینی پیاوێک دەفرۆشرێت، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) چوو بۆ لای و معامەلەی کرد (تا بیکڕێت و ئازادی بکات)، دواتر وازی لێهێنا (دیارە نەیتوانیوە بیکڕێت لەبەر نەبوونی)، جا پیاوێک بینی و پیاوەکەی کڕیەوە و ئازادی کرد، دواتر بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من ئەم پیاوەم کڕیوە و ئازادم کردوە، چی دەفەرمووی دەربارەی؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەو براتە و بەندەتە، کابرا وتی: هاوەڵایەتی ئەوت پێ چۆنە؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر هاوڕێیەتیت بکات و هەموو کات سوپاس و شوکرانەت بکات ئەوە چاکە بۆ ئەو و خراپە بۆ تۆ (ڕەنگە تۆ بە هۆی ستاییشەکەی ئەو شانازی بەخۆتەوە بکەیت و پاداشتەکەت بەتاڵ ببێتەوە)، وە ئەگەر کوفرانەی کردی و (چاکەی تۆی لەبەر چاو نەبوو) ئەوە چاکە بۆ تۆ (توشی لەخۆباییت ناکات)، بەڵام خراپە بۆ خۆی (چونکە بێ نمەک و سپڵە دەبێت)، کابرا وتی: چی دەفەرمویت دەربارەی ماڵ و سەروەتەکەی؟ فەرمووی: ئەگەر مرد و هیچ عەصەبەیەکی دوای خۆی جێ نەهێشت ئەوە تۆ میراتگری ئەویت.

٣٠٦٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادٍ، أَنَّ ابْنَةَ حَمْزَةَ أَعْتَقَتْ عَبْدًا لَهَا، فَمَاتَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ، وَمَوْلَاتَهُ بِنْتَ حَمْزَةَ، فَقَسَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِيرَاثَهُ بَيْنَ ابْنَتِهِ وَمَوْلَاتِهِ بِنْتِ حَمْزَةَ نِصْفَيْنِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی شەددادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کچی حەمزە بەندەیەکی خۆی ئازاد کرد و بەندەکە مرد، جا بەندەکە کچێکی خۆی و گەورەکەی (کە دەکاتە کچی حەمزە) لە دوای خۆی بەجێما، جا پێغەمبەری خوا ﷺ میراتەکەی دابەش کرد بە نیوە لە نێوان کچەکەی و لە نێوان کچی حەمزەی گەورەکەی (واتە: هەر یەکە و نیوەی پێدان و کردی بە دوو بەشی یەکسان).

٣٠٦٦ - «عَنْ شَمُوسَ الْكِنْدِيَّةِ، قَالَتْ: قَاضَيْتُ إِلَى عَلِيٍّ، فِي أَبٍ مَاتَ لَمْ يَدَعْ أَحَدًا غَيْرِي وَمَوْلَاهُ، فَأَعْطَانِي النِّصْفَ، وَأَعْطَى مَوْلَاهُ النِّصْفَ»[٢].

واتە: لە شەموسی کیندیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دادوەریم برد بۆ لای عەلی دەربارەی باوکێک کە مرد و کەسی دوای خۆی جێ نەهێشت جگە لە من و گەورەکەی، جا (عەلی) نیوەی پێدام و نیوەشی دا بە گەورەکەی.

٣٠٦٧ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ أُتِيَ بِابْنَةٍ وَمَوْلًى، فَأَعْطَى الإِبْنَةَ النِّصْفَ، وَالْمَوْلَى النِّصْفَ، قَالَ الْحَكَمُ: فَمَنْزِلِي هَذَا نَصِيبُ الْمَوْلَى الَّذِي وَرِثَهُ عَنْ مَوْلَاهُ»[٣].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە کچێک و گەورەیەکیان هێناوەتە لای، ئەویش نیوەی داوە بە کچەکە و نیوەشی داوەتە گەورەکە، حەکەم وتویەتی: ئەو خانوەی من (کە لە ناوی دام) پشکی ئەو گەورەیە بوو کە بە میرات بۆی مایەوە لە بەندەکەی.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى شموس الكندية.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٠٦٨ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُدْلِجٍ: أَنَّهُ مَاتَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ وَمَوَالِيَهُ، فَأَعْطَى عَلِيٌّ ﷺ ابْنَتَهُ النِّصْفَ، وَمَوَالِيَهُ النِّصْفَ»(١).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی مودلیجەوە گێڕدراوەتەوە، كە كاتێ مرد كچەكەی و گەورەكەی دوای خۆی جێهێشت، جا عەلی ﷺ نیوەی میراتەكەی دا بە كچەكەی و، نیوەشی دا بە گەورەكەی.

٣٠٦٩ - «عَنْ الشَّمُوسِ، أَنَّ أَبَاهَا مَاتَ فَجَعَلَ عَلِيٌّ، لَهَا النِّصْفَ، وَلِمَوَالِيهِ النِّصْفَ»(٢).

واتە: لە شەموسەوە گێڕدراوەتەوە كە باوكی مردووە عەلی نیوەی میراتەكەی بۆ داناوە و نیوەشی بۆ گەورەكەی دانا.

٣٠٧٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أُخْتَيْنِ اشْتَرَتْ إِحْدَاهُمَا أَبَاهَا فَأَعْتَقَتْهُ ثُمَّ مَاتَ، قَالَ: لَهُمَا الثُّلُثَانِ فَرِيضَتُهُمَا فِي كِتَابِ اللهِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلْمُعْتِقَةِ دُونَ الآخْرَى»(٣).

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە كە پرسیاری لێكراوە دەربارەی دوو خوشك كە یەكێكیان باوكی خۆی كڕیوەتەوە و ئازادی كردوە، دواتر باوكەكە مردووە، وتی: دوو خوشكەكان دوو لەسەر سێ پشكەكەیانە لە پەرتوكی خوادا ، ئەوەی دەشمێنێتەوە ئەوە بۆ خوشكە ئازادكەرەكەیە نەك ئەوەی تریان.

٣٠٧١ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي امْرَأَةٍ أَعْتَقَتْ أَبَاهَا، فَمَاتَ الأَبُ وَتَرَكَ أَرْبَعَ بَنَاتٍ هِيَ إِحْدَاهُنَّ، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْهِ مِنَّةٌ، لَهُنَّ الثُّلُثَانِ، وَهِيَ مَعَهُنَّ»(٤).

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتێك كە باوكی خۆی ئازاد كردوە و باوكەكە مردووە و چوار كچی لەدوای خۆی جێهێشتوە و كچە ئازادكەرەكە یەكێكیانە، وتویەتی: هیچ منەتێك لەسەر باوكەكە نیە، دوو لەسەر سێیان بۆ هەیە، ئەویش یەكێكیانە (واتە: كچە ئازادكەرەكە پشكی زیاتری نیە و منەتی لەسەر باوكی نیە، تاوەكو بە تەنها میراتەكەی بگرێت).

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی میرات دەدات بە خزمان نەك بە گەورە

٣٠٧٢ - «عَنْ حَيَّانَ بْنِ سَلْمَانَ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَسَأَلَهُ عَنْ فَرِيضَةِ رَجُلٍ تَرَكَ ابْنَتَهُ وَامْرَأَتَهُ، فقَالَ: أَنَا أُنْبِئُكَ قَضَاءَ عَلِيٍّ، قَالَ: حَسْبِي قَضَاءُ عَلِيٍّ، قَالَ: قَضَى عَلِيٌّ، لإِمْرَأَتِهِ الثُّمُنَ، وَلإِبْنَتِهِ النِّصْفَ ثُمَّ رَدَّ الْبَقِيَّةَ عَلَى ابْنَتِهِ»(٥).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە حەییانی کوڕی سولەیمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای سوەیدی کوڕی غەفەلە بووم، جا پیاوێک هات بۆ لای و پرسیاری لێکرد دەربارەی میراتی پیاوێک کە کچەکەی و خێزانەکەی دوای خۆی جێهێشتووە، ئەویش وتی: من دادوەری و بڕیاری عەلیت پێ ڕادەگەیەنم: کابراش وتی: دادوەری و بڕیاری عەلیم بەسە (جا لەوە باشتر هەیە)، سوەید وتی: عەلی (لە مەسئەلەیەکی ئاوادا) بڕیاری داوە هەشت یەک بۆ خیزانەکەی بێت و، نیوەش بۆ کچەکەی بێت، دواتر ئەوەی مایەوە گێڕایەوە بۆ کچەکەی و دای بە ئەو.

٣٠٧٣ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ مَوْلاَةً لإِبْرَاهِيمَ تُوُفِّيَتْ وَتَرَكَتْ مَالاً، فَقُلْتُ لإِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ: إِنَّ لَهَا ذَا قَرَابَةٍ»[١].

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێڕدراوەتەوە، کە بەندەیەکی ئیبڕاهیم مرد و ماڵ و سەروەتێکی دوای خۆی جێهێشت، جا بە ئیبڕاهیمم وت (میراتەکەی بۆ تۆیە وانیە)؟، ئەویش وتی: ئافرەتەکە خزمی هەنە (واتە: خزمەکانی خۆی میراتەکە دەگرن، نەک من).

## بابەت: وەلاء بۆ گەورەترینە (واتە: نزیکترین لە ڕووی نەسەبەوە)

٣٠٧٤ - «عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَزَيْدٍ ﷺ، قَالَ: وَأَحْسَبُهُ قَدْ ذَكَرَ عَبْدَ اللهِ، أَيْضًا أَنَّهُمْ قَالُوا: الْوَلاَءُ لِلْكُبْرِ. يَعْنُونَ بِالْكُبْرِ: مَا كَانَ أَقْرَبَ بِأَبٍ أَوْ أُمٍّ»[٢].

واتە: لە عومەر و عەلی و زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، پێم وایە باسی عەبدوڵلاشی کرد ـ وتویانە: وەلاء بۆ کوبرە، مەبەستیان بە کوبر: ئەوەیە کە نزیکتر بێت بە باوک یان بە دایک.

٣٠٧٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، قَالَ: كُتِبَ إِلَى عُمَرَ ﷺ فِي شَأْنِ فُكَيْهَةَ بِنْتِ سَمْعَانَ أَنَّهَا مَاتَتْ وَتَرَكَتِ ابْنَ أَخِيهَا لأَبِيهَا وَأُمِّهَا، وَابْنَ أَخِيهَا لأَبِيهَا. فَكَتَبَ عُمَرُ: إِنَّ الْوَلاَءَ لِلْكُبْرِ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عوتبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نوسراوێک بۆ عومەر ﷺ نوسرا دەربارەی بابەتی فوکەیهەی کچی سەمعان کە مرد و کوڕی براکەی لە دایک و باوکی و، کوڕی براکەی لە دایکی، دوای خۆی جێهێشت، جا عومەر (لە وەڵامدا) نوسی: وەلاء بۆ گەورەترین و لە پێشترینە (لە ڕووی نەسەبەوە).

٣٠٧٦ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ عَلِيًّا، وَزَيْدًا رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: الْوَلاَءُ لِلْكُبْرِ وقَالَ عَبْدُ اللهِ، وَشُرَيْحٌ: لِلْوَرَثَةِ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە شەعبیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەلی و زەید (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویانە: وەلاء بۆ گەورەترین و لە پێشترینە (لە ڕووی نەسەبەوە)، عەبدوڵڵا و شورەیحیش وتویانە: بۆ میراتگرانە (واتە: بە پێی پشکی میراتگرانی دەبێت).

٣٠٧٧ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قَضَى عُمَرُ، وَعَبْدُ اللهِ، وَعَلِيٌّ، وَزَيْدٌ ﷺ، لِلْكُبْرِ بِالْوَلَاءِ»(١).

واتە: لە شەعبیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەر و، عەبدوڵلا و، عەلی و، زەید ﷺ بڕیاریانداوە بەوەی وەلاء بۆ لە پێشترین بێت.

٣٠٧٨ - «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، قَالَ: تُوُفِّيَتْ فُكَيْهَةُ بِنْتُ سَمْعَانَ وَتَرَكَتِ ابْنَ أَخِيهَا لِأَبِيهَا وَبَنِي بَنِي أَخِيهَا لِأَبِيهَا وَأُمِّهَا «فَوَرَّثَ عُمَرُ، بَنِي أَخِيهَا لِأَبِيهَا»(٢).

واتە: لە ئیبنو سیرینەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: فوکەیهەی کچی سەمعان مرد و کوڕی برای لە باوک و، کوڕی کوڕی برای لە باوک و دایکی، دوای خۆی جێهێشت، جا عومەر میراتەکەی دا بە کوڕی برای لە دایکی.

٣٠٧٩ - «عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَزَيْدٍ ﷺ، أَنَّهُمْ قَالُوا: الْوَلَاءُ لِلْكُبْرِ»(٣).

واتە: لە عومەر و عەلی و زەیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویانە: وەلاء بۆ کەسی لە پێشترە (لە ڕووی نەسەبەوە).

٣٠٨٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي أَخَوَيْنِ وَرِثَا مَوْلًى كَانَ أَعْتَقَهُ أَبُوهُمَا، فَمَاتَ أَحَدُهُمَا، وَتَرَكَ وَلَدًا، قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ، وَزَيْدٌ، وَعَبْدُ اللهِ ﷺ، يَقُولُونَ: الْوَلَاءُ لِلْكُبْرِ»(٤).

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی دوو برا کە میراتیان گرت لە بەندەیەک کە باوکیان ئازادی کردبوو، جا یەکێکیان مرد و منداڵێکی دوای خۆی جێهێشت، وتویەتی: عەلی و، زەید و، عەبدوڵلا ﷺ وتویانە: وەلاء بۆ لە پێشترینە.

٣٠٨١ - «حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ مَطَرًا الْوَرَّاقَ، يَقُولُ: قَالَ عُمَرُ، وَعَلِيٌّ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: الْوَلَاءُ لِلْكُبْرِ»(٥).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف إلى ابن عباس.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە حەممادی كوڕی زەیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە مەتەڕی وەڕڕاق بوو دەیووت: عومەر و عەلی (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویانە: وەلاء بۆ گەورەترینە (لە ڕووی نەسەبەوە).

٣٠٨٢ - «عَنْ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: الْوَلَاءُ لِلْكُبْرِ»[١].

واتە: لە طاووسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: وەلاء بۆ گەورەترین و لە پێشترینە.

٣٠٨٣ - «عَنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْوَلَاءُ لِلْكُبْرِ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وەلاء بۆ گەورەترینە (لە ڕووی نەسەبەوە).

## بابەت: دەربارەی ئەو پیاوەی وەلائی خۆی دەدات بە پیاوێک

٣٠٨٤ - «عَنْ الْحَسَنِ، فِي الرَّجُلِ يُوَالِي الرَّجُلَ، قَالَا: هُوَ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ سُفْيَانُ ﷺ: وَكَذَلِكَ نَقُولُ»[٣].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەلائی خۆی دەدات بە پیاوێک، وتویانە: میراتەكەی لە نێوان مسوڵمانان دابەش دەكرێت (واتە: وەلائەكە نەقڵ نابێت بۆ كەسێكی تر، بۆیە میراتەكە بۆ مسوڵمانان دەبێت بە گشتی)، سوفیان ﷺ وتویەتی: ئێمەش ئاوا دەڵێین.

٣٠٨٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ تَمِيمًا الدَّارِيَّ ﷺ، يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا السُّنَّةُ فِي الرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ الْكُفْرِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيْ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ»[٤].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی مەوهەبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە تەمیمی داری بوو ﷺ دەیووت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیار و ڕێبازی ئیسلام چیە دەربارەی پیاوێكی ئەهلی كوفر كە مسوڵمان دەبێت لەسەر دەستی پیاوێک لە مسوڵمانان؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو نزیكترین و شایستەترینی خەڵكیە بە ژیانی و مردنی.

٣٠٨٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ السَّوَادِ إِذَا أَسْلَمَ عَلَى يَدَيْ رَجُلٍ قَالَ: يَعْقِلُ عَنْهُ وَيَرِثُهُ»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیاری لێکراوە دەربارەی پیاوێک لە عاممەی خەڵکی کاتێ مسوڵمان دەبێت لەسەر دەستی پیاوێک، وتویەتی: بەدەل خوێنی بۆ دەدات و میراتیشی دەگرێت.

## بابەت: ئەوەی وتویەتی: خێزان میرات لە خوێنی هاوسەرەکەی دەگرێت

٣٠٨٧ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: تَرِثُ الْمَرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا فِي الْعَمْدِ، وَالْخَطَإِ»[١].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خێزان میرات دەگرێت لە خوێنی هاوسەرەکەی (لە تۆڵەی کوشتنی) ئەنقەست و بە هەڵەدا.

٣٠٨٨ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الدِّيَةُ عَلَى فَرَائِضِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەدەل خوێن دابەش دەکرێت بەسەر ئەو پشکانەی خوا عزَّ وجلَّ دایناوە (واتە: دابەش دەکرێت بەسەر خاوەن پشکەکانی میرات کە خوا باسی کردوون، خێزانیش یەکێکە لەوان).

٣٠٨٩ - «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، قَالَ: الدِّيَةُ سَبِيلُهَا سَبِيلُ الْمِيرَاثِ»[٣].

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ڕێگە و چۆنیەتی دابەشکردنی بەدەل خوێن بریتیە لە ڕێگە و چۆنیەتی دابەشکردنی میرات (هەمان ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە میرات دەیانگرێتەوە، خێزانیش یەکێکە لەوان).

٣٠٩٠ - «أن عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ، كَتَبَ أَنْ يُوَرَّثَ الإِخْوَةُ مِنَ الأمِّ مِنَ الدِّيَةِ»[٤].

واتە: لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە گێڕدراوەتەوە کە نوسیویەتی: برای لە دایک میراتیان پێ دەدرێت لە بەدەلخوێندا.

٣٠٩١ - «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: الْعَقْلُ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى كِتَابِ اللهِ وَفَرَائِضِهِ»[٥].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەدەلخوێن میراتە لە نێوان میراتگرانی کوژراوەکە بە پێی پەرتوکی خوا و دابەشکردنەکەی (بە چۆنیەتی میراتی شەرعی).

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى ابن قلابة.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى عمر.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

٣٠٩٢ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: لَقَدْ ظَلَمَ مَنْ لَمْ يُوَرِّثِ الإِخْوَةَ مِنَ الأُمِّ مِنَ الدِّيَةِ»[١].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی ستەمی کردوە ئەوەی میرات نەدات بە براکانی لە دایک، لە بەدەلخوێندا.

٣٠٩٣ - «عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَزَيْدٍ ﷺ، قَالُوا: الدِّيَةُ تُورَثُ، كَمَا يُورَثُ الْمَالُ خَطَؤُهُ، وَعَمْدُهُ»[٢].

واتە: لە عومەر و عەلی و زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویانە: بەدەل خوێن دەبێتە میرات، هەر وەک چۆن ماڵ و سەروەت دەبێتە میرات، (جا کوشتنەکە) بە هەڵە بێت یان بە ئەنقەست.

## بابەت: ئەوەی وتویەتی: (خێزان لە بەدەل خوێنی هاوسەرەکەی) میرات ناگرێت

٣٠٩٤ - «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ ﷺ، لاَ يُوَرِّثُ الإِخْوَةَ مِنَ الأُمِّ، وَلاَ الزَّوْجَ، وَلاَ الْمَرْأَةَ مِنَ الدِّيَةِ شَيْئًا، قَالَ عَبْد اللهِ: بَعْضُهُمْ يُدْخِلُ بَيْنَ إِسْمَاعِيلَ وَعَامِرٍ رَجُلاً»[٣].

واتە: لە عامرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ نە براکانی لە دایک و، نە مێرد و، نە خێزانی نەدەکردن بە میراتگری هیچ شتێک لە بەدەل خوێن.

٣٠٩٥ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: لاَ تُوَرَّثُ الإِخْوَةُ مِنَ الأُمِّ مِنَ الدِّيَةِ»[٤].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: براکانی لە دایک میرات ناگرن لە بەدەل خوێندا.

## بابەت: میراتی کەسانی خنکاو

٣٠٩٦ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: كُلُّ قَوْمٍ مُتَوَارِثِينَ، عَمِيَ مَوْتُهُمْ فِي هَدْمٍ أَوْ غَرَقٍ، فَإِنَّهُمْ لاَ يَتَوَارَثُونَ، يَرِثُهُمُ الأَحْيَاءُ»[٥].

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر خەڵکانێک میراتیان لێ بگیرێت و مردنەکەیان دیار نەبێت (کامیان پێش کامیان مردووە وەک) لە ڕوخان و خنکاندا ڕوودەدات، ئەوان میرات لەیەکتری ناگرن (چونکە نازانرێت کامیان پێش کامیان خنکاوە، کەواتە: مردووەکان میرات لێک ناگرن، بەڵکو) زیندووەکان میراتیان لێ دەگرن.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى علي.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٥) ـ إسناده حسن.

٣٠٩٧ - «عَنْ يَحْيَى بْنِ عَتِيقٍ، قَالَ: قَرَأْتُ فِي بَعْضِ كُتُبِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فِي الْقَوْمِ يَقَعُ عَلَيْهِمُ الْبَيْتُ لا يُدْرَى أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ؟ قَالَ: لاَ يُوَرَّثُ الأَمْوَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ، وَيُوَرَّثُ الأَحْيَاءُ مِنَ الأَمْوَاتِ»[١].

واتە: لە يەحیای كوڕی عەتیقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە یەكێک لە نوسراوەكانی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز خوێندومەتەوە دەربارەی ئەوەی خەڵكانێک خانویان بەسەردا بڕوخێ و نەزانرێت كامیان پێشتر مردووە؟ وتویەتی: مردووەكان میرات لە یەكتری ناگرن (چونكە نازانرێت كامیان پاش كامیان مردووە تا میراتی لێ بگرێت، بەڵكو) زیندووەكان میرات دەگرن لە مردووەكان.

٣٠٩٨ - «حَدَّثَنَا جَعْفَرٌ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أُمَّ كُلْثُومٍ وَابْنَهَا زَيْدًا مَاتَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، فَالْتَقَتِ الصَّائِحَتَانِ فِي الطَّرِيقِ، فَلَمْ يَرِثْ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ صَاحِبِهِ. وَأَنَّ أَهْلَ الْحَرَّةِ لَمْ يَتَوَارَثُوا، وَأَنَّ أَهْلَ صِفِّينَ لَمْ يَتَوَارَثُوا»[٢].

واتە: لە جەعفەرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئوممو كەلسوم و كوڕەكەی كە زەید بوو لە یەک ڕۆژدا مردن و هەواڵدەرەكان لە ڕێگەدا بەیەک گەیشتن (واتە: هەواڵەكە لە یەک كات بوو و نەزانرا كامیان پاش كامیان مردووە) جا هیچێک لە هەردووكیان میراتیان لەوەی تر نەگرت، وە خەڵكی حەڕڕە كاتێ مردن میراتیان لە یەكتری نەگرت، وە خەڵكی صیففین (كە كوژران) میراتیان لە یەكتری نەگرت (چونكە لە هیچیان نەزانرا كامیان پێش كامیان مردووە).

٣٠٩٩ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ: أَنَّ بَيْتًا فِي الشَّامِ وَقَعَ عَلَى قَوْمٍ، فَوَرَّثَ عُمَرُ، بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ»[٣].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خانوێک لە شام ڕوخا بەسەر بنەماڵەیەكدا، جا عومەر میراتی هەندێكیانی دا بە هەندێكی تر (دیارە زانراوە كامەیان دوای كامیان گیانی دەرچووە، میرات دابەش كردنەكەش بەسەر مردووەكانی گرنگیەكەی لەوە دایە دواتر دابەش دەكرێتەوە بەسەر میراتگرە زیندووەكان).

٣١٠٠ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ وَرَّثَ أَخَوَيْنِ قُتِلاَ بِصِفِّينَ: أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ»[٤].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە، دوو برای كردوون بە میراتگر كە كوژران لە شەڕی صیففین، یەكێكیانی كرد بە میراتگر لەوەی تریان (دیارە یەكێكیان تۆزێک دوای ئەوەیتر گیانی لەدەست داوە).

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى عمر بن عبد العزيز.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: میراتی ذوي الأرحام

٣١٠١ - «عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُزَنِيِّ: أَنَّ رَجُلاً هَلَكَ وَتَرَكَ عَمَّتَهُ وَخَالَتَهُ، فَأَعْطَى عُمَرُ ﷺ، الْعَمَّةَ نَصِيبَ الأَخِ، وَأَعْطَى الْخَالَةَ نَصِيبَ الأخْتِ»[١].

واتە: لە بەكری كوڕی عەبدوڵڵای موزەنیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک مرد و پوری و خارەتی دوای خۆی جێهێشت، جا عومەر ﷺ ئەندازەی میراتی برای دا بە پورەكە و، ئەندازەی میراتی خوشكیشی دا بە خارەتەكە.

٣١٠٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: مَنْ أَدْلَى بِرَحِمٍ، أُعْطِيَ بِرَحِمِهِ الَّتِي يُدْلِي بِهَا»[٢].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک بە هۆی خزمێک خزمایەتی نزیک كەوتبێتەوە، ئەوە وەک پشكی ئەو خزمەی پێ دەدرێت كە لە نێوانیان دایە (بۆ نمونە لە نێوان مردوو و پوری مردووەكە برا هەیە، كەواتە: پورەكە پشكی وەكو برا دەبات لە میراتدا).

٣١٠٣ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ تَرَكَ عَمَّتَهُ وَابْنَةَ أَخِيهِ، قَالَ: الْمَالُ لإِبْنَةِ أَخِيهِ»[٣].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک كە پور و كچە برای دوای خۆی جێهێشتبوو، وتویەتی: ماڵەكە بۆ كچی براكەیەتی.

٣١٠٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْخَالُ وَارِثٌ»[٤].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: خاڵ میراتگرە.

٣١٠٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ: أن عُمَرَ، وَعَبْدَ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، رَأَيَا أَنْ يُوَرِّثَا خَالاً»[٥].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر و عەبدوڵڵا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) پێیان وابوو دەبێ میرات بدەن بە خاڵ.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن إلى إبراهيم.

(٣) ـ إسناده حسن إلى عامر الشعبي.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح بشواهده.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

٣١٠٦ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي عَمَّةٍ وَبِنْتِ أَخٍ قَالَ: الْمَالُ لاِبْنَةِ الأَخِ»[١].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی (مەسئەلەی میراتی) پورێک و کچی برا، وتویەتی: ماڵەکە بۆ کچی برایە.

٣١٠٧ - «حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، أَنْبَأَنَا حَسَنٌ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ بَعْضِهِمْ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: لِلْعَمَّةِ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، (لە هەمان مەسئەلەدا) وتویەتی: بۆ پورەکەیە.

٣١٠٨ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، فِي بِنْتِ أَخٍ، وَعَمَّةٍ، قَالَ: أَعْطِي الْمَالَ لاِبْنَةِ الأَخِ»[٣].

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی کچی خاڵ و پور وتویەتی: ماڵەکە دەدەم بە کچی برا.

٣١٠٩ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، فِي رَجُلٍ تُوُفِّيَ وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ إِلاَّ ابْنَةُ أَخِيهِ وَخَالُهُ، قَالَ: لِلْخَالِ نَصِيبُ أُخْتِهِ، وَلاِبْنَةِ الأَخِ نَصِيبُ أَبِيهَا»[٤].

واتە: لە مەسروقەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی پیاوێک کە وەفاتی کرد و هیچ میراتگرێکی نەبوو جگە لە کچی برای و خاڵی، (مەسڕوق) وتی: بۆ خاڵ ئەندازەی پشکی خوشکەکەی هەیە و، بۆ کچی براشی ئەندازەی پشکی باوکی هەیە (کە دەکاتە برای مردووەکە).

٣١١٠ - «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: كَانَ مَسْرُوقٌ، يُنَزِّلُ الْعَمَّةَ بِمَنْزِلَةِ الأَبِ إِذَا لَمْ يَكُنْ أَبٌ، وَالْخَالَةَ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ إِذَا لَمْ تَكُنْ أُمٌّ»[٥].

واتە: لە عامڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مەسڕوق پوری دەخستە شوێنی باوک ئەگەر باوک لە مەسەلەکەدا نەبووایە، وە خارەتیشی دەخستە شوێنی دایک ئەگەر دایک لە مەسەلەکەدا نەبووایە.

٣١١١ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَبَّانَ عَنْ عَمِّهِ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، قَالَ: تُوُفِّيَ ابْنُ الدَّحْدَاحَةِ - وَكَانَ أَتِيًّا، وَهُوَ الَّذِي لاَ يُعْرَفُ لَهُ أَصْلٌ فَكَانَ فِي بَنِي الْعَجْلاَنِ - وَلَمْ يَتْرُكْ عَقِبًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ: هَلْ تَعْلَمُونَ لَهُ فِيكُمْ نَسَبًا؟. قَالَ: مَا نَعْرِفُهُ يَا رَسُولَ اللهِ. فَدَعَا ابْنَ أُخْتِهِ، فَأَعْطَاهُ مِيرَاثَهُ»[٦].

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى مسروق.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە موحەممەدی كوڕی حەببانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە مامیەوە لە واسیعی كوڕی حاببانەوە گێڕاویەتەوە، وتویەتی: ئیبنو دەحداحە مرد لەكاتێكدا كەسێكی غەریب بوو و ئەصڵەكەی نەدەناسرا لەناو بەنی عەجلان، جا كەسی لەدوای خۆی جێنەهێشت، پێغەمبەری خواش ﷺ بە عاصمی كوڕی عەدی فەرمووی: ئایا نەسەبی دەزانن لەناو ئێوەدا؟ ئەویش وتی: نایناسین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی كوڕە براكەی ئیبنو دەحداحەی كرد و میراتەكەی دا بە ئەو.

٣١١٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عُمَرَ ﷺ: أَنَّهُ أَعْطَى خَالاً الْمَالَ»[١].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عومەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە ماڵی میراتی داوە بە خاڵێك.

٣١١٣ - «حَدَّثَنَا أَبُو هَانِئٍ، قَالَ: سُئِلَ عَامِرٌ، عَنِ امْرَأَةٍ - أَوْ رَجُلٍ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ خَالَةً، وَعَمَّةً قال: لَيْسَ لَهُ وَارِثٌ، وَلاَ رَحِمٌ غَيْرُهُمَا. فَقَالَ: كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ يُنَزِّلُ الْخَالَةَ بِمَنْزِلَةِ أُمِّهِ، وَيُنَزِّلُ الْعَمَّةَ بِمَنْزِلَةِ أَخِيهَا»[٢].

واتە: لە ئەبو هانیئەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عامیر پرسیاری لێكرا دەربارەی ئافرەتێك ـ یان پیاوێك ـ كە وەفاتی كرد و خارەت و پوری دوای خۆی جێهێشت، وتی: هیچ میراتگرێك و هیچ خزمێكی ڕەحمی نیە جگە لەم دوانە، جا عامیر وتی: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ خارەتی لە شوێنی دایكی مردووەكە دادەنا و، پوریشی لە شوێنی براكەی دادەنا.

## بابەت: دەربارەی ئیددیعا كردن و ئینكاری كردن

٣١١٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ اعْتَرَفَ عِنْدَ مَوْتِهِ بِأَلْفِ دِرْهَمٍ لِرَجُلٍ، وَأَقَامَ آخَرُ بَيِّنَةً بِأَلْفِ دِرْهَمٍ، وَتَرَكَ الْمَيِّتُ أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَقَالَ: الْمَالُ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مُفْلِسًا، فَلاَ يَجُوزُ إِقْرَارُهُ»[٣].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێك كە لە كاتی مردنیدا دانینا بە هەزار درهەم بۆ پیاوێك (كە گوایە قەرزاریەتی)، پیاوێكی تریش بەڵگەی هێنایەوە بە هەزار درهەم (واتە: نوسراو یان شاهێدی هێنا لەسەر ئەوەی پیاوە مردووەكە هەزار دیناری ئەویش قەرزارە)، جا مردیەكەش تەنها هەزار درهەمی جێهێشتبوو، (حەسەن) وتی: ماڵەكە لە نێوانیان (واتە: لەنێوان دوو خاوەن قەرزەكە) دابەش دەكرێت بە نیوە، بەڵام ئەگەر موفلیس بوو هیچی نەبوو، ئەو كات ئیقرارەكەی دروست نیە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٣١١٥ - «أَخْبَرَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: قُلْتُ لِشَرِيكٍ: كَيْفَ ذَكَرْتَ فِي الأَخَوَيْنِ يَدَّعِي أَحَدُهُمَا أَخًا؟، قَالَ: يَدْخُلُ عَلَيْهِ فِي نَصِيبِهِ. قُلْتُ: مَنْ ذَكَرَهُ؟ قَالَ: جَابِرٌ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ»[١].

واتە: لە ئەبو نوعەیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە شەریکم وت: چۆنت باس کردوە (یان چۆنت لەبیرە یان چۆن حوکم دەدەی) دەربارەی دوو برا کە یەکێکیان بانگەشەی ئەوە دەکات برایەکی تریشیان هەیە (جا برایەکی تریشی هەیە ئینکاری دەکات)، شەریک وتویەتی: برایە تازەکە لە پشکی ئەو دەبات (واتە: بەشدار دەبێت لە میرات، بەڵام پشکەکەی خۆی تەنها لە پشکی برا دانپێداهێنەرەکە وەردەگرێت ئەوەندەی بەری دەکەوێت)، ئەبو نوعەیم دەڵێت: وتم کێ باسی ئەوەی کردوە؟ وتی: جابر و عامیر و عەلی ﷺ.

٣١١٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الإِخْوَةِ يَدَّعِي بَعْضُهُمُ الأَخَ، وَيُنْكِرُ الآخَرُونَ قَالَ: يَدْخُلُ مَعَهُمْ بِمَنْزِلَةِ عَبْدٍ يَكُونُ بَيْنَ الإِخْوَةِ، فَيَعْتِقُ أَحَدُهُمْ نَصِيبَهُ، قَالَ: وَكَانَ عَامِرٌ، وَالْحَكَمُ، وَأَصْحَابُهُمَا يَقُولُونَ: لاَ يَدْخُلُ إِلاَّ فِي نَصِيبِ الَّذِي اعْتَرَفَ بِهِ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی چەند برایەک کە یەکێکیان (یان هەندێکیان) بانگەشەی ئەوە دەکەن کە برایەکی تریشیان هەیە، ئەوانی تریش ئینکاری دەکەن، وتویەتی: وەگەریان دەکەوێت (واتە: لەگەڵ گشتیان میرات دەگرێت) لە پلەی بەندەیەک دایە کە بەندە بێت لە نێوان چەند برایەک و یەکێکیان ئازادی بکات، وتویەتی: وە عامیر و حەکەم و هاوەڵەکانیان دەیانووت: نایێتە گەر گشتیان بەڵکو تەنها دەچێتە گەر پشکی ئەوەی دانی هێناوە پێی.

٣١١٧ - «عَنْ وَكِيعٍ، قَالَ: إِذَا كَانَا أَخَوَيْنِ، فَادَّعَى أَحَدُهُمَا أَخًا وَأَنْكَرَهُ الآخَرُ؟ قَالَ: كَانَ ابْنُ أَبِي لَيْلَى، يَقُولُ: هِيَ مِنْ سِتَّةٍ: لِلَّذِي لَمْ يَدَّعِ ثَلاَثَةٌ، وَلِلْمُدَّعِي سَهْمَانِ، وَلِلْمُدَّعَى سَهْمٌ»[٣].

واتە: لە وەکیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر دوو برا هەبوون و یەکێکیان بانگەشەی ئەوەی کرد برایەکی تریان هەیە و ئەوەیتریش ئینکاری کرد، وتویەتی: ئیبنو ئەبی لەیلا دەیووت: مەسەلەکە لە شەشە: بۆ ئەو برایەی دانینەناوە سێ پشک هەیە، وە بۆ ئەو برایەشی کە دانیناوە دوو پشک هەیە، وە بۆ برا نوێیەکەی کە دانپێداهێنراوە پشکێک هەیە.

٣١١٨ - «عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ حَمَّادٍ، فِي الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ ثَلاَثَةُ بَنِينَ، فَقَالَ: ثُلُثِي لأَصْغَرِ بَنِيَّ، فَقَالَ: الأَوْسَطُ أَنَا أُجِيزُ، وَقَالَ الأَكْبَرُ: أَنَا لاَ أُجِيزُ. قَالَ: هِيَ مِنْ تِسْعَةٍ يُخرِجُ ثُلُثَهُ، فَلَهُ سَهْمُهُ وَسَهْمُ الَّذِي أَجَازَ. وَقَالَ حَمَّادٌ: يَرُدُّ السَّهْمَ عَلَيْهِمْ جَمِيعًا، وَقَالَ عَامِرٌ: الَّذِي رَدَّ إِنَّمَا رَدَّ عَلَى نَفْسِهِ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى حامد.

واتە: لە موغیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە حەممادی گێڕاوەتەوە دەربارەی ئەو پیاوەی سێ کوڕی هەبن و بڵێت: سێیەکی ماڵەکەم بۆ کوڕە بچوکەکەم بێت، کوڕە ناوەنجیەکەش بڵێت: من ڕێگە دەدەم و ڕازیم، کوڕە گەورەکەش بڵێت: من ڕێگە نادەم و ڕازی نیم، وتویەتی: مەسئەلەکە لە نۆیە سێیەکی لێ دەردەکرێت و پشکێکی خۆی بۆ هەیە لەگەڵ پشکی ئەو برایەی ڕێگەی پێداوە و ڕازی بووە، وە حەمماد وتویەتی: پشکێکی تریش دەگەڕێنرێتەوە بۆ سەر گشتیان، عامیڕیش وتویەتی: ئەوەی ڕەتی کردۆتەوە و ڕازی نەبووە ئەوە پشکەکەی تەنها بۆ خۆی گەڕاندۆتەوە (واتە: ئەو پشکەی دەمێنێتەوە بۆ گشتیان نابێت بەڵکو تەنها بۆ کوڕە گەورەکە دەگەڕێنرێتەوە، لەسەر قسەی عامیڕ).

**٣١١٩ - «عَنْ شُرَيْحٍ، فِي رَجُلٍ أَقَرَّ بِأَخٍ. قَالَ: بَيِّنَتُهُ أَنَّهُ أَخُوهُ»[١].**

واتە: لە شوڕەیحەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە ئیعترافی کردوە و دانیناوە بەوەی برایەکی تری هەیە، وتویەتی: بەڵگەکەی تەنها ئەوەیە کە ئەو برایەتی (واتە: خودی ئیقڕارەکەی بەڵگەیە و پێویستی بە بەڵگە نیە).

**٣١٢٠ - «عَنِ الْحَارِثِ الْعُكْلِيِّ، فِي رَجُلٍ أَقَرَّ عِنْدَ مَوْتِهِ بِأَلْفِ دِرْهَمٍ مُضَارَبَةً، وَأَلْفِ دَيْنًا، وَلَمْ يَدَعْ إِلاَّ أَلْفَ دِرْهَمٍ. قَالَ: يُبْدَأُ بِالدَّيْنِ، فَإِنْ فَضَلَ فَضْلٌ، كَانَ لِصَاحِبِ الْمُضَارَبَةِ».[٢]**

واتە: لە حاریثی عوکلیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە لە کاتی مردنیدا دانیناوە بە هەزار درهەم کە لە کەسێکی وەرگرتووە بۆ ئەوەی بازرگانی بۆ پێ بکات، کابراش هیچی جێنەهێشتبوو دوای خۆی تەنها هەزار درهەم نەبێت، وتویەتی: سەرەتا دەست دەکرێت بە قەرز (قەرزەکانی دەدرێنەوە)، جا ئەگەر شتێک زیاد بوو (لە میراتەکە) ئەوە بۆ خاوەنی ئەو پارەیەیە کە بۆ بازرگانی پێی داوە.

**٣١٢١ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ مَاتَ وَتَرَكَ ثَلاَثَ مِائَةِ دِرْهَمٍ، وَثَلاَثَةَ بَنِينَ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَدَّعِي مِائَةَ دِرْهَمٍ عَلَى الْمَيِّتِ، فَأَقَرَّ لَهُ أَحَدُهُمْ. قَالَ: يَدْخُلُ عَلَيْهِمْ بِالْحِصَّةِ، ثُمَّ قَالَ الشَّعْبِيُّ: مَا أُرَى أَنْ يَكُونَ مِيرَاثًا حَتَّى يُقْضَى الدَّيْنُ».[٣]**

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە مردبێت و سێ سەد درهەمی دوای خۆی جێهێشتبێت و سێ کوڕی هەبن و پیاوێک بێت و بانگەشەی ئەوە بکات کە سەد درهەمی قەرزی هەیە لەسەر مردووەکە و یەکێک لە کوڕەکانیش دان بنێت بۆی، شەعبی وتویەتی: بە پشک لەگەڵیان بەشدار دەبێت، دواتر (پاشگەز بویەوە لە بۆچونەکەی) و وتی: پێم وا نیە ببێتە میرات تاوەکو قەرزەکە دەدرێتەوە (واتە: بە پشک بەشدار نابێت بەڵکو سەدی تەواوی خۆی وەردەگرێتەوە، ئنجا ئەوەی تریش دەبێتە میرات).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح

(٣) ـ إسناده صحيح الى عمر الشعبي.

٣١٢٢ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ هَلَكَ وَتَرَكَ ابْنَيْنِ، وَتَرَكَ أَلْفَيْ دِرْهَمٍ، فَاقْتَسَمَا الأَلْفَيْ دِرْهَمٍ، وَغَابَ أَحَدُ الإِبْنَيْنِ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَاسْتَحَقَّ عَلَى الْمَيِّتِ أَلْفَ دِرْهَمٍ. قَالَ: يَأْخُذُ جَمِيعَ مَا فِي يَدِ الشَّاهِدِ، وَيُقَالُ لَهُ: اتَّبِعْ أَخَاكَ الْغَائِبَ، فَخُذْ نِصْفَ مَا فِي يَدِهِ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە مردووە و دوو کوڕ و دوو هەزار درهەمی دوای خۆی جێهێشتووە، جا دوو کوڕەکانی دوو هەزار درهەمەکەیان لە نێوانی خۆیان دابەش کرد (یەکە و هەزاریان) و، کوڕێکیان غائیب بوو ڕۆیشت بۆ شوێنێک و پیاوێک هات و داوای ئەوەی کرد کە هەزار درهەمی لەسەر مردووەکە هەیە (واتە: باوکیان قەرزاریەتی)، (حەسەن) وتویەتی: هەموو ئەو پارەیە وەردەگرێتەوە کە لەدەستی برایە ئامادەبوەکە هەیە (کە دەکاتە هەزار درهەمی قەرزی خۆی)، وە بە براکە دەوترێت بچۆ بە دوای برا غائیبەکەت و نیوەی ئەوەی لێوەربگرەوە کە لە دەستیدا هەیە (کە دەکاتە پێنج سەد درهەم، چونکە دەبێت هەردووکیان باری قەرزەکە هەڵگرن بە یەکسانی).

٣١٢٣ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا أَقَرَّ بَعْضُ الْوَرَثَةِ بِدَيْنٍ، فَهُوَ عَلَيْهِ بِحِصَّتِهِ».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ یەکێک لە میراتگران دانینا بە قەرزێک، ئەوە دەکەوێتە سەر ئەو کەسە بە تەنها لە پشکەکەی خۆیدا.

٣١٢٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا شَهِدَ اثْنَانِ مِنَ الْوَرَثَةِ بِدَيْنٍ، فَهُوَ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ إِذَا كَانُوا عُدُولاً وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: عَلَيْهِمَا فِي نَصِيبِهِمَا».[٣]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر دوو لە میراتگران شاهێدیان دا لەسەر قەرزێک، ئەوە (قەرزەکە دەدرێت) لەگشت ماڵەکە (واتە: لە پشکی گشتیان دەدرێت، نەک تەنها لە پشکی ئەوانەی شاهێدیەکەیان داوە، بە مەرجێک) ئەگەر دوو شاهێدەکان عادل بوو، شەعبیش (بۆچونی جیاوازە و) وتویەتی: قەرزەکە تەنها لەسەر ئەوانەیە کە شاهێدیان داوە بە پێی پشکەکانیان.

## بابەت: دەربارەی میراتی کەسی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام

٣١٢٥ - «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ، يُوَرِّثُ أَهْلَ الْمُرْتَدِّ إِذَا قُتِلَ».[٤]

واتە: لە قاسمی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو مەسعود ﷺ میراتی کەسی هەڵگەڕاوەی دەدا بە خزم و کەسە مسوڵمانەکانی کاتێ بکوژرایە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

٣١٢٦ - «عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ جَعَلَ مِيرَاثَ الْمُرْتَدِّ لِوَرَثَتِهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ».(١)

واته: له ئەبو عەمری شەیبانیەوه گێردراوەتەوه، وتویەتی: عەلی كوڕی ئەبی تالیب ﷺ میراتی كەسی هەڵگەڕاوەی دادەنا بۆ میراتگره مسوڵمانەكانی.

٣١٢٧ - «عَنِ الْحَكَمِ، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ، قَضَى فِي مِيرَاثِ الْمُرْتَدِّ لأَهْلِهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ».(٢)

واته: له حەكەمەوه گێردراوەتەوه، وتویەتی: عەلی ﷺ بڕیاری دا دەربارەی میراتی كەسی هەڵگەڕاوه بۆ خزم و كەسەكانی له مسوڵمانان.

## بابەت: میراتی كەسی بكوژ (قاتل)

٣١٢٨ - «عَنْ الْحَكَمِ، قَالَ: إِذَا قَتَلَ الرَّجُلُ أَخَاهُ عَمْدًا لَمْ يُوَرَّثْ مِنْ مِيرَاثِهِ، وَلاَ مِنْ دِيَتِهِ، فَإِذَا قَتَلَهُ خَطَأً، وُرِّثَ مِنْ مِيرَاثِهِ، وَلَمْ يُوَرَّثْ مِنْ دِيَتِهِ، قَالَ: وَكَانَ عَطَاءٌ يَقُولُ ذَلِكَ».(٣)

واته: له حەكەمەوه گێردراوەتەوه، وتویەتی: ئەگەر كەسێك برای خۆی كوشت به ئەنقەست ئەوه له میراتەكەی پێ نادرێت، وه له خوێنەكەشی پێ نادرێت، جا ئەگەر به هەڵە كوشتی ئەوه دەكرێته میراتگر له میراتەكەی، بەڵام ناكرێته میراتگر له بەدەل خوێنەكەی (له دیەكەی)، دەڵێ: عەتائیش ئاوای دەووت.

٣١٢٩ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: رَمَى رَجُلٌ أُمَّهُ بِحَجَرٍ فَقَتَلَهَا، فَطَلَبَ مِيرَاثَهُ مِنْ إِخْوَتِهِ، فَقَالَ لَهُ إِخْوَتُهُ: لاَ مِيرَاثَ لَكَ. فَارْتَفَعُوا إِلَى عَلِيٍّ فَجَعَلَ عَلَيْهِ الدِّيَةَ، وَأَخْرَجَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ».(٤)

واته: له عەلیەوه ﷺ گێردراوەتەوه، وتویەتی: پیاوێك بەردێكی گرته دایكی و كوشتی و داوای میراتەكەی دەكرد له براكانی، براكانیشی پێیان وت: تۆ میراتت بۆ نیه، جا كێشەكەیان بەرز كردەوه بۆ لای عەلی، ئەویش دیه و خوێنی خسته سەری و دەریكرد له میرات.

٣١٣٠ - «عَنِ الْحَكَمِ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا قَتَلَ امْرَأَتَهُ خَطَأً، أَنَّهُ يُمْنَعُ مِيرَاثَهُ مِنَ الْعَقْلِ وَغَيْرِهِ».(٥)

واته: له حەكەمەوه گێردراوەتەوه، وتویەتی: ئەگەر پیاوێك خێزانەكەی به هەڵە بكوژێت، ئەوه میراتەكەی لێ قەدەغه دەكرێت، له خوێنەكه و جگه له خوێنەكەش (واته: نه دەبێته میراتگری سەروەتەكەی نه دەبێته میراتگری خوێنەكەی و دیەكەی).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٤) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٥) ـ إسناده صحيح إلى مرائه.

٣١٣٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: لاَ يَرِثُ الْقَاتِلُ مِنَ الْمَقْتُولِ شَيْئًا».[١]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی قاتیل هیچ میراتێک لە کوژراوەکە ناگرێت.

٣١٣٣ - «عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، فِي رَجُلٍ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، وَجَاءَ بِشُهُودٍ فَرُجِمَتْ؟ قَالَ: يَرِثُهَا».[٢]

واتە: لە قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی پیاوێک کە خێزانەکەی تۆمەتبار کردوە بە زیناو شاهێدی هێناوە و ڕەجم کراوە؟ وتویەتی: میرات لێک دەگرن.

٣١٣٣ - «عَنْ حَمَّادٍ، فِي رَجُلٍ جُلِدَ الْحَدَّ - أَرَاهُ مَاتَ شَكَّ أَبُو النُّعْمَانِ؟ قَالَ: يَتَوَارَثَانِ».[٣]

واتە: لە حەممادەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە جەڵدی حەددی لێدرا ـ پێم وابێ مرد ـ ئەبو نوعمان گومانی لەوەندە هەیە، (حەمماد): وتی: میرات لێک دەگرن.

٣١٣٤ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: الْقَاتِلُ لاَ يَرِثُ وَلاَ يَحْجُبُ».[٤]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی قاتیل نە میرات دەگرێت و نە حوجب دەکات.

٣١٣٥ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: لاَ يُوَرَّثُ الْقَاتِلُ».[٥]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی قاتیل میرات ناگرێت.

٣١٣٦ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: لاَ يَرِثُ قَاتِلٌ خَطَأً وَلاَ عَمْدًا».[٦]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتویەتی: نە قاتیلی بە هەڵە و نە قاتیلی بە ئەنقەست میرات ناگرێت.

٣١٣٧ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: لاَ يَرِثُ الْقَاتِلُ».[٧]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی قاتیل میرات ناگرێت.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على قتادة.

(٣) ـ إسناده صحيح الى حماد.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده ضعيف لانقطاعة.

(٧) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: میراتی مەجوس

٣١٣٨ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: إِذَا اجْتَمَعَ نَسَبَانِ، وُرِّثَ بِأَكْبَرِهِمَا يَعْنِي: الْمَجُوسَ».[١]

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر دوو نەسەب کۆبوونەوە میرات بە نەسەبە گەورە و نزیکەکەیان دەگیرێت، واتە: دەربارەی موجوس (چونکە ئەوان لایان دروستە کچ و دایک و خوشکی خۆیان بخوازن و هاوسەرگیریان لەگەڵ بکەن بۆیە دوو ڕێگای میراتیان بۆ دروست دەبێت).

٣١٣٩- «عَنْ حَمَّادِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، قَالَ: يَرِثُ مِنَ الْجَانِبِ الَّذِي يَصْلُحُ، وَلاَ يَرِثُ مِنَ الْجَانِبِ الَّذِي لاَ يَصْلُحُ».[٢]

واتە: لە حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (کەسی مەجوسی) میرات لەو لایەنە دەگرێت کە دەگونجێ و دروستە (بە پێی شەریعەتی ئیسلام)، وە میرات ناگرێت لەو لایەنەی دروست نیە (بۆ نمونە مەجوسیێک خوشکی خۆی کردبێتە هاوسەر، ئەوە میراتی هاوسەرایەتی وەرناگرێت بەڵکو میراتی خوشکایەتی وەردەگرێت).

٣١٤٠ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ عَلِيًّا، وَابْنَ مَسْعُودٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ فِي الْمَجُوسِ: إِذَا أَسْلَمُوا يَرِثُونَ مِنَ الْقَرَابَتَيْنِ جَمِيعًا».[٣]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی و ئیبنو مەسعود (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەربارەی مەجوس وتویانە: کاتێ مسوڵمان دەبن لە هەردوو سەری خزمایەتی میرات دەگرن بە یەکەوە.

## بابەت: دەربارەی میراتی بەندکراو (ئەسیر)

٣١٤١ - «عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فِي امْرَأَةِ الأَسِيرِ: أَنَّهَا تَرِثُهُ وَيَرِثُهَا».[٤]

واتە: لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی خێزانی کەسی بەندکراو وتویەتی: ئافرەتەکە میراتی لێ دەگرێت و، بەندکراوەکەش میرات لە ئافرەتەکەی دەگرێت.

٣١٤٢ - «عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فِي الأَسِيرِ يُوصِي قَالَ: أُجِيزُ لَهُ وَصِيَّتَهُ مَا دَامَ عَلَى دِينِهِ لَمْ يَتَغَيَّرْ عَنْ دِينِهِ».[٥]

---

(١) ـ إسناده صحيح الى الزهري.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى حمادة بن ابي سليمان.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده حسن إلى عمر بن عبدالعزيز.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی بەندکراو کە وەسێت بکات، وتویەتی: وەسێتەکەی بۆ جێبەجێ دەکرێت مادەم لەسەر دینەکەی مابێت و، لە دینەکەی هەڵنەگەڕابێتەوە.

٣١٤٣ - «عَنْ شُرَيْحٍ، قَالَ: يُوَرَّثُ الأَسِيرُ إِذَا كَانَ فِي أَيْدِي الْعَدُوِّ».(١)

واتە: لە شورەیحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەندکراو میراتی پێ دەدرێت (واتە: پشکی میراتی خۆی بۆ دادەندرێت) ئەگەر لە دەستی دوژمن دابێت.

٣١٤٤ - «حَدَّثَنَا سُفْيَانُ ﷺ، حَدَّثَنِي مَنْ، سَمِعَ إِبْرَاهِيمَ، يَقُولُ: يُوَرَّثُ الأَسِيرُ».(٢)

واتە: لە سوفیانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسێک بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە ئیبڕاهیم ببوو دەیووت: کەسی بەندکراو میراتی پێ دەدرێت (بۆی هەڵدەگیرێت).

٣١٤٥ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ لاَ يُوَرِّثُ الأَسِيرَ».(٣)

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە میراتی نەداوە بە بەندکراو.

## بابەت: دەربارەی میراتی ئەو کەسەی نەسەبێکی بۆ پاڵ دراوە

٣١٤٦ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، إِلَى شُرَيْحٍ أَنْ لاَ يُوَرِّثَ الْحَمِيلَ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ فِي خِرَقِهَا».(٤)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب بۆ شورەیحی نوسی میرات نەدات بەوەی نەسەبێکی بۆ پاڵدراوە (وەک وترابێت: فلان باوکمە یان کوڕمە یان نەوەمە ...هتد) تەنها بە بەڵگە نەبێت، هەرچەندە (ئافرەتێک) منداڵێک بهێنێت لە جلەکانی خۆشیدا (هەر نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی بڵێ: ئەوە منداڵی خۆمە).

٣١٤٧ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: وَرِّثِ الْحَمِيلَ».(٥)

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: میرات بدە بەو کەسەی بانگەشەی نەسەبێکی بۆ کراوە و (نەسەبێکی دراوەتە پاڵ).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٣١٤٨ - «عَنْ ضَمْرَةَ، وَالْفُضَيْلِ بْنِ فَضَالَةَ، وَابْنِ أَبِي عَوْفٍ، وَرَاشِدٍ، وَعَطِيَّةَ، قَالُوا: لاَ يُوَرَّثُ الْحُمَلاَءُ».(١)

واتە: لە ضەمرە و، فوضەیلی کوڕی فەضالە و، ئیبنو ئەبی عەون و، ڕاشید و، عەطییەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: میرات نادرێت بەوانەی بانگەشەی نەسەبێکیان بۆ دەکرێت و نەسەبێکیان دەدرێتە پاڵ (بەبێ بەڵگە).

٣١٤٩ - «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَهُ قَوْلُ مَنْ يَقُولُ فِي الْحَمِيلِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ. وَقَالَ: قَدْ تَوَارَثَ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ بِنَسَبِهِمُ الَّذِي كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ».(٢)

واتە: لە موحەممەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای ئەو باسی بۆچونی ئەو کەسانە کرا کە دەربارەی ئەو کەسانەی نەسەبێکیان بۆ پاڵ دەدرێت قسەیان کردوە (وتویانە میراتیان پێ نادرێت)، جا ئەوەی پێ باش نەبوو و (بە بۆچونەکە ڕازی نەبوو) و وتی: ئەنصارەکان و موهاجیرەکان میراتیان دەگرت بەو نەسەبەی کە لە سەردەمی نەزانی هەیانبووە (کە چەندە عادەتی خراپیشیان تیا بووەو دەکرێ نەسەبی خۆیان نەبوبێت، بەڵام حیساب بۆ گومان ناکرێت، مادەم پاڵ دراون بۆ نەسەبێک ئەو حیسابی بۆ دەکرێت).

٣١٥٠ - «عَنِ الْحَسَنِ، وَابْنِ سِيرِينَ، قَالاَ: لاَ يُوَرَّثُ الْحَمِيلُ إلاَّ بِبَيِّنَةٍ».(٣)

واتە: لە حەسەن و ئیبنو سیرینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەو کەسانەی نەسەبێکیان دەدرێتە پاڵ میراتیان پێ نادرێت تەنها بە بەڵگە نەبێت (واتە: دەبێ بە یەقین ساغ ببێتەوە کە ئەو نەسەبەی دراوەتە پاڵی ڕاستە).

٣١٥١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ ﷺ يُوَرِّثُونَ الْحَمِيلَ».(٤)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکر و، عومەر و، عوسمان ﷺ، میراتیان نەدەدا بەو کەسەی نەسەبێکی دەدرێتە پاڵ (بەبێ بەڵگە).

٣١٥٢ - «عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، قَالَ: أَقَرَّتْ امْرَأَةٌ مِنْ مُحَارِبٍ جَلِيبَةٌ، بِنَسَبٍ أَخٍ لَهَا جَلِيبٍ، فَوَرَّثَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُتْبَةَ، مِنْ أُخْتِهِ».(٥)

واتە: لە ئەشعەثی کوڕی ئەبی شەعثائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک هێنراو دانینا بۆ هۆزی موحاریب بە نەسەبی برایەکی خۆی کە ئەویش هێنرابوو (واتە: وتی ئەوە برای منە، هەردووکیشیان

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

نەسەبەکەیان نەدەزانرا و لە شوێنی ترەوە هێنرابوون بۆ ئەوێ)، جا عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە براکەی کرد بە میراتگری خوشکەکەی.

**٣١٥٣ - «عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ رَجُلٍ قَالَ عِنْدَ فِرَاقِ الدُّنْيَا: أَنَا مَوْلَى فُلاَنٍ، قَالَ: يُرَدُّ مِيرَاثُهُ لِمَنْ سَمَّى أَنَّهُ مَوْلاَهُ عِنْدَ فِرَاقِ الدُّنْيَا إلاَّ أَنْ يَأْتُوا عَلَيْهِ بِبَيِّنَةٍ بِغَيْرِ ذَلِكَ يَرُدُّونَ بِهِ قَوْلَهُ، فَيُرَدُّ مِيرَاثُهُ إِلَى مَا قَامَتْ بِهِ الْبَيِّنَةُ».[١]**

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە لە کاتی جیابوونەوە لە دونیا (لە کاتی مردنیدا) وتی: من بەندەی فڵانە کەسم، وتویەتی: میراتەکەی دەگەڕێندرێتەوە و دەدرێت بەو کەسەی کە ناوی هێناوە، بەوەی لەکاتی مردنیدا وتویەتی ئەو گەورەکەمە، تەنها لەو حاڵەتە نەبێت کە (کەسانی دیکە) بەڵگە بهێننەوە بە جگە لەوەی ئەو کەسە وتویەتی و قسەکەی پێ ڕەت بکەنەوە، ئەو کات میراتەکەی دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە بەڵگەی هەیە.

## بابەت: دەربارەی میراتی منداڵی زینا

**٣١٥٤ - «عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: وَلَدُ الزِّنَا بِمَنْزِلَةِ ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ».[٢]**

واتە: لە عەلی و عەبدوڵڵاوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویانە: منداڵی زینا وەک منداڵی ئافرەتی مولاعەنە لەگەڵکراوە (واتە: وەک ئەو میراتەکەی بۆ دایکی و خزمەکانی دایکیەتی).

**٣١٥٥ - «عَنِ الْحَسَنِ بْنِ الْحُرِّ، حَدَّثَنِي الْحَكَمُ: أَنَّ وَلَدَ الزِّنَا لاَ يَرِثُهُ الَّذِي يَدَّعِيهِ، وَلاَ يَرِثُهُ الْمَوْلُودُ».[٣]**

واتە: لە حەسەنی کوڕی حوڕڕەوە گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): حەکەم بۆی گێڕامەوە، وتی: ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە منداڵی زینا هی ئەوە لەو بووە میراتی لێ ناگرێت، وە منداڵەکەش میرات لەو ناگرێت (چونکە نەسەب دانامەزرێت بە بانگەشەی بێ بەڵگە).

**٣١٥٦ - «عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ: أَنَّهُ كَانَ لاَ يُوَرِّثُ وَلَدَ الزِّنَا، وَإِنْ ادَّعَاهُ الرَّجُلُ».[٤]**

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەینەوە گێڕدراوەتەوە کە میراتی نەداوە بە منداڵی زینا، هەر چەندە پیاوەکەش بانگەشەی کردبێت کە منداڵەکە لەوە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الحكم بن عتبة.

(٤) ـ إسناده قوي.

٣١٥٧ - «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أَتَى إِلَى غُلَامٍ يَزْعُمُ أَنَّهُ ابْنٌ لَهُ، وَأَنَّهُ زَنَى بِأُمِّهِ وَلَمْ يَدَّعِ ذَلِكَ الْغُلَامَ أَحَدٌ، فَهُوَ يَرِثُهُ، قَالَ بُكَيْرٌ: وَسَأَلْتُ عُرْوَةَ، عَنْ ذَلِكَ - فَقَالَ مِثْلَ قَوْلِ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ - وَقَالَ عُرْوَةُ: بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ».[1]

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر پیاوێک هات بۆ لای منداڵێک و وتی: ئەو کوڕی خۆیەتی و زینای لەگەڵ دایکی کردوە، کەسیش بانگەشەی ئەوەی بۆ منداڵەکە نەکرد (واتە: باوکیشی نەزانرا)، ئەوە میراتی لێ دەگرێت، بوکەیر وتویەتی: پرسیارم لە عورِوە کرد دەربارەی ئەمە، ئەویش هەمان قسەی سولەیمانی کوڕی یەساری کرد، هەروەها عورِوە وتویەتی: پێمان گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵ بۆ سەرجێیە (واتە: بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیە و ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی)، وە بۆ کەسی داوێن پیسیش بەرد هەیە (واتە: هیچی ناکەوێ و میرات ناگرێت، وە ڕەجمیش دەکرێت ئەگەر خێزاندار بێت).

٣١٥٨ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: ابْنُ الْمُلَاعَنَةِ مِثْلُ وَلَدِ الزِّنَا، تَرِثُهُ أُمُّهُ، وَوَرَثَتُهُ، وَرَثَةُ أُمِّهِ».[2]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: منداڵی ئافرەتی مولاعەنەکراو وەک منداڵی زینا وایە، دایکی و، میراتگرەکانی خۆی و، میراتگرەکانی دایکی، میراتی لێ دەگرێت.

٣١٥٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لاَ يُوَرَّثُ وَلَدُ الزِّنَا».[3]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: میرات ناگیرێت لە منداڵی زینا.

٣١٦٠ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، فِي أَوْلَادِ الزِّنَا قَالَ: يَتَوَارَثُونَ مِنْ قِبَلِ الْأُمَّهَاتِ، وَإِنْ وَلَدَتْ تَوْأَمًا فَمَاتَ، وَرِثَ السُّدُسَ».[4]

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی منداڵانی زینا وتویەتی: میرات لێک دەگرن لەلای دایکانەوە (واتە: لەگەڵ دایکی و خزمی دایکی میرات لێک دەگرن)، جا ئەگەر ئافرەتەکە منداڵەکەی بوو و خۆی مرد، ئەوە منداڵەکە شەش یەک دەگرێت.

٣١٦١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لاَ يَرِثُ وَلَدُ الزِّنَا، إِنَّمَا يَرِثُ مَنْ لَمْ يُقَمْ عَلَى أَبِيهِ الْحَدُّ، أَوْ تُمْلَكْ أُمُّهُ بِنِكَاحٍ أَوْ شِرَاءٍ».[5]

---

(١) ـ إسناده ضعيف لكن المرفوع منه صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى ابراهيم.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: منداڵی زینا میرات ناگرێت، تەنها ئەوە میرات دەگرێت کە حەددی زینا جێبەجێ نەکرابێت لەسەر باوکی، یان دایکی کرابێتە موڵک، جا بە هۆی مارەکردن بێت یان کرین (واتە: نابێ منداڵی زینا بێت بە یەقینی).

٣١٦٢ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الرَّجُلِ يَفْجُرُ بِالْمَرْأَةِ، ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا، قَالَ: لاَ بَأْسَ، إلاَّ أَنْ تَكُونَ حُبْلَى، فَإِنَّ الْوَلَدَ لاَ يَلْحَقُهُ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی بەد ئەخلاقی و زینا لەگەڵ ئافرەتێکدا دەکات و دواتر دەیکات بە خێزانی خۆی، وتویەتی: کێشەی تیا نیە (دەبێتە خێزانی)، تەنها ئەگەر دوو گیان بوو (لە زیناکە)، ئەوە منداڵەکە نابێتە هی ئەو (کەواتە: دەبێتە منداڵی ژنەکە نەک منداڵی پیاوەکە، چونکە نەسەب تەنها بۆ خاوەنی عەقدی شەرعی جێگیر دەبێت).

٣١٦٣ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أن رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى أَنَّ كُلَّ مُسْتَلْحَقٍ اسْتُلْحِقَ بَعْدَ أَبِيهِ الَّذِي يُدْعَى لَهُ ادَّعَاهُ وَرَثَتُهُ بَعْدَهُ، فَقَضَى إِنْ كَانَ مِنْ أَمَةٍ يَمْلِكُهَا يَوْمَ يَطَؤُهَا، فَقَدْ لَحِقَ بِمَنِ اسْتَلْحَقَهُ، وَلَيْسَ لَهُ فيمَّا قُسِمَ قَبْلَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ شَيْءٌ، وَمَا أَدْرَكَ مِنْ مِيرَاثٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَلَهُ نَصِيبُهُ، وَلاَ يَلْحَقُ إِذَا كَانَ الَّذِي يُدْعَى لَهُ أَنْكَرَهُ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَمَةٍ لاَ يَمْلِكُهَا، أَوْ حُرَّةٍ عَاهَرَهَا، فَإِنَّهُ لاَ يَلْحَقُ وَلاَ يَرِثُ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي يُدْعَى لَهُ هُوَ ادَّعَاهُ، فهُوَ وَلَدُ زِنَا لأَهْلِ أُمِّهِ مَنْ كَانُوا حُرَّةً، أَوْ أَمَةً».[٢]

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداوە هەموو منداڵێکی نەسەب پاڵدراو کە نەسەبەکەی پاڵدەدرا دوای (مردنی) ئەو باوکەی کە پاڵ دەدرا بۆ لای و میراتگرانی پیاوەکە دوای ئەو داوایان کرد، بڕیارەکەی ئاوادا: ئەگەر منداڵەکە لە ئافرەتێکی کۆیلە بێت کە پیاوەکە کڕیویەتی لەو ڕۆژەی لەگەڵی جووت بووە، ئەوە نەسەبەکەی دەدرێتە پاڵ ئەوەی داوای پاڵدانی نەسەبەکەی دەکات (بۆ لای خۆی)، وە هیچی بۆ نیە لەوەی دابەش کراوە لە میراتەکەی بەر لە ئەو، وە ئەوەندەی وێشڕاگەیشت لە میراتەکە کە دابەش نەکرابوو، ئەوە پشکی خۆی بۆ هەیە، (بەڵام) نەسەبەکە پاڵ نادرێت ئەگەر ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکرێت (کە منداڵەکە هی ئەو بێت) ئەویش ئینکاری بکات، وە ئەگەر منداڵەکە لە ئافرەتێکی کۆیلە بوو کە پیاوەکە نەیکڕی بوو، یان ئافرەتەکە ئافرەتێکی ئازاد بوو پیاوەکە زینای لەگەڵ کردبوو، ئەوە پاڵ نادرێت (بۆ لای) و میرات ناگرێت (لێی)، وە ئەگەر ئەو کەسەی بانگەشەی بۆ دەکرێت (کە منداڵەکە هی ئەوە) خۆی بانگەشەی دەکرد، ئەوە منداڵی زینایە (میراتەکەی) بۆ خزمی دایکیەتی (جا دایکەکە) چ ئازاد بێت چ کویلە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

٣١٦٤ - «عَنْ عُمَيْرِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: سَأَلْتُ الشَّعْبِيَّ، عَنْ مَمْلُوكٍ لِي وَلَدُ زِنًا قَالَ: لاَ تَبِعْهُ، وَلاَ تَأْكُلْ ثَمَنَهُ، وَاسْتَخْدِمْهُ».[١]

واتە: لە عومەیری کوڕی یەزیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە شەعبی کرد دەربارەی بەندەیەکی خۆم کە منداڵی زینا بوو، وتی: نەیفرۆشیت و پارەکەی نەخۆیت (واتە: پارەی فرۆشتنەکەی)، (بەڵکو) بەکاری بهێنە.

٣١٦٥ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، سُئِلَ عَنْ وَلَدِ زِنَا يَمُوتُ، قَالَ: إِنْ كَانَ ابْنَ عَرَبِيَّةٍ وَرِثَتْ أُمُّهُ الثُّلُثَ، وَجُعِلَ بَقِيَّةُ مَالِهِ فِي بَيْتِ الْمَالِ، وَإِنْ كَانَ ابْنَ مَوْلاَةٍ، وَرِثَتْ أُمُّهُ الثُّلُثَ، وَوَرِثَ مَوَالِيهَا الَّذِينَ أَعْتَقُوهَا مَا بَقِيَ، قَالَ مَرْوَانُ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا «يَقُولُ ذَلِكَ».[٢]

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، پرسیاری لێکرا دەربارەی منداڵی زینا کە دەمرێت (ئایا میراتی بۆ کێیە)، وتی: ئەگەر منداڵەکە هی ئافرەتێکی ئازاد بوو، ئەوە دایکی سێیەکی میراتەکە دەگرێت و ئەوەی دەشمێنێتەوە لە سەروەتەکە دەدرێت بە خەزێنەی گشتی مسوڵمانان، ئەگەریش منداڵەکە هی ئافرەتێکی بەندەی ئازادکراو بوو، ئەوە دایکی سێیەکی میراتەکە دەگرێت و گەورەکانیشی کە ئازادیان کردوە ئەوەی تر دەگرن کە ماوەتەوە، مەڕوان وتویەتی: هەروەها گوێم لە مالیکیش بوو ئاوای دەووت.

٣١٦٦ - «حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: قَضَى بِمِيرَاثِ ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ لأُمِّهِ كُلِّهِ لِمَا لَقِيَتْ فِيهِ مِنَ الْعَنَاءِ».[٣]

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا بەوەی میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنەکراو بۆ دایکی بێت لەبەر ئەو ناخۆشی و زەحمەتەی بەهۆیەوە توشی بووە (چونکە لەسەر ئەو منداڵە تۆمەتی زینای دراوەتە پاڵ).

٣١٦٧ - «عَنْ عَلِيٍّ ؓ، أَنَّهُ قَالَ فِي وَلَدِ الزِّنَا لأَوْلِيَاءِ أُمِّهِ: خُذُوهُ إِنَكُمْ تَرِثُونَهُ، وَتَعْقِلُونَهُ، وَلاَ يَرِثُكُمْ».[٤]

واتە: لە عەلیەوە ؓ گێڕدراوەتەوە کە دەربارەی منداڵی زینا بە خزمانی دایکی منداڵەکەی وت: منداڵەکە ببەن ئێوە میراتی لێ دەگرن و دیە و بەدەل خوێنیشی وەردەگرن (کاتێ بکوژرێت)، (بەڵام) ئەو میراتتان لێ ناگرێت.

---

(١) ـ إسناده حسن إلى الشعبي.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: میراتی کۆیلەی سائیبە

٣١٦٨ - «عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: السَّائِبَةُ يَضَعُ مَالَهُ حَيْثُ شَاءَ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ: قَالَ شُعْبَةُ: لَمْ يَسْمَعْ هَذَا مِنْ سَلَمَةَ أَحَدٌ غَيْرِي».(١)

واتە: لە ئەبو عەمری شەیبانیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: بەندەی سائیبە ماڵەکەی دەدات بەوەی خۆی دەیەوێت.

تێبینی: کۆیلەی سائیبە بریتیە لەو بەندەیەی خاوەنەکەی پێی دەڵێت: برۆ تۆ ئازاد بوویت و، هیچمان لە نێوان نەما و میراتەکەشت و وەلائەکەشتم ناوێت.

٣١٦٩ - «عَنْ الْحَسَنِ، سُئِلَ عَنْ مِيرَاثِ السَّائِبَةِ، فَقَالَ: كُلُّ عَتِيقٍ سَائِبَةٌ».(٢)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی میراتی کۆیلەی سائیبە، ئەویش وتویەتی: هەموو ئازادکراوێک سائیبەیە.

٣١٧٠- «عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: الصَّدَقَةُ، وَالسَّائِبَةُ لِيَوْمِهِمَا أَوْ لِوَقْتِهِمَا».(٣)

واتە: لە ئەبو عوسمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتویەتی: صەدەقە و، کۆیلەی سائیبە (کە بەیەکجاری ئازاد دەکرێت لە هەموو شتێکدا) بۆ ڕۆژی خۆیانە یان بۆ کاتی خۆیانە (واتە: پاداشتەکەی بۆ ڕۆژو کاتی قیامەتە).

٣١٧١ - «حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا، قَالَ: سُئِلَ عَامِرٌ، عَنْ الْمَمْلُوكِ يُعْتَقُ سَائِبَةً لِمَنْ وَلَاؤُهُ؟ قَالَ: لِلَّذِي أَعْتَقَهُ».(٤)

واتە: لە زەکەریاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە عامیر کرا دەربارەی ئەو بەندەیەی ئازاد دەکرێت بە سائیبەیی کە ئایا وەلائەکەی بۆ کێیە؟ وتی: بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردوە.

٣١٧٢ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: مَاتَ مَوْلًى عَلَى عَهْدِ عُثْمَانَ ﷺ، لَيْسَ لَهُ وَالٍ، فَأَمَرَ بِمَالِهِ فَأُدْخِلَ بَيْتَ الْمَالِ».(٥)

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى عمر الشعبي.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەمڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەندەیەک مرد لە سەردەمی ئیمامی عوسمان ﷺ و هیچ گەورەیەکی نەبوو، جا عوسمان فەرمانی کرد بەوەی ماڵەکەی (بدرێت بە خەزێنەی گشتی مسوڵمانان) و خرایە ناو خەزێنەی گشتی مسوڵمانان.

٣١٧٣ - «عَنْ مَسْرُوقٍ، فِي رَجُلٍ مَاتَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَوْلَى عَتَاقَةٍ قَالَ: مَالُهُ حَيْثُ أَوْصَى بِهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَوْصَى، فَهُوَ فِي بَيْتِ الْمَالِ».[١]

واتە: لە مەسروقەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی پیاوێک کە مرد و هیچ گەورەیەکی ئازادکردنی نەبوو، وتی: ماڵەکەی (سەرف دەکرێت) بەو شێوەیەی وەسێتی پێ کردوە، جا ئەگەر وەسێتی نەکردبوو، ئەوە بۆ خەزێنەی گشتی مسوڵمانانە.

٣١٧٤ - «عَنْ ضَمْرَةَ، وَرَاشِدِ بْنِ سَعْدٍ، وَغَيْرِهِمَا، قَالُوا فِيمَنْ أُعْتِقَ سَائِبَةً: إِنَّ وَلاَءَهُ لِمَنْ أَعْتَقَهُ، إِنَّمَا سَيَّبَهُ مِنَ الرِّقِّ، وَلَمْ يُسَيِّبْهُ مِنَ الْوَلاَءِ».[٢]

واتە: لە ضەمرە و ڕاشیدی کوڕی سەعد و جگە لەوانیش گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو کەسەی بەندە ئازاد دەکات بە شێوازی سائیبە، وتویانە: ولائەکەی بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردوە (وەلائی هەر دەمێنێت تا بەهۆیەوە میراتی لێ بگرێت)، (چونکە) تەنها لە ئازادکردن سائیبەی کردوە، سائیبەی نەکردوە لە وەلاء (کەواتە: وەلائەکەی هەر دەمێنێت کە بەهۆیەوە میراتی لێ دەگرێت).

٣١٧٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَالشَّعْبِيِّ، قَالاَ: لاَ بَأْسَ بِبَيْعِ وَلاَءِ السَّائِبَةِ وَهِبَتِهِ».[٣]

واتە: لە ئیبراهیم و شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: کێشە نیە لە فرۆشتنی وەلائی بەندەی سائیبە و کردنە دیاری (وەلائەکە).

٣١٧٦ - «عَنْ الْقَاسِمِ، قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ غُلاَمًا سَائِبَةً، فَأَتَى عَبْدَ اللهِ ﷺ، وَقَالَ: إِنِّي أَعْتَقْتُ غُلاَمًا لِي سَائِبَةً وَهَذِهِ تَرِكَتُهُ. قَالَ: هِيَ لَكَ، قَالَ: لاَ حَاجَةَ لِي فِيهَا، قَالَ: فَضَعْهَا فَإِنَّ هَاهُنَا وَارِثًا كَثِيراً».[٤]

واتە: لە قاسمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک بەندەیەکی ئازاد کردبوو بە سائیبە، جا هات بۆ لای عەبدوڵڵا ﷺ و وتی: من بەندەیەکی خۆم ئازاد کرد بە سائیبە و ئەوەش میراتەکەیەتی، عەبدوڵڵا وتی: (میراتەکە) هی تۆیە، کابراش وتی: من پێویستیم پێی نیە، عەبدوڵڵا وتی: کەواتە: دایبنێ، لێرەدا میراتگری زۆر هەن (واتە: دەیدەم بە مسوڵمانانی خاوەن پێویستی).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن لغيره.

## بابەت: میراتی منداڵ

٣١٧٧ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ، وُرِّثَ وَصُلِّيَ عَلَيْهِ».(١)

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ منداڵ دەنگی لێوەهات (لە کاتی لەدایک بوون، یان نیشانەیەکی زیندوویەتی پێوە دیار بوو و دواتر مرد) ئەوە میراتی پێ دەدرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت.

٣١٧٨ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ وَرِثَ وَوُرِثَ وَصُلِّيَ عَلَيْهِ».(٢)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ منداڵ دەنگی لێوەهات (لە کاتی لە دایک بوون، یان نیشانەیەکی زیندویەتی پێوە بوو و دواتر مرد) ئەوە میرات دەگرێت و میراتی لێ دەگیرێت و نوێژیشی لەسەر دەکرێت.

٣١٧٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: لَيْسَ مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ اسْتَهَلَّ، وَاسْتِهْلاَلُهُ بِعَصْرِ الشَّيْطَانِ بَطْنَهُ. فَيَصِيحُ إِلاَّ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ».(٣)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ منداڵێکی لەدایکبوو نیە حەتمەن دەنگی لێوەدێ، دەنگ لێوە هاتنەکەشی بە هۆی گوشینی سکیەتی لەلایەن شەیتانەوە، بۆیە دەقیژێنێ، تەنها عیسای کوڕی مەریەم نەبێت (شەیتان نەیتوانی نزیکی بکەوێتەوە، بۆیە لە قیژەی نەدا).

٣١٨٠- «عَنْ مَكْحُولٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَرِثُ الْمَوْلُودُ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخًا، وَإِنْ وَقَعَ حَيًّا».(٤)

واتە: لە مەکحولەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵی لەدایکبوو میرات ناگرێت تاوەکو دەنگی لێوە نەیەت بە زیرە، هەر چەندە بە زیندوویش لە دایکی بکەوێتە خوارەوە و (لە دایک ببێت).

٣١٨١ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ، صُلِّيَ عَلَيْهِ وَوُرِثَ».(٥)

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ منداڵی لە دایکبوو دەنگی لێوەهات، ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێت و میراتی پێ دەدرێت.

---

(١) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده مرسل بسند صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح.

٣١٨٢ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَرَى الْعُطَاسَ اسْتِهْلَالاً».[١]

واتە: لە زوهریەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێم وایە پشمین ئیستیهلالە (واتە: پشمینیش بەو ئیستهلالە حیسابە کە مەرجە بۆ میرات و نوێژ لەسەر کردن).

٣١٨٣ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لاَ يُوَرَّثُ الْمَوْلُودُ حَتَّى يَسْتَهِلَّ، وَلاَ يُصَلَّى عَلَيْهِ حَتَّى يَسْتَهِلَّ، فَإِذَا اسْتَهَلَّ، صُلِّيَ عَلَيْهِ وَوُرِّثَ، وَكُمِّلَتِ الدِّيَةُ».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: میرات نادرێت بە منداڵی لەدایکبوو تاوەکو دەنگی لێوە نەیەت، وە نوێژیشی لەسەر ناکرێت تاوەکو دەنگی لێوە نەیەت، جا ئەگەر دەنگی لێوە هات ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێت و میراتی پێ دەدرێت و دیە و بەدەل خوێنیشی کامل دەبێت (واتە: وەک کەسێکی تەواو حیسابی بۆ دەکرێت).

٣١٨٤ - «عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، وَسَأَلْنَاهُ عَنِ السِّقْطِ فَقَالَ: لاَ يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَلاَ يُصَلَّى عَلَى مَوْلُودٍ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخًا».[٣]

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێردراوەتەوە، (یونس وتویەتی): پرسیارمان لێ کرد دەربارەی منداڵی لەبارچوو، ئەویش وتی: نوێژی لەسەر ناکرێت، هەروەها نوێژ لەسەر هیچ لەدایکبوێک ناکرێت تاوەکو دەنگی لێوە نەیەت بە زیرە.

## بابەت: دەربارەی خزمایەتی ئازادکردنی کۆیلەی نوسراوپێدراو

٣١٨٥ - «عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: إِذَا ابْتَاعَ الْمُكَاتَبَانِ أَحَدُهُمَا الآخَرَ: هَذَا هَذَا مِنْ سَيِّدِهِ، وَهَذَا هَذَا مِنْ سَيِّدِهِ، فَالْبَيْعُ لِلأَوَّلِ. وَيَقُولُ: أَهْلُ الْمَدِينَةِ: الْوَلاَءُ لِسَيِّدِ الْبَائِعِ. وَيَقُولُونَ: إِنَّمَا ابْتَاعَ هَذَا مَا عَلَى الْمُكَاتَبِ، فَالْوَلاَءُ لِلسَّيِّدِ».[٤]

واتە: لە قەتادەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر دوو بەندە نوسراوپێدراوەکان هەر یەکێکیان ئەوەی تری کڕیەوە: ئەمەیان ئەوەی کڕیەوە لە گەورەکەی، ئەوەشیان ئەمەی کڕیەوە لە گەورەکەی، ئەوە بەیع و مامەڵەکە بۆ یەکەمەکەیە، ئەهلی مەدینەش دەیانووت: خزمایەتی ئازادکردن بۆ گەورەی کڕیارەکەیە، وە دەیانووت: ئەمەیان تەنها ئەوەی کڕیوە کە لەسەر بەندەی نوسراوپێدراوە (وەلاء ناگرێتەوە)، کەواتە: وەلائو خزمایەتی ئازادکردن بۆ گەورەکەیەتی (نەک بۆ خۆی).

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الزهري.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح الى قتادة.

## بابەت: دەربارەی کەسی ئازاد کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی کۆیلەدا دەکات

٣١٨٦ - «عَنْ سَعِيدٍ، أَنَّ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَيُّمَا حُرٌّ تَزَوَّجَ أَمَةً، فَقَدْ أَرَقَّ نِصْفَهُ، وَأَيُّمَا عَبْدٍ يَتَزَوَّجُ حُرَّةً، فَقَدْ أَعْتَقَ نِصْفَهُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَعْنِي: الْوَلَدَ».[١]

واتە: لە سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی: هەر پیاوێکی ئازاد ئافرەتێکی کۆیلە بخوازێت و بیکات بە هاوسەری، ئەوە نیوەی خۆی کردۆتە بەندە، وە هەر بەندەیەکی پیاو هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی ئازاد بکات، ئەوە نیوەی خۆی ئازاد کردوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: یەعنی: منداڵەکە (واتە: مەبەستی بە نیوە ئازادکردن و نیوە کردنە کۆیلە بریتیە لە منداڵەکەی، کە لە نێوانیان لەدایک دەبێت).

## بابەت: میراتی خزمایەتی ئازادکردن

٣١٨٧ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي الْعَبْدِ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ ثُمَّ يُطَلِّقُهَا وَلَهُ مِنْهَا وَلَدٌ؟ قَالَ: إِنْ كَانَتْ حُرَّةً، فَالنَّفَقَةُ عَلَى أُمِّهِ، وَإِنْ كَانَ عَبْدًا - يَعْنِي: الصَّبِيَّ - فَعَلَى مَوَالِيهِ».[٢]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو بەندەیەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکدا دەکات و دواتر تەڵاقی دەدات لەکاتێکدا منداڵێکی لە ئافرەتەکە هەیە؟ (شەعبی) وتویەتی: ئەگەر ئافرەتەکە ئازاد بێت، ئەوە نەفەقەکە (واتە: نەفەقە کێشانی منداڵەکە) لەسەر دایکیەتی، وە ئەگەر منداڵەکە کۆیلە بوو (لەبەر ئەوەی دایکیشی کۆیلە بوو)، ئەوە نەفەقەکە لەسەر گەورەکانیەتی.

٣١٨٨ - «عَنْ عامِرٍ وإِبْرَاهِيمَ، أَنَّهُمَا قَالاَ: وَلاَؤُهُ لِمَنْ بَدَأَ بِالْعِتْقِ أَوَّلَ مَرَّةٍ».[٣]

واتە: لە عامیرو ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: وەلاء و خزمایەتی ئازادکردن بۆ ئەو کەسەیە کە سەرەتا دەست دەکات بە ئازاد کردن.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح بفرعيه.

## بابەت: دەربارەی ئەو بەندەیەی لە نێوان دوو كەسە (واتە: كۆیلەی دوو كەسە لە یەک كاتدا) و یەكێكیان پشكەكەی خۆی ئازاد دەكات

٣١٨٩ - «عن عامر وعَنْ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّهُمَا قَالاَ: إِنْ ضَمِنَ، كَانَ الْوَلاَءُ لَهُ، وَإِنْ اسْتَسْعَى الْعَبْدُ، كَانَ الْوَلاَءُ بَيْنَهُمْ».[١]

واتە: لە عامیر و ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەگەر زەمانەتی كرد (واتە: دوای ئازادكردنی پشكی خۆی زەمانەتی پشكی شەریكەكانی تری كرد و وتی: من دەیدەم)، ئەوە خزمایەتی ئازادكردن بۆ ئەوە، وە ئەگەر بەندەكە خۆی هەوڵی كاسبی و پارە پەیدا كردنیدا بۆ خۆكڕینەوە لە شەریكەكانی تر، ئەوە خزمایەتی ئازادكردن بۆ گشتیانە.

٣١٩٠ - «عَنْ عَامِرٍ، فِي عَبْدٍ بَيْنَ رَجُلَيْنِ أَعْتَقَ أَحَدُهُمَا نَصِيبَهُ، فَقَالَ: يُتَمِّمُ عِتْقَهُ. فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ، اسْتُسْعِيَ الْعَبْدُ فِي النِّصْفِ بِقِيمَةِ عَدْلٍ، وَالْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ».[٢]

واتە: لە عامیرەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو بەندەیەک كە لە نێوان دوو كەس بێت (بەندەی دوو كەس بێت) و، یەكێكیان پشكەكەی خۆی ئازاد بكات، وتویەتی: ئازادكردنەكەی تەواو دەكرێت، جا ئەگەر ماڵ و سەروەتی نەبوو داوا لە بەندەكە دەكرێت هەوڵبدات پارەی نیوەكەیتر پەیدا بكات بە كاركردن بە خەمڵاندنی كەسێكی دادپەروەر (واتە: كەسێكی دادپەروەر نیوەكە دیاری بكات)، وە خزمایەتی ئازادكردنەكەش بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی كردووە.

٣١٩١ - «عَنْ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، فِي عَبْدٍ بَيْنَ رَجُلَيْنِ أَعْتَقَ أَحَدُهُمَا نَصِيبَهُ وَأَمْسَكَهُ الآخَرُ. قَالَ: مِيرَاثُهُ بَيْنَهُمَا».[٣]

واتە: لە طاووسەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە دەربارەی بەندەیەک كە لە نێوان دوو پیاودا بێت (كۆیلەی دوو كەس بێت بە هاوبەشی)، یەكێكیان پشكەكەی خۆی ئازاد بكات و ئەوەی تریشیان ئازادی نەكات، وتویەتی: میراتەكەی بۆ هەردووكیانە (بە هاوبەشی).

٣١٩٢ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: مِيرَاثُهُ لِلَّذِي أَمْسَكَهُ وَقَالَ قَتَادَةُ ﷺ: هُوَ لِلْمُعْتِقِ كُلُّهُ، وَثَمَنُهُ عَلَيْهِ، وَيَقُولُهُ أَهْلُ الْكُوفَةِ».[٤]

---

(١) ـ إسناده صحيح بفرعيه.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: میراتەکەی بۆ ئەو کەسەیە کە پشکەکەی خۆی ئازاد ناکات، قەتادەش ﷺ وتویەتی: میراتەکە گشتی بۆ ئازادکەرەکەیە و پارەکەشی (واتە: پارەی نیوەکەی تریشی) لەسەر ئەوە، ئەهلی کوفەش هەر ئاوایان دەووت.

## بابەت: ئەوەی بۆ ئافرەتان هەیە لە خزمایەتی ئازادکردن

٣١٩٣ - «عَنْ عَطَاءٍ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَمُوتُ وَيَتْرُكُ مُكَاتَبًا، وَلَهُ بَنُونَ وَبَنَاتٌ، أَيَكُونُ لِلنِّسَاءِ مِنَ الْوَلَاءِ شَيْءٌ؟ قَالَ: تَرِثُ النِّسَاءُ مِمَّا عَلَى ظَهْرِهِ مِنْ مُكَاتَبَتِهِ، وَيَكُونُ الْوَلَاءُ لِلرِّجَالِ دُونَ النِّسَاءِ، إِلاَّ مَا كَاتَبْنَ أَوْ أَعْتَقْنَ».[١]

واتە: لە عەطائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی کە دەمرێت و بەندەیەکی نوسراوپێدراو دوای خۆی جێدەهێڵێت، لە کاتێکدا چەند کوڕو کچێکی هەیە، ئایا هیچ خزمایەتیەکی ئازادکردن بۆ ئافرەت هەیە؟ وتی: ئافرەت میرات دەگرن لەوەی لەسەر پشتیەتی لە نوسراوپێدانەکەی (واتە: میرات لەو قیستە دەگرن کە دەبێ بەندەی نوسراوپێدراو بیدات بۆ کڕینەوەی خۆی)، وەلائو خزمایەتی ئازادکردنیش بۆ پیاوانە نەک ئافرەتان، تەنها (لەو حاڵەتەی) خۆیان موکاتەبە لەگەڵ بەندەکەدا دەکەن یان خۆیان ئازادی دەکەن ئەو کاتە وەلائو خزمایەتی ئازادکردنیان بۆ هەیە.

٣١٩٤ - «عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: لاَ تَرِثُ النِّسَاءُ مِنَ الْوَلاَءِ إِلاَّ مَا أَعْتَقْنَ أَوْ أَعْتَقَ مَنْ أَعْتَقْنَ».[٢]

واتە: لە طاووسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتان میرات لە خزمایەتی ئازادکردن ناگرن (واتە: وەلائی بەندەیان بۆ نیە) تەنها لەوە نەبێت کە خۆیان ئازادی دەکەن یان کەسێک بەندەی ئازاد کردوە کە ئەوان کەسەکەیان ئازاد کردوە.

٣١٩٥ - «عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: تُوُفِّيَ رَجُلٌ وَتَرَكَ مُكَاتَبًا، ثُمَّ مَاتَ الْمُكَاتَبُ وَتَرَكَ مَالاً، فَجَعَلَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، مَا بَقِيَ مِنْ مُكَاتَبَتِهِ بَيْنَ بَنِي مَوْلاَهُ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ عَلَى مِيرَاثِهِمْ، وَمَا فَضَلَ مِنَ الْمَالِ بَعْدَ كِتَابَتِهِ، فَلِلرِّجَالِ مِنْهُمْ مِنْ بَنِي مَوْلاَهُ دُونَ النِّسَاءِ».[٣]

واتە: لە یەحیای کوڕی ئەبی کەثیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وەفاتی کرد و بەندەیەکی نوسراوپێدراوی دوای خۆی جێهێشت، دواتر بەندە نوسراوپێدراوەکەش مرد و ماڵ و سەروەتی دوای خۆی جێهێشت، جا ئیبنو موسەییب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدورڕەحمان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) ئەوەی مایەوە لە قستی موکاتەبەکە بۆ منداڵەکانی گەورەکەی بە پیاوو ژنەوە خستویانەتە سەر میراتەکەیان، جا ئەوەی مایەوە دوای قستی موکاتەبەکەی، بۆ پیاوەکانە لە منداڵەکانی گەورەکەی نەک بۆ ئافرەتەکان.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى أبي سلمة.

٣١٩٦ - «عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَزَيْدٍ ﷺ، أَنَّهُمْ قَالُوا: الْوَلاَءُ لِلْكُبْرِ، وَلاَ يُوَرِّثُونَ النِّسَاءَ مِنَ الْوَلاَءِ إلاَّ مَا أَعْتَقْنَ أَوْ كَاتَبْنَ».(١)

واتە: لە عومەر و عەلی و زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویانە: خزمایەتی ئازادکردن بۆ گەورەترینە (لە مناڵانی ئازادکەرەکە)، وە ئافرەتان میرات ناگرن لە وەلاء و خزمایەتی ئازادکردندا، تەنها لەو کاتە نەبێت کە خۆیان بەندە ئازاد بکەن یان موکاتەبە بکەن.

٣١٩٧ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ».(٢)

واتە: لە ئەبو قیلابەوە ئەم شوێنە وا گێڕدراوەتەوە.

٣١٩٨ - «حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ».(٣)

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییب هەمان شوێنەوار گێڕدراوەتەوە.

٣١٩٩ - «حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُمْ قَالُوا: لاَ تَرِثُ النِّسَاءُ مِنَ الْوَلاَءِ إلاَّ مَا أَعْتَقْنَ أَوْ كَاتَبْنَ».(٤)

واتە: لە (ئەبو قیلابە و سەعیدی کوڕی موسەییب و) سولەیمانی کوڕی یەسارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئافرەتان میرات ناگرن لە وەلاء و خزمایەتی ئازادکردن تەنها ئەو کاتە نەبێت کە خۆیان بەندە ئازاد دەکەن، یان موکاتەبە دەکەن.

٣٢٠٠ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: لاَ تَرِثُ النِّسَاءُ مِنَ الْوَلاَءِ إلاَّ مَا أَعْتَقْنَ أَوْ أَعْتَقَ مَنْ أَعْتَقْنَ، إلاَّ الْمُلاَعَنَةُ فَإِنَّهَا تَرِثُ مَنْ أَعْتَقَ ابْنُهَا الَّذِي انْتَفَى مِنْهُ أَبُوهُ».(٥)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتان میرات ناگرن لە وەلاء و خزمایەتی ئازادکردن، تەنها لەو حاڵەتە نەبێت کە خۆیان بەندە ئازاد دەکەن، یان کەسێک بەندە ئازاد دەکات کە ئەوان ئازادیان کردبێت، تەنها (ئافرەتی) مولاعەنە لەگەڵکراو نەبێت، ئەویان میراتی ئەو کەسە دەگرێت کە کوڕەکەی ئازادی کردوە، ئەو کوڕەی باوکەکەی خۆی لێ بەری کردوە (وتویەتی لە من نیە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى أبي قلابة.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى سعيد بن المسيب.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٣٢٠١ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ كَانَ يَرِثُ مَوَالِيَ عُمَرَ دُونَ بَنَاتِ عُمَرَ».(١)

واتە: لە سالمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە میراتی گرتووە لە بەندەکانی عومەر، بەڵام کچەکانی عومەر میراتەکەیان نەگرت.

٣٢٠٢ - «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ فِي امْرَأَةٍ مَاتَتْ وَتَرَكَتْ بَنِيهَا فَوَرِثُوهَا مَالاً وَمَوَالِيَ، ثُمَّ مَاتَ بَنُوهَا قَالَ: يَرْجِعُ الْوَلَاءُ إِلَى عَصَبَةِ الْمَرْأَةِ».(٢)

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، (پرسیار کرا) دەربارەی ئافرەتێک کە مرد و کوڕەکانی دوای خۆی جێهێشت، ئەوانیش ماڵ و سەروەت و بەندەیان لێ بە میرات گرت، دواتر منداڵەکانی مردن، ئەبو قیلابە وتی: وەلائو خزمایەتی ئازادکردن دەگەڕێتەوە بۆ عەصەبەی ئافرەتەکە (واتە: بۆ خزمەکانی پشتێی).

٣٢٠٣ - «عَنْ مَنْصُورٍ، قَالَ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ رَجُلٍ كَاتَبَ عَبْدًا لَهُ ثُمَّ مَاتَ وَتَرَكَ وَلَدًا رِجَالاً وَنِسَاءً. قَالَ: لِلذُّكُورِ دُونَ الإِنَاثِ».(٣)

واتە: لە مەنصورەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبڕاهیم کرد دەربارەی پیاوێک موکاتەبەی لەگەڵ بەندەیەکی خۆی کردوە، دواتر مردووە و منداڵی کوڕ و کچی دوای خۆی جێهێشتووە، ئیبڕاهیم وتی: (خزمایەتی ئازادکردنەکە واتە: وەلائەکە) بۆ نێرەکانە، نەک مێیەکان.

٣٢٠٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي امْرَأَةٍ مَاتَتْ وَتَرَكَتْ مَوْلًى، قَالَ: الْوَلَاءُ لِبَنِيهَا، فَإِذَا مَاتُوا، رَجَعَ إِلَى عَصَبَتِهَا».(٤)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتێک کە مردووە و بەندەیەکی دوای خۆی جێهێشتووە، وتویەتی: وەلائو خزمایەتی ئازادکردن بۆ کوڕەکانیەتی، جا ئەگەر ئەوانیش مردن، ئەوە بۆ عەصەبەکەیەتی (واتە: بۆ خزمەکانی پشتێیەتی).

٣٢٠٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لَيْسَ لِلنِّسَاءِ مِنَ الْوَلَاءِ شَيْءٌ إِلاَّ مَا أَعْتَقَتْ هِيَ فِي نَفْسِهَا».(٥)

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ خزمایەتیەکی ئازادکردن بۆ ئافرەتان نیە (بە میرات)، تەنها ئەوە نەبێت کە خودی خۆی بەندە ئازاد بکات.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى أبي قلابة.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح إلى إراهيم.

٣٢٠٦ - «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: مَاتَ مَوْلًى لِعُمَرَ فَسَأَلَ ابْنُ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، فَقَالَ: هَلْ لِبَنَاتِ عُمَرَ مِنْ مِيرَاثِهِ شَيْءٌ؟ قَالَ: مَا أَرَى لَهُنَّ شَيْئًا، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُعْطِيَهُنَّ، أَعْطَيْتَهُنَّ».[١]

واتە: لە موحەممەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەندەیەكی عومەر مرد، جا ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) پرسیاری لە زەیدی كوڕی ثابیت كرد و وتی: ئایا كچەكانی عومەر هیچ شتێكیان بۆ هەیە لە میراتەكەی؟ وتی: من پێم وانیە هیچ شتێكیان بۆ هەبێت، وە ئەگەر حەزیش دەكەیت پێیان بدەیت ئەوە پێیان بدە.

٣٢٠٧ - «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: يُحْرِزُ الْوَلَاءَ مَنْ يُحْرِزُ الْمِيرَاثَ».[٢]

واتە: لە هیشامەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: وەلاء خزمایەتی ئازادكردن بەدەست دەهێنن ئەو كەسانەی میرات بەدەست دەهێنن و میراتیان بۆ هەیە.

٣٢٠٨ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ مُحَارِبٍ وَهَبَتْ وَلَاءَ عَبْدِهَا لِنَفْسِهِ، فَأَعْتَقَتْهُ، فَوَهَبَ وَلَاءَ نَفْسِهِ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ وَمَاتَتْ فَخَاصَمَتْ الْمَوَالِي إِلَى عُثْمَانَ ﷺ، فَدَعَا عُثْمَانُ الْبَيِّنَةَ عَلَى مَا قَالَ. قَالَ: فَأَتَى الْبَيِّنَةُ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: اذْهَبْ فَوَالِ مَنْ شِئْتَ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَوَالَى عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ».[٣]

واتە: لە ئەبوبەكری كوڕی عەمری كوڕی حەزمەوە گێڕدراوەتەوە كە ئافرەتێك لە هۆزی موحاریب وەلائو خزمایەتی ئازادكردنی بەندەكەی خۆی كرد بە دیاری بۆ خودی بەندەكە و ئازادی كرد، بەندەكەش وەلائو خزمایەتی ئازادكردنەكەی كرد بە دیاری بۆ عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەمری كوڕی حەزم، جا ئافرەتەكە وەفاتی كرد و خزمەكانی كێشەیان دروستكرد (داوای خزمایەتی ئازادكردنەكەیان دەكرد) و كێشەكەیان برد بۆ لای عوسمان ﷺ، عوسمانیش داوای بەڵگەی كرد لەسەر ئەوەی بەندەكە دەیڵێت، دەڵێ: جا بەندەكە بەڵگەكەی خۆی هێنا و عوسمانیش پێی وت: برۆ كێی دەتەوێ بیكە بە خزمی ئازادكردنەكەت، ئەبوبەكر وتویەتی: جا عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەمری كوڕی حەزمی كرد بە خزمی ئازادكردنەكەی.

## بابەت: فرۆشتنی وەلائو خزمایەتی ئازادكردن

٣٢٠٩ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ».[٤]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لە فرۆشتنی خزمایەتی ئازادكردن و كردنە دیاری ئەو خزمایەتیە.

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى محد بن سيرين.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٣٢١٠ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ».[١]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی كردوە لە فرۆشتنی خزمایەتی ئازادكردن و كردنە دیاری ئەو خزمایەتیە.

٣٢١١ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: لاَ يُبَاعُ الْوَلاَءُ وَلاَ يُوهَبُ، وَالْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ».[٢]

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) دەیووت: وەلائو خزمایەتی ئازادكردن نە دەفرۆشرێ و نە دەشكرێتە دیاری، وەلائیش بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی كردوە.

٣٢١٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: الْوَلاَءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ».[٣]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: وەلائو خزمایەتی ئازادكردن پەیوەندی و خزمایەتییێكە وەك پەیوەندی و خزمایەتی نەسەب، نە دەفرۆشرێت و نە دەكرێتە دیاری.

٣٢١٣ - «عَنْ الْحَسَنِ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ ﷺ: أَنَّهُمَا كَرِهَا بَيْعَ الْوَلاَءِ».[٤]

واتە: لە حەسەن و سەعیدی كوڕی موسەییبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە هەردووكیان فرۆشتنی وەلائیان پێ ناپەسند (مكروه) بووە.

٣٢١٤ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: لاَ يُبَاعُ الْوَلاَءُ: أَيُؤْكَلُ بِرَقَبَةِ رَجُلٍ مَرَّتَيْنِ».[٥]

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی: وەلاء نافرۆشرێت، ئایا دەكرێت دوو جار بە ناوی ئەستۆی كەسێكەوە سەروەت بخورێت؟!

## بابەت: دەربارەی عەولی میرات

٣٢١٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: الْفَرَائِضُ مِنْ سِتَّةٍ لاَ نُعِيلُهَا».[٦]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: میرات لە شەشە و عەولی ناکەین (واتە: زیاد و کەمی ناکەین).

٣٢١٦ - «عَنْ شُرَيْحِ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ: اخْتُصِمَ إِلَى شُرَيْحٍ، فِي بِنْتَيْنِ، وَأَبَوَيْنِ، وَزَوْجٍ فَقَضَى فِيهَا، فَأَقْبَلَ الزَّوْجُ يَشْكُوهُ فِي الْمَسْجِدِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ عَبْدَ اللهِ بْنَ رَبَاحٍ ﷺ، فَأَخَذَهُ، وَبَعَثَ إِلَى شُرَيْحٍ فَقَالَ: مَا تَقُولُ فِي هَذَا؟ قَالَ: هَذَا يَخَالُنِي امْرَءاً جَائِرًا، وَأَنَا أَخَالُهُ امْرَءاً فَاجِرًا يُظْهِرُ الشَّكْوَى وَيَكْتُمُ قَضَاءً سَائِرًا. فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: مَا تَقُولُ فِي بِنْتَيْنِ، وَأَبَوَيْنِ، وَزَوْجٍ؟ فَقَالَ: لِلزَّوْجِ الرُّبُعُ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ، وَلِلأَبَوَيْنِ السُّدُسَانِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلإِبْنَتَيْنِ فَلأَيِّ شَيْءٍ نَقَصْتَنِي؟ قَالَ: لَيْسَ أَنَا نَقَصْتُكَ، اللهُ نَقَصَكَ، لِلإِبْنَتَيْنِ الثُّلُثَانِ، وَلِلأَبَوَيْنِ السُّدُسَانِ، وَلِلزَّوْجِ الرُّبُعُ، فَهِيَ مِنْ سَبْعَةٍ وَنِصْفِ فَرِيضَةً، فَرِيضَتُكَ عَائِلَةٌ».[١]

واتە: لە شوڕەیحی کوڕی حاریثەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کێشەیان هێنا بۆ لای شوڕەیح دەربارەی مەسئەلەی: دوو کچ و، دایک و، باوکێک و، مێرد، شوڕەیحیش بڕیاری دەرکرد و دادوەریەکەی کرد، جا مێردەکە شکاتی لێ کرد لە مزگەوت (واتە: لە مزگەوت ناڕەزایی دەردەبڕی دەربارەی بڕیارەکەی شوڕەیح)، جا عەبدوڵلای کوڕی ڕەباح ﷺ ناردی بەدوای مێردەکە و گرتی، وە ناردی بەدوای شوڕەیحدا و وتی: چی دەڵێی دەربارەی ئەمە؟ شوڕەیح وتی: ئەم پیاوە گومان دەربارەی من دروست دەکات و وا نیشانم دەدات کەسێکی ستەمکار بم، وە من پێم وایە ئەو پیاوێکی ستەمکار و خراپە، ناڕەزایی ئاشکرا دەکات و دادوەری و بڕیارێکی مەشهور و ناسراویش ڕەت دەکاتەوە (کە من بۆم داوە)، جا پیاوەکە (مێردەکە) پێی وت: چی دەڵێی دەربارەی (پشکی میراتی) دوو کچ و دایک و باوک و مێرد؟ شوڕەیحیش وتی: چواریەک بۆ مێردە لە کۆی گشتیماڵەکە و، دوو لەسەر شەشیش بۆ دایک و باوکە و، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ دوو کچەکەیە، جا بە هۆی چیەوە تۆ ڕەخنەم لێ دەگریت و لە گەورەییم کەم دەکەیتەوە (لە ناو خەڵکی بە ناڕەزاییەکەت)؟

کابراش وتی: من ڕەخنەت لێ ناگرم، بەڵکو خوا ڕەخنەت لێ دەگرێت، (چونکە) دوو لەسەر سێ بۆ دوو کچەکانە و، دوو لەسەر شەشیش بۆ دایک و باوکە و، چواریەکیش بۆ مێردە، ئەوە بوو بە حەوت بەش و نیو، (هەرچی) دابەشکردنی تۆیە عەولی تیایە (واتە: پشکەکانت کەم کردۆتەوە).

## بابەت: ڕاکێشانی وەلاء و خزمایەتی ئازادکردن

٣٢١٧ - «عَنْ عَلِيٍّ، وَعُمَرَ، وَزَيْدٍ ﷺ، قَالُوا: الْوَالِدُ يَجُرُّ وَلاَءَ وَلَدِهِ».[٢]

واتە: لە عەلی و عومەر و زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویانە: باوک وەلاء و خزمایەتی ئازادکردنی منداڵەکەی ڕادەکێشێت (واتە: باوک دەبێتە وەلائی ئەو بەندەیەی بۆ دەمێنێتەوە کە کوڕەکەی ئازادی کردوە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

٣٢١٨ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: الْجَدُّ يَجُرُّ الْوَلاَءَ».(١)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باپیر وەلاء ڕادەكێشێت.

٣٢١٩ - «عَنْ شُرَيْحٍ، قَالَ: الْوَالِدُ يَجُرُّ وَلاَءَ وَلَدِهِ».(٢)

واتە: لە شورەیحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باوك وەلائی منداڵەكەی ڕادەكێشێت.

٣٢٢٠ - «عَنْ عَامِرٍ، فِي مَمْلُوكٍ تُوُفِّيَ وَلَهُ أَبٌ حُرٌّ، وَلَهُ بَنُونَ مِنَ امْرَأَةٍ حُرَّةٍ، لِمَنْ وَلاَءُ وَلَدِهِ؟ قَالَ: لِمَوَالِي الْجَدِّ».(٣)

واتە: لە عامرەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی بەندەیەك كە وەفاتی كردوە و باوكێكی ئازادی هەیە، هەروەها چەندین كوڕی لە ئافرەتێكی ئازاد هەیە، جا وەلائی منداڵەكەی بۆ كێیە؟ وتویەتی: بۆ باپیریەتی.

٣٢٢١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي مُكَاتَبٍ مَاتَ وَقَدْ أَدَّى نِصْفَ مُكَاتَبَتِهِ، وَلَهُ وَلَدٌ مِنَ امْرَأَةٍ حُرَّةٍ، قَالَ: مَا أُرَاهُ إِلاَّ قَدْ جَرَّ وَلاَءَ وَلَدِهِ».(٤)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی بەندەی موكاتەبە لەگەڵ كراو كە بمرێت و نیوەی پارەی موكاتەبەكە و خۆكڕینەوەكەی خۆی دابێت و منداڵێكیشی لە ئافرەتێكی ئازاد هەبێت (ئایا وەلائەكەی بۆ كێیە)؟ وتی: پێم وایە تەنها باوكەكە وەلائی كوڕەكەی ڕادەكێشێت (واتە: میراتی بەندەكە بۆ باوكی كوڕە ئازادكەرەكەیە).

٣٢٢٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ شُرَيْحٌ، لاَ يَرْجِعُ عَنْ قَضَاءٍ يَقْضِي بِهِ، فَحَدَّثَهُ الأَسْوَدُ: أَنَّ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: إِذَا تَزَوَّجَ الْمَمْلُوكُ الْحُرَّةَ فَوَلَدَتْ أَوْلاَدًا أَحْرَارًا، ثُمَّ عُتِقَ بَعْدَ ذَلِكَ، رَجَعَ الْوَلاَءُ لِمَوَالِي أَبِيهِمْ» فَأَخَذَ بِهِ شُرَيْحٌ».(٥)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: شورەیح وتویەتی: لە هیچ بڕیارێك پاشگەز نەدەبویەوە كە دەری دەكرد، جا ئەسوەد بۆی گێڕایەوە كە عومەر ﷺ وتویەتی: ئەگەر بەندە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێكی ئازاد كرد و چەند منداڵێكی ئازادی لێ بوو، دواتر پاش ئەوە ئازادكرا ئەوە وەلائەكە دەگەڕێتەوە بۆ باوكیان، جا شورەیح ئەو بڕیارەی وەرگرت (بۆ كارپێكردن و بڕیاردان).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٣٢٢٣ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ، فِي الْمَمْلُوكِ يَكُونُ تَحْتَهُ الْحُرَّةُ: يُعْتَقُ الْوَلَدُ بِعِتْقِ أُمِّهِ، فَإِذَا عُتِقَ الأَبُ، جَرَّ الْوَلاَءَ».(١)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ دەربارەی بەندەیەک کە ئافرەتێکی ئازادی لەژێر نیکاح بێت وتویەتی: منداڵەکە ئازاد دەبێت بە هۆی ئازادی دایکیەوە، جا ئەگەر باوکی ئازادکرا ئەوە وەلاء ڕادەکێشێت (واتە: وەلائی منداڵەکەی).

٣٢٢٤ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْحُرَّةِ تَحْتَ الْعَبْدِ، قَالَ: أَمَّا مَا وَلَدَتْ مِنْهُ وَهُوَ عَبْدٌ، فَوَلاَؤُهُمْ لأَهْلِ نِعْمَتِهَا، وَمَا وَلَدَتْ مِنْهُ وَهُوَ حُرٌّ، فَوَلاَؤُهُمْ لأَهْلِ نِعْمَتِهِ».(٢)

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتێکی ئازاد کە لە ژێر نیکاحی پیاوێکی بەندە بێت وتویەتی: هەرچی دەربارەی ئەو منداڵانەیە کە لە پیاوە بەندەکە بوویەتی لە کاتێکدا کە بەندەیە، ئەوە وەلائەکەیان بۆ خزمانی دایکیانە (کەواتە: میراتەکەیان بۆ ئەوانە)، وە ئەو منداڵانەی لە پیاوەکەی بووە لەو کاتەی ئازاد بووە، ئەوە وەلائەکەیان بۆ ئەو کەسانەیە کە ئازادیان کردوە (کەواتە: میراتەکەی بۆ ئەوانە).

٣٢٢٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: إِذَا كَانَتِ الْحُرَّةُ تَحْتَ الْمَمْلُوكِ فَوَلَدَتْ لَهُ غُلاَمًا فَإِنَّهُ يُعْتَقُ بِعِتْقِ أُمِّهِ، وَوَلاَؤُهُ لِمَوَالِي أُمِّهِ، فَإِذَا أُعْتِقَ الأَبُ، جَرَّ الْوَلاَءَ إِلَى مَوَالِي أَبِيهِ».(٣)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتویەتی: ئەگەر ئافرەتێکی ئازاد لە ژێر نیکاحی بەندەیەک دابوو و ئافرەتەکە کوڕێکی لە پیاوە بەندەکە بوو، ئەوە منداڵەکە ئازاد دەبێت بە هۆی ئازادی دایکیەوە، وە وەلائەکەشی بۆ خزمانی دایکیەتی، جا کە باوکەکە ئازادکرا ئەوە وەلائەکە ڕادەکێشێت بۆ خزمانی باوکی.

٣٢٢٦ - «عَنْ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَتْ أُمِّي مَوْلاَةً لِلْحُرَقَةِ، وَكَانَ أَبِي يَعْقُوبُ مُكَاتَبًا، لِمَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ النَّصْرِيِّ، ثُمَّ إِنَّ أَبِي أَدَّى كِتَابَتَهُ، فَدَخَلَ الْحُرَقِيُّ عَلَى عُثْمَانَ ﷺ، فسَأَلَ لِي الْحَقَّ - يَعْنِي: الْعَطَاءَ - وَعِنْدَهُ مَالِكُ بْنُ أَوْسٍ، فَقَالَ: ذَاكَ مَوْلاَيَ. فَاخْتَصَمَا إِلَى عُثْمَانَ، فَقَضَى بِهِ لِلْحُرَقِيِّ».(٤)

واتە: لە عەلائی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: دایکم بەندە بوو بۆ حوڕەقە (کە گوندێکی هۆزی قەضاعەیە) باوکیشم یەعقوب بەندەیەکی نوسراوپێدراو

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى عطاء.

(٣) ـ إسناده منقطع.

(٤) ـ إسناده ضعيف لعنعنة محمد بن إسحاق.

بوو (موکاتەبە لەگەڵکراوی) مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەثانی نەصری بوو، دواتر باوکم پارەی موکاتەبەکە و خۆ کڕینەوەکەی خۆیدا و حوڕەقیەک هات بۆ لای عوسمان و ﷺ پرسیاری هەقی منی لێ کرد ـ واتە: داوای پێدانی کرد ـ مالیکی کوڕی ئەوسیشی لەلا بوو، وتی: ئەو بەندەی منە، جا کێشەیان بردە لای عوسمان و ئەویش بڕیاریدا بۆ کابرای حوڕەقی.

## بابەت: ئەو پیاوەی دەمرێت و هیچ عەصەبەیەک و خزمێکی پشتێ دواى خۆی جێناهێڵێت

٣٢٢٧ - «أَخْبَرَنِي سَهْمُ بْنُ يَزِيدَ الْحَمْرَاوِيُّ: أن رَجُلاً تُوُفِّيَ وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ فَكُتِبَ فِيهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ - وَهُوَ خَلِيفَةٌ - فَكَتَبَ: أَنْ قسِمُوا مِيرَاثَهُ عَلَى مَنْ كَانَ يَأْخُذُ مَعَهُمُ الْعَطَاءَ، فَقُسِمَ مِيرَاثُهُ عَلَى مَنْ كَانَ يَأْخُذُ مَعَهُمُ الْعَطَاءَ فِي عِرَافَتِهِ».[١]

واتە: لە سەهمی کوڕی یەزیدی حەمڕاویەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وەفاتی کرد و هیچ میراتگرێکی نەبوو، جا (نوسراوێک) نوسرا دەربارەی ئەم پیاوە، بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ لە کاتێکدا کە خەلیفە بوو ـ ئەویش نوسیەوە (وەڵامی دایەوە وتی): میراتەکەی دابەش بکەن بەسەر ئەوانەی بەیەکەوە بەخشینیان وەرگرتووە (واتە: لێی نزیکن لە دۆست و خزمان و بەخشینیان لە نێواندا هەیە)، جا میراتەکەی دابەشکرا بەسەر ئەوانەی شتیان وەرگرتووە لەگەڵ یەکتری لە گەلەکۆمەی کەسەکە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

## بابەت: ئەو کەسانەی وەسیەتکردنیان پێ سوننەت بووە

٣٢٢٨ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ، إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ».(١)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی شایستەی مرۆڤی مسوڵمانە و (هەق وایە ئەنجامی بدات، ئەوەیە) دوو شەو زیاتر نەمێنێتەوە و بەسەریدا تێپەڕ نەبێت لە کاتێکدا شتێکی هەبێت وەسێتەکەی تێدا بنوسێت حەتمەن دەبێت وەسێتەکەی لەلا نوسرا بێت (لای خۆی دایبنابێت).

٣٢٢٩ - «حَدَّثَنَا الْحَسَنُ، قَالَ: الْمُؤْمِنُ لاَ يَأْكُلُ فِي كُلِّ بطنه، وَلاَ تَزَالُ وَصِيَّتُهُ تَحْتَ جَنْبِهِ».(٢)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی بڕوادار پڕ بە سکی ناخوات (تەنگەی پڕ ناکات) و، بەردەوام وەسێتەکەشی لە ژێر تەنیشتیەتی (واتە: لە ژێر پێخەفی خەوتنیەتی).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی وەسێت

٣٢٣٠ - «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ لِي ثُمَامَةُ بْنُ حَزْنٍ: مَا فَعَلَ أَبُوكَ؟ قُلْتُ: مَاتَ. قَالَ: فَهَلْ أَوْصَى؟ فَإِنَّهُ كَانَ يُقَالُ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ، كَانتَ وَصِيَّتُهُ تَمَامًا لِمَا ضَيَّعَ مِنْ زَكَاتِهِ».(٣)

واتە: لە قاسمی کوڕی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ثومامەی کوڕی حەزن پێی وتم: باوکت چی لێهات؟ وتم: وەفاتی کرد، وتی: ئایا وەسێتی کرد؟ چونکە دەوترێت: ئەگەر مرۆڤ وەسێت بکات، ئەوە وەسێتەکەی دەبێتە تەواوکەری ئەو زەکاتەی لێی فەوتاوە و (کەموکوڕیەکانی زەکات پڕ دەکاتەوە).

٣٢٣١ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: مَنْ أَوْصَى بِوَصِيَّةٍ فَلَمْ يَجُرْ، وَلَمْ يَحِفْ، كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ مَا إِنْ لَوْ تَصَدَّقَ بِهِ فِي حَيَاتِهِ».(٤)

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دەوترا: هەر کەسێک وەسێتێک بکات و ستەم نەکات و لە هەق لانەدات، ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، وەک ئەوەی خێر و صەدەقەی کردبێت لە کاتی ژیانی خۆیدا (واتە: پاداشتەکەی بە تەواوی پێ دەگات).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٣) ـ إسناده حسن إلى قحامة.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

٣٢٣٢ - «عَنْ أَبِي قَزَعَةَ، قَالَ: قِيلَ لِهَرِمِ بْنِ حَيَّانَ: أَوْصِنا قَالَ: أُوصِيكُمْ بِالأَيَاتِ الأَوَاخِرِ مِنْ سُورَةِ النَّحْل وَقَرَأَ ابْنُ حَيَّانَ: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل».[1]

واتە: لە ئەبو قەزەعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە هەریمی کوڕی حەییان وترا: ئامۆژگاریمان بکە، وتی: ئامۆژگاریتان دەکەم بە ئایەتەکانی کۆتایی لە سورەتی نەحل، جا ئیبنو حەییان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە: {ئەی پێغەمبەر ئەی ئیماندار، بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری جوان و بەجێ و گفتوگۆ و موجادەلە بە جوانترین شێوە، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە کە کێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایە بە هیدایەت وەرگران}.

## بابەت: ئەو کەسەی وەسێتی نەکردوە

٣٢٣٣ - «عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ الْيَامِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ: أَوْصَى رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَكَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الْوَصِيَّةُ أو أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ؟ فَقَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ وقَالَ هُزَيْلُ بْنُ شُرَحْبِيلَ: أَبُو بَكْرٍ كَانَ يَتَأَمَّرُ عَلَى وَصِيِّ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ وَدَّ أَبُو بَكْرٍ أَنَّهُ وَجَدَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَهْدًا فَخَزَمَ أَنْفَهُ بِخِزَامَةٍ ذَلِكَ».[2]

واتە: لە تەڵحەی کوڕی موصەرریفی یامیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا کرد ﷺ وتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسێتی کردوە؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی چۆن وەسێت کردن لەسەر خەڵکی نوسراوە یان چۆن فەرمانیان بە وەسێت کردن پێکراوە؟ ئەویش وتی: بە پەرتوکی خوا فەرمان بە وەسێت کراوە، وە هوزەیلی کوڕی شوڕەحبیل وتویەتی: ئەبوبەکر هەر پرسیاری دەکرد لە سەروەسێتی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: لەسەر جێنشین و خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ)، ئەبوبەکر حەزی دەکرد پەیمان و وەسێتێکی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەست بکەوتایە و خۆی پێیەوە پابەند بکردایە.

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الزهري.

(٢) ـ إسناده صحيح.

٣٢٣٤ - «عَنْ قَتَادَةَ ﷺ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: الْخَيْرُ: الْمَالُ، كَانَ يُقَالُ: أَلْفًا فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ».(١)

واتە: لە قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت): ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ البقرة، وتویەتی: الخیر: ماڵە، دەوترا (ئەندازەکەشی): هەزار و بەسەرەوەیە.

## بابەت: ئەوەی سوننەتە لە وەسێتدا لە شاتومان و وتە

٣٢٣٥ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ: أَنَّهُ أَوْصَى ذِكْرُ مَا أَوْصَى بِهِ أَوْ هَذَا ذِكْرُ مَا أَوْصَى بِهِ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ بَنِيهِ وَأَهْلَ بَيْتِهِ أَنْ: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ ﴾ الأنفال، وَأَوْصَاهُمْ بِمَا أَوْصَى بِهِ إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ: ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ البقرة، وَأَوْصَاهُمْ أَنْ لاَ يَرْغَبُوا أَنْ يَكُونُوا مَوَالِيَ الأَنْصَارِ وَإِخْوَانَهُمْ فِي الدِّينِ، وَأَنَّ الْعِفَّةَ وَالصِّدْقَ خَيْرٌ وَأَتْقَى مِنَ الزِّنَا وَالْكَذِبِ، إِنْ حَدَثٌ بِهِ حَدَثٌ فِي مَرَضِي هَذَا قَبْلَ أَنْ أُغَيِّرَ وَصِيَّتِي هَذِهِ، ثُمَّ ذَكَرَ حَاجَتَهُ».(٢)

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە گێڕدراوەتەوە کە باسی ئەوەی کردوە کە چۆن وەسێتی کردوە ـ یان باسی وەسێتی موحەممەدی کوڕی ئەبی عەمرەی کردوە بۆ کوڕەکانی و خانەوادەکەی ـ (کە ئاوا بووە): ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ ﴾ واتە: {لە خوا بترسن و چاکسازی نێوانی خۆتان بکەن و فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بن، ئەگەر ئێوە بڕوادارن}، وە وەسێتی کردن بەوەی ئیبراهیم و یەعقوب وەسێتیان پێ کرد: ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: (وەک ئایەتەکە وتی): {ڕۆڵەکانم، بەڕاستی خوا هەر ئەم ئاینەی بۆ ئێوە بڕیارداوە و هەڵیبژاردووە، ئیتر ئێوەش هەوڵبدەن بە مسوڵمانی نەبێت مەمرن}، هەروەها وەسێتی کردن کە پشت نەکەن لە دۆستایەتی ئەنصاریەکان و برایان بن لە دیندا، وە داوێن پاکی و ڕاستگۆیی گەلەک چاکتر و پارێزراوترە لە داوێن پیسی و درۆ، جا ئەگەر شتێک ڕوویدا، لەم نەخۆشیەی من پێش ئەوەی ئەم وەسێتەم بگۆڕم (ئەوە ئەم وەسێتە جێبەجێ دەکرێت)، دواتر وەسێتەکەی خۆی باس کرد و دەربارەی سەروەتەکەیدا وەسێتی کرد.

٣٢٣٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: هَكَذَا كَانُوا يُوصُونَ: هَذَا مَا أَوْصَى بِهِ فُلاَنُ بْنُ فُلاَنٍ، أَنَّهُ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لاَ رَيْبَ فِيهَا، وَأَنَّ اللهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ، وَأَوْصَى مَنْ تَرَكَ بَعْدَهُ مِنْ أَهْلِهِ أَنْ يَتَّقُوا اللهَ وَيُصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِهِمْ، وَأَنْ يُطِيعُوا اللهَ وَرَسُولَهُ إِنْ

---

(١) ـ إسناده صحح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى محمد بن سيرين.

كَانُوا مُؤْمِنِينَ. وَأَوْصَاهُمْ بِمَا أَوْصَى بِهِ إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ، وَيَعْقُوبُ: ﴿يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ البقرة، وَأَوْصَى إِنْ حَدَثَ بِهِ حَدَثٌ مِنْ وَجَعِهِ هَذَا، أَنَّ حَاجَتَهُ كَذَا وَكَذَا».[1]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئا بەو شێوەیە وەسێتیان دەکرد: ئەمە ئەو وەسێتەیە کە فڵانی کوڕی فڵان کردوویەتی: شاهێدی دەدات کە هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله کە تاکە و هیچ هاوەڵێکی نیە، وە موحەممەدیش پێغەمبەر و نێردراوی خوایە ﷺ، وە بەرپابوون و ڕوودانی قیامەتیش هەر دێت و گومانی تیا نیە، وە خوای پەروەردگار خەڵکی زیندوو دەکاتەوە لە گۆڕەکان، هەروەها وەسێتی بۆ ئەو کەسانە دەکرد کە لەدوای خۆی جێیان دەهێڵێت بەوەی: تەقوای خوا بکەن و چاکسازی لە نێوانی خۆیاندا بکەن و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن ئەگەر ڕاست دەکەن برِوادارن، هەروەها وەسێتی بۆ دەکردن بەوەی ئیبراهیم ﷺو یەعقوب ﷺ وەسێتیان پێکرد: ﴿يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ البقرة، واتە: (وەک ئایەتەکە دەڵێت): [ڕۆڵەکانم، بەڕاستی خوا هەر ئەم ئاینەی بۆ ئێوە بڕیارداوە و هەڵی بژاردووە، ئیتر ئێوەش هەوڵبدەن بە مسوڵمانی نەبێت مەمرن]، هەروەها وەسێتی دەکرد ئەگەر شتێک ڕوویدا لەم نەخۆشیەیدا (واتە: ئەگەر مرد) ئەوە وەسێتەکەی ئەوە و ئەوەیە (جا باسی وەسێتەکەی بۆ دەکردن).

٣٢٣٧- «عَنْ مَكْحُولٍ، حِينَ أَوْصَى قَالَ: نشَهْدُ هَذَا - فاشَهِدْ بِهِ: نَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَيُؤْمِنُ بِاللهِ وَيَكْفُرُ بِالطَّاغُوتِ عَلَى ذَلِكَ يَحْيَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ، وَيَمُوتُ، وَيُبْعَثُ، وَأَوْصَى فِيمَا رَزَقَهُ اللهُ فِيمَا تَرَكَ إِنْ حَدَثَ بِهِ حَدَثٌ وَهُوَ كَذَا وَكَذَا إِنْ لَمْ يُغَيِّرْ شَيْئًا مِمَّا فِي هَذِهِ الْوَصِيَّةِ».[2]

واتە: لە مەکحولەوە گێردراوەتەوە، کاتێ وەسێتی کرد وتی: ئەم شاتومانە دێنین ـ تۆش شاتومانەکە بهێنە ـ شاهێدی دەدەین کە هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە الله کە تەنهایە و هیچ هاوەڵێکی نیە، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری ئەوە ﷺ، وە بڕوا دێنێ بە خوا و کوفر بە گشت پەرستراو و زاڵم و باتڵێک دەکات، لەسەر ئەمە دەژیێت و لەسەر ئەمە دەمرێت و لەسەر ئەمە زیندوو دەکرێتەوە، وە وەسێتی کرد دەربارەی ئەو ماڵەی خوا پێیداوە لەوەی جێی هێشتووە دوای خۆی، ئەگەر شتێک ڕوویدا (واتە: وتی ئەگەر مردم) ئەوە ئاوا و ئاوایە (واتە: ئەوە وەسێتەکەمە)، ئەگەر هیچ شتێکم لەم وەسێتە نەگۆڕی.

٣٢٣٨ - «عَنْ مَكْحُولٍ، قَالَ: هَذِهِ وَصِيَّةُ أَبِي الدَّرْدَاءِ».[3]

واتە: لە مەکحولەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەمە وەسێتی ئەبو دەرداءە (واتە: ئەو وەسێتەکەی لە پێشەوە باس کرا).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف لعنعة الولد بن مسلم.

(٣) ـ إسناده حسن.

٣٢٣٩ - «حَدَّثَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَتَبَ الرَّبِيعُ بْنُ خُثَيْمٍ، وَصِيَّتَهُ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذَا مَا أَوْصَى بِهِ الرَّبِيعُ بْنُ خُثَيْمٍ وَأَشْهَدَ اللهَ عَلَيْهِ، وَكَفَى بِاللهِ شَهِيدًا، وَجَازِيًا لِعِبَادِهِ الصَّالِحِينَ وَمُثِيبًا، فَإِنِّي رَضِيتُ بِاللهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيًّا، وَإِنِّي آمُرُ نَفْسِي وَمَنْ أَطَاعَنِي أَنْ نَعْبُدَ اللهَ فِي الْعَابِدِينَ، وَنَحْمَدَهُ فِي الْحَامِدِينَ، وَأَنْ نَنْصَحَ لِجَمَاعَةِ الْمُسْلِمِينَ».[1]

واتە: لە ئەبو حەییانی تەمیمیەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ڕەبیعی کوڕی خوثەیم وەسێتەکەی خۆی نوسی (ئا بەم شێوەیە): بسم الله الرحمن الرحیم، ئەمە ئەوەیە کە ڕەبیعی کوڕی خوثەیم وەسێتی پێ کردوە و خوای کردۆتە شاهێد لەسەری و خواش بەسە بۆ شاهێدی و پاداشت دانەوەی بەندە چاکەکانی، من ڕازیم بەوەی الله پەروەردگارم بێت و ئیسلام ئاینم بێت و موحەممەد پێغەمبەرم ﷺ بێت، وە من فەرمان بە خودی خۆم و ئەوانەش دەکەم کە گوێڕایەڵی من دەکەن بەوەی خوا بپەرستین لەگەڵ خواپەرستان و، سوپاس و ستاییشی خوا بکەین لەگەڵ ستاییشکاران و، ئامۆژگاری کۆمەڵی مسوڵمانان بکەین (واتە: پێشی وەسێتەکەی ئەم پێشەکیەی نوسی).

## بابەت: ئەوەی پێی وا نەبووە وەسێت لە ماڵ و سەروەتی کەمدا بکرێت

٣٢٤٠ - «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ، دَخَلَ عَلَى مَرِيضٍ فَذَكَرُوا لَهُ الْوَصِيَّةَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: قَالَ اللَّهُ: ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، وَلاَ أُرَاهُ تَرَكَ خَيْرًا، قَالَ حَمَّادٌ: فَحَفِظْتُ أَنَّهُ تَرَكَ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِ مِائَةٍ».[2]

واتە: لە هیشامەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ چوو بۆ لای نەخۆشێک و خەڵکیش باسی وەسێتیان بۆ کرد، عەلیش وتی: خوای پەروەردگار دەفەرموێ:﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، واتە: (ئەو کات وەسێت دەکات) ئەگەر هاتوو ماڵێکی چاکی لەدوای خۆی جێهێشتبوو، واشنازانم ماڵێکی چاکی لەدوای خۆی جێهێشتبێت.

حەمماد وتویەتی: من لەبەرم کردوە کە ئەو نەخۆشەی عەلی باسی کرد زیاتر لە حەفت سەد (درهەمی) لەدوای خۆی جێهێشتبوو.

٣٢٤١ - «حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَلَى رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ يَعُودُهُ، فَقَالَ: أُوصِي؟ قَالَ: لاَ، لَمْ تَدَعْ مَالاً، فَدَعْ مَالَكَ لِوَلَدِكَ».[3]

واتە: لە هیشامەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ چوو بۆ لای پیاوێک لە قەومەکەی لەبەر نەخۆشی سەردانی کرد، کابرا وتی: ئایا وەسێت بکەم؟ عەلی وتی: نەخێر، ماڵێکی زۆرت جێنەهێشتووە، ماڵەکەت وازلێبێنە با بۆ منداڵەکەت بێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى علي.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی وەسێت دەکات بە زیاتر لە سێیەک

٣٢٤٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي رَجُلٍ أَوْصَى وَالْوَرَثَةُ شُهُودٌ مُقِرُّونَ، فَقَالَ: لاَ يَجُوزُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَعْنِي: إِذَا أَنْكَرُوا بَعْدُ».[١]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە وەسێتی کردبوو (بە زیاتر لە سێیەک) لە کاتێکدا میراتگرەکانی ئامادە بوون و پێی ڕازیبوون، (ئیبراهیم) وتی: دروست نیە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (کە دەڵێ دروست نیە) واتە: ئەگەر دواتر میراتگرەکانی ئینکاری بکەن و پێی ڕازی نەبن.

٣٢٤٣ - «حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَأَلْتُ الْحَكَمَ، وَحَمَّادًا رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ الأَوْلِيَاءِ يُجِيزُونَ الْوَصِيَّةَ، فَإِذَا مَاتَ لَمْ يُجِيزُوا؟ قَالاَ: لاَ يَجُوزُ».[٢]

واتە: لە شوعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە حەکەم و حەمماد (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) کرد دەربارەی میراتگران کە ڕازیبوون و ڕێگەیانداوە بە وەسێتی زیاتر لە سێیەک (لەلایەن ئەو کەسەی میراتی لێ دەگرن)، جا کاتێ کەسەکە مردووە ڕێگەیان پێ نەداوە (پەشیمان بوونەتەوە، جا ئایا جێبەجێ دەکرێت)؟ وتیان: دروست نیە (جێبەجێ ناکرێت مادەم پەشیمان بووبنەوە و هەقەکە هی ئەوانە مادەم سێیەکی تێپەڕاندووە).

٣٢٤٤ - «عَنْ شُرَيْحٍ، فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِأَكْثَرَ مِنْ ثُلُثِهِ، قَالَ: إِنْ أَجَازَتْهُ الْوَرَثَةُ، أَجَزْنَاهُ، وَإِنْ قَالَتِ الْوَرَثَةُ: أَجَزْنَاهُ، فَهُمْ بِالْخِيَارِ إِذَا نَفَضُوا أَيْدِيَهُمْ مِنَ الْقَبْرِ».[٣]

واتە: لە شوڕەیحەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێتی بە زیاتر لە سێیەک کردوە، وتویەتی: ئەگەر میراتگرەکانی ڕێگەیان پێدا ئەوە بە دروستی دادەنێین و جێبەجێی دەکەین، ئەگەر میراتگرەکانیشی (لە سەرەتا) وتیان: ڕێگەمان دا، ئەوە ئەوان سەرپشکن ئەگەر دەستیان لە گۆڕ جیابکەنەوە (واتە: سەرپشکن ئەگەر دواتر پەشیمان ببنەوە و نەهێڵن وەسێتی خاوەنی گۆڕەکە جێبەجێ بکرێت لە زیاتر لە سێیەک).

٣٢٤٥ - «عَنْ الْقَاسِمِ، أَنَّ رَجُلاً اسْتَأْذَنَ وَرَثَتَهُ أَنْ يُوصِيَ بِأَكْثَرَ مِنَ الثُّلُثِ، فَأَذِنُوا لَهُ، ثُمَّ رَجَعُوا فِيهِ بَعْدَ مَا مَاتَ، فَسُئِلَ عَبْدُ اللهِ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: هَذَا التَّكَرُّهُ لاَ يَجُوزُ».[٤]

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٢) ـ إسناده صحيح الى الحكم.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى تسريح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە قاسمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک مۆڵەتی وەرگرت لە میراتگرەکانی تا مۆڵەتی بدەن بە زیاتر لە سێیەک وەسێت بکات، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، دواتر پەشیمان بوونەوە دوای ئەوەی وەفاتی کرد، جا پرسیار لە عەبدوڵلا کرا دەربارەی ئەوە، ئەویش وتی: ئەو پێناخۆشبوونە دروست نیە (واتە: مادەم پێیان خۆش نەبێت زیادەی دوای سێیەکەکە جێبەجێ ناکرێت و دروست نیە).

٣٢٤٦ - «عَنْ الْحَسَنِ، فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِأَكْثَرَ مِنَ الثُّلُثِ فَرَضِيَ الْوَرَثَةُ؟ قَالَ: هُوَ جَائِزٌ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَجَزْنَاهُ - يَعْنِي: فِي الْحَيَاةِ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێتی بە زیاتر لە سێیەک کردوە و میراتگرەکانیشی ڕازی بوون، وتی: دروستە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: جێبەجێی دەکەین، واتە: لە ژیاندا (کە هێشتا کابرا ماوە).

## بابەت: وەسێت کردن بە سێیەک

٣٢٤٧ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهِ وَهُوَ بِمَكَّةَ وَلَيْسَ لَهُ إِلاَّ ابْنَةٌ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُ لَيْسَ لِي إِلاَّ ابْنَةٌ وَاحِدَةٌ، فَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ. قُلْتُ: فَأُوصِي بِالنِّصْفِ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ. قَالَ: فَأُوصِي بِالثُّلُثِ؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ».[٢]

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سەعدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای لەکاتێکدا ئەو لە مەککە بوو و کەسیشی نەبوو جگە لە کچێک، جا بە پێغەمبەری خوام ﷺ وت: من کەسم نیە جگە لە یەک کچ، جا ئایا وەسێت بە گشت ماڵەکەم بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، وتم: کەواتە: ئایا وەسێت بە نیوەی ماڵەکەم بکەم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: نەخێر، وتی: کەواتە: وەسێت بە سێیەکی بکەم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: سێیەک دەبێت، کەچی سێیەکیش هەر زۆرە.

٣٢٤٨ - «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: اشْتَكَيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حَتَّى إِذَا أُدْنِفْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعُودُنِي فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أُرَانِي إِلاَّ أَلِمٌ بِي وَأَنَا ذُو مَالٍ كَثِيرٍ، وَإِنَّمَا يَرِثُنِي ابْنَةٌ لِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَبِنِصْفِهِ، قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَالثُّلُثِ؟ قَالَ: الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ إِنْ تَتْرُكْ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ فُقَرَاءَ يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ بِأَيْدِيهِمْ، وَإِنَّكَ لاَ تُنْفِقُ نَفَقَةً إِلاَّ آجَرَكَ اللهُ فِيهَا حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ».[٣]

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عامیری کوڕی سەعدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: نەخۆش کەوتم کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم لە حەجی ماڵئاواییدا، تا ئەو کاتەی نەخۆشی پێمەوە وابەستە بوو و لێم جیا نەبویەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام سەردانی کردم، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وانازانم تەنها ئەوە نەبێت مردنم نزیک بۆتەوە و منیش خاوەنی ماڵ و سەروەتێکی زۆرم و تەنها کچێکم میراتم لێ دەگرێت، جا ئایا گشت ماڵەکەم بکەم بە صەدەقە؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: نەخێر، وتم: کەواتە: نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: کەواتە: سێیەک؟ فەرمووی: سێیەک دەبێت، سێیەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت دوای خۆت جێبهێڵی بە دەوڵەمەندی و زەنگینی، ئەوە چاکترە لەوەی دوای خۆت جێیان بهێڵیت بە هەژاری و دەست لە خەڵک پان بکەنەوە، وە تۆ هیچ مەسرەفێک نیە کە بیکەیت (لە کەسە نزیکەکانت) حەتمەن خوا تیایدا پاداشتت دەداتەوە هەتا ئەوەش کە دەیخەیتە ناو دەمی خێزانەکەشتەوە.

## بابەت: وەسێت کردن بە کەمتر لە سێیەک

٣٢٤٩ - «عَنْ الْعَلاَءِ بْنِ زِيَادٍ، أَنَّ أَبَاهُ زِيَادَ بْنَ مَطَرٍ، أَوْصَى فَقَالَ: وَصِيَّتِي مَا اتَّفَقَ عَلَيْهِ فُقَهَاءُ أَهْلِ الْبَصْرَةِ» فَسَأَلْتُ، فَاتَّفَقُوا عَلَى الْخُمُسِ».(١)

واتە: لە عەلائی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە کە زیادی کوڕی مەتەڕی باوکی وەسێتی کرد و وتی: وەسێتی من ئەوەیە کە زانایانی شەرعزانی بەصرە لەسەری کۆک دەبن، (عەلاء دەڵێ): جا منیش پرسیارم کرد (لە زانایان تا بزانم لەسەر چەند کۆکن)، جا زانایان کۆکبوون لەسەر پێنج یەک (واتە: یەک بەش لە پێنج بەش بەبێ ڕا جیایی قبوڵ و جێبەجێ دەکرێت).

٣٢٥٠ - «عَنْ الْعَلاَءِ بْنِ زِيَادٍ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ وَارِثِي كَلاَلَةٌ، أَفَأُوصِي بِالنِّصْفِ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَالثُّلُثِ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَالرُّبُعِ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَالْخُمُسِ؟ قَالَ: لاَ، حَتَّى صَارَ إِلَى الْعُشْرِ، فَقَالَ: أَوْصِ بِالْعُشْرِ».(٢)

واتە: لە عەلائی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد و وتی: میراتگرانم (خزمی دوورمن) جگە لە دایک و باوک و منداڵمن (ئەمانەم نیە)، جا ئایا وەسێت بە نیوەی ماڵەکەم بکەم؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە: سێیەک؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە: چواریەک؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە: پێنجیەک؟ وتی: نەخێر، (جا هەر وتی: نەخێر) تاوەکو چوو بۆ دەیەک، ئنجا وتی: وەسێت بە دەیەک بکە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

٣٢٥١ - «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: إِنَّمَا كَانُوا يُوصُونَ بِالْخُمُسِ وَالرُّبُعِ، وَكَانَ الثُّلُثُ مُنْتَهَى الْجَامِحِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَعْنِي بِالْجَامِحِ: الْفَرَسَ الْجَمُوحَ».[١]

واتە: لە عامیرەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: تەنها وەسێتیان بە پێنج یەک و چوار یەک دەکرد، سێیەکیش کۆتایی کەسی چەموش بوو (واتە: بۆ ئەو کەسە بوو کە هەر ئینکاری کردبا بۆ ئەوەی زیاتر بکات بە وەسێت).

٣٢٥٢ - «عَنْ بَكْرٍ، قَالَ: أَوْصَيْتُ إِلَى حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ: مَا كُنْتُ لأَقْبَلَ وَصِيَّةَ رَجُلٍ لَهُ وَلَدٌ يُوصِي بِالثُّلُثِ».[٢]

واتە: لە بەکر گێردراوەتەوە، وتویەتی: وەسێتم بۆ حەمیدی کوڕی عەبدووڕڕحمان کرد و لە ماڵی خۆمم پێ بەخشی، ئەویش وتی: من وەسێتی پیاوێک قبوڵ ناکەم کە منداڵی هەبێت و وەسێت بە سێیەک بکات.

٣٢٥٣ - «عَنْ شُرَيْحٍ، قَالَ: الثُّلُثُ جَهْدٌ وَهُوَ جَائِزٌ».[٣]

واتە: لە شورەیحەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: سێیەک مەشەققەتە و دروستیشە.

٣٢٥٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ السُّدُسُ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ الثُّلُثِ».[٤]

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: (زانایان) شەش یەکیان لەلا خۆشەویست تر بووە لە سێیەک.

### بابەت: ئەوەی دروستە و ئەوەی دروست نیە بۆ سەروەسێت

٣٢٥٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْوَصِيُّ أَمِينٌ فِيمَا أُوصِيَ إِلَيْهِ بِهِ».[٥]

واتە: لە ئیبڕاهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: سەروەسێت ئەمینە لەو شتەی وەسێتی پێ کراوە.

تێبینی: سەروەسێت بریتیە لەو کەسەی ڕادەسپێردرێت و وەسێتی بۆ دەکرێت کە چاوی لە بەڕێوەبردنی خانەوادەکەی بێت دوای مردنی وەسێتکارەکە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.

(٥) ـ إسناده حسن.

٣٢٥٦ - «عَنْ أَبِي وَهْبٍ، عَنْ مَكْحُولٍ، قَالَ: أَمْرُ الْوَصِيِّ جَائِزٌ فِي كُلِّ شَيْءٍ إِلاَّ فِي الإِبْتِيَاعِ، وَإِذَا بَاعَ بَيْعًا لَمْ يُقِلْ، وَهُوَ رَأْيُ يَحْيَى بْنِ حَمْزَةَ».(١)

واتە: لە ئەبو وەهبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە مەكحولەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: كاروبار و ڕەفتاری كڕین و فرۆشتن لەلایەن سەروەسێتەوە دروستە بۆ گشت شتێک، جگە لە كڕینی شتەكانی یەتیمەكان بۆ خۆی (چونكە ڕەنگە شەیتان لە خشتەی ببات و بە هەرزان لە دەستیان دەربێنێت و ڕەچاوی مەصڵەحەتی ئەوان نەكات)، وە كاتێ (شتەكانی ئەوانیشی) فرۆشت ئەوە ئیقالە ناكات و وەری ناگرێتەوە، ئا ئەوە بۆچونی یەحیای كوڕی حەمزەیە.

٣٢٥٧ - «عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: الْوَصِيُّ أَمِينٌ فِي كُلِّ شَيْءٍ إِلاَّ فِي الْعِتْقِ فَإِنَّ عَلَيْهِ أَنْ يُقِيمَ الْوَلاَءَ».(٢)

واتە: لە یەحیای كوڕی ئەبو كەسیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەروەسێت ئەمینە لە گشت شتێكدا تەنها لە ئازادكردن نەبێت، چونكە لەسەری واجبە وەلاء دابنێت.

٣٢٥٨ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ فِي مَالِ الْيَتِيمِ يَعْمَلُ بِهِ الْوَصِيُّ إِذَا أَوْصَى إِلَى الرَّجُلِ».(٣)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ماڵی یەتیم وتویەتی: كەسی سەروەسێت كار بە ماڵەكە دەكات ئەگەر وەسێتی بۆ كرابوو.

٣٢٥٩ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: وَصِيُّ الْيَتِيمِ يَأْخُذُ لَهُ بِالشُّفْعَةِ وَالْغَائِبُ عَلَى شُفْعَتِهِ».(٤)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەروەسێتی یەتیم بە شوفعە ماڵ بۆ یەتیمەكە وەردەگرێتەوە، كەسی غائیبیش شوفعەی خۆی وەردەگرێتەوە (كاتێ گەڕایەوەو بینی شەریكەكەی پشكی خۆی فرۆشتووە بێ پرسی ئەو).

٣٢٦٠ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ شَيْخٍ، مِنْ أَهْلِ دِمَشْقَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، وَعِنْدَهُ سُلَيْمَانُ بْنُ حَبِيبٍ، وَأَبُو قِلاَبَةَ، إِذْ دَخَلَ غُلاَمٌ فَقَالَ: أَرْضُنَا بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا، بَاعَكُمُ الْوَصِيُّ وَنَحْنُ أَطْفَالٌ، فَالْتَفَتَ إِلَى سُلَيْمَانَ بْنِ حَبِيبٍ فَقَالَ: مَا تَقُولُ؟ قَالَ: فَأَضْجَعَ فِي الْقَوْلِ، فَالْتَفَتَ إِلَى أَبِي قِلاَبَةَ، فَقَالَ: مَا تَقُولُ؟ فَقَالَ: رُدَّ عَلَى الْغُلاَمِ أَرْضَهُ. قَالَ: إِذًا يَهْلِكُ مَالُنَا. قَالَ: أَنْتَ أَهْلَكْتَهُ».(٥)

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف لضعف إسماعيل.

(٥) ـ إسناده ضعيف لجهالة عكرمة.

واتە: لە عیكریمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە شەیخێكی دیمەشقی گێراوەتەوە، وتویەتی: من لەلای عومەری كوڕی عەبدولعەزیز بووم، سولەیمانی كوڕی حەبیب و ئەبو قیلابەش لەوێ بوون، لەناكاو منداڵێكی تازە پێگەیشتوو هاتە ژورەوە و وتی: ناوچەكەمان لە فڵان و فڵان شوێنە، سەروەسێت (زەوی و ئەرزی ئێمەی) بە ئێوە فرۆشتووە لە كاتێكدا ئێمە منداڵ بووین (مەصڵەحەتی ئێمەی ڕەچاو نەكردوە)، جا ئاوڕی دایەوە بۆ لای سولەیمانی كوڕی حەبیب و وتی: چی دەڵێی؟ دەڵێ: زمانی نەیگرت چ بڵێت (نەیزانی چی بڵێت)، جا ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئەبو قیلابە و وتی: چی دەڵێی: ئەویش وتی: زەوی منداڵەكە بۆ منداڵەكە بگەڕێنەوە، ئەویش وتی: ئاخر سەروەتمان لەناو دەچێت؟ ئەبو قیلابە وتی: خۆت لەناوت بردووە (هەڵەی خۆتە).

## بابەت: ئەگەر (كەسێک) وەسێتی بە نیوەی ماڵەكەی بۆ كەسێک كردو بە سێیەكیشی بۆ كەسێكی دیكەی كرد

٣٢٦١ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ أَوْصَى لِرَجُلٍ بِنِصْفِ مَالِهِ، وَلِآخَرَ بِثُلُثِ مَالِهِ، قَالَ: يَضْرِبَانِ بِذَلِكَ فِي الثُّلُثِ: هَذَا بِالنِّصْفِ وَهَذَا بِالثُّلُثِ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێتی بۆ پیاوێک كردوە بە نیوەی ماڵەكەی و وەسێتی بۆ كەسێكی تریش كردوە بە سێیەكی ماڵەكەی، وتویەتی: دابەشی دەكەن بەم شێوەیە لە سێیەكدا: ئەوەیان نیوە دەبات ئەوەشیان سێیەک (واتە: تەنها سێیەكی ماڵەكەی دەبێتە وەسێت، جا خاوەنی نیوەكە نیوەی سێیەكەكە دەبات و خاوەنی سێیەكەكەش سێیەک لە سێیەكەكە دەبات).

## بابەت: پەشیمان بوونەوە لە وەسێت

٣٢٦٢ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: يُغَيِّرُ صَاحِبُ الْوَصِيَّةِ مِنْهَا مَا شَاءَ غَيْرَ الْعَتَاقَةِ».[٢]

واتە: لە شەعبیەوە گێردراوەتەوە وتویەتی: خاوەنی وەسێت گۆڕانكاری لە وەسێتەكەی خۆیدا دەكات چۆنی بوێت، جگە لە كۆیلە ئازاد كردن (ناتوانێت لێی پەشیمان ببێتەوە ئەگەر ئازادی كرد).

٣٢٦٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: يُحْدِثُ الرَّجُلُ فِي وَصِيَّتِهِ مَا شَاءَ، وَمِلَاكُ الْوَصِيَّةِ آخِرُهَا».[٣]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی ڕەبیعەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: پیاو گۆڕانكاری لە وەسێتەكەی خۆیدا دەكات چۆنی بوێت، ئەساسی وەسێت كۆتاییەكەیەتی.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٣) ـ إسناده رجاله ثقات.




٣٢٦٤ - «حَدَّثَنِي قَتَادَةُ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، أَنَّ أَبَاهُ أَعْتَقَ رَقِيقًا لَهُ فِي مَرَضِهِ، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَرُدَّهُمْ وَيُعْتِقَ غَيْرَهُمْ، قَالَ: فَخَاصَمُونِي إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ فَأَجَازَ عِتْقَ الآخِرِينَ، وَأَبْطَلَ عِتْقَ الأَوَّلِينَ».(١)

واتە: لە قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەمری كوڕی دینار بۆی گێڕامەوە كە باوكی چەند بەندەیەكی خۆی ئازاد كرد لەكاتی نەخۆشیەكەیدا، دواتر (پەشیمان بوویەوە) و پێی باش بوو ئەوان بگەڕێنێتەوە و هیتر ئازاد بكات، دەڵێ: جا كێشەیان لەگەڵ دروست كردم و چووین بۆ لای عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان و ئەویش ئازادكردنی وەجبەی دواتری جێبەجێ كرد و، ئازادكردنی وەجبەی یەكەمی هەڵوەشاندەوە.

٣٢٦٥ - «قَالَ عُمَرُ ﷺ: يُحْدِثُ الرَّجُلُ فِي وَصِيَّتِهِ مَا شَاءَ، وَمِلاَكُ الْوَصِيَّةِ آخِرُهَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هَمَّامٌ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عَمْرٍو، وَبَيْنَهُمَا قَتَادَةُ».(٢)

واتە: عومەر ﷺ وتویەتی: پیاو گۆڕانكاری لە وەسێتەكەیدا دەكات چۆنی بوێت، ئەساس و گرنگی وەسێت كۆتاییەكەیەتی (كەواتە: وەسێتی كۆتایی جێبەجێ دەكرێت).

٣٢٦٦ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِوَصِيَّةٍ ثُمَّ يُوصِي بِأُخْرَى، قَالَ: هُمَا جَائِزَتَانِ فِي مَالِهِ».(٣)

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێتێك دەكات، دواتر دەیگۆڕێت و وەسێتێكی تر دەكات، وتویەتی: هەردووكیان دروستن لە ماڵەكەیدا.

٣٢٦٧ - «قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: مِلاَكُ الْوَصِيَّةِ آخِرُهَا».(٤)

واتە: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: ئەساسی وەسێت كۆتاییەكەیەتی.

## بابەت: دەربارەی سەروەسێتی تۆمەتباركراو

٣٢٦٨ - «عَنْ يَحْيَى، قَالَ: إِذَا اتُّهِمَ الْقَاضِي الْوَصِيِّ لَمْ يَعْزِلْهُ، وَلَكِنْ يُوَكِّلُ مَعَهُ غَيْرَهُ وَهُوَ رَأْيُ الأَوْزَاعِيِّ».(٥)

واتە: لە یەحیاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێ قازی سەروەسێتی تۆمەتبار كرد لەكاری ناخات، بەڵكو وەكیلێكی لەگەڵ دادەنێت (بۆ چاودێری كردنی كاری سەروەسێتەكە)، ئەوە بۆچونی ئەوزاعیە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده منقطع.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده منقطع.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: وەسێتی كەسی نەخۆش

٣٢٦٩ - «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: يَجُوزُ بَيْعُ الْمَرِيضِ وَشِرَاؤُهُ وَنِكَاحُهُ، وَلاَ يَكُونُ مِنَ الثُّلُثِ».(١)

واتە: لە عامیرەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: كڕین و فرۆشتن و ژن و ژنخوازی كەسی نەخۆش (كە نەخۆشی سەرەمەرگی بێت) دروستە و لە سێیەكەكە ئەژمار ناكرێت (واتە: جگە لە سێیەک ئەم شتانەش جێبەجێ دەكرێن).

٣٢٧٠ - «عَنِ الْحَارِثِ الْعُكْلِيِّ، قَالَ: مَا حَابَى بِهِ الْمَرِيضُ فِي مَرَضِهِ مِنْ بَيْعٍ أَوْ شِرَاءٍ، فَهُوَ فِي ثُلُثِهِ قِيمَةُ عَدْلٍ».(٢)

واتە: لە حاریثی عوكلیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەوەی كەسی نەخۆش (كە نەخۆشی سەرەمەرگی بێت) دەیبەخشێت لە كاتی نەخۆشیەكەیدا لە كڕین و فرۆشتن، ئەوە لە سێیەكەكەی ئەژمار دەكرێت، بە قرساندن و تەخمین كردنی كەسێكی عەدل و دادپەروەر.

٣٢٧١ - «عَنْ يَحْيَى هو ابْنُ سَعِيدٍ قَالَ: أَعْطَتْ امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِنَا وَهِيَ حَامِلٌ، فَسُئِلَ الْقَاسِمُ، فَقَالَ: هُوَ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ، قَالَ يَحْيَى: وَنَحْنُ نَقُولُ: إِذَا ضَرَبَهَا الْمَخَاضُ فَمَا أَعْطَتْهُ، فَمِنَ الثُّلُثِ».(٣)

واتە: لە یەحیاوە (كە دەكاتە) ئیبنو سەعید گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک لە ئێمە وەسێتی كرد لە كاتێكدا كە دووگیان بوو، جا پرسیار لە قاسم كرا، ئەویش وتی: جێبەجێ دەكرێت لە كۆی ماڵەكە (نەک لە سێیەک)، یەحیا وتویەتی: ئێمەش دەڵێین: ئەگەر كاتی دانانی حەملەكەی هات ئەوەی بیبەخشێت لە سێیەک ئەژمار دەكرێت (نەک لە كۆی ماڵەكەی).

٣٢٧٢ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ قَالَ لِغُلاَمِهِ: إِنْ دَخَلْتُ دَارَ فُلاَنٍ، فَغُلاَمِي حُرٌّ، ثُمَّ دَخَلَهَا وَهُوَ مَرِيضٌ، قَالَ: يُعْتَقُ مِنَ الثُّلُثِ، وَإِنْ دَخَلَ فِي صِحَّتِهِ، عُتِقَ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ».(٤)

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک كە بە بەندەكەی خۆی وتووە: ئەگەر بچم بۆ ماڵی فڵانە كەس ئەوە بەندەكەم ئازاد بێت، دواتر چووە بۆ ماڵەكە لەكاتێكدا نەخۆش بووە (لە نەخۆشی سەرەمەرگدا چووە بۆ ئەوێ)، (حەسەن) وتویەتی: بەندەكە ئازاد دەكرێت لە سێیەكەكە، وە ئەگەر چوو بۆ ئەوێ لە كاتی ساغی ئەوە ئازاد دەكرێت لە كۆی ماڵەكە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.




## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی لە سێیەكی وەسێت دەگێڕێتەوە و دەیدات بە میراتگر

٣٢٧٣ - «عَنْ مَكْحُولٍ، قَالَ: إِذَا كَانَ الْوَرَثَةُ مَحَاوِيجَ، فَلاَ أَرَى بَأْسًا أَنْ يُرَدَّ عَلَيْهِمْ مِنَ الثُّلُثِ، قَالَ يَحْيَى: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلأَوْزَاعِيِّ فَأَعْجَبَهُ».[١]

واتە: لە مەكحولەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر میراتگر موحتاج و نەبوون بوون، ئەوە من هیچ كێشەیەک نابینم بەوەی لە سێیەكی وەسێتیان بۆ بگەڕێندرێتەوە، یەحیا وتویەتی: ئەوەم باس كرد بۆ ئەوزاعی و ئەویش پێی باش بوو.

## بابەت: كاتێ دوو لە میراتگران شاهێدی دەدەن (لەسەر وەسێت)

٣٢٧٤ - «عَنِ الحسن و إِبْرَاهِيمَ، قَالاَ: إِذَا شَهِدَ شَاهِدَانِ مِنَ الْوَرَثَةِ، جَازَ عَلَى جَمِيعِهِمْ، وَإِذَا شَهِدَ وَاحِدٌ، فَفِي نَصِيبِهِ بِحِصَّتِهِ».[٢]

واتە: لە حەسەن و ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەگەر دوو شاهێد لە میراتگران شاهێدیاندا (لەسەر هەبوونی وەسێت بۆ كەسێكی جگە لە خۆیان لەلایەن خاوەنی میراتەكەیان)، ئەوە لەسەر گشتیان دادەمەزرێت (دەبێ هەر كەسە و بە پێی پشكی خۆی پشكی وەسێت بۆكراوەكە بدات)، وە ئەگەر یەک كەس (لە میراتگران) شاهێدی بدات، ئەوە تەنها لە پشكی میراتی خۆی پشكی كابرای وەسێت بۆكراو دادەمەزرێت و دەبێت بیدات بەوەی بەر خۆی دەكەوێت (واتە: وەسێتەكە حیسابی ئەوەی بۆ دەكرێت ئەگەر ئیسپات بایە پشكی ئەو چەند كەمی دەكرد ئەوەندە دەدرێتە كەسە وەسێت بۆكراوەكە، بەڵام لەوانیتر وەرناگیرێت، چونكە بە یەک كەس ئیسپات نابێت).

٣٢٧٥ - «حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ: أَنَّهُ سَمِعَ الشَّعْبِيَّ، يَقُولُ: إِذَا شَهِدَ رَجُلٌ مِنَ الْوَرَثَةِ، فَفِي نَصِيبِهِ بِحِصَّتِهِ ثُمَّ قَالَ: بَعْدَ ذَلِكَ فِي جَمِيعِ حِصَّتِهِ».[٣]

واتە: لە موتەرریفەوە گێڕدراوەتەوە، كە گوێی لە شەعبی بووە كاتێ دەیووت: ئەگەر یەكێک لە میراتگران شاهێدیدا (لەسەر هەبوونی وەسێتێک لە میراتەكەیان)، ئەوە تەنها لە پشكی میراتی خۆی دادەمەزرێت بە پێی پشكی كابرا وەسێت بۆ كراوەكە، دواتر پاش ئەوە وتی: لە گشت پشكەكەیەتی.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: ئەو وەسێتەی لە ماڵی كاش و قەرز دەكرێت (بە یەک جار)

٣٢٧٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ بِالثُّلُثِ، وَالرُّبُعِ، فَفِي الْعَيْنِ وَالدَّيْنِ، وَإِذَا أَوْصَى بِخَمْسِينَ أَوْ سِتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ، فَفِي الْعَيْنِ حَتَّى يَبْلُغَ الثُّلُثَ».(١)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر پیاوێک وەسێتی كرد بە سێیەک و، چواریەک، ئەوە لە ماڵە كاش و قەرزەكە (حیساب دەكرێت)، وە ئەگەر وەسێتی بە پەنجا، یان شەست، تا سەد كرد، ئەوە لە ماڵە كاشەكەیە تاوەكو دەگات بە سێیەک.

تێبینی: (نمونەی ئەو بابەتە ئاوایە): بۆ نمونە كەسێک دە دیناری لە ماڵ هەیەو، دە دیناریشی لە قەرزە، جا وەسێت دەكات سێیەكی ماڵەكەی بدرێت بە كەسێک، جا ئەو سێیەكە لە هەردووكیان حیساب دەكرێت، نیوە لە پارە كاشەكە و نیوەش لە پارە قەرزەكە، بەڵام ئەگەر نەگەیشتبوو بە سێیەک ئەوە تەنها لە پارە كاشەكە دەدرێت.

## بابەت: ئەوانەی وەسێتیان پێ چاک نەبووەو ئەوانەی پێیان چاک بووە

٣٢٧٧ - «عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قُسَيْطٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْمَرْءُ أَحَقُّ بِثُلُثِ مَالِهِ يَضَعُهُ فِي أَيِّ مَالِهِ شَاءَ».(٢)

واتە: لە یەزیدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی قەسەیتەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤ بە دڵی خۆیەتی لە كام جۆر لەو ماڵەی هەیەتی سێیەكی وەسێتەكەی دیاری بكات.

٣٢٧٨ - «عَنْ أَبِي حَبِيبَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ جَعَلَ دَرَاهِمَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَثَلُ الَّذِي يَتَصَدَّقُ عِنْدَ مَوْتِهِ، أَوْ يُعْتِقُ، كَالَّذِي يُهْدِي بَعْدَمَا شَبِعَ».(٣)

واتە: لە ئەبو حەبیبەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئەبو دەرداء ﷺ كرد دەربارەی پیاوێک كە چەند درهەمێكی كردوون بە خێر لە پێناوی خوا ﷺ (لە كاتی سەرەمەرگدا)، ئەبو دەردائیش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نمونەی ئەو كەسەی خێر و بەخشین دەكات، یان بەندە ئازاد دەكات لەكاتی مردنیدا، وەک ئەو كەسە وایە كە دیاری و خێر ببەخشێت دوای ئەوەی خۆی تێر بووە و پێویستی پێ نەماوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ رجال إسناده ثقات إلا أنه مرسل.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: ئەوەی سەرەتا دەست پێ دەكرێت لە وەسێتەكان

٣٢٧٩ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِأَشْيَاءَ ومنهَا الْعِتْقُ، فَيُجَاوِزُ الثُّلُثَ؟ قَالَ: يُبْدَأُ بِالْعِتْقِ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێتی بە چەندین شت كردوە لە ناویشیاندا ئازادكردنی بەندەی تیایە و وەسێتەكەش لە سێیەک تێپەڕ دەبێت (واتە: سێیەک بەشی هەموو ئەو شتانە ناكا تاكە وەسێتی كردوە، جا كامیان پێش دەخرێت)؟ وتی: لە ئازادكردنی بەندە دەست پێ دەكرێت (جا لە كۆتایی كامیان لەبەر بڕا ئەوە تەرک دەكرێت، چونكە ناكرێت وەسێت لە سێیەک تێپەڕ ببێت).

٣٢٨٠ - «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: بِالْحِصَصِ».[٢]

واتە: لە موحەممەدەوە (واتە: لە ئیبنو سیرینەوە) گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە پێی پشكە (واتە: ئەگەر چەند وەسێتێک كرابن و لە سێیەک تێپەڕ بكات، ئەوە سێیەک دابەش دەكرێت بەسەر ئەو وەسێتانەی كراون و ئەو ئەندازەیان لێ جێبەجێ دەكرێت كە لە سێیەكە بەریان دەكەوێت، واتە: گشت جۆرەكانی وەسێت جێبەجێ دەكرێت بە پێی ئەو پشكەی بەریان دەكەوێت لە سێیەكە).

٣٢٨١ - «عن عَطَاءٍ، قَالَ: مَنْ أَوْصَى أَوْ أَعْتَقَ، فَكَانَ فِي وَصِيَّتِهِ عَوْلٌ، دَخَلَ الْعَوْلُ عَلَى أَهْلِ الْعَتَاقَةِ وَأَهْلِ الْوَصِيَّةِ، قَالَ عَطَاءٌ: إِنَّ أَهْلَ الْمَدِينَةِ غَلَبونا، يَبْدَءُونَ بِالْعَتَاقَةِ قَبْلُ».[٣]

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک وەسێتی كرد، یان بەندەی ئازاد كرد و عەول كەوتە وەسێتەكەیەوە (واتە: وەسێتەكەی زیاتر دەرچوو لە سێیەک) ئەوە ئەو عەولە دەكەوێتە سەر ئەو كەسانەی كە ئازادكراون و ئەوانەش كە وەسێتیان بۆ كراوە (واتە: سێیەكەكە لە نێوان هەردوو لا دابەش دەكرێت و بەو ئەندازەیە جێبەجێ دەكرێت)، عەطاء وتویەتی: ئەهلی مەدینە بەسەرماندا زاڵ بوون، سەرەتا دەست بە ئازادكردن دەكەن (لە سێیەكەكە، جا ئەگەر هێشتا سێیەک تەواو نەببوو ئەوە وەسێتەكانی تر بە پێی پشكی خۆیان لە سێیەكەكە جێبەجێ دەكەن).

٣٢٨٢ - «حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: قَالَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، فِي الَّذِي يُوصِي بِعِتْقٍ وَغَيْرِهِ فَيَزِيدُ عَلَى الثُّلُثِ قَالَ: بِالْحِصَصِ».[٤]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە حەممادی كوڕی زەیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەمری كوڕی دینار دەربارەی ئەو كەسەی وەسێت دەكات بە ئازادكردنی بەندە و جگە لە بەندەش (واتە: وەسێتی تریش دەكات و كۆی گشتی) لە سێیەک تێپەڕ دەكات، وتویەتی: بە پێی پشكەكانە (واتە: سێیەكەكە بەسەر گشت جۆرەكانی وەسێت دابەش دەكرێت، هەر یەكەو چەندی بەركەوت ئەوەندە جێبەجێ دەكرێت).

٣٢٨٣ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ أَوْصَى بِأَكْثَرَ مِنَ الثُّلُثِ وَفِيهِ عِتْقٌ؟ قَالَ: يُبْدَأُ بِالْعِتْقِ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک كە وەسێتی كردوە بە زیاتر لە سێیەک و ئازادكردنی بەندەشی تیایە (جا ئایا كامیان لە پێشترە بۆ جێبەجێ كردن تاوەكو لە كۆتاییدا لێی نەبڕێت)؟ وتی: بە ئازادكردنی بەندە دەست پێ دەكرێت.

٣٢٨٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: يُبْدَأُ بِالْعَتَاقَةِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئازادكردنی بەندە دەست پێ دەكرێت بەر لە وەسێت.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی كە وەسێت دەكات بۆ بەرەبابی فلان بە پشكێک لە ماڵەكەی

٣٢٨٥ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ يُوصِي لِبَنِي فُلَانٍ قَالَ: غَنِيُّهُمْ وَفَقِيرُهُمْ، وَذَكَرُهُمْ وَأُنْثَاهُمْ سَوَاءٌ».[٣]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک كە وەسێت بۆ بەرەبابی فلان بكات، وتویەتی: دەوڵەمەندەكەیان و، هەژارەكەیان و، نێریان و، مێیان وەكو یەكن (وەک یەک مافیان لەو پشكە دەبێت).

٣٢٨٦ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى لِبَنِي فُلَانٍ، فَالذَّكَرُ وَالأُنْثَى فِيهِ سَوَاءٌ».[٤]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێ (كەسێک) وەسێت بۆ بەرەبابی فلان دەكات، ئەوە نێر و مێ تیایدا یەكسانن.

٣٢٨٧ - «حَدَّثَنِي يَسَارُ بْنُ أَبِي كَرِبٍ، أَنَّ آتِيًا أَتَى شُرَيْحًا، فَسَأَلَهُ عَنْ رَجُلٍ أَوْصَى بِسَهْمٍ مِنْ مَالِهِ، قَالَ: تُحْسَبُ الْفَرِيضَةُ فَمَا بَلَغَ سِهَامَهَا أُعْطِيَ الْمُوصَى لَهُ سَهْمًا كَأَحَدِهَا».[٥]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده حسن.

واتە: لە یەساری کوڕی ئەبو کەریبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسێک هات بۆ لای شوڕەیح و پرسیاری لێ کرد دەربارەی پیاوێک کە وەسێتی کردوە بە پشکێک لە ماڵەکەی (کە ئایا چۆن دابەش دەکرێت)؟ شوڕەیح وتی: میراتەکە دابەش دەکرێت (بە یەکسانی)، جا پشکەکانی گەیشتن بە چەند پشک لەو پشکانە دەدرێت بەوەی وەسێتی بۆ کراوە.

## بابەت: کاتێ پیاو دەبەخشێتەوە بەسەر هەندێک لە میراتگرانی

٣٢٨٨ - «عَنْ مَكْحُولٍ، قَالَ: إِذَا تَصَدَّقَ الرَّجُلُ عَلَى بَعْضِ وَرَثَتِهِ وَهُوَ صَحِيحٌ بِأَكْثَرَ مِنَ النِّصْفِ، رُدَّ إِلَى الثُّلُثِ، وَإِذَا أَعْطَى النِّصْفَ، جَازَ لَهُ ذَلِكَ، قَالَ سَعِيدٌ: وَكَانَ قُضَاةُ أَهْلِ دِمَشْقَ يَقْضُونَ بِذَلِكَ».[١]

واتە: لە مەکحولەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پیاو زیاتر لە نیوەی ماڵەکەی دەبەخشێتەوە بەسەر هەندێک (یان یەکێک) لە میراتگرانی لەکاتێکدا خۆی ساغ و سەلامەتە، ئەوە دەکرێتەوە سێیەک (واتە: دروست نیە لە نیوە زیاتر ببەخشێت بە میراتگر)، بەڵام ئەگەر نیوەی پێ بەخشی، ئەوە بۆی دروستە، قازیەکانی دیمەشقیش بەوە دادوەریان کردوە و بڕیاریان داوە.

## بابەت: ئەوەی دەڵێ کفن لە کۆی ماڵە ئەژمارکراوەکە دەردەکرێت

٣٢٨٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْكَفَنُ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کفن لە کۆی ماڵەکە دەردەکرێت.

٣٢٩٠ - «عَنْ الْحَسَنِ، فِي رَجُلٍ مَاتَ وَتَرَكَ قِيمَةَ أَلْفَيْ دِرْهَمٍ، وَعَلَيْهِ مِثْلُهَا أَوْ أَكْثَرُ، قَالَ: يُكَفَّنُ مِنْهَا وَلاَ يُعْطَى دَيْنُهُ».[٣]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە مردبێت و ئەندازەی دوو هەزار درهەمی لە دوای خۆی جێهێشتبێت و بە قەد ئەو ئەندازەیە، یان زیاتریش قەرزی لەسەر بێت، وتویەتی: کەسەکە کفن دەکرێت لەو دوو هەزار درهەمەی کە بە کاش لای خۆی هەیەتی و جارێ قەرزەکەی نادرێتەوە (بەر لە کفن کردن و بەخاک سپاردنی، بەڵکو مەسرەفی کفن و بە خاک سپاردنەکەی لە پارەکەی دەدرێت دواتر ئەوەی دەمێنێتەوە دەدرێتەوە بە قەرزەکەی).

٣٢٩١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: يُبْدَأُ بِالْكَفَنِ، ثُمَّ الدَّيْنِ، ثُمَّ الْوَصِيَّةِ».[٤]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف فيه جهالة.

واتە: ئیبراهیم وتویەتی: (دابەش كردنی سەروەت و سامانی مردووەكە) سەرەتا بە كفن دەست پێ دەكرێت، دواتر قەرز، دواتر وەسێت.

٣٢٩٢ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي الْمَرْأَةِ تَمُوتُ، قَالَ: تُكَفَّنُ مِنْ مَالِهَا، لَيْسَ عَلَى الزَّوْجِ شَيْءٌ».[١]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتەی دەمرێت، وتویەتی: سەرەتا كفن دەكرێت لە ماڵ و سامانەكەی، هیچیش لەسەر مێردەكەی واجب نیە (لە مەسرەفی كفن و بەخاك سپاردن و قەرزە تایبەتیەكانی).

٣٢٩٣ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: الْحَنُوطُ، وَالْكَفَنُ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ».[٢]

واتە: لە عەتائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوڵاوی مردوو و كفن لە سەرمایەكە دەردەكرێت.

٣٢٩٤ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: الْكَفَنُ مِنْ وَسَطِ الْمَالِ، فيُكَفَّنُ عَلَى قَدْرِ مَا كَانَ يَلْبَسُ فِي حَيَاتِهِ، ثُمَّ يُخْرَجُ الدَّيْنُ، ثُمَّ الثُّلُثُ».[٣]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كفن لە كرۆكی ماڵەكە دەردەكرێت، جا كفن دەكرێت بە گوێرەی ئەوەی پۆشیویەتی لە دونیا (واتە: مەسرەفێكی وەك مەسرەفی جلی كاتی زیندویی بۆ دەكرێت)، دواتر قەرز لە ماڵەكە دەردەكرێت، دواتر سێیەك و وەسێت جێبەجێ دەكرێت.

## بابەت: كاتێ كەسێك وەسێت بۆ كەسێك دەكات لە كاتێكدا ئامادە نیە

٣٢٩٥ - «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَهُوَ غَائِبٌ، فَلْيَقْبَلْ وَصِيَّتَهُ، وَإِنْ كَانَ حَاضِرًا، فَهُوَ بِالْخِيَارِ: إِنْ شَاءَ، قَبِلَ، وَإِنْ شَاءَ، تَرَكَ».[٤]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە كە دەیووت: كاتێ پیاوێك وەسێت بۆ پیاوێك دەكات و (شتێكی پێ دەبەخشێت) لە كاتێكدا (كەسە وەسێت بۆكراوەكە) ئامادە نیە، ئەوە با وەسێتەكەی قبوڵ بكات، وە ئەگەر ئامادە بوو، ئەوە سەرپشكە: ئەگەر حەز بكات وەری دەگرێت، ئەگەر حەزیش بكات (وازی لێ بێنێت و نەیەوێت) ئەوە وازی لێ دێنێت و ڕەتی دەكاتەوە.

٣٢٩٦ - «عَنْ أَيُّوبَ، قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ، وَمُحَمَّدًا، عَنِ الرَّجُلِ يُوصِي إِلَى الرَّجُلِ، قَالاَ: نَخْتَارُ أَنْ يَقْبَلَ».[٥]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەیوبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە حەسەن و موحەممەد کرد دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێتی بۆ کەسێک کردوە (ئایا وەری بگرێت باشە یان نا)؟ وتیان: پێمان باشە وەری بگرێت.

٣٢٩٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَهُوَ غَائِبٌ، فَإِذَا قَدِمَ فَإِنْ شَاءَ، قَبِلَ، فَإِذَا قَبِلَ، لَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يَرُدَّهُ».(١)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پیاوێک وەسێت بۆ پیاوێک دەکات لە کاتێکدا ئامادە نیە، ئەگەر هاتەوە و حەزی کرد وەری دەگرێت، جا کە وەری گرت ئەوە بۆی نیە بیگەڕێنێتەوە.

٣٢٩٨ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فَعُرِضَتْ عَلَيْهِ الْوَصِيَّةُ، وَكَانَ غَائِبًا فَقَبِلَ، لَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ».(٢)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پیاوێک وەسێت بۆ پیاوێک دەکات و وەسێتەکەی بۆ عەرز دەکرێت و خۆیشی ئامادە نیە و وەسێتەکەش قبوڵ دەکات و وەری دەگرێت، ئەوە بۆی نیە پەشیمان ببێتەوە.

## بابەت: وەسێت کردن بۆ مردوو

٣٢٩٩- «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ لإِنْسَانٍ، وَهُوَ غَائِبٌ، وَكَانَ مَيِّتًا، وَهُوَ لاَ يَدْرِي، فَهِيَ رَاجِعَةٌ».(٣)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پیاوێک وەسێتی بۆ کەسێک کرد لە کاتێکدا کەسەکە ئامادە نەبوو مردبوو، ئەوەی وەسێتیشی کرد نەیزانی مردووە، (لەو حاڵەتەدا) وەسێتەکە دەگەڕێتەوە (واتە: جێبەجێ نابێت).

## بابەت: وەسێت کردن بۆ بەندە

٣٣٠٠ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى لِعَبْدِهِ ثُلُثَ مَالِهِ، رُبُعَ مَالِهِ، خُمُسَ مَالِهِ، فَهُوَ مِنْ مَالِهِ دَخَلَتْهُ عَتَاقَةٌ».(٤)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر کەسێک وەسێتی کرد بۆ بەندەکەی بە سێیەکی ماڵەکەی، یان چواریەکی ماڵەکەی، یان پێنج یەکی ماڵەکەی، ئەوە بەندەکەی خۆی بەشێکە لە ماڵەکەی کەواتە: ئازادکردنەکەی دەکەوێتە ناو ماڵەکەوە (دەیگرێتەوەو ئازاد دەبێت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

## بابەت: ئەو زانایانەی پێیان باش نەبووە کە مرۆڤ ماڵەکەی پەخش بکات لە کاتی مردندا

٣٣٠١ - «عَنْ قَيْسٍ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ بَرَكَةَ مَالِهِ فِي حَيَاتِهِ، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْمَوْتِ تَزَوَّدَ بِفَجْرَةٍ».(١)

واتە: لە قەیسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دەوترا: پیاو هەیە بەرەکەتی ماڵەکەی قەدەغە دەکات لە کاتی ژیانیدا (واتە: لە کاتی ساغی نایبەخشێت)، جا کاتێ دەگاتە سەرەمەرگ زەخیرە دادەکات (بۆ دواڕۆژی) بە سەخاوەت و بەخشین.

٣٣٠٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: الْمُرَّانِ: الإِمْسَاكُ فِي الْحَيَاةِ، وَالتَّبْذِيرُ عِنْدَ الْمَوْتِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يُقَالُ مُرٌّ فِي الْحَيَاةِ وَمُرٌّ عِنْدَ الْمَوْتِ».(٢)

واتە: لە ئیبراهیمی تەیمیەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: دوو تاڵیەکان (بریتین لەم دووانە): نەبەخشین لە ژیاندا (ئەوەیان بۆ خۆی تاڵە پاداشتی لە کیس دەچێت)، وە زێدەڕۆیی کردن لە بەخشیندا لە کاتی مردن (ئەوەشیان تاڵە بۆ خزم و کەس، چونکە پشکیان کەم دەکات).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: تاڵیەک لە ژیاندا و، تاڵیەکیش لەکاتی مردندا.

## بابەت: ئەو پیاوەی وەسێت بۆ کەسێک دەکات بە ئەندازەی پشکی میراتگرێک

٣٣٠٣ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ لِآخَرَ بِمِثْلِ نَصِيبِ ابْنِهِ، فَلاَ يَتِمُّ لَهُ مِثْلُ نَصِيبِهِ، حَتَّى يَنْقُصَ مِنْهُ».(٣)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ پیاو وەسێت بۆ کەسێک دەکات بە ئەندازەی هەمان پشکی منداڵەکەی، ئەوە ئەندازەی هەمان پشکی ئەوی بۆ تەواو ناکرێت و پێی نادرێت تاوەکو لێی کەم دەکاتەوە (واتە: دەبێت لەو ئەندازەیە کەمتری بکاتەوە تاوەکو جێبەجێ بکرێت).

٣٣٠٤ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ كَانَ لَهُ ثَلاَثَةُ بَنِينَ، فَأَوْصَى لِرَجُلٍ مِثْلَ نَصِيبِ أَحَدِهِمْ لَوْ كَانُوا أَرْبَعَةً، قَالَ الشَّعْبِيُّ: يُعْطَى الْخُمُسَ».(٤)

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە سێ کوڕی هەنە و، وەسێت بۆ پیاوێک دەکات بە هاوشێوەی پشکی یەکێکیان، ئەگەر ببن بە چوار (وەک لەم فەرموودەیەدا هاتووە): شەعبی وتویەتی: (کەسە وەسێت بۆ کراوەکە) پێنج یەکی پێ دەدرێت (تاوەکو نەگاتە ئەندازەی پشکی هەر یەکێکیان، چونکە میراتگرەکان سیانن).

٣٣٠٥ - «حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، قَالَ: سَأَلْنَا عَامِرًا، عَنْ رَجُلٍ تَرَكَ ابْنَيْنِ وَأَوْصَى بِمِثْلِ نَصِيبِ أَحَدِهِمْ لَوْ كَانُوا ثَلاَثَةً، قَالَ: أَوْصَى بِالرُّبُعِ».[١]

واتە: لە داوودی کوڕی ئەبی هیندەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارمان لە عامیر کرد دەربارەی پیاوێک کە دوو کوڕی دوای خۆی جێ هێشتووە و وەسێتی کردوە بە هاوشێوەی یەکێکیان ئەگەر هاتوو سێ بن (واتە: بە وەسێت بۆکراوەکە و کوڕەکان ببن بە سێ کەس)، ئەوە داوود وتویەتی: وەسێت بە چوار یەک دەکات (بۆ کەسە وەسێت بۆکراوەکە تاوەکو پشکی وەسێت بۆکراوەکە نەگاتە پشکی میراتگران).

٣٣٠٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ فِي رَجُلٍ أَوْصَى بِمِثْلِ نَصِيبِ بَعْضِ الْوَرَثَةِ، قَالَ: لاَ يَجُوزُ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنَ الثُّلُثِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هُوَ حَسَنٌ».[٢]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە وەسێت بە ئەندازەی هەمان پشکی میراتگران دەکات، وتویەتی: دروست نیە، ئەگەرچی لە سێیەکیش کەمتر بێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەوەیان چاکە.

## بابەت: دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێت دەکات بە بەرهەمی بەندەکەی

٣٣٠٧ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ أَوْصَى فِي غَلَّةِ عَبْدِهِ بِدِرْهَمٍ، وَغَلَّتُهُ سِتَّةٌ، قَالَ: لَهُ سُدُسُهُ».[٣]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە وەسێتی بە درهەمێک کردوە لە بەرهەمی بەندەکەی، بەرهەمەکەشی شەش درهەمە، وتویەتی: (کابرای وەسێتی بۆ کراوە) شەش یەکی بۆ هەیە (لە بەرهەمی بەندەکە).

## بابەت: وەسێت کردن بۆ میراتگر

٣٣٠٨ - «أَخْبَرَنَا قَبِيصَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ سُفْيَانَ، يَقُولُ: إِذَا أَقَرَّ لِوَارِثٍ وَلِغَيْرِ وَارِثٍ بِمِئَةِ دِرْهَمٍ، قَالَ: أَرَى أَنْ أُبْطِلَهُمَا جَمِيعًا».[٤]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى الشعبي.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى سفيان.

واتە: لە قەبیصەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سوفیان بوو دەیووت: ئەگەر کەسێک دانینا بە سەد درهەم بۆ میراتگر و غەیری میراتگر (بەوەی وتی: قەرزاریانم)، وتویەتی: من هەردووکیان بەیەکەوە بەتاڵ دەکەمەوە (چونکە گومانی ئەوەی لێ دەکرێت بیەوێ بەو فێڵە پشکی میراتگرێک زیاتر بکات).

٣٣٠٩ - «عَنْ شُرَيْحٍ، قَالَ: لاَ يَجُوزُ إِقْرَارٌ لِوَارِثٍ، قَالَ: وَقَالَ الْحَسَنُ: أَحَقُّ مَا جَازَ عَلَيْهِ عِنْدَ مَوْتِهِ أَوَّلَ يَوْمٍ مِنْ أَيَّامِ الآخِرَةِ، وَآخِرَ يَوْمٍ مِنْ أَيَّامِ الدُّنْيَا».[١]

واتە: لە شورەیحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داننان بە قەرز بۆ میراتگر دروست نیە، دەڵێ: حەسەنیش (بە پێچەوانەی شورەیح) وتویەتی: شایستەترین کات کە دروست بێت وەسێت بۆ میراتگر جێبەجێ بکرێت لە کاتی مردنی خاوەن میراتەکە بریتیە لە یەکەم ڕۆژ لە ڕۆژەکانی دوارۆژ و کۆتا ڕۆژ لە ڕۆژەکانی دونیا (واتە: خاوەنی وەسێتەکە لە ڕۆژی کۆتایی ژیانیدا وەسێتەکەی بۆ میراتگر جێبەجێ دەکرێت).

٣٣١٠ - «عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ: لاَ يَجُوزُ لِوَارِثٍ وَصِيَّةٌ».[٢]

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ وەسێتێک بۆ میراتگر دروست نیە.

٣٣١١ - «عَنْ حُمَيْدٍ، أَنَّ رَجُلاً يُكْنَى أَبَا ثَابِتٍ أَقَرَّ لاِمْرَأَتِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ أَنَّ لَهَا عَلَيْهِ أَرْبَعَمِائَةِ دِرْهَمٍ مِنْ صَدَاقِهَا، فَأَجَازَهُ الْحَسَنُ».[٣]

واتە: لە حومەیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک کە کونیەکەی ئەبو ثابیت بوو دانینا (بە قەرزێک) بۆ خێزانەکەی بەوەی کە چوار سەد درهەمی ئەوی لەسەرە لە مارەییەکەی، جا حەسەن ڕێگەیدا و جێبەجێی کرد.

٣٣١٢ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ تَحْتَ نَاقَةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَهِيَ تَقْصَعُ بِجِرَّتِهَا، وَلُعَابُهَا يَنُوصُ بَيْنَ كَتِفَيَّ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: أَلاَ إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلاَ يَجُوزُ وَصِيَّةٌ لِوَارِثٍ».[٤]

واتە: لە عەمری کوڕی خاریجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لە بان سەری وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە کاتێکدا وشترەکە کاوێژی بە خواردنە خەزنکراوەکەی ناو گەدەی دەکرد و لیکاوەکەی دەڕژایە نێوان شانەکانم، (لەو کاتەدا) گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاگاداربن خوای پەروەردگار هەق و مافی داوەتە هەموو خاوەن مافێک، کەواتە: وەسێت بۆ میراتگر دروست نیە.

٣٣١٣ - «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، أَمَرَ أَنْ يُوصِيَ لِوَالِدَيْهِ وَأَقَارِبِهِ، ثُمَّ نُسِخَ بَعْدَ ذَلِكَ فِي سُورَةِ النِّسَاءِ، فَجَعَلَ

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى تسريع و أيضاً الحسن.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى حميد.

(٤) ـ إسناده حسن لكن الحديث صحيح.

لِلْوَالِدَيْنِ نَصِيبًا مَعْلُومًا، وَأَلْحَقَ لِكُلِّ ذِي مِيرَاثٍ نَصِيبَهُ مِنْهُ، وَلَيْسَتْ لَهُمْ وَصِيَّةٌ، فَصَارَتِ الْوَصِيَّةُ لِمَنْ لاَ يَرِثُ مِنْ قَرِيبٍ وَغَيْرِهِ».[١]

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (كە خوا دەفەرمووێ): ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾﴾البقرة، واتە: [واجب كراوە لەسەرتان كاتێك يەكێكتان مەرگی نزيک بويەوە و سامان و ماڵ و داراییەكی بەجێدەهێشت، ئەوە با وەسێت بكات كە هەندێكی بدرێت بە دايک و باوكی و خزمانی بە شێوەيەكی جوان و لەبار، ئەمە واجب و ئەركە لەسەر خواناس و پارێزكاران].

(قەتادە وتويەتی): خوا (لەم ئايەتەدا) فەرمانی كرد كە مرۆڤی مسوڵمان وەسێت بكات بۆ دايک و باوكی و خزمەكانی، دواتر حوكمەكەی هەڵوەشايەوە لە سورەتی نيساء و پشكی دياريكراوی دانا بۆ دايک و باوک، وە پشكی هەموو خاوەن ميراتێكيشی لكاند بە سەروەتەكەوەو پشكی بۆ ئەوانيش دياری كرد و، هيچ وەسێتێكيان بۆ نيە و، وەسێت بوو بەهی غەيری ميراتگر لە خزمان و غەيری خزمان.

٣٣١٤ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ الْمَالُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ، فَنَسَخَ اللهُ مِنْ ذَلِكَ مَا أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ مِثْلَ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ وَالثُّلُثَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ الثُّمُنَ وَالرُّبُعَ، وَلِلزَّوْجِ الشَّطْرَ وَالرُّبُعَ».[٢]

واتە: لە ئيبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتويەتی: پێشتر سەروەت بۆ منداڵ بوو، وەسێتيش بۆ دايک و باوک و خزمان بوو، جا خوا ئەو حوكمەی سڕيەوە بەوەی پێی خۆش بوو و، (لە منداڵدا) بۆ نێر هاوشێوەی دوو مێی دانا و، بۆ دايک و باوكيش بۆ هەر يەكەيان شەش يەک و سێيەكی دانا و، بۆ خێزان هەشت يەک و چواريەكی دانا و، بۆ مێرد نيوە و چواريەكی دانا.

٣٣١٥ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، وَالْحَسَنِ: ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، فكَانَتِ الْوَصِيَّةُ كَذَلِكَ، حَتَّى نَسَخَتْهَا آيَةُ الْمِيرَاثِ».[٣]

واتە: لە عيكريمەو حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە (دەربارەی ئەم ئايەتە):﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾﴾ البقرة، (وتويانە): وەسێت ئاوا بوو تا ئەو كاتەی ئايەتی ميرات حوكمەكەی سڕيەوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى قتادة.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: وەسێت کردن بۆ دەوڵەمەند

٣٣١٦ - «عَنِ الْحَسَنِ، سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ أَوْصَى وَلَهُ أَخٌ مُوسِرٌ، أَيُوصِي لَهُ؟ قَالَ: نَعم، وَإِنْ كَانَ رَبَّ عِشْرِينَ أَلْفًا، ثُمَّ قَالَ: وَإِنْ كَانَ رَبَّ مِائَةِ أَلْفٍ، فَإِنَّ غِنَاهُ لاَ يَمْنَعُهُ الْحَقَّ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، پرسیاری لێکراوە دەربارەی پیاوێک وەسێت دەکات و برایەکی دەوڵەمەندی هەیە، جا ئایا وەسێتی بۆ بکات (دروستە)؟ وتی: بەڵێ، ئەگەرچی (براکەی) خاوەنی بیست هەزاریش بێت، دواتر وتی: ئەگەرچی خاوەنی سەد هەزاریش بێت، چونکە دەوڵەمەندیەکەی نابێتە ڕێگری لە مافەکەی.

## بابەت: ئەو پیاوەی وەسێت بۆ کەسێک دەکات بەوەی کە ئەو مرد بۆ کەسێکی تر بێت

٣٣١٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، فِي رَجُلٍ قَالَ: سَيْفِي لِفُلاَنٍ، فَإِنْ مَاتَ فُلاَنٌ، فَلِفُلاَنٍ، فَإِنْ مَاتَ فُلاَنٌ، فَمَرْجِعُهُ إِلَيَّ. قَالاَ: هُوَ لِلأَوَّلِ قَالَ: وَقَالَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: يُمْضَى كَمَا قَالَ».[٢]

واتە: لە حەسەن و سەعیدی کوڕی موسەییبەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە وتویەتی: شمشێرەکەم بۆ فلان بێت، جا کە فلان مرد با بۆ فلان بێت، جا کە ئەویش مرد با بۆ من بگەڕێتەوە (بۆ میراتگرەکانم بێت)، وتویانە: تەنها بۆ یەکەمەکەیە، دەڵێ: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانیش وتویەتی: چۆنی وتووە ئاوا جێبەجێ دەکرێت.

٣٣١٨ - «حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، أَنَّ عُرْوَةَ، قَالَ فِي الرَّجُلِ يُعْطِي الرَّجُلَ الْعَطَاءَ فَيَقُولُ: هُوَ لَكَ، فَإِذَا مُتَّ، فَلِفُلاَنٍ، فَإِذَا مَاتَ فُلاَنٌ، فَلِفُلاَنٍ، وَإِذَا مَاتَ فُلاَنٌ، فَمَرْجِعُهُ إِلَيَّ: يُمْضَى كَمَا قَالَ وَإِنْ كَانُوا مِائَةً».[٣]

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عوڕوەی گێڕاوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی کە شتێک دەبەخشێت بە پیاوێک و دەڵێت: ئەو شتە بۆ تۆ بێت، جا کە تۆ مردی با بۆ فلان بێت، ئەگەر فلانیش مرد با بۆ فلان بێت، وە ئەگەر فلانیش مرد با بۆ من بگەڕێتەوە، عوڕوە وتویەتی: چۆنی وتووە ئاوا جێبەجێ دەکرێت، ئەگەرچی سەد کەسیش بن.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێت بۆ جگە لە خزمەكانی دەكات

٣٣١٩ - «حدثنا شَيْبَةُ بْنُ هِشَامٍ الرَّاسِبِيُّ، وَكَثِيرُ بْنُ مَعْدَانَ، قَالاَ: سَأَلْنَا سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ عَنِ الرَّجُلِ يُوصِي فِي غَيْرِ قَرَابَتِهِ، فَقَالَ سَالِمٌ: هِيَ حَيْثُ جَعَلَهَا، قَالَ: فَقُلْنَا: إِنَّ الْحَسَنَ، يَقُولُ: يُرَدُّ عَلَى الأَقْرَبِينَ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ وَقَالَ قَوْلاً شَدِيدًا».[١]

واتە: لە شەیبەی كوڕی هیشامی ڕاسبی و كەثیری كوڕی مەعدانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: پرسیارمان لە سالمی كوڕی عەبدوڵلا كرد دەربارەی پیاوێك كە وەسێت بكات بۆ جگە لە خزمەكانی، سالم وتی: وەسێتەكە بەو شێوەیە دەبێت كە دایناوە (واتە: وەک خۆی جێبەجێ دەبێت)، دەڵێ: ئێمەش وتمان: حەسەن دەیگێڕێتەوە بۆ سەر خزمەكانی (بۆ بێگانە جیبەجێی ناكات)، جا ئەو بڕیارەی حەسەنی پێ باش نەبوو نكوڵی كرد، وە قسەی توندی كرد.

٣٣٢٠ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا أَوْصَى الرَّجُلُ فِي قَرَابَتِهِ، فَهُوَ لأَقْرَبِهِمْ بِبَطْنٍ: الذَّكَرُ وَالأُنْثَى فِيهِ سَوَاءٌ».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێ پیاوێك وەسێتی كرد بۆ خزمەكانی، ئەوە بۆ نزیكترینیانە لە سك (لە ڕەحم)، نێر و مێ تیایدا وەكو یەكە.

## بابەت: ئەگەر كەسێك وتی: یەكێك لە بەندەكانم ئازادبێت، دواتر مرد و ڕوونی نەكردەوە (كامەیانی مەبەستە)

٣٣٢١ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ قَالَ: أَحَدُ غُلاَمَيَّ حُرٌّ ثُمَّ مَاتَ وَلَمْ يُبَيِّنْ، قَالَ: الْوَرَثَةُ بِمَنْزِلَتِهِ يُعْتِقُونَ أَيَّهُمَا أَحَبُّوا».[٣]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێك كە وتبووی: یەكێك لە بەندەكانم ئازاد بێت، دواتر مرد و ڕوونی نەكردەوە (كامەیانی مەبەستە)، وتی: میراتگرەكانی لە شوێنی ئەون، كامەیان حەزكرد ئازادی دەكەن (واتە: دیاری كردنەكە دەكەوێتە سەر شانی میراتگرەكان).

## بابەت: كاتێ كەسێك وەسێت دەكات لە كاتی نەخۆشیدا، دواتر چاك دەبێتەوە

٣٣٢٢ - «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ فِي مَرَضِهِ: لِفُلاَنٍ كَذَا وَلِفُلاَنٍ كَذَا، وَعَبْدِي فُلاَنٌ حُرٌّ، وَلَمْ يَقُلْ: إِنْ حَدَثَ بِي حَدَثٌ، فَبَرَأَ، قَالَ: هُوَ مَمْلُوكٌ».[٤]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن إلى الشعبي.

(٤) ـ إسناده صحيح إلى حسن.

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە کاتی نەخۆشیەکەیدا وتی: ئەوەندە سەروەتە بۆ فلان بێت و ئەوەندەش بۆ فلان بێت و، فلان بەندەشم ئازاد بێت، جا نەیووت: ئەگەر شتێکم بەسەرهات (ئەگەر مردم)، (جا حەسەن دەربارەی ئەوە) وتویەتی: بەندەکە هەر کۆیلەیە (ئازاد نابێت، چونکە مەبەستی ئەوەیە دوای مردنی خۆی ئازاد ببێت، کەچی خۆشی نەمردووە).

## بابەت: ئەو کەسەی کۆیلەکەی ئازاد دەکات لەکاتی سەرەمەرگ و هیچ سەروەت و ماڵێکی جگە لەویشی نیە

٣٣٢٣ - «عَنْ الشَّعْبِيِّ، فِي رَجُلٍ أَعْتَقَ غُلَامَهُ عِنْدَ الْمَوْتِ وَلَيْسَ لَهُ غَيْرُهُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، قَالَ: يَسْعَى لِلْغُرَمَاءِ فِي ثَمَنِهِ».[١]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێک کە بەندەکەی ئازاد دەکات لە کاتی سەرەمەرگ و هیچ سەروەت و ماڵێکی جگە لەویشی نیە و قەرزاریشە، وتویەتی: (ئازادکردنەکە جێبەجێ نابێت، بەڵکو دەبێت بەندەکە بفرۆشرێت) و پارەکەی ببرێت بۆ قەرزارەکان (چونکە قەرز پێشی وەسیەت جێبەجێ دەکرێت).

٣٣٢٤ - «عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ رَجُلاً اشْتَرَى عَبْدًا بِتِسْعِ مِائَةِ دِرْهَمٍ فَأَعْتَقَهُ وَلَمْ يَقْضِ ثَمَنَ الْعَبْدِ وَلَمْ يَتْرُكْ شَيْئًا، فَقَالَ عَلِيٌّ: يَسْعَى الْعَبْدُ فِي ثَمَنِهِ».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک بەندەیەکی کڕی بە نۆسەد درهەم و، ئازادی کرد و پارەی کڕینی بەندەکەشی نەدایەوە (کە بە قەرز کڕیبوی) و هیچ شتێکیشی لەدوای خۆی جێنەهێشت، جا عەلی وتی: (ئازادکردنەکە جێبەجێ نابێت، بەڵکو دەبێت بەندەکە بفرۆشرێت) و پارەکەی ببرێت بۆ قەرزارەکان (چونکە قەرز پێشی وەسیەت جێبەجێ دەکرێت).

## بابەت: ئەو کەسەی وتویەتی: مودەببەڕ[٣] لە سێیەک ئەژمار دەکرێت

٣٣٢٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: الْمُدَبَّرُ مِنَ الثُّلُثِ».[٤]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کۆیلەی چاوەڕوانکراو لە سێیەک دەردەکرێت (واتە: لە سێیەکی وەسێت حیسابە).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى علي.

(٣) ـ واتە: کۆیلەی چاوەڕوانکراو، مەبەست پێی ئەو کۆیلەیەیە کە خاوەنەکەی پێی وتووە کاتێ من مردم تۆ ئازاد بیت.

(٤) ـ إسناده موضوع.

٣٣٢٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْمُدَبَّرُ مِنَ الثُّلُثِ».[١]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: کۆیلەی چاوەڕوانكراو لە سێیەک دەردەكرێت (واتە: لە سێیەكی وەسێت حیسابە).

٣٣٢٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْمُعْتَقُ عَنْ دُبُرٍ مِنَ الثُّلُثِ».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: کۆیلەی چاوەڕوانكراو لە سێیەک دەردەكرێت (واتە: لە سێیەكی وەسێت حیسابە).

٣٣٢٨ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْمُعْتَقَةُ عَنْ دُبُرٍ وَوَلَدُهَا مِنَ الثُّلُثِ».[٣]

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی کۆیلەی چاوەڕوانكراو و منداڵەكانیشی لە سێیەک دەردەكرێن (واتە: لە سێیەكی وەسێت حیسابن).

٣٣٢٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْمُعْتَقُ عَنْ دُبُرٍ مِنَ الثُّلُثِ».[٤]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: کۆیلەی چاوەڕوانكراو لە سێیەک دەردەكرێت (واتە: لە سێیەكی وەسێت حیسابە).

٣٣٣٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْمُدَبَّرُ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ».[٥]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: کۆیلەی چاوەڕوانكراو لە کۆی ماڵەكە دەردەكرێت.

٣٣٣١ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: الْمُعْتَقُ، عَنْ دُبُرٍ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ، قَالَ: سُئِلَ أَبُو مُحَمَّد بِأَيِّهِمَا تَقُولُ؟ قَالَ: مِنَ الثُّلُثِ».[٦]

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: کۆیلەی چاوەڕوانكراو لە کۆی ماڵەكە دەردەكرێت.

دەڵێ: پرسیار لە ئەبو موحەممەد كرا تۆ بۆچوونت لەگەڵ كامیانە (لە سێیەكی ماڵەكە دەربكرێت یان لە کۆی گشتی)؟ وتی: سێیەک.

---

(١) ـ إسناده حسن.
(٢) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.
(٣) ـ إسناده صحيح.
(٤) ـ إسناده صحيح.
(٥) ـ إسناده صحيح.
(٦) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: ئەوەی وتویەتی: شاهێدی لەسەر هیچ وەسێتێک مەدە هەتا بەسەرتدا دەخوێندرێتەوە

٣٣٣٢ - «عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: لاَ تَشْهَدْ عَلَى وَصِيَّةٍ حَتَّى تُقْرَأَ عَلَيْكَ، وَلاَ تَشْهَدْ عَلَى مَنْ لاَ تَعْرِفُ».(١)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: شاهێدی مەدە لەسەر هیچ وەسێتێک تاوەکو بەسەرتدا دەخوێندرێتەوە، وە شاهێدی لەسەر کەسێکیش مەدە کە نایناسی.

## بابەت: ئەو کەسەی وەسێت بۆ دایکی منداڵەکانی دەکات

٣٣٣٣ - «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَوْصَى لأُمَّهَاتِ أَوْلاَدِهِ بِأَرْبَعَةِ آلاَفٍ، أَرْبَعَةِ آلاَفٍ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ».(٢)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وەسێتی بۆ دایکەکانی منداڵەکانی کرد، بۆ هەر ئافرەتێک لەوان بە چوار هەزار.

تێبینی: (أمهات أولاده: دایکی منداڵەکانی) واتە: ئەو ئافرەتانەی کە کۆیلەن و پیاوەکە منداڵی لێ هەنە.

## بابەت: وەسێتی منداڵ

٣٣٣٤ - «عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ: أَنَّهُ أَجَازَ وَصِيَّةَ ابْنِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ سَنَةً».(٣)

واتە: لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە گێڕدراوەتەوە، کە وەسێتی منداڵی تەمەن سێزدە ساڵی بە دروست داناوە.

٣٣٣٥ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: أَوْصَى غُلاَمٌ مِنَ الْحَيِّ ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ، فَقَالَ شُرَيْحٌ: إِذَا أَصَابَ الْغُلاَمُ فِي وَصِيَّتِهِ، جَازَتْ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يُعْجِبُنِي، وَالْقُضَاةُ لاَ يُجِيزُونَ».(٤)

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: منداڵێک لە ناوچەکە وەسێتی کرد تەمەنی حەوت ساڵ بوو، جا شورەیح (کە قازی بوو) وتی: کاتێ منداڵ هەق دەپێکێت لە وەسێتەکەیدا ئەوە دروستە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (دادوەریەکەی شورەیحم) بە دڵە، کەچی قازیەکان ڕێگە بەوە نادەن.

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٣٣٣٦ - «حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ: أَنَّهُ شَهِدَ شُرَيْحًا، أَجَازَ وَصِيَّةَ عَبَّاسِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مَرْثَدٍ لِظِئْرِهِ مِنْ أَهْلِ الْحِيرَةِ، وعَبَّاسٌ صَبِيٌّ».(١)

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێردراوەتەوە، کە لای شورەیح ئامادە بووە کە ڕێگەی داوە بە وەسێتی عەبباسی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی مەرثەد بۆ دایەنەکەی لە خەڵکی حیرە (واتە: بۆ ئەو ئافرەتەی شیری پێ داوە)، لەکاتێکدا عەبباس منداڵ بوو (تەمەنی حەوت ساڵ بوو).

٣٣٣٧ - «حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، قَالَ: قَالَ شُرَيْحٌ: إِذَا اتَّقَى الصَّبِيُّ الرَّكِيَّةَ، جَازَتْ وَصِيَّتُهُ».(٢)

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: شورەیح وتویەتی: کاتێ منداڵ خۆی لە چاڵ و بیر پاراست (لەوەی بکەوێتە ناوی) ئەوە وەسێتەکەی دروستە (واتە: ئەو کاتە وەسێتی منداڵ دروستە کە ژیر بێت و قازانج و زەرەر لێک جیا بکاتەوە).

٣٣٣٨ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: أَنَّ غُلَامًا مِنْهُمْ حِينَ ثُغِرَ يُقَالُ لَهُ مَرْثَدٌ: أَوْصَى لِظِئْرٍ لَهُ مِنْ أَهْلِ الْحِيرَةِ بِأَرْبَعِينَ دِرْهَمًا، فَأَجَازَهُ شُرَيْحٌ، وَقَالَ: مَنْ أَصَابَ الْحَقَّ، أَجَزْنَاهُ».(٣)

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: منداڵێک لە خۆیان ئارەقەی لێ دەچۆڕا (بە هۆی سەرەمەرگ) کە پێی دەووترا: مەرثەد: وەسێتی بۆ ئافرەتێکی شیردەری خۆی کرد کە خەڵکی حیرە بوو، بە چل درهەم، جا شورەیح ڕێگەی پێدا و وتی: هەر کەسێک هەق بپێکێت ڕێگەی پێ دەدەین.

٣٣٣٩ - «أَخْبَرَنَا يَحْيَى: أن أَبَا بَكْرِ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، أَخْبَرَهُ: أَنَّ غُلَامًا بِالْمَدِينَةِ حَضَرَهُ الْمَوْتُ وَوَرَثَتُهُ بِالشَّامِ، وَأَنَّهُمْ ذَكَرُوا لِعُمَرَ أَنَّهُ يَمُوتُ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يُوصِيَ فَأَمَرَهُ عُمَرُ، أَنْ يُوصِيَ، فَأَوْصَى بِبِئْرٍ يُقَالُ لَهَا بِئْرُ جُشَمَ، وَأَنَّ أَهْلَهَا بَاعُوهَا بِثَلَاثِينَ أَلْفًا ذَكَرَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَّ الْغُلَامَ كَانَ ابْنَ عَشْرِ سِنِينَ أَوْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ».(٤)

واتە: لە یەحیاوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: منداڵێک لە مەدینە هەبوو گەیشتە سەرەمەرگ و میراتگرەکانیشی لە شام بوون، جا بۆ عومەریان باس کرد کە خەریکە دەمرێت و، ئەوانیش داوای وەسێتیان لە منداڵەکە کردوە، جا عومەر فەرمانی پێ کرد کە وەسێت بکات، جا منداڵەکە وەسێتی کرد بیرێک بکرێتە خێر کە پێی دەووترا: بیری جوشەم، خاوەنەکەی بە سی هەزار فرۆشتبوی، ئەبوبەکر باسی کردوە وتویەتی:

منداڵەکە تەمەنی دە یان دوازدە ساڵ بوو.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

٣٣٤٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: يَجُوزُ وَصِيَّةُ الصَّبِيِّ فِي مَالِهِ فِي الثُّلُثِ، فَمَا دُونَهُ، وَإِنَّمَا يَمْنَعُهُ وَلِيُّهُ ذَلِكَ فِي الصِّحَّةِ رَهْبَةَ الْفَاقَةِ عَلَيْهِ، فَأَمَّا عِنْدَ الْمَوْتِ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَمْنَعَهُ».(١)

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وەسێتی منداڵ دروستە لە سێیەکی ماڵەکەی و کەمتر لەوە، چونکە سەرپەرشتیارەکەی کە قەدەغەی دەکات لە وەسێت کردن لەکاتی ساغیدا لە ترسی هەژارکەوتنیەتی، جا هەرچی کاتی مردنە ئەوە بۆی نیە قەدەغەی بکات.

٣٣٤١ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّهُ أُتِيَ فِي جَارِيَةٍ أَوْصَتْ، فَجَعَلُوا يُصَغِّرُونَهَا، فَقَالَ: مَنْ أَصَابَ الْحَقَّ أَجَزْنَاهُ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵک هاتونەتە لای دەربارەی کیژۆڵەیەک کە وەسێتی کردبوو، جا هەر بچوکیان دەکردەوە (واتە: دەیان وت: ئەوە کەی هی ئەوەیە وەسێت بکات)، عەبدوڵڵاش وتی: هەر کەسێک هەق بپێکێت ئەوە ڕێگەی پێ دەدەین (با منداڵیش بێت).

٣٣٤٢ - «عَنْ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ سُلَيْمًا الْغَسَّانِيَّ مَاتَ وَهُوَ ابْنُ عَشْرٍ أَوْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً، فَأَوْصَى بِبِئْرٍ لَهُ قِيمَتُهَا ثَلاَثُونَ أَلْفًا، فَأَجَازَهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ».(٣)

واتە: لە ئەبوبەکر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سولەیمی غەسسانی وەفاتی کرد لەکاتێکدا تەمەنی دە، یان دوازدە، ساڵ بوو و، وەسێتی کرد بە بیرێکی خۆی کە نرخەکەی سی هەزار بوو و، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ ڕێگەی پێدا.

٣٣٤٣ - «حدثنا سفيان عَنِ ابْنَيْهِ عَبْدِ اللهِ، وَمُحَمَّدٍ، ابْنَيْ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِيهِمَا، مِثْلَ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّ أَحَدَهُمَا قَالَ: ابْنُ ثَلاَثَ عَشْرَةَ، وَقَالَ الآخَرُ: قَبْلَ أَنْ يَحْتَلِمَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: عَنِ ابْنَيْهِ، يَعْنِي: ابْنَيْ أَبِي بَكْرٍ».(٤)

واتە: لە سوفیانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە دوو کوڕەکانی ئەبوبەکرەوە عەبدوڵڵاو موحەممەدی گێڕاوەتەوە، ئەوانیش لە باوکیانەوە هەمان فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، تەنها ئەوە نەبێت یەکێکیان وتویەتی: تەمەنی منداڵەکە سێزدە ساڵ بوو، ئەوەیتر وتویەتی: هێشتا باڵغ نەببوو.

## بابەت: ئەوانەی وتویانە وەسێتی منداڵ دروست نیە

٣٣٤٤ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: وَصِيَّتُهُ لَيْسَتْ بِجَائِزَةٍ إِلاَّ مَا لَيْسَ بِذِي بَالٍ يَعْنِي: الْغُلاَمَ قَبْلَ أَنْ يَحْتَلِمَ».(٥)

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى إبراهيم.
(٢) ـ إسناده صحيح إلى عبد الله بن عينة.
(٣) ـ إسناده منقطع.
(٤) ـ إسناده منقطع.
(٥) ـ إسناده صحيح إلى الزهري.

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، کە دەیووت: وەسێتەکەی دروست نیە تەنها لە شتێک نەبێت کە خاوەن بەها نەبێت، واتە: مەبەستی منداڵە بەر لەوەی باڵغ ببێت.

٣٣٤٥ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: لاَ يَجُوزُ طَلاَقُ الْغُلاَمِ، وَلاَ وَصِيَّتُهُ، وَلاَ هِبَتُهُ، وَلاَ صَدَقَتُهُ، وَلاَ عَتَاقَتُهُ حَتَّى يَحْتَلِمَ».(١)

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نە تەڵاقی منداڵ دروستە و، نە وەسێتەکەی و، نە دیاریەکەی و، نە خێرەکەی و، نە ئازادکردنەکەی، تاوەکو باڵغ دەبێت.

٣٣٤٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لاَ يَجُوزُ طَلاَقُ الصَّبِيِّ، وَلاَ عِتْقُهُ، وَلاَ وَصِيَّتُهُ، وَلاَ شِرَاؤُهُ، وَلاَ بَيْعُهُ، وَلاَ شَيْءٌ».(٢)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نە تەڵاقی منداڵ دروستە و، نە ئازادکردنەکەی و، نە وەسێتەکەی و، نە کڕینەکەی و، نە فرۆشتنەکەی و، نە هیچ شتێکی.

٣٣٤٧ - «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحِمْيَرِيِّ، قَالَ: لاَ يَجُوزُ طَلاَقٌ، وَلاَ وَصِيَّةٌ إِلاَّ فِي عَقْلٍ إِلاَّ النَّشْوَانَ يَعْنِي: السَّكْرَانَ - فَإِنَّهُ يَجُوزُ طَلاَقُهُ، وَيُضْرَبُ ظَهْرُهُ».(٣)

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی حیمیەریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نە تەڵاق و، نە وەسێت دروست نیە تەنها لە کەسی باڵغ و ژیر نەبێت جگە لە نەشوان ـ واتە: ئەو کەسەی بە دەستی خۆی خۆی بێهۆش کردوە ـ ئەویان (هەر چەندە ژیری نەماوە بەڵام) تەڵاقی دروستە و لە پشتی دەدرێت (واتە: حەددی مەشروب خواردنەوەشی لێ دەردەکرێت).

## بابەت: کاتێ کەسێک وەسێت بۆ بەندەیەکی هەڵاتووی خۆی دەکات

٣٣٤٨ - «عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَأَلْتُ الْقَاسِمَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَمُعَاوِيَةَ بْنَ قُرَّةَ، عَنْ رَجُلٍ قَالَ فِي وَصِيَّتِهِ: كُلُّ مَمْلُوكٍ لِي حُرٌّ. وَلَهُ مَمْلُوكٌ آبِقٌ، فَقَالاَ: هُوَ حُرٌّ، وقَالَ الْحَسَنُ، وَإِيَاسٌ، وَبَكْرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ: لَيْسَ بِحُرٌّ».(٤)

واتە: لە یەحیای کوڕی ئەبو موڕڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە قاسمی کوڕی عەبدوڕڕەحمان و مەعاویەی کوڕی قوڕڕە کرد دەربارەی پیاوێک کە لە وەسێتەکەیدا وتویەتی: هەموو بەندەکانی من ئازاد بن (دوای مردنی من، کەچی) بەندەی هەڵاتوشی هەیە؟ وتیان: دەبێتە ئازاد.

حەسەن و ئیاس و بەکری کوڕی عەبدوڵڵا وتویانە: نابێتە ئازاد.

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى حميد.

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: وەسێت كردن بۆ ئافرەتان

٣٣٤٩ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ عُمَرَ، أَوْصَى إِلَى حَفْصَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِي اللهُ عَنْهن».[(١)]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر وەسێتی بۆ حەفصەی دایكی بڕواداران (رَضِي اللهُ عَنهن) كرد.

## بابەت: وەسێت كردن بۆ ئەهلی زیممە (بۆ هاوپەیمانان)

٣٣٥٠ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ صَفِيَّةَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، أَوْصَتْ لِنَسِيبٍ لَهَا يَهُودِيٍّ».[(٢)]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: صەفیە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) وەسێتی كرد بۆ خزمێكی خۆی كە جوولەكە بوو.

٣٣٥١ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: أَوْصَى غُلاَمٌ مِنَ الْحَيِّ يُقَالُ لَهُ عَبَّاسُ بْنُ مَرْثَدٍ ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ لِظِئْرٍ لَهُ يَهُودِيَّةٍ مِنْ أَهْلِ الْحِيرَةِ بِأَرْبَعِينَ دِرْهَمًا، فَقَالَ شُرَيْحٌ: إِذَا أَصَابَ الْغُلاَمُ فِي وَصِيَّتِهِ، جَازَتْ وَإِنَّمَا أَوْصَى لِذِي حَقٍّ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَنَا أَقُولُ بِهِ».[(٣)]

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: منداڵێک لە ناوچەكە وەسێتی كرد پێیان دەووت: عەبباسی كوڕی مەڕثەد ـ تەمەنی حەوت ساڵ بوو ـ (وەسێتی كرد) بە چل درهەم بۆ ئافرەتێكی شیردەری خۆی كە جوولەكە بوو خەڵكی حیرە بوو، جا شورەیح (كە قازی بوو) وتی: كاتێک منداڵ هەق دەپێكێت لە وەسێتەكەیدا ئەوە دروستە و بۆی جێبەجێ دەكەین، چونكە (هیچ هەڵەیەكی نەكردوە، تەنها) وەسێتی بۆ خاوەن مافێک كردوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: من لەگەڵ ئەو بۆچوونەم.

## بابەت: دەربارەی وەقف

٣٣٥٢ - «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ الزُّبَيْرَ ﷺ، جَعَلَ دُورَهُ صَدَقَةً عَلَى بَنِيهِ، لاَ تُبَاعُ وَلاَ تُوَرَّثُ، وَأَنَّ لِلْمَرْدُودَةِ مِنْ بَنَاتِهِ أَنْ تَسْكُنَ غَيْرَ مُضِرَّةٍ وَلاَ مُضَارٍّ بِهَا، فَإِنْ هِيَ اسْتَغْنَتْ بِزَوْجٍ، فَلاَ حَقَّ لَهَا».[(٤)]

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى ابن عمر.

(٣) ـ إسناده صحيح إلى أبي إسحاق.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە هیشامەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: زوبەیر ﷺ خانوەكانی خۆی كرد بە صەدەقە و وەقف بەسەر مندالەكانی خۆی، بەوەی نە بفرۆشرێت و نە ببێتە میرات، وە بۆ كچە تەڵاقدراوەكانیشی هەبێت (ئەگەر تەڵاقدران) لە خانوەكان نیشتەجێ بن بێ ئەوەی زیان ببەخشێت و زیانی لێ بدرێت، جا ئەگەر پێویستی پێی نەما بە هۆی مێرد كردنەوە ئەوە مافی نیە (لە خانوەكە بمێنێتەوە).

## بابەت: كاتێ وەسێت بۆ كراو دەمرێت پێشی وەسێتكار

٣٣٥٣ - «عَنْ مَكْحُولٍ، فِي الرَّجُلِ يُوصِي لِلرَّجُلِ بِدَنَانِيرَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَيَمُوتُ الْمُوصَى لَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ بِهَا مِنْ أَهْلِهِ. قَالَ: هِيَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمُتَوَفَّى الْمُوصِي يُنْفِذُونَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ».[١]

واتە: لە مەكحولەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێت بۆ پیاوێك دەكات بە چەند دینارێك و ئەندازەیەك لە پێناوی خوا، جا وەسێت بۆ كراوەكە دەمرێت پێش ئەوەی پارەكە بباتە دەرەوە لەناو خانەوادەی وەسێتكەرەكە، (مەكحول) وتویەتی: پارەكە بۆ خزمانی وەسێتكارە مردووەكەیە (واتە: پارەكە دەگەڕێندرێتەوە بۆیان) و ئەوانیش لە پێناوی خوا جێبەجێی دەكەن و، سەرفی دەكەن (واتە: لە كارێكی تری خێر سەرفی دەكەن).

٣٣٥٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الرَّجُلِ يُوصِي لِلرَّجُلِ بِالْوَصِيَّةِ، فَيَمُوتُ الْمُوصَى لَهُ قَبْلَ الْمُوصِي. قَالَ: هِيَ جَائِزَةٌ لِوَرَثَةِ الْمُوصَى لَهُ».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی وەسێت بۆ پیاوێك دەكات و وەسێت بۆكراوەكە دەمرێت بەر لە وەسێتكارەكە، وتویەتی: وەسێتەكە دروستە بۆ میراتگرانی وەسێت بۆكراوەكە (واتە: شتە وەسێت پێ كراوەكە ناگەڕێندرێتەوە بۆ خانەوادەی وەسێتكارەكە، بەڵكو دەبێتە میرات بۆ كەسە وەسێت بۆكراوەكە).

٣٣٥٥ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ السَّبِيعِيِّ، قَالَ: حُدِّثْتُ أَنَّ عَلِيًّا كَانَ يُجِيزُهَا مِثْلَ قَوْلِ الْحَسَنِ».[٣]

واتە: لە ئەبو ئیسحاقی سەبیعیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بۆم گێڕدراوەتەوە كە عەلی ڕێگەی داوە وەك بۆچونەكەی حەسەن (واتە: عەلیش وەك حەسەن پێی وابووە كە وەسێتەكە جێبەجێ دەبێت بۆ خزمانی وەسێت بۆكراوەكە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: کاتێ (کەسێک) وەسێتی بە شتێک کرد لە پێناوی خوا

٣٣٥٦ - «عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً أَوْصَى إِلَيَّ وَجَعَلَ نَاقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ، وَلَيْسَ هَذَا زَمَانًا يُخْرَجُ إِلَى الْغَزْوِ، فَأَحْمِلُ عَلَيْهَا فِي الْحَجِّ؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ فِي سَبِيلِ اللهِ».(١)

واتە: لە نافیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) وتی: کەسێک وەسێتی لەلای من کرد و وشترێکی مێی کردە وەسێت لە پێناوی خوا، ئێستاش سەردەمێک نیە خەڵک ببرێن و دەربچن بۆ جەنگ و جیهاد، جا ئایا بیبەم بۆ حەج (لەوێ بۆ خزمەتی حاجیان سەرفی بکەم)؟ ئیبنو عومەریش وتی: حەج و عەمرە لە پێناوی خوایە (ئەویش دەبێت).

٣٣٥٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً أَوْصَى بِمَالِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَسَأَلَ الْوَصِيُّ عَنْ ذَلِكَ عُمَرَ، فَقَالَ: أَعْطِهِ عُمَّالَ اللهِ، قَالَ: وَمَنْ عُمَّالُ اللهِ؟ قَالَ: حَاجُّ بَيْتِ اللهِ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وەسێتی بە ماڵەکەی کرد لە پێناوی خوا، جا سەروەسێتەکە پرسیاری ئەوەی لە ئیبنو عومەر کرد (کە ئایا لە پێناوی خوا چیە و چۆنە، لەچی سەرفی بکات)؟ ئیبنو عومەریش وتی: بیدە بە کرێکارانی خوا (یان ئاوەدانکەرەوانی ماڵی خوا)، پیاوەکە وتی: کێ کرێکارانی خوان؟ ئیبنو عومەر وتی: حاجیانی ماڵی خوا.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: گەورەیی ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێت

٣٣٥٨ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الرَّجُلَ الَّذِي لَيْسَ فِي جَوْفِهِ شَيْءٌ مِنَ الْقُرْآنِ كَالْبَيْتِ الْخَرِبِ».(١)

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو كەسەی هیچ قورئانی لە ناخیدا نەبێت، ئەوە وەک ماڵی وێرانە و كاول وایە.

٣٣٥٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ مَأْدُبَةُ اللهِ، فَخُذُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ شَيْئًا أَصْفَرَ مِنْ خَيْرٍ، مِنْ بَيْتٍ لَيْسَ فِيهِ مِنْ كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ. وَإِنَّ الْقَلْبَ الَّذِي لَيْسَ فِيهِ مِنْ كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ، خَرِبٌ كَخَرَابِ الْبَيْتِ الَّذِي لاَ سَاكِنَ لَهُ».(٢)

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەم قورئانە خوان و سفرەی خودایە، جا بە گوێرەی توانا لێی وەربگرن، من وانازانم هیچ شتێک خاڵیتر بێت لە ماڵێک كە هیچ لە پەرتوكی خوای تیا نەبێت (واتە: كەسێكی تیا نەبێت قورئان بخوێنێت یان قورئانی تیا نەبێت تا بخوێنرێت)، وە بە دڵنیاییی ئەو دڵەی بەشێک لە پەرتوكی خوای تیا نەبێت ئەوە وێرانە، وەک وێرانەی ئەو خانووەی كەسی تیادا ناژیێت.

٣٣٦٠ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: تَعَلَّمُوا هَذَا الْقُرْآنَ فَإِنَّكُمْ تُؤْجَرُونَ بِتِلاَوَتِهِ بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، أَمَا إِنِّي لاَ أَقُولُ بِـ﴿ الٓمٓ ﴾ البقرة، وَلَكِنْ بِأَلِفٍ، وَلاَمٍ، وَمِيمٍ، بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرُ حَسَنَاتٍ».(٣)

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان فێری ئەم قورئانە بكەن، چونكە ئێوە پاداشت دەدرێنەوە بە خوێندنەوەی، بە هەموو پیتێک دە چاكە (پاداشت دەدرێنەوە)، ئاگاداربن من ناڵێم و (مەبەستم ئەوە نیە) بەوەی:﴿ الٓمٓ ﴾، (یەک پیت بێت)، بەڵكو (دەڵێم) ئەلیف و لام و میم، بە هەر پیتێكیان دە چاكە هەیە.

٣٣٦١ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: إِنَّ الْبَيْتَ لَيَتَّسِعُ عَلَى أَهْلِهِ وَتَحْضُرُهُ الْمَلاَئِكَةُ وَتَهْجُرُهُ الشَّيَاطِينُ، وَيَكْثُرُ خَيْرُهُ أَنْ يُقْرَأَ فِيهِ الْقُرْآنُ، وَإِنَّ الْبَيْتَ لَيَضِيقُ عَلَى أَهْلِهِ وَتَهْجُرُهُ الْمَلاَئِكَةُ، وَتَحْضُرُهُ الشَّيَاطِينُ، وَيَقِلُّ خَيْرُهُ أَنْ لاَ يُقْرَأَ فِيهِ الْقُرْآنُ».(٤)

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده موقوف على ابن مسعود.

(٣) ـ إسناده موقوف.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند صحيح إلى أبي الزهري.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەیووت: ماڵ فراوان دەبێت (واتە: فەرەحنایی بۆ دانیشتوانەكەی دروست دەبێت) و، فریشتە تیایدا ئامادە دەبن و، شەیتانەكان لێی دەردەچن و جێی دەهێڵن و، خێری زۆر دەبێت كە قورئانی تیادا بخوێنرێت، وە بە دڵنیایی ماڵ تەنگ دەبێت (واتە: دانیشتوانەكەی دڵ توند و نارەحەت دەبن) و، فریشتە لێی دەردەچن و نایێنە ناویەوە و، شەیتانەكان تیایدا ئامادە دەبن و خێری كەم دەبێت كە قورئانی تیادا نەخوێندرێت.

**٣٣٦٢** - «عَنْ مِشْرَحِ بْنِ هَاعَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لَوْ جُعِلَ الْقُرْآنُ فِي إِهَابٍ، ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ، مَا احْتَرَقَ».[١]

واتە: لە میشرەحی كوڕی هاعانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عوقبەی كوڕی عامیر بوو ﷺ دەیووت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر قورئان بخرێتە ناو پێستەیەک (واتە: ئەگەر دڵی مرۆڤی بڕوادار وەک پێستەی خۆشنەكراویش بێت كە چەند زوو دەسوتێت)، دواتر بخرێتە ناو ئاگر (لە ڕۆژی دواییدا) ئەوە هەر نایسوتێنێ (واتە: لە ڕۆژی دواییدا دڵی مرۆڤێک بە ئاگر ناسوتێت كە قورئانی تیابێت، ئەگەرچی دڵەكە وەک پێستەی خۆشنەكراویش بێت كە شایستەی سوتان بێت و، زوو گڕ بگرێت ئەوە هەر گڕ ناگرێت لەبەر قورئانەكە).

**٣٣٦٣** - «عَنْ أَبِي صَالِحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ نِعْمَ الشَّفِيعُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. إِنَّهُ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: يَا رَبِّ، حَلِّهِ حِلْيَةَ الْكَرَامَةِ، فَيُحَلَّى حِلْيَةَ الْكَرَامَةِ، يَا رَبِّ، اكْسُهُ كِسْوَةَ الْكَرَامَةِ فَيُكْسَى كِسْوَةَ الْكَرَامَةِ، يَا رَبِّ، أَلْبِسْهُ تَاجَ الْكَرَامَةِ، يَا رَبِّ ارْضَ عَنْهُ، فَلَيْسَ بَعْدَ رِضَاكَ شَيْءٌ».[٢]

واتە: لە ئەبو صالحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ دەیوت: قورئان بخوێنن، چونكە ئەو چاكترین تكاكارە لە ڕۆژی دواییدا، ئەو لە ڕۆژی دواییدا دەڵێت: ئەی پەروەردگارا بیرازێنەوە بە ڕازاندنەوەیەكی ڕێزلێنان، جا دەڕازێندرێتەوە بە ڕازاندنەوەی ڕێزلێنان، (وە دەڵێت): ئەی پەروەردگارا پۆشتەی بكە بە جلی ڕێزلێنان، جا پۆشتە دەكرێت بە جلی ڕێزلێنان، (وە دەڵێت): ئەی پەروەردگارا تاجی ڕێزلێنان بخەرە سەری، ئەی پەروەردگارا لێی ڕازیبە، چونكە دوای ڕازیبوونی تۆ هیچ شتێک نیە.

**٣٣٦٤** - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَشْفَعُ لِصَاحِبِهِ، يَقُولُ: يَا رَبِّ لِكُلِّ عَامِلٍ عُمَالَةٌ مِنْ عَمَلِهِ، وَإِنِّي كُنْتُ أَمْنَعُهُ اللَّذَّةَ وَالنَّوْمَ، فَأَكْرِمْ. فَيُقَالُ: ابْسُطْ يَمِينَكَ، فَيُمْلَأُ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ، ثُمَّ يُقَالُ: ابْسُطْ شِمَالَكَ، فَيمْلأَ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ، وَيُكْسَى كِسْوَةَ الْكَرَامَةِ، وَيُحَلَّى حِلْيَةِ الْكَرَامَةِ، وَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ».[٣]

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قوڕئان دەهێنرێت و تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات، دەڵێت: ئەی پەروەردگارا هەموو کرێکارێک و کارکەرێک پاداشت و کرێی کارەکەی بۆ هەیە، وە من (خاوەنەکەم) قەدەغە کرد لە چێژ و خەوتن، بۆیە ڕێزی لێ بنێ، جا (بە خاوەنی قوڕئان) دەوترێت: دەستی ڕاستەت درێژ بکە، جا پڕ لە ڕەزامەندی خوا دەکرێت، دواتر دەوترێت: دەستی چەپەت درێژ بکە، جا پڕ لە ڕەزامەندی خوا دەکرێت (واتە: بە هەردوو دەستەکانی ڕەزامەندی خوا بەدەست دەهێنێت) و، بە جل و بەرگی ڕێزداری پۆشتە دەکرێت و، دەرازێندرێتەوە بە ڕازاندنەوەی ڕێز و، تاجی ڕێزی دەخرێتە سەر.

**٣٣٦٥** - «عَنْ أَبِي صَالِحٍ، قَالَ: الْقُرْآنُ يَشْفَعُ لِصَاحِبِهِ فَيُكْسَى حُلَّةَ الْكَرَامَةِ ثُمَّ يَقُولُ: رَبِّ زِدْهُ. فَيُكْسَى تَاجَ الْكَرَامَةِ، قَالَ: فَيَقُولُ: رَبِّ زِدْهُ، فَآتِهِ، وَآتِهِ. . . قال: يَقُولُ: رِضَايِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: قَالَ وُهَيْبُ بْنُ الْوَرْدِ: اجْعَلْ قِرَاءَتَكَ الْقُرْآنَ عَمَلاً ، وَلاَ تَجْعَلْهُ عِلْمًا».[١]

واتە: لە ئەبو صاڵحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قوڕئان تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات و پۆشتە دەکرێت بە ڕازاندنەوەی ڕێز، دواتر (قوڕئان) دەڵێت: پەروەردگارا بۆی زیاد بکە، جا تاجی ڕێزیشی دەخرێتە سەر، جا (دووبارە) دەڵێت: پەروەردگارا بۆی زیاد بکە، جا هەر پێی دەدرێت و پێی دەدرێت، (جا خوا) دەفەرموویت: ڕەزامەندی خۆم بۆ حەڵاڵ کرد و پێم بەخشی.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: وهەیبی کوڕی وەرد وتویەتی: قوڕئان خوێندنەکەت بکە بە کردەوە و، مەیکە تەنها بە زانست (واتە: مەیکە بە زانستێکی بێ کردەوە، چونکە زانستەکەش هەر بۆ کردەوەیە و ئەویان گرنگە).

**٣٣٦٦** - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ أَنْ يَجِدَ ثَلاَثَ خَلِفَاتٍ سِمَانٍ، قَالُوا: نَعم يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَثَلاَثُ آيَاتٍ يَقْرَؤُهُنَّ أَحَدُكُمْ خَيْرٌ لَهُ مِنْهُنَّ».[٢]

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە حەز دەکات کاتێ چوو بۆ لای خانەوادەکەی لەوێ سێ وشتری سک پڕی قەڵەو ببینێ (کە خانەوادەکەی بەدەستیان هێنا بێت)، وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: (دڵنیابن) سێ ئایەت کە یەکێک لە ئێوە بیخوێنێت ئەوە بۆ ئەو چاکترە لەو سێ وشترە.

**٣٣٦٧** - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ مَأْدُبَةُ اللهِ، فَتَعَلَّمُوا مِنْ مَأْدُبَتِهِ مَا اسْتَطَعْتُمْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ حَبْلُ اللهِ، وَالنُّورُ الْمُبِينُ، وَالشِّفَاءُ النَّافِعُ، عِصْمَةٌ لِمَنْ تَمَسَّكَ بِهِ، وَنَجَاةٌ لِمَنِ اتَّبَعَهُ، لاَ يَزِيغُ فَيُسْتَعْتَبَ، وَلاَ يَعْوَجُّ فَيُقَوَّمَ، وَلاَ تَنْقَضِي عَجَائِبُهُ، وَلاَ يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ الرَّدِّ، فَاتْلُوهُ فَإِنَّ اللهَ يَأْجُرُكُمْ عَلَى تِلاَوَتِهِ بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، أَمَا إِنِّي لاَ أَقُولُ: ﴿الٓمٓ ①﴾ البقرة، وَلَكِنْ بِأَلِفٍ، وَلاَمٍ، وَمِيمٍ».[٣]

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند حسن إلى أبي صالح.

(٢) ـ إسناده حسن لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەم قورئانە خوان و سفرەی (زانست و هیدایەت و کردەوەی پەسەندی لای) خودایە، جا بە گوێرەی توانا خۆتان لە خوانەکەی فێر بکەن، ئا ئەم قورئانە پەت و حەبلی خوایە (مرۆڤەکان بەهۆیەوە لە گومڕایی دەردەهێنێ) و، ڕووناکیەکی ئاشکرا و ڕوونە و، چارەسەرێکی بە سودە، پارێزەرە (لە هەموو خراپەیەک) بۆ ئەو کەسەی دەستی پێوە بگرێت، وە ڕزگاریە بۆ ئەو کەسەی شوێنی بکەوێت، (شوێنکەوتووی قورئان) لە هەق لانادات تاوەکو دوای عیقاب و عیتاب ئنجا ڕازی بکرێت و (درەنگ پاداشت بدرێتەوە)، وە لار نابێتەوە تاوەکو ڕاست بکرێتەوە، وە (ئەم قورئانە) شتە سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتایی نایێن (لە زانست و مانای جوان و حیکمەت و هیدایەت و وردبینی)، وە کۆن نابێت بە هۆی زۆر دووبارەکردنەوە، کەواتە: بیخوێنن، چونکە خوا پاداشتتان دەداتەوە لەسەر خوێندنەوەکەی، بە هەر پیتێک دە چاکە (دەنوسرێت)، ئاگاداربن من ناڵێم و (مەبەستم بەو پیتە): ﴿الٓمٓ ۝١﴾، نیە، بەڵکو دەڵێم و (مەبەستم) بە ئەلیف و لام و میمە (واتە: بە هەر یەکێکیان دە چاکە دەنوسرێت نەک بە گشتیان).

٣٣٦٨ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمًا خَطِيبًا فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَنِي رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَهُ، وَإِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ: أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَتَمَسَّكُوا بِكِتَابِ اللهِ، وَخُذُوا بِهِ، فَحَثَّ عَلَيْهِ وَرَغَّبَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: وَأَهْلَ بَيْتِي أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي ثَلَاثَ مَرَّاتٍ».[١]

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان وتاریدا و هەڵسایەوە و ستاییشی خوای کرد و بە جوانی وەسفی کرد، دواتر فەرمووی: ئەی خەڵکینە من هەر تەنها مرۆڤێکم، نزیکە نێردراوی خوا (فریشتەی گیان کێشان) بێتە لام و منیش وەڵامی بدەمەوە (وەفات بکەم)، وە من دوو شتە بە سەنگەکانم لەناو ئێوەدا جێهێشتووە: یەکەمیان پەرتوکی خوایە ، کە ڕێنمویی و ڕووناکی و ڕۆشنی تیایە، کەواتە: دەست بە پەرتوکی خواوە بگرن (بە عەقیدە و کردارەوە) وە وەریبگرن (بە زانست و لەبەرکردن و تێگەیشتنەوە)، (زەید دەڵێ): جا خەڵکی هاندا لەسەری و ڕەغبەتی تیا کرد، دواتر فەرمووی (دووەم لە دوو شتە بە سەنگەکان بریتیە لە): خانەوادەکەم، ئاگادارتان دەکەمەوە خواتان دەهێنمەوە یاد دەربارەی خانەوادەکەم، سێ جار (ئاوای فەرموو).

٣٣٦٩ - «عَنْ أَبِي وَائِلٍ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: إِنَّ هَذَا الصِّرَاطَ مُحْتَضَرٌ، تَحْضُرُهُ الشَّيَاطِينُ يُنَادُونَ: يَا عِبَادَ اللهِ، هَذَا الطَّرِيقُ فَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ، فَإِنَّ حَبْلَ اللهِ الْقُرْآنُ».[٢]

واتە: لە ئەبو وائیلەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا وتویەتی: بە دڵنیایی ئەم ڕێگەیە (واتە: ڕێگەی ڕاستی ئیسلامەتی) ئامادەکراوە، شەیتانەکان ئامادەی دەبن بانگ دەکەن (دەڵێن): ئەی بەندەی خوا

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى عبد الله.

ئەوە ڕێگایە (واتە: دەیانەوێ ڕێگەی گومڕایی نیشانی بەندەکانی خوا بدەن)، جا دەست بە پەتی خواوە بگرن، پەتی خواش قوڕئانە.

٣٣٧٠ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، قَالَ: إِنَّ قَارِئَ الْقُرْآنِ، وَالْمُتَعَلِّمَ، تُصَلِّي عَلَيْهِمُ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يَخْتِمُوا السُّورَةَ، فَإِذَا أَقْرَأَ أَحَدُكُمُ السُّورَةَ، فَلْيُؤَخِّرْ مِنْهَا آيَتَيْنِ حَتَّى يَخْتِمَهَا مِنْ آخِرِ النَّهَارِ كَيْ مَا تُصَلِّي الْمَلاَئِكَةُ عَلَى الْقَارِئِ وَالْمُقْرِئِ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ إِلَى آخِرِهِ».[1]

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خوێنەری قوڕئان و خوێندکاری قوڕئان فریشتەکان نزای چاکیان بۆ دەکەن تاوەکو سوڕەتەکە تەواو دەکەن، جا کاتێ یەکێک لە ئێوە سوڕەتێکی خوێند با دوو ئایەتی لێ دوابخات (نەیانخوێنێت) تاوەکو لە کۆتایی ڕۆژەکەدا سورەتەکە تەواو دەکات تاوەکو فریشتە دووعای چاک بۆ خوێنەر و فێرکار بکات لە سەرەتای ڕۆژەکەوە تا کۆتاییەکەی.

٣٣٧١ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ وَلاَ تَغُرَّنَّكُمْ هَذِهِ الْمَصَاحِفُ الْمُعَلَّقَةُ، فَإِنَّ اللهَ لَنْ يُعَذِّبَ قَلْبًا وَعَى الْقُرْآنَ».[2]

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە دەیووت: قوڕئان بخوێنن و، با ئەم موصحەف و قوڕئانە هەڵواسراوانە (کە هەڵواسراون بە دیوارەوە یان لەسەر ڕەفە و مێز دانراون) فریوتان نەدەن (چونکە هەبوونی قوڕئان لە ماڵ و دائیرە و شوێنی کار گرنگ نیە، خوێندنەوە و لەبەربوون و کارپێکردنی گرنگە)، چونکە خوا دڵێک سزا نادات و نایسوتێنێت کە قوڕئان تێگەیشتبێت (وکاری پێ کردبێت).

٣٣٧٢ - «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، قَالَ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ وَلاَ تَغُرَّنَّكُمْ هَذِهِ الْمَصَاحِفُ الْمُعَلَّقَةُ، فَإِنَّ اللهَ لاَ يُعَذِّبُ قَلْبًا وَعَى الْقُرْآنَ».[3]

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قوڕئان بخوێنن، با ئەم موصحەف و قوڕئانە هەڵواسراوانە (کە هەڵواسراون بە دیوارەوە یان لەسەر ڕەفە و مێز دانراون) فریوتان نەدەن (چونکە هەبوونی قوڕئان لە ماڵ و دائیرە و شوێنی کار گرنگ نیە، خوێندنەوە و لەبەربوون و کارپێکردنی گرنگە)، چونکە خوا دڵێک سزا نادات و نایسوتێنێت کە قوڕئان تێگەیشتبێت و کاری پێ کردبێت.

٣٣٧٣ - «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: لَيْسَ مِنْ مُؤَدِّبٍ إِلاَّ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى أَدَبُهُ، وَإِنَّ أَدَبَ اللهِ الْقُرْآنُ».[4]

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف ولكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند صحيح إلى عبد الله.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ دەعوەتکارێک نیە حەتمەن حەز دەکات خەڵکی بۆ دەعوەتەکەی بێن، وە دەعوەتی خواش قورئانە (کەواتە: حەز دەکات خەڵک بۆی بێن).

٣٣٧٤ - «عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ مَأْدُبَةُ اللهِ، فَمَنْ دَخَلَ فِيهِ، فَهُوَ آمِنٌ».[١]

واتە: لە ئەبو ئەحوەصەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ دەیووت: ئەم قورئانە دەعوەتی خوایە، جا هەر کەسێک بێتە ناو دەعوەتەکەوە، ئەوە سەلامەتە (لە سزای خوا).

٣٣٧٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ أَحَبَّ الْقُرْآنَ فَلْيُبْشِرْ».[٢]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک قورئانی خۆش بووێت با موژدەی لێ بێت.

٣٣٧٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ أَحَبَّ الْقُرْآنَ فَلْيُبْشِرْ».[٣]

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک قورئانی خۆش بووێت با موژدەی لێ بێت.

٣٣٧٧ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَشْفَعُ لِصَاحِبِهِ، فَيَكُونُ لَهُ قَائِدًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَيَشْهَدُ عَلَيْهِ وَيَكُونُ لَهُ سَائِقًا إِلَى النَّارِ».[٤]

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو مەسعود ﷺ دەیووت: لە ڕۆژی دواییدا قورئان دەهێنرێت، جا (یان ئەوەتە) تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات و، بۆی دەبێتە پێشڕەو بۆ بەهەشت (ئەگەر کاری پێ کردبێت)، یان شاهێدی لەسەر دەدات و پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئاگر (ئەگەر کاری پێ نەکردبێت).

٣٣٧٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ، قِيلَ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: أَهْلُ الْقُرْآنِ».[٥]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا خەڵک و ئەهلی تایبەتی خۆی هەیە لەناو خەڵکیدا، وترا: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەهلی قورئان (واتە: ئەوانەی لەبەریانە و تێگەیشتوون و کاری پێ دەکەن).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند صحيح إلى عبد الله.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن إلى الشعبي.

(٥) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح.

٣٣٧٩ - «عَنْ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالْقُرْآنِ، فَإِنَّهُ فَهْمُ الْعَقْلِ، وَنُورُ الْحِكْمَةِ، وَيَنَابِيعُ الْعِلْمِ، وَأَحْدَثُ الْكُتُبِ بِالرَّحْمَنِ عَهْدًا. وَقَالَ فِي التَّوْرَاةِ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي مُنَزِّلٌ عَلَيْكَ تَوْرَاةً حَدِيثَةً تَفْتَحُ فِيهَا أَعْيُنًا عُمْيًا، وَآذَانًا صُمًّا، وَقُلُوبًا غُلْفًا».(١)

واتە: لە کەعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دەست بگرن بە قوڕئانەوە، چونكە ئەو تێگەیشتنی عەقڵە (واتە: عەقڵ ڕۆشن دەكات و تێی دەگەیەنێت)، وە ڕووناکی و داناییە، وە سەرچاوە و کانیاوەکانی زانستە، وە کۆتایی و نوێترین پەرتوکی خودایە، وە لە تەوراتدا فەرموویەتی: ئەی موحەممەد من پەرتوکێکم بۆ دابەزاندووی کە کۆتاییە، تیایدا چاوانێکی کوێر (لە ئاست بینینی هەقیقەت) و، گوێچکانێکی کەڕ (لە ئاست بیستنی هەقیقەت) و، دڵانێکی داپۆشراو (بە کوفر و گومڕایی) بەهۆیەوە دەکەیتەوە.

٣٣٨٠ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ كَائِنٌ لَكُمْ أَجْرًا، وَكَائِنٌ لَكُمْ ذِكْرًا، وَكَائِنٌ عَلَيْكُمْ وِزْرًا، اتَّبِعُوا الْقُرْآنَ وَلاَ يَتَّبِعْنكُمُ الْقُرْآنُ، فَإِنَّهُ مَنْ يَتَّبِعِ الْقُرْآنَ، يَهْبِطْ بِهِ فِي رِيَاضِ الْجَنَّةِ، وَمَنِ اتَّبَعَهُ الْقُرْآنُ يَزُخُّ فِي قَفَاهُ، فَيَقْذِفُهُ فِي جَهَنَّمَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يَزُخُّ: يَدْفَعُ».(٢)

واتە: لە ئەبو مووساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە وتویەتی: ئەم قوڕئانە بۆتان پاداشتە، وە بۆتان بیرەوەریە، وە لەسەرتان گوناهو تاوانە (ئەگەر کاری پێ نەکەن)، شوێنی قوڕئان بکەون و قوڕئان شوێنی خۆتان مەخەن، چونكە ئەو کەسەی شوێن قوڕئان دەکەوێت، بەهۆیەوە دەکەوێتە ناو مێرگی بەهەشت، هەر کەسێکیش قوڕئان شوێنی خۆی بخات، ئەوە لە دواوە پاڵی پێوە دەنێ و دەیخاتە ناو دۆزەخ.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (يَزُخُّ) واتە: پاڵی پێوە دەنێت.

٣٣٨١ - «حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ أَيُّوبَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمِّي إِيَاسَ بْنَ عَامِرٍ، يَقُولُ: أَخَذَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، بِيَدِي، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكَ إِنْ بَقِيتَ سَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ ثَلاَثَةُ أَصْنَافٍ: فَصِنْفٌ لِلَّهِ، وَصِنْفٌ لِلْجِدَالِ، وَصِنْفٌ لِلدُّنْيَا، وَمَنْ طَلَبَ بِهِ أَدْرَكَ».(٣)

واتە: لە موسای کوڕی ئەییوبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیاسی کوڕی عامری مامم بوو دەیووت: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەستی گرتم، دواتر وتی: ئەگەر تۆ مایت دەبینیت سێ چین قوڕئان دەخوێنن: چینێک بۆ خوا دەیخوێنێت، چینێکیش بۆ دەمەقاڵێ و مناقەشە دەیخوێنێت، چینێکیش بۆ دونیا دەیخوێنێت، وە هەر کەسێک بە قوڕئان داوابکات (واتە: یەکێک لەو مەبەستانەی بوێت) پێی دەگات.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٣٨٢ - «عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لأَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ: إِنَّ إِخْوَانَكَ مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ، مِنْ أَهْلِ الذِّكْرِ، يُقْرِئُونَكَ السَّلاَمَ. فَقَالَ: وَعَلَيْهِمُ السَّلاَمُ، وَمُرْهُمْ فَلْيُعْطُوا الْقُرْآنَ بِخَزَائِمِهِمْ فَإِنَّهُ يَحْمِلُهُمْ عَلَى الْقَصْدِ وَالسُّهُولَةِ وَيُجَنِّبُهُمُ الْجَوْرَ وَالْحُزُونَةَ».[١]

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک بە ئەبو دەرداﺋی وت ﷺ: براكانت لە خەڵكی كوفە لە ئەهلی قوڕئان سەلامت لێ دەكەن، ئەویش وتی: سەلام لەسەر ئەوانیش بێت و، فەرمانیان پێ بكە گوێڕایەڵیان بدەن بە قوڕئان، چونكە قوڕئان دەیانباتە سەر میانڕەوی و ئاسانكاری، وە دووریان دەخاتەوە لە ستەم و لادان و توندی و ڕژدی.

٣٣٨٣ - «عَنِ الْحَارِثِ، قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا أُنَاسٌ يَخُوضُونَ فِي أَحَادِيثَ، فَدَخَلْتُ عَلَى عَلِيٍّ ﷺ، فَقُلْتُ: أَلاَ تَرَى أَنَّ أُنَاسًا يخُوضُونَ فِي الأَحَادِيثِ فِي الْمَسْجِدِ؟ فَقَالَ: قَدْ فَعَلُوهَا؟ قُلْتُ: نَعم، قَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: سَتَكُونُ فِتَنٌ، قُلْتُ: وَمَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا؟ قَالَ: كِتَابُ اللهِ، كِتَابُ اللهِ فِيهِ نَبَأُ مَا قَبْلَكُمْ، وَخَبَرُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، هُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ، هُوَ الَّذِي مَنْ تَرَكَهُ مِنْ جَبَّارٍ، قَصَمَهُ اللهُ، وَمَنِ ابْتَغَى الْهُدَى فِي غَيْرِهِ، أَضَلَّهُ اللهُ، فَهُوَ حَبْلُ اللهِ الْمَتِينُ، وَهُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَهُوَ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، وَهُوَ الَّذِي لاَ تَزِيغُ بِهِ الأَهْوَاءُ، وَلاَ تَلْتَبِسُ بِهِ الأَلْسِنَةُ، وَلاَ يَشْبَعُ مِنْهُ الْعُلَمَاءُ، وَلاَ يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ الرَّدِّ، وَلاَ تَنْقَضِي عَجَائِبُهُ، وَهُوَ الَّذِي لَمْ يَنْتَهِ الْجِنُّ إِذْ سَمِعَتْهُ أَنْ قَالُوا: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ١﴾ الجن، هُوَ الَّذِي مَنْ قَالَ بِهِ صَدَقَ، وَمَنْ حَكَمَ بِهِ عَدَلَ، وَمَنْ عَمِلَ بِهِ أُجِرَ، وَمَنْ دَعَا إِلَيْهِ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ، خُذْهَا إِلَيْكَ يَا أَعْوَرُ».[٢]

واتە: لە حاریثەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ مزگەوت، جا خەڵكانێک لەوێ ڕۆدەچوون لە قسەو باسان، جا چووم بۆ لای عەلی ﷺ، وتم: ئایا نابینی خەڵكانێک هەن ڕۆدەچن لە قسە و باسان لەناو مزگەوتدا؟ ئەویش وتی: ئاوایان كردوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: دە بزانە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فیتنە و ئاشوبی زۆر پەیا دەبن، وتم: جا دەرچە بۆ ڕزگاربوون لێی چیە؟ فەرمووی: پەرتوكی خوایە، پەرتوكی خوا هەواڵی پێشینەی ئێوەی تیایە، وە هەواڵی دوای ئێوەشی تیایە، وە حوكم و دادوەری نێوان ئێوەشی تیایە، قوڕئان ڕوون و یەكلاكەرەوەیە و گاڵتە و گەپ نیە، ئەو پەرتوكەیە كە هەر كەسێک وازی لێ بهێنێت لە خۆ بەزلزانان خوا پشتی دەشكێنێت و لەناوی دەبات، وە هەر كەسێكیش ڕێنمویی لە غەیری قوڕئان بخوازێت، ئەوە خودا گومڕای دەكات، قوڕئان پەتی توندی خودایە و، هەر ئەو یادەوەریەكی دانایانەیە، وە هەر ئەو ڕێگەی ڕاستە، وە هەر ئەو هەواو نەفس لایانادات و بەلاڕێی دانابات، وە زمانەكان پێی تێكەڵ و پێكەڵ نابن، وە زانایان لێی تێر نابن، وە كۆنیش نابێت بەهۆی زۆر دووبارەكردنەوە، وە سەرسوڕهێنەریەكانی (لە ڕووی ماناو مەبەست و وردبینی و زانستەكانی) كۆتایی نایێن، وە ئەو قوڕئانە بوو كە جنۆكەكان هێشتا تەواویان نەكردبوو وتیان: ﴿إِنَّا

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴿١﴾ ﴾ الجن، واتە: [ئێمە گوێبیستی قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بووین]. ئەو قورئانەیە کە هەر کەسێک قسەی پێ بکات ئەوە ڕاستی کردوە، وە هەر کەسێک بڕیاری پێ بدات ئەوە دادگەری کردوە، وە هەر کەسێک کاری پێ بکات ئەوە پاداشت دراوەتەوە، وە هەر کەسێکیش بانگەوازی بۆلا بکات ئەوە ڕێنمویی کراوە بۆ ڕێگەی ڕاست، (دواتر عەلی بە حاریثی) وت: بیگرە ئەی کوێر.

٣٣٨٤ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمَّتَكَ سَتُفْتَتَنُ مِنْ بَعْدِكَ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَوْ سُئِلَ مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا؟ قَالَ: الْكِتَابُ الْعَزِيزُ الَّذِي: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت، مَنْ ابْتَغَى الْهُدَى فِي غَيْرِهِ، فقد أَضَلَّهُ اللهُ، وَمَنْ وَلِيَ هَذَا الأَمْرَ مِنْ جَبَّارٍ فَحَكَمَ بِغَيْرِهِ، قَصَمَهُ اللهُ، هُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَالنُّورُ الْمُبِينُ، وَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، فِيهِ خَبَرُ مَا قَبْلَكُمْ، وَنَبَأُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، وَهُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ، وَهُوَ الَّذِي سَمِعَتْهُ الْجِنُّ فَلَمْ تَتَنَاهَ أَنْ قَالُوا: ﴿ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴿١﴾ ﴾ الجن، وَلاَ يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ الرَّدِّ، وَلاَ تَنْقَضِي عِبَرُهُ، وَلاَ تَفْنَى عَجَائِبُهُ. ثُمَّ قَالَ عَلِيٌّ لِلْحَارِثِ:خُذْهَا إِلَيْكَ يَا أَعْوَرُ».[1]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەل و ئوممەتەکەت توشی فیتنە دەبن لەدوای تۆ، جا عەلی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ـ یان پرسیاری لێکرا ـ دەرچە بۆ ڕزگاربوون لێی چیە؟ فەرمووی: ئەو پەرتوکە زاڵەی کە: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت، واتە: {هیچ ناهەقی و نادروستی و ناتەواویەک ڕووی تێ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە، ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییەو شایانی سوپاس و ستاییشە}، جا هەر کەسێک هیدایەت لە غەیری قورئان بخوازێت، ئەوە خوا گومڕای دەکات، وە هەر کەسێک لە خۆ بەزلزانان دەسەڵات وەربگرێت و حوکم بە جگە لە قورئان بکات، ئەوە خوا پشتی دەشکێنێت و تەفروتونای دەکات، ئەو قورئانی حەکیمە و، نورێکی ڕوونەو، ڕێگایەکی ڕاستە، هەواڵی پێشینەی ئێوەی تیایە، وە هەواڵی پاشینەشتانی تیایە، وە حوکم و دادوەری نێوانی ئێوەشی تیایە، ئەو (پەرتوکێکی) یەکلاکەرەوەیە گاڵتە و گەپ نیە، وە ئەو پەرتوکەیە کە جن و پەری گوێبیستی بوون هێشتا تەواو نەبووبوو کە وتیان: ﴿ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴿١﴾ ﴾، واتە: {ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بوو، (مرۆڤ و جنۆکە) ڕێنمویی دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست و ژیری}.

٣٣٨٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، ﴿ وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: الْفَهْمَ بِالْقُرْآنِ».[2]

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف إلى إبراهيم.

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە (دەربارەی ئەم ئایەتە): ﴿وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾﴾، واتە: {هەر کەسێک حیکمەتی پێ بدرێت ئەوە چاکەی زۆری پێدراوە} وتویەتی: (مەبەستی ئایەتەکە) تێگەیشتنی قورئانە.

٣٣٨٦ - «عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ﴿٢٦٩﴾﴾ البقرة، قَالَ: الْكِتَابَ يُؤْتِي إِصَابَتَهُ مَنْ يَشَاءُ».[١]

واتە: لە موجاهیدەوە گێردراوەتەوە (ئەم ئایەتە): ﴿يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ﴿٢٦٩﴾﴾، واتە: [خوا حیکمەت دەدات بە هەر کەسێک کە بیەوێت] وتویەتی: حیکمەتەکە قورئانە، ڕاست پێکانەکەی دەدات بە هەر کەسێک کە بیەوێت.

٣٣٨٧ - «عَنْ خَيْثَمَةَ، قَالَ: قَالَ لِامْرَأَتِهِ: إِيَّاكِ أَنْ تُدْخِلِي بَيْتِي مَنْ يَشْرَبُ الْخَمْرَ بَعْدَ أَنْ كَانَ يُقْرَأُ فِيهِ الْقُرْآنُ كُلَّ ثَلَاثٍ».[٢]

واتە: خەیثەمە (لە کاتی وەفاتیدا) بە خێزانەکەی وت: نەکەیت کەسێک بێنیتە ماڵەکەم کە مەشروب دەخواتەوە (واتە: مێرد بە برام نەکەیتەوە چونکە مەشروبخۆرە)، دوای ئەوەی ماڵەکەم لە هەر سێ ڕۆژێک قورئانی تیا خوێندراوەتەوە (ئەو بەرەکەتەی ماڵەکەم نەسڕیتەوە).

٣٣٨٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَا يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ إِذَا رَجَعَ مِنْ سُوقِهِ، أَوْ مِنْ حَاجَتِهِ فَاتَّكَأَ عَلَى فِرَاشِهِ، أَنْ يَقْرَأَ ثَلَاثَ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: چ شتێک ناهێڵێت و قەدەغەتان دەکات لەوە کاتێ (هەر کەسێک لە ئێوە) لە بازاڕەکەی یان لە کارەکەی گەڕایەوە و، پاڵکەت لەسەر جێگاکەی، سێ ئایەت لە قورئان بخوێنێت؟.

## بابەت: چاکترینتان ئەوەیە کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکیش فێردەکات

٣٣٨٩ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».[٤]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکیش فێردەکات.

٣٣٩٠ - «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ خَيْرَكُمْ مَنْ عَلَّمَ الْقُرْآنَ أَوْ تَعَلَّمَهُ، قَالَ: أَقْرَأَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ فِي إِمْرَةِ عُثْمَانَ حَتَّى كَانَ الْحَجَّاجُ، قَالَ: ذَلِكَ أَقْعَدَنِي مَقْعَدِي هَذَا».[٥]

---

(١) ـ إسناده صحيح إلى مجاهد.
(٢) ـ إسناده حسن.
(٣) ـ إسناده صحيح.
(٤) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح لغيره.
(٥) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث ؟؟

واتە: لە عوسمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکیش فێردەکات.

(سەعدی کوڕی عوبەیدە) وتویەتی: ئەبو عەبدورڕەحمان دەرسی قورئانی دەدایەوە لەکاتی کاربەدەستبوونی عوسمانەوە تاوەکو کاتی حەججاج، وتویەتی: ئەو فەرمودەیە منی لێرە دانیشاندووە.

٣٣٩١ - «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خِيَارُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، قَالَ: فَأَخَذَ بِيَدِي وأَقْعَدَنِي هَذَا الْمَقْعَدَ أُقْرِئُ».[1]

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکیش فێردەکات.

وتویەتی: جا دەستی گرتم و لەو شوێنە داینیشاندم، جا بۆیە لێرە دەرسی قورئان دەدەمەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی خۆی فێری قورئان بکات، دواتر بیری بچێتەوە

٣٣٩٢ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ رَجُلٍ يَتَعَلَّمُ الْقُرْآنَ ثُمَّ يَنْسَاهُ، إِلاَّ لَقِيَ اللهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهُوَ أَجْذَمُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: عِيسَى هُوَ ابْنُ فَائِدٍ».[2]

واتە: لە سەعدی کوڕی عوبادەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆی فێری قورئان بکات، دواتر بیری بچێتەوە حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا دەگاتەوە بە خوا بەبێ دەست (واتە: بە کەم ئەندامی).

## بابەت: دەربارەی بەردەوامبوون و گرنگی پێدانی قورئان

٣٣٩٣ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: أَكْثِرُوا تِلاَوَةَ الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، قَالُوا: هَذِهِ الْمَصَاحِفُ تُرْفَعُ، فَكَيْفَ بِمَا فِي صُدوور الرِّجَالِ؟ قَالَ: يُسْرَى عَلَيْهِ لَيْلاً فَيُصْبِحُونَ مِنْهُ فُقَرَاءَ، وَيَنْسَوْنَ قَوْلَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَيَقَعُونَ فِي قَوْلِ الْجَاهِلِيَّةِ وَأَشْعَارِهِمْ، وَذَلِكَ حِينَ يَقَعُ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ».[3]

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: زۆر قورئان بخوێنن پێش ئەوەی هەڵبگیرێ، وتیان: ئەم پەرتوکانە هەڵدەگیرێنەوە؟ ئەی چی دەربارەی ئەوەی لە سینگی مسوڵمانان دایە (ئەو چی بەسەر دێت)؟ وتی: شەوێکی بەسەردا تێدەپەڕێت و بەیانی دەکەنەوە بە هەژاری لە قورئاندا (واتە: هیچ

---

(١) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث حسن بشواهده.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

قورئانیان لانەماوە)، وە گۆتەی (لا إله إلاَّ الله)یان بیر دەچێتەوە، وە دەکەونە ناو گۆتە و دروشمی نەفامی، ئەوە ئەو کاتەیە کە فەرمانی خوایان بەسەر جێبەجێ دەبێت.

٣٣٩٤ - «كَانَ قَتَادَةُ، يَقُولُ: اعْمُرُوا بِهِ قُلُوبَكُمْ، وَاعْمُرُوا بِهِ بُيُوتَكُمْ، قَالَ: أُرَاهُ: يَعْنِي الْقُرْآنَ».(١)

واتە: قەتادە دەیووت: دڵتانی پێ ئاوەدان و نوژەن بکەنەوە، وە ماڵەکانیشتانی پێ ئاوەدان بکەنەوە، (ئەبو موتیع) وتویەتی: پێم وابێ مەبەستی: قورئانە.

٣٣٩٥ - «عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: لَيُسْرَيَنَّ عَلَى الْقُرْآنِ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَلاَ يُتْرَكُ آيَةٌ فِي مُصْحَفٍ، وَلاَ فِي قَلْبِ أَحَدٍ إِلاَّ رُفِعَتْ».(٢)

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: شەوێک بەسەر قورئاندا تێدەپەڕێت، نە ئایەتێک هەیە جێبهێڵرێت لە موصحەفدا و، نە لە دڵی کەسێکدا دەمێنێتەوە حەتمەن بەرز دەکرێتەوە و نامێنێت.

٣٣٩٦ - «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: مَا جَالَسَ الْقُرْآنَ أَحَدٌ فَقَامَ عَنْهُ إِلاَّ بِزِيَادَةٍ أَوْ نُقْصَانٍ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء».(٣)

واتە: لە قەتادەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هیچ کەسێک نیە لەگەڵ قورئاندا دانیشتبێت و دواتر هەڵسابێت حەتمەن بە زیادەوە بووە یان بە کەمیەوە (واتە: یان پاداشت و زانست و شیفا و هیدایەتی بۆ زیاد بووە، یان سزا و خەسارەتی توش بووە)، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء، واتە: [ئێمە لە قورئاندا ئایەت و سورەتانێک دادەبەزێنین کە ببێتە هۆی شیفا و چارەسەرە دەروونی و جەستەییەکان هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیش بۆ بڕواداران، وە بۆ ستەمکار و خوانەناسانیش تەنها زیادکردنی زەرەرو زیان نەبێت هیچی دیکەی بۆ نیە].

٣٣٩٧ - «حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ عَجْلاَنَ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: إِنَّ اللهَ لَيُرِيدُ الْعَذَابَ بِأَهْلِ الأَرْضِ، فَإِذَا سَمِعَ تَعْلِيمَ الصِّبْيَانِ الْحِكْمَةَ، صَرَفَ ذَلِكَ عَنْهُمْ، قَالَ مَرْوَانُ: يَعْنِي بِالْحِكْمَةِ: الْقُرْآنَ».(٤)

واتە: لە ثابیتی کوڕی عەجلانی ئەنصاریەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: دەوترا: خوا دەیەوێت سزای خەڵکی زەوی بدات، جا کاتێ گوێبیستی فێرکردنی منداڵان لە حیکمەت دەبوو، ئەوە سزاکەی لەسەر لادەدان، مەڕوان وتویەتی: مەبەست بە حیکمەت: قورئانە.

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند ضعيف.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند حسن على عبد الله.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند ضعيف على ثابت.

٣٣٩٨ - «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: سَيَبْلَى الْقُرْآنُ فِي صُدوور أَقْوَامٍ كَمَا يَبْلَى الثَّوْبُ، فَيَتَهَافَتُ، يَقْرَءُونَهُ لاَ يَجِدُونَ لَهُ شَهْوَةً وَلاَ لَذَّةً، يَلْبَسُونَ جُلُودَ الضَّأْنِ عَلَى قُلُوبِ الذِّئَابِ، أَعْمَالُهُمْ طَمَعٌ لاَ يُخَالِطُهُ خَوْفٌ، إِنْ قَصَّرُوا، قَالُوا: سَنَبْلُغُ، وَإِنْ أَسَاءُوا، قَالُوا: سَيُغْفَرُ لَنَا، إِنَّا لاَ نُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئًا».[1]

واتە: لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قوڕئان کۆن دەبێت لە دڵی خەڵکانێک هەر وەک چۆن جل و بەرگ کۆن دەبێت و تیکە تیکە دەبێت و هەڵدەوەرێت، (ئەم خەڵکە) دەیخوێنن و هەست بە حەز و چێژەکەی ناکەن، پێستی مەڕ دەکەنە بەریان و هەقیقەتی خۆشیان لەسەر دڵی گورگە (واتە: فێڵاوی و دڵ ڕەقن)، کردەوەکانیان ئیشتیهایە، ترسی (خوای) لەگەڵ تێکەڵ نەبووە، ئەگەر کەمتەرخەم بن (لە کردەوە و عیبادەت) ئەوە دەڵێن: تەواوی دەکەین، وە ئەگەر خراپە بکەن ئەوە دەڵێن: لێمان دەبوردرێت ئێمە هیچ هاوبەشێکمان بۆ خوا بڕیار نەداوە.

٣٣٩٩ - «عَنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: بِئْسَمَا لأَحَدِكُمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ: بَلْ هُوَ نُسِّيَ. وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَسْرَعُ تَفَصِّيًا مِنْ صُدور الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ مِنْ عُقُلِهَا».[2]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: خراپترین شت بۆ یەکێک لە ئێوە ئەوەیە کە دەڵێت: فڵان و فڵان ئایەتم بیرچۆتەوە (با نەڵێت بیرم چۆتەوە)، بەڵکو بیری براوەتەوە (شەیتان لەبیری بردۆتەوە بە هۆی ئیهمالی خۆی)، دەوری قوڕئان بکەنەوە (زوو زوو مراجەعەی بکەنەوە)، چونکە ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوەی لە دڵی مسوڵمانان خێراترە لەو وشترەی لە پەتەکەی بەڕەڵا دەبێت.

٣٤٠٠ - «حَدَّثَنَا مُوسَى يَعْنِي ابْنَ عُلَيٍّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ تَعَلَّمُوا كِتَابَ اللهِ وَتَعَاهَدُوهُ، وَتَغَنَّوْا بِهِ وَاقْتَنُوهُ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ - أَوْ فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ - لَهُوَ أَشَدُّ تَفَلُّتًا مِنَ الْمَخَاضِ فِي الْعُقُلِ».[3]

واتە: لە موسای کوڕی عەلیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە باوکم بوو وتی: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیر بوو ﷺ دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان فێری پەرتوکی خوا بکەن و چاودێری بکەن (مەهێڵن بیرتان بچێتەوە)، وە دەنگتانی پێ خۆش بکەن و سودو پاداشی لێ وەربگرن، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ـ یان سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ـ ئەم قوڕئانە ڕۆیشتنی زیاتر و خێراترە لە ڕۆیشتن و ڕاکردنی وشتری ئاوس لە پەتەکەی.

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٤٠١ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تَعَلَّمُوا كِتَابَ اللهِ وَتَعَاهَدُوهُ، وَاقْتَنُوهُ، وَتَغَنَّوْا بِهِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَهُوَ أَشَدُّ تَفَلُّتًا مِنَ الْمَخَاضِ فِي الْعُقُلِ».(١)

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان فێری پەرتوکی خوا بکەن و چاودێری بکەن (مەهێڵن بیرتان بچێتەوە)، وە سودو پاداشی لێ وەربگرن و دەنگتانی پێ خۆش بکەن، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەم قوڕئانە ڕۆیشتنی زیاتر و خێراترە لە ڕۆیشتن و ڕاکردنی وشتری ئاوس لە پەتەکەی.

٣٤٠٢ - «أَنَّ عِكْرِمَةَ بْنَ أَبِي جَهْلٍ، كَانَ يَضَعُ الْمُصْحَفَ عَلَى وَجْهِهِ وَيَقُولُ: كِتَابُ رَبِّي، كِتَابُ رَبِّي».(٢)

واتە: عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل هەموو جار قوڕئانی دەخستە سەر ڕوخساری و دەیووت: پەرتوکی پەروەردگارم پەرتوکی پەروەردگارم (ئەوەندە قوڕئانی خۆش دەویست).

٣٤٠٣ - «حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، قَالَ: كَانَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى، إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ، قَرَأَ الْمُصْحَفَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، قَالَ: وَكَانَ ثَابِتٌ يَفْعَلُهُ».(٣)

واتە: لە ثابیتەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا کاتێ نوێژی بەیانی دەکرد، قوڕئانی دەخوێند تاوەکو خۆر هەڵدەهات، (هەممام) وتویەتی: هەروەها ثابیتیش ئاوای دەکرد.

## بابەت: قوڕئان فەرمایشتی خوایە

٣٤٠٤ - «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ البقرة، قَالَ: أَيْ: يَعْلَمُونَ أَنَّهُ كَلَامُ الرَّحْمَنِ».(٤)

واتە: لە قەتادەوە گێردراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ البقرة، واتە: [بەڕاستی خوا باکی نیە و نەنگ نیە بەلایەوە هەر نمونەیەک بهێنێتەوە

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على ثابت.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على ثابت.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

بە مێشولەیەکیش بێت، لەویش بچوکتر بێت یان گەورەتر، جا ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە ئەوە چاک دەزانن ئەم نمونەیە ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانەش کە کافر و بێ بڕوان دەڵێن: خوا مەبەستی چی بوو لەم نمونانە؟!!! جا خوا زۆرێکی پێ گومڕا دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنموویی دەکات، بەڵام دیارە جگە لە لارو وێر و یاخی و تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکات]، (قەتادە) وتویەتی: (کە لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ئیمان و باوەڕیان هێناوە ئەوە چاک دەزانن ئەم نمونەیە ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاریانەوەیە) واتە: دەزانن قورئان وتەی خوایە.

٣٤٠٥ - «عَنْ عَطِيَّةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ كَلَامٍ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ مِنْ كَلَامِهِ، وَمَا رَدَّ الْعِبَادُ إِلَى اللهِ كَلَامًا أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ كَلَامِهِ».(١)

واتە: لە عەتییەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ وتەیەک گەورەتر نیە لەلای خوا لە وتەکانی خۆی، وە بەندەکان هیچ قسە و وتەیەک ناگەڕێننەوە بۆ لای خوا لەلای خۆشەوستتر بێت لە وتەکانی خۆی (حەز دەکات بەندەکانی هەر وتەکانی ئەو دووبارە بکەنەوەو بڵێن: خوای پەروەردگار فەرمویەتی).

٣٤٠٦ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعْرِضُ نَفْسَهُ فِي الْمَوْسِمِ عَلَى النَّاسِ فِي الْمَوْقِفِ فَيَقُولُ: هَلْ مِنْ رَجُلٍ يَحْمِلُنِي إِلَى قَوْمِهِ؟ فَإِنَّ قُرَيْشًا مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلَامَ رَبِّي».(٢)

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەوسیمی حەج لە عەرەفە خۆی بۆ خەڵکی عەرز کرد و فەرمووی: ئایا هیچ پیاوێک هەیە بمباتەوە بۆ لای قەومەکەی؟ قورەیشیەکان قەدەغەیان کردووم لەوەی وتەی خوای خۆم ڕابگەیەنم.

٣٤٠٧ - «عَنْ أَبِي الزَّعْرَاءِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ كَلَامُ اللهِ، فَلاَ أَعْرِفَنَّكُمْ فِيمَا عَطَفْتُمُوهُ عَلَى أَهْوَائِكُمْ».(٣)

واتە: لە ئەبو زەعرائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: بێگومان ئەم قورئانە وتەی خوایە، فێرتان ناکەین ئەوەی لاری دەکەنەوە بۆ هەواو نەفسی خۆتان (واتە: قورئان دەبێ وەکو خۆی لێک بدرێتەوە نەک بکرێتە بەڵگە بۆ بۆچونی پێشوەختەی خۆتان، کە سەرچاوەی گرتووە لە هەواو نەفس و دەتانەوێ بەلای خۆتانی بشکێننەوە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: گەورەیی فەرمایشتی خوا بەسەر وتەكانی تر

٣٤٠٨ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ شَغَلَهُ قِرَاءَةُ الْقُرْآنِ عَنْ مَسْأَلَتِي وَذِكْرِي، أَعْطَيْتُهُ أَفْضَلَ ثَوَابِ السَّائِلِينَ. وَفَضْلُ كَلَامِ اللهِ عَلَى سَائِرِ الْكَلَامِ، كَفَضْلِ اللهِ عَلَى خَلْقِهِ».(١)

**واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (خوای پەروەردگار فەرموویەتی) هەر كەسێك خوێندنی قورئان سەرقاڵی بكات لە دووعا و داواڵێكردنم و یادی من (واتە: لەبەر قورئان مەجالی دووعا و زیكری نەبێت)، ئەوە چاكترین پاداشتی نزاكارانی پێ دەبەخشم، وە گەورەیی وتەی خوا بەسەر وتەی جگە لە وتەی خوا، وەك گەورەیی خوایە بەسەر دروستكراوەكانی.**

٣٤٠٩ - «عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَضْلُ كَلَامِ اللهِ عَلَى كَلَامِ خَلْقِهِ، كَفَضْلِ اللهِ عَلَى خَلْقِهِ».(٢)

**واتە: لە شەهری كوڕی حەوشەبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەیی وتەی خوا بەسەر وتەی دروستكراوەكان، وەك گەورەیی خوایە بەسەر دروستكراوەكانی.**

٣٤١٠ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: الْقُرْآنُ أَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ».(٣)

**واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: قورئان لای خوا خۆشەویستترە لە ئاسمانەكان و ئەوەی تیایاندایە.**

## بابەت: كاتێ جیاوازبوون لە قورئان(٤) ئەوە هەڵسن (وازی لێ بێنن)

٣٤١١ - «عَنْ جُنْدُبٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفْتُمْ عَلَيْهِ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ، فَقُومُوا».(٥)

**واتە: لە جوندوبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان بخوێنن تا ئەو كاتەی لەسەری كۆكن، جا كاتێ جیاوازیتان تیایدا دروست بوو ئەوە هەڵسن (وازی لێ بهێنن).**

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده مرسل بسند صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ واتە: بۆچونی پێچەوانەی قورئانتان بۆ دروست بوو لە كاتی خوێندنی.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٣٤١٢ - «عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ، فَقُومُوا».[١]

واتە: لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان بخوێنن تا ئەو کاتەی دڵەکانتان لەسەری کۆکە، جا کاتێ جیاوازیتان تیایدا دروست بوو ئەوە هەڵسن (وازی لێ بهێنن).

٣٤١٣ - «عَنْ جُنْدُبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ، فَقُومُوا».[٢]

واتە: لە جوندوبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان بخوێنن تا ئەو کاتەی دڵەکانتان لەسەری کۆکە، جا کاتێ جیاوازیتان تیایدا دروست بوو ئەوە هەڵسن (وازی لێ بهێنن).

## بابەت: نمونەی ئەو کەسە بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێت

٣٤١٤ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: مِنَ النَّاسِ مَنْ يُؤْتَى الإِيمَانَ وَلاَ يُؤْتَى الْقُرْآنَ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُؤْتَى الْقُرْآنَ وَلاَ يُؤْتَى الإِيمَانَ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُؤْتَى الْقُرْآنَ وَالإِيمَانَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لاَ يُؤْتَى الْقُرْآنَ وَلاَ الإِيمَانَ، ثُمَّ ضَرَبَ لَهُمْ مَثَلاً، قَالَ: فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ الإِيمَانَ وَلَمْ يُؤْتَ الْقُرْآنَ، فَمَثَلُهُ مَثَلُ التَّمْرَةِ حُلْوَةُ الطَّعْمِ لاَ رِيحَ لَهَا، وَأَمَّا مَثَلُ الَّذِي أُوتِيَ الْقُرْآنَ وَلَمْ يُؤْتَ الإِيمَانَ فَمَثَلُ الآسَةِ طَيِّبَةُ الرِّيحِ، مُرَّةُ الطَّعْمِ، وَأَمَّا الَّذِي أُوتِيَ الْقُرْآنَ وَالإِيمَانَ فَمَثَلُ الأُتْرُجَّةِ، طَيِّبَةُ الرِّيحِ، حُلْوَةُ الطَّعْمِ، وَأَمَّا الَّذِي لَمْ يُؤْتَ الْقُرْآنَ وَلاَ الإِيمَانَ فَمَثَلُهُ مَثَلُ الْحَنْظَلَةِ مُرَّةُ الطَّعْمِ لاَ رِيحَ لَهَا».[٣]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەندێک لە خەڵکی ئیمان و باوەڕیان پێ دراوە، بەڵام قورئانیان پێ نەدراوە، وە هەندێکی تریان قورئانیان پێ دراوە، بەڵام ئیمان و باوەڕیان پێ نەدراوە، وە هەیە قورئان و ئیمانی پێ دراوە، وە هەیە نە قورئان و نە ئیمانی پێ دراوە، دواتر نمونەی بۆ ئەمانە هێنایەوە، وتی: هەرچی ئەوەیە کە ئیمانی پێ دراوە بەڵام قورئانی پێ نەدراوە، ئەوە نمونەکەی وەک خورمایە، تامی شیرینە بەڵام بۆنی نیە، وە هەرچی نمونەی ئەو کەسەشە کە قورئانی پێ دراوە بەڵام ئیمانی پێ نەدراوە، ئەوە نمونەکەی وەک ئاسەیە (ناوی دارێکە)، بۆنی خۆشە بەڵام تاڵە، وە هەرچی نمونەی ئەو کەسەشە کە قورئان و ئیمانی پێ دراوە، ئەوە نمونەکەی وەک ئوتروجەیە، بۆنی خۆشە و تامیشی شیرینە، وە هەرچی ئەوەیە کە نە قورئان و نە ئیمانی پێ دراوە، ئەوە نمونەکەی وەک گوژارک وایە، تامی تاڵە و بۆنیشی نیە.

---

(١) ـ إسناده موقوف صحيح على جندب.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٣٤١٥ - «عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ طَعْمُهَا حُلْوٌ وَلَيْسَ لَهَا رِيحٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الْحَنْظَلَةِ لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ».[١]

واتە: لە ئەبو مووسای ئەشعەریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: نمونەی ئەو بڕوادارەی قورئان دەخوێنێت وەک ئوترجە وایە، تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، وە نمونەی ئەو بڕوادارەی قورئان ناخوێنێت، وەک خورما وایە، تامی خۆشە، بەڵام بۆنی نیە، وە نمونەی ئەو مونافیقەی کە قورئان دەخوێنێت وەک ڕەیحان وایە، بۆنی خۆشە و تامیشی تاڵە، وە نمونەی ئەو مونافیقەی کە قورئان ناخوێنێت وەک گوژارک وایە، بۆنی نیە تامیشی تاڵە.

٣٤١٦ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: مَثَلُ الَّذِي أُوتِيَ الإِيمَانَ وَلَمْ يُؤْتَ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلاَ رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الَّذِي أُوتِيَ الْقُرْآنَ وَلَمْ يُؤْتَ الإِيمَانَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ الآسَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الَّذِي أُوتِيَ الْقُرْآنَ وَالإِيمَانَ مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يُؤْتَ الإِيمَانَ وَلاَ الْقُرْآنَ مَثَلُ الْحَنْظَلَةِ رِيحُهَا خَبِيثٌ، وَطَعْمُهَا خَبِيثٌ».[٢]

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: نمونەی ئەو کەسەی کە ئیمانی پێ دراوە بەڵام قورئانی پێ نەدراوە، ئەوە نمونەکەی وەک خورمایە، تامی شیرینە بەڵام بۆنی نیە، وە نمونەی ئەو کەسەش کە قورئانی پێ دراوە بەڵام ئیمانی پێ نەدراوە، ئەوە نمونەکەی وەک ئاسەیە (ناوی دارێکە)، بۆنی خۆشە بەڵام تاڵە، وە نمونەی ئەو کەسەش کە قورئان و ئیمانی پێ دراوە، ئەوە نمونەکەی وەک ئوترجەیە، بۆنی خۆشە و تامیشی شیرینە، وە نمونەی ئەو کەسەش کە نە قورئان و نە ئیمانی پێ دراوە، ئەوە نمونەکەی وەک گوژارک وایە، بۆنی ناخۆشە و تامیشی ناخۆشە.

### بابەت: خوا بەم قورئانە کەسانێک بەرز دەکاتەوە و کەسانێکیش نزم دەکات

٣٤١٧ - «حَدَّثَنِي عَامِرُ بْنُ وَاثِلَةَ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ لَقِيَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ بِعُسْفَانَ، وَكَانَ عُمَرُ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى أَهْلِ مَكَّةَ، فَسَلَّمَ عَلَى عُمَرَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَنِ اسْتَخْلَفْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي؟ فَقَالَ نَافِعٌ: اسْتَخْلَفْتُ عَلَيْهِمُ ابْنَ أَبْزَى. فَقَالَ عُمَرُ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ فَقَالَ: مَوْلًى مِنْ مَوَالِينَا. فَقَالَ عُمَرُ: فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى؟ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللهِ، عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ. فَقَالَ عُمَرُ: أَمَا إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ قَالَ: إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ».[٣]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عامیڕی کوڕی واثیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نافیعی کوڕی عەبدولحاریث گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە عەسەفان (کە شوێنێکە لە دەرەوەی مەککە)، لە کاتێکدا عومەر کردبووی بە کاربەدەست بەسەر خەڵکی مەککە، جا سەلامی لە عومەر کرد و عومەریش پێی وت: کێت لە شوێنی خۆت جێهێشتووە بەسەر خەڵکی دۆڵەکە (مەککە)؟ نافیعیش وتی: «ئیبنو ئەبزا»م لەسەر داناون بە کاربەدەست لە شوێنی خۆم، عومەریش وتی: ئیبنو ئەبزا کێیە؟ ئەویش وتی: کۆیلەیەکە لە کۆیلەکانمان، عومەر وتی: بەندەیەکت بەسەر کردوونەتە کاربەدەست لە شوێنی خۆت؟! ئەویش وتی: ئەی گەورەی بڕواداران ئەو قاریئی قورئانە و زانایە بە زانستی میرات، عومەریش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا خەڵکانێک بەم پەرتوکە بەرز دەکاتەوە و خەڵکانیکیش نزم دەکاتەوە.

## بابەت: گەورەیی ئەو کەسەی گوێ بۆ قورئان دەگرێت

٣٤١٨ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، قَالَ: إِنَّ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ لَهُ أَجْرٌ، وَإِنَّ الَّذِي يَسْتَمِعُ لَهُ أَجْرَانِ».[١]

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت پاداشتێکی بۆ هەیە، ئەوەش کە گوێ بۆ قورئان دەگرێت دوو پاداشتی بۆ هەیە.

٣٤١٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَنِ اسْتَمَعَ إِلَى آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ، كَانَتْ لَهُ نُورًا».[٢]

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک گوێ بۆ ئایەتێک بگرێت لە پەرتوکی خوا، ئەوە ئەو ئایەتە بۆی دەبێتە نور و ڕووناکی.

## بابەت: گەورەیی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت و لەسەری سەخت دەبێت

٣٤٢٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ مَاهِرٌ بِهِ، فَهُوَ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَؤُهُ وَهُوَ يَشْتَدُّ عَلَيْهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ».[٣]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت و بلیمەتە لێی، ئەوە لەگەڵ فریشتە نێردراوە ڕێزدارە چاکەکارەکان دایە (واتە: لەگەڵ چاکترین پۆلی فریشتە دایە)، وە ئەو کەسەشی کە دەیخوێنێتەوە و لەسەری سەختە، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە (پاداشتی خوێندنەوە و پاداشتی زەحمەت چەشتن).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٤٢١ - «عَنْ وَهْبٍ الذِّمَارِيِّ، قَالَ: مَنْ آتَاهُ اللهُ الْقُرْآنَ فَقَامَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَعَمِلَ بِمَا فِيهِ، وَمَاتَ عَلَى الطَّاعَةِ، بَعَثَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَعَ السَّفَرَةِ وَالأَحْكَامِ، قَالَ سَعِيدٌ: السَّفَرَةُ: الْمَلاَئِكَةُ، وَالأَحْكَامُ: الأَنْبِيَاءُ، قَالَ: وَمَنْ كَانَ حَرِيصًا وَهُوَ يَتَفَلَّتُ مِنْهُ، وَهُوَ لاَ يَدَعُهُ، أُوتِيَ أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ. وَمَنْ كَانَ عَلَيْهِ حَرِيصًا وَهُوَ يَتَفَلَّتُ مِنْهُ وَمَاتَ عَلَى الطَّاعَةِ، فَهُوَ مِنْ أَشْرَافِهِمْ، وَفُضِّلُوا عَلَى النَّاسِ، كَمَا فُضِّلَتِ النُّسُورُ عَلَى سَائِرِ الطَّيْورِ، وَكَمَا فُضِّلَتْ مَرْجَةٌ خَضْرَاءُ عَلَى مَا حَوْلَهَا مِنَ الْبِقَاعِ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، قِيلَ: أَيْنَ الَّذِينَ كَانُوا يَتْلُونَ كِتَابِي لَمْ يُلْهِهِمْ اتِّبَاعُ الأَنْعَامِ؟ فَيُعْطَى الْخُلْدَ وَالنَّعِيمَ. فَإِنْ كَانَ أَبَوَاهُ مَاتَا عَلَى الطَّاعَةِ، جُعِلَ عَلَى رُءُوسِهِمَا تَاجُ الْمُلْكِ، فَيَقُولاَنِ: رَبَّنَا مَا بَلَغَتْ هَذَا أَعْمَالُنَا؟ فَيَقُولُ: بَلَى إِنَّ ابْنَكُمَا كَانَ يَتْلُو كِتَابِي».(١)

واتە: لە وەهبی ذیماریەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک خوا قورئانی پێ بدات (واتە: لەبەرکردنی قورئانی پێ ببەخشێت) و لە کاتانێکی شەو و کاتانێکی ڕۆژدا نوێژی پێ بخوێنێت و کار بە ناوەڕۆکەکەی بکات و لەسەر گوێڕایەڵی بمرێت، ئەوە خوا لە ڕۆژی دواییدا زیندووی دەکاتەوە لەگەڵ سەفەرە و ئەحکامدا، سەعید وتی: سەفەرە فریشتەیە، ئەحکامیش پێغەمبەرانن، وتی: هەر کەسێکیش سور بێت (لەسەر لەبەرکردنی قورئان) لە کاتێکدا بیری دەچێتەوە و وازیشی لێ ناهێنێت، ئەوە دوو جار پاداشتەکەی دەدرێتەوە، وە هەر کەسێک لەسەری سور بێت لە کاتێکدا بیری دەچێتەوە، لەسەر گوێڕایەڵیش بمرێت، ئەوە لە گەورەکانیانە و ڕێز و گەورەیی زیاتری پێ دراوە بەسەر خەڵکی، هەر وەک چۆن هەڵۆکان گەورەیی زیاتریان پێ دراوە بەسەر باڵندەکانی تر، وە هەر وەک چۆن پارچە مێرگێکی سەوز گەورەیی و گرنگی زیاتری دراوەتێ بەسەر زەویەکانی وشکی دەوروبەری، جا کاتێ ڕۆژی دوایی دادێت دەوترێت (واتە: خوای پەروەردگار دەفەرموێت): کوانن ئەوانەی پەرتوکی منیان دەخوێندەوە و شوێنکەوتنی ئاژەڵ و (حەیوانداری و کارەکانی خۆیان) سەرقاڵی نەدەکردن؟ جا ژیانی هەتاهەتایی و خۆشیان پێ دەدرێت، جا ئەگەر دایک و باوکی لەسەر گوێڕایەڵی مردبن، ئەوە تاجی پادشایەتیان دەخرێتە سەر، جا دایک و باوکەکە دەڵێن: پەروەردگارا کردەوەکانمان نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە؟! (خوای پەروەردگاریش) دەفەرموێت: با، منداڵەکەی ئێوە پەرتوکی منی دەخوێندەوە (ئەوەش بە کردەوەی ئێوە حیسابە).

## بابەت: گەورەیی فاتیحە

٣٤٢٢ - «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فِي فَاتِحَةِ الْكِتَابِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ».(٢)

واتە: لە عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فاتیحە فەرموویەتی: شیفایە بۆ گشت نەخۆشیێک.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده مرسل بسند صحيح.

٣٤٢٣ - «عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى الأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال، قَالَ: أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُمْ».(١)

واتە: لە ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللای ئەنصاریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامدا تێپەڕی و وتی: مەگەر خوا عزّ وجلّ نەیفەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال، واتە: ((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێک بانگتان دەکەن بۆ بەرنامە و ڕێبازێک و شتێک کە دەتانژیێنێتەوە و ژیان بەخشە، چاک بزانن بەڕاستی خوا (زۆر بە ئاسانی دەتوانێت) دەسەڵاتی بکەوێتە نێوان ئادەمیزاد و (ئاواتەکانی) دڵیەوە (بە گۆڕینیان)، (بیرتان نەچێت) بەڕاستی هەر بۆ لای ئەویش کۆدەکرێنەوە))، جا فەرمووی: ئایا گەورەترین سوڕەتت فێر نەکەم لە قوڕئاندا، پێش ئەوەی دەربچم لە مزگەوت؟ جا کاتێ ویستی (لە مزگەوت) دەربچێت فەرمووی: «الحمد لله رب العالمين» (واتە: سوڕەتی فاتیحەی فێرکرد کە گەورەترین سوڕەتە) و سەبعول مەثانی و قوڕئانی مەزنە کە پێم دراوە.

٣٤٢٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَاتِحَةُ الْكِتَابِ هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي».(٢)

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فاتیحە سەبعول مەثانیە.

٣٤٢٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا أُنْزِلَتْ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الإِنْجِيلِ وَالزَّبُورِ وَالْقُرْآنِ مِثْلُهَا - يَعْنِي أُمَّ الْقُرْآنِ - وَإِنَّهَا لَسَبْعٌ مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُعْطِيتُ».(٣)

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە لە تەوڕات و نە لە ئینجیل و نە لە قوڕئان وەک ئەو دانەبەزیوە ـ واتە: وەک فاتیحە ـ وە ئەو سەبعول مەثانی و قوڕئانی مەزنە کە پێم دراوە.

٣٤٢٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْحَمْدُ لِلَّهِ أُمُّ الْقُرْآنِ، وَأُمُّ الْكِتَابِ، وَالسَّبْعُ الْمَثَانِي».(٤)

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن ولكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «الحمدللّه» (واتە: سورەتی فاتیحە) ئوممول قورئان و ئوممول كتاب و سەبعول مەثانیە (واتە: لەبەر گرنگی سورەتەكە ئەو چەند ناوانەی هەیە).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سوورەتی بەقەرە

٣٤٢٧ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَا مِنْ بَيْتٍ تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ إِلاَّ خَرَجَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضَرِيطٌ».[١]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر ماڵێک سورەتی بەقەرەی تیادا بخوێندرێت حەتمەن شەیتان لێی دەچێتە دەرەوە و ڕادەكات و دەنگ لە دواوەی دەردەچێت.

٣٤٢٨ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، قَالَ: سُورَةُ الْبَقَرَةِ تَعَلُّمُهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكُهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ، وَهِيَ فُسْطَاطُ الْقُرْآنِ».[٢]

واتە: لە خالیدی كوڕی مەعدانەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: سورەتی بەقەرە فێربوونەكەی بەرەكەتە و، وازلێهێنانی داخ خواردن و پەشیمانیە و، ساحیرەكانیش ناتوانن خۆی لەبەرامبەر ڕابگرن و، مەرجەعی قورئانە.

٣٤٢٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ سَنَامًا، وَإِنَّ سَنَامَ الْقُرْآنِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ، وَإِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ لُبَابًا، وَإِنَّ لُبَابَ الْقُرْآنِ الْمُفَصَّلُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: اللُّبَابُ: الْخَالِصُ».[٣]

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە، كە وتویەتی: هەموو شتێک چڵەپۆپەیەكی هەیە، چڵەپۆپەی قورئانیش سورەتی بەقەرەیە، وە هەموو شتێكیش پاڵفتە و پوختەیەكی هەیە، پوختەی قورئانیش ئەو سورەتانەن كە ئایەتیان زۆر و كورتن.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (اللُّبَابُ) واتە: پاڵفتە.

٣٤٣٠ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، تُوِّجَ بِهَا تَاجًا فِي الْجَنَّةِ».[٤]

واتە: لە عەبدورڕەحمانی كوڕی ئەسوەدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک سورەتی بەقەرە بخوێنێت تاجێكی دەخرێتە سەر لە بەهەشتدا.

٣٤٣١ - «عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الشَّيْطَانَ إِذَا سَمِعَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ تُقْرَأُ فِي بَيْتٍ، خَرَجَ مِنْهُ».[٥]

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكنه أثر موقوف صحيح لغيره.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على عبد الله.

واتە: لە ئەبو ئەحوەصەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: شەیتان كاتێ گوێی لە سوڕەتی بەقەڕە دەبێت دەخوێندرێت لە ماڵێكدا ئەوە لێی دەردەچێت.

## بابەت: گەورەیی سەرەتای سوڕەتی بەقەڕە و ئایەتی كورسی

٣٤٣٢ - «حَدَّثَنِي أَيْفَعُ بْنُ عَبْدٍ الْكَلَاعِيُّ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ سُورَةِ الْقُرْآنِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص، قَالَ: فَأَيُّ آيَةٍ فِي الْقُرْآنِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: آيَةُ الْكُرْسِيِّ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ۝٢٥٥ ﴾ البقرة، قَالَ: فَأَيُّ آيَةٍ يَا نَبِيَّ اللهِ تُحِبُّ أَنْ تُصِيبَكَ وَأُمَّتَكَ؟ قَالَ: خَاتِمَةُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّهَا مِنْ خَزَائِنِ رَحْمَةِ اللهِ، مِنْ تَحْتِ عَرْشِهِ، أَعْطَاهَا هَذِهِ الأُمَّةَ، لَمْ تَتْرُكْ خَيْرًا مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ».[١]

واتە: لە ئەیفەعی كوڕی عەبدی كەلاعیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا كام سوڕەتی قورئان گەورەترینە؟ فەرمووی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص، پیاوەكە وتی: ئەی چ ئایەتێك لە قورئاندا گەورەترینە؟ فەرمووی: ئایەتی كورسی: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ۝٢٥٥ ﴾ البقرة، پیاوەكە وتی: ئەی حەز دەكەیت كام ئایەت بەر خۆت و ئوممەتەكەت بكەوێت و ببێتە نسیبتان ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: كۆتایی سوڕەتی بەقەرە، چونكە خەزێنەكانی ڕەحمەتی خوایە لە ژێر عەرشەكەی و داویەتیە ئەم ئوممەتە، هیچ چاكە و خێرێكی دونیا و دوارۆژ نیە حەتمەن ئەم ئایەتانە لەخۆیان گرتووە.

٣٤٣٣ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: لَقِيَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ رَجُلاً مِنَ الْجِنِّ، فَصَارَعَهُ فَصَرَعَهُ الإِنْسِيُّ. فَقَالَ لَهُ الإِنْسِيُّ: إِنِّي لَأَرَاكَ ضَئِيلاً شَخِيتًا، كَأَنَّ ذُرَيِّعَتَيْكَ ذُرَيِّعَتَا كَلْبٍ، فَكَذَاكَ أَنْتُمْ مَعْشَرَ الْجِنِّ، أَمْ أَنْتَ مِنْ بَيْنِهِمْ كَذَلِكَ؟ قَالَ: لاَ وَاللهِ إِنِّي مِنْهُمْ لَضَلِيعٌ، وَلَكِنْ عَاوِدْنِي الثَّانِيَةَ، فَإِنْ صَرَعْتَنِي عَلَّمْتُكَ شَيْئًا يَنْفَعُكَ. فَعَاوَدَهُ فَصَرَعَهُ، قال: هَاتِ عَلِّمْنِي، قَالَ: نَعم، قَالَ: تَقْرَأُ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ۝٢٥٥ ﴾ البقرة؟ قَالَ: نَعم. قَالَ: فَإِنَّكَ لاَ تَقْرَؤُهَا فِي بَيْتٍ إِلاَّ خَرَجَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ، لَهُ خَبَجٌ كَخَبَجِ الْحِمَارِ، ثُمَّ لاَ يَدْخُلُهُ حَتَّى يُصْبِحَ».[٢]

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ وتویەتی: پیاوێك لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ گەیشت بە پیاوێك لە جنۆكە و لەگەڵی كەوتە زۆرەملانێ و مرۆڤەكە جنۆكەكەیدا بە زەویدا، جا مرۆڤەكە پێی وت: من دەتبینم باریك و لاواز و بێ هێزی، باسكەكانت دەڵێی باسكی سەگن (ڕەق و باریكن)، ئایا كۆمەڵەی جنۆكەكان هەموویان ئاوان یان تەنها تۆ لە ناویاندا ئاوای؟ (جنۆكەكە) وتی: نەخێر، سوێند بە خوا من لە ناویاندا زۆر گەورە و زەبەلاحم، بەڵام دووبارە زۆرانەم لەگەڵ بكە، جا ئەگەر لە زەویت دام (ئەم جارەیان) ئەوە شتێكت فێر دەكەم سودت پێ دەگەیەنێت، جا دووبارەی كردەوە و دیسان دای

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

لە زەوی، وتی: دەی فێرم بکە (ئەو شتەی بەڵێنت دا)، (جنەکە وتی): باشە، وتی:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة، دەخوێنی؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ، جنەکە وتی: تۆ لە هەرماڵێکدا بیخوێنیت حەتمەن شەیتان لێی دەچێتە دەرەوە، بای لێ دەردەچێت وەک هی گوێدرێژ، دواتر هەتا بەیانی ناچێتەوە ناو ماڵەکە.

٣٤٣٤ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ، لَمْ يَدْخُلْ ذَلِكَ الْبَيْتَ شَيْطَانٌ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى يُصْبِحَ: أَرْبَعًا مِنْ أَوَّلِهَا، وَآيَةُ الْكُرْسِيِّ، وَآيَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَثَلَاثٌ خَوَاتِيمُهَا، أَوَّلُهَا: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ﴾ البقرة».[١]

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: هەر کەسێک دە ئایەت لە سورەتی بەقەرە بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە شەیتان لەم شەوەدا ناچێتە ئەو ماڵەوە تاوەکو بەیانی، (دە ئایەتەکانیش بەم شێوەیەن): چوار ئایەت لە سەرەتاکەی و، ئایەتی کورسی و، دوو ئایەتی دواتر و، سێ ئایەت لە کۆتاییەکەی کە سەرەتاکەی ئەم ئایەتەیە: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ﴾ البقرة.

٣٤٣٥ - «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ أَرْبَعَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَآيَةَ الْكُرْسِيِّ، وَآيَتَانِ بَعْدَ آيَةِ الْكُرْسِيِّ، وَثَلَاثًا مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَمْ يَقْرَبْهُ وَلاَ أَهْلَهُ يَوْمَئِذٍ شَيْطَانٌ، وَلاَ شَيْءٌ يَكْرَهُهُ، وَلاَ يُقْرَأْنَ عَلَى مَجْنُونٍ إِلاَّ أَفَاقَ».[٢]

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک چوار ئایەت بخوێنێت لە سەرەتای سورەتی بەقەرە و، ئایەتی کورسی و، دوو ئایەتی دوای ئایەتی کورسی و، سێ ئایەتی کۆتایی سورەتی بەقەرە، ئەوە شەیتان نزیکی خۆی و خانەوادەکەی نابێتەوە لەم ڕۆژەدا، وە هیچ شتێکیش نزیکی ناکەوێتەوە کە پێی ناخۆش بێت، وە ئەم ئایەتانە بخوێنرێن لەسەر شێتێک حەتمەن ژیر دەبێتەوە و چاک دەبێتەوە.

٣٤٣٦ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَمَّنْ، سَمِعَ عَلِيًّا ﷺ، يَقُولُ: مَا كُنْتُ أَرَى أَنَّ أَحَدًا يَعْقِلُ، يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ هَؤُلاَءِ الْآيَاتِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَإِنَّهُنَّ لَمِنْ كَنْزٍ تَحْتَ الْعَرْشِ».[٣]

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لەو کەسەی گێڕاوەتەوە کە گوێی لە عەلی بووە ﷺ کاتێ دەیووت: پێم وا نیە کەسێک ژیر بێت و بخەوێت بەر لەوەی ئەم ئایەتانە بخوێنێت لە کۆتایی سورەتی بەقەرەدا، ئەم ئایەتانە لە خەزێنەی ژێر عەرشن.

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده منقطع.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٣٤٣٧ - «عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ سُبَيْعٍ - وَكَانَ من أَصْحَابِ عَبْدِ اللهِ ﷺ - قَالَ: مَنْ قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنَ الْبَقَرَةِ عِنْدَ مَنَامِهِ، لَمْ يَنْسَ الْقُرْآنَ: أَرْبَعُ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِهَا، وَآيَةُ الْكُرْسِيِّ، وَآيَتَانِ بَعْدَهَا، وَثَلَاثٌ مِنْ آخِرِهَا، قَالَ إِسْحَاقُ: لَمْ يَنْسَ مَا قَدْ حَفِظَه».(١)

واتە: لە موغیرەی کوڕی سوبەیعەوە گێڕدراوەتەوە ـ کە یەکێکە لە هاوەڵانی عەبدوڵلا ﷺ ـ وتویەتی: هەر کەسێک دە ئایەت بخوێنێت لە سوڕەتی بەقەرە لەکاتی خەوتنیدا، ئەوە قورئانی بیر ناچێتەوە (دە ئایەتەکانیش بەم شێوەیەن): چوار ئایەت لە سەرەتاکەی و، ئایەتی کورسی و، دوو ئایەتی دوای ئایەتی کورسی و، سێ ئایەت لە کۆتاییەکەی، جا ئیسحاق (باسی خۆی کردوە کە ئەوەی جێبەجێ کردوە) و وتویەتی: ئەوەی لەبەری کردوە بیری نەچۆتەوە.

٣٤٣٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ، وَفَاتِحَةَ حم الْمُؤْمِنِ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ٣ ﴾ غافر، لَمْ يَرَ شَيْئًا يَكْرَهُهُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَرَأَهَا حِينَ يُمْسِي، لَمْ يَرَ شَيْئًا يَكْرَهُهُ حَتَّى يُصْبِحَ».(٢)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ئایەتی کورسی و، سەرەتای سوڕەتی غافیر:﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ٣ ﴾ غافر، بخوێنێت بە ڕۆژ، ئەوە هیچ شتێکی توش نابێت کە پێی ناخۆش بێت تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە، وە هەر کەسێکیش بیانخوێنێت لە کاتی ئێوارەدا، ئەوە هیچ شتێکی توش نابێت کە پێی ناخۆش بێت تاوەکو بەیانی دەکاتەوە.

٣٤٣٩ - «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِأَلْفَيْ عَامٍ، فَأَنْزَلَ مِنْهُ آيَتَيْنِ خَتَمَ بِهِمَا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، وَلاَ تُقْرَآنِ فِي دَارٍ ثَلاَثَ لَيَالٍ فَيَقْرَبُهَا شَيْطَانٌ».(٣)

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا نوسراوێکی نوسی دوو هەزار ساڵ بەر لەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات، جا دوو ئایەتی لێ دابەزاندن و کردنی بە کۆتایی سوڕەتی بەقەڕە، جا سێ شەوان لە هیچ ماڵێک نیە بخوێندرێن و شەیتان نزیکی بکەوێتەوە.

٣٤٤٠ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ الْآيَتَيْنِ الْآخِرَتَيْنِ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ».(٤)

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على المغيرة.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی بەقەرە بخوێنێت لە شەوێکدا ئەوە بەسیەتی (واتە: شوێنی شەونوێژ دەگرێتەوە، یان واتە: شەڕی شەیتانی لێ دووردەخاتەوە).

٣٤٤١ - «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ رَضِي اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اسْمُ اللهِ الأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة،﴿ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة».[1]

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسمی ئەعزەمی خوا (ناوە گەورەکەی خوا کە هەر داوایەکی پێ بکرێت ڕەت ناکرێتەوە) لەم دوو ئایەتە دایە:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة،﴿ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة.

٣٤٤٢ - «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ خَتَمَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ بِآيَتَيْنِ أُعْطِيتُهُمَا مِنْ كَنْزِهِ الَّذِي تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَعَلَّمُوهُنَّ وَعَلِّمُوهُنَّ نِسَاءَكُمْ، فَإِنَّهُمَا صَلَاةٌ وَقُرْآنٌ وَدُعَاءٌ».[2]

واتە: لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا سورەتی بەقەرەی کۆتایی هێناوە بە دوو ئایەت کە پێم دراوە لەو خەزێنەی کە لە ژێر عەرش دایە، کەواتە: خۆتانی فێر بکەن و ئافرەتەکانیشتان فێر بکەن، چونکە ئەم دوو ئایەتە نوێژ و قورئان و دووعان.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سورەتی بەقەرە و ئالی عیمران

٣٤٤٣ - «حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: تَعَلَّمُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ يَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ، ثُمَّ سَكَتَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: تَعَلَّمُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، وَآلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا الزَّهْرَاوَانِ، وَإِنَّهُمَا تُظِلاَنِ صَاحِبَهُمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ غَيَايَتَانِ، أَوْ فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ. وَإِنَّ الْقُرْآنَ يَلْقَى صَاحِبَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِينَ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ كَالرَّجُلِ الشَّاحِبِ فَيَقُولُ لَهُ: هَلْ تَعْرِفُنِي؟ فَيَقُولُ: مَا أَعْرِفُكَ، فَيَقُولُ: أَنَا صَاحِبُكَ الْقُرْآنُ الَّذِي أَظْمَأْتُكَ فِي الْهَوَاجِرِ، وَأَسْهَرْتُ لَيْلَكَ، وَإِنَّ كُلَّ تَاجِرٍ مِنْ وَرَاءِ تِجَارَتِهِ، وَإِنَّكَ الْيَوْمَ مِنْ وَرَاءِ كُلِّ تِجَارَةٍ، فَيُعْطَى الْمُلْكَ بِيَمِينِهِ، وَالْخُلْدَ بِشِمَالِهِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ، وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَيْنِ لاَ يَقُوَّمُ لَهُمَا الدُّنْيَا، فَيَقُولاَنِ: بِمَ كُسِينَا هَذَا؟ فَيُقَالُ لَهُمَا: بِأَخْذِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَاصْعَدْ فِي دَرَجِ الْجَنَّةِ وَغُرَفِهَا، فَهُوَ فِي صُعُودٍ مَا دَامَ يَقْرَأُ هَذًّا كَانَ أَوْ تَرْتِيلاً».[3]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من دانیشتبووم لەلای پێغەمبەر ﷺو گوێم لێی بوو دەیفەرموو: خۆتان فێری سورەتی بەقەرە بکەن، چونکە

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده رجاله ثقات.

(٣) ـ إسناده حسن.

دەست پێوەگرتنی بەرەكەتە و واز لێهێنانی حەسرەت و پەشمانیە و، ساحیرەكان توانایان بەسەردا ناشكێ، جا دواتر ماوەیەك بێ دەنگ بوو، دواتر فەرمووی: خۆتان فێری سورەتی بەقەرە و ئالی عیمران بكەن، چونكە ئەم دوانە ڕووناككەرەوەكانن و، هەردووكیان سێبەر لە خاوەنەكانیان دەكەن لە ڕۆژی دواییدا وەك دوو هەور، یان دوو چەتر، یان دوو پۆل باڵندەی باڵ كراوە وان (سێبەریان دێت بەسەر خاوەنەكانیان)، وە قورئان وەك پیاوێكی ڕەنگ پەڕیو دەگات بە خاوەنەكەی لە ڕۆژی دواییدا كاتێ گۆڕەكەی لەسەر شەق دەبێت و پێی دەڵێت: ئایا دەمناسی؟ خاوەنەكەشی دەڵێت: ناتناسم، پیاوە ڕەنگ پەڕیوەكە دەڵێت: من هاوڕێكەتم، ئەو قورئانەم كە تونێووم دەكردی لەكاتی گەرما و، شەونخونیم پێ دەكردی بە شەوەكانت، جا هەموو بازرگانێك بەدوای بازرگانیەكەیەوەیە، تۆش ئەمڕۆ بەدوای گشت بازرگانیەكەوەی، جا موڵك و سەروەت دەدرێتە دەستی ڕاستی و، ژیانی هەتاهەتاییشی دەدرێتە دەستی چەپی و، تاجی ڕێزیشی دەخرێتە سەر و، دایك و باوكیشی پۆشتە دەكرێن بە دوو تاخمە جل كە بە دونیا نا نرخێنرێن و (بەراورد ناكرێن بە هەموو دونیا)، دایك و باوكی دەڵێن: بەهۆی چ شتێك پۆشتە كراین بەوە؟! پێیان دەوترێت: بە دەستگرتنی منداڵەكەتان بە قورئانەوە، دواتر بە خاوەنی قورئانەكە دەوترێت: بخوێنە و بەرزبەرەوە بە پلەكانی بەهەشت و كۆشكەكانی، جا هەر لە بەرزبوونەوە دایە مادەم قورئانەكە بخوێنێت بە خێرایی بێت، یان بە هێواشی.

٣٤٤٤ - «عَنْ أَبِي يَحْيَى سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا أُمَامَةَ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّ أَخًا لَكُمْ أُرِيَ فِي الْمَنَامِ أَنَّ النَّاسَ يَسْلُكُونَ فِي صَدْعِ جَبَلٍ وَعْرٍ طَوِيلٍ، وَعَلَى رَأْسِ الْجَبَلِ شَجَرَتَانِ خَضْرَاوَانِ تَهْتِفَانِ: هَلْ فِيكُمْ مَنْ يَقْرَأُ سُورَةَ الْبَقَرَةِ؟ هَلْ فِيكُمْ مَنْ يَقْرَأُ سُورَةَ آلِ عِمْرَانَ؟ فَإِذَا قَالَ الرَّجُلُ: نَعم، دَنَتَا بِأَعْذَاقِهِمَا حَتَّى يَتَعَلَّقَ بِهِمَا، فَتَخْطِرَانِ بِهِ الْجَبَلَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: الأَعْذَاقُ: الأَغْصَانُ».(١)

واتە: لە ئەبو یەحیا، سولەیمی كوڕی عامیرەوە گێڕدراوەتەوە كە گوێی لە ئەبو ئومامە ﷺ بووە كە دەیووت: برایەكی ئێوە لە خەوندا پێی نیشان دراوە خەڵك دەڕۆیشتن لە درزی شاخێكی سەختی دووردرێژ و، لە سەری شاخەكەش دوو درەختی سەوز هەبوون هاواریان دەكرد: ئایا كەسێك لەناوتاندا هەیە سورەتی بەقەرە بخوێنێت؟ ئایا كەسێك لەناوتاندا هەیە سورەتی ئالی عیمران بخوێنێت؟ جا لەو كاتەدا پیاوەكە وتی: بەڵێ، جا دوو درەختەكە بە ڕەگەكانیان نزیك بوونەوە تاوەكو كەسەكە خۆی پێوە هەڵواسین و لە شاخەكە پەڕاندیانەوە.

٣٤٤٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قرأ رَجُلٌ عِنْدَ عَبْدِ اللهِ الْبَقَرَةَ، وَآلَ عِمْرَانَ. فَقَالَ: قَرَأْتَ سُورَتَيْنِ فِيهِمَا اسْمُ اللهِ الأَعْظَمُ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى».(٢)

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك لەلای عەبدوڵلا سورەتی بەقەرە و ئالی عیمرانی خوێند، عەبدوڵلا وتی: دوو سورەتت خوێندن كە ئیسمی ئەعزەمیان تیایە (واتە: ناوە گەورەكەی خوای

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

تیایە)، ئەو ناوەی کە ئەگەر پێی بانگ بکرێت وەڵام دەداتەوە، وە ئەگەر پێی داوا بکرێت ئەوە دەبەخشێت.

٣٤٤٦ - «عَنْ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ الْبَقَرَةَ، وَآلَ عِمْرَانَ، جَاءَتَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَقُولَانِ: رَبَّنَا لاَ سَبِيلَ عَلَيْهِ».(١)

واتە: لە کەعبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک سورەتی بەقەرە و ئالی عیمران بخوێنێت، ئەوە هەردووکیان لە ڕۆژی دواییدا دێن دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان هیچ ڕێگایەک نیە (بۆ سزادانی).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سوورەتی ئالی عیمران

٣٤٤٧ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: مَنْ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ، فَهُوَ غَنِيٌّ وَالنِّسَاءُ مُحَبِّرَةٌ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: مُحَبِّرَةٌ: مُزَيِّنَةٌ».(٢)

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ وتویەتی: هەر کەسێک سورەتی ئالی عیمران بخوێنێت، ئەوە دەوڵەمەندە، سورەتی نیسائیش ڕازێنەرەوەیە.

٣٤٤٨ - «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ آخِرَ آلِ عِمْرَانَ فِي لَيْلَةٍ، كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ».(٣)

واتە: لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک کۆتایی سورەتی ئالی عیمران بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە شەونوێژی شەوێکی بۆ دەنوسرێت.

٣٤٤٩ - «عَنْ مَكْحُولٍ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ آلِ عِمْرَانَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ إِلَى اللَّيْلِ».(٤)

واتە: لە مەکحولەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک سورەتی ئالی عیمران بخوێنێت لە ڕۆژی هەینیدا، ئەوە فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو شەو.

٣٤٥٠ - «قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: نِعْمَ كَنْزُ الصُّعْلُوكِ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ يَقُومُ بِهَا فِي آخِرِ اللَّيْلِ».(٥)

واتە: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: چاکترین خەزێنەی کەسی هەژار سورەتی ئالی عیمرانە، کە شەونوێژی پێ بکات لە کۆتایی شەودا.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على مكحول.

(٥) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على عبد الله.

٣٤٥١ - «عَنْ أَبِي السَّلِيلِ، قَالَ: أَصَابَ رَجُلٌ دَمًا، قَالَ: فَأَوَى إِلَى وَادِي مَجَنَّةٍ: وَادٍ لاَ يَمْشِي فِيهِ أَحَدٌ إِلاَّ أَصَابَتْهُ جِنَّةٌ، وَعَلَى شَفِيرِ الْوَادِي رَاهِبَانِ، فَلَمَّا أَمْسَى قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: هَلَكَ وَاللهِ الرَّجُلُ، قَالَ: فَافْتَتَحَ سُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، قَالاَ: فَقَرَأَ سُورَةً طَيِّبَةً لَعَلَّهُ سَيَنْجُو ، قَالَ: فَأَصْبَحَ سَلِيمًا».[١]

واتە: لە ئەبو سەلیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک خوێنی کەوتە سەر (بەهۆی کوشتنی کەسێکەوە)، دەڵێ: جا پەنای بردە بەر دۆڵی مەجەنە، دۆڵێکە هیچ کەسێک نیە پێیدا تێپەڕ ببێت حەتمەن توشی شێت بوون دەبێت، جا لە سەرەتای دۆڵەکە دوو ڕاهیب هەن، جا کاتێ ئێوارە داهات یەکێک لە ڕاهیبەکان بەوەی تری وت: ئەو پیاوە لەناوچوو سوێند بەخوا، دەڵێ: (جا پیاوەکە) سوورەتی ئالی عیمرانی کردەوە و (خوێندی)، دوو ڕاهیبەکە وتیان: سوڕەتێکی چاکی خوێند بەڵکو ڕزگاری ببێت (ئێستا ئومێد هەیە)، دەڵێ: جا پیاوەکە بەیانی کردەوە بە سەلامەتی.

## بابەت: گەورەییەکانی سوڕەتی ئەنعام و چەند سوڕەتێکی تر

٣٤٥٢ - «قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: السَّبْعُ الطُّوَلُ مِثْلُ التَّوْرَاةِ، وَالْمِئِينَ مِثْلُ الإِنْجِيلِ، وَالْمَثَانِي مِثْلُ الزَّبُورِ، وَسَائِرُ الْقُرْآنِ بَعْدُ فَضْلٌ».[٢]

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: حەوت سورەتە درێژەکان (واتە: البقرة وآل عمران والنساء والمائدة والأنعام والأعراف والتوبة) وەک تەوڕات وان (واتە: شوێنی تەوڕات دەگرنەوە)، وە ئەو سوڕەتانەی کە لە سەد ئایەت زیاترن وەک ئینجیل وان (شوێنی ئینجیل دەگرنەوە)، وە ئەو سوڕەتانەی دوای ئەوان دێن لە ڕووی ئایەت کورتی وەک زەبوڕ وان (شوێنی زەبوڕ دەگرنەوە)، وە ئەوەیتری کە دەمێنێتەوە لە سوڕەتەکانی قوڕئان ئەوە زیادەیە (بەسەر ئەم پەرتوکانە، کەواتە: قوڕئان لە هەموویان زیاتر و گاریگەرتر و کامڵترە).

٣٤٥٣ - «عَنْ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: الأَنْعَامُ مِنْ نَوَاجِبِ الْقُرْآنِ».[٣]

واتە: لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوڕەتی ئەنعام یەکێکە لە گەورە و هەڵبژێردراوان و بە نرخانی قوڕئان.

٣٤٥٤ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَبَاحٍ ، قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبًا ﷺ، قَالَ: فَاتِحَةُ التَّوْرَاةِ الأَنْعَامُ، وَخَاتِمَتُهَا هُودٌ».[٤]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە کەعب ﷺ بوو وتی: سەرەتای تەوڕات سوڕەتی ئەنعامە، کۆتاییەکەشی سوڕەتی هودە (واتە: ئەم سوڕەتانە دەتوانن شوێنی تەوڕات بگرنەوە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند حسن على عمر.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على كعب.

٣٤٥٥ - «عَنْ كَعْبٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: اقْرَءُوا سُورَةَ هُودٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ».(١)

واتە: لە کەعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سورەتی هود بخوێنن لە ڕۆژی هەینیدا.

٣٤٥٦ - «عَنْ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْرَءُوا سُورَةَ هُودٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ».(٢)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە کەعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سورەتی هود بخوێنن لە ڕۆژی هەینیدا.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سورەتی کەهف

٣٤٥٧ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنَ الْكَهْفِ، لَمْ يَخَفِ الدَّجَّالَ».(٣)

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک دە ئایەت لە سورەتی کەهف بخوێنێت، ئەوە لە دەججال ناترسێت.

٣٤٥٨ - «عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ آخِرَ سُورَةِ الْكَهْفِ لِسَاعَةٍ يُرِيدُ يَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ، قَامَهَا، قَالَ عَبْدَةُ: فَجَرَّبْنَاهُ فَوَجَدْنَاهُ كَذَلِكَ».(٤)

واتە: لە زیری کوڕی حوبەیشەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک کۆتایی سورەتی کەهف بخوێنێت، بیەوێت لە (کاتێک لە کاتەکانی) شەو هەڵسێت و خەبەری ببێتەوە، ئەوە خەبەری دەبێتەوە (لەو کاتەی دەیەوێ).

عەبدە وتویەتی: جا ئێمە تاقیمان کردەوە بەم شێوەیە دەرچوو (کەواتە: کۆتایی سورەتی کەهف وەک جەرەس و خەبەرکەرەوە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت زۆر لە زانایان کاریان پێ کردوە).

٣٤٥٩ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ».(٥)

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک سورەتی کەهف بخوێنێت لە شەوی هەینیدا، ئەوە خوا بە نور نێوانی ئەو و نێوانی کەعبە ڕووناک دەکاتەوە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف لإرساله.
(٢) ـ إسناده ضعيف لإرساله.
(٣) ـ إسناده ضعيف، لكنه موقوف صحيح لغيره.
(٤) ـ إسناده ضعيف.
(٥) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على أبي سعيد.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سورەتی سەجدە و سورەتی تەبارەكە (مولک)

٣٤٦٠ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، قَالَ: اقْرَءُوا الْمُنَجِّيَةَ، وَهِيَ الم تَنْزِيلُ فَإِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَقْرَؤُهَا مَا يَقْرَأُ شَيْئًا غَيْرَهَا، وَكَانَ كَثِيرَ الْخَطَايَا، فَنَشَرَتْ جَنَاحَهَا عَلَيْهِ وَقَالَتْ: رَبِّ اغْفِرْ لَهُ فَإِنَّهُ كَانَ يُكْثِرُ قِرَاءَتِي، فَشَفَّعَهَا الرَّبُّ فِيهِ، وَقَالَ: اكْتُبُوا لَهُ بِكُلِّ خَطِيئَةٍ حَسَنَةً، وَارْفَعُوا لَهُ دَرَجَةً».(١)

واتە: لە خالیدی كوڕی مەعدانەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ڕزگاركەرەكە بخوێنن، كە سورەتی سەجدەیە، من پێم گەیشتووە كە پیاوێک ئەوەی دەخوێند و هیچ شتێكی تری نەدەخوێند، زۆر تاوانباریش بوو، جا سورەتی سەجدە باڵەكانی خستە سەری و وتی: پەروەردگارا لێی خۆشبە، چونكە ئەوە زۆر منی دەخوێند، جا خوا تكاكاریەكەی لە سورەتی سەجدە قبوڵ كرد بۆ پیاوەكە و فەرمووی: بە هەر تاوانێک چاكەیەكی بۆ بنوسن و پلەیەكیشی بۆ بەرز بكەنەوە.

٣٤٦١ - «عَنْ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ، وَتَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كُتِبَ لَهُ سَبْعُونَ حَسَنَةً، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا سَبْعُونَ سَيِّئَةً، وَرُفِعَ لَهُ بِهَا سَبْعُونَ دَرَجَةً».(٢)

واتە: لە كەعبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک سورەتی سەجدە و تەبارەكە بخوێنێت، ئەوە حەفتا چاكەی بۆ دەنوسرێت و، حەفتا خراپەشی لەسەر دەسڕدرێتەوە و، حەفتا پلەش بەهۆیەوە بەرز دەكرێتەوە.

٣٤٦٢ - «أَنَّ خَالِدَ بْنَ مَعْدَانَ، قَالَ: إِنَّ الم تَنْزِيلُ الْكِتَابِ لاَ رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ تُجَادِلُ عَنْ صَاحِبِهَا فِي الْقَبْرِ تَقُولُ: اللهُمَّ إِنْ كُنْتُ مِنْ كِتَابِكَ، فَشَفِّعْنِي فِيهِ، وَإِنْ لَمْ أَكُنْ مِنْ كِتَابِكَ، فَامْحُنِي عَنْهُ، وَإِنَّهَا تَكُونُ كَالطَّيْرِ تَجْعَلُ جَنَاحَهَا عَلَيْهِ، فَيُشْفَعُ لَهُ، فَتَمْنَعُهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِي تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، مِثْلَهُ، فَكَانَ خَالِدٌ لاَ يَبِيتُ حَتَّى يَقْرَأَ بِهِمَا».(٣)

واتە: لە خالیدی كوڕی مەعدانەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: سورەتی سەجدە مناقەشە و بەرگری دەكات لە خاوەنەكەی لە گۆڕدا، دەڵێت: خوایە ئەگەر من لە پەرتوكەكەتم و بەشێكم لێی ئەوە تكاكەم وەرگرە دەربارەی (خاوەنەكەم كە خوێندومی)، وە ئەگەر لە پەرتوكەكەتدا نیم و بەشێک نیم لێی، ئەوە لە پەرتوكەكەت بمسڕەوە، جا وەكو باڵندە باڵەكانی (دەكاتەوە) و دایدەنێت لەسەر كەسەكە و تكاكەی قبوڵ دەكرێت بۆ كەسەكە و ڕێگری لێ دەكات لە سزای ناو گۆڕ، وە دەربارەی سورەتی مولكیش هەمان شتە، جا خالید نەدەخەوت تاوەكو هەردووكی نەخوێندبان.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على كعب.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٣٤٦٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الم وَتَبَارَكَ».[١]

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت تاوەكو سوڕەتی سەجدە و سوڕەتی تەباڕەكەی دەخوێند.

٣٤٦٤ - «عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: فُضِّلَتَا عَلَى كُلِّ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ بِسِتِّينَ حَسَنَةً».[٢]

واتە: لە طاوسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (سوڕەتی سەجدە و مولك) گەورەیی زیاتریان بەسەر گشت سوڕەتەكانی تری قوڕئان پێ بەخشراوە بە شەست چاكە.

٣٤٦٥ - «حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ مُرَّةَ، يَقُولُ: أُتِيَ رَجُلٌ فِي قَبْرِهِ، فَأُتِيَ من جَانِبُ قَبْرِهِ، فَجَعَلَتْ سُورَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ ثَلاَثُونَ آيَةً تُجَادِلُ عَنْهُ، حَتَّى قَالَ: فَنَظَرْنَا أَنَا وَمَسْرُوقٌ فَلَمْ نَجِدْ فِي الْقُرْآنِ سُورَةً ثَلاَثِينَ آيَةً إِلاَّ تَبَارَكَ».[٣]

واتە: لە عەمری كوڕی موڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە موڕەبوو دەیووت: پیاوێک هێنرا بۆ گۆڕەكەی و لە لایەكی گۆڕەكە بۆی هاتن (واتە: فریشتە بۆی هات)، جا سوڕەتێک لە قوڕئان كە سی ئایەتە كێشمەكێشمی لەسەر دەكرد و (بەرگری لێ دەكرد)، موڕڕە دەڵێ: من و مەسروق سەیری قوڕئانمان كرد و هیچ سوڕەتێكمان لە قوڕئان نەدۆزیەوە سی ئایەت بێت، جگە لە سوڕەتی تەباڕەكە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سوڕەتی تاها و یاسین

٣٤٦٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَرَأَ طه وَ يس قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِأَلْفِ عَامٍ، فَلَمَّا سَمِعَتِ الْمَلاَئِكَةُ الْقُرْآنَ، قَالَتْ: طُوبَى لأُمَّةٍ يَنْزِلُ هَذَا عَلَيْهَا، وَطُوبَى لأَجْوَافٍ تَحْمِلُ هَذَا، وَطُوبَى لأَلْسِنَةٍ تَتَكَلَّمُ بِهَذَا».[٤]

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا تبارك وتعالى خۆی سوڕەتی تاها و یاسینی خوێندووە هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەكان و زەوی دروست بكات، جا كاتێ فریشتەكان گوێیان لە قوڕئان بوو وتیان: خۆشبەختی بۆ ئوممەت و گەلێک ئەمەی بەسەر دادەبەزێت، وە خۆشبەختی بۆ ناخانێک كە ئەوە هەڵدەگرن (لە سینگ و دڵیان)، وە خۆشبەختی بۆ زمانانێک كە قسە بەوە بكەن و (ئەم قوڕئانەیان لە دەم دەردەچێ).

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند ضعيف على طاوس.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على مرة.

(٤) ـ إسناده ضعيف جداً.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی یاسین

٣٤٦٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ يس فِي لَيْلَةٍ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ أَوْ مَرْضَاةِ اللهِ، غُفِرَ لَهُ، وَقَالَ: بَلَغَنِي أَنَّهَا تَعْدِلُ الْقُرْآنَ كُلَّهُ».[١]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک یاسین بخوێنێت لە شەوێکدا لە پێناوی خوا یان لە پێناوی ڕەزامەندی خوا، ئەوە لێی دەبوردرێت.

(حەسەن) وتویەتی: پێم گەیشتووە کە سورەتی یاسین بەقەد هەموو قورئانە (لە ڕووی پاداشتەوە).

٣٤٦٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ قَلْبًا، وَإِنَّ قَلْبَ الْقُرْآنِ يس، مَنْ قَرَأَهَا، فَكَأَنَّمَا قَرَأَ الْقُرْآنَ عَشْرَ مَرَّاتٍ».[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو شتێک دڵێکی هەیە، دڵی قورئانیش سورەتی یاسینە، هەر کەسێک بیخوێنێت ئەوە وەک ئەوە وایە کە دە جار قورئانی خوێندبێت.

٣٤٦٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَرَأَ يس فِي لَيْلَةٍ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ، غُفِرَ لَهُ فِي تِلْكَ اللَّيْلَةِ».[٣]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سورەتی یاسین بخوێنێت لە شەوێکدا و مەبەستی خوا بێت، ئەوە لێی دەبوردرێت لەم شەوەدا.

٣٤٧٠ - «عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ يس فِي صَدْرِ النَّهَارِ، قُضِيَتْ حَوَائِجُهُ».[٤]

واتە: لە عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێم گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سورەتی یاسین بخوێنێت لە سەرەتای ڕۆژدا ئەوە کاروبار و پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ دەکرێن.

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند ضعيف على الحسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث موضوع.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده مرسل بسند ضعيف.

٣٤٧١ - «عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: مَنْ قَرَأَ يس حِينَ يُصْبِحُ، أُعْطِيَ يُسْرَ يَوْمِهِ حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَرَأَهَا فِي صَدْرِ لَيْلِهِ، أُعْطِيَ يُسْرَ لَيْلَتِهِ حَتَّى يُصْبِحَ».(١)

واتە: لە شەهری کوڕی حەوشەبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) وتویەتی: هەر کەسێک سوڕەتی یاسین بخوێنێت کاتێ بەیانی دەکاتەوە، ئەوە ئاسانی ئەو ڕۆژەی پێ دەبەخشرێ (هەموو شتێکی ئەو ڕۆژەی بۆ ئاسان دەبێت) تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە، وە هەر کەسێکیش لە سەرەتای شەوەکەیدا بیخوێنێت، ئەوە ئاسانی شەوەکەی پێ دەبەخشرێت تاوەکو بەیانی دەکاتەوە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سوڕەتی دوخان و، حامیمەکان و موسەببیحەکان(٢)

٣٤٧٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِيسَى، قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ مَنْ قَرَأَ حم الدُّخَانَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِيمَانًا وَتَصْدِيقًا بِهَا، أَصْبَحَ مَغْفُورًا لَهُ».(٣)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عیساوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەواڵم پێدراوە بەوەی هەر کەسێک سوڕەتی دوخان بخوێنێت لە شەوی هەینیدا بە بڕوا پێ هەبوون و بە بەڕاستدانانی، ئەوە بۆتە کەسێکی لێبوردراو (لە تاوانەکانی).

٣٤٧٣ - «عَنْ أَبِي رَافِعٍ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ حم فِي لَيْلَةِ الْجُمُعَةِ، أَصْبَحَ مَغْفُورًا لَهُ، وَزُوِّجَ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ».(٤)

واتە: لە ئەبو ڕافیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک (حم) بخوێنێت لە شەوی هەینیدا، ئەوە بۆتە لێبوردراو، وە حۆری لێ مارەکراوە.

٣٤٧٤ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كُنَّ الْحَوَامِيمُ يُسَمَّيْنَ الْعَرَائِسَ».(٥)

واتە: لە سەعدی کوڕی ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حامیمەکان (واتە: ئەو سوڕەتانەی بە «حم» دەست پێ دەکەن) ناونرابوون بە بوکەکان (واتە: هەندە جێگای ئەوەیە مرۆڤ دڵی پێ خۆشبن، بەهۆی ئەو پاداشتە زۆرەی تیایاندایە).

٣٤٧٥ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ ثَلاَثَ آيَاتٍ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْحَشْرِ إِذَا أَصْبَحَ فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ ذَلِكَ، طُبِعَ بِطَابَعِ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ قَرَأَ إِذَا أَمْسَى فَمَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ، طُبِعَ بِطَابَعِ الشُّهَدَاءِ».(٦)

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند حسن على ابن عباس.

(٢) ـ واتە: ئەو سوڕەتانەی بە «حم» یان بە «سبح» و «یسبح» دەست پێ دەکەن.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على عبد الله بن عيسى.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على أبي رافع.

(٥) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على سعد بن إبراهيم.

(٦) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على الحسن.

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک سێ ئایەت بخوێنێت لە کۆتایی سورەتی حەشردا کاتێ کە بەیانی کردەوە، جا لەو ڕۆژەیدا مرد، ئەوە مۆر دەکرێت بە مۆری شەهیدان، وە ئەگەر خوێندی کاتێ ئێوارەی کردەوە و لە شەوەکەیدا وەفاتی کرد، ئەوە مۆر دەکرێت بە مۆری شەهیدان.

٣٤٧٦ - «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ الْمُسَبِّحَاتِ عِنْدَ النَّوْمِ وَيَقُولُ: إِنَّ فِيهِنَّ آيَةً تَعْدِلُ أَلْفَ آيَةٍ».[١]

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە هەموو جار لە کاتی خەوتن ئەو سوڕەتانەی دەخوێند کە بە (سبح) و (یسبح) دەست پێ دەکەن، وە دەیفەرموو: ئەمانە ئایەتێکیان تیایە بە هەزار ئایەت هەیە (پاداشتەکەی).

٣٤٧٧ - «عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، وَثَلَاثَ آيَاتٍ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْحَشْرِ، وَكَّلَ اللهُ بِهِ سَبْعِينَ أَلْفَ مَلَكٍ يُصَلُّونَ عَلَيْهِ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ قَالَهَا مَسَاءً فَمِثْلُ ذَلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ».[٢]

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک کاتێ بەیانی دەکاتەوە بڵێت: (أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) واتە: (پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی نەفرین لێکراو) سێ جار، وە سێ ئایەت لە کۆتایی سوورەتی حەشر بخوێنێت، ئەوە خوا حەفتا هەزار فریشتە ڕادەسپێرێت دووعای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو ئێوارە، وە ئەگەر لە ئێوارەدا بیانخوێنێت ئەوە هەمان شتە تا بەیانی دەکاتەوە (واتە: بە هەمان شێوە حەفتا هەزار فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سوڕەتی (قل یأیها الکافرون)

٣٤٧٨ - «عَنْ أَبِي الْحَسَنِ مُهَاجِرٍ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ، زَمَنَ زِيَادٍ إِلَى الْكُوفَةِ فَسَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ لَهُ قَالَ: وَرُكْبَتِي تُصِيبُ - أَوْ تَمَسُّ - رُكْبَتَهُ، فَسَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ قَالَ: بَرِئَ مِنَ الشِّرْكِ وَسَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ، قَالَ: غُفِرَ لَهُ».[٣]

واتە: لە ئەبو حەسەنی موهاجیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ کوفە لە سەردەمی زیاد، جا گوێم لێی بوو دەیگێڕایەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە لە ڕێگایێکدا، دەڵێ: لە کاتێکدا ئەژنۆم بەر ئەژنۆی دەکەوت جا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو «قل یاأیها الکافرون»ی دەخوێند فەرمووی: ئەوە لە شیرک و هاوبەش دانان بەری بوو، وە گوێی لە پیاوێکی تر بوو «قل یاأیها الکافرون»ی دەخوێند فەرمووی: ئەوە لێی بوردرا (خوا لێی خۆش بوو).

---

(١) ـ إسناده مرسل بسند صحيح وقد وصله الترمذي و أبوداود، والحديث حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٤٧٩- «عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَجِيءٌ مَا جَاءَ بِكَ، قَالَ: جِئْتُ لِتُعَلِّمَنِي شَيْئًا أَقُولُهُ عِنْدَ مَنَامِي، قَالَ: فَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ، فَاقْرَأْ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ».[1]

واتە: لە فەروەی كوڕی نەوفەلەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاتووی؟ چی تۆی هێناوە؟ وتی: هاتووم تاوەكو شتێكم فێر بكەیت لەكاتی خەوتنمدا بیڵێم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كاتێ چویتە سەر جێگاكەت سوڕەتی «قل یاأیها الكافرون» بخوێنە، دواتر بخەوە دوای تەواو خوێندنی، چونكە بەرائەتە لە هاوبەش دانان.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی سوڕەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص

٣٤٨٠ - «عَنْ نَوْفٍ الْبِكَالِيِّ، قَالَ: إِنَّ اللهَ جَزَّأَ الْقُرْآنَ عَلَى ثَلاَثَةِ أَجْزَاءٍ، فَجَعَلَ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، ثُلُثَ الْقُرْآنِ». [2]

واتە: لە نەوفی بیكالیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: خوا قوڕئانی دابەش كردوە بەسەر سێ بەش، جا «قل هو الله أحد»ی كردۆتە سێیەكی قوڕئان (واتە: یەک لەسەر سێ).

٣٤٨١ - «أَخْبَرَنِي أَبُو عَقِيلٍ، أَنَّهُ: سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، يَقُولُ: إِنَّ نَبِيَّ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ عَشْرَ مَرَّاتٍ، بُنِيَ لَهُ بِهَا قَصْرٌ فِي الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَرَأَهاَ عِشْرِينَ مَرَّةً، بُنِيَ لَهُ بِهَا قَصْرَانِ فِي الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَرَأَهَا ثَلاَثِينَ مَرَّةً، بُنِيَ لَهُ بِهَا ثَلاَثَةُ قُصُورٍ فِي الْجَنَّةِ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ إِذَنْ لَتَكْثُرَنَّ قُصُورُنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اللهُ أَوْسَعُ مِنْ ذَلِكَ».[3]

واتە: لە ئەبو عەقیلەوە گێردراوەتەوە، كە گوێی لە سەعیدی كوڕی موسەییب بوو دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک دە جار سوڕەتی «قل هو الله أحد» بخوێنێت، كۆشكێكی لەبەهەشت بۆ دروست دەكرێت، وە هەر كەسێک بیست جار بیخوێنێت، دوو كۆشكی بۆ لە بەهەشت دروست دەكرێت، وە هەر كەسێک سێ جار بیخوێنێت، سێ كۆشكی لە بەهەشت بۆ دروست دەكرێت، جا عومەری كوڕی خەتتاب وتی: كەواتە: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كۆشكەكانمان زۆر دەبن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (موڵكی) خوا لەوە فراوانترە (هەر چەندی زۆری بكەن هەر كەمە).

٣٤٨٢ - «عَنْ عُتْبَةَ بْنِ ضَمْرَةَ بْنِ حَبِيبٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَرَأَ سُورَةً فَخَتَمَهَا، أَتْبَعَهَا بِقُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ».[4]

---

(١) ـ إسناده صحيح.
(٢) ـ إسناده ضعيف.
(٣) ـ إسناده ضعيف لإرساله.
(٤) ـ إسناده موقوف بسنمد صحيح على خمير بن حبيب.

واتە: لە عوتبەی کوڕی ضەمرەی کوڕی حەبیبەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە هەموو جار کاتێ سوڕەتێکی تەواو دەکرد ڕاستەوخۆ لە دوای ئەو «قل هو الله أحد»ی دەخوێند.

٣٤٨٣ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالُوا: نَحْنُ أَعْجَزُ وَأَضْعَفُ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ جَزَّأَ الْقُرْآنَ ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ، فَجَعَلَ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».(١)

واتە: لە ئەبو دەرداوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا یەکێک لە ئێوە ناتوانێت لە شەوێکدا سێیەکی قوڕئان بخوێنێت؟ وتیان: ئێمە لەوە بێ تواناتر و لاوازترین (ناتوانین بەردەوام ئەوەندە بخوێنین)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا قوڕئانی دابەش کرد بەسەر سێ بەش و «قل هو الله أحد»ی کرد بە سێیەکی قوڕئان (کەواتە: شەوانە تەنها بە خوێندنی سوڕەتی ئیخلاص سێیەکی قوڕئانتان خوێندووە).

٣٤٨٤ - «أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».(٢)

واتە: ئەبو هوڕەیرە دەیووت: «قل هو الله أحد» بە قەد سێیەکی قوڕئانە.

٣٤٨٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».(٣)

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: «قل هو الله أحد» بە قەد سێیەکی قوڕئانە.

٣٤٨٦ - «حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، مِثْلَهُ».(٤)

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٣٤٨٧ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: وَاللهِ إِنِّي لَأُحِبُّ هَذِهِ السُّورَةَ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ الإخلاص، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: حُبُّكَ إِيَّاهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ».(٥)

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وتی: سوێند بە خوا من ئەم سوڕەتەم خۆشدەوێت: سوڕەتی «قل هو الله أحد»، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خۆشەویستیەکەت بۆ ئەم سوڕەتە دەتخاتە بەهەشتەوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده موقوف بسند ضعيف، لكن المرفوع صحيح عند الترمذي وابن ماجة.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند حسن.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند حسن.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٣٤٨٨ - «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أُمِّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ فَقَالَ: ثُلُثُ الْقُرْآنِ أَوْ تَعْدِلُهُ».[١]

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە دایکیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی سورەتی «قل هو الله أحد» و فەرموویەتی: سێیەکی قورئانە یان بە قەد سێیەکی قورئانە.

٣٤٨٩ - «عن عبد الرحمن بن أبي ليلى، عن امرأة من الأنصار، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، قَالَ: أَتَاهَا فَقَالَ: أَلاَ تَرَيْنَ إِلَى مَا جَاءَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَتْ: رُبَّ خَيْرٍ قَدْ أَتَانَا بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَمَا هُوَ؟ قَالَ: قَالَ لَنَا: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ فِي لَيْلَةٍ؟ قَالَ: فَأَشْفَقْنَا أَنْ يُرِيدَنَا عَلَى أَمْرٍ نَعْجِزُ عَنْهُ، فَلَمْ نَرْجِعْ إِلَيْهِ شَيْئًا حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: أَمَا يَسْتَطِيعُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾ الإخلاص».[٢]

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئافرەتێک لە ئەنصاریەکانی گێڕاوەتەوە، ئەویش لە ئەبو ئەیوبەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە هاتووە بۆ لای و وتویەتی: ئایا نازانی پێغەمبەری خوا ﷺ چی هێناوە، ئافرەتەکەش وتی: چاکەی زۆری تیایە ئەو شتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان دەهێنێت، شتەکە چیە؟ ئەبو ئەیوبیش وتی: (پێغەمبەری خوا) پێی فەرمووین: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە ناتوانن سێیەکی قورئان بخوێنن لە شەوێکدا؟ ئەبو ئەیوب دەڵێ: جا ئێمە ترساین شتێکمان بۆ زیاد بکات کە پێمان نەکرێت و تواناما بەسەردا نەشکێت، بۆیە هیچ وەڵاممان نەدایەوە تاوەکو سێ جار فەرمووی، دواتر فەرمووی: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە ناتوانێت:﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾ الإخلاص، بخوێنێت؟ (واتە: سورەتی ئیخلاص بخوێنن کە بە سێیەکی قورئان حیسابە).

٣٤٩٠ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَرَأَ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ خَمْسِينَ مَرَّةً، غَفَرَ اللهُ لَهُ ذُنُوبَ خَمْسِينَ سَنَةً».[٣]

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پەنجا جار سورەتی «قل هو الله أحد» بخوێنێت، ئەوە لە تاوانی پەنجا ساڵی دەبوردرێت.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی هەردوو سورەتی:
## ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴿١﴾﴾ الفلق، و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾﴾ الناس

٣٤٩١ - «حَدَّثَنِي أَبُو عِمْرَانَ، أَنَّهُ سَمِعَ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ: تَعَلَّقْتُ بِقَدَمِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَقْرِئْنِي سُورَةَ هُودٍ، وَسُورَةَ يُوسُفَ. فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا عُقْبَةُ إِنَّكَ لَنْ تَقْرَأَ مِنَ الْقُرْآنِ سُورَةً أَحَبَّ إِلَى اللهِ وَلاَ أَبْلَغَ عِنْدَهُ مِنْ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، قَالَ يَزِيدُ: فَلَمْ يَكُنْ أَبُو عِمْرَانَ يَدَعُهَا، كَانَ لاَ يَزَالُ يَقْرَؤُهَا فِي صَلاَةِ الْمَغْرِبِ».[١]

واتە: لە ئەبو عیمرانەوە گێردراوەتەوە، کە گوێی لە عوقبەی کوڕی عامیر بوو ﷺ دەیووت: وابەستەی شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم (واتە: لەدوای دەڕۆیشتم) و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سورەتی هود و سورەتی یوسفم فێر بکە، ئەویش فەرمووی: ئەی عوقبە تۆ لە قورئاندا هیچ سورەتێک ناخوێنیت خۆشەویست تر بێت لەلای خوا و زوو بگات بە خوای پەروەردگار لە سورەتی «قل أعوذ برب الفلق»، یەزید وتویەتی: ئەبو عیمران وازی لێ نەدەهێنا، بەردەوام دەیخوێند لە نوێژی مەغریبدا.

٣٤٩٢ - «أَنَّ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: مَشَيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِي: قُلْ يَا عُقْبَةُ، فَقُلْتُ: أَيَّ شَيْءٍ أَقُولُ؟ قَالَ: فَسَكَتَ عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: يَا عُقْبَةُ، قُلْ، فَقُلْتُ: أَيَّ شَيْءٍ أَقُولُ؟ قَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ» فَقَرَأْتُهَا حَتَّى جِئْتُ عَلَى آخِرِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: مَا سَأَلَ سَائِلٌ وَلاَ اسْتَعَاذَ مُسْتَعِيذٌ بِمِثْلِهَا».[٢]

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشتم و پێی وتم: ئەی عوقبە بڵێ، منیش وتم چ شتێک بڵێم؟ دەڵێ: لێم بێ دەنگ بوو، دواتر فەرمووی: ئەی عوقبە بڵێ، منیش وتم: چ شتێک بڵێم؟ فەرمووی: بڵێ"قل أعوذ برب الفلق"، منیش خوێندم تا گەیشتم بە کۆتاییەکەی، جا لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ داواکارێک نیە داوا بکات وە هیچ پەناگرێک نیە پەنا بگرێت بە هاوشێوەی ئەم سورەتە (واتە: چاکترین پەناگرتن و نزایە).

٣٤٩٣ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيَّ آيَاتٌ لَمْ أَرَ - «أَوْ لَمْ يُرَ - «مِثْلَهُنَّ» يَعْنِي: الْمُعَوِّذَتَيْنِ».[٣]

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی چەند ئایەتێکم بەسەر دابەزیوە هاوشێوەی ئەوانم نەدیوە ـ یان نەبینراوە ـ واتە: سورەتی فەلەق و ناس.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: گەورەیی ئەو كەسەی دە ئایەت دەخوێنێت

٣٤٩٤ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ فِي لَيْلَةٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ».(١)

واتە: لە تەمیمی داریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک دە ئایەت بخوێنێت لە شەوێكدا، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناكرێت.

٣٤٩٥ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: مَنْ قَرَأَ بِعَشْرِ آيَاتٍ فِي لَيْلَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُصَلِّينَ».(٢)

واتە: لە تەمیمی داری و فەضاڵەی كوڕی عوبەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویانە: هەر كەسێک دە ئایەت بخوێنێت لە شەوێكدا، ئەوە لە نوێژخوێنان تۆمار دەكرێت (واتە: بۆی بە شەونوێژ ئەژمار دەكرێت).

٣٤٩٦ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَنْ قَرَأَ بِعَشْرِ آيَاتٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ».(٣)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک دە ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناكرێت.

٣٤٩٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِعَشْرِ آيَاتٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ».(٤)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک لە شەوێكدا دە ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناكرێت.

## بابەت: ئەو كەسەی پەنجا ئایەت دەخوێنێت

٣٤٩٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِخَمْسِينَ آيَةً، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ».(٥)

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک لە شەوێكدا پەنجا ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناكرێت.

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف لإرساله.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٣٤٩٩ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: مَنْ قَرَأَ خَمْسِينَ آيَةً فِي لَيْلَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْحَافِظِينَ».[١]

واتە: لە تەمیمی داری و فەضاڵەی کوڕی عوبەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویانە: هەر کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە لە ئەزبەرکاران تۆمار دەکرێت.

## بابەت: ئەو کەسەی سەد ئایەت دەخوێنێت

٣٥٠٠ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ».[٢]

واتە: لە ئەبو دەرداوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە فەرموویەتی: هەر کەسێک سەد ئایەت بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناکرێت.

٣٥٠١ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِمِائَةِ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ».[٣]

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک لە شەوێکدا سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت.

٣٥٠٢ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ، كُتِبَ لَهُ قُنُوتُ لَيْلَةٍ».[٤]

واتە: لە تەمیمی داریەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سەد ئایەت بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە پاداشتی شەونوێژی شەوێکی بۆ دەنوسرێت.

٣٥٠٣ - «عَنْ أَبِي صَالِحٍ، قَالَ: قَالَ كَعْبٌ: مَنْ قَرَأَ مِائَةَ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ».[٥]

واتە: لە ئەبو صاڵحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەعب وتویەتی: هەر کەسێک سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە شەونوێژکاران دەنوسرێت.

٣٥٠٤ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: مَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ».[٦]

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە تەمیمی داری و فەضاڵەی کوڕی عوبەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویانە: هەر کەسێک سەد ئایەت بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت.

٣٥٠٥ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِمِائَةِ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ».(١)

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک لە شەوێکدا سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت.

٣٥٠٦- «عَنْ حَبِيبِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ ﷺ، يَقُولُ: مَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ».(٢)

واتە: لە حەبیبی کوڕی عوبەیدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو ئومامە بوو ﷺ دەیووت: هەر کەسێک سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناکرێت.

## بابەت: ئەو کەسەی دوو سەد ئایەت دەخوێنێت

٣٥٠٧ - «عَنْ حَبِيبِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ ﷺ، يَقُولُ مَنْ قَرَأَ مِائَتَيْ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ».(٣)

واتە: لە حەبیبی کوڕی عوبەیدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو ئومامە بوو ﷺ دەیووت: هەر کەسێک دوو سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت.

٣٥٠٨ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ مِائَتَيْ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ».(٤)

واتە: لە ئەبو دەردائەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو سەد ئایەت بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت.

٣٥٠٩ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ عَشْرَ آيَاتٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِمِائَةِ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِمِائَتَيْ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْفَائِزِينَ».(٥)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک لە شەوێکدا دە ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە بێ ئاگایان تۆمار ناکرێت، وە هەر کەسێکیش لە شەوێکدا سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت، وە هەر کەسێکیش دوو سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە سەرکەوتووان تۆمار دەکرێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده موقوف بند صحيح على أبي أمامة.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على أبي أمامة.

(٤) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: ئەو کەسەی لە سەد ئایەت تا هەزار ئایەت دەخوێنێت

٣٥١٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ عَشْرَ آيَاتٍ، كُتِبَ مِنَ الذَّاكِرِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِخَمْسِ مِائَةِ آيَةٍ إِلَى الأَلْفِ، أَصْبَحَ وَلَهُ قِنْطَارٌ مِنَ الأَجْرِ، قِيلَ: وَمَا الْقِنْطَارُ؟ قَالَ: مِلْءُ مَسْكِ الثَّوْرِ ذَهَبًا».[١]

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک لە شەوێکدا دە ئایەت بخوێنێت، ئەوە لەو کەسانە دەنوسرێت کە زۆر یادی خوا دەکەن، وە هەر کەسێکیش سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە لە شەونوێژکاران تۆمار دەکرێت، وە هەر کەسێکیش پێنج سەد ئایەت بخوێنێت تاوەکو هەزار ئایەت، ئەوە بەیانی دەکاتەوە لەکاتێکدا یەک قینتارِ پاداشتی بۆ نوسراوە، جا وترا: قینتارِ چیە؟ وتی: پڕ بە پێستەی مانگا زێڕ.

٣٥١١ - «عَنْ الْحَسَنِ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ مِائَةَ آيَةٍ، لَمْ يُحَاجُّهُ الْقُرْآنُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، وَمَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ مِائَتَيْ آيَةٍ، كُتِبَ لَهُ قُنُوتُ لَيْلَةٍ، وَمَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ خَمْسَ مِائَةِ آيَةٍ إِلَى الأَلْفِ، أَصْبَحَ وَلَهُ قِنْطَارٌ فِي الآخِرَةِ، قَالُوا: وَمَا الْقِنْطَارُ؟ قَالَ: اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە شەوێکدا سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە قورئان بەڵگەی بەسەر ئەم کەسەوە نامێنێت لەم شەوەدا (واتە: لە ڕۆژی دوایی شکاتی لێ ناکات و نابێتە حوجەت بەسەریەوە)، وە هەر کەسێکیش لە شەوێکدا دوو سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە شەونوێژی ئەو شەوەی بۆ دەنوسرێت، وە هەر کەسێکیش لە شەوێکدا پێنج سەد ئایەت بخوێنێت تا هەزار ئایەت، ئەوە بەیانی دەکاتەوە لە کاتێکدا یەک قینتارِ پاداشتی بۆ هەیە لە ڕۆژی دواییدا، جا وترا: قینتار چیە؟ وتی: دوازدە هەزار درهەمی زیوە.

٣٥١٢ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثَلاَثَ مِائَةِ آيَةٍ، كُتِبَ لَهُ قِنْطَارٌ، وَمَنْ قَرَأَ سَبْعَ مِائَةِ آيَةٍ لاَ أَدْرِي أَيَّ شَيْءٍ قَالَ فِيهَا أَبُو نُعَيْمٍ».[٣]

واتە: لە عەبدوڵڵاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک لە شەوێکدا سێ سەد ئایەت بخوێنێت، ئەوە یەک قینتارِ (پاداشتی) بۆ دەنوسرێت، وە هەر کەسێک حەفت سەد ئایەت بخوێنێت نازانم ئەبو نوعەیم چ شتێکی وت (زۆر زۆر بوو پاداشتەکەی کە وتی).

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف لإرساله.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: ئەو کەسەی هەزار ئایەت دەخوێنێت

٣٥١٣ - «عَنْ حَبِيبِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ ﷺ، يَقُولُ: مَنْ قَرَأَ أَلْفَ آيَةٍ، كُتِبَ لَهُ قِنطَارٌ مِنَ الأَجْرِ. وَالْقِيرَاطُ مِنْ ذَلِكَ الْقِنطَارِ لاَ تَفِي بِهِ دُنْيَاكُمْ - يَقُولُ: لاَ تَعْدِلُهُ دُنْيَاكُمْ».[١]

واتە: لە حەبیبی کوڕی عوبەیدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو ئومامە بوو ﷺ دەیووت: هەر کەسێک هەزار ئایەت بخوێنێت، ئەوە یەک قینتارِ پاداشتی بۆ هەیە، جا قیراتێک لەو قینتارە دونیا بەشی ناکات، دەیووت: دونیا بە قەد ئەو نیە (واتە: ئەگەر بە دونیا بنرخێندرێت دونیا ناگاتە نرخی ئەو).

٣٥١٤ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رَضِي اللهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: مَنْ قَرَأَ أَلْفَ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ كُتِبَ لَهُ قِنْطَارٌ، وَالْقِيرَاطُ مِنَ الْقِنْطَارِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَاكْتَسَبَ مِنَ الأَجْرِ مَا شَاءَ اللهُ».[٢]

واتە: لە تەمیمی داری و فەضاڵەی کوڕی عوبەیدەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویانە: هەر کەسێک هەزار ئایەت بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە قینتارێک پاداشتی بۆ هەیە، جا قیراتێک لەم قینتارە چاکترە لە دونیا و ئەوەی تیاشیەتی، وە ئەوەندەی خوا بیەوێت پاداشت بەدەست دەهێنێت.

٣٥١٥ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَرَأَ أَلْفَ آيَةٍ كُتِبَ لَهُ قِنطَارٌ مِنَ الأَجْرِ، الْقِيرَاطُ مِنْهُ مِثْلُ التَّلِّ الْعَظِيمِ».[٣]

واتە: لە ئەبو دەرداوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێراوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک هەزار ئایەت بخوێنێت، ئەوە قینتارێک پاداشتی بۆ هەیە، قیراتێک لەم قینتارە وەک تەپۆڵکە و چیایێکی مەزن وایە.

## بابەت: قینتارِ چەندە؟

٣٥١٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: الْقِنْطَارُ: اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا».[٤]

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ دوازدە هەزارە (واتە: دوازدە هەزار درهەمە).

٣٥١٧ - «عَنْ أَبِي نَضْرَةَ الْعَبْدِيِّ، قَالَ: الْقِنْطَارُ: مِلْءُ مَسْكِ ثَوْرٍ ذَهَبًا».[٥]

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٤) ـ إسناده حسن إلى أبي هريرة.

(٥) ـ إسناده صحيح ألى أبي نضرة.

واتە: لە ئەبو نەضرەی عەبدیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ (بە قەد) پڕ لە پێستەی مانگا زێڕە.

٣٥١٨ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، قَالَ: الْقِنْطَارُ أَرْبَعُونَ أَلْفًا». [١]

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ چل هەزار درهەمە.

٣٥١٩ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْقِنْطَارُ دِيَةُ أَحَدِكُمُ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا».[٢]

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ بریتیە لە خوێن و تۆڵەی کوژرانی یەکێک لە ئێوە، کە دوازدە هەزار درهەمە.

٣٥٢٠ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: الْقِنْطَارُ: سَبْعُونَ أَلْفَ دِينَارٍ».[٣]

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ حەفتا هەزار دیناری زێڕە.

٣٥٢١ - «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: الْقِنْطَارُ أَلْفُ أُوقِيَّةٍ وَمِائَتَا أُوقِيَّةٍ».[٤]

واتە: لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ هەزار و دوو سەد ئۆقیەیە.

٣٥٢٢ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: الْقِنْطَارُ سَبْعُونَ أَلْفَ مِثْقَالٍ».[٥]

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قینتارِ حەفتا هەزار میسقاڵە.

## بابەت: دەربارەی خەتم کردنی قوڕئان

٣٥٢٣ - «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، رَفَعَهُ قَالَ: مَنْ شَهِدَ الْقُرْآنَ حِينَ يُفْتَحُ، فَكَأَنَّمَا شَهِدَ فَتْحًا فِي سَبِيلِ اللهِ، وَمَنْ شَهِدَ خَتْمَهُ حِينَ يُخْتَمُ، فَكَأَنَّمَا شَهِدَ الْغَنَائِمَ حِينَ تُقْسَمُ».[٦]

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ئامادە بێت لەلای قوڕئان کاتێ دەست پێ دەکرێت (بۆ خەتم کردن)، وەک ئەوە وایە ئامادەی ئازادکردن و فەتح کردنی شوێنێک بێت لە پێناوی خوا، وە هەر کەسێکیش ئامادەی کۆتایی خەتمەکە بێت کاتێ خەتم دەکرێت، ئەوە وەک ئەوە وایە ئامادەی دەستکەوت بێت کاتێ کە دابەش دەکرێت (واتە: وەک دەستکەوت پاداشتی زۆر دڵخۆشکەری بۆ هەیە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف موقوف على سعيد بن المسيب.

(٢) ـ إسناده صحيح إلى الحسن.

(٣) ـ إسناده حسن إلى مجاهد.

(٤) ـ إسناده رجاله ثقات إلا أنه منقطع.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

٣٥٢٤ - «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ، وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَدْ وَضَعَ عَلَيْهِ الرَّصَدَ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ خَتْمِهِ، قَامَ فَتَحَوَّلَ إِلَيْهِ».(١)

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پیاوێک لە مزگەوتی مەدینە قورئانی دەخوێندەوە، جا ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) چاوی خستبووە سەری و چاودێری دەکرد تا بزانێ گەیشتۆتە کوێ، جا کاتێ ڕۆژی کۆتایی خەتمەکەی دادەهات هەڵدەستا و دەچوو بۆ لای.

٣٥٢٥ - «عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، إِذَا أَشْفَى عَلَى خَتْمِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ، بَقَّى مِنْهُ شَيْئًا حَتَّى يُصْبِحَ فَيَجْمَعَ أَهْلَهُ فَيَخْتِمَهُ مَعَهُمْ».(٢)

واتە: لە ثابیتی بەنانیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کاتێ بگەیشتایەتە سەر خەتمی قورئان بە شەو، ئەوە شتێکی لێ دەهێشتەوە (کۆتاییەکەی نەدەخوێند) تاوەکو بەیانی دادەهات و خانەوادەکەی کۆدەکردەوە و لەگەڵ ئەوان خەتمی دەکرد و کۆتایی پێ دەهێنا.

٣٥٢٦ - «حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، قَالَ: كَانَ أَنَسٌ ﷺ إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ، جَمَعَ وَلَدَهُ وَأَهْلَ بَيْتِهِ فَدَعَا لَهُمْ».(٣)

واتە: لە ثابیتەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کاتێ قورئانی خەتم دەکرد، منداڵەکانی و خێزانەکەی کۆدەکردەوە و دووعا و نزای بۆ دەکردن.

٣٥٢٧ - «عَنْ عَبْدَةَ، قَالَ: إِذَا خَتَمَ الرَّجُلُ الْقُرْآنَ بِنَهَارٍ، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ فَرَغَ مِنْهُ لَيْلاً، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُصْبِحَ».(٤)

واتە: لە عەبدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ کەسێک قورئان خەتم دەکات بە ڕۆژ، ئەوە فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە، وە ئەگەر لە شەودا لە خەتمەکەی تەواو بێت، ئەوە فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو بەیانی دەکاتەوە.

٣٥٢٨ - «عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ، قِيلَ: وَمَا الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ؟ قَالَ: صَاحِبُ الْقُرْآنِ يَضْرِبُ مِنْ أَوَّلِ الْقُرْآنِ إِلَى آخِرِهِ، وَمِنْ آخِرِهِ إِلَى أَوَّلِهِ، كُلَّمَا حَلَّ، ارْتَحَلَ».(٥)

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على أنس.

(٤) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على عبده بن أبي لبابة.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە زورارەی کوڕی ئەوفاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا: کام کردەوە چاکترینە؟ فەرمووی: (کردەوەی کەسی) «الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ»، وترا: «الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ» چیە؟ فەرمووی: خاوەنی قورئانە (قورئان خوێنە) کە لە یەکەمی قورئان تا کۆتایی دەخوێنێت، وە لە کۆتایی بۆ یەکەم دێتەوە، هەموو جارێک تەواو بێت دەست پێ دەکاتەوە (واتە: کە خەتمی کرد چەند ئایەتێکیتر لە سەرەتاکەی دەخوێنێتەوە و ختمێکی تر دەست پێ دەکات).

٣٥٢٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا قَرَأَ الرَّجُلُ الْقُرْآنَ نَهَارًا، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ قَرَأَهُ لَيْلاً، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُصْبِحَ، قَالَ سُلَيْمَانُ: فَرَأَيْتُ أَصْحَابَنَا يُعْجِبُهُمْ أَنْ يَخْتِمُوهُ أَوَّلَ النَّهَارِ، وَأَوَّلَ اللَّيْلِ».[١]

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ کەسێک بە ڕۆژ قورئانی خوێند، ئەوە فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو بەیانی دەکاتەوە، وە ئەگەر هاتوو بە شەو بیخوێنێت، ئەوە فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو بەیانی دەکاتەوە، سولەیمان وتویەتی: هاوەڵەکانی خۆمانمان (لە زانا و پیاوچاکان) بینی پێیان خۆش بوو قورئان خەتم بکەن لە سەرەتای ڕۆژو سەرەتای شەو (تاوەکو نزای فریشتەکان هەموو کاتەکەیان بگرێتەوە).

٣٥٣٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ مِثْلَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ لَيْسَ فِيهِ قَوْلُ سُلَيْمَانَ».[٢]

واتە: هەمان فەرموودە لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت قسەی سولەیمانی تیا نەبوو (لەم ڕێگایە).

٣٥٣١- «عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِهِ، كَانَتْ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا أَوْ فِي الآخِرَةِ».[٣]

واتە: لە موحاریبی کوڕی دیثارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک قورئان بخوێنێت بە لەبەر، ئەوە نزایەکی (قبوڵکراوی) بۆ هەیە لە دونیادا ـ یان لە دوارۆژدا ـ

٣٥٣٢ - «عَنْ طَلْحَةَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، قَالاَ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ إِلَى اللَّيْلِ، وَقَالَ الآخَرُ: غُفِرَ لَهُ».[٤]

واتە: لە تەڵحەو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: هەر کەسێک بە شەو یان بە ڕۆژ قورئان بخوێنێت، ئەوە فریشتە نزای ڕەحمەتی بۆ دەکەن تاوەکو شەو، وە ئەوەیتریان (واتە: عەبدوڕڕەحمان ئەوەشی زیاتر گێڕایەوە و) وتی: لێشی دەبوردرێت.

---

(١) ـ إسناده موقوف بسند صحيح على إبراهيم النخعي.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده حسن.

٣٥٣٣ - «عَنْ حُمَيْدٍ الأَعْرَجِ، قَالَ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ ثُمَّ دَعَا، أَمَّنَ عَلَى دُعَائِهِ أَرْبَعَةُ آلاَفِ مَلَكٍ».[(١)]

واتە: لە حومەیدی ئەعرەجەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک قورئان بخوێنێت، دواتر نزا و دووعا بکات، ئەوە چوار هەزار فریشتە ئامین دەکەن بۆ دووعاکەی.

٣٥٣٤ - «عَنْ الْحَكَمِ، قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ مُجَاهِدٌ قَالَ: إِنَّمَا دَعَوْنَاكَ أَنَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْتِمَ الْقُرْآنَ وَإِنَّهُ بَلَغَنَا أَنَّ الدُّعَاءَ يُسْتَجَابُ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ، قَالَ: فَدَعَوْا بِدَعَوَاتٍ».[(٢)]

واتە: لە حەکەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موجاهید ناردی بەدوامدا، جا (موجاهید) وتی: تەنها لەبەر ئەوە بەدواماندا ناردی ئێمە دەمانەوێت قورئان خەتم بکەین، وە پێمان گەیشتووە کە نزا و دووعا قبوڵ دەکرێت لەکاتی خەتمی قورئاندا، دەڵێ: جا چەندین دووعا و نزایان کرد.

٣٥٣٥ - «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا وَافَقَ خَتْمُ الْقُرْآنِ أَوَّلَ اللَّيْلِ، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُصْبِحَ، وَإِنْ وَافَقَ خَتْمُهُ آخِرَ اللَّيْلِ، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُمْسِيَ، فَرُبَّمَا بَقِيَ عَلَى أَحَدِنَا الشَّيْءُ فَيُؤَخِّرَهُ حَتَّى يُمْسِيَ أَوْ يُصْبِحَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: هَذَا حَسَنٌ، عَنْ سَعْدٍ».[(٣)]

واتە: لە سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ خەتمی قورئان دەکەوێتە سەرەتای شەو، ئەوە فریشتەکان نزای ڕەحمەت دەکەن (بۆ کەسەکە) تاوەکو بەیانی دەکاتەوە، وە ئەگەر هاتوو خەتمەکە کەوتە کۆتایی شەو، ئەوە فریشتەکان نزای ڕەحمەت دەکەن (بۆ کەسەکە) تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە، جا هەندێ جار بەشێک دەمێنێت و دوای دەخات تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە یان بەیانی دەکاتەوە.

٣٥٣٦ - «عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: حَمَلَةُ الْقُرْآنِ عُرَفَاءُ أَهْلِ الْجَنَّةِ».[(٤)]

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەڵگرانی قورئان (ئەوانەی قورئانیان لەبەرە، یان زۆر دەیخوێنن) ڕێ نیشاندەری خەڵکی بەهەشتن (دوای پلەی پێغەمبەران).

٣٥٣٧ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّهُ كَانَ يَخْتِمُ الْقُرْآنَ كُلَّ لَيْلَتَيْنِ».[(٥)]

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە کە هەموو دوو شەوێک قورئانی خەتم دەکرد.

٣٥٣٨ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ فِي كَمْ أَخْتِمُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: اخْتِمْهُ فِي شَهْرٍ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَا أُطِيقُ. قَالَ: اخْتِمْهُ فِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ، قَالَ: اخْتِمْهُ فِي عِشْرِينَ،

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح إلى سعيد.

قُلْتُ: إِنِّ أُطِيقُ. قَالَ: اخْتِمْهُ فِي خَمْسَ عَشْرَةَ قُلْتُ: إِنِّ أُطِيقُ. قَالَ: اخْتِمْهُ فِي عَشْرٍ، قُلْتُ: إِنِّ أُطِيقُ. قَالَ: اخْتِمْهُ فِي خَمْسٍ، قُلْتُ: إِنِّ أُطِيقُ. قَالَ: لاَ».[١]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ماوەی چەند قورئان خەتم بکەم؟ فەرمووی: بە مانگێک خەتمی بکە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەتوانم (بە کەمتر خەتمی بکەم و توانای زیاترم هەیە)، فەرمووی: لە بیست و پێنج ڕۆژ خەتمی بکە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەتوانم (بە کەمتر)، فەرمووی: لە بیست ڕۆژ خەتمی بکە، وتم: من دەتوانم (بە کەمتر)، فەرمووی: لە پازدە ڕۆژ خەتمی بکە، وتم: من دەتوانم (بە کەمتر)، فەرمووی: لە دە ڕۆژ خەتمی بکە، وتم: من دەتوانم (بە کەمتر)، فەرمووی: لە پێنج ڕۆژ خەتمی بکە، وتم: من دەتوانم (بە کەمتر)، فەرمووی: نەخێر.

٣٥٣٩ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ لاَ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثٍ».[٢]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم کە قورئان بە کەمتر لە سێ ڕۆژ نەخوێنم.

## بابەت: دەنگ خۆش کردن بە قورئان

٣٥٤٠ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ، قال ابْنُ عُيَيْنَةَ: يَسْتَغْنِي».[٣]

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە (واتە: لەو سیفەتەدا لە ئێمە نیە) ئەو کەسەی دەنگی خۆش نەکات بە قورئان، ئیبنو عویەینە وتویەتی: داوای دەنگ خۆشی دەکات.

٣٥٤١ - «عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ، أَيُّ النَّاسِ أَحْسَنُ صَوْتًا لِلْقُرْآنِ، وَأَحْسَنُ قِرَاءَةً؟ قَالَ: مَنْ إِذَا سَمِعْتَهُ يَقْرَأُ، أُرِيتَ أَنَّهُ يَخْشَى اللهَ، قَالَ طَاوُسٌ: وَكَانَ طَلْقٌ كَذَلِكَ».[٤]

واتە: لە تاووسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا: کام لە خەڵکی خۆشترین دەنگی لە قورئاندا هەیە و، خوێندنەوەکەی جوانترینە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کاتێ گوێی بۆ دەگریت کە دەخوێنێت دەبینیت کە لە خوا دەترسێت (بە خشوع دەیخوێنێت)، تاووس وتویەتی: طەڵق ئاوابوو (لەو جۆرە قورئانخوێنانە بوو).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح،

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

٣٥٤٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَمْ يَأْذَنِ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ، قَالَ صَاحِبٌ لَهُ: أَرَادَ: يَجْهَرُ بِهِ».(١)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، كە دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا (زۆر بە گرنگی) گوێبیستی ناكات بۆ هیچ شتێك وەك ئەوەی گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێك دەكات كە دەنگی خۆش دەكات بە قورئان (واتە: كاتێ قورئان بە دەنگی خۆش دەخوێنێت)، هاوڕێكەی (واتە: هاوڕێی ئەبو سەلەمە كە عەبدولحەمیدی كوڕی عەبدوڕڕەحمانە) وتویەتی: مەبەستی ئەوەیە: كە بە دەنگ دەیخوێنێت.

٣٥٤٣ - «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ كَمَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ».(٢)

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو سەلەمە پێی ڕاگەیاندووم كە ئەبو هورەیرە ﷺ وتویەتی: خوا (زۆر بە گرنگی) گوێبیستی ناكات بۆ هیچ شتێك وەك ئەوەی گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێك دەكات كە دەنگی خۆش دەكات بە قورئان (واتە: كاتێ قورئان بە دەنگی خۆش دەخوێنێت).

٣٥٤٤ - «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ لأَبِي مُوسَى وَكَانَ حَسَنَ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ: لَقَدْ أُوتِيَ هَذَا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ».(٣)

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕڕەحمان هەواڵی پێداوم كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو موسای فەرمووە ـ كە دەنگی خۆش بووە بۆ قورئان ـ ئەوە (واتە: ئەبو موسا) لە دەنگی خۆشی ئالی داودی پێدراوە.

٣٥٤٥ - «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَيْضًا: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، كَانَ إِذَا رَأَى أَبَا مُوسَى قَالَ: ذَكِّرْنَا رَبَّنَا يَا أَبَا مُوسَى، فَيَقْرَأُ عِنْدَهُ».(٤)

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو سەلەمە بۆی گێڕامەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ كاتێ ئەبو موسای دەبینی دەیووت: پەروەردگارمان بیربخەرەوە ئەی ئەبو موسا، جا ئەبو موسا لەلای ئەو قورئانی دەخوێندەوە.

٣٥٤٦ - «عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَضَعُ إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى يَتَغَنَّى وَيَدَعُ أَنْ يَقْرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَفِرُّ مِنَ الْبَيْتِ يُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ، وَإِنَّ أَصْفَرَ الْبُيُوتِ الْجَوْفُ يَصْفَرُ مِنْ كِتَابِ اللهِ».(٥)

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكنه موقوف صحيح.

(٣) ـ إسناده مرسل بسند ضعيف لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: یەکێک لە ئێوە نەبینم قاچێکی لەسەر قاچەکەی تر دانابێ گۆرانی بڵێت و واز لە خوێندنی سورەتی بەقەڕە بهێنێ، چونکە شەیتان ڕادەکات لەوماڵەی سورەتی بەقەڕەی تیا بێت، وە خاڵی ترین ماڵ (لە خێر و بەرەکەت) ئەو ماڵەیە خالی بێت لە پەرتوکی خوا (واتە: ئەو ماڵەی قورئانی تیایدا نەخوێندرێت).

٣٥٤٧ - «عَنْ أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَنِي بَعْضُ، آلِ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَدِمَ سَلَمَةُ الْبَيْذَقُ الْمَدِينَةَ فَقَامَ يُصَلِّي بِهِمْ، فَقِيلَ لِسَالِمٍ: لَوْ جِئْتَ فَسَمِعْتَ قِرَاءَتَهُ، فَلَمَّا كَانَ بِبَابِ الْمَسْجِدِ، سَمِعَ قِرَاءَتَهُ رَجَعَ فَقَالَ: غِنَاءٌ غِنَاءٌ».(١)

واتە: لە ئەییوبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: یەکێک لە ئالی سالمی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە، وتی: سەلەمەی بەیذەق هات بۆ مەدینە و هەڵسا نوێژی بۆ کردن، جا بە سالم وترا: بۆ ناچی و گوێ لە خوێندنەکەی بگری، جا کاتێ چوو بۆ لای دەرگەی مزگەوت، گوێبیستی قورئان خوێندنەکەی بوو، گەڕایەوە و دەیووت: گۆرانیە گۆرانی!!

٣٥٤٨ - «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا مُوسَى ﷺ كَانَ يَأْتِي عُمَرَ ﷺ، فَيَقُولُ لَهُ عُمَرُ: ذَكِّرْنَا رَبَّنَا، فَيَقْرَأُ عِنْدَهُ».(٢)

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەبو موسا ﷺ دەهات بۆ لای عومەر ﷺ، عومەریش پێی دەوت: پەروەردگارمان یادبخەرەوە، جا ئەویش قورئانی لەلا دەخوێند.

٣٥٤٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ كَإِذْنِهِ لِنَبِيٍّ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ».(٣)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار (زۆر بە گرنگی) گوێبیستی ناکات بۆ هیچ شتێک وەک ئەوەی گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێک دەکات کە دەنگی خۆش دەکات بە قورئان، کاتێ بە ئاشکرا و بە دەنگ دەیخوێنێت.

٣٥٥٠ - «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَقَدْ أُوتِيَ أَبُو مُوسَى مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ».(٤)

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەبو موسا دەنگێکی خۆشی لە دەنگە خۆشەکانی ئالی داوود ﷺ پێدراوە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف فيه جهالة.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٣٥٥١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَسَمِعَ قِرَاءَةَ رَجُلٍ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟» قِيلَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ قَيْسٍ. قَالَ: لَقَدْ أُوتِيَ هَذَا مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ».(١)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە و گوێبیستی قورئان خوێندنی پیاوێک بوو و فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وترا: عەبدوڵڵای کوڕی قەیسە، فەرمووی: ئەمە دەنگێکی خۆشی لە دەنگە خۆشەکانی ئالی داوود پێدراوە.

٣٥٥٢ - «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ».(٢)

واتە: لە بەڕڕائەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: قورئان برازێننەوە بە دەنگەکانتان (بە دەنگە خۆشەکانتان).

٣٥٥٣ - «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: حَسِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ، فَإِنَّ الصَّوْتَ الْحَسَنَ يَزِيدُ الْقُرْآنَ حُسْنًا».(٣)

واتە: لە بەڕڕائی کوڕی عازیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: قورئان جوانتر بکەن بە دەنگەکانتان، چونکە دەنگی خۆش قورئان زیاتر جوان دەکات.

## بابەت: مەکرڕوهی لەحن و ئاواز و لارکردنەوە و بە مۆسیقا کردنی دەنگ لە قورئانخوێندندا

٣٥٥٤ - «عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: قَرَأَ رَجُلٌ عِنْدَ أَنَسٍ ﷺ، بِلَحْنٍ مِنْ هَذِهِ الأَلْحَانِ، فَكَرِهَ ذَلِكَ أَنَسٌ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: وقَالَ غَيْرُهُ: قَرَأَ غُورَكُ بْنُ أَبِي الْخِضْرِمِ».(٤)

واتە: لە ئەعمەشەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لای ئەنەس ﷺ قورئانی خوێند بە یەکێک لەو لەحنانە (لەو بە ئاوازکردنە نامەشروعانە)، جا ئەنەس پێی ناخۆش بوو و نەهی لێکرد.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: جگە لە ئەعمەش وتویانە: غورەکی کوڕی ئەبو خیضریم خوێندویەتی.

٣٥٥٥ - «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ هَذِهِ الأَلْحَانَ فِي الْقُرْآنِ مُحْدَثَةً».(٥)

واتە: لە موحەممەدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: (زانایان لە صەحابەو تابیعین) ئەم ئاوازو بەلاڕێ دابردنەی دەنگیان لە قورئاندا بە داهێنراو و بیدعە داناوە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده موقوف، بسند صحيح على الأعمش.

(٥) ـ إسناده حسن.

# نـــــاوەڕۆك

## پەرتوکی ٦ : حەج.......................................٤١

## پەرتوکی ٧ : قوربانیی ...................................... ١٠١



## پەرتوکی ٨ : نێچیر و ڕاوکردن ...................................... ١٢١

## پەرتوکی ٩ : خواردەمەنییەکان............١٢٩

## پەرتوکی ٩ : خواردنەوەکان.................................. ١٥٣

## پەرتوكی ١٠ : خەوبینین (خەون)........................ ١٧١



## پەرتوكی ١١ : ژن مارەكردن ( ژن و ژنخوازی ) ........................ ١٨٥

## پەرتوكی ١٣ : سزای تاوانەكان

## پەرتوكی ١٤ : وەفا بە نەزر و سوێندەكان ......257



## پەرتوكی ١٥ : خوێن باییەكان ......٢٦٥

## پەرتوكی ١٧ : جیهاد و تێكۆشان لە پێناوی خوا.............................٢٨١

## پەرتوكی ١٨ : ڕێگا و شێوازی جیهاد كردن (السِّيَر) ........ ٣٠١

## پەرتوكی ١٩ : كڕین و فرۆشتنەكان..........٣٣٩

## پەرتوکی ٢٠ : داوای مۆڵەتکردن........................................ ٣٧٥

## پەرتوکی ریقـــاق ٢١ : (ئەو باسانەی کە دڵی مرۆڤ نەرم دەکەن)........ ٤٠٥

## پەرتوكی ٢٢ : میرات ............................................ ٤٥٩